ســـــاقی! بـــــاوەرە بـــــادەی خولاســـــە
نۆشـــینی پـــەرێ دەفـــع غـــەم خاســـە

ســــــاقی! بــــــاوەرە بــــــادە و پیاڵــــــە
تـــا لـــێم مـــالووم بـــۆ کـــامی حەڵاڵـــە

ســاقی بــدەر پــێم پیاڵــەی پــڕ مــەی
بە عیش ئەو کەس، کەس نییــەن وەک خــوەی

ســـــاقی! بـــــاوەرە شـــــەراو بیغـــــەش
وەک قەنــد مــەزەی خــوەش، ســوور بــێ وەک

ســـــاقی! بـــــاوەر بـــــادەی جامەکـــــە
بـــــە عیـــــشق بـــــاڵای نەونەمامەکـــــە

ســـــاقی! بـــــاوەرە بـــــادە هەســـــەکە
بــدەر پــێم بــە عــیش دیــدە مەســەکە

ســـــاقی! بـــــاوەرە، خـــــوەش‌شـــــەراوەکە
بـــــە شـــــەوق بـــــاڵای پەلکەخاوەکـــــە

«حامیـــد»، قرچیـــا لـــە نـــاو تاوەکـــە
بـــــاوەر بادەیـــــێ وەک وەفراوەکـــــە

* * *

بـــە تەعنـــە پەرســـا پـــیر مەیخانـــە
ئایـــا مـــــەزانی مـــــەعنای پەروانـــــە؟

بـــــواتم: یانـــــێ پـــــەروا نـــــەدارۆ
ســـەد بـــسۆز وە نـــار، ئـــەرواح بـــسپارۆ

واتـــش: ئافـــەرین، مەعلوومـــەن مەســـی
لـــە ئـــەهل مەســـتان بـــادەی هەوەســـی

وات: وا دیـــارە، کـــەمئـــیخلاس بـــووگی
واتم: نە وەک تــۆ، کــەس‌نــەناس بــووگی

* * *

ســەوزە، چاوەکــەم! ســەوزە، چاوەکــەم!
ســەوزەی دیــدەمــەس! نــوور چاوەکــەم!

یـــار پەلکەشـــۆڕ، زوڵـــف لەولاوەکـــەم!
عـــومرم عـــەزیزم، خـــورد و خاوەکـــەم!

عەبــد دوڕ نــەگۆش بــەر دەرماڵــەکەم
ســـــەناخوانەکەی تـــــەن زوخاڵـــــەکەم

«حامیــد» ئــەوا مــرد لــە دەرماڵــەکەت
وێش کەرد و سەرگەرد نوختە و خاڵەکەت

* * *

چـــــراخ وەنـــــەردم، چـــــراخ وەنـــــەردم
فەڵـــەک نـــەرد بـــەد شـــانا وە نـــەردم

وەک فــەرهاد جــەفای بــێ‌حاســل بــەردم
وەک نەوفەل شــەرەنگ هیجرانــت وەردم

وەک مەجنوون چەن‌وەخت چۆڵگەردی کــەردم
وەک یــەخبەنــد ســەرد، هەناســەســەردم

*دیوانی دەسنووسی حامید ئالیجانی*، *ڕۆژنامەی کردستان*، تاران.

## شێخ حوسەینی هەزارکانیانی

حاجی شێخ حوسەینی مەردۆخی، کوڕی شێخ حەسەن، کوڕی شێخ موحەممەد عـارف، لـە پـشتی شـێخ عەبدولغەفاری یەکەم، مرۆیەکی زانا، لەخواترس، دڵاوا و میوان‌دۆست بووە کە گەورە و پچووک ڕێزیـان لـێ گرتووە و لە بیستەکانی چەرخی چاردەدا لە دنیا دەرچووە.

شێخ حوسەین شیعریشی گوتووە و لەگەڵ شاعیری بەناوبانگ مەلـەوی مەعدوومیـدا، جاروبـار شـیعریان گۆڕیوەتەوە. بەداخەوە شیعری شێخ حوسەینم دەس نەکەوت؛ بەڵام ئەم سـێ بەیتـەی مەولـەوی، جـوابی شیعرێکی ئەوە:

| | |
|---|---|
| هەوای «سەرساراڵ» خوسووس وەتەن بـۆ | ئـەرچی سـەفای ڕۆح، ڕاحـەتی تـەن بـۆ |
| بــەڵام دووری تــۆ یەنــد زۆر ئــاوەردەن | دەردی وە دەروون هامـدەردان بــەردەن |
| وە هـــەرجا تەشــریف تــۆ ئەرزانییـــەن | هــەر دیــدە پــەی تــۆ «هــەزارکانیان» |

«هەزارکانیان»ی زێدی شێخ حوسەین، گوندێکی ناوچەی «ساراڵ»ی سەر بە دیواندەرەیە. مەولەوی دەڵـێ: ڕاستە هەوای سەر ساراڵی ژێگەی تۆ، هۆی ڕاحەتی ڕۆح و سانەوەی گیانە؛ بـەڵام دووری تـۆ هێنـدەی زۆر هێناوە و دەردی بە دۆستانت داوە، هەرکوێ بچی، هەموو چاوێک بۆ تۆ هەزاکانیانە!

حاجی شێخ حوسەین باوکی خوا لێ خۆشبوو شێخ عەبدوڵڵای هەزارکانیانییە؛ کە پیاوکی مەزن بـووە و لـە شوێنی خویدا باسی دەکەین.

*دیوانی مەولەوی*، ل٥٤٩. جونگێکی دەسنووس.

## سەید مستەفا بەرزنجی

کوڕی سەید بابارەسوول، لە سەیدەکانی بەرزنجەیە کە ساڵی ١٢٣٥ لەدایکبووە و ساڵـی ١٣٠٢ ک. م. لـە دنیا چووە.

سەید مستەفا ماوەیەک لە خزمەتی عەللامە موحەممەدی فەیزی زەهاوی، مـوفتی بەغـدا خوێندوویـە و ئیجازەی لێ وەرگرتووە و پاشان دەرس‌گوتنەوە و فتوادانی دەسپێکردووە؛ پیاوێکی زانـا و شـاعیرێکی توانـا بووە و بەرهەمی ـ لە شیعر و پەخشان ـ لێ بەجێ‌ماوە. ئەم بەیتە هی ئەوە:

| | |
|---|---|
| قَـــــرَأتُ كتـــــابَ الكائنـــــات فَإنَّـــــهُ | سُـــــطُورٌ بتَوحيـــــد إلا لَـــــه تُهَلّـــــلُ |

نزیک لەم مانایە کە سەعدی دەفەرموێ:

| | |
|---|---|
| بــــرگ درختـــان ســبز در نظـــر هوشـــیار | هــر وَرَقَــش دفتریـست معرفـت کردگـار |

**واتا:**

| | |
|---|---|
| گەڵای داران لە بـەرچاوی مرۆڤـی ورد و وشـیارا | بە وێنەی دەفتەرێکە هەر پەڕێکی بۆ خوداناسی |

*تاريخ سُليمانيّە*، ل٢٨٨.

## حاجی مامۆسای نۆدشی

حاجی مەلا ئەحمەد، مەشهوور بە «حاجی مامۆسا»، کوڕی مەلا عەبـدورڕەحمان، کـوڕی مـەلا ئەحمـەدی



موفتی سلێمانی، لە زانایانی شارەزا و شەرعزانانی کەموێنە و پێشەوایانی ئایینی و مامۆستایانی پایەبەرز بووە کە ساڵی ١٢٢٨ ک. م. لە گوندی «نۆدشە»ی هەورامان هاتۆتە دنیاوە.[١]

مەلا ئەحمەد کە خوێندنی تەواو کردووە، ماوەیەک لە سلێمانی ماوەتەوە و پاشان گەڕاوەتەوە نۆدشە و لەوێ فەقێ ڕاگرتووە و دەرسی گوتوتەوە و خەڵکی ئامۆژگاری و ڕێنوێنی کردووە؛ دوایی و بە پیری، چۆتە سنە و لە مزگەوت و مەدرەسەی مەولانادا بە زۆرێک لە زانایان بەهرەی گەیاندووە.

حاجی مامۆسا، زیاد لە باری زانستی، عارفێکی گەورە و خەلیفە و موجازی شێخ عوسمان سیراجەدین بووە کە لە سەرەتای سەفەرەمانگی ساڵی ١٣٠٢ ک. م. لە شاری سنە، دنیای بەجێ‌هێشتووە و لە «تەپ شەرەفول‌مولک»دا[٢] نێژراوە.

حاجی مامۆسا شیعریشی گوتووە و نازناوی «فانی» بووە. ئەم چەند بەیتە، پاژێک لە غەزەلێکی عیرفانی ئەوە:

ساقیا! مَی دە و بر باد دە این ما و منی را 	مُطربا! نَی زن و بردار حجاب بدنی را
تن نی و نالە نوا، نَی‌زن من نیست بە جز 	گوش جان می‌شنود نالە، بهل گوش تَنی را
نالە از بس کە لطیف است، بە گوشت نرسد هیچ 	گوش جان می‌شنود نالە، بهل گوش تَنی را
کَندە دندان وصال، آن کە ز هجرش مَزَە جوید 	کردە تقلید در این بحث «اُویس قرنی» را
«فانیا»! عود بە مَی کن کە بود عَوْد احمد 	ساقیا! می دە و بر باد دە این ماە و مَنی را

پێڕای قەسیدەیەک، بەم شێوە پەسنی مورشیدەکەی خۆی داوە:

قطع راە هفتخوان و قتل این دیو سپید 	از «سراج‌الدّین» طَلَب، پیر تهمتن همت است

چەند شیعری کوردی گۆرانی لە فانی:

وادەی پاییزەن، وارانی وەشتەن 	کەژ و کۆ مەزەی نەوسوەیل چەشتەن
باز وە سۆ ئامای کۆنەداخانەن 	فەسڵ تەمگیری کۆهـ و زاخانەن
هەر لا سەیل هوون نەسەر چەمەی چەم 	گڵپەی نار دڵ، ناڵەی کوورەی دەم
پڕ کەردەن شەتاو ناوانی گەردوون 	سوچنای شەخەڵ ژیای دونیای دوون
تەم غەم نەسەر سەر کڵاوەی دڵ 	چەترەن چون گیسووی جەمین پەڕەی گوڵ
سەفحەی گۆنای زەرد ڕەنگ جە خەزان بەر 	باڵا خەم کالان نە ڕەزان بەتەر
سەردی هەناسەی ئێلاخەکەی دڵ 	وتەی سیاکار بەختم جە سەر چڵ
دەروێش دڵریش، ناڵەی بێ‌ئەسەر 	ئەسەر وەبەرعەکس یاوا وە دڵبەر

---

١. ئەم لەتە بەیتە، شادەمێژووی لەدایکبوونی، بە حیسابی ئەبجەدە: «بوَد اَحمَد خَلَفِ اَمجَد عبدُالرّحمن»؛ کە دەکاتە ١٢٢٨.

٢. گردێکی نێزیک لە عیمارەتی خەسراوایە لە سنەدا، کە بۆتە زیارەتان و «تەپ شێخ حەمەباقر»یشی پێ ئێژن.

لازم کــەردەن لــێم فەســڵەکەی پــاییز | دوور وســتەی وەهــار وەســڵەکەی ئــازیز
قیبلـەم! هەرکەسـێ چـون مـن ماتەمـەن | وەهـــارش پـــاییز، پـــاییزش خەمـــەن

* * *

کــوورەی دڵ دیــسان جۆشــش وەردەوە | کــەمــکــەم بێهۆشــی هۆشــش بــەردەوە
ئەسرین هەم تاف بەست وە ڕووی ڕوومەدا | تفــڵئاســا مـــەدۆ وێـــش وە بوومـــەدا
بـــەختم ســـیاپۆش، یەخـــە یارشـــەن | شـــەرارەی ناڵـــەم شـــوم ستارەشـــەن
لەرزەی دڵ جـە شـەوق پێکـانی پـەیکان | ئامـــاج ئامـــانجش جـــارێ نـــەپێکان
زاهـیر هـەم فەڵــەک کەڵــەک بەسـتەبۆ | دیــسان دڵ وە تــیر دووری خەســتە بــۆ
دووری ئــەو دڵــبەر جــە گیــان سرشــتە | دیـدە وە سـورمەی بـەخت مـن ڕەشـتە
قامــەت ســەروناز چەمــەی نــوور ئــاودا | نگـاش دیـدەی عەشـق نیـدای وە خـاودا
گیسوو دڵەی شێت لێش کەردەن تەئسیر | پەی پای گیانفیـدات بییـەن وە زەنجـیر
یـــاخۆ مـــەزاقش یـــەکی وجـــوودەن | ڕەمــزش ئــەو مــەقام فــەنا و شــوهوودەن

* * *

چەنــدە پــێم واتی: هــای دڵــەی غافــل | حـــەق حـــەقیقی، ئیزافـــەی باتـــل
پەردەی ئەو جـەمال موتلـەق جـە ئیـتلاق | ئاوێنـــەی مـــەعکووس میرئــاتی ئافــاق
بوو بە بـای مـوراد نەشـئەی سـافی مـەی | بــە یــاری مــەللاح ســۆز ناڵــەی نــەی
کەشـتی غـەرق کـەوتن نـە گێجـاو وەی | یاونــە وە ســاحیل ئـی بــەحر بـێپـەی
بــا کــەرۆش کۆتــا گــڵپەی کــوورەی دڵ | شـــەرارەی ســـەبوون چۆڵـــەکەی مـــەنزڵ
تـــۆ بەتـــەر دامـــان عـــسیانت تـــەڕ بی | وێنـــەی بەدبـــەختان ئـــاخرت شـــەڕ بی
هــیچ نــەبیت وە تــەنگ دمــارۆی فــەردا | دەی تـــا مـــەتاوی بـــدە وە ســـەر دا

*یادی مەردان*. چەند جونگی دەسنووس.

## حافی سمێرانی

حاجی شێخ موحەممەد، نازناو «حافی»، کوڕی ڕۆسەم بەگی مەشهوور بـە ئـەمیر ئاخورباشـی، کـوڕی بـارام بەگ، کوڕی میرزا بەگ، کوڕی حاجی موحەممەد ئاغا، ئەمیرئاخوڕی خوسرەو خـانی گـەورەی ئـەردەڵان، ساڵی ١٢٤١ ک. م. لە شاری سنە هاتۆتە دنیا و دوایی بە بۆنەی نیشتەجێ بوونی لە گونـدی «سمێـران»ی لای باشووری سنە، ناوی سمێرانی پێ براوە.

شێخی سمێرانی دوای خوێنـدنی سـەرەتایی لـە قوتابخانـە، چۆتـە کـۆڕی فەقێیانـەوە و چەنـد ساڵـی

خوێندووه و پاشان لێبڕاوه له تەریقەتیش بێ بەش نەبێ؛ وەک خۆی له کتێبی «*معدن‌النور*»دا دەڵێ: «له سەردەمی منداڵی و کاڵیدا ـکه پاژێک لەم پەرتووکه داندرابووـ دڵ هاته سەر ئەو بڕیاره که بیکەمه دیارییەک و بیبەمه دەرگانەی دەروێشێکی بارەگای خاوێنی خودای تاکی پاکەوه. لەو کاتەدا شێخی پایەبەرز و خاوەن شکۆ، که له مەیدانی ئەزموونددا، گۆی عیبادەتی به گۆچانی مل‌کەچی، له دەستی نەفسی ملهوڕ ڕفاندبوو؛ پله و پایەکانی لاهووت و جەبەرووتی، لەم دنیا ناسووتییەدا، به خۆ و خدەی مەلەکووتی پشتەسەر نابوو، له ئابادییەکی ئەم وڵاته ـکه «کاشتەر»ی ناوەـ نیشتەجێ بوو.

کامه شێخ؟ ئەو پیری ژیری بەمشوور ڕێبەر و گەورەی هەموو، «عەبدولغەفوور»

پێشەکی کتێبەکەم هەڵگرت و وەک دیارییەک پێشکەشی ئەو بارگایەم کرد. دوای خوێندنی، ئاوڕێکی لێ دامەوه؛ وەک بێژی چرای داکوژاوی تین لێ بڕاوی تیشک نەماوی گیانمیان له چرادانی سینگمدا، به پرشنگی ڕێنوێنی خۆی هەڵکردەوه؛ وەها که ئەوی بۆی بەئاوات بووم، بوو به داهاتم. مێزەری بەودمی خۆی کرده کراسێک و سەرشانی ئەم بێ نیشانەی بەو خەڵاته شایانه ڕازاندەوه؛ تا ورده ـ ورده له پیتی دڵدانەوەی هاودەنگانی ئەو زاته، بێزم له لاڕێ هاتەوه و وازم هاتەسەر لانشینی دەروێشان و هەژاران و هەموو ساڵێ جارێکیش بۆ زیارەتی بەردەستانی ئەو پیره گڵکۆپیرۆزه دەڕۆیشتم و تۆزی تاریکی و تەریکی و بێخەبەریم له سەر ڕووپەڕی هزر و بیری خۆ دەسڕییەوه؛ تا سەرەنجام ساڵی ١٢٧٠ ک. م. جەنابی شێخ، جامی بێ خڵت و خاوێنی خودایی به زاردا کرد و بوون و مانەوەی هەتاهەتایی بۆ دنیای‌تر برد. سڵاو و ڕەحمەتی بێبڕانەوەی خودای تاک له گیانی پاکی.»[1]

شێخی سمێرانی تا ئەو ماوه له موریدانی تایبەتی شێخ غەفوور بووه و له ودمی لانشینی ئەو عارفه گەوره، بەهرەی بردووه. دوای کۆچی دوایی ئەو زاته، بەرەو ڕۆژاوای کوردستان چووه و خزمەتی سەرقافڵەی عارفان، شێخ عوسمان سیراجەدینی گڵکۆ پیرۆز گەیشتووه و ماوەیەکیش هاودەنگی خانەقای ئەوی کردووه و وەک خۆی دەڵێ، لەوێ به فەنای نەفس گەیشتووه:

نَفْس ما را شیخ ما برباد داد ای دوصد رحمت بر آن اُستاد

**واتا:**

نەفسی ئێمه، شێخی ئێمه دایەبا هەی هەزار ڕەحمەت له ئەو وەستایه با

خوا لێ خۆشبوو شێخی سمێرانی زانا و عارفێکی گەوره و هەناسەگەرم بووه و له لای مورشیدەکەیەوه، پله و پایەیەکی تایبەتی بۆ ڕەچاو کراوه و چەند کتێبی وەک: «*بارقات‌السّرور*» و «*معدن النور*» و ... له بارەی داب و دەستووری تەریقەت و کەرامەتی مورشیدەکەیەوه نووسیوه.

---

١. دەقی ئەم نووسراوه به فارسی، له لاپەڕەی ٣٨٥، باسی شێخ غەفووردا هاتووه. م.

حافی شیعریشی گوتووە و ئەوا دوو غەزەل لە شیعرەکانی:

بَعد صدسـال ز مـرگ ار بـه مَـزارم بخرامـی خاك بشکافم و بـر خیزمَـت از بهـر غلامـی
نقد طاعـات چهـل‌ساله قبـول ار شـده باشـد پیـشکش بهـر نثـار رَهَـت آرم بـه تمـامی
بهـــر بوســیدن خـــاك دَرَت ار راه بیـــابم سَر عزّت به فَلَك سایم از ایـن عُلـو مقـامی
یـارب آن شـاهد شـیرین اَدَب شـوخ دلارام چه بود آید و جویا شود از من کـه چـه نـامی؟
گفتم: ای یار پریچهره، من از هجر تـو مـردم خنده زد، گفت: بلی، مُردی و افسوس کـه خـامی
مـی‌دَمَـد رایحـه‌ی پیـرهن یوسـف مطلـوب شَـمّ یعقـوب بیایـد، تـو کـه معلـول زُکـامی
عاشـقان را رُخ زرد و دل پُرسـوز و گـداز اسـت حکمت عشق چه دانـی؟ تـو کـه در قیـد کلامـی
مـی‌وَزَد نفخـه‌ی مـشک از اَثَـر طـره‌ی لیلـی حال مجنون اَگـرت نیـست نـه شـایان مقـامی
«حافی» از دست دهد جُرعه‌ای از باده‌ی وصلش وارَهـــی از محَـــن پیـــری و نایافتـــه‌کـــامی

* * *

یـــادت بـــه خیـــر بـــادا ای وقـــت نوجـــوانی بنگـــر چـــه بَـــر مـــن آورد پیـــریّ و نـــاتوانی
هجران و عشق جانان با هم چـو عهـد بَستند مـــا را بـــه وادی غـــم کردنـــد جـــاودانی
آر ای صـبا بـه مجنـون بـویی ز زُلـف لیلـی تـا یـك دمـش ز غَمهـا بـا لُطـف وارهـانی
قَـومی نینـد آگـاه ز اسـرار و رمـز ایـن راه در عـشق و شـورش مـا دارنـد، بـد گمانی
حَلّـاج را شـنیدی چـون دسـتها بریدنـد کردی رُخ خود از خون گلگون و اَرغـوانی
تـا ناقـصان غافـل، بیگانـه زیـن مـسائل از زردروئـــی او نارنـــد بـــد مَظـــانی
چون نیستی ز تردید، همرنـگ اهـل توحیـد خوش باش تا به تقلید خـود را در آن کَشانی
شاید به یك تَجَلّـی عکـس جمـال معشوق روزی تـــو را چـــو برقـــی دریابـــد و بـــدانی
ای «حـافی» پریـشان! در راه وصـل جانـان گر راحت است و گر رنج، می‌کُوش تـا تـوانی

*معدن النّور*. چەند بەیازی دەسنووس.

## شێخ حەمزەی قەرەباغی

لە وێژەوانان و شاعیرانی کوردی باکووری کوردستانە کە ساڵی ١٣٠٣ ک. م. ئەمری خوای بەجێ هێناوە و لە گەڕەکی بایەزیدپاشای ئەستەمبووڵدا نێژراوە.

شێخ حەمزە دیوانی شیعر و چەند کتێبیشی هەیە کە هێندێکیان ترکی، بەشێکیان عەرەبی و بڕێکیش فارسین.

*مشاهیر الکُرد*، امین زَکی بیگ.

### مەلا مەهدی سنەیی (دووهەم)

مەلا موحەممەد مەهدی دووەم، ناسراو بە «ئاغە بەها»، کوڕی مەلا ئەحمەد، پیاوێکی زانا بووە و وەکوو بابی، لە شاری سنەدا پلەی شێخولیسلامی دراوەتێ و سەرەنجام ساڵی ١٣٠٣ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*تاریخ مەردوخ.*

### کەیفی کوردستانی

فەتحوڵای کەیفی، شاعیرێکی خەڵکی جوانرۆیە کە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای کوردستان خوێندوویە و بەتایبەت لە شاری کۆیە خوێندنی تەواو کردووە و لەگەڵ حاجی قادری کۆیی دۆستایەتییەکی زۆری هەبووە و هاوڕێی ئەو، بۆ ڕواندز و ئەستەمبوڵ چووە.

کەیفی ساڵی ١٣٠٣ ک. م. لە تەمەنی ٧٠ ساڵاندا کۆچی دوایی کردووە.

**غەزەلێکی کوردی کەیفی:**

ئەم دڵڕەقی بێڕەحمە فەرەنگیکی تەواوە — عەینی شەڕە، جێفتنەیە، قوربان بڵێ چاوە
قەوسی بە سپەر کردووە، گرتوویەتە دەستی — سەد خەنجەری خونڕیز و دووسەد تیری سواوە
زەنجیری عەداڵەت نییە ئەم زاڵمە، زوڵفە — هەرچەندە بنێ بەندە بە ڕووی عەرشی خوداوە
ئەو سلسلە وا موشکی خوتەن نێوی براوە — پڕ پێچ و شکەن، خەمبەخەم و حەڵقەکراوە
لەولاوە کە لەولاوە بە ئەم لاوە کشاوە — یا یاسەمەنی خاوە بە ڕووی ڕۆژ دراوە
یا دووکەڵی جەستەی منە ئەو شەمعە سووتاوە — یا هەوری سیەهتاوە کە مانیع لە هەتاوە
دامێ کە لە ڕووی دانەیی خاڵت تەنراوە — زەنجیرە لە بان ساحیلی ئەو ڕووتە نراوە
هەی هەی غەڵەتم وت ئەمە زوڵمەت، ئەمە ئاوە — بەم زوڵمەتە، بەم ئاوە، حەیاتم خەڵەتاوە
دڵ تینووە، سووتاوە، بە بێتاقەت و تاوە — ڕێگەم بە سەر ئاوە کە دەچم ڕێم بەسەراوە
ئەو لەعلی لەب و جامی شەرابە کە تۆ دیبووت — بۆ «کەیفی»یە ئاخر کە خودا بۆ ئەوی ناوە

*مێژووی ئەدەبی کوردی*، ل٥٤٣. بەیازێکی دەسنووس.

### عارفی کوردستانی

شێخ مەحموود، نازناو «عارف»، پیاوێکی زانا، شاعیر، خۆشخەت و لە سۆفیانی تەریقەتی نەقشبەندی بووە کە تا سەرەتاکانی چەرخی سێزدە ژیاوە.

وەک شێخ موحەممەدی خاڵ، لە گۆڤاری «*کۆڕی زانیاری کورد*»دا نووسیویە، لە کتێبخانەکەی دیوانێکی عارف، بە خەتێکی جوان هەیە کە سەرەتا هێندێک وشەی تایبەتی سۆفیگەری، پەخشانێک، پەسندی



عارف و ویژەوانی بەناوبانگ، مەلا حامید (کاتبُ‌الاسرار)، نووسەری «*ریاضُ المشتاقین*»، چەند قەسیدە لە پەسنی دوایینی پێغەمبەران (د)، قەسیدەیەک باسی زنجیرەی ڕێڕەوانی تەریقەتی نەقشبەندی، چەند قەسیدە پەسنی دوو مورشیدی پایەبەرزی ئەو تەریقە (شێخ سیراجەدین و شێخ بەهائەدین) و قەسیدەیەکی تر باسی ئەو سەفەرە کە ساڵی ١٢٩١ ک. م. هاوڕێ شێخ موحەممەد بەهائەدین بووە و بۆ حیجاز چووە و پاشان دیوانەکە دەسپێدەکا کە بریتی لە ٦٨٥٠ بەیتی فارسییە.

لەم دواییانە دیوانێکی چاپی ئەم شاعیرەم دەسکەوت کە خوالێخۆشبوو حاجی مەحموودی موحەممەدی (حەکاک) بە خەتی خۆی نووسیبوویەوە و ساڵی ١٣٤٧ ک. ه. )١٩٦٨ ز.) لە چاپی دابوو. لێرەدا چەند نموونەی لێ دەخوێنینەوە:

هیچ سالكْ ز پس پرده خبردار نشد — تا چو منصور سزاوار سر دار نشد
هیچ صورت ز پس پرده نیامد بیرون — پیش رخسار تو چون نقش به دیوار نشد
کی به اجمال پریشانی دلها داند — آن که تفصیل بدان زلف گرفتار نشد
زان جهت درد دل خویش نگفتم با او — که چنان محو شدم فرصت گفتار نشد
آن که در عهد اَزَل دید دو چشم مَستش — تا ابد مست شد و هیچ خبردار نشد
آن که یكْ جام می تلخ نَزَد در دل شب — همچو «عارف» به حَرَم، مَحرم اسرار نشد

* * *

افسوس که دلبستەی نامیم هنوز — در بند رضای خاص و عامیم هنوز
تا پاكْ شود آینەی قلب ز زنگ — ما منتظر جُرعەی جامیم هنوز

* * *

ای درگه رحمتت به روی همه باز — وی عشق تو اندر دل هر صاحب راز
هر چند گناه من ز حَد افزون است — بنواز به عفو خویشم ای بندەنواز

*دیوانی عارف. گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد.*

## خەیاڵی ئامیدی

ئەحمەدی خەیاڵی، کوڕی شێخ موحەممەد شەعبان، لەو شاعیرە کوردانەیە کە زۆرتر بە ترکی شیعری گوتووە و دیوانێکیشی لێ بەجێماوە.

زا و مەرگی خەیاڵی، ساڵانی ١٢٦٦ و ١٣٠٤ ک. م. نووسراوە.

*هدیّةُ العارفین*، ب١، ل١٩٠.

## مەلا هیدایەتی شێخولیسلام

کوڕی مەلا عەباس، لە بنەماڵەی شێخولیسلامەکانی سنە، مرۆیەکی هێژا و مێژوونووسێکی زانا و دادوەرێکی درووستکار بووە کە ماوەیەکیش شێخولیسلامی شاری سنەی لە ئەستۆ گرتووە و ساڵی ١٣٠٤ ک. م. لە دنیا چووە.

مەلا هیدایەت کتێبێکی لەمەڕ مێژووی ئیسلامەوە نووسیبوو کە نوسخەی لێ نەماوە.

*تاریخ مردوخ.*

## ئەختەری کۆیی

ئەمین ئاغا، کوڕی حاجی بەکر ئاغا، نازناو «ئەختەر»، ساڵی ١٢٥٥ ک. م. لە شاری کۆیە هاتە دنیا و هەر لەوێ لای مەلا ئیسمایل ناوێک، ڕەشخوێنی قورئان و وانە سەراەتاییەکان فێر بوو. کە بووە دوازدەساڵی، لەگەڵ ئەسعەد ئاغای برای چووە بەغدا و لە خزمەتی مەلا تاهای دیمەلانی شوێنی خوێندنەکەی گرت؛ بەڵام پاش دوو-سێ ساڵ، لەبەر مەرگی بابی، گەڕاوە کۆیە و بەسەر ماڵ و بنەماڵەدا ڕاگەیشت.

ئەمین ئاغا پیاوێکی دارا و لەگەڵ ئەوەدا دەهندە و جوامێر بووە. بە دەستی کراوە و دڵی نەرمەوە، زۆری خزمەت بە شاعیران و زانایان و ویژەوانان کردووە و شارۆچکەی کۆیە، بە بۆنەی ئەختەرەوە، گیان و تینێکی تایبەتی تێ کەوتووە؛ وەک شاعیرێک گوتوویە:

ئەی موحەممەد! ئەی ئەمینوددەولە! ئەمڕۆ خاکی کۆ جەننەتێکە، کەوتە دۆزەخ هەرچی لێ دوورکەوتەوە

ئەمین ئاغا زەوقی شیعری بووە و لە میرمنداڵییەوە جاروبارە شیعری گوتووە. لە ڕاستیدا ئەوینی ڕابیعە ناوێک، زۆری کار تێ‌کردووە و هەستی شاعیرانەی بزواندووە؛ بەتایبەت کە زۆری حەول‌داوە ڕابیعە بخوازێ و بۆی نەلواوە و ئەو مێردی بە پیاوێکی‌تر کردووە و ئەمیش تا ماوە، بەو ئەوینەوە سووتاوە و بۆ دامرکاندنی کوڵی دڵی جاروبار شیعرێکی داناوە. بەڵام دیوانەکەی کۆ نەکراوەتەوە و شیعرەکانی پەرژ و بڵاوە.

ئەختەر لەگەڵ شاعیرانی وەک نالی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کەیفیدا، نامە و شیعر گۆڕینەوی هەبووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٠٥ ک. م. لە کۆیە ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە و لە زیارەتانی «بەفری قەندیان»دا نێژراوە.

**چەند شیعری ئەختەر:**

ئەمان ساقی! دڵی شەیدا لە جەوری دیدە غەمگینە
لە نەشئەی چاوەکەی مەستت پیاڵە پڕکە، بۆم بینە

فدای چاوی سیاهت بم، کە هۆشم بوو ئەویشم چوو
بە تاراجی نیگاهت چوو، ئەگەر عەقڵە و ئەگەر دینە

لە هیجری قامەتی سەروت وەکوو قومری بە ڕۆژ و شەو
لە باغی زندەگی پیشەم هەمیشە ئاهـ و ناڵینە

ئەگەر مەقسوودەکەت مەرگی منە، فەرمان دە تا بمرم
وەکوو لالە هەموو ئەعزام بە خوێنی دیدە ڕەنگینە

گوڵم! سووچم چ بوو؟ دوو چاوەکەت بێ ڕەحم و مروەت بوون — دەخیلت بم عینایەت کە، کە «ئەختەر» زار و میسکینە

* * *

دەخیلت بم لە عوشاقت مەڕەنجە — دڵ و دینم فیدای ئەو لار و لەنجە
هەتا وەک شیری دایکت لێت حەلاڵ بێ — حەنایی کە بە خوێن ئەو دەست و پەنجە

* * *

مەکەن لۆمەم لە ڕسوایی ڕەفێقان — کە عەقڵ و عاشقی لێکتر جیایە
سەر و ماڵم لەبەر تۆ چاوی چاوم — مەڵێ ئەوساکە «ئەختەر» بێوەفایە

* * *

تەشەکوور واجبە بۆ من کە من بمرم بە زەخمی تۆ — بە شەرتێ کفنەکەم بدرووی بە تای زولفی پەرێشانت
دڵم مەشکێنە چونکی مەعدەنی دەردی غەمی تۆیە — فیدای شەرت و وەفات بم چی بەسەرهات مەیلی جارانت؟

گۆڤاری *هیوا*، بەغدا، ١٩٨٥ ز. س١، ژ٩، ل٨٦.

## شێخی موهاجیر

عەللامە شێخ عەبدولقادیری موهاجیر، کوڕی حاجی شێخ موحەممەد سەعیدی تەختی مەردۆخی، ساڵی ١٢١١ ک. م. لە سنە لە دایک بووە و کە بای‌باڵی‌داوە، خوێندنی دەسپێکردووە و لە خزمەتی بابی زانا و ماموستایانی تردا، ساڵانێکی زۆر خوێندوویە، تا تەواو پێگەیشتووە و ئیجازەی وەرگرتووە و دوای کۆچی دوایی بابی، جێ ئەوی گرتۆتەوە و لە مەدرەسەی «دارُالاحسان»ی سنەدا دەرسی گوتۆتەوە.

شێخی موهاجیر لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٢٧١ ک. م. بە هۆی شڵەژاوی بارودۆخی ئێران و بەتایبەت بشێوەی میرنشینی ئەردەڵانەوە، لە سنە باری‌کردووە و ڕووی لە سلێمانی ناوە و لە لایەن هەموو چینێکی ئەوشارە، بەتایبەت زانایان و مەلایانەوە، پێشوازی لێ کراوە و زۆری ڕێز لێ گیراوە.

میری سلێمانی هەڵدەگرێ و نامەیەک بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی دەنووسێ و بە پوخت و پاراوی، شێخی موهاجیر و بنەماڵەی پایەبەرزی دەناسێنێ و یەکێ بەرگێک لە بەرهەمە بەنرخەکانی بۆ دەنێرێ و ڕادەگەیەنێ کە ئەوا ئەو زاتە پیرۆزە، تەشریفی هێناوە و لە سلێمانیدایە؛ چۆن دەفەرمووی، وا بکەم.

بە هەڵکەوت ئەو نامە و کتێبانە، لەگەڵ خەبەری دڵگەشێنی سەرکەوتنی لەشکری عوسمانی لە خاکی ڕووسیادا، پێکەوە دەگەنە ئاسانە و سوڵتان ئەو سەرکەوتنە، لە ودمی هاتنی شێخی موهاجیر بۆ خاکی عوسمانی دەزانێ و نامەیەکی وا بۆ شێخ دەنووسێ: «بعدَ المُقَدمة السَّلامُ عَليكُم، قَدْ ظَهَرَ فَضْلُكُمْ مِنْ أثَرِكُمْ، وَ نَحنُ تَفاءَلْنا بِيَوْمِ قُدُومكُمْ المُصادف ليوم دُخُول عَساكرنا المَنصُورة بَلدة سواستبول، فَها خَصَّصْنا لكم شَهْرِيَّةً تَكْفي مَعيشَتَكُمْ، وَ إنْ لَمْ تَكْفِ فَاكْتُبُوا لَنا بَعْدَ فَراغِنا مِنْ غَوائِلِ الحربِ وَ لا تَنْسَوْنا مِنَ الدُّعاء، وَ السَّلام.».

شێخی موهاجیر لە کەلام و فەلسەفە و حیکمەتدا، بلیمەتێکی بێ هاوتا و لە زانستەکانی تری باوی ئەو ڕۆژگارە، مامۆستایەکی کەموێنە بووە. لە سلێمانی، تا بۆی کراوە، دەرسی داوە، کتێبی داناوە، پەراوێزی نووسیوە و ڕێگای زانستی بڕیوە، سەرەنجام ساڵی ١٣٠٥ ک. م. لە تەمەنی ٩٤ ساڵیدا، لەو شارە ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە زیارەتانی «گردی‌سەیوان» نێژراوە.

**بەرهەمەکانی شێخی موهاجیر**: پەراوێز لەسەر«*شرح عقاید عضُدیّه*»، «*شرحُ رسالة الزّوراء*»، «*کشفُ‌الغطاء*» لەمەڕ زات و سیفاتی خوای تواناوە، پەراوێز بۆ «*تعلیقات لاری*». بەڵام لە هەموو کتێبەکانی بەناوبانگ‌تر، شەرحێکە لەسەر «*تذهیب‌الکلام*»ی تەفتازانی، بەناوی «*تقریبُ‌المَرام*». ئەم کتێبە هەر لە دەورانی ژیانی خۆیدا، بوو بە یەک لە کتێبە دەرسییەکانی حیکمەت و کەلام لە هەموو کوردەواریدا و ئێستاش لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا، جێی سەرنجی مامۆستایان و قوتابییانە.

«*تقریبُ‌المَرام*» بە پەراوێزەکانیەوە، کە شێخ وەسیم، برای شێخی موهاجیر بۆی داناوە و «*وَسیمّیه*» یان «*مُحاکمات*»ی ناو لێ ناوە، ساڵی ١٣٠٣ ک. م. لە قاهیرە چاپ کراوە.

شێخی موهاجیر، زیاد لە پلە و پایەی بەرزی زانستی، مرۆڤێکی خوداناسی لە خوا ترس بووە و بەشێ لە کاتی شەو و ڕۆژی بە نوێژ و عیبادەت ڕابواردووە.

شیاوی باسە دوای کۆچی شێخی موهاجیر لە شاری سنە، ماوەیەک شێخ وەسیمی برای دەرس‌گوتنەوەی مەدرەسەی «دارُالإحسان»ی لە ئەستۆ بووە.

پێشەکی *تقریبُ‌المرام*، قاهیرە، ١٣٠٣ ک. م. *الاعلام*، ب٤، ل١٦٩. *ایضاح المکنون*. *تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٧٢. *هدیّةُ العارفین*، ب١، ل٦٠٥. *عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٣٠٦ و ٣٠٧.

## کاک ئەحمەدی شێخ

پیری پارسا، سەید کاک ئەحمەدی شێخ، کوڕی عارفی زانا شێخ موحەممەد مەعرووفی نۆدێیی بەرزنجی، ساڵی ١٢٠٨ لە سلێمانی لەدایک‌بووە و ١٣٠٥ ک. م. هەر لەو شارە دنیای بەجێهێشتووە.

کاک ئەحمەدی شێخ لە عارفانی پایەبەرز و ئەولیای بەناوبانگە کە لە بەڕێوەبردنی داب و دەستووری پێغەمبەری مەزندا (د) هێندە تێکۆشەر و پێداگر بووە، تەنانەت تاقە سوننەتێکیشی لەبیر نەکردووە؛ پیاوێکی خاکی، خواناس و لەخواترس، ڕۆژان بەڕۆژوو، شەوان شەونوێژ خوێن، دەهندە، میهرەبان، ڕووخۆش، خۆش‌سەروزمان و تەنانەت نزاگیراو بووە. خوێندنی لای بابی و مامۆستایانی تری سلێمانی و ئەوناوچە تەواو کردووە و پاشان لە خزمەتی بابی پایەبەرزیدا، تەریقەتی قادری وەرگرتووە.

باسی چاکەی کاک ئەحمەد زۆرە و لە سەرووی هەموانەوە، مرۆدۆستی و خۆ تەرخان کردنی بۆ خزمەت

بە خەڵکە. ئەگەر ناحەقی‌لێکراوێک هانای بۆ بردووە، تا ئەو ڕادە دەستی چووە، پشتی گرتووە و دادی ساندووە. وەک دەڵێن لە تاقە ڕۆژێکدا چەند جاران چۆتە لای پارێزگەری سلێمانی، تا داخوازی داماوێکی سەلماندووە.

لە کاک ئەحمەدی شێخ، چەند کتێب سەبارەت بە تەفسیر و حەدیس و فیقهـ بەجێ‌ماوە؛ بەڵام زۆربەی نامیلکەکانی ئەپەرژێتە سەر داب و دەستووری ئایینی و دۆعا و مۆچیاری. بۆ وێنە چەند بەرهەمی فارسی هەیە بریتی لە ١٢ بەش، باسی هاندان بۆ چاکە و بەرگری لە خراپە و ئیشی موسوڵمانەتی؛ کە کوڕەزای ناوداری شێخ مەحموودی نەمر، کۆی کردنەوە و ساڵی ١٣٥٥ ک. م. لە سێ بەرگدا لە نەجەف، لەچاپی‌دان. دیسان لە بەرهەمەکانی، شەرحێکە لەسەر هۆنراوەی «*سُلَّمُ‌الوصول*»ی بابی لە ئوسوولدا و هەروەها پەراوێزێکە بۆ «*کمال شرح شافیەی صرف*» و کتێبی «*رغبةُ‌الطّالبین*» لە مەڕ هێژایی زانست و زانایان.

پێشەکی *مکتوبات بَرزَنجی*. *تاریخ سُلیمانیّە*، ل٢٢٤. *ذیل کشفُ الظُّنون* ب١، ل٥٧٥. *مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١١٩.

## شێخ جەسیمی مەردۆخی

کوڕی حاجی شێخ موحەممەد سەعید و برای شێخ عەبدولقادیری موهاجیر، کە «صَدرُالعُلَما» و «**حُجةُالاسلام**»یشیان پێ گوتووە، لە زانا بلیمەتەکانی بنەماڵەی مەردۆخییە و جیا لە پلەی بەرزی زانستی و پایەی هێژای عیرفانی، وتاربێژ و قسەزانێکی یەکجار دەم‌پاراو و گفت‌جوان بووە؛ چەند جاران بۆ تاران چووە و لەگەڵ مەلا گەورەکانی شیعەدا، کێشە و وتووێژی زانستی و ئایینی کردووە.

شێخ جەسیم نامیلکە و پەراوێزی لەسەر کتێبانی تر زۆر نووسیوە و هەروەها هێندێک کتێبی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە. قەڵەمێکی بەهێزی بووە، بەتایبەت بۆ پەخشانی فارسی و جاروبارەش شیعری گوتووە.

**لە شیعرەکانی**:

به دور خرمن حُسنش به بوی دانه‌ی خالش — بیا که مورچه‌ای بهتر از سُلیمانی است
کشید باز شه غم، عَلَم به کشور هستی — زنید کوس که هان نوبت پریشانی است
به خارهای مَلامت به تیغ‌های مشقت — ز دوست ناله نمودن نه شأن انسانی است

* * *

جام دل لبریز صَهبای غم است — کَشتی تن غرق بحر ماتم است
خیره از ادراک حُسنت چشم عقل — در مدیحت صد چو سَحبان اَبکم است

ئەمەش نموونەیەک لە پەخشانی فارسی شێخ جەسیم، کە بەشێ لە نامەیەکە لە سەری پیری و بە



دەستێکی لەرزۆک، بۆ شێخ ئیسمایلی کاشتەری نووسیوە:

«جان فدای مشربِ عالی... قَدَمت به روی چشم دل، پای خیال و یادآوری بر مردمکِ‌دیده، مَن و انصراف از مبدأ، حاشا و کَلّا. من اگر به صورت مُنْحَرِفم، معنیً باز به صوب موطن مُنصرفم. رَحِمَ الله مَنْ قال: گم نخواهد کرد رهرو راه را. نی‌نی، من خاک پای نیکان و کمینه‌ی ارادت‌کیش بستگانم. جزای‌خیر بادت، لطف فرمودی. آری ساحتِ خیال چه‌قدر وسیع است، مجال عَمَل صد برابر تنگ و پای اقدام بر تثبیت اُمور لنگ. فقیر این وضع این چنین، ز عشق تا به صبوری هزار فرسنگ است، شاید باید زیستن؟ دور از وجود شریف، ناشاد باید زیستن. این من و خجلتم و آن شما و رأفتتان؛ خدای از آن بکاهد و بر این بیفزاید. رعشه‌ی دست مانع است و الّا در مدیحت داد معنی دادمی.

فقیر بی‌بضاعت اگر حُسنی دارم، همین انتساب به آن جناب و سلسله‌ی بَنی اعمام اکرام آن‌جناب است. اگر قاصرم، از بستگان آن دودمانم. به شرط حیات و فراهم‌بودن اسباب، نمی‌شود خود را شرمنده و خَجِل دارم. جَوارح و مَشاعِر در ما خلقت هِی لاجله انْ شاءالله صرف خواهد شدن. میلم کشانید به خط خود زحمت دادم که شکست حالی مُخْتَفی نماند. جَسیمم عِوض نشده‌ام، وَ السَّلامُ علیکُمْ و رَحْمَةالله.»

شێخ موحەممەد جەسیم لە ٢١ی زیحەجەی ساڵی ١٣٠٥ ک. م. لە شاری سنە، دنیای بەجێ‌هێشتووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ عەبدوڕڕەحمانی مەولاناوایی

لە تۆرەمەی عارفی بەناوبانگ، شێخ حەسەنی مەولاناوایە کە دەوری ساڵانی ١٢٥٠ ک. م. لەدایک‌بووە و ١٣٠٦ لە دنیا چووە.

ڕەحمان تازەلاوێکی هەرزەکار بووە، کچێکی خێڵی حەمیدی جاف، دڵی بردووە و هەستی شاعیری بزواندووە. شیعرەکانی ناسک و دڵبزوێنن و زۆربەیان باسی ئەو ئەوینە ئاورینەیە. بۆ وێنە:

دیدەم ئەر پرسی چۆنەن ئێلاخان  ئاخان ئاخانەن، زاخان جە داخان
ئەو شەوق، ئەو زینەت، ئەو شێوە تۆ دیت  ئەو هەرد، ئەو هەڵەت، ئەوسا پێوە بیت
ئیسە جە دووریت پۆشان سیاسەنگ  هاژەی قەڵوەزان، ماتەمەن، بێ‌دەنگ
ئەو تاتای چنوور، ئەو دەستەی شەوبۆ  تۆ مەدیت نە هەرد «بنەسوورە» کۆ
ئەو ئەرخەوانان لێو شەتاوان  ئەو تەوق سەوڵان نە پای گوڵاوان
ئیستە نە ئەو بۆ نە ئەو شێوە و ڕەنگ  نە ئەو شادی و زەوق، نە ئەو سەدا و دەنگ
دڵ‌تەنگەن جە داخ دووری دیدەی تۆ  ویەرد مەنزڵگای «دەرەی تەنگە» کۆ
«کەس‌نەزان» هەر سەیل ئەسرین مەڕێزان  تاف وە فراوان، وەهاران بێزان

«کەللـــەبا» وە بـــای هەناســـان ســـەرد
کەللەش چون کەللەی من بیەن وە گـەرد
«مێرەش» ڕەش پۆشەن، «سـاتیار» ئازیـەت بـار
«قوجە» شینـشەن، «بـەردەڕەش» ئـەوگار
«سەرواڵە» نە چەم ڕەوان کـەردەن سـەیل
هەردان، هەڵەتان، کـاوان کـەردەن کـەیل
«تۆراخ تەپ» دووریـت تـەم وەنـەش بـارەن
«توشـــکەبـــار» غـــەمبار، دایم زگـــارەن
وەی تـــەور هـــەواران، کـــلاوان، کـــاوان
چـون مـن ناڵەشـان وە گـەردوون یـاوان
هــەر هــەردێ کــە تــۆ مــەگێڵای تێـدا
ئێــــستە بایـــــەقوش مـــــەوانۆ پێـــــدا
ئێـــستە هـــامن چـــون جـــود هـــەواران
دەور مـەدەم جـە دەور مـاوای هـەرجاران

جونگێکی دەسنووس.

## زیائەدینی حەیدەری

لە بنەماڵەی حەیدەرییەکان و کوڕی عەبدوڵڵای حەیدەری هەولێرییە. مرۆڤێکی زانا و قازی شاری هەولێـر بووە و ساڵی ١٣٠٧ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

کتێبی «*غایةُ المرام فی شرحِ بُرأةالامام*» لە نووسراوەکانیەتی.

*ایضاحُ المَکنون*، ب٢، ل١٤١. *هدیّةُ العارفین*، ب١، ل٣٤٢.

## سەید عەبدوڵڵای چۆڕی

سەید عەبدوڵڵای مودەڕڕیسی چۆڕی، زانایەک لە سـەیدەکانی چـۆڕی لای مـەریوان بـووە کـە ژیـانی بـە دەرس‌گوتنەوە و بەهرە گەیاندن ڕابواردووە. لە ساڵەکانی دوایی تەمەنیدا بۆ شاری سنە چووە و لە مزگـەوت و مەدرەسەی نەسیردیوانی ئەوشارە، درێژەی بە ئیشی خۆی داوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٠٧ ک. م. هەر لە سنە ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## سوڵتانیی کرماشانی

حوسەینقولی خانی سولتانی، کوڕی مـستەفاقولی خـانی دیـوان‌بـەیگی، کـوڕی حـاجی شـەهباز خـانی کەلهوڕی[١] کرماشانی، ساڵی ١٢٥٠ ک. م. لە کرماشان هاتۆتە دنیا و حەوت سـالان خوێنـدنی سـەرەتایی

١. تایفەی کەلهوڕ بەشێکی گەورە لە کوردانن کە کەسـایەتی مـەزن و هێـژای زۆریـان لـێ هەڵـکەوتووە. لـە بەشـی دووهەمی ئەم کتێبەدا، باسیان دەکەین. خێڵی «حاجی‌زادگان» لقێک لە هۆزی کەلهوڕە.

دەسپێکردووە و پاشان لە قوتابخانەدا، عەرەبی و مێژوو و جوگارفی و دیوانی شاعیرانی عەرەب و فارسی لای مامۆستایانی ئەو سەردەمەوە خوێندووە و بە هۆی تێکۆشانی زۆر و زەینی تیژەوە، لە ماوەیەکی کەمدا لە باری ویژەوانی و خەتخۆشی و شیعر هۆنین و پەخشان نووسیندا تا ڕادەیەکی زۆر سەرکەوتووە.

شیاوی باسە یەک لە مامۆستایانی شیعر و وێژەی سوڵتانی، میرزا حاجی موحەممەد، نازناو «بیدل» بووە.

سوڵتانی دیوانێکی بریتی لە دەوری چلهەزار بەیت شیعری عەرەبی و فارسی، لە قەسیدە و غەزەل و مەسنەوی هەبووە و هەروەها هێندێک کتێبیشی نووسیوە؛ وەکوو: «*نجاتُ الثّقلَین*»، «*شکّرستان*»، «*باغستان*»، بە شێوەی «*گُلستان*»ی سەعدی، «*گنج باد آور*»، «*عَروض و قَوافی*» و «*تذکرەی شُعرای مُعاصر*».

ئەم مامۆستایە زەینێکی تیژی هەبووە و شیعرێکی زۆری، لە عەرەبی و فارسی، لەبەر کردووە. زۆربەی کاتی بە خوێندنەوە و تۆژینەوە ڕابواردووە و بەم بۆنەوە نەیپەرژاوەتە سەر کاری ڕامیاری و پیشەی باوانییەوە و هەر وازی لە کتێب و خوێندن و نووسین بووە. سەفەرێک بۆ ئەسفەهان چووە و دوای ماوەیەک مانەوە و وتوویژ لەگەڵ مامۆستایانی ئەو شارە، سەرێکی تارانی داوە و لەوێش هەر هاودەنگیی و ئاموشۆی زانایان و شاعیرانی کردووە.

مامۆستا حوسەینقولی خانی سوڵتانی سەرەنجام ساڵی ١٣٠٧ ک. م. لە تەمەنی ٥٧ ساڵاندا کۆچی دوایی کردووە.

**چەند نموونە لە شیعرەکانی**:

گر غرض نقش تو در پردەی تقدیر نبود ‌ ‌ ‌ گل آدم بە خدا قابل تخمیر نبود
کیمیای دل من عشق تو گردید آن روز ‌ ‌ ‌ کە نشان هیچ ز سیم و زر و اکسیر نبود
کاروان دلی از شهر برون هیچ نرفت ‌ ‌ ‌ کە نوای جَرَسش نالەی شبگیر نبود
ز بلندی بە تو ای قصر عدالت نرسد ‌ ‌ ‌ یا کە در نالەی ما این همە تأثیر نبود
تا نگشت ابرو و مُژگان تو خونریز دلی ‌ ‌ ‌ سپر تیغ نگشت و هدف تیر نبود
عادت غمزەی چشم تو شکاراندازی است ‌ ‌ ‌ وَر نە صید دل ما قابل نخجیر نبود
عشق بر گردن کس طوق ارادت ننهاد ‌ ‌ ‌ تا بە دستش ز سر زلف تو زنجیر نبود
بە خط و خال تو گفتم نسپارم دل خویش ‌ ‌ ‌ چە کنم چارەی تقدیر بە تدبیر نبود
خضر از نقش لَبت زندە و جاوید بماند ‌ ‌ ‌ وَر نە در آب بَقا این همە تأثیر نبود
غم هجران تو ای تازەجوان پیرش کرد ‌ ‌ ‌ وَر نە «سلطانی» از این پیش چنین پیر نبود

* * *

بە چَمَن بار دگر رُست عَقیق یَمَنا ‌ ‌ ‌ چو رُخ تُرک من از شاخ برآید سَمَنا
بر گُلش بلبل شیدا بە سجود آمد باز ‌ ‌ ‌ آنچنان کاید در پیش صَنَم، بَرْهَمَنا
رُخ خورشید درخشندە ز تاریک سحاب ‌ ‌ ‌ چون نگین جَم و مانند دل اهرمَنا

سُرمه در چشم کشد بار دگر نرگسَکا | مُشکْ بر زُلف زند بار دگر نَسترنا
اَبر بارنده گُهر بارد هر دم گویی | که فرود آید از آن قُرطه‌ی درّ عَدَنا
گرنه مانند کلیسا شده گُلزار ز چیست؟ | که چکاوک شده خُنیاگر و ناقوس زَنا
گُل صدپاره به زندان چمن دانی چیست؟ | یوسفی کش بدریدند به بر پیرهَنا
شاخ گر کان جواهر نه، چرا هر دم از آن | گاه پیروزه همی‌روید و گه بَهْرمنا
همه زنگار دهد سبزه به کوه و چَمَنا | همه شنگرف دهد لاله به دشت و دَمنا
گر به شنگرف و به زنگار فتد حاجت خلق | گو بیا و ببر این هر دو به خروار و منا

*مَجمَعُ‌الفُصَحاء*، ب٢، ل١٥٢. *تذکره‌ی شُعرای کرمانشاه*، ل٥٤.

## شێخ ئەحمەدی وەلی

شێخ ئەحمەد شەمسەدین، کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدینی نەقشبەندی، لە عارف و سۆفییە ناودارەکانە کە ساڵی ١٢٦٦ ک. م. لە گوندی «تەوێڵێ» لە دایک بووە و ٢٥ی سەفەری ساڵی ١٣٠٧ ک. م. بە مەرگێکی ناکاو، لە دنیا چووە.

ئەحمەد هەر لە تەمەنی هەرزەکارییەوە و کاتی خوێندن، لاوێکی بەعیبادەت و لەخواترس و ڕیازەتکێش بووە و خۆی تەیاری وەرگرتنی تەریقەت و سەیر و سولووک کردووە و سەرەنجام لە ژێر چاوەدێری بابی پایەبەرزیدا، چۆتە ناو جەرگەی سۆفیانەوە و یەک لە دووی یەک لە پلەکانی تەریقەت سەرکەوتووە و تا سەرترین پلە ڕۆیشتووە و بە «شێخ ئەحمەدی وەلی» ناوی دەرکردووە.

*سراجُ‌الطالبین*، ل١٦١. *الفضیلة*.

## مەلا عوسمانی کانیکەوەیی

کوڕی حاجی مەلا ئیسمایل، کوڕی مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلا فازیل، ساڵی ١٢٢١ ک. م. لە گەڕەکی «دەرەگەزێن»ی[١] سلێمانی هاتۆتە دنیا و خوێندنی لەو شارە و شارانی دەور و بەردا تەواو کردووە. پاشان

---

١. **دەرگەزێن**: ناوچەیەکە لە هەمەدانەدا. زەمانی شاسولتانحوسەینی سەفەوی (١١٠٥– ١١٣٥ ک. م.) بە هۆی بشێوەی ئێران و شەڕی ناوخۆی میرانی کرماشان و هەمەدانەوە، تایفەی قادری ـکە نیشتەجێی ناوچەی دەرگەزێنی هەمەدان بوون ـ لێبڕاون بەرەو ڕۆژاوا بارکەن. ئەم کۆچ و بارە، ساڵی ١١٢٠ ک. م. ڕوویداوە و کۆچەران بوون بە دوو دەستەوە: دەستەیەکیان لە شاری سنە دابەزیون و دەستەیەکیش تا سلێمانی ڕۆیون و لەوێ گەڕەکێکیان بە ناوی خۆیانەوە کردۆتەوە و ناوی بووە بە «گەڕەکی دەرگەزێن». باب و کاڵی مەلا عوسمان لەو کۆچەرانە بوون. دەڵێن باوەگەورەی ئەم خێڵە، بابا تاهیری هەمەدانییە.

چۆتە خزمەتی پیری تەریقەتی نەقشبەندی، شێخ سیراجەدین و ماوەیەک لە سووچی خانەقای تەوێڵێدا سەیر و سولووکی کردووە تا بە مرازی گەیشتووە و لە مورشیدەکەی، ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە سلێمانی و پێڕای بەجێهێنانی داب و دەستووری تەریقەت و ڕێنوێنی خەڵک، ئەرکی وەرگرتنی فەقێ و دەرس گوتنەوەشی لە ئەستۆ گرتووە.

مەلا عوسمان مرۆیەکی پارسا، لەخواترس، بە بەشی خۆ ڕازی و دوورەپەرێز لە خەڵک بووە و ئاوڕێکی وای لە ماڵ و سامانی دنیا نەداوەتەوە و سەرەنجام ساڵی ۱۳۰۷ ک. م. بەرەو لای پەروەرندەی گەڕاوەتەوە.

لە مەلا عوسمان دیوانێک شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی و هەروەها کتێبێک بەناوی «*جَوهرَةُ العرفان*» لەمەڕ سۆفیگەرییەوە، بە زبانی عەرەبی بەجێ ماوە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ۳۸۰ و ۳۸۱.

## عەبدوسسەمیعی بانەیی

حاجی سەید عەبدوسسەمیع، کوڕی سەید سولەیمان، کوڕی سەید ئیبراهیم، کوڕی سەید ئەحمەد، لە تۆرەمەی سەیدەکانی بەرزنجەیە کە ساڵی ۱۲٦٤ ک. م. لە ناوچەی «سیوەیل»، لە ڕۆژاوای کوردستان هاتۆتە دنیا و پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، ڕووی لە ڕۆژهەڵات ناوە و لە گوندی «حەمزەلان»ی ناوچەی «دەشتەتاڵ»ی بانە گیرساوە و لەوێ خەریکی دەرس‌دانەوە و بەرنوێژی خزمەتی دینی بووە و ژنی خواستووە. ساڵی ۱۲۹۵ ک. م. چۆتە ئابادی «ئەنجینەی ئیبراهیم» و ساڵی ۱۳۰۲، ئەوێشی بەجێهێشتووە و لە دێی «بنەخوێ» یۆنس خانی بانە دامەزراوە. ساڵی ۱۳۰۷ ک. م. سەفەری حیجازی کردووە و پاش بەجێهێنانی حەج و زیارەتی مەدینەی پیرۆز، هێشتا نەگەیشتۆتەوە جەددە، دنیای بەجێهێشتووە.

خوا لێ خۆشبوو عەبدوسسەمیع پیاوێکی عارف و هێژا بووە و لە تەریقەتدا، سەری بە قوتبی تەریقەت، مورشیدی پایەبەرزی قادری، کاک ئەحمەدی شێخ سپاردووە.

لەم مامۆستایە هۆنراوەیەک بە کوردی، لە عەقایددا و کتێبێک بە پەخشانی فارسی، لەمەڕ مارە و تەڵاق و قوربانییەوە بەجێماوە.

ئێستاش لە پشتی ئەو بەڕێزە، مامۆستایانێکی پارسا و هێژا، لە بانە و سەقز و دێهاتی دەوروبەریدا دەژین.

یادداشتەکانی نووسەر.

## میرزا ئەسەدوڵای قادرمەرزی

ناسراو بە «میرزا ئەسەدوڵا خان»، کوڕی میرزا مەهدی خان، پیاوێکی گفتخۆش و دەمپاراو بووە و زۆری حەز بە شیعر و وێژەی کوردی کردووە و لەگەڵ هێندێک لە شاعیرانی کوردی هاوچەرخیدا، شیعریان



گۆڕیوەتەوە.

میرزا ئەسەدوڵا هەڵبەستی «*باد و باران*»ی میرزا شەفیعی کولیایی نووسیوەتەوە و بە چاولێکەری ئەو، مەسنەوی «*هەرزەکەلام*»ی هۆنیوەتەوە.

مامۆستا موحەممەد سەعیدی مەجیدی، سەرجەمی شیعرەکانی میرزای لە کتێبێکدا بە ناوی «*گوڵزاری ئەسەدوڵا خان*» کۆ کردۆتەوە کە بریتییە لە «*هەرزەکەلام*» یان «*زۆسان و شەماڵ*»، «*سوڵتان جومجومە*»، «*ئیسمایل‌نامە*» و «*شینی شێخ عوسمانی تەوێڵێ*».

ئەوا چەند بەیت لە سەرەتای هۆنراوەی *زۆسان و شەماڵ*:

هـان وە تەنگەوە، هـان وە تەنگەوە ... فەڵەک! بەندەگان هـان وە تەنگەوە
گشت جە نادانی شین وە نەنگەوە ... پاڵدان وە پاڵشت سیای سەنگەوە
ئەلوەدای شیوەن چەنی سەختی ساڵ ... کەس نەمەند، جە ڕەنگ زمان کەردەن لاڵ
جای بە ناو مەلجەء، هەنی نییەن کەس ... غەیر جە زاتی تۆ، قەدیمی ئەقدەس!
بەندەت گونابار، سەربارەن عیسیان ... پەی وێش جەم‌کەردەن بی‌سەهوو نسیان
جە شەرمەساری، ڕای ڕجاش بەندەن ... شەیتان وە چەن ڕەنگ دام نەڕاش تەندەن
تەئسیر نەمەندەن جە کەرەمی نەفس ... مەر لوتفی وێت بۆ ئەی کەس بێ‌کەس!
ئەڵبەت یا ڕەویەی ئاخر زەمانەن ... قەتع مەقبووڵی دۆعای پاکانەن
وەی تەور زمستان زۆرئازمای زوور ... جە خورشید سەندەن جیلوەی شەوق نوور
یەک ڕۆژەن جە بورج حەمەل ویەردەن ... یەک نیشانەی خەیر زاهیر نەکەردەن
کەروێشک و ڕێوی، وەحشی و فەقیرحاڵ ... وێڵ ــ وێڵ مەگێلان دڵ‌سوختەی زوخاڵ
کەو و کەڵ‌کێفی قەڵوەزان یاتاخ ... کەفتەن وە پادەشت دڵ چون سیاداخ
نە قەتارەی قاز چون هەردەجاران ... نە سەوت عەندەلیب مەیۆ نەداران
نە قەمەر مەندەن بە جەلای جەمین ... نە خورشید مەدۆ شۆڵەی تاو و تین
نە شەتاو مەندەن پەرێ مورغاوی ... نە کۆ دیارەن پەی مورغ کاوی
یاران! یاوەران! کێ مەندەن وە هوش؟ ... کێ دیەن وە چەم، یا شنەفتە گۆش؟
کێ واچۆ ساڵێ چێ وەتەر بییەن؟ ... زەلالەت زوڵمەش نەحەد بەرشیەن
کەس جە وەرینان تەقریر نەکەردەن ... نمەبۆ ناوێ تا وەرۆی مەردەن

جارێک دەنگخۆشی بەناوبانگی کورد، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی ــ کە لە دۆستانی میرزا بووە ــ دەعوەتی لێ دەکا بۆ سنە بڕوا و ماوەیەک میوانی بێ. میرزا، وەک سەید دەڵێ، بڕوبیانوو دێنێتەوە. سەید عەلی ئەسغەر ئەم شیعرەی بۆ دەنێرێ:

مــــیرزا کافییـــــەن! مــــیرزا کافییــــەن! عـــورز و بەهانـــەت بـــێئینـــسافییەن
جــەم جەمــەن، ڕاســتی دڵ ئینتــزارەن زۆســـــان تــــەواوەن، وادەی بــــەهارەن
پـــەی ئامـــات مـــیرزا! ڕۆژشماریمـــەن جـــە دووریـــت بـــیللا بـــێقەراریمـــەن
ئەڵـــبەت مـــەواچی ســـنە ئیلاخـــەن بـــەڵام گوڵـــستان، بێـــسان و باخـــەن

تا لە کۆتاییدا دەڵێ:

بـــاقی وەســـــسەلام، ڕەفێـــق دنیـــام بـــۆ هـــاتنی تـــۆ ئیتـــر دڵـــنیام

ئەمەش وەرامی میرزا:

ئوستاد فەرەحبەخش! ئەولادەی ڕەسـوول! ســـەیید ســـەروەر! نیـــایش مـــەقبووڵ
نامــەی موبــارەک نیــام نــە ڕووی چــەم ئیــستقبالم کــەرد، چــەنی چــەن قــەدەم
فــەرەح وســت جــە نــاو دڵ خــەمبارم ســـارێژش کـــەردەن ئـــێش و ئـــازارم
ئومێـــدم ئێـــدەن جـــە لای لامـــەکان شـــادم بکـــەری بـــە داری جینـــان
ئومێـــدم بـــە تـــۆ، دانـــا و تـــەوانا! ڕەجـــام هانایـــە، ســـەدهەزار هانـــا

تا ئێژێ:

هـــا ئامـــام وەلات، ڕەفێـــق دیـــنم بـــاقی وەســـسەلام ئێـــدەن یـــەقینم

میرزا ئەسەدوڵا ساڵی ١٣٠٧ ک. م. پاش ٦٣ ساڵ ژیان، لە زێدەکەی خۆیا ماڵاوایی لە دنیا کردووە.

کتێبی دەسنووسی *گوڵزاری ئەسەدوڵا خان*،
ئامادەکردنی موحەممەد سەعیدی مەجیدی.

## موفتی زەهاوی

عەللامەی تاقانە، مەلا موحەممەد، نازناو «فەیز»، کوڕی مەلا ئەحمەد، کوڕی حەسەن بەگ، کوڕی ڕوستەم بەگ، کوڕی کەیخوسرەو بەگ، کوڕی ئەمیر بابا سولەیمان، لە عەشیرەتی بابان، ساڵی ١٢٠٨ ک. م. لە سلێمانی هاتە دنیا و ١٣٠٨[1]، پاش سەد ساڵ ژیانی پڕپیت، لە بەغدا دنیای بەجێهێشت.

عەللامە زەهاوی ماوەی ٨٠ ساڵان دەرسی گوتووە و ٣٨ ساڵ موفتی بەغدا بووە و لە هەموو زانستە ئیسلامییەکاندا، تا پلەیەکی بەرز سەرکەوتووە.

بابی مەلا موحەممەد، خەڵکی سلێمانی و دایکی لە مەردمی زەهاو[2] بووە و بەو بۆنەوە ماوەیەک بە ماڵەوە

---

١. ڕستەی «غابَ نَجْمُ المَعالِم»، بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ١٣٠٨، کە ساڵی لە دنیا چوونی زەهاوییە.

٢. **زەهاو**: ناوچەیەکی کوردە لە نێوان «هورین» و «شێخان» و «قەسر»دا.

لە زەهاو ژیاون، بە زەهاوی ناوی دەرکردووە.

موحەممەد سەرەتا لای بابییەوە خوێندنی دەسپێکرد و دوایی، چەند ساڵ لە خزمەتی شێخ موحەممەد مەعرووفی نۆدێیی، بەیان و مەعانی و عەرووز فێر بوو. ئیمجا چوو بۆ هەڵەبجە و ماوەیەک لای شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی خوێندی و جا ڕووی‌کردە سنە و لە کۆڕی دەرسی عەللامە شێخ موحەممەد قەسیمی مەردۆخی (گەورە)، حیکمەت و کەلام و ڕیازی وەرگرت و لەوێشەوە چووە سابڵاغ (مەهاباد) و لای زانای بەناوبانگ، مەلا موحەممەد، ناسراو بە «ئیبنو ڕەسوول»، ڕیازی و هەیئەتی خوێند.

مەلا موحەممەد دوای تەواو کردنی دەرس و دەور، گەڕاوە سلێمانی و هێندێکی کەم لە مزگەوتی شێخ باباعەلی دەرسی گوتەوە و پاشان چووە کەرکووک و ماوەیەکی زۆر لەو شارە درێژەی بە کاری خۆی دا.

زەهاوی لە نێوان ساڵانی١٢٥٧ تا ١٢٦٠ ک. م. کۆچی کرد بۆ بەغدا و ساڵی ١٢٦٦، پێڕای پیشەی دەرس‌گوتنەوە، سەرپەرشتی کۆڕی مامۆستایانی بەغدای پێ سپێردرا و ساڵی ١٢٧٠ ک. م. بە شێوەی ڕەسمی، بوو بە موفتی بەغدا و تا دوارۆژی ژیانی لەو مەقامەدا مایەوە.

عەبدولباقی عومەری، شاعیری بەناوبانگی عیراقی، بۆ شاباش و پەسن‌دانی زەهاوی کە بۆتە موفتی بەغدا، ئەم دوو بەیتەی گوتووە:

قَدْ قِیلَ لی إذ رُحْتُ أنْشدْ عِنْدَ ما    شاهَدْتَ دینَ مُحَمَّد یَتَجَدَّدُ
فی مَذهَب النُّعمان بالزّوراء قَدْ    أفْتَی الإمامُ الشَّافعیُّ مُحَمَّدُ

**واتا**: بە منیان گوت: کاتێ چوویە بەغدا و دیتت کە دینی موحەممەد (د) گوڕ و گەشەیەکی تازەی پەیدا کردووە، قەسیدەیەک دانە و بێژە: وا ئیمام موحەممەد ئیدریسی شافیعییە کە لە بەغدا لەسەر کورسی فتوا دانیشتووە و لە مەزهەبی ئەبووحەنیفەدا فتوا دەدا.

شاعیر لەم دوو بەیتەدا ئاماژە بەوە دەکا کە فەقیهێکی شافیعی (زەهاوی)، لەبەر شارەزایی لە هەموو مەزهەبەکاندا، بۆتە ئیمامی حەنەفییەکانیش لە بەغدا.

شیاوی باسە زەهاوی پاش ماوەیەک، بۆخۆشی چۆتە سەر مەزهەبی ئەبووحەنیفەوە.

موفتی زەهاوی زۆر زیرەک و هێژا بووە و خودا بیرێکی یەکجار بەهێزی پێداوە؛ بە شێوەیەک کە هەرچێکی خوێندووتەوە، دەسبەجێ لەبەری‌کردووە. زیاد لە پایەی بەرزی زانستی، لە زبان و وێژەی عارەب و فارسدا، دەسەڵاتێکی تایبەتی هەبووە و بۆ قسەزانی و دەمپاراوی و شیعر هۆنین و پەخشان نووسین و هەروەها قسەملانێ، کەس تۆزی نەشکاندووە. زۆرێک لە زانایانی لەزەبری سوننە یان شیعە، کە چوونەتە مەیدانی کێشە و بەربەرەکانێ ئەدەبی و زانستی مامۆستاوە، هێندەی نەخایاندووە، داریان لە دەس داکەوتووە و دۆڕاویانە و لەو هەموو هێزی بەڵگەهێنانەوە و زەبری زبانە، سەریان سووڕ ماوە. بۆخۆی لەم بارەوە، لە شوکرانەبژێریدا گوتوویە:

فکـــــری دقیــــقٌ فــــی العلــــوم لأنَّـــــهُ          دارَت عَلَیــــه رَحـــــی الجــــدال ســــنینا

**واتا**: له زیرەکی و وردی و زانیاریدا، خاوەن پلەیەکی بەرزم؛ چونکوو زۆر ساڵان هزر و بیری مـن لـە ژێـر تەوژمی بەردەئاشی وتوویژ و قسە بەزۆرانداني زانستی و ئایینیدا، بارهاتووە.

مـوفتی زەهـاوی پیـاوێکی پارێزکـار، لـەخـواترس، خێرومەنـد، مرۆدۆسـت و غەریبـدار بـووە و ئـەوەی دەسی‌کەوتووە، زۆرتری بە هەژاراندا بڵاوکردۆتەوە. لە پشتەسەر گـوتن خـۆی پاراسـتووە و قـەت خراپـەی کەسێکی نەگوتووە. فـەقێ و قوتابییـەکی زۆر لـە کـۆڕی دەرسـیدا پێگەیـشتوون و زانایـانێکی گـەورە لـە بەردەستیدا هەڵکەوتوون. کەسانی وەک: شێخ عەبدورڕەحمانی قەرەداغی، مەلا عەبدوڵڵای پیرەباب، مەلا عەلی قزڵجی تورجانی، مـەلا موحەممـەدی کوانەدۆڵـی، سـەید عەبـدورڕەحمانی نـەقیبی بەغـدا، شـێخ عەبدولوەهابی نایب، شێخ حەسەنی قەرەداغی و شاعیری بەناوبانگ، مەلا موحەممەدی مەحوی، ئیجازەیان لێ وەرگرتووە.

زەهاوی منداڵانێکی هێژاشی بارهێناوە. یەک لە کۆڕەکانی، فەیلەسووف و شـاعیری بـەناوبانگ، جـەمیل سیدقی زەهاوییە کە لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین.

ئەگەرچی موفتی زەهاوی بە بۆنەی کـاری زۆری ئـایینی و زانـستی و سـەردانی بـێ‌پـسانی خەڵـکەوە، کاتێکی وای بۆ نەماوەتەوە شیعر بێژێ، بەو حاڵەش جاروبار بەیتێک، قەتعەیـەک یـان غـەزەلێکی جـوان و ناسکی هۆنیوەتەوە؛ کە کۆ نەکراونەتەوە و بە پەرژ و بڵاوی ماونەتەوە. لێرەدا هێندێکیان دەخەینە بەرچاو:

**فارسی**:

رسید اینـک غـرور مـردم نـاکس بـدانجایی          که بیند خویش را هـر خَـرمَگس از عُجب، عَنقـایی
گمارد خویش را هـر ذرّەی نـاچیز، خورشـیدی          شمارد خویش را هـر قطـرەی بـی‌قـدر، دریـایی
هزاران در جهان جالوت هست و نیست داوودی          فراوان بر زمین فرعون هـست و نیـست موسـایی
همه گم‌کرده راهیم و نباشـد در جهـان خـضری          همه کُـور و کَـر و لالـیم و پیـدا نیـست عیـسایی
هـــزاران آزر بُتگـــر عیاننـــد و خَلیلـــی نیـــست          بـود چـون نَیْنَـوا هـر شـهر و نبـود ابـن‌مَتّـایی[1]
از ایـن اوضـاع نـاهموار بـی‌هَنجـار مـی‌ترسـم          خوشا می‌یافتم «فیضی» در این گنبد دگـر جـایی

* * *

در فکر شَرحه شرحه دلا همچـو شـانه بـاش          آسـان نمـی‌تـوان سـر زلـف سُـخن گرفـت

* * *

خـوش آنکـه جـان و رَه بـسپاریم و بـسپریم          یعنـــی کـــه عاریـــت بگـــذاریم و بگـــذریم

---

١. **ابن‌مَتّی**: واتا حەزرەتی یۆنس (د) کە ناوی بابی مەتتا بووە.

مــا را مُیَــسَّر ار نــشود دیــدن نگـــار لَــوحی ز صــورتش بنگــاریم و بنگــریم

* * *

دلا عهدی است چون بلبل در این گُلزار می‌نـالم گه از بی‌مهری گُل، که ز جور خار مـی‌نـالم

میـان نالـه‌ی مـا نیـست چنـدان فـرق ای بلبـل تو بر رُخسار گُل، من بر گُل رخسار مـی‌نـالم

**عەرەبی:**

بــانَ لــی فــیالْمــرْآت شــیخٌ کَبیــر عـــاشَ حَتّـــی تَعَـــرَّفَ الأحـــوالا

قُلْـــتُ: کَـــمْ عـــشْتَ؟ قـــالَ: تـــسْعینَ عامـــاً قُلْـــتُ مـــاذا فَعَلْـــتَ فیهـــا؟ فَقـــالا:

أکَـــــلات دفعتهـــــا فَـــــضُلات وَ شُــــــرُوباً أرَقْتُهـــــا أبْـــــوالا

وَ ثیابـــــاً لَبـــــسْتُها فـــــاخرات جُــــدُداً، قَــــدْ نَزعتُهـــا أســــمالاً

* * *

اُضــیفَ الــدُّجی مَعْنــیً إلــی لیــل شَــعْره فَطــالَ فَلَــولا ذاکَ مــا خُــصَّ بــالجَرِّ

و حاجِبُـــهُ نُـــونُ الوقـــایَـــة مـــا وَقـــت علــی شــرطها فعْــلَ الجُفُــون مــنَ الکَــسْر

* * *

یــا رَبّ حـــارَتْ فـــی ثَنـــاکَ عُقُـــولُ مـــاذا عَـــسی فیـــکَ العُقُـــولُ تَقُـــولُ

إنَّ الوُجُـــودَ ثَنـــی عَلیـــک بأسْـــره فَثَنــاءُ أهْــل الفَــضْل فیــکَ فُــضُولُ

وێنەیەک لە پەخشانی عەرەبی زەهاوی کـە پەسـندێکە بـۆ قەسـیدەیەکی شـاعیری نـاوداری عـیراق، عەبدولباقی عومری و تێدا چەند ئایەتی قورئانی، وەکو شایەت هێناوەتەوە:

«... اَللّهُ أکبرُ، اُنْظُروا اُدَباءَ الأمصار، وَ اعْتَبرُوا یا أولی الأبصار، هَلْ قامَت القیامةُ أمْ کَشفَها لَنـا فـی الـدُّنیا عَلی وَجْه الکَرامَة، شَیخُ الشُّعَراء السَّری، حضرةُ عبدالباقی اَفندی العُمری، مَتَّعَنا اللهُ ببَقائه، و عـادَ عَلینـا مـنْ بَرکات إنْشاده وَ إنْشاءه فَإنَّهُ أطْلَعَ هذه القصیدة فَإذا الشَّمسُ کُوّرَتْ، وَ أبدَعَ مَعانیها المَصیدة فإذَا الوُحُوشُ حُشرَت، وَ نَظَمَ کَلمَها فإذا الکَواکبُ اَنْتَرت، و وقر البحر الخَفیف بها فَـإذا البحـارُ سُـجّرتْ، تُتْلـی رقیقَـةُ الألفاظ، علی قاسیَة القُلُوب الغلاظ، فإذا الجبالُ سُیِّرَتْ، یَسْمَعُها الأولیاءُ وَ الاعداءُ فاذا الجَنَّة اُزْلفَـت، و إذا الجحیمُ سُعِّرَتْ، ثُمَّ خَمَّسَها فَجُمعَ الشَّمسُ وَ القَمَر وَ قَرَنَ ـ لله درُّهُ ـ بَیْنَ الدَّراری وَ الدُّرر، انَّ هذه لَکَـرامَـةٌ اُوثرَ بها لا سحرٌ یُؤثَر»

**بەرهەمەکانی زەهاوی:**

١. نامیلکەیەک لەمەڕ جەبر و ئیعتیزالەوە و لێکدانەوەیان لەگەڵ بیر و بۆچوونی سوننەدا.

٢. وەرگێڕانی نووسراوەکانی ئیمامی ڕەببانی (شێخ ئەحمەدی فاروقی سەرهیندی) لە فارسییەوە بۆ عارەبی.

لە موفتی زەهاوییان پرسیوە: بەم هەموو زانستەوە، چۆنە کتێبێکـی واتـان نەنووسـیوە؟ بـە هاتـە جـوابی

داوەتەوە:

عـــاق تدريـــسی عـــن التَّـــاليف لکـــن مـــا أنـــا مـــنْ فَـــضل ربّـــی مُتأسّـــف
مـــــنْ تَلاميـــــذیَ أَلَّفـــــتُ کتابـــــاً کُـــلُّ سَـــطر منْـــهُ فـــی العلْـــم مُؤلَّـــف

**یانی**: ئەگەر دەرس گوتنەوە بوو بە هۆی ئەوە دەرفەتێکم بۆ نووسین نەمێنێتەوە، خـەم نـاخۆم و چاکـەی خودا سەبارەت بە خۆم بە کەم نازانم. ئەمن لە ژیانمـدا قوتابییـانێکم بارهێنـاوە کـە هـەرکام بەرامبـەر بـە کتێبێکی وان کە هەر دێڕێکیان زانستێکە.

جارێک والی بەغدا، ساعەتێکی زێڕ پێشکەشی موفتی زەهاوی دەکا. چەنـد کەسـێکی کۆڕەکـە ـلەبـەر ئێرەیی ـ بە تەوس و توانجەوە هەڵدەدەن: ساعەتی زێڕ و موفتی! زەهاوی دەسبەجێ جواب دەداتەوە:

زَلْـــزَلَهُم ســـاعَــــــةٌ اُوتیتُهـــا زَلـزَلَــةُ الـسَّاعَــة شـیءٌ عَظـیم

کە دێنە دەرەوە، کرێکارێک بە بارەدارێکەوە لە سەر شـان، دێتـە ڕێگایـان. بـانگی دەکـا و سـاعەتەکەی دەداتێ. ئەمجار ڕوو دەکاتە هاوڕێیانی و ئێژێ: ئەگەر دیارییەکەی والیم بەسـەریدا نـەداوە، بـۆ ئـەوە نـەبوو بیکەمە دەستم؛ نەمویست بەخۆدا بشکێتەوە.

*مفتی زَهاوی*، شیخ مُحمّد خال، بغداد، ١٣٧٣ ک. م. *البیتوشی. تاریخ سُلیمانیه*، ل ٢٥١. گۆڤاری *یادگار*، تاران، س٣، ژ٩، گولانی ١٣٢٦ ک.هـ. ل٦٤ تا ٦٨.

## ئامانوڵای فەرهەنگ

ئامانوڵای فەرهەنگ، لە خێڵی کوردی بیگوەند، خەڵکی ناوچەی کولیایی لای کرماشان، پیاوێکی وێژەوان و شاعیرێکی خۆش‌سەروزمان بووە و ساڵی ١٣٠٨ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

ئەم بەیتە هی ئەوە:

مـن ز جفـای رقیـب، خـون‌جگـر و بـی‌طبیـب درد مرا چاره نیست، دارو و درد از خداست

*گلزار اَدب*، تهران، ل ١٠٠.

## عەبدولقادیری هەمەوەند

مەشهوور بە «فەقێ قادر»، کوڕی کوێخا ڕەسووڵ، کوڕی جوامێر، کوڕی یادگار، لە خێڵی هەمەوەنـد، ساڵـی ١٢٤٧ ک. م. لە ناوچەی بازیانی کوردستان هاتە دنیا و ساڵی ١٣٠٥، پـاش پێـنج سـاڵ و نیـو زینـدان لـە کەرکووک و دووساڵ لە مووسڵ یان بەغدا، لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، لەگەڵ خێـڵەکەی، بـۆ شـاری بینغازی لیبی تارێنرا و ساڵی ١٣٠٨ ک. م. هەر لەوێ دنیای بەجێ‌هێشت.

قادر لە قوتابخانە دینییەکاندا خوێندوویە و مرۆیەکی بەئیمان، حـەق‌بێـژ و دروسـتکار بـووە و زۆر جـاران

گازندەی لە زۆربێژی و ناحەقیکاری دەسەڵاتداران کردووە و بەم بۆنەوە ساڵانێکی زۆر لە زیندان خـراوە یـان بۆ دوورەوڵاتان تارێنراوە.

فەقێ قادر مرید و دەروێشی عارفی پایەبەرز کاک ئەحمەدی شێخ بووە و لە شیعرەکانیدا زۆر جاران پەسنی داوە.

لەم شاعیرە ساڵی ١٩٨٠ ز. دیوانێک بە تێکۆشانی زانای بەڕێز، مامۆستا مەلا کەریمی بیارە لـە چـاپ درا کە بریتییە لە حەوت بەش: ١.هێژایی مرۆ ٢.پەندی زانایان ٣. بڕوای ئیسلامی ٤. میعراجنامە ٥. پەسن‌نامـە ٦. جەبری و ئەشعەری ٧. جونگ‌نامەی بەهار و زستان.

شیاوی باسە فەقێ قادر نازناوی خۆی، جار-جار «فەقێ» و جاروبار «دەروێش» نووسیوە.

**ئەمەش چەند شیعری فەقێ دەروێش :**

موغـــەننی! ســـازێ، موغـــەننی! ســـازێ
نــــەڕووی ئیلتفـــات دەس‌دەر نەســـازێ

جـــەی بـــەزم وە ئاهـــەنگ ســـادەی ئـــاوازێ
جـــە نـــەزم حیجـــاز بکـــەر ئاغـــازێ

دڵـــــەی خـــــەمبارم خـــــەیلێوەن خـــــەجڵ
تەئـــسیر دەنگـــت ئەســـەر کـــۆ نـــە دڵ

فــدات بــام ســاقی هــا زومــرەی عوشــشاق
داریم ئیحتیـــاج پـــەی تـــەکلیف شـــاق

کــەچ‌کــەر عــەرەقچین، زولفــەین بەڵاوکــەر
عەینـەین مەسـتت هـەم سورمەسـاوکەر

پڕکــــــەر پیاڵـــــە، بنمـــــا جەماڵـــــت
وە حەنا ڕەنـگ‌کـەر پەنجـەی شمـشاڵت

بـــا نەشـــئەی بـــادە نـــە ڕای حـــەقیق بـــۆ
ڕەنگش چـون لـەبان لـەعلت عـەقێق بـۆ

مـــوترب! ســـا بەرزکـــەر نـــەوایێ هـــەنی
«لا یَعْقَـلْ» کـەر دڵ نـەی دونیـای دەنی

خـــامۆش کـــەر کـــوورەی فیکـــر و خەیاڵـــم
ڕەوشـــەن کـــەر مینـــای زیهـــن زەڵاڵـــم

بـــا گـــوش نـــە ســـەدای ئـــاوازەخوان بـــۆ
نەشـــیب و فـــەراز جـــە لام یەکـــسان بـــۆ

یەکڕەنگ بام نەی مەی، مەدهۆش بام نەی دەنگ
مەنقووش بام چون نەقش نەققاش نە ڕووی سـەنگ

بفـــەرما «فـــەقی» بـــەســـەن ئـــەی ناڵـــە
بنۆشـــــە نـــــەی بـــــەزم ســـــەر و پیاڵـــــە

بەڵـــکم نـــە هیممـــەت ئینعـــام دڵـــبەر
شـــادبام وە حـــوزوور شـــای هومـــایوون‌فـــەڕ

* * *

نامەکـــــەی ئـــــازیز، ڕافیـــــع یاوەنـــــا
تەئـــسیرش کـــــوورەی دڵـــــم تاوەنـــــا

جـــەرگ زوخاڵـــی کـــەرد، دەروونم وە تـــەم
تاســـــەی دیـــــدارت تـــــازە بی دەمدەم

خەیاڵـــم هەریەنـــد جـــە لات بەســـتەن کـــۆ
وەختـــەن فـــانی بـــام جـــە خـــەیاڵ تـــۆ

ئـــەمما مەنـــدەنان نـــەی حاڵـــە حـــەیران
هـــەرگا مـــەیلت بـــۆ، دڵ مـــەبۆ گـــران

ئـەر سـەرد بـێ مـەیلت، سـەرد مـەبۆ ئـاهم
بـــە یـــەخ مـــەمانۆ ســـفتەی ســـیاهم

بـــەلام مـــەیلت بـــۆ، تـــا مەنـــدەن نەفـــەس
بەس نییەن بە مەیل تۆ مـەبۆن قەقنـەس

«فــەقی» دڵ هــا شـــەوق تەئـسیر نامــە ئەســەر کــەرد نەشـئەی «یَـوْمُ القیامَــە»

* * *

عیـــد قوربانـــەن، نــــەزاریم قوربـــان! قوربـــانی بـــە غـــەیر یـــەک ڕۆح ڕەوان

ئـــــەر قەبووڵــــتەن مــــەگیر بەهانــــە چـــون یـــاران نیـــسار وێم کـــەم ڕەوانــە

ئـــەوا بـــەن خـــەیلێ ئەرکـــەری قیـــساس بەڵ جە کوورەی نار فیرقەت بام خـەلاس

تاکـــەی دڵ بـــە خـــار میحنـــەتان ئێـــشۆ قامــەت تاکــەی بـار خەجـڵەتان کێـشۆ

قوربـــان! «فـــەقی» دڵ تەفرەقـــەن خـــەیلێ یا قوربـانیش کـەر، یـا پـێش‌دەر مـەیلێ

* * *

ئـــاهووی تـــەتاران! ئـــاهووی تـــەتاران! دەلیلـــەی ســـەررەم، ئـــاهووی تـــەتاران

لـــەیلای عـــەرەبوار، شـــای وەفـــاداران وەفات مەجنوون وست نە پـای کۆسـاران

بۆ زەرڕەی نە عیـشق مـەجنوون بکـەر مـەیل بـــاوەر بـــە خـــاتر وەفـــاداری لـــەیل

بنمـــا جەماڵـــت ئـــاهووی ســـەر ڕوەیـــل قەیس کەر بە مـەجنوون سـەرهەردەی دوجـەیل

جـــەلادەر تـــوڕڕەی تـــوغرای شـــاماران وەفات مەجنوون وسـت نـەپای کۆسـاران

دانگـــێ شـــەو مـــانۆ کـــەژاوە کـــەر بـــار وەرنـە کـۆچ ناقـە نـاق کـەر جـە قـەتار

پـەی دیـدەنی قـەیس سـادەی جـان‌نیـسار ڕوو نـە جەبـەل کـەر بـێ‌سـەبر و مـەدار

وەش‌دەمـاخش کــەر وە بــۆی ڕەش‌مــاران وەفات مەجنوون وست نە پـای کۆسـاران

قامـــــەت وە قـــــەبای زەڕنگـــــارەوە هـــەر هـــای نـــە خـــەیاڵ کـــارزارەوە

ڕوو وەش بـــەو ســـاتێ وە لای یـــارەوە جەهـــد قـــەیـــست بـــۆ نـــە پێـــوارەوە

بنـیش چـەنی قـەیـس نـە سـای مـەغاران وەفات مەجنوون وست نە پـای کۆسـاران

نـە تـوی شەبـستان مەسـقەڵ‌دەر جـەبین گـوش‌دەر وە ناڵـەی قـەیس دڵ‌حـەزین

بگـیر نـە ئـاغۆش جـێش مەکـەر نـەفرین مـــاوەر بـــەیانـــە ئـــەغنام مـــسکین

بکـــەر غـــەمخواری شـــای دڵ‌ئـــەفگاران وەفات مەجنوون وست نە پـای کۆسـاران

چـڵ‌چــەنگ وە گیـسووی تـازە شـوورەوە قەیس بەیۆ جـە نەجـد بەڕیـەی دوورەوە

کاســـەی پـــڕ نـــە «مـــاءُ الطّهـــور»ەوە بـــدەر بـــە دەســـتش وە ســـوروورەوە

تەســـکین‌دەر وە دەرد دڵـــەی هـــەژاران وەفات مەجنوون وسـت نـەپای کۆسـاران

یاشـا هـەر شەخـسێ وەی تـەور دڵـدار بـۆ شـیرین شـێوە بـۆ، لـەیلێ ڕەفتـار بـۆ

مـــەحفووز گەزەنـــد دیـــدەی بـــەدکار بـــۆ چـــون لـــەیل وەریـــن هـــەر پایـــدار بـــۆ

هـــەر مـــانۆ بـــە شـــاد پـــەی دەردەداران وەفات مەجنوون وست نە پـای کۆسـاران

پێشەکی و دیوانی چاپی شاعیر. جونگێکی دەسنووس.

## قازی کاشتەری

مەلا موحەممەد ئەمین، لە مامۆستایانی هێژای سەردەمی خۆی بووە کە لە گوندی «کاشتەر»ی ناوچەی بێڵەوار، دەرسی گوتۆتەوە و دادوەری کردووە. بابی ڕەحمەتیم ـکە پوورزایشی بووـ سەرەتا ماوەیەک لای ئەو خوێندبووی و زۆر جار باسی پارێزکاری و دروستکاری و هەروەها شارەزایی لە فیقهدا دەکرد.

ئەم مامۆستایەساڵی ١٣٠٩ ک. م. لە کاشتەر کۆچی دوایی کردووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## عومەر ئەفەندی ئەربیلی

عەللامە عومەر ئەفەندی کوڕی ئەبووبەکر ئەفەندی، لە زانایانی هەڵبژاردەی سەردەمی خۆی بووە کە خوێندنی لای عومەر ئەفەندی خێلانی تەواو کردووە و پاشان لە مزگەوتی جامیعەی قەڵای هەولێردا ـکە باوکیشی مامۆستای ئەوێ بووەـ دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکردووە.

عومەر ئەفەندی پیاوێکی دارا بووە و خەرجی قوتابخانە و قوتابییانی وەئەستۆ گرتووە. یەک لە زانایانی موجازی کۆڕی دەرسی مامۆستا، مەلا عەبدوڵلای دشییە؛ کە لە جێی خۆیدا باسی ئەویش دەکەین.

کۆچی یەکجاری عومەر ئەفەندی ساڵی ١٣٠٩ ک. م. ڕوویداوە.

بیرەوەرییەکانی نووسەر.

## فیکری کوردستانی

لە شاعیرە ڕەوانبێژ و هێژاکانی کۆتایی چەرخی سێزدە و سەرەتای چەرخی چاردەی کۆچی بووە کە بە زبانی سۆرانی شیعری گوتووە و لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

**شیعری ئەون**:

چەمەن چۆڵ بوو لە ئارادا نەما گوڵ شین نەکەم چی‌بکەم؟
لیباسی ئیرسی مەجنوونی بەبەر خۆما نەکەم چی‌بکەم؟

لە کەللەمدایە سەودای سونبولی زولفی پەرێشانی
بە یادی عەشقی ئەو مەشقی پەرێشانی نەکەم چی‌بکەم؟

ئەگەر ئەو شۆخە بێتە سەر فرۆشی ماچی لێوی خۆی
لە بازاری مەحەبەتدا بە ڕۆح سەودا نەکەم چی‌بکەم؟

مەتاڵای خەتتی تۆ سەعبە لەبەر شـەمعی ڕوخـت قوربـان

هەموو شەو تا سبەینێ زیهنی تیژم کول نەکەم چیبکەم؟

ئەوەنـد تەشـنەلەبـە دڵ بـۆ شـەرابی غـەمزەیی سـاقی

بە دەریای عیلمەوە گەر ڕوو لە مەیخانە نەکەم چیبکـەم؟

کە جیلوەی دا لەسەر سەفحەی گوڵی ڕووت شەبنەمی ئەسرین

لە سەرچاوەی دڵم تۆفانی خوێن جاری نەکەم چیبکـەم؟

شەرابی وەسڵی تو زەحمەت دەچێتە سەر لەبی «فیکری»

بە ئابی وەسفی حوسنت لێوی وشکم تەڕ نەکەم چیبکەم؟

* * *

خوێن لە چاوانم خورۆشاوە و فەوارەی بەستووە | جارێ نابێ بێتە سەر ئەم حەوز و جۆگـە و کانییـە

چاوەکـانی کاڵـە، لێـوی ئاڵـە، خاڵـی ماوییـە | کاکە تۆخوا پێبڵێ: بۆ پەنجەکەی خوێناوییـە

ناڵەناڵی «فیکری»یە وا خەڵقی خـستە زەلزەلـە | یا نە خۆ حەشری گونەهکارە، وەهـا هاوارییـە

جونگێکی دەسنووس.

## قازی عەبدولفەتاحی ساباڵاغی

پیاوێکی زانا و وێژەوان لە بنەماڵەی قازییەکانی ساباڵاغی مـوکری (مـەهاباد) بـووە کـە سـەری بردۆتـە نـاو سیاسەت و میرمەزنی نواندووە و بەو بۆنەوە گیراوە و ماوەیەک لە تاران، لە زیندان خراوە. کاتی زیندان، ئـەم شیعرەی بۆ ئەتابەکی ئەعزەم نووسیوە:

کمـانابـرو گمـان بـردی کـه مـن سام نریمـانم | کشیدی زیر زنجیرم، مکان دادی به زنـدانم

نَیَم یوسف، مرا جا دادی انـدر گوشـه‌ی زنـدان | و یا یعقوب، مأوی باشد اندر بیت‌الاحـزانم

حدیث أکرمُوالضیف از نظرهـا محـو شـد گویـا | اگر من عاصیم، آخر به اهـل شـهر مهمـانم

مَـنم آن بلبـل شـیدا، کـه جـایم بـود گُلـشنها | کنون چون جُغدها جا داده‌ای در کُنج ویـرانم

ز نوک خامه‌ام می‌ریخـت دائـم لُؤلُـؤ و مرجـان | کنون خون می‌چکد هـر صـبح و شـام از نـوک مژگـانم

اگـر چنـدی بُـدم سـالک میـان نـاجی و هالـک | ستمها دیده بودم بـر کـسان و ایـل و اَقـرانم

اگر با حبس من سامان پذیرد کار این کشور | ندارم شکوه‌ای من، جان فدای خاک ایرانم

نبود اندر سرم هرگز هـوای سرکـشی، آخـر | چرا ماندن به کُنج حبس همچون سعد سـلمانم

اگـر خـود اشـتباهی کـرده‌ام از راه ناچـاری | بفرما چاره‌ای کُـن درد را، مـن خـود پـشیمانم

دەڵێن قازی فەتاح پاش ماوەیەک بەو مەرجە لـە تـاران دەرنەکـەوێ، بـەردراوە و سـەرەنجام لـە کۆتـایی

دەکانی چەرخی چواردە، لەو شارەدا بەشی لە دنیا براوە.[1]

بیرەوەرییەکانی نووسەر.

## مەلا عەوڵای پیرەباب

لە زانایانی پایەبەرز و مامۆستایانی بەناوبانگی خەڵکی ئوتەمیشی لای مەهابادە کە پاش دوایی هاتنی دەرس و دەور و وەرگرتنی ئیجازە لە کەسانی وەک مەلا موحەممەد ئەفەندی (خەتێ) و موفتی زەهاوی، گەڕاوەتەوە سابڵاغ و تا کۆتایی ژیان لە مەدرەسەی «هەباساغا»دا کاری دەرس‌گوتنەوە بە قوتابیان و ڕێنوێنی خەڵک بووە.

پیرەباب زیاد لە زانستی ئاسایی مەلایان، هندیسە و جەبر و بەگشتی بیرکاری (ڕیازی) زۆر باش زانیوە و مامۆستایەکی کەموێنەی ئەو ڕۆژگارە لەم زانستانەدا بووە و تەنانەت زانایانی هاوچەرخی، گیروگرفتیان لای ئەو بردووە.

مەلا عەوڵا نووسراوەی زۆری ـ لە کتێب و نامیلکە و پەراوێز ـ لەمەڕ زانستە جۆراوجۆرەکانەوە هەیە؛ وەک: پەراوێز بۆ «*جواد*»، شەرحی «*خُلاصةُ الحساب*»، پەیوەست بۆ «*فرائض تُحفه*» لە فیقهدا، پەراوێز بۆ «*اُصول اُقلیدُس*»، پەیوەست لەسەر «*شرح اُسطُرلاب بیرجندی*» و کتێبێک لەمەڕ هەیئەت و هندیسەوە.

کۆچی دوایی ئەم مامۆستایە ١٣٠٩ و ١٣١٨ ک. م. نووسراوە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٤٦. *سالنامەی فرهنگ مهاباد*.

## موحەممەد سەعید پاشا

کوڕی سلێمان (نەزیف)ی ئامیدی (دیاربەکری)، وێژەوانێک بووە مێژووزان لە باکووری کوردستان بە نازناوی «سەعید»، کە لە ماردین و چەند پارێزگای تر، پارێزگاری کردووە.

زا و مەرگی سەعید پاشا، ساڵانی ١٢٤٨ ک. م. لە دیاربەکر و ١٣٠٩ لە ماردین نووسراوە.

**لە کتێبەکانی**: «*تبصرةُالانسان*» بە ترکی، «*خُلاصةُ المَنطق*»، «*مِراةُ الصّحّه*»، «*مِراةُ العَبر فی التّاریخ*» لە چوار بەرگدا و «*میزانُ الاَدَب*».

*هدیّةُ العارفین*، ب٢، ل٣٩٢.

## میرزا ڕەزای کەلهوڕ

میرزا موحەممەد ڕەزا خەتتات، کوڕی موحەممەد ڕەحیم بەگی سەردەستە سواری کەلهوڕی کرماشان، لە

---

١. بەپێی فەرمایشی مامۆستا هەژار، قازی فەتاح لە یەکەم شەڕی جیهانی (١٩١٣-١٩١٨ ز.) لە مەهاباد شهید بووە.

ناودارانی خۆشنووسی و هونەرمەندانی گەورەی شێوەی نەستەعلیق بووە کە ساڵی ١٢٤٥ ک. م. هاتۆتە دنیا و سەرەتای لاوی، بەدەم خوێندنەوە، سواری و تیرەنازیش فێربووە و کاروبـاری عەشایەریـشی دەسـپێکردووە و جاروباریش بە بۆنەی زەوق و لێهاتوویییەوە، دەستێکی بۆ قەڵەم بردووە و مەشقێکی کردووە.

میرزا کە لە خۆیدا دیوە ببێتـە خۆشنووسـێکی گـەورە، پێـشەکی لای مـیرزا موحەممـەدی خـۆش‌نڤیـسی خانساری، شاگردی ئاقا موحەممەد مەهدی تارانی، لە هۆنەرمەندانی بەناوبانگی خـەت، مەشـق دەکـا و پاشـان خەتی مامۆستایانی پێشوو، بەتایبەت میرعیماد، ئەکاتـە سەرمەشـقی خـۆی و بـۆ دەسـت‌خـستنی ئـەو وێنـە دەسنووسانە، چەند سەفەر بۆ قەزوێن و ئەسفەهان دەڕوا و مەشقێکی زۆر لەڕووی سەردەرکی حەمامێکی قەزوێن و کەتیبەی میرفندرسکی ئەسفەهان دەکا؛ کە ئەو دووە لە باشترین نموونە خەتەکانی میرعیمادی قەزوێنین.

میرزا ڕەزا دوای ئەوە لەم هونەرەدا دەبێتە مامۆستای هەرەبەرز و بێ‌قسەی زەمانی خـۆی و ناوبـانگی بـە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە، بە فەرمانی ناسرەدین شـای قاجـاڕ (١٢٤٦-١٣١٣ ک. م.)، لـە مەزرینگـەی «*انطباعات*»، لە بەردەستی موحەممەد حەسەن‌خانی سەیفوددەولەیا دادەمەزرێ.

میرزا ڕەزا پیاوێکی خاوەن هەست، پاکداوێن، دڵپاک و میوان‌ڕاگر بووە و هێندەش گوێی بۆ دنیا و مـاڵ و سامانی دنیا شل نەکردووە. یەکجار کەیفی بە هونەرەکەی هاتووە و قەت لە نووسیندا ئاگـای لـە مانـدوویی نەبووە. شاگردانێکی هەڵکەوتە وەکوو: حاجی مەهدی مازندەرانی، ئاقا مورتەزا نەجم‌ئابادی، میرزا عەبدوڵـلا خانی موستەوفی گورگانی و هەروەها میرزا زەینولعابدینی شەریفی قەزوێنی، ناسراو بە «*مَلِکُ‌الخَطّاطین*» و سەید موحەممەدی «*صدرُالکُتّاب*»ی بارهێناوە.

ئەوی لە شوێنی دەست و پەنجەی هونەرمەندی کەلهوڕ ماوەتەوە، بێجگە لەوانەی لای دۆستانی داناوە و بە دیاری پێیانی داوە، هێندێک ڕۆژنامە و کتێبی چاپین کە بە نیازی خۆی یان لەسەر داخوازی کەسانی تر نووسیونی و لە تاران بە چاپی بەردینەی ئەو سەردەمە لە چاپ دراون و بریەتین لە:

١. بەشێک لە ڕۆژنامەی «*شَرَف*».
٢. دوازدە ژمارە لە ڕۆژنامەی «*اُردوی هُمایونی*».
٣. سەفەرنامەی دووهەمی ناسرەدین شا بۆ خوراسان.
٤. کتێبی «*مَخزنُ الانشاء*»، کە هەڵبژاردەیەکە لە نووسراوەی هێندێک لە هونەرمەندان.
٥. کتێبی «*فیضُ الدُّموع*»، نووسراوەی میرزا ئیبرایمی تارانی، کە ساڵی ١٢٨٦ لە تاراندا چاپ کراوە.
٦. «*مُنتَخَبُ‌السُّلطان*»،هەڵبژاردەی ناسرەدین‌شا لە شیعری حافظ و سەعدی، بە خەتی میرزا.
٧. چەند بەش لە «*سفرنامەی کربلا*»ی ناسرەدین شا.
٨. «*نَصایح المُلوک*».
٩. «*مُناجات خواجه عبدالله انصاری*»

١٠. بەشێک لە «*کُلّیّات قاآنی*».

ژیانی میرزا لە مانگیٚ تمەنێکی شاگردەکانی و سیٚ-چوار تمەن حەقی چاپ بەڕێوە چووە و مانگانە سەرجەم پازدە تا هەژدە تمەنی داهات هەبووە.

میرزا زەوقی شیعریشی بووە و جاروبار شیعری گوتووە.

ئەم هونەرمەندە گەورە، سەرەنجام لە وەباکەی ساڵی ١٣١٠ ک. م. تاراندا، تووش بووە و ڕۆژی هەینی، ٢٥ی موحەڕڕەمە مانگی ئەوساڵە، لە ٦٥ساڵاندا، ئەمری خوای بەجیٚهێناوە و لە زیارەتانی حەسەنابادی تاراندا نێژراوە.

گۆڤاری *یادگار*، تهران، س١، ژ٧، آذر ١٣٢٣ک. ه.

## شێخ ڕەزای لۆنی

حاجی شێخ ڕەزای حوسەینی، کوڕی شێخ موحەممەدی ئەسکەندەری، لە سەیدە پایەبەرزەکانی «لۆن» لە ناوچەی بێڵەوارە کە دوای کۆچی دوایی بابی، جێگای گرتۆتەوە و بۆتە گەورەی خێڵ و بە خۆوخدەی باش و ئاکاری بەرزی، خزمەتێکی زۆری بە خێڵەکەی کردووە و لە سەردەمی ئەودا، سەیدەکانی لۆن، ئاسایش و هێمنایەتییەکی تەواویان هەبووە.

شێخ ڕەزا پیاوێکی زانا، پارێزکار، جوامێر، میوانخوەشەویس، پشوودرێژ و مەزن بووە و بۆ جێبەجیٚ کردنی کاری خەڵک و تەکیەداری، ناوی دەرکردووە و هەروەها لە لۆندا قوتابخانەی ئایینی دامەزراندووە و توانیویە زۆرێک پەرە بە خوێندن و زانست بدا.

حاجی شێخ ڕەزا پیاوێکی عارف بووە و زۆربەی کاتی بە عیبادەت و ڕیازەت ڕابواردووە و سەرەنجام ساڵی ١٣١٠ ک. م. دنیای بەجیٚهێشتووە و لە سەرقەبرانی لۆنیان ناشتووە.

*تاریخچەی سادات لۆن.*

## مەلا حەسەنی بەزاز

پیاوێکی وێژەوان، هێژا و پارسا لە کوردانی شاری مووسڵە کە لە ناوەڕاستەکانی چەرخی ١٩ی زایینیدا ناوبانگی دەرکردووە و دەوری ساڵانی ١٣١٠ و ١٣١١ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

دیوانی شیعرە عەرەبییەکانی مەلا حەسەن ساڵی ١٣٠٥ ک. م. بە تێکۆشانی یەک لە شاگردانی بەناوی موحەممەد شەیسی جەوانمەردی مووسڵی ـ بە چەن شیعری خۆیشی لە پاشەرۆکیدا ـ لە قاهیرەدا چاپ کرا.

بەپێی ئەوە کە مەلا حەسەن لە شیعرەکانیدا زۆر باسی سۆفیگەری کردووە و پەسنی خاوەن تەریقەتەکانی داوە، وێدەچیٚ بۆخۆشی ئەهلی تەریقەت بووبیٚ.

**دوو نموونە لە شیعری مەلا حەسەنی بەزاز:**

ئەم دوو بەیتەی لە خۆشەویستی خودای تاکی توانا و ئاکارچاکیدا نووسیوە:

لـئن لـم یکـن فـی الـصالحات مشـوبـة وَ لَـیْسَ علَـی العـصْیان منْـهُ عقـابُ،

لَطاعَتُـهُ عنْـدی نَعـیمٌ وَجَنَّـةٌ وَ عـصْیانُهُ قَبـلَ العَـذاب، عَـذابُ

**واتا**: ئەگەر کاری باش و خراپ، پاداش و جزیاشی نەبێ، هەر بەڕێوەبردنی فەرمانی خوا بۆ من بەهەشتە و لەڕێ لادانی ئێش و ئازارە.

ئەم قەتعەشی بە هۆی بارینی بەفر سۆڵەی سەرمای ساڵی ١٢٢٧لە مووسڵدا هۆنیوەتەوە:

تَجَلّـی عَلَیْنـا عـارضٌ غَیْـرُ مـاطر وَ لکنَّـهُ بـالثَّلج عَـمَّ نَواحیـا

فَأصـبَحَت الخَـضْراءُ بَیْـضاء قَـدْ زَهَـت وَ عـادَتْ رُباهـا و البطـاحُ کَواسـیها

و کَـمْ بَـسْطَتْ منْـهُ یَـدُ البَـرْد وَ الـشِّتا بـساطاً عَلـی وَجْـه البَـسیطَة باهیـا

وَ کَـمْ جَبَـل راس یَقُـولُ: مُفـاخراً أَلَـم تَنْظُـرُوا قَـدْ عَمَّـمَ الـثَّلجُ راسـیا

فَقُلْـتُ بـه إذْکـانَ شـاذاً وُقُوعُـهُ لیَـذْکُرَهُ مـنْ بَعْـدُ مَـنْ کـانَ باقیـا

غَمـامٌ بکـانون بَـدایا مُؤَرّخـاً «حَبـا مـصْرنا بَـرْداً مـنَ الـثَّلج زاهیـا»[1]

**واتا**: هەورێک سێبەری خستە سەرمان کە بارانی پـێ نـەبوو؛ بـەفرێکی دابارانـد، هـەموو وڵاتی داگـرت. هەرکوێ سەوزەڵانییەک هەبوو، سپی هەڵگەڕا. هەموو دەشت و دۆڵ و بەرز و نزم، بوو بـە ژێـری بـەفرەوە. دەڵێی شاخە بەرزەکان بە فیزێکەوە ئێژن: نابینن چۆناوچۆن سەرما، سەرمانی مێزەر پێچاوە؟!

ئەمن کە شتێکی وا دەگمەنم بینی، بەیتێکم دانا کە داهاتوان مێژووی لەبیر نەکەن. لـە مـانگی کانوونـدا هەورێک هەڵسا و بە شارەکەمان دیارییەک لە بەفری سپی و بریقەداری دا.

*آدابُ العربیّة فی القرن التّاسع عشر*، بیروت، ١٩٢٤ ز. ل١٠٥.

## موحەممەد ئەمین ئەفەندی

لە عەشیرەی زەندی ناوچەی کفری (سەلاحییە)ی سەر بە مەڵبەندی کەرکووکە و ساڵی ١٢٢٦ ک. م. لـە بەغدا هاتۆتە دنیاوە. پێشەکی لای باوکی خوێندوویە و پاشان لە کـۆڕی دەرس و دەوری مامۆسـتایانی ئـەو سەردەمەی بەغدا، ئەوپەڕی بەهرەی بردووە و ئیجازەی وەرگرتووە. ماوەیەک جێگری قـازی بەغـدا بـووە و هێندێکی پێ نـەچووە کراوەتـە مـوفتی بەغـدا؛ بـەڵام لـەم مەقامەشـدا زۆر نەماوەتـەوە و بـە دەسـتووری نامیق‌پاشای والی، جێ خۆی داوەتە زانای بەناوبانگ، موحەممەد ئەفەنـدی فـەیزی زەهـاوی و خـۆی بۆتـە

---

١. ئەم لەتە بەیتە بە حیسابی ئەبجەد ئەبێتە ١٢٢٧، بەرامبەر بە ساڵی هاتنی ئەو بەفرە لە مووسڵدا.

نوێنــەری عــیراق لــە پەرلــەمانی نایبــەکانی دەوڵــەتی عوسمانیــدا و چۆتــە ئەســتەمبووڵ. کــە سوڵــتان عەبدولحەمید (١٢٩٣– ١٣٢٦ ک. م.) دەرکی ئەو پەرلەمانەی داخستووە، بۆتە ئەنــدامی کــۆڕی نوێنــەرانی دەوڵەتی و تا دوا کاتی ژیان (ساڵی ١٣١١ ک. م.) ئەو کارەی هەبووە.

موحەممەد ئەمین ئەفەندی شەرعزانێکی ئاگا و زانایــەکی وریــا و ســەردەرچوو لــە کاروبــاری ڕامیــاری و کۆمەڵایەتی و قانووندا بووە. ماڵ و سامانێکی بەرچاوی دەسکەوتووە و زۆرتر بۆ خەڵکی خــەرج کــردووە. بــۆ وێنە، مزگەوتێکی جوانی لە بەغدا کردۆتەوە کە بە جــامیعی «کــەیها»[1] ناســراوە و چەنــد پارچــە زەویوزاری وەقفی کردووە. بێجگە زمانی کوردی، عەرەبی و ترکی و فارسیشی باش زانیــوە و هێنــدێک نووسراوەشــی بەم چەند زمانە هەیە؛ وەک کتێبێکی گەورەی مێژویی کە بۆخۆی لە بەغدا، بە چاپی بەردینە لەچاپیداوە.

لــە زاروزێچــی ئــەم مامۆســتایە، ئێــستاش کەســانێکی هەڵــکەوتە و ناســراو، لــە ئەســتەمبووڵ و بەغــدا، کاربەدەستن و بە «کەیها»یان دەناسن.[2]

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٤١.

## وەحدەتی کرماشانی

تاماسبقولی خان، کوڕی ڕۆسەم خان، ناسراو بە «وەحدەت»، لە خانەکانی هۆزی کــەلهوڕی کرماشــانە کــە ساڵی ١٢٤١ ک. م. لەو شارە لە دایک بووە و کە پێگەیشتووە، سەرف و نەحو و مەنتیق و کەلام و مەعانی و بەیانی لە قوتابخانەی حاجی شەهبازخان خوێندووە و ئەوجار ڕێگای عیرفــان و ســۆفیگەری گرتۆتــەبــەر و ماوەیەک سەری بە میرزا حەسەنی کرمانی سپاردووە. پاش گەڕانەوە لە سەفەری عەتــەبات، بــۆ هەمــەدان چووە و خزمەتی ئاخووند مەلا وەلیولا ـکە شوێنگری حوسەینعەلیشا بووەـ گەیشتووە و چەند ســاڵ لــەوێ بە سەیر و سولووکەوە خەریکی شۆردنەوەی ژەنگی دڵ بووە و کە مورشیدەکەی کۆچی یەکجاری کــردووە، بەرەو تاران چووە و لەوێ ماوەی ٣٠ ساڵان لە مزگەوتی ئاغا مەحموودی کرماشانی، ڕاهێنــانی خوازیــارانی وەئەستۆ گرتووە و سەرەنجام ساڵی ١٣١١ ک. م. گیانی جیهانی بەجێهێشتووە و لەشی لــە ســەرقەبرانی ئیبنوبابوەیهـ جێی گرتووە.

وەحدەت شاعیرێکی باشە و زۆربەی شیعرەکانی بە شێوەی غەزەلن و باسی خاوێنکردنــەوەی نــەفس و خۆشەویستی خودایە. ئەوا دوو نموونە لە شیعرەکانی:

آتــش عــشقم بــسوخت خرقــەی طاعــات را　　　ســیل جنــون در رُبــود رخــت عبــادات را

---

١. **کەیها**: وشەیەکی ترکییە، بە مانای نوێنەر.

٢. «کَیها» وشەیەکی ترکیە؛ واتا بریکار، وەکیل.

مــسألەی عــشق نیــست در خــور شــرح و بیــان
به که به یـک سـو نهنـد لفـظ و عبـارات را

دامن خلوت ز دست کَی دهد آن کُو که یافت
در دل شــــبهای تــــار ذَوق مُناجــــات را

هــر نَفَــسم چنــگ و نــی از تــو پیــامی دهــد
پَــی نَبَــرد هــر کــسی رَمــز و اشــارات را

جــای دهیــد امــشبم، مــسجدیان! تــا سَــحَر
مَــستم و گُــم کــردەام راه خرابــات را

دوش تَفَـرج کُنـان خـوش ز حَـرَم تـا بـه دیـر
رفــتم و کــردم تمــام ســیر مقامــات را

غیــر خیــالات نیــست عــالم و مــا کــردەایــم
از دم پیــــر مُغــــان رفــــع خیــــالات را

خــاک‌نــشینان عــشق بــی‌مَــدَد جبرئیــل
هــر نَفَــسی مــی‌کننــد سَــیر ســماوات را

در ســر بــازار عــشق کَــس نَخَــرد ای عزیــز
از تو به یک جَو هزار کشف و کرامات را

«وَحدت» از این پس مَده دامن رنـدان ز دست
صَـرف خَرابـات کُـن، جملـەی اوقـات را

* * *

زاهد خودپرست کُو تا که ز خود رَهانَمش
دُرد شراب بیخودی در خُم هُو چَشانَمش

گر نَفَسم بـه او رسـد، در نَفَسی بـه یک نَفَس
تا سَر کُوی مَی کَشان، موی کَشان کَشانَمَش

زُهــدفُروش خودنمــا تــرک ریــا نمــی‌کنــد
هر چه فسون دمیدمش، هر چه فسانه خوانَمَش

هـر چـه بـه جز خیـال او قـصد حَریم دل کنـد
دَر نَگُــشایمش بــه رُو، از دَر دل بــرانَمَش

گر شَبَکی خُوش از کَرَم دوست دَرآیـد از دَرَم
ســر کُنَمَش نثـار ره، جـان بـه قَـدم فـشانَمَش

تذکرەی شُعَرای کرمانشاه، ل١٤٢. سالنامەی نادر، س١٣٣٨ک. ه.

## شێخ عەبدوڕڕەحمانی مەردۆخی

کوڕی شێخ جەمالەدینی دووەمی مەردۆخی سنەیی، زانایەکی دەمپاراو، خۆش‌قسە، کۆڕڕازێن و لە کێـشەدا هەڵکەوتە ناوی لێ براوە و ئەگەرچی دادوەری کردووە، زۆرتر وازی لە دوورەپەرێزی و عیبادەت بووە و ساڵی ١٣١٢ ک. م. پاش ٦٥ ساڵ ژیان، بە بێ‌منداڵ لە دنیا چووە.

شێخ جاروبارە شیعریشی گوتووە و ئەم غەزەلە هی ئەوە:

فرَنگــی‌زادە یــارا دلبــری ســیمین‌عذارســتی
دُو اَبرو تیغ و مژگان تیر و خود آهـو شعارسـتی

مُسلمان‌روی و کافرموی و عنبربوی و آتـش‌خـو
غَــضنْفروار و عاشــق‌خــوار ودل‌آزار یارســتی

تو ملک عشق را بـانی، بـه خـوبی یوسـف ثـانی
رُخَـت خجلـت ده مـانی، سـلیمان اقتدارسـتی

سَمای حُسن را مـاهی، بـه شـهر دلبـری شـاهی
غلط گفتم، نه چون ماهی، تـو مـاه تاجدارسـتی

حبیب وصـل و هجرانـی، طبیـب درد و درمـانی
به حکمتهای یونـانی، تـو اکنـون پـردەدارسـتی

یَمیــنم آب رنجــوری، یَــسارم بــاد مهجــوری
به سر شد خاکم از دُوری، به جـانم همچـو نارسـتی

| | |
|---|---|
| غُـــلام دلبـــر جانانـــه و مینـــای صـــهبایم | مَرا با دانش بی‌سود و بی‌حاصل چه کارستی |

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ عەبدوڵڵای مرادوەیسی

لە سەیدەکانی «تاوەگۆز» و خزمی شاعیر و ویژەوانی بەناوبانگ، مەلا عەبدوڕڕەحیمی مەعدوومی (مەولەوی کورد)، پیاوێکی پارێزکار، جوامێر و لێهاتوو بووە و تەریقەی نەقشبەندی لە پیری تەریقەت، شێخ عوسمان سیراجەدین لە تەوێڵێ وەرگرتووە و کە ئەو پایەبەرزە عەمری خوای کردووە، مریدی شێخ بەهائەدین و شێخ زیائەدین بووە.

شێخ عەبدوڵلا لە گوندی «کیوەڕێ» ژیاوە و ساڵانێکی زۆر لەوێدا خەریکی ڕێنوێنی و ئامۆژگاری خەڵک و دەرس‌گوتنەوەی قوتابیانی ئەو ناوچە بووە و لە شمێران و تاوەگۆزدا، خەڵکێکی زۆر سەریان پێ سپاردووە و لە ئاکامدا، ساڵی ١٣١٢ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە و لە زیارەتانی «کڵاوسوور»دا نێژراوە.

*یادی مەردان*، ب٢، ل ٤٩٨.

## جونوونی

میرزا حەسەن، نازناو «جونوونی» و ناسراو بە «حەسەن کەنۆش»، لە تایفەی «دەلو» کە لقێکی هۆزی زەنگەنەیە، لە دەورانی دەسەڵاتی موحەممەد پاشای جاف (مەرگ ١٣٠٨ ک. م.)دا ژیاوە و لە شیعرەکانیدا زۆری بە چاکە باس دەکا.

لە جونوونی هێندێک شیعری جوان و ڕەوان بەجێ‌ماوە کە زۆرتر سۆفیانەیە؛ ئەوا نموونەیەکی:

| | |
|---|---|
| دڵـــە! هۆشـــت بـــۆ، دڵـــە! هوشـــت بـــۆ | دنیـــا مەویـــەرۆ دڵـــە! هۆشـــت بـــۆ |
| غافـــل مەنیـــشۆ، هـــۆش و گۆشـــت بـــۆ | بەڵـــکەم خـــواوەن خەتاپۆشـــت بـــۆ |
| هـــەتا مـــەتاوی بلاڵـــە پـــەی وێـــت | بەڵـــکەم خـــواوەن ڕەحـــم کـــەرۆ پێـــت |
| بناڵـــــە وەزار، بلاڵـــــە و جـــــەخت | بترسە نە جای مـەئوای سـەنگ سـەخت |
| نـــە یـــار نـــە یـــاوەر ســـوودێ نـــەدارۆ | ئـــاهیر چـــون ســـێلاو وەنـــەش مـــەوارۆ |
| ئـەوجار چـێش کـەردەن لـەو جاگـە تەنگـدا | ئەوسـا وە ناچـار سـەرمەین وە سـەنگدا |
| بـــۆ وە لوتـــف وێـــش بوەخـــشێ «حەســـەن» | بەدی «جونـوونی» تبـدیل کـا ئەحـسەن |

زا و مەرگی میرزا حەسەنی جونوونی ساڵی ١٢٦٠ و ١٣١٤ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٥٤. گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ١٠، ل ٢١١ و ٢١٢.

## شێخ موئمینی مەردۆخی (سێهەم)

کوڕی شێخ جەمالەدینی مەردۆخی، ساڵی ١٢٤١ لە سنە هاتۆتە دنیا و بەرەبەیانی هەینی، ١٩ی ڕەجەبە مانگی ساڵی ١٣١٤ ک. م. لە دنیا دەرچووە.
شێخ عەبدولموئمین پیاوێکی زانا و وتاربێژێکی قسەزان و بەتوانا بووە و زانستە ڕیازییەکانی یەکجار باش زانیوە و ماوەی ٥٢ ساڵان بەرنوێژی جومعەی شاری سنە بووە. هەروەها کتێبێک بە ناوی «*رَدُّ النَّصاری*» لێوە بەجێماوە.

*تاریخ مردوخ.*

## حاجی قادری کۆیی

هەستیاری نەتەوەیی، حاجی قادر، کوڕی مەلا ئەحمەد، لە هۆزی زەنگەنە، ساڵی ١٢٣٧ ک. م. لە گوندی «گۆڕقەرەج»ی سەر بە شاری کۆیە، هاتۆتە دنیا و منداڵێک بووە، بابی عەمری خوای کردووە و دایکی لەبەر هەژاری و بە ناچاری، کۆچی کردۆتە کۆیە؛ بەشکوو لەوێ کار بکا و ژیانیان بەڕێوە بچێ.

قادر لە کۆیە دەچێتە قوتابخانەوە و دوای خوێندنی سەرەتایی، دەبێتە فەقێ لە مزگەوتێک و شان لە خوێندنی ئایینی شل ئەکا و پاشان بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەی، دەچێتە ناوچەی خۆشناوەتی و لەوێشەوە ماوەی چەن ساڵان، زۆر گوند و شار و شارۆچکەی کوردستان، وەک: هەولێر و سلێمانی و سەردەشت و سابڵاخی موکری (مەهاباد) و شنۆ دەگەڕێ و لە قوتابخانەکانیاندا دەخوێنێ و لە ئاکامدا ئیجازە وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە کۆیە.

یەک لە دۆستانی نزیک و هاوحوجرەی حاجی قادر، مەلا عەبدوڵڵای جەلی کۆیی و یەکێکی تر «کەیفی» شاعیری جوانڕۆیی بووە کە بۆ شوێنگرتنی خوێندنەکەی، چۆتە کۆیە و حاجی دیوە و بەو بۆنەوە کە هەردوو شاعیر و ڕوانگەشیان لێک نزیک بووە، زۆر زوو بوونەتە دۆستی گیانیگیانی و پاش ماوەیەک کە کەیفی لەبەر بەرهەڵستی خانەکانی کۆیە، ناچار بووە بەدزییەوە ئەوێ بەجێبێڵێ و بچێ بۆ هەولێر، حاجیش ـ کە لەگەڵ خێڵی سۆفییان هەڵینەکردووە و ژماریشیان لە کۆیە کەم نەبووە ـ وای بە باش زانیوە بە شوێنیدا بڕوا و لە هەولێر یەکیان گردۆتەوە. دوای ماوەیەک پێکەوە چوونەتە ڕواندز و لەوێش هێندە سەریان نەکردووە و ساڵی ١٨٥٤ ز. ڕێی ئەستەمبووڵیان گردۆتە بەر. کەیفی لەوێ حقۆق دەخوێنێ و حاجی دوای ئاشنا بوون لەگەڵ بنەماڵەی بەدرخانیان، دەبێتە مامۆستای منداڵانی بەدرخان پاشا.

حاجی قادر هەستێکی بەتین و ئەوینێکی ئاورینی بۆ زێد و نیشتمان و زمان و نەتەوەکەی هەبووە و بەتایبەت کە بەدرخانییەکانی ناسیوە، ئەم ئاورە لە دەروونیدا، ڕۆژ لە دووی ڕۆژ زیاتر بڵێسەی ساندووە و بەهێزتر بووە. کاتی دەسەڵاتداری ملهوڕانەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، بۆتە ئەندامی کوڕی

ئازادیخوازانی کورد و تا دواکاتی ژیانی، بۆ پەرە دان بە بیری ئازادیخوازی و هاندانی لاوان بۆ خەبات لە ڕێی ئازادی و سەربەخۆیی و دەرچوون لە ژێر باری گرانی ژێردەستی و بێ دەسەڵاتی، زۆری حەول‌داوە و شیعری ئاورین و هەستبزوێنی زۆری داناوە.

شیاوی باسە ناوبانگی حاجی قادر و پلە و پایەی بەرزی لە ناو شاعیرانی کورددا، زیاتر لەبەر هەستی نەتەوایەتی و کارکردنی لەسەر هزر و بیری گەلی کورد و بەتایبەت لاوانەوەیە تا بڕستی وێژەیی شیعرەکانی.

سەرجەمی ئەشعاری حاجی، لای ئەمیر عەبدوڕڕەززاق بەگی بەدرخانی بووە و کاتێ کە ئەمیر لە شاری مووسڵدا بەدەستی جەیشی عوسمانلی گیراوە و شەهید کراوە و ماڵی بە تاڵان براوە، دیوانەکەی حاجیش لەو تاڵان و ماڵانەدا لەناو چووە. دوایی لەملاو و لەولا، هێندێک لەو شیعرانە کۆ کراونەتەوە و ساڵی ١٢٤٤ ک. م. لە بەغدا چاپ کراون.

حاجی قادر قەت ژنی نەخواستووە و بە سەڵتی ژیاوە[1] و سەرەنجام ساڵی ١٣١٢ یان ١٣١٤ ک. م. لە تەمەنی ٧٧ ساڵاندا، لە شاری ئەستەمبووڵ، بە یەکجاری دەستی لە دنیا بەرداوە.

حاجی قادر ئەگەرچی بۆخۆشی نازناوی «حاجی» هەڵبژاردووە، بەڵام حەجی نەکردووە. وێدەچێ لەبەر ئەوە لە مانگی زیحەجەدا هاتۆتە دنیا و وەک پێشوو لە کوردەواریدا باو بووە، بۆ مبارەکی «حاجی»یان پێ گوتووە.

**چەند شیعری حاجی قادری کۆیی**:

ئەی بێ‌نەزیر و هەمتا! هەر تۆی کە بەرقەراری — بێ دار و بێ دیاری، بێدار و پایەداری
بۆ باغی مەردی باغی، سەرمایەکەی خەزانی — بۆ مەزرەعەی فەقیران، سەرمایەکەی بەهاری
جەبباری بێ‌فوتووری، سولتانی بێ‌قوسووری — ڕەززاقی مار و مووری، ئاودێری دێمەکاری
فەیرووزە تەختی گەردوون مەسنووعی نەقشی تۆیە — یاقووت و لەعلی ڕۆژە، ئەستێرەکان دوراری
جێی و مەکانی تۆیە، بێ‌جێی و بێ‌مەکانی — لەیل و نەهاری تۆیە بێ‌لەیل و بێ‌نەهاری
هەر ئەمری تۆ مەدارە، بۆ کار و باری عالەم — هەچەندە بێ‌وەزیر و بێ‌سەدر و بێ‌موشاری
سەحرانەوەردی شەوقت خورشید و ماهی تابان — دوو جارییەن شەو و ڕۆژ بێ‌مەحمیل و عیماری
مەعلوومە بۆچی «حاجی» مەدحت دەکا بە کوردی — تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری

**پاژێکی شیعرێکی ئامۆژگاری**

هەتا وەک ئاگری ژێر کان لەگەڵ یەک — ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان بە پووشەک

---

١. خۆی دەڵێ: «هەر منم ئێستە وارسی عیسا بێ ژن و ماڵ و بێ کوڕ و ماوا»

لـە گـوێ گـا نوسـتوون بۆیـێ کـە ڕیـوی ... لەسەر ئێوە وەها شێلگیرە وەک سـەگ

سـەلاحی ئێـوە ئێـستاکە سـیلاحە ... تەماعی گەورەیی بێ‌چەک نەکەن نـەک

**بۆ ئەوانەی بایەخ بە زمانی زگماکی خۆیان نادەن و پێی قسە ناکەن**

ئەگـەر کوردێـک قـسەی بـابی نـەزانی ... موحەقـەق دایکـی حیـزە و بـابی زانی

وەرە بـا بـۆت بکـەم باسـێ نیهـانی ... تەفـەننـون خۆشـە گـەر چـاکی بـزانی

«صـلاحالـدّین» و «نُورالـدّین»ی کـوردی ... عـەزیزانی جزیـر و مـووش و وانی

«مهلـهل»، «اردشـیر» و «دَیـسم»ی شـێر ... «قوبـاد» و «بـازومیر»ی ئـەردەلانی

ئەمانـە پاکیـان کـوردن نهایـەت ... لەبـەر بـێ‌دەفتـەری ون بـوون و فـانی

کتێـب و دەفتـەر و تـاریخ و کاغـەز ... بـە کـوردی گـەر بنووسـرایێ زمـانی

مـەلا و پـیر و شـێخ و پادشـامان ... هـەتا مەحـشەر دەمـا نـاو و نیـشانی

**بەشێک لە غەزەلێکی حاجی**

کە هەستا قامەتی بـەرزی لـە فـەرقی تـا وەکـوو ئـەرزی ... پەریـشان زولفـی سـەد تـەرزی بەیەکـدا دارژاو و لـەرزی

حەیای چوو چەتری تاوس، بارەگاکەی شەعشەعەی ڕۆژێش ... کەمەندی توهمەتن، زنجیری داود، گورزی گوودەرزی

هەڵیدا زولفی چەوگانی کـورەی خورشـیدی دا بـەر شـەق ... لەوێدا چەند مەلایەک بوون سـەمایان کـرد لـەسـەر ئـەرزی

موریدان مەست و سەرخۆشن لە نەشئەی بـادەیی دەسـتی ... مەلایەک جوملە بێ‌هوشن بە نـازی چـاوی پـڕڕەمزی

مـورادی مـن، موریـدی خالیـسە، خەییاتییـە کـاری ... پەری ڕەنگ، ماهروو، ئاهوو نیگاهە، «حاجییـە» تـەرزی

*شیعر و ئەدەبیاتی کوردی*، بەغدا، ١٩٤١ ز. *مێـژووی ئـەدەبی کـوردی*، ل٣٠٩ تـا ٣٢٨. *مـشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٠٠ و ١١١.

## غەمناکی دووەم

دوو کەس لە شاعیرانی کوردی زەنگەنە، بە نـاوی «غـەمناک»ەوە ناسـراون: یەکـەم موحەممـەد ئاغـا یـان غەمناکی گەورەیە کـە سـەرەتا نازنـاوی «زەبـوونی» و پاشـان «غـەمناک»ی هەڵـبژاردووە و پێـشتر باسـی ئەویشمان کرد.

غەمناکی دووەم کە خەڵکی گوندی «قەیتوول»ی سـەر بـە هـۆزی زەنگەنـەی لای کەرکووکـە و ساڵـی ١٣١٤ک. م. پاش ٧٥ ساڵ ژیان لە دنیا چـووە، لەگـەڵ مـەلا فـەتاحی جـەبباری شـاعیردا، دۆسـتایەتی و ئامۆشۆی هەبووە و ئەم چەند بەیتە بەشێ لە پارچە هەڵبەستێکە بۆ ئەوی نووسیووە:

فەتتاح فتنەی لەیل، فەتتاح فتنـەی لـەیل ... فـەتتاح مـەفتوون فتنـەی بـاڵای لـەیل

فەتتاح عەین لەیل، مەست وە سـورمە کـەیل ... تۆش کەردەن وەک قـەیس پـەی هـەردەی دوجـەیل



لـە عیـشوەی شـیرین ئـەو حـۆریشـێوە
فامـــت لێویـــان بـــەدتر بیـــت لێـــوە

حـــەقت وە دەســـەن فـــەتتاح فـــەهیم
وارس جاگـــەی ئەرەســـتووی حـــەکیم

هامـــدەرد بـــەهرام نمـــەدپۆش چـــین
فـــەرهاد کۆکـــەن دێوانـــەی شـــیرین

مـەواچان چـەنی ئـەو لـەیل پـڕ مـەیل
سـەد تانـە مـەدۆ لـە زولـەیخا و لـەیل

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ١٣ و ١٤.

## شێخ حەسەنی قەرەداغی

شێخ حەسەن، کوڕی شێخ عەبدوڵڵا، کوڕی شـێخ عوسمـان، کـوڕی شـێخ لـەتیفی گـەورەی مـەردۆخی قەرەداغی، لە بنەماڵەی زانیاریدا بارهات و لە هـەموو زانـستەکانی ئـەو سـەردەمەدا شـارەزاییەکی تـەواوی دەسکەوت و سەرەنجام ڕۆی بۆ بەغدا و لە خزمەتی مەلا موحەممەدی فەیز (مـوفتی زەهـاوی) ئیجـازەی وەرگرت و ئەوجار گەڕاوە قەرەداغ و دەرس‌گوتنەوە و ڕاهێنانی فەقێیانی دەسـپێکرد. چەنـد سـاڵ لـەوەدوا ڕۆیەوە بۆ بەغدا و چۆناوچۆن بوو، حەولی دا بڕواتە کفری. هـەر واشـی لـێ هـات و بەشـێوەیەکی ڕەسمـی ناردرایە ئەوشارە و دەرس‌گوتنەوە لە قوتابخانەیەکی کفری پێ سپێردرا و تا دواساڵـی ژیـان (١٣١٥ ک. م.) لەو شارە ئەو کارەی لە ئەستۆ بوو.

هێندێک کتێب و نووسراوەش لە شێخ حەسەن بەجێماوە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل١٦٥.

## جەهانئارا

خاتوونێکی هێژا و وێژەوان، جوان و لەبەردڵان، کچی مەلا نەشئەتی پاوەیی بـووە کـە سـەرەتا مێـردی بـە عەلیئەکبەرخانی شەرەفولمولکی ئەردەڵان کـردووە و دوایـی کـە نێوانیـان تێکچـووە، لـێ جیـا بۆتـەوە و حەبیبەڵا خانی جافی بۆ هاوسەری هەڵبژاردووە.

ساڵی زا و مەرگی جەهانئارا خانم نەنووسراوە؛ بەڵام شک لەوەدا نییە کە تا بیستەکانی چەرخی چاردەی کۆچی ژیاوە. ئەمەش تەڵبژێرێک لە شیعرەکانی کە بۆ مێردی هەوەڵی نووسیوە:

قیبلـــەم دەمـــاخم، قیبلـــەم دەمـــاخم
نەمەنـــدەن، نییـــەن بـــەرزی دەمـــاخم

دوور جـە تـۆ پـەردەی دەروون داخداخـم
زەنجـــیر تەقـــدیر کـــەردەن یاســـاخم

کەمکـەم کـەردەن کـەم سـۆمای چـراخم
پـــەژموردەن غونچـــەی گوڵاڵـــەی بـــاخم

پەرگەنـــدەن کـــڵاف خەیاتـــەی دێـــزم
نمینـــەن نـــەرگس شـــەهلای خونـــڕێزم

زەردەن گـــوڵوەرەق گۆنـــای گوڵـــنارم
کەساســـەن توحفـــەی مایـــەی بـــازارم

لێلەن ئایەنەی جام جەمینم  قولاخین کالای بالای خەمینم

نارەواجەن لاڵ دورج یەمانیم  بێقوربەن گەوهەر نوقڵ نهانیم

ئازیزم یە گشت مەینەتباری تۆن  تانەی ئەغیاران گشت سەرکۆنەی تۆن

ئەرێ بێخەبەر بێباک جە ئەحواڵ!  ئەرێ تیرئەنداز وە ڕووی دانەی لاڵ!

تاکەی تۆ چەنی بەختم ناسازی؟  تاکەی های نە شۆن ڕای بەدمەجازی؟

تاکەی بنۆشۆ زووخ زام جەرگ  تاکەی بواچۆ ئەی خودا سا مەرگ

تاکەی ئەسرینم ئاوپاش خاک بۆ  تاکەی هەناسەم پەخش ئەفلاک بۆ

تاکەی بواچان وە دەشت و دەردا  تافتەی ڕسواییش کێشان وەسەردا

تۆخوا زەلیلی و زگاری تا چەند  توخوا خەمینی و خەمباری تا چەند

وەسوەسەی دەروون نیمەشەو تا کەی  جەنگ چەم تا سوبح چەنی خەو تا کەی

خوداوەند ئامان وەسەن دەردسەر  یا نەجات یا مەرگ یا وەسڵ دڵبەر

ئیتر نەمەندەن تەوانای تانە  جەی فێشتر عەزاب پەنەم مەنمانە

جە خەزانەی غەیب تۆ چێش مەبۆ کەم  پەروانە شاد بۆ، شاد وە شۆڵەی شەم

بوڵبوڵ نەکێشۆ هەنی جەفای خار  بێخەوف بگێڵۆ پەی وێش نە گوڵزار

بارێ ئازیزم! شای تیرئەندازان  سەردار سپای گەردەنفەرازان

دەروونم جە عەشق بالات قەقنەس بی  ڕۆحم چەنی ڕۆح پاکت پەیوەس بی

تا بە ڕۆی مەردەن یەکلا و یەکدینم  بزانە گیانم! گیان شیرینم

زندگی و مەرگم ئاما و لوای تۆن  حەواسم جەسەر تەفرەقەی ڕای تۆن

ماوام گەرمەسێر وەگەر ئێلاخەن  دەماخم وە بۆی هەوای تۆ چاخەن

تۆنی ئازیزم، تۆنی غەمخوارم  هەر تۆنی یاگەی گشت کەسوکارم

من پەی تۆ وێم کەرد مەحبووس شاران  مەحرووم جە سەیران بەرز کۆساران

پەی تو دەروونم پڕ نێش خارەن  سەد کۆ چون شاهۆ خەم و نەمبارەن

من بادەی حەسرەت هیجرانت وەردم  جەفات پەی من بی سەفات پەی مەردم

جەی وەر کێ بییەن یار دڵدارت؟  دیسان هەر ئەوەن شەفای ئازارت

خەدەنگ غەمزەی کام مەهروو بەردت؟  هەم بشۆ وە لاش پەی دەوای دەردت

جە یانەی خاڵی ئێمەت چ کارەن؟  دنیا گشت پەی تۆ مینا بازاڕەن

قیبلەم حەیفت کەرد جە من ویەردی  خەیاڵێ وەی تەور نە دڵ ئاوەردی

من جە عومر وێم نەی دنیای فانی  پام نەنیان وە بان ڕاگەی نادانی

چـــەتر نامووســـم جەســـەر ئەفراشـــتەن | پـــەردەی عیـــسمەتم هـــەر نگاداشـــتەن
بەرز مەکەر جـە لام سـەدای نـام و نـەنگ | شیشەی مەعسوومیم مەدەر وە ڕووی سەنگ
نـــە خـــودا بـــەردار، نـــە بەنـــدە ڕازی | نـە فتـوای شـەرعەن، نـە حـوکم قـازی
فدات بام پـەی چـێش پەشـیمانیت بـەرد | چەند سەوگەندت وەرد، چەند جار عەهدت کـەرد
ئـــەر بـــەیۆ جـــەلات ســـاتێ وە ساڵـــێ | وە بـــێ ڕەزای مـــن نەکـــەی خەیاڵـــێ
ئەر باخەن، ئەر مولک، ئەر گەنجەن، ئـەر مـاڵ | دەخڵش هەر بـە تـۆن داری کەمـەر لاڵ
خـــاترت جـــەم بـــۆ دڵ مـــەدەی وە دڵ | پـەی تـۆ ڕازیـان ئـی باغچـەی پـڕ گـوڵ

یاداشتەکانی نووسەر. *حدیقەی سولتانی*، ل ١٧٩.

## شێخ مەحموودی شووریجە

کوڕی شـێخ عەبدولعـەزیز، کـوڕی شـێخ مەحیـەدین، کـوڕی شـێخ حەسـەنی «گـڵەزەردە»، لـە گونـدی «ونەلەکە»ی ناوچەی «قەرەحەسەن»ی سەر بە شاری کەرکووک هاتۆتە دنیا و کـە پێگەیـشتووە، خوێنـدنی لای مەلا موحەممەدی قەرەکـەیی و مامۆسـتایانی تـر کۆتـایی پـێ هێنـاوە و دواجـار چۆتـە نێـو خێـڵی تەریقەتەوە و ماوەیەک لە خزمەتی عارفی بەناوبانگ، کاک ئەحمەدی سـلێمانی و سـەردەمێک لای شـێخ حوسەینی قازی بەرزنجی، تەریقەتی قادری وەرگرتـووە و بـە سـەیر و سـولووکەوە خـەریک بـووە و دوای وەرگرتنی ئیجازەی خەلافەت، خزمەتی زانستی و ئایینی دەسپێکردووە.

شێخ مەحموود مرۆڤێکی هێژا، کتێبخوێن و خزمەتگوزاری خەڵـک بـووە و لـە شـووریجە بـە یاریکـاری هەموانی، مزگەوت و تەکیەیەکی بنیات ناوە و سەرەنجام ساڵی ١٣١٥ ک. م. سەری یەکجاری ناوەتەوە.

**لە کتێبەکانی**:

١. «*الاشرفیّة فی اَنساب السّادةُ البرزنجیّه*»
٢. «*تحفَةُالاحباب*»، مۆچیاری
٣. تەفسیری چەند جزمی قورئانی پیرۆز بە فارسی
٤. «*عقاید اسلامی*»
٥.هۆنراوەیەکی فارسی لەمەڕ ناودارانی تەریقەتی قادرییەوە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٥٥٨ و ٥٥٩.

## مەلا ئەمینی موفتی سلێمانی

حاجی مەلا ئەمین، کوڕی مەلا ئەحمەدی چاوماری دێلێژەیی، مرۆیەکی زانا و هێژا، سـەردەرچووی بـواری

ڕامیاری، دوای کۆچی دوایی بابی، جێگای گرتۆتەوە و ساڵی ١٣٠٨ ک. م. بۆتە موفتی و لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، بە بۆنەی ئاکارچاکی و مرۆدۆستی و جووڵانەوەی پەسند لەگەڵ خەڵکدا، زیـاد لـەوە مەداڵـی مەجیدی پێ دراوە، ڕێزی تایبەتیشی لێ گیراوە.

مەلا ئەمین ساڵی ١٣١٥ ک. م. بەشی لە دنیا بڕاوە و هێندێک نووسراوەشی لێ بەجێماوە.

پێشەکی *دیوانی مەلا مەحموودی دیلێژەیی*.

## کەمالەدین عەبدولقادر

کوڕی مەحیەدینی سدیقی هەولێری قـادری، لـە زانایـان و هێژایـانی شـاری هـەولێر و شـاگردانی شـێخ عەبدوڕڕەحمانی تاڵەبانی کەرکووکی بووە کە ساڵی ١٣١٥ ک. م. لە شاری ئورفەی تورکیادا لە دنیا چووە.

ماموستا کەمالەدین ژیانی بە دەرس‌گوتنـەوە و توژینـەوە و نووسـینەوە ڕابـواردووە و ئـەم کتێبانـەی لـێ بەجێماوە؛ کە بەشێکیان چاپ بوون:

١. *حُجَّةالذاکرین*
٢. *تَفْریحُ‌الخاطر*
٣. *اَلطَّریقَةُ الرَّحمانیّه*
٤. *مرآتُ الشُّهُود فی بَیان وَحدَة الوُجُود*
٥. *حَدیقَةُ الازهار فی الحِکَم وَ الاسرار*
٦. *آدابُ المُریدین وَ نَجاتُ المُسْتَرشدین*
٧. *شرحُ اللَّمعَات فخرالدّین عراقی*

*هدیّةُ العارفین*، ب١، ل٦٠٥. *مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٣٢.

## بولبول

شێخ حەسەنی سازانی، نازناو «بولبول»، شاعیرێکی توانا و هاوچەرخی مەولەوی تاوەگۆزی بووە کە دڵـی لـە کچێکی چووە؛ بەڵام لەڕووی هەڵنەهاتووە بچێتە خوازبێنییەوە؛ تا سەرەنجام کچەکە داواکـارێکی تـری بـۆ هاتووە و مەولەوی لێی مارە کردووە. بولبول کە بـەم کارەسـاتەی زانیـوە، تـەواو تێکچـووە و بـە ئـازراوی و دڵئێشاوی هەڵیگرتووە و شیعرێکی سەرانسەر گلە و گازندە و تووک و نفرینی بۆ مەولەوی ناردووە؛ کە ئـەوا چەند بەیتی:

نیـــشانەی نـــاوک نیگـــای نـــازاران یانـێ سـەردەفتەر سـیای خـەمباران
وە غەلـەت مەشـهوور حـاڵزان دەردان پەی وێت وەرپاکـەر هەناسـەی سـەردان

نەتیجەی قیاس قەزیەی قەزای تۆ — تەدبیر چەند دڵ پەی ناڕەزای تۆ
بزیسکەی ناسوور دەرد جەستەی من — کزەی کولیای زام تۆژاربەستەی من
گەردەلوول گێج هەناسان سەرد — دوور نییەن وزۆت نە سەد گێج و دەرد
فەڵەک وەکوورەی مۆڕەی ساختەی دەرد — پەی تەفرەقەی وەسڵ بشانۆ یەک نەرد
وزووت نە گێجاو مەینەتان خەم — ڕۆی شادی، ڕووی وەسڵ نەوینی وە چەم
تا ئاوخانەی دڵ نە کەللە سەربۆ — ئانە شیرینەن، ئەوەڵ چەمەر بۆ
پەی گەرمی کوورەی مەیل دەرۆنت — هەناسەی سەردم ئاما ئەو شۆنت

مەولەویش وای جواب داوەتەوە:

چیشەن پەشیویم؟ ماتەمی دڵەن — یا کزەی ئامای نامەی بولبوڵەن؟
شاهید دانای گردین ئەحوالان — وەسەن پەی ڕاسی عەرزەی مەلالان
ئێش هامفەردم ئێش ویم زانان — دەرد هامدەردم دەرد ویم زانان
بەلام تۆ قەزا و بێتەدبیری وێت — کەردەن پێت ئانا هەرچی کەردەن پێت
کەی تۆ خەیاڵێت وە دەروون ئاوەرد — هانات کەرد ئەو من، من بێمەیلیم کەرد
تا تەئسیری بۆ پەرێ شەوناڵەت — یا پەی هەناسەی سوب دوعا و لاڵەت
گۆیا جە لاویت دەروونت ئێشان — بەد دوعاییت کەرد تەسدیعت کێشان
من ڕۆی مامەڵەی گردین خاس و کەس — جەو ڕاسەبازاڕ شارەکەی ئەلەس
جە سەر دوکانچەی شای سەر توجاران — هۆرگرتم کالای بەلای نازاران
نامان نە گۆشت مەی فەردەکەی من — فەرد وەش مەزموون بێگەردەکەی من
ئەر هەر سات دەردێ دەردێوتەر چەنی — بەیۆ ماچۆ ئاخ پەی دەردێ هەنی
یە کێوەن جە لام شادی و ڕەنجووری — کەیفی و بێکەیفی، نزیکی و دووری
مەر چون تۆ هەڵوای مەحەبەت خامێ — قەبای عەشق دڵ پشت ناتەمامێ
وەشی و ناوەشی تەفاوت زانۆ — مەلێ نەزانۆ، هەر پەلێ شانۆ
سا هەر دوعاکەر با چەرخ چەپگەرد — تا تاقەتش هەن هەر بشانۆ نەرد
من وزۆ ئەو دەرد ئەو نەو سەردی مەیل — ئەو ئەو قەبایل، من ئەوکۆی دوجەیل
خسوسەن، بولبول جەلای زامداران — دووری خاستەرەن نە وەسڵ یاران
پەوکە خۆ گرتەی بەلا و کۆسەنان — نزیکی بێزار، دووری دۆسەنان
نە کۆی نزیکی شادی وە بادم — نە دەورەی دووری وەیادش شادم

دیسانەکە بولبول لە جوابدا شیعرێکی هۆنیوەتەوە و بۆی ناردووە، کە ئەوا چەند بەیتی:

سەرشار سەرخوەش مەیخانەی ئەلەست
وەنەشئەی مینای دەس ساقی مەست

پابەستە وە سەید سەییاد مەعنی
فاریغ نە سوورەت فیرقەی «لایَعنی»

تا لە کۆتاییدا دەڵێ:

ئەر بێوەفایی وەر بێمەیلیت کەرد
جە بەدبەختی من، هەرچی بی ویەرد

ئەمما حەیف بولبول جە وێت هەراس کەرد
پەی تەنیا گوڵێ وێت کەس‌نەناس کرد

*یادی مەردان*، ب٢، ل٤١٨ و ٤١٩. *دیوانی مەولەوی*.

## مەلا ئەحمەدی کلاشی

مرۆیەکی هێژای خاوەن زانیاری لە کارو باری دەفتەر و دیوان و شاعیرێکی وردبین بووە کە دەمێک لە دیوانی میرانی ئەردەلانی، بەتایبەت عەلی‌ئەکبەرخانی شەرەفولمولکدا کاری کردووە و دەستی چووە و تا سەرەتاکانی چەرخی چارە ژیاوە.

بابەتی هۆنراوەیەکی مەلا ئەحمەد ئامۆژگارییە؛ کە ئەوا بەشێکی:

دڵە گوش بدەر، دڵە گوش بدەر
لادێ وە قەوڵم خاس خاس گوش بدەر

وەسوەسە و خەیاڵ نە خاتر بەرکەر
تاوا چون پەریت یەک‌یەک دەردسەر

با وجوود وێت خاستر مەزانی
چێشت کەردەن چێش نەی دونیای فانی

ڕاسەن جە ئەزەڵ یاگەی ڕۆحەنی
دەروازەی سوروور، ڕای فتۆحەنی

زاهیر جای خالس دین و ئیمانی
خەیر! شەریک بەزم نەفس و شەیتانی

جە وەخت تفلی هیچ نەبی ئاخت
نەبیم من دڵتەنگ بەرزی دەماخت

پات نیا نە ساڵ سن باڵغی
دڵە کەم‌کەم تۆ وە من بیت یاغی

جە ڕەفیقی ڕۆح مەیلت سەرد کەرد
سوجدە وە خاک پای دێو نەفست بەرد

نەفس ئەممارە حوکم میری بەرد
شەیتانیچ فەرمان وەزیری ئاوەرد

دڵە تۆیچ نامەی نادانی وەندی
بۆ وێت تەعلیقەی میرزایی سەندی

دڵە چەند تۆڕ دام نە ڕاکەی تەندی
چەند تۆم خەیاڵ پڕ و پووچ شەندی

شەیتان دا سەرمەشق دڵە تۆیچ وانات
منیچ کەردم مەشق فەرد تەقسیرات

دڵە شای ئیمان ماتەن نە شەش‌دەر
فڕ و فێڵ وەهمت بەستەن ڕای‌گوزەر

دوو سەردار ڕوخ سەخت ماتڵەن
نە مەیدانەدا بێ شا خەجڵەن

دڵە گاهێ مەیل خوەراسانت بی
ئیرادەی سەفەر ڕای ئاسانت بی

قاسد خەیاڵ گیتی نەوەردت
شاتر ئەندێشەی ڕووی دونیا گەردت

«طُرفةُالعین»ێ مەبین ڕەوانە  ...  پەری ماخولیای دەور زەمانە

چەسپان‌تەر نە بەرق، بزیسکەی ڕووی هەور  ...  عەرسەی سەرزەمین دەور مەدان وە دەور

ساتێ وە سەد لەون مەگێڵۆ جە ڕەنگ  ...  هەی دڵ وە سەنگ بای، هەم وە نەقش سەنگ

یاغی بیت جە ڕای خوداشناسی  ...  جە فەرموودەی حەق تەمام بیت عاسی

ئەندێشەت نەبی جە دین ئیسلام  ...  لادای جە ڕای شەرع شای «خیرُالانام»

نە تەنخوای گوڵبانگ «اللّهُاکبر»  ...  دای نە مەقامات چڵ‌چەنگ دڵبەر

دڵە کام بەد بی نەکەردت، کەردت  ...  دڵە کام بەد بی نەوەردت، وەردت

چێشت بی حاسڵ چێشت بی دەسگیر  ...  جە نافەرمانیت هیچ نەکەرد تەقسیر

بزانە دونیا فانییەن فانی  ...  ویەرد هەرچێت کەرد نە ڕووی نادانی

خوداوەند غەففار هەم ڕەحمەت‌پیشەن  ...  «وَ لا تَقْنَطوا» فەرموودەی ویشەن

«تُبْتُ اِلَی الله تَوْبَةَ النَّصُوح»  ...  بوانە دایم هەر شام و سەبووح

بناڵە وە سۆز نەی دونیای بادی  ...  «تُقْبَلُ التَّوبَة مِنَ العِبادِ»

پا بنیەر نە ڕای ڕاسی و قەناعەت  ...  ویر بدەر وە زیکر، خولووس تاعەت

ڕازی بەر وە ئەمر قەزا و قەدەر  ...  ئاخێز کەر ئاخێز وادەی سوب سەحەر

جە «ماسوی‌اللّه» قەتع ڕەجات کەر  ...  پەنا وە دەرگای تای بێ‌هەمتا بەر

سەکەرات مەوت باوەر وە نەزەر  ...  سوئال و جەواب نەکیر و مونکەر

دڵە یاگەکەت خەیلێ دڵتەنگەن  ...  سەرینت خاکەن پاینت سەنگەن

وە بەرزی بالات خاک وەنەت بارەن  ...  نە جای نازباڵشت سای سەنگ خارەن

کاسەی دەماغت مەبۆ خاک‌ئەنداز  ...  ئەعزات مەڕیزۆ وێنەی مارانگاز

مەلا ئەحمەدی کلاشی لەگەڵ کەیفی جوانڕۆییدا ـکە لە ئەستەمبووڵ ژیاوەـ دۆستایەتی هەبووە و جاروبارەش پێکەوە شیعریان گۆڕیوەتەوە. ئەم چەند بەیتەی لە وەرامی نامەیەکی کەیفیدا نووسیوە:

کەیفی نامەکەی ڕەشحەی شەکەرڕێز  ...  چاپار یاوناش وە شار تەبرێز

بۆسام سەراسەر، موتالەعەم کەرد  ...  پەیاپەی کێشام هەناسان سەرد

دڵ وێنەی قەقنەس شوعلەی ئایرخێز  ...  نە تەبرێزەدا ڕیزە بی وە ڕێز

بڵێسەم بەرز بی جە هیجران تۆ  ...  ئایر دا تەمام سەحرا و کەش و کۆ

ئەر دەریای موحیت بگیرۆ بوخار  ...  ئەگەر ئەستەمووڵ بسۆچۆ وە نار

ئەگەر توورومپای ئەستەمووڵ نەدۆش  ...  ئاوپاشیم کەران نمەبۆ خامۆش

تۆ نەفت‌ڕێزی کەر وە دۆعا و سلام  ...  بازە «کلاشی» بسۆچۆ تەمام

*حدیقەی سولتانی*، ل ٦١. یاداشتەکانی نووسەر.

## ئەدیبی سنەیی

میرزا ئیسمایل «صَدرُالکُتّاب»، مەشهوور بە «ئاغە» و نازناو «ئەدیب»، کوڕی ئەڵاویردی سوڵتان، کوڕی میرزا ئیسمایلی دارۆغە، لە بنەماڵەی وەزیرییەکانی سنە، خۆشنووسێکی گەورەی شێوە خەتی نەسخ و نەستەعلیق و هەروەها وێژەوان و شاعیر و نووسەر بووە کە لە نێوان ساڵەکانی ١٣١٠ تا ١٣١٥ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**چەند شیعری ئەدیب**:

قَسَم به چشم تو تا چشم من جمال تو دید — ندید خواب به خواب و همه خیال تو دید
ربودی از نظری صبر و تاب و هوش مرا — به جُرم آنکه چرا چشم من جمال تو دید
شکست روزه به ماه صیام و عید انگاشت — «ادیب» واله چو ابروی چون هلال تو دید
اسیر و رام تو شد مرغ دل ز نادانی — ندید دام دو گیسوت و دانه خال تو دید
ندانم این دل وحشی چگونه کردی صید — ز یک نگاه که آن چشم چون غزال تو دید
ز دل مپرس که چون برگزیدت ای دلبر — ز دیده پرس که آن عشوه و دلال تو دید
یکی است دل که ز یک تیر چشم مست تو خَست — یکی است جان که صد آسیب گوشمال تو دید
نه کس به مهر و وفا در جهان نظیر من است — نه کس به حُسن و صفا در بُتان مثال تو دید
تو را «ادیب» ز روی صفا از آن بگزید — که نقش خویش در آیینەی جمال تو دید

**چوارینە**:

افسوس که مدح اشقیا کردم بس — با اهل ریا، روی و ریا کردم بس
از روی و ریا چو تافتم روی کنون — رو بر در ربّ کبریا کردم بس

بۆ دۆستێکی کە لە زەماوەنێکدا پای هاتۆتە لادا:

چون نوبت عیش در سرای تو رسید — نوبت به کف گره‌گشای تو رسید
گر در دل من خیال تو پا ننهاد — درد دل من چرا به پای تو رسید

بیرەوەری و یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا لوتفوڵای شێخولیسلام

کوڕی مەلا فەتحوڵای قازی، کوڕی مەلا موحەممەد ئیبراهیم، کوڕی مەلا حوسەینی قازی، ناسراوترین و بەدەسەڵاتترین کەس لە بنەماڵەی قازیانی سنەیە کە جیا لە پلە و پایەی بەرزی لە زانست و دادوەریدا، لە باری

کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئایینیشەوە وا بووە کە میران و حاکمانی کوردستان، گوێڕایەڵی بوون و دەسەڵات و مەزنایەتی ئەو پیاوە تا ڕادەیەک گەیشتووە کە شای قاجار، لابردن و دانانی میرانی ناوچەکەی بەو سپاردووە.

مەلا لوتفوڵا ماڵ و سامانێکی زۆری هەبووە و بۆ دەهندەیی و جوامێریش کەس تۆزی نەشکاندووە. هونەری ناسیوە و بایەخی بە هونەرمەندان داوە. چەند جار سەفەری تاران و ئەسفەهانی کردووە و لە سەفەرێکیدا، چەند وەستاکار و میعماری ئەسفەهانی لەگەڵ خۆی بۆ سنە هێناوە و داویە ماڵێکی ڕازاوەیان بە شێوازی ئەو ڕۆژگارە بۆ کردۆتەوە. ئەو ماڵە ئێستاش ماوە و ئەنتیکەخانەی شاری سنەیە.

ئەم پیاوە هێژایە هەروەها وێژەوان و زاناپەروەریش بووە و زۆری حەز لە کتێب کردووە و لە کتێبخانەکەیدا کتێبی زۆر نایابی دەسنووسی کۆ کردۆتەوە. لەو سەردەمە دوو کتێبخانەی گەورە لە سنە هەبووە: کتێبخانەی والییەکانی ئەردەڵان و هی مەلا لوتفوڵای شێخولیسلام؛ کە بەداخەوە هەکیان لە تێپەڕی ئەوساڵانەدا، چەند جاران کەوتنە بەر تاڵان و هیچیان لێ نەمان.

مەلا لوتفوڵا خەتیشی تا ڕادەیەک جوان بووە و دەفتەرێکی داناوە، هەرکوێ شیعر یان ڕستەیەک ـ عەرەبی یان فارسی ـ سەرنجی ڕاکێشاوە، لەو دەفتەرەدا نووسیویەتەوە و جاروباریش داویە خۆشنووسەکان بۆیان نووسیوە. کەشکۆڵێکی ئەو خوالێخۆشبووەم لای یەک لە خانەکانی سنە چاوپێ کەوت کە بەشێکی خەتی خۆی و بەشێکی تری شوێنی قەڵەمی وێژەوانی زانا، میرزا عەبدوڵڵای کوڕی میرزا جافری مونشی کوردستانییە و پتر لە کۆتایی هەرکام لە شیعر یان پەخشانەکاندا، مێژووی نووسینەوەکەشی نووسراوە؛ بە شێوەیەک کە ئەم ساڵانەی (کۆچی ـ مانگی)م بەرچاو کەوت: ١٢٧٠، ١٢٧١، ١٢٩٠، ١٢٩٢، ١٢٩٤، ١٢٩٧، ١٣٠٥ و ١٣٠٩. لە لاپەڕەی ١٦٥ تا ١٧٩ی کەشکۆڵەکە، خەتی میرزا عەبدوڵڵایە کە ساڵی ١٢٩٠ ک. م. نووسیویە و وەک دیارە، لەو ساڵەدا مەلا لوتفوڵا هێشتا نەبۆتە شێخولیسلام و «ئەمینولئیسلام»یان پێ گوتووە. ئەوی ساڵی ٢٩٤، لە کرماشان و ساڵی ١٣٠٥ لە ئیسفەهان نوسراوەتەوە، خەتی مەلا لوتفوڵا خۆیە.

شێخولیسلام زەوقی شیعریشی هەبووە و جارـجار شیعری گوتووە. ئەوا دوو غەزەل لەو کەشکۆڵە:

شوخیت کُن ای دوست کە اغیار ندانند / کاین مردم آمادە در اینجا دگرانند

تنها نە من از عشق تو رسوای جهانم / تنها بە جهان بیش بدیدیم چنانند

لیلی کە شدە شهرە، ز مجنون صفتی بود / عُشاق تو لیکن ز مشاهیر جهانند

ساقی بدە آن بادە، زمان می گذرد زود / و اینها کە تو بینی همە ز ابنای زمانند

خوبان بە جفا اهل محبت بگذارند / آنان کە بە ما فاتحە خوانند، کیانند؟

* * *

خراب و شیفتە و بیخود و فتادە و مستم / نە مَست آب رَزَم، بلکە مست روز الستم

چه بیخودیست نـدانم گرفتـه در سـرم امـروز جز اینکه دوست نهاده است جام بـاده بـه دستم

جـزات خیـر بـود سـاقی خجسـتهشـمایل ز رنج گردش گیتی به جُرعـهای ز تـو رسـتم

صراحی و خم و جام و پیاله جملـه دُرست اسـت صـدای آنچـه شـنیدید، توبـه بـود شکـستم

می و نگار و بهار و گل است و گوشـهی گلـشن هـزار توبـه در ایـن روزهـا شکـستم و بـستم

خیال روز و شبم اینکـه ره بـه سـوی تـو یـابم خوشـا کـه عاقبـت اینـک بـر آسـتانه نشـستم

هـزار سلـسله در زنـدگی ببـست مـرا پـای به غیر مهر تو هـر عقـده بـود، جملـه گسـستم

مـرا تخلـصی ار نیـست هـیچ مطلـب نیـست تـوام بـه هرچـه بنـامی، سپاسـگوی تـو هـستم

خوا لیٚ خۆشبوو مەلا لوتفولا، ساڵی ١٢٥١ ک. م. لەدایکبـووە و ڕسـتەی «غفـر لـهُ= ١٣١٥»، میـژووی کۆچی یەکجاری ئەوە.

کەشکۆڵی دەسنووسی مەلا لوتفولا. چەند جونگی دەسنووس.

## شێخ عەبدولوەهابی مەردۆخی

شێخ ئەولوەهاو، کوڕی شێخ جەمالەدینی دووەم، پیـاوێکی پارێزکـار، بـەئاکار، چـاوتێر و هـەروەها زانـا، لـە بنەماڵەی مەردۆخی شاری سنە بووە کە ساڵی ١٢٤٤ ک. م. هاتۆتە دنیا و ١٣١٦ کۆچی یەکجاری کـردووە و هێندێک نووسراوەشی لە خۆوە بەجێهێشتووە.

*تاریخچەی خاندان مردوخ*.

## شێخ مەحموودی خەنسی[1]

زانایەکی پارسا و عارفێکی ئاگا لە مەشایخی نەقشبەندی بووە کە لە باکووری کوردسـتان ژیـاوە و لـە بـاری ئایینییەوە قسەی لە ناو خەڵکدا زۆر چووە و مەردمێکی لە ئەژمار بەدەر سەریان پێ سپاردووە و سـەرەنجام ساڵی ١٣١٦ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

شێخ مەحموود بابی شێخ سەعیدی نەقشبەندییە، کە لە بەشی دووهەمی ئەم کتێبەدا باسی دەکەین.

قاهیرە. *مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٨٤.

## مەلاباشی سدێقی

«نَصیرُالاسلام» مەلا ئەحمەدی، مەشهوور بە «مەلاباشی»، کەڵـەپیاوێکی بـواری زانـست و هێزایـی خەڵـکی

١. **خەنس**: شارۆچکەیەکە لە باکووری زریای وان، لە کوردستانی باکوور.



جوانڕۆیە کە چۆتە سنە و زۆر سالان لەو شارە دەرسی گوتۆتەوە و داوەری کردووە و سالی ١٣١٦ ک. م. دنیای بەجیٚهێشتووە.

مەلاباشی لە بنەماڵەیەکە ڕەچەڵەکی خۆیان دەبەنەوە سەر حەزرەتی ئەبووبەکری سدێق (س) خەلیفەی یەکەم و بەو بۆنەوە «سدێقی»یان پیٚ دەڵێن.

مەلاباشی خەتی نەسخی جوان نووسیوە و زۆر کتێبی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە؛ کە زیاتریان هەیئەت و ڕیازین؛ کە خۆی شارەزاییەکی تەواوی تێیاندا هەبووە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## عەبدوڵلا بەگی جاف

کوڕی حەسەن بەگ، سەربە عەشرەتی جاف و بەرەی میکایلی و لە ئامۆزایانی مەولانا خالیدی شارەزوورییە کە لە هەڵەبجە ژیاوە و ساڵی ١٣١٦ ک. م. هەر لەویٚ، بەشی لە دنیا بڕاوە.

عەبدوڵلا بەگ ئەگەرچی زۆری نەخوێندووە، شیعرەکانی لە باری بیری ناسک و هەستی شاعیرانەوە، بەرز و سەرنجڕاکێشن؛ بە گۆرانی و سۆرانی شیعری گوتووە و لە گاڵتە و گازندەدا دەستێکی باڵای هەبووە. مەولەوی تاوەگۆزی زۆری خۆشویستووە و زۆرجار پەسنی هەستی شاعیرانەی داوە.

وەک «*تاریخ سلیمانیە*» دەڵیٚ، بۆ بەڕێوەچوونی ژیان، کشت و کاڵ و کرێکاری کردووە و داهاتی زۆر هندک بووە و یەکجار بە کزی و ناتەواوی ڕایبواردووە.

**دوو نموونە شیعری عەبدوڵلا بەگ**:

جێران هەردە! جێران هەردە! وەڵەدەی خەتا، وەتەن گومکەردە
دەلیل ڕەمکێش غەزالان چین سەییاد سەر کۆی سەربەرزان نشین
موشک ناف لە عەتر مایەی عەتاران دەماغ لە هەوای بەرزە دیاران
ستارەی زوحەل، فیتنەی زەمانە جەللاد خوێنڕێژ خویش و بێگانە
دڵەی عاشقان قیمەی کەبابکەر چای بیژەن نە جای ئەفراسیاب کەر
کوشەندەی خوسرەو، شیرۆ بەدناوکەر بێخ و بنچینەی هورمز تەواو کەر
تۆ خوا ئازیز! زولفان عەنبەرین گویٚ بدە وە حەرف بەندەی کەمتەرین
با سەدبار مەعشۆق بانووی شیرین بیٚ خاسە جەللادی پڕخەشم و قین بیٚ،
باڵا بنوێنە بە تەرتیبەوە بە خەندەی لەعلی سەرەندیبەوە
بنوێنە مینای جەمینت یەکدەم بە وێنەی جام جەهاننمای جەم
بۆ پەروانەکەی شەیدای شەوق شەم ڕووت دەرخە لە تۆی عەرەقچین کەمکەم

بــه جیلــوەی چــاوت شــۆخی دیدەمەســت / ڕازیم بـــه حـــوکمی ڕۆژەکـــەی ئەلەســـت
بــا مــاچ کـــەم خاڵـــت بـــه حیجابـــەوە / وەک بـــەردی گۆشـــەی بنـــای کابـــەوە
بنۆشـــم شـــەربەت لـــه لێـــوت بـــێخـــەم / فـــەرزە دەم تـــەڕ کـــا حـــەججاج وە زەمـــزەم

**گله و گازنده له بەرگی گاڵتەدا**:

ئـــەوە نـــان نـــەبوو تـــۆ دات وە بەنـــه / وە هـــەوڵ قـــۆڵ و وە زۆری چەنـــه
سـێساڵ لـەسـەر یـەک ڕەمـەزانم گـرت / لـــه ماڵـــی خوەمـــا ئیفتـــارم نـــەکرد
عــومرم وە ســەر چــوو بــه پــەنجا گــەیی / ســایەی مــاڵ خــوەم بــه تێــری نــەدی
وە ناکــەس ئــەدەی مــاینی موحەننــەک / وە منـــت ئـــەدا کڵاشـــێکی چـــەک
ژێرم خاک ئەکـەی سـەرم سـەنگ ئەکـەی / ئەمن دەنگ ناکەم ئـەتۆ دەنـگ ئەکـەی؟!

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوەسرم*، ل٤٨. *تاریخ سُلیمانّیه*، ل٢٧٢.

## شێخ عەبدولوەهابی نایب

شێخ وەهاو پیاوێکی هێژا بووە کە لە سـەرەتای چـەرخی چـاردەدا ژیـاوە و خوێنـدنی لـە بەغـدا لای مـەلا موحەممەدی فەیز (موفتی زەهاوی) تەواو کردووە و ماوەیەک دەرسی گوتووە و دوایـی پیـشەی داوەری لـە ئەستۆ گرتووە.

**لە کتێبەکانی**:

«*هدایۀالوصوُل لِبیان اَلفَرق بَینَ النَّبی وَ الرَّسُل*» کە موفتی زەهاوی پەسندێکی لە سەر نووسیوە و لـە بەغـدا چاپ کراوە.

*مُفتی زَهاوی*. بَغداد.

## سەید ئیبراهیمی حوسەینی

کوڕی سەید ئیسماعیل، کوڕی سەید عەبدولعەزیز، کوڕی سەید عەبدوڵلا، لـە سـەیدە بەرزنجییەکانـە کـە ساڵی ١٢٥٣ ک. م. لە سنە هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە، بۆ خوێندن سنەی بەجێهێشتووە و ماوەیەک لە دێهاتەکانی کوردستان و هێندێک لە سلێمانی و کەرکووک خوێندوویە. لـە کەرکووکـدا، پێـڕای خوێنـدن، لای شێخ عەبدوڕڕەحمانی خالسی تاڵەبانی، چۆتە نێو تەریقەتی قادرییـەوە و سـەیر و سـولووکی کـردووە. پاشان بۆ میسر چووە و ماوەیەک لەوێ شوێن دەرس و دەوری گرتووە. بە شـوێن ئـەوەدا ڕووی لـە خـاکی حیجاز ناوە و فەرزی حەجی بەجێهێناوە.

حاجی سەید ئیبراهیم لـە مەدینـەی پـیرۆز، خزمـەتی یـەکێک لـە شـێخە بەناوبانگـەکانی تەریقـەتی

نەقشبەندی، بە ناوی شائەحمەدی سەعید (١٢١٧–١٢٧٧ ک. م.) گەیشتووە و ئەو تەریقەشی وەرگرتـووە و پاش دوو ساڵان بەرەو زێدی خۆی (سنە) گەڕاوەتەوە.

شێخ موحەممەد مەزهەر، کوڕی شائەحمەدی سەعید، مورشیدی سید ئیبراهیم لە کتێبی «*مناقـب أحمَدیّە و مَقامات سَعیدیّە*»دا ـکە ساڵی ١٢٧٧ ک. م. لە دیهلی چاپ بووە ـ لە بـارەی حـاجی سـەید ئیبراهیمەوە وای نووسیوە: «حاج سیّد ابراهیم کُردی، از خُلفای شاه احمَد سعید، صاحب حالات بُلنـد و مقامات ارجمند، کثیرالزَّعَقات و الشَّهَقات، شدیدالمَحَبّة لاستاذه، در ولایت کُبری از اجـازَت و خلافَـت مُعَزَّز بودند.»

ئەم عارفە بەرزە کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـنە، لـە پـەنا ماڵـەکەیدا خانەقایـەک دادەنـێ و کـوڕی ئیرشـاد دادەمەزرێنێ. خەڵکیش کە بە پاکی و ممبارەکی ئەو دەزانن، لە هەموو لایەکەوە ڕوو لە خانەقاکەی دەنـێن و تەریقەتی لێ وەردەگرن.

حاجی سەید ئیبراهیمی حوسەینی سنەیی، سەرەنجام ساڵی ١٣١٦ ک. م. لە ٦٣ ساڵاندا، ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە حوجرەیەکی خانەقاکەیدا نێژراوە.

*مناقِب أحمَدیّە و مَقامات سَعیدیّە*، ل٣١٨.

## سەید جەعفەری دووەمی بەرزنجی

کوڕی سەید ئیسمایل، کوڕی سەید زەینولعابـدین، کـوڕی سـەید موحەممـەدی بـەرزنجی، زانایـەک لـە بنەماڵەی بەرزنجە و نەتەوەی سەید جەعفەری یەکەمی کوڕی سەید حەسەنە کـە لـە مەدینـەی پـیرۆزدا ژیاوە و موفتی شافیعی بووە و هەر لەوێ ساڵی ١٣١٧ ک. م. لە دنیا چووە.

**لە بەرهەمەکانی**: پەراوێز بۆ کتێبی «*الکوکبُالأنور عَلی عِقدالجوهَر*»، نووسـراوەی سـەید جەعفـەری یەکەم و «*تاجُالابتهاج فی الاسراء و المِعراج*».

*هـدیّـةُ العـارفین*، ب١، ل٢٥٦ و ٢٥٧.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل١٣٦.

## ئەفسەر

میرزا عەلیئەکبەر، نازناو «ئەفسەر»، ناسراو بە «وەقایع نیگار»، کەسناو «صادقُالمُلک»، کوڕی میرزا عەبدوڵـڵای مونشیباشی (ڕەونەق)، لە وێژەوانان و شـاعیران و مونـشییانی بـەناوبانگی سـەردەمی خۆیـە کـە ماوەیـەک ئینشابەندی خانەکانی ئەردەڵانی بووە و چەلێک ئەم کارەی بۆ سەیفەدین خانی تیلەکۆیی کردووە.

بە داخەوە بێژگە ئەو چەند شـیعرە لێـرەدا هـاتووە، شـتێکی تـر لـە شـیعری ئەفـسەری وەقـایعنیگـارم

دەس‌نەکەوت؛ بەڵام هەر ئەم کەمەش دەردەخا کە چەند شاعیری چاک بووە. هەروەها کتێبێک بە ناوی «*حدیقەی ناصری*» نووسیوە؛ کە ئەویش دەس‌ناکەوێ.[1]

لە کاتێکدا کە عەبدول‌حوسەین خانی ئەمیرتۆمان (سالارُالمُلک) بۆ حوکوومەتی کوردستان ناوی لێ براوە، وێژەوان و شاعیری بەناوبانگی ئێرانی، میرزا سادقی فەراهانی، نازناو «ئەمیری» و ناسراو بە «ادیبُ‌المَمالک»، قەسیدەیەکی بە ناوی گازندە و شکات و وەکی گەپ و گاڵتە بۆ دەنووسێ و تێدا زۆرێک جنێو بە ئەفسەر دەدا کە بۆچی ناوی «صادقُ‌المُلک»ی لە ناوی من (صادق) دزیوە؟! ئەفسەریش کە ئەم دەنگ‌وباسەی پێ دەگا و شیعرەکە دەبینێ، جوابێکی خۆی‌ئاسایی، هەر لەسەر ئەو کێش و سەروایە، پێ دەداتەوە؛ کە ئەوا لە پێشدا شیعرەکەی ئەدیبولمەمالیک:

خدایگانا! ازدستبرد چرخ دغل — سه سال نام من از نامەی جهان گُم شد
چو از صحیفەی ایام محو شد نامم — دلم چو دیده ز اندیشه پُر تلاطم شد
برای یافتن وی به دست باد صبا — کتابتم به خُراسان و ساوه و قم شد
نشان نیافتم از وی به هیچ شهر و دیار — شرار آهم از این رو به چرخ هشتم شد
سپس شنیدم کش برده خواجه «افسر کُرد» — بدان مثابه که خود نیز در توهم شد
گرفته نام مرا از برای خویش لقب — وزین شرف به همه خلق در تقدم شد
دلم بسوخت از این درد و دود از او برخاست — چنانکه دیدی آتش به خُشک هیزم شد
غَمین شدم که چرا کرم پیله افعی گشت — سُتُه بُدم که چرا عنکبوت کژدم شد
چگونه خود را صادق کند خطاب کسی — که او مُکذّب نصب امیر در خم شد
هرآنکه بشنید این قصه در تحیّر ماند — هر آنکه بر خواند این نکته در تَبَسُّم شد
نبشتمش که خدا را به خویش نام مرا — مَبند، زآنکه نخواهد شعیر گندم شد
پلنگ باید سیّاح کوه سَهلان گشت — نَهنگ باید مَسّاح بَحر قُلْزُم شد
ز نام نیکان کس نیک نام مینشود — ببایدت پی نیکان گرفت و مردم شد
به عجز و لابه‌ام آن سنگدل نبشخود ایچ — بلی به برّه کجا گرگ را ترحّم شد
جواب من همه از خامه‌اش سکوت آمد — سلام من همه در حضرتش علیکم شد
چو بود جایش در آسان میر اَجَل، — کمینه نیز در آنجا پی تظلّم شد
خدایگانا! بهر خدا اگر روزی — به چرخ کاخ تو هم سلک عقد اَنجُم شد

---

١. ئەم کتێبە کە ئەفسەر لەسەر داخوازی میرزا ئیبراهیم‌خانی نیزامودەوڵە، میری ئەو سەردەمەی کوردستان نووسیویە، ٣٣٦ لاپەڕەی دەسنووسە لە چوار بەشدا و لە کتێبخانەی بریتانیا، لە شاری لەندەن، بە ژمارەی OR-١٤١٠٨ ڕادەگیرێ.

بگیــر نــام رَهــی را از او و بــاز فرســت / که مر تو را به هزاران چو وی تحکُّم شد
وگـر بـه محضر شـرعم روان کنـی گـویم: / ز کرّگـی خَـرَك لنـگ بنـده بـیدُم شـد
وگر به من ندهد گوش هوش خواهد دید / که عنقریب دو گُوشش جریمەی دُم شد
پـی مُطایبـه ایـن طُرفـه چامـه بـر بستم / اگـر چـه بـر صـفت تسخر و تهکُّـم شـد

**ئەمەش وەرامی ئەفسەر:**

«امیـری» آنکـه ز خـود غـرق در تـوهم شـد / ز نـام و شـهرت مـن سخت در تلاطُم شد
بــدون ســابقه بــر مُقتــضای طبـع پلیــد / بـه نیش هجو گزیـده مَرا چـو کـژدُم شد
فُـسای گنــد پراکنــد و شــامه را آزرد، / ادیـب مملکـت مـا چـو در تکلُّـم شـد
نــدانم از چــه ز مــن بــیدلیـل رنجیــده / بـه نـزد والـی عـالی، پَـی تَظَلُّـم شـد
میــان جامعــه گــر بنــده صــادقُ المُلْکَـم / ز صدق شُهرتم اینسان ز شاه و مردم شد
ولـی بـه کـودکی ار گـشت نـام او صـادق / کنون ز کذب و سَفَه صادقی از او گـم شد
ایـا ادیـب امیـری! کـه صیت خُـوی بَـدَت / بـه اصـفهان و فراهـان و سـاوه و قُـم شـد
ز یــاوه گــویی تــو در تَعَجُّــبم کــاخر / هـر آنکـه حـرف تـو بـشنید در تبسم شد
نوشــتەی تــو همــه ناســزا و نفــرین بــود / بـه نـزد اهـل خـرَد تـسخر و تهکُّـم شـد
مـرا تحیُّـر ازایـن اسـت نـام و شـهرت مـن / تُـو را چگونـه چنـین موجـب تـالُم شـد
چنــان ز شــهرت نیکــوی مــن برآشــفتی / کـه نالـەی نَفَـسَت تـا بـه چـرخ هشتم شد
مَراســت عــار ز همنـامی کـسی چـون تـو / تـو مـدّعی کـه مـرا موجـب تقـدُّم شـد
غُــرور بُــرد ز یــاد تــو شــیوەی مــردی / خوشا کسی پی نیکان گرفت و مردم شد
بـه مـن کـلام و سـلامی تـو کـی فرسـتادی / نوشـتەای کـه جـواب مَنـتْ عَلـیکُم شـد
تُو را ز بیخَرَدی خُود دُمی است غُصه مَخُور / ز کُرّگی خَرَت ار لنگ گشت و بیدُم شد
جـواب بـیاَدَبـان گـر چـه هـست بـیاَدَبـی / ولــی مــرا اَدَب از مکتــب اَب و اُم شــد
سُخن بـس اسـت نـرنجم ز هـرزه گـویی تـو / مـرا بـه پاسـخ تـو عـار از تَـشاتم شـد
ز ضـعف نفـس بـود آنچـه گفتـهای، ز آنـرو / نرنجـد «اَفْـسَر» و بهـر تـو در تـرحُّم شـد

ئەم بەیتەی لەسەر دابی «إخراج» و «إدخال»، بۆ لابـردنی فـەرهاد مـیرزا (مُعتَمدُالدَّولـه) لـە حوکوومـەتی کوردستان و دانانی تەهماسب میرزا (مویدُالدَّوله) له جێگایدا، پێڕای قەسیدەیەک گوتووە:

از تخـــت جـــلال رفـــت فرهـــاد / طهماسـب بـه جـای وی مکـان یافـت

به حیسابی ئەبجەد، تخت جلال=١٤٦٤، فرهاد=٢٩٠، طهماسب=١١٧.

ساڵی لابردنی فەرهاد و دانانی تەهماسب: ١٢٩١= ١١٧+١١٧٤ =٢٩٠-١٤٦٤

ئەم بەیتەشی بۆ مێژووی دروستکردنی قەڵای «لەشکرئاباد»، لە ساڵی ١٢٨٩ ک. م. داناوە:

نوشـت خامـەای افـسر بـە سـال تـاریخش «بـسعی معتمدالدولـە قلعـە شـد آبـاد»

جونگێکی دەسنووس. *دیوان ادیبُ‌المَمالک فَراهانی*، ل١٨٤.

## عاسیمی سنەیی

شێخ عەبدولعەزیزی عاسیم، پیاوێکی وێژەوان و زانای خەڵکی سنە بووە کە پاش تەواو کردنی خوێندن، بـۆ بەغدا چووە و ماوەیەک لە خزمەتی عەللامە موفتی زەهاوی بەهرەی بردووە و ئیجازەی لێ وەرگرتووە و لـە ئاکامدا هەر لەوێ دانیشتووە.

حاجی میرزا ئەحمەدی دیوانبەیگی شیرازی، نووسەری ژینامەی «*حدیقةُالشُعرا*»، کـە ساڵـی ١٢٩٧ ک. م. بۆ زیارەتی عەتەبات چووە بۆ عیراق، لە بەغدا شێخ عاسیمی دیوە و باسی مەلا موحەممەد فەیز (مـوفتی زەهاوی) و جەمیل سیدقی زەهاوی (کوڕی) بیستووە و بەنیازی چاوپێکەوتنیان بووە؛ بەڵام دەستی نەداوە و هێندێک لە بەرهەمەکانیانی لە عاسیم سەندووە و لە ژینامەکەیدا هێناویە.

گۆڤاری *یادگار*، تاران، س٣، ژ٩، ل٦٤. جونگێکی دەسنووس.

## وەفایی

حاجی میرزا عەبدوڕڕەحیم، کوڕی مەلا غەفوور، کوڕی نەسروڵا، لە بنەماڵەی مەلا جـامی، ساڵـی ١٢٦٤ ک. م. لە شاری ساباڵاغ (مەهابادی ئێستا) لە دایک بووە و هەر لەوێ خوێندوویە و پـاش فێربـوونی وانـە سەرەتاییەکان، لە خزمەتی مامۆستایانی هێژای مزگەوتی سووردا درێژەی بە خوێندن داوە و موجاز بووە.

لە تەمەنی بیستساڵاندا، بەنیازی دیتنی ئەستەمبووڵ، لـە مـەهاباد دەرکـەوتووە؛ بـەڵام کـە گەیـشتۆتە «نەهرییە» و چاوی بە شێخ عوبەیدیللای نەهری کەوتووە، لەوێ ماوەتەوە و چۆتە نێو تەریقەتی نەقـشبەندی و دوای ساڵێک کە شێخەکەی لە حەج هاتۆتەوە، گەڕاوەتەوە بۆ مەهاباد و ژنی خواستووە.

دوو جار بۆ حەج چووە و جاری دووهەم، ساڵی ١٣١٨ ک. م.[١] هـاوڕێ کەسـانی وەک: شـێخ سـەعیدی بەرزنجی (بابی شێخ مەحموود)، پیرەمێرد و سەید ئەحمەدی خانەقا (کـەرکووکی) بـووە و لـە گەڕانـەوەدا عەمری خوای کردووە.

وەفایی مرۆیەکی بێدەمار و پارێزکار، ڕووگەش و خۆشسـەروزمان و مرۆدۆسـت بـووە؛ تـا بـۆی کرابـێ گۆشتی نەخواردووە و زۆری حەز لە گوڵ و گوڵزار و دەر و دەشت و لانزار و بەگـشتی، سروشـت کـردووە.

---

١. هێندێکیش ساڵی ١٣٢٠ و هێندێکی تر ١٣٣٤ یان نووسیوە.

بێژگە زبانی کوردی، فارسی و عەرەبی و ترکیشی زانیوە و زیاتر بە کوردی شـیعری گوتـووە و شـیعرەکانی باشترین بەڵگەن بۆ نیشاندانی پلەی بەرزی شاعیری و هەستیاری دانەرەکەی.

**چەند شیعری وەفایی**:

تـاییکی ڕیـشەیی دڵ بـە نـووکی غـەمزە دادا		دەستێکی بۆ سەما برد ڕووبەنـدی مـاهی لادا
نافەی گوڵی عەیان بوو، عەتری بە دەم سـەبادا		باریک و لووس و ناسک دوو زولفی خاوی بادا

وەک شاخی گوڵ بەلادا، شیرین تەشیدەڕێسێ

کە کەوتە چەرخ و گەردش تەشی بە دەسـتی ڕەنگـین		هەودای لە لێو و دەمدا خورشیدی سینە نەسـرین
سـەمای بـە ذوذَنَـب دا کَـفُ‌الخُـضیب شـیرین		گرتی خەتی مەدارات شەفەق بە عیقدی پـەروین

سیحرێکە بۆ دڵ و دین، شیرین تەشی دەڕێسێ

نووکی تەشی بە گەردش قوتبێکـە چـەرخی پێـوە		مەجەررە بوو بە داوی کـە چـەرخی کەوتـە نێـوە
وەک زوهرە دەستی کێشا کە بەندی قەوسی زێـوە		ئەسـتێرە مـاهی داگـرت سـابت کـرا بـە پێـوە

ئارەق بە ڕوو بەڕێوە، شیرین تەشی دەڕێسێ

کـە دەسـتی بـرد و هێنـا بـە دولبـەری بـە تـادا		بە چەرخی خـست و گێـڕای بـە ڕانی سـافیدا دا
عـەیان بـوو پەنجـەیی ڕۆژ بـە خـەتی ئیـستوادا		بە سوبحی سادق ئەنگووت ذَنَب لـە نێـو سـەمادا

حیرەت لە ماسـیوادا، شـیرین تەشـیدەڕێـسێ

پەردەی کراسی لاچوو پشکووت بە هەر دوو لێـوان		گوڵ و شەکەر دەباری لـە کووچـەبـاخی سـێوان
زولفـی ڕژانــە کولـّـمی وەدەرکــەوت لــە نێــوان		شەمس و قەمەر هەڵاتن دوێنێ بە نوێژی شـێوان

وەفایی کەوتە کێوان، شـیرین تەشـی دەڕێـسێ

بـــۆنی غەزاڵـــی چـــینی لـــە نافـــەدا عەیانـــە		دەڵـــێی لـــە نیوەشـــەودا ســـپیدەیی بەیانـــە
دەمی گوڵ و لەبی گوڵ دوو مەمکی قـووتی گیانـە		لـــە بـــاخی یاســـەمیندا، شـــکۆفەیی گوڵانـــە

بەهاری بێ‌خەزانە، شیرین تەشـی دەڕێـسێ

کە کەوتە چەرخ و گەردش تەشی بە ڕانی لووسـی		دەکـــەوتـــە پایبووســـی دوو زولفـــی ئابنووســـی
ذَنَـــب لـــە مانگەشـــەودا دەهاتـــە چاپلووســـی		لە بان بەیازی گەردەن بە خەتتی خۆشی نووسـی

مەهتابە پایبووسی، شیرین تەشی دەڕێـسێ

شیفای جەراحەتی دڵ تەشی نەبوو کە ڕسـتی		شاپەری خاوی خۆی بوو پەڕیوە بـوو لـە مەسـتی
هەتیوی کەللەشەق بوو بە داوی حیلە بەسـتی		لە تاوی هاتوچوویدا بە لێـوی خونچـە گەسـتی

بە ڕۆح و دڵ، بە قەستی، شیرین تەشی دەڕێـسێ

بە خەنـدە زولفـی لادا لـەسـەر عیـزار و زاری		کـە شـەو بـەیانی بـەردا گـوڵ و وەنەوشـە بـاری

دوگمەی کراسی بەربوو بزووت هەوای بەهاری      سەلای لە عاشقان دا باخی گوڵ و هەناری
دونیا بە ئینتزاری، شیرین تەشی دەڕێسێ

مەکەن مەنعی «وەفایی» کە خاو و دڵبڵاوە      بە داوودڵ دڵی خۆی بە داوی زولفی داوە
سەرێکە مەستی نازی دڵێکە بۆی نەماوە      دڵم حەقی بە دەستە فتوای سەرم دراوە
کە ئەم غەزاڵەچاوە، شیرین تەشی دەڕێسێ

* * *

لەو ڕۆژە کە دوور کەوتووە سایەت لەسەری من      سووتاوە لە تاوت هەموو گیان و جگەری من
جەرگم هەموو لەتلەت بوو بە سێڵاوی سروشکم      چپکەم کە بە دەریا چووە لەعل و گوهەری من
دەیفەرموو: لەسەر خاکی دەری خۆی کە منی کوشت،      جەننەت بەسە بۆ خوێنی شەهیدی نەزەری من
قەت وا دەبێ خاکی دەری تۆ تاجی سەرم بێ؟      ئەو دەوڵەتە بۆ من نییە ئەی خاک بەسەری من
زولفت کە وەکوو شامی غەریبانە، لەوێدا      حاڵی چییە داخۆ دڵەکەی دەربەدەری من
وەک بولبولی شەیدا بە هەزار نەغمە دەناڵم      جاری گوڵەکەم! گوێ بدە ناڵەی سەحەری من
دیم هاتە عەیادەت دەمی پڕ خەندە بوو یەعنی      ڕۆح و دڵی بیمارە، دەوای گوڵشەکەری من
بێنوورە دڵم هێندە لەسەریەک مەشکێنە      ڕوو وابکە شەوقێکی بداتە فەنەری من
خوەش بەو دەمە ساقی لە دەری مەیکەدە فەرمووی      ئەو جامە لە من بگرە «وەفایی» بەسەری من

* * *

لەبەر نازی چاوبازان خورد و خەوم زووخاوە      بە تیری تیرئەندازان چبکەم جەرگم بڕاوە
هاتم بۆ دانەی خاڵت، تووشی داوی زولفت بووم      تەیرێکی نابەڵەد بووم، نەمزانی دانە و داوە
تۆخوا دڵم مەشکێنە، با بزانم: ڕووت وابێنە      ڕووتە یا گوڵ هەنارە، لێوتە یا شەکری خاوە؟
بەس عومری من بە بادە ڕووت بێنە زوڵفت لادە      دڵ بۆیە نامورادە بەو شەوە ڕۆژ گیراوە
بە دەردی بێدەرمانی کەوتوومە سەرگەردانی      بە جوابی «لَنْ تَرانی» چبکەم جەرگم سووتاوە
با شەو بڕوا سەحەر بێ، باغی گوڵان وەبەر بێ      گەر تۆ مەیلت لەسەر بێ کافر ئیسلامی ناوە
لەبەر چاوت نەمزانی بێباغەوان گوڵچینم      مەست بووم هوشم لێ نەبوو دەمم بۆ ڕووت هێناوە
لە سایەی چاوەکانت بوومە ڕەندی خەرابات      لە لای پیری مەیخانە خەرقەم لە گرۆی مەی ناوە
شێت و شەیدا و سەحرایی دەگریم هەروەک «وەفایی»      چبکەم لە دڵی سەودایی پەریان دەستیان لێداوە

* * *

چەمەن یەکبارە خامۆشە خرۆشی بولبولان با بێ      دڵ ئەورۆ مات و مەدهۆشە خودا فەسڵی گوڵان بابێ
ئەگەر مەیلت لەسەرمانە چ حاجەت ئاوی حەیوانە      لە لەعلی لێوی جانانە حەیاتی جاویدان بابێ

نەماوە حاڵەتی ژینم لە دەس چوو ڕۆحی شیرینم
ڕەفێقان بێن بکەن شینم سەدای گریە و فوغان بابێ

ئەسیری تاری گێسووتم هیلاکی چاوی جادووتم
شەهیدی تێغی ئەبرووتم، دەسا عیسای زەمان بابێ

لە باغان سەیری گوڵزارە لە هەرجێ عاشقی زارە
خودا ئەو ئاهوو ڕەفتارە، وەکوو سەروی ڕەوان بابێ

وەفایی گەرچی شێواوی، لە عیشقی یارێ سووتاوی
بڵێ: موتریب هەتاماوی، سەدای چەنگ و چوغان بابێ

**لە شیعرە فارسییەکانی**:

ای بـه مـصر سـودایت صـد عزیـز قربـانی
رحـم کُـن، بـه یـادآور حـال پیـر کنعـانی

دل ز حـسرت رویـت روز و شـب همـی‌نالـد
نغمـه‌ی حَـزین دارد عنـدلیب زنـدانی

عـیش هـر دو عـالم را حاضـرم فـدا سـازم
بوسـه‌ای اگـر یـابم زان لَبـان رُمّـانی

در خَـم دو گیـسویت، لـب قـرین لـب بـودن
لـذّتی دگـر دارد جمـع در پریـشانی

زُلـف گیرمـت گـویی: راه کُفـر مـی‌جـویی
روی بوسمت گـویی: نیـست ایـن مـسلمانی

زان لَبـان تمنـایی دارم و نمـی‌گـویم
مـذهب «وفـایی» نیـست کـشف راز پنهـانی

* * *

شنیدم با وفـایی لطـف کـردی، یـاد فرمـودی
ز شاهی کم مَبادت، بنده‌ای را شاد فرمـودی

دلم بشکستی اما مخزن عشق خـودت کـردی
جَزاکَ‌الله خـرابش کـردی و آبـاد فرمـودی

پس از عمری نگاهی کردی و کُشتی «وفـایی» را
کَرَم کردی که ایـن پابـسته را آزاد فرمـودی

* * *

گُل گفت بـه بلبـل کـه بـه مـا یـک دلـه‌بـاش
جانبـاز و پُـر از نیـاز و بـا حوصـله بـاش

هنگـام سـحر اگـر بـه یـک خنـده‌ی مـن
اشکال تو حَـل نگـشت، پـس در گلـه بـاش

* * *

ای بنـده «وفـایی»! سـر و گـردن مَفـراز
چـون بـی‌اَدبـان بـر زَبَـر خـاک مَنـاز

در هـر قَـدَمی کـه پـای بـر خـاک نَهـی
دارا و سـکندری اسـت خوابیـده بـه نـاز

*دیوانی وەفایی*. گۆڤاری *گەلاوێژ*.

## شێخ عومەر «زیائەدین»

عارفی پایەبەرز، شێخ عومەر زیائەدینی نەقشبەندی، کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدین، لە ئەولیای بێ‌قسە و شێخانی جێ‌بڕوایە کە شەوی دووشەمبە، ٢٦ی جیمادی‌یەکەمی ساڵی ١٢٥٥ ک. م. لە تەوێڵێ هاتۆتە دنیا و پاش ٦٣ ساڵ ژیان، ساڵی ١٣١٨ لە دنیا دەرچووە.

زیائەدین دوای تێپەڕ کردنی ساڵانی کرچوکاڵی و منداڵی، خوێندنی دەسپێکرد و بە هۆی لێهاتوویی

سرشتی و تێکۆشان و پێداگرییەوە، دوای چەندێک، لـە فارسـی و عەرەبیـدا چـاوی کرایـەوە و لـە زانسـتە دینییەکان سەری دەرکرد و ئەوجار بە فەرمانی بـابی خـاوەن ڕێـزی (شـێخ سـیراجەدین)، چـووە ڕیـزی سۆفییانەوە و هەر لەو تەمەنی لاوی و هەرزەکارییەیدا، بە سەیر و سولووکەوە بارهات و بە چاوەدێری بـاوکی و کاکی (شێخ بەهائەدین)، لە ماوەیەکی کەمدا دوایین پلەکانی تەریقەتی نەقشبەندی تێپەڕ کرد.

بە کـۆچی دوایـی شـێخ سـیراجەدین، شـێخ عومـەر ڕۆیـە بیـارێ و لـەوێ خانەقایـەک بـۆ مریـدان و مەدرەسـەیەک بـۆ قوتابیـانی پێـکهێنـا و خـۆی خانەقاکـەی گەڕانـد و چەنـد مامۆسـتای هێـژای بـۆ دەرسگوتنەوە و جێبەجێ کردنی کار و ئەرکی فەقێیان دامەزراند و بەم جۆرە لە ماوەیەکی کەمـدا، بیـارێ بوو بە یەکێ لە شوێنە گەورە و گرینگەکانی زانست و تەریقەت لە کوردەواریدا.

شێخ عومەر زیائەدین زاتێکی ممبارەک بووە و کەشف و کەرامەتی زۆریان لێ گێڕاوەتەوە. خەڵکێکی زۆر لە ژێر چاوەدێری ئەودا بارهاتوون و بەهرەمەند بوون و گەلێک سەرلێشێواو و ژیان دۆڕاو، بە پێـی هەناسـەی گەرمییەوە، بووژانەوە و بەرەو ڕاستەڕێ گەڕانەوە. لە عـەرەبی نووسـیندا زۆر شـارەزا بـووە و فارسیـشی بـاش نووسیوە. شیعریشی گوتووە و نازنـاوی «فـەوزی» هەڵـبژاردووە و هێنـدێک شـیعری کـوردی و فارسـی لـێ بەجێماوە. لەگەڵ خوالێخۆشبوو حاجی شێخ ئیسمایلی کاشتەری ـباپیری نووسەر ـ دا، بە فارسی و عەرەبی نامەیان گۆڕیوەتەوە کە بڕێکیانم لا هەیە و یەک بە یەکیان پیشاندەری قەوەتی قەڵەمی نووسەریەتی.

**ئەمەش چەند شیعری کوردی ڕەوانشاد فەوزی:**

کولاهی سیحەتم ناوێ کە عیللـەت تـاجی زیللەتمـە
کەوای عیززەت لەبەر ناکەم کە قیللەت بـەرگی ڕەحمەتمـە

عـەیادەت بـۆکەسـێ چاکـە گرفتـاری تەبیعـەت بـێ
کە مـن مـەفتوونی جانـانم چ بـاکی دەرد و عیللەتمـە

ئەگـەر دڵـبەر بلاوێنـێ هـەموو دەرد و بـەلا خۆشـە
لەگەڵ مەیل و ڕەزای جانان چ باکی سـوقم و سـیحەتمە؟

کە دیم خوون جارییە ئەمڕۆ لە جەرگ و دڵ وەکـوو سـەیلاب
وتم ئـەم شـاهدە بـەس بـۆ حیـساباتی قیامەتمـە

قەزای ئەو هەرچی بووبێ من ڕەزام گـەر خوشـە یـا تەڵـخە
لەگەڵ مەیل و ئێرادەی حەق جەهەننەم عەینی جەننەتمـە

قوسوورم زۆرە، کارم سەختە، دەردم کارییـە «فـەوزی»
ئەوا تەنها ئومێـد و مەخلەسـم عیـشق و مەحەبەتمـە

فــەقیهــی مــەدرەســی تــەوحیــدم ئــەمــڕۆ
فـــەریـــدی دایـــرەی تەفریـــدم ئەمـــڕۆ
ڕەزا نـــابم کـــە ئـــەغیـــار بێنـــە مـــەجلیس
بـــە چـــەوگانی قـــەزا تەبعیـــدم ئەمـــڕۆ
لـــە تـــەنزیها نییـــە هـــیچ کـــەس ڕەفـــێقم
چـــرای کاروانـــەڕێی تەحمیـــدم ئەمـــڕۆ
عـــەلایق دەردی بـــێدەرمانـــە «فـــەوزی»
ڕەئیـــسی عەســـکەری تەجریـــدم ئەمـــڕۆ

* * *

قیبلـــــــە! وەردەنم، قیبلـــــــە! وەردەنم
جەوســـــاوە ژارا و دووریـــــــت وەردەنم
چـــەنی دڵ و گیـــان شـــەرتێ کـــەردەنم
مـــەیل نـــەدۆ وە کـــەس تـــا ڕۆی مـــەردەنم
دڵ یەنـــد مەینـــەتان موســـیبەت کـــڕیان
تـــای تـــامڵ، ئـــازیز جـــە دەســـتش بـــڕیان
پـــای ســـەبرش هـــالا شکەســـت ئـــاوەردەن
پەوکە شـــەو تـــا ڕۆ ویـــردش ئـــی فـــەردەن:
فەڵـــەک داخ وە دڵ جەســـــتەمدا بـــەردی
ژاراو دووری ئـــــــــازیز پـــــــێم وەردی

* * *

قیبلـــەم! هـــا بـــەردم، قیبلـــەم هـــا بـــەردم
داغ دووری تــــــۆ وە گــــــڵکۆ بــــــەردم
وەمـــــەیل تـــــۆوە ڕوو وە چـــــوڵ کـــــەردم
ژار دووری و دەرد هیجـــران گـــشت وەردم
یانـــێ ئـــازیزم عەشـــق تـــۆم نەســـــەر
وە عەشـــق تـــۆوە هـــا شـــیم وە مەحـــشەر
تۆخـــوا بـــە وەفـــا و مـــەیل وەرینـــت
بنمانـــە جارـــجـــار وە مـــن جـــەمینت
بنمانــــــە قامـــــەت وەی زامـــــەت وەردە
پـــەری ئـــەو قامـــەت داخ وەگـــڵ بـــەردە
تاجــــەو ڕۆ دەم ـــــ دەم وە بـــێ مـــدارا
«قَدْ قامَت» واچـوون هەرسـات نـەو سـارا
چونکـــە زیکـــر تـــۆن مایـــەی حـــەیاتم
وەشی و شـادی و شـەوق مایـەی نیـشاتم
جـــەو مەماتـــەدا بـــا تـــۆم جـــەیاد بـــۆ
جـــەو عاڵـــەمەدا دڵ وەتـــۆ شـــاد بـــۆ

* * *

وەشـــــــا نـــــــــازارێ لاونــــــــا دڵان
جە وەخـت خـەزان، جـە فەسـڵ گـوڵان
دڵان وەشیـــــــشان جـــــــە ئازارانـــــــەن
وەشـــڕەنگی گـــوڵان نمـــەو وارانـــەن
ئەو وەشی و ئەورەنگ، ئێـد ناڵـەی سـەحەر
گـرد بـان وە فـدای نـیمنگـای دڵـبەر

**شیعرێکی فارسی فەوزی:**

خرقـــە را در گـــرو مهـــر تـــو دادن اولـــی
جـان شـیرین بـه ره عـشق نهـادن اولـی
گو به رویـم همـه درهـای جهـان بسته شـود
کـه بـه رویـم در لُطـف تـو گـشادن اولـی
عـزّت و منزلـت و مَجـد نجـویم هر گـز
همچـو خاشـاک بـه راه تـو فُتـادن اولـی
ثـروت و قـدرت و هـستی ندهـد فائـدەای
همـه را دادن و عـشق تـو سـتادن اولـی

گــر نــه مقــصود شناســایی خــالق باشــد «فوزیــا» از شــکم مــام نَــزادن اولــی

یاداشتەکانی نووسەر. *یادی مەردان*، ب٢، ل ١٦٦ تا ١٦٨.

## باکی

سۆفی باسەفا و شاعیری شەیدا، مەلا مەحموود، نازناو «باکی»، خەڵکی گوندی «خورخورە»ی لای سەقز، مرۆیەکی هێژا و پارسا لە مریدانی شێخ عومەر زیائەدینی نەقشبەندی بووە کە بە ئیشی کەنەکاری (حَکّاکی) ژیانی بەڕێوە بردووە.

زا و مەرگی مەلا مەحموودی باکی ساڵانی ١٢٥٢ و ١٣١٨ ک. م. ڕوویداوە.

ئەم غەزەلەی بۆ مورشیدەکەی نووسیوە:

ای بـــلای دل صـــاحبنظران بالایـــت آتــش خــرمن ســودازدگان ســیمایت

قُوت جان طرفه نگاهی ز دو چشم سیهت قُــوَّت دل سُــخنی زان لــب شــکرخایت

عــیش جَنَّــت ثَمَــری از شَــجر دیــدارت تــاب دوزخ شَــرَری از غــم جانفرســایت

مست و مخمور سر از خاک لحد بردارد هـر کـه لَـب تـر کنـد از چاشنی صـهبایت

گـر ز شـوریدەدلان شـور قیامـت خـواهی جلوه ده طلعت جانبخش جهان آرایت

نازنینــا بــه ســراپردەی عــزت بــاز آی کُور آن چشم که خالی ز تو بیند جایت

دیــدەی خــاکنــشینان ســر کویــت را باز روشن کن از آن سُرمەی خاک پایت

مـا بـه دام تـو گرفتـار و تـو از مـا بیـزار تــو ز مــا فــارغ و مــا شــیفته و شــیدایت

جـان بـه لـب آمـده پروانـەی دلـسوخته را شمع جان! تا به کی آخر نبود پروایت

ذرّەای‌اَم بــه هــوای رخ تــو ســر گردان والـەی حُـسن «ضـیا»، غمـزدەی سـودایت

نظــری بــر مــن بیچــارەی مــسکین فرمــا مــن فــدای نظــر و منظــر مهرافزایــت

بـاکی از «بـاکی» دلتنـگ و پریـشانت نیـست ســـرورم! آه ز بیبـــاکی و اســـتغنایت

*یادی مەردان*، ب٢، ل ٥٦٩. جونگێکی دەسنووس.

## مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی

خەڵکی گوندی «دێلێژە»ی سەر بە ناوچەی قەرەداغە کە ساڵی ١٢٥٠ یان ١٢٥٢ ک. م. لەدایکبووە و لە شاری سلێمانی، لای مامۆستایانی ناوداری ئەوێ چەند ساڵ خوێندوویە و پاشان چۆتە بەغدا و لە کۆڕی دەرسی عەللامە موفتی زەهاوی بەهرەی بردووە و ئیجازەی وەرگرتووە و ئەوجار ڕووی لە ئەستەمبووڵ ناوە و لەوێ سەرەتا دادوەریی «شاربازێڕ» و بە دوویدا چەند شوێنی تری پێ سپێراوە؛ بەڵام سەرەنجام دەس لە

داوەری بەردەدا و دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و دەرس گوتنەوە دەسپێدەکا و دەیپەردەژێ چەند کتێبی بایەخداریش بنووسێ؛ کتێبانی وەک: نامیلکەیەک سەبارەت بە خودای تاکی تواناوە و هەروەها زنجیرەیەک بە ناوی «*الفَتاوی*».

حاجی مەلا ئەحمەد ڵالی ١٣١٨ ک. م. لە شاری سلێمانی ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە زیارەتانی «گردی شێخ محیەدین» نێژراوە.

*مُفتی زَهاوی*، ل ٣٠. *تاریخ سُلیمانیّه*.

## مەلا عەبدوڕڕەحمانی پێنجوێنی

عەللامەی توێژەر و مامۆستای پایەبەرز، مەلا عەبدوڕڕەحمانی پێنجوێنی، کوڕی مەلا موحەممەد و لە تۆرەمەی شێخ نوورەدینی بریفکانی، ساڵی ١٢٤٤ ک. م. لە پێنجوێن هاتە جەهانەوە و کە پێگەیشت، خوێندنی دەسپێکرد و زۆربەی شارەکانی کوردستانی ڕۆژاوای بە هیوا و خۆشی گەیشتنە خزمەتی مامۆستایانی زانا و فێر بوون، داپاوە و زۆری سەخڵەتی کێشا و لە ئاکامدا گەیشتە تورجان و ماوەیەک لە بەردەستی ئوستادی پایەبەرز، مەلا عەلی قزڵجی تورجانی خوێندی و ئیجازەی لێ وەرگرت.

مەلاوڕەحمان پاش کۆتایی هاتنی خوێندنەکەی، گەڕاوە پێنجوێن و ماوەی ٤٠ ساڵ دەرسی گوتەوە و زۆرێک فەقێ و قوتابی پێگەیاند. ماوەیەکیش کۆچی کرد بۆ سلێمانی و لە مەدرەسەی مزگەوتی گەورەدا دەرسی گوت؛ بەڵام دوایی گەڕاوە پێنجوێن و لەوێ ساڵی ١٣١٨ یان ١٩ ک. م. کۆچی یەکجاری کرد.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێز لەسەر «*گَلَنبَوی بُرهان*» لە مەنتیقدا، کە ساڵی ١٣٤٧ ک. م. لە میسر چاپ کرا و هەروەها پەراوێز بۆ «*آدابُ‌البَحْث*»، کە ئەویش لە میسر، ساڵی ١٣٥٣ لە چاپ درا.

پێشەکی *گَلَنبوی بُرهان*. *تاریخ سُلیمانیّه*، ل ٢٦٢. *مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٢.

## شێخ موحەممەد نەسیمی مەردوخی

کوڕی حاجی شێخ موحەممەد سەعید، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامە، لە زانایانی هێژا و پارسای بنەماڵەی مەردۆخییە کە ژیانی بە خوێندنەوە و تۆژینەوە و دەرس گوتنەوە تێپەڕ کردووە و ساڵی ١٢٧١ ک. م. دەگەڵ برای پایەبەرزی (شێخی موهاجیر)دا، لە سنە کۆچی کردووە بۆ شارەزوور چووە و ساڵی ١٣١٩ ک. م. لە «گوڵعەنبەر»ی ئەو ناوچەدا دنیای بەجێهێشتووە.

شێخ نەسیم شاعیر و وێژەوانیش بووە و شیعری گۆرانی زۆر ڕەوان و جوانی لێ بەجێ ماوە؛ یەکیان:

جەژن یارانەن، جەژن یارانەن ئارۆ سەبا ڕۆی جەژن یارانەن

وادەی شادی و زەوق هەردەجارانەن وەشی و بەشارەت گرۆی یارانەن

گلــــەی گوزەشـــتەی هـــەمقەتارانـــەن
گـــــەردنئـــــازادی خاترادرانــــــەن

فـــەســـل ئاموشـــۆی شـــەکەر ڕازانـــن
دەس نــە مــل کــەردەی ئــاوات وازانــەن

ئـــارایش کـــەردەی تیـــپ خاســـانەن
نـــەزم نەزاکـــەت شـــیرینیاســـانەن

تــەرتیب مــەدان خــاڵ ســونع ڕەببــانی
مەکێـشان وەچـەم سـورمەی سـوبحانی

بـۆی عـەتر و عـەبیر هـەم موشـک شـاران
گـــولاو پاشـــییەن نەبـــەین یـــاران

ســەرتاپای وێــشان زەرپــەفت مەپوشــان
دەستە بە دەستە، جوقجـوق مەخرۆشـان

جـــوقجـــوق مــــەوینان و بانانـــەوە
یەکایـــەک خوێـــشان مەوانانـــەوە

شــەققەی مــاچ و مــووچ، دەم لــە نــاو دەم
کــەردەن ئــازادی مــەوازان جــە هــەم

جــەو دمــا پــەی زەوق ئامــای عیــد نــۆ
ڕووە مەنیان پەی دەشت، سارا و کـەژ و کـۆ

نیمـــێ وە ســـارا، نیمـــێ ســـای داران
بــەعزێ مەشــان ســای بــەرزەچنــاران

دەســـتەی خـــاتر تـــەنگ ســـیا مەپۆشـــان
مەشـــان وە مـــاوای شـــار خامۆشـــان

شـــیوەن مەکـــەران بـــێئەنـــدازەوە
بــۆ مــەنیان وە بــۆی گــڵکۆی تــازەوە

بــەعزێ هــەم تــەناف مــەرخوز شــاران
مـــەوەزان نـــەڕووی شـــاخ چنـــاران

پــا مــەنیان تــەناف مــەیان وە پــەرواز
هاتوچوو مەکـەن وە سـەد غـەمزە و نـاز

هــەر ســاڵ بــەی وێنــە شــادی تەمامــەن
عــەود عیــد نــۆ پــەرێ گــشت عامــەن

غــەیر جــە مــن و تــۆ خــاتر مەینــەتبــار
دوور کەفتـــەی وەتـــەن نـــەیاران پێـــوار

نــە خــوێش نــە دڵــسۆز نــە دۆس جــاران
غەریب و بێ کـەس، دوورکەفتـەی شـاران

نـــەدەنگ هـــاودەم، نـــە ڕەنـــگ دڵـــسۆز
نەکەس هـەن واچـۆ جـەژن نـۆت پـیرۆز

تەنخوای شادی و جەژن خـدێمان شـینەن
ڕەفێقمـــان غەمـــەن، یارمـــان گرینـــەن

دەربـــەدەر کەفتـــەی شـــاران نـــە شـــاران
مەحرووم و مەهجوور جـە ڕووی گـشت یـاران

نـــەجای ئومیـــدەن، نـــە فەریادڕەســـەن
نــە کــەس مــەواچۆ ئینــە چ‌کەســەن؟

مەکـــەرۆن خـــەیاڵ وەشـــی ڕۆزگـــار
فێـشتەر کـۆی ئەلـەم وەنـەم مـەبۆ بـار

هەرکـــەس غەریبـــەن خـــاتر پـــڕ دەردەن
دەرد غـــــەریبی عــــــەجایب دەردەن

ئـــێش دووری دۆس فـــەراوان ســـەختەن
یـــاران بزانـــدێ غـــەریب بەدبەختـــەن

خوسووس پەرێ مـن جـە حـەد ویـەردەن
غەریب پـێم ماچـان تـا وەڕووی مـەردەن

یـــە «نەســـیم» واتـــەن ئـــاوارەی شـــاران
کەس وەشی دونیـاش تـا سـەر مـەویاران

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل٦٠٦. چەند جونگی دەسنووس.

## ئاهی

ساڵح ئەفەندی، نازناو «ئاهی»، خەڵکی شاری سلێمانی، لـە شـاعیرانی ئـاخر و ئـۆخری چـەرخی سـێزدە و سەرەتاکانی چەرخی چاردەیە کە زۆرتر لە کۆیە ژیاوە و زیاد لە شـاعیری، پیـاوێکی زانـاش بـووە. ئـەم دوو غەزەلە هی ئەوە:

| | |
|---|---|
| خودا هەڵناگرێ چاوم ئەمەنـدە شـێت و شـەیدا بم | لە مابەینی خەلایقدا وەهـا مـەهتووک و ڕیـسوا بم |
| گەلێ دەفعە ئەڵێم بـێم دڵ بگـۆڕم خـۆمم لـەوی لادەم | لە دووریدا خەریک دەردم بەڵام وا چاکـە یەکـرا بم |
| چ ئینسافێکە ئەی نەیقامەت و غونچە دەهـان و شـۆخ؟ | وەکوو بولبوڵ هەمیشە هەر بەهاوار و بـە غـەوغا بم |
| هەتا کەی سا زەقوومی محنەتی دووریـت بچێـژم مـن؟ | بە شێتی وێڵ و سەرگەردانی دەشت و کێو و سـەحرا بم |
| دەبێ «ئاهی» لە جـەژنی وەسـڵی دڵـبەردا بـە قوربـانی | قەدی باریک و لێوی ئاڵ و چـاوی مەسـت و شـەهلا بم |

* * *

| | |
|---|---|
| نوکتەی دەمی مەخفی لە فەلاتوونی خەیاڵە | سیرڕێکە بە سەد فەلسەفە ئیزاحـی مەحاڵـە |
| پەروانە سیفەت دڵ بە چرای عاریزی پاکـت | سـەرباختە و سـووختە و بـێ‌پـەڕ و باڵـە |
| سەرمەست و بریندارى مـوژە و چـاوی خومـارە | ماتـەم زەدە و شـیفتەیی پەرچـەم و خاڵـە |
| «ئاهی»! کە غولام و خەدەمی حـەزرەتی یـاری | ناڵێ بخەرە گوێتەوە وەک حەڵـقە لـە ناڵـە |

*شیعر و ئەدەبیاتی کوردی*، ڕەفیق حیلمی. *تاریخ سُلیمانیّە*، ل ١٦٠.

## سیدقی ماردینی

یۆسف سیدقی، کوڕی عومەر شەوقی، مامۆستایەکی فیقهی حەنەفی خەڵکی ماردین بووە کـە پـاش تـەواو کردنی دەرس و دەور، چووە بۆ ئەستەمبووڵ و بۆتە قازی عەسکەر و ئەندامی کۆڕی لێکۆڵینەوەی شەرعی.

**لە کتێبەکانی**: «*مَحاسِنِ الحُسام*»، «*مِعراجُ المُعْتَمر و الحاج*» و «*مَسیرُالموحّدین الی اِحیاء عُلُومِ الدّین*».

مامۆستا یۆسف سیدقی ساڵی ١٣١٩ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

*الاعلام*، زرکلی، ب٩، ل ٣١٠. *هدیّةُ العارفین*، ب٢، ل ٥٧١. *ایضاحُ المَکنوُن*، ب٢، ل ٤٤٠.

## شێخ عەبدوڵڵای کەمانگەر

کوڕی مەولانا ئەحمەدی کەمانگەر، لە شێخە گەورەکانی تەریقەتی نەقشبەندییە کە لای بابییەوە تەریقەتی وەرگرتووە و لەگەڵ وردەکارییەکانیدا ئاشنا بووە و پاشان، ساڵانێکی زۆر لـە گونـدی «ماسـان»ی لای سـنە، ئیرشادی کردووە.



حاجی شێخ عەبدوڵلا مرۆیەکی پارسا و عارفێکی دڵئاگا و شارەزا لە قۆناخەکانی سەیر و سولووک بووە. بابی ڕەحمەتیم لە ساڵانی ١٣٠٧ و ١٣٠٨ ک. م. لە قوتابخانەی ئایینی ماساندا خوێندوویە و لەو سەردەمە شێخ عەبدوڵلا لەوێ ئیرشادی کردووە. زۆر جاران باسی کەرامەت و پایەبەرزی ئەو زاتەی دەگێڕاوە.

کۆچی دوایی شێخ، ساڵی ١٣١٩ ک. م. لە ماسان ڕوویداوە. ئەم چەند بەیتە بەشێک لەو قەسیدەیەکە بابم لە شینیدا دایناوە:

| | |
|---|---|
| قُطب سامان‌رسان ز ماسان شد | نَوحه بر اهل عالم آسان شد |
| رخت بَربَست سوی عالم غیب | چون ز صحن جهان هراسان شد |
| برکاتی شد از کف این ملك | کز کف دهلی و خراسان شد |
| هاتفی خواند بهر تاریخش | «کهف ماسان به جای خاسان شد»[1] |

یاداشتەکانی نووسەر.

## ئەحمەد خولووس ئەفەندی

کوڕی شێخ ئیسمایلی شیروانی، لە زانایان و وێژەوانانی سەرەتای چەرخی چاردەیە کە کاروباری زۆرتر، دادوەری لە شارە ترکەکاندا بووە و هاوکات دەرسیشی گوتووە و کتێبیشی نووسیوە و سەرەنجام لە کۆتایی بیستەکانی چەرخی چاردەی کۆچیدا بەشی لە دنیا بڕاوە و لە شاری ئاماسیەدا نێژراوە.

*ذیل کشف‌الظنون*.

## شێخ ئیسمایلی کاشتەری

کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی «شیخ‌الشیوخ» عەبدولغەفووری کاشتەری، عارفێکی زانا لە بنەماڵەی مەردۆخییەکانی کاشتەرە کە بە ساوایی باوکی لە دنیا چووە و باپیری گەورەی کردووە. لەو سەردەمەدا گوندی کاشتەر خاوەن قوتابخانە و قوتابی و فەقێ بووە و شێخ غەفوور دەرس و دەوری کوڕەزاکەی لە ژێر چاوەدێری خۆیدا، بە قوتابیانی موستەعید سپاردووە؛ تا تەواو پێگەیشتووە و لە هەموو بارێکەوە لێهاتوویی خۆی دەرخستووە.

پلە و پایەی هێژایی و زانستیی شێخ ئیسماعیل تا ڕادەیەک بووە کە زانایانی هاوماڵی لە بەرامبەر هێزی هزر و قەوەتی قەڵەمیدا ورەیان بەرداوە. لە باری نووسین بە فارسی و عەرەبی و هەروەها دەمپاراوی و قسەزانییەوە کەس تۆزی نەشکاندووە. لەگەڵ ئەوانەدا، باڵای بەرز و ناوچاوی ڕوون و نوورانی و خۆ و خدەی پەسندی، بۆتە هۆی ئەوە هەموو چینی خەڵک، ڕێزیان لێ گرتووە. مەردمی چەوسێنراو و بەش خوراو، کە

---

١. بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ١٣١٩.

ناویان بیستبێ، ڕوویان لـە دەرکـی ماڵـی نـاوە و بـە بۆنـەی کەسـایەتی بـەرز و بڕشـتی قـسەیەوە، داوای یارمەتییان لێ کردووە؛ بەتایبەت بۆ ڕزگاری لە ستەمی حاکمان و پیاوانی حوکمەت، زۆر جاران پەنایان پـێ بردووە.

حاجی شێخ ئیسمایل لە کونجی خانەقادا، سـۆفییەکی بـێ گـەرد و لـە گۆشـەی مزگەوتـدا، دینـدارێکی بێ‌خەوش و لە کۆڕی وێژەوانان و زانایاندا، وتاربێژێکی لەزەبر بووە و لە سـەرینەی ئەمانـە، بـۆ سـوارچاکی و تیرهاوێژی، گرۆی لە هەموان بردۆتەوە. لە تەریقەت و سەیر و سولووکیشدا دەستی بووە و سەری بە عارفی پایەبەرز، شێخ موحەممەد بەهائەدینی عوسمانی سپاردووە.

ئەوی لە شیعر و پەخشان لێی ماوەتەوە، چەند چوارینەی فارسی و شین‌نامەیەکە لە تەمەنی ٢٤ سـاڵاندا بۆ کۆچی یەکجاری باپیری گوتوویە:

در خـدمت خلـق بـاش و بـا یـزدان بـاش — هـم بنـدەی ایـن و هـم پنـاە آن بـاش
ز آمیـزش اهـل زور و زر یکـسو بـاش — و آزار دچـار درد را درمـان بـاش

* * *

از گـردش روزگـار آزردە مبـاش — غمگـین منـشین چنـین و افـسردە مبـاش
خـواهی مُـردن، کنـون کـە هـستی زنـدە — پژمـردە و ژولیـدە و دلمـردە مبـاش

* * *

کـشتی شـکتە بـر لـب دریـا نشـستەام — جـا مانـدەام ز قافلـە و ز پـا نشـستەام
گـر ناخـدا برفـت، خـدایا بـە حـال زار — افتـادە بـر درت بـە تمنـا نشـستەام

* * *

أرَی فـی فُـؤادی لَـوْعَـةً وَغَرامـا — غَرامـاً سَـقانی أزْمَـةً وَسَـقاما
وَأورَثَنـی حُزنـاً حَکی حُـزْنَ یُوسُـفا — إذا لَبْثُـهُ فـی الـسّجْن کـانَ مُـداما
وَحَمَّلَنـی إصْـراً مَتـی مـا حَملتُـهُ — عَلـی الأرض ضَـجَّتْ دکَّـةً و انْفـصاما
فمـا حـالُ فـرع بـاتَ أصـلُهُ یابـسا — وَنـال عَلـی قَـصِّ الجنـاح سـماما
و مـا بـالُ طَیـر قُـصَّ جُـلُّ جَناحـه — و حـازَ عَلـی قـصّ الجنـاح سـماما
بحالَیْهمـا حاشـا هُمـا مـنْ کَـآبَتی — فَقَـدْ فـاتَنی مَـنْ کـانَ فینـا قوامـا
هُـوَ الوالـدُ البـرُّ العطُـوف المُمَجَّـدُ — وَمَـن کـانَ فـی التّقْـوی أماماً هُمامـا
هُـوَ الوالـدُ المولُـودُ مـنْ صُـلْب ماجـد — وَکـانَ لآبـائی الْکـرام ختامـا
بآبائـه الغُـرّ اقْتـدی فَاهْتـدی بهـمْ — اُنـاسٌ تَـریهُمْ سُـجّداً و قیامـاً
لَقَـدْ سَـلَفُوا طُـرّاً بفَـضل وَخَلَّفُـوا — فَـضائلَ لا تُحْـصی وَمَـرّوا کرامـاً

وَ قــــــامَ بــــــأمرالله حينـــــاً وَ إنَّـــــهُ كمـــا كـــــانَ قَوّامـــاً عَلَيـــه اســـتقاماً
فيـــا غـــافرَ الـــذَّنب ارْضَ عَنـــهُ و أرضـــه وَ بَلِّغْـــهُ فـــي دار الـــسّلام، ســـــلاما
و آمنْـــهُ مـــنْ أهْـــوال زلْـــزال ســـاعـــة بهـــا النّـــاسُ طُـــرّاً يَنْظُـــرونَ هيامـــا
و يـــا ربَّنـــا احْـــشُرْهُ مَـــعَ الـــصّحب آمنـــاً مُـــسَوّى لَـــهُ أعْلَـــى الجنـــان مقامـــا
زد اثنَـــيْن وَ احْـــسبْ عـــامَ تـــاريخ مَوْتـــه «يُـــــرى رَمْـــــسُهُ لِلْمُتَّقـــينَ إمامـــــاً»

یاداشتەکانی نووسەر.

## هائیم

میرزا عەبدورڕەحیم، خەڵکی سلێمانی، لە شیعر و ویژەدا خاوەن ناو بووە و نازناوی «هائیم»ی هەڵـبژاردووە و ساڵی ١٣٢٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

*یادی ئەدیبان*، ل٦٦.

## شێخ عەبدولکەریمی مەردۆخی

کوڕی شێخ عەبدولقادیری موهاجیر، لە زانایان و مامۆستایانی سەرەتای چەرخی چاردەی کۆچی‌ـمانگییـە کە لە هەرەتی لاوەتیدا، هاوڕێ بابی پایەبەرز و مامی زانای (شێخ موحەممەد وەسیم)، ساڵـی ١٢٧١ک. م. لە سنەوە بۆ سلێمانی کۆچی کردووە و پاش کۆچی یەکجاری بـابی لـە ١٣٠٥دا، جێـی ئـەوی گرتۆتـەوە و لەوپەڕی ڕێز و وەجدا ژیاوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٢٠ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

لە شێخ عەبدولکەریم کوڕێک بە ناوی شێخ عەبدوللەتیف بەجێ‌ماوە کە پـاش بـابی ماوەیـەک خـەریکی سەعاتسازی بووە و سەرەتێک ددانسازی کردووە و لەم پیشەدا وەستایەکی باشی لێ دەرچووە.

*عُلَماونا فی خدمـةالعلـمِ و الـدّین*، ل٣١٩.

*یـــادی مـــەردان*، ب٢، ل ٣٩٩ و ٤٠٢.

## مەلا موحەممەدی کوانەدۆڵی

زانای ئاگا، مەلا موحەممەد، خەڵکی گوندی «کوانەدۆڵ»ی سەربە پێنجوێن، ساڵی ١٢٧٠ ک. م. لـە دایـک بووە و خوێندنی لە ڕۆژاوای کوردستاندا تەواو کردووە و چۆتە بەغدا و لە مەلا موحەممەدی فەیزی زەهـاوی ئیجازەی وەرگرتووە. پاشان بە دەرس‌گوتنەوە، لە خانەقین دامەزراوە و دەوری ساڵەکانی ١٣٢٠ ک. م. بـە یەکجاری دەستی لە دنیا بەرداوە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٥٢٩.

## موحەممەد ئەمینی سوورەبەردی

کــوڕی عەبــدوڕڕەحمان، کــوڕی موحەممــەد موحــسین، کــوڕی موحەممــەد ساڵــەحی ســوورەبەردی، مێژووزانێکی بەناوبانگە کە نیشتەجێی بەغدا بووە و ساڵی ١٣٢٠ ک. م. لەو شارە دنیای بەجێهێشتووە.

ئەم مامۆستایە دوای خوێندن، ماوەیەک دەرسی گوتووە و سەردەمێک بۆتــە ئەنــدامی دادگــەی تۆژینــەوە (مَحکمەی استیناف) لە بەغدا و هێندێکیش شارەداری سامەرا و چەن شاری تر بووە.

**لە کتێبەکانی**: «*تاریخ بغداد*»، کە وەکوو پاشکۆیەک بۆ مێژووەکــەی باپیرەگــەورەی، موحەممــەد ساڵــەحی سوورەبەردی، وتاربێژی «دارُالسّلام»، واتا بەغدای نووســیوە. هــەروەها زنجــیرە وتــارێکی وێژەیــی و دیــوانی شیعر.

*الاعلام*، زرکلی، ب٦، ل٢٦٩.

## یۆسف زیائەددینی ئەسعەردی

یۆسف زیائەدین ئەفەندی، کوڕی شێخ حوسەینی ئەســعەردی، لــە زانایــانی ناســراوی ســەرەتای چــەرخی چاردەیە کە لە قوتابخانەی شاری ئەسعەرددا دەرسی گوتۆتەوە و چەند بەرهەمێکی لێ بەجێمــاوە؛ یــەکیان پەسندێکە بە شیعری عەرەبی لەسەر کتێبی «*الهدیّةُ الحَمیدیّةُ فی اللُّغةُ الکُردیّة*»[1]، کە ئەوا سێ بەیتی:

احلــی کتــاب فــی لغــی الاکــراد قــد — جَمَـــعَ الجمیـــعَ و قَـــدْ سَـــماتَرْتیبا
وَ حَــوی الاصــولَ الغُــرَّ غیــرَ مُغــادر — فـــی الکَـــشف افْـــراداً وَ لا ترْکیبـــا
مُـــذْتَمّ إمْـــلاءُ الهَـــدیَّـــة ارّخـــت — «أمْلَـــی الکتـــابَ بـــنُ الخلیـــل اَدیبـــا»

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٢٢٦.

---

١. ئەم کتێبە یۆسف زیائەدین پاشا خالیدی موقەددەسی، کوڕی حاجی محەممەد، کوڕی عەلی نووسیویە؛ کە ساڵــی ١٢٥٨ ک. م. لە قودس هاتۆتە دنیاوە و ساڵی ١٣٢٤، هەر لەوی دەستی لە جیهان بڕاوە. بابی پیاوێکی دەسەڵاتدار لــە دەوڵەتی عوسمانی و حاکمی ئەرزڕووم بووە و یۆسفیش چەند مەقامی بەرزی دەفتــەری و دیــوانی پــێ دراوە و لەبــەر زانینی ترکی و فارسی و تەنانەت کوردی، زۆرتر بۆ وڵاتە غەیرە عەرەبەکانیان ناردووە و ماوەیەکیش لە قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکاندا دەرسی گوتووە.

یۆسف زیائەدین پاشا کاتی هەبوونی لە بدلیس فێری کوردی بووە و دواجار کە دیتوویە کتێبێکی باش لەمەڕ ڕێزمــان و وشەی کوردییەوە نەنووسراوە، خۆی بۆ نووسینی ئەو کتێبە چاکی لێ هەڵماڵیوە و «*الهدیّةُ الحَمیدیّةُ فی اللُّغةُ الکُردیّــة*»ی ناو ناوە و لە چاپیشی داوە.

*الاعلام*، زرکلی، ب٩، ل٣١٠.

## شێخ مەحموودی خالیدی

شێخ مەحموود ئەفەندی حەمزەوی خالیدی، پوورزای زیائەدین ئەفەندی، لە زانایان و ویژەوانانی چەرخی چاردە و مامۆستای قوتابخانەی «جامعُ‌الکبیر»ی شاری ئەسعەرد بووە کە چەند کتێبیشی نووسیوە و هێندێکیان چاپ کراون.

ئەم دوو بەیتە لە قەتعەیەکە بۆ پەسندی کتێبی «*الهدیّةُ الحَمیدیّةُ فی اللُّغةُ الکُردیّة*» نووسیویە:

عوفیت من موجبات السوء و الکمد     وَعشْتَ یا ابْنَ کرام النّاس بالرَّغَد
أذْقُمْتَ تَنْشُرُ أنوار المَعارف بَعْ     دَبَسْطكَ العَدْلَ فی الأطْراف وَ البَلَد

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٨٥.

## شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەسعەردی

شێخ ڕەحمانی، کوڕی مەلا حوسەین، کوڕی مستەفا، زانایەکی ئایینی و شاعیر و ویژەوانی شاری ئەسعەرد بووە کە ژیانی بە خوێندن و دەرس‌گوتنەوە و ڕێنوێنی خەڵک تێپەڕ کردووە و جاروبارە شیعریشی گوتووە و تا کۆتایی بیستەکانی چەرخی چاردەی کۆچی ژیاوە.

ئەم چوار بەیتە لە قەسیدەیەکە بۆ پەسندی کتێبی «*الهدیّةُ الحَمیدیّةُ فی اللُّغةُ الکُردیّة*» هۆنیویەتەوە:

وَ غَدَتْ مَآ ثرُهُ الحمیدة تُکْتَبُ     عَنْ سَیِّد سَبَقَ الکرامَ سَلیلا
أعنی ضیاءالدّین یُوسُفَ مَنْ غَدا     بقُدُومه عَنّا العنا مَقْفُولا
شَمْسُ بأرْض القُدْس شیمَ ضیاوُها     فَتَنَوَّرت منْها اَلبقاعُ شُمُولا
حقٌّ عَلَیْنا شَرْحُ مَتْن ثَنائه     فی کُلّ یَوْم بُکْرَةً وَ أصیلا

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٤.

## مەلا مستەفا عاسیم ئەفەندی

مەلا مستەفا عاسیم ئەفەندی ئەسعەردی لە زانایان و ویژەوانانی چەرخی چاردە و مامۆستای مەدرەسەی ساڵەحییەی شاری ئەسعەرد بووە کە ئەم سێ بەیتەی بۆ پەسندی کتێبی «*الهدیّةُ الحَمیدیّةُ فی اللُّغةُ الکُردیّة*» داناوە:

یَروی لُغی الأکراد، یَکشفُ سرَّها     بَدیع نَظْم لْلقَواعد ماهد
وَ الکُلُّ یَشْکُر فی الحَقیقَة هَمَّهُ     لسَلیل سَیف الله حَضْرَة خالد
یُوسُف ضیاءالدین باشا الشَّهم مَنْ     وَرثَ المَفاخر ما جداً عَنْ ماجد

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٩٣.



## مەلا فەتحوڵای ئەسعەردی

مەلا فەتحوڵا زانا و ویژەوانێکی چەرخی چواردەی کۆچی و مامۆستایەک بووە کە تا کۆتایی ژیانی دەرسی گوتۆتەوە و فەقێ و قوتابییانی بارهێناوە. ئەمیش بۆ کتێبی «*الهدیّةُ الحَمیدیّةُ فی اللُّغةُ الکُردیّة*» شیعرێکی هۆنیوەتەوە؛ بەڵام بە کوردی کرمانجی کە ئەوا دوو بەیتی:

ژ حەیوانات خودی ئیشقیوە چیکرد نەوعی ئینسانی
کودایی عەقڵەکی کامڵ ژووی تێ عیلم و عیرفانی
مەعارف ڕۆژبەڕۆژ زیدە دەبن حەتتا لە ناف کوردان
دەکەین تەئلیف حەمی کەس تێدەمێنن شاش و حەیرانی

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٠٣ و ١٠٤.

## شێخ حەسەنی شارەزووری

مرۆیەکی هێژا بووە کە پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، زێدی خۆی بەجێهێشتووە و شاری حەلەبی بۆ تێدا ژیان هەڵبژاردووە و لە قوتابخانەی ئەحمەدییەی ئەو شارە دەرسی گوتووە.

**لە کتێبەکانی**: «*المُوجَز*»، لە نەحو، «*سُلَّمُ المُرَتقی*»، لە مەنتیق و «*الأمانی*»، لە مەعانی و بەیاندا.

*هدیّةالعارفین*.

## مەلا حوسەینی سەبری

خەڵکی پشدەر و لە مامۆستایان و توێژەرانی بەناوبانگی بەغدا بووە کە پاش تەواو کردنی دەرس و دەور و وەرگرتنی ئیجازە لە خزمەتی عەللامە موفتی زەهاوی، لەو شارە گیرساوەتەوە و لە قوتابخانەی ئەعزەمییەدا بۆ دەرس‌گوتنەوە دامەزراوە و سەرەنجام لە بیستەکانی چەرخی چواردەدا ئەمری خوای بەجێهێناوە.

**لە کتێبەکانی**: شەرحێک بۆ کتێبی «*تشریحُ الأفلاک*»ی بەهائەدینی عامیلی و یەکێ ــ دوو نووسراوەی تر لەمەڕ هەیئەت و ڕیازییەوە.

حاجی شێخ عەبدولحەمیدی عیرفانی کانی‌مشکانی، سنەیی، لە شاگردانی موجازی مەلا حوسەینی پشدەری بووە.

*مُفتی زهاوی*، ل٣١.

## ئایشە عیسمەت تەیموور

کچی ئیسماعیل ڕوشدی پاشا، کوڕی موحەممەد تەیموور کاشف و سەرباشقەی بزووتنەوەی زانستی و

وێژەیی ژنانی میسرە کە ساڵی ١٢٥٦ ک. م. لە دایک بووە.

باپیری ئایشە (موحەممەد تەیموور کاشف)، کوڕی ئیسماعیل، کوڕی عەلی، لە کوردانی «قەرەجـۆلان»ی باکووری مووسڵ بووە کە سەرەتای چەرخی سێزدە بـۆ قـاهیرە چـووە و بـە هـۆی هێژایـی و لێهـاتوویی و هەروەها زانینی زمانی ترکی و عەرەبی، موحەممەد عەلی پاشا وەریگرتووە و حاواندوویەتەوە و لە ماوەیەکی کەمدا بووە بە یەک لە میرە جێبڕواکانی.[1]

ئایشە عیسمەت تەیموور هەر لە منداڵییەوە زۆر حەزی لە شیعر و زبان و وێژە کردووە و بابی کە بەمـەی زانیوە، بۆ ڕاهێنانی، حەولێکی باشی داوە و تەنانەت مامۆستای سەرماڵی بۆ گرتووە، زبانی عەرەبی و فارسـی و ترکی پێ فێر بکا. دواجار ئایشە بۆخۆی لە کۆڕە ئەدەبییەکاندا بەشداری دەکرد و گوێی بـۆ قـسە و باسـی مامۆستایان ڕادەگرت؛ تا لە بواری زبان و وێژەوانیدا گەیشتە ڕادەیەک، بە دەگمـەن ژنێکـی تـر گەیـشتبێ؛ شیعری تەڕ و پاراو، پەخشانی جوان و ڕازاوە و زبانی بێ گت و گرێ و ڕەوان ببوو.

ئایشە ساڵی ١٢٧١ ک. م. مێردی کردە موحەممەد تەوفیق بەگی کوڕی مەحموود بەگی ئەستەمبووڵـی و ڕەگەڵیدا چووە ئەو شارە و ئەرکی ماڵ و منداڵ کەوتە سەر شانی و ماوەیەک، تـەواو لـە شـیعر و کتێبـان دوور کەوتەوە؛ تا وردە ـوردە تەوحیدەی کچی پێگەیشت و توانی بەشێ لە کارو باری ماڵ بگرێتـە ئەسـتۆ و دایکی جاروبار بتوانێ هێندێک بخوێنێتەوە و بنووسێ.

ساڵی ١٢٨٩ ک. م. بابی و ١٢٩٢ شووەکەی عەمری خوایـان کـرد و ئایـشە نـاعیلاج گـەڕاوە قـاهیرە و ئەمجار هەموو کاتی تەرخانی خوێندنەوە و فێر بوون کرد و بـە هـۆی هێژایـی و پـشتگری و پـشوودرێژی، گەیشتە ئەوپەڕی پوختی و زانایی و تەواو هەڵیدا.

ساڵی ١٢٩٤ ک. م. تەوحیدەی کچی ـکە ئەو کاتە لاوێکی هەژدە ساڵان بووـ لە ناکاو پەپوولەی گیـانی هەڵفڕی و داخی جەرگ سووتانی بۆ دایکی داخداری بـەجێهێـشت و زامـی تـازەی بەسـەر کۆنەبرینانـدا خستەوە. شاعیری دڵناسکی وڵاتی نیل، حەوت ساڵان ئازیەتباری ئەم کچەی بوو. لەم ماوەدا بە هۆی ئـەو خەم و پەژارەوە، شیعری وای گوتووە لەوپەڕی جوانی و هەستبزوێنیدا؛ کە لە بـاری وێژەییـشەوە، هـەرکام شاکارێکن.

ئەم خاتوونە بە سێ زبانی عەرەبی و ترکی و فارسی شیعری گوتووە و قەسـیدەی زۆری لەمـەڕ هانـدانی ژنان بۆ فێر بوون و ڕاهاتنیان لەگەڵ ڕۆژگاری نوێدا داناوە.

بەرهەمە چاپکراوەکانی:

١. «*دیوان اشعار*» فارسی و ترکی، کە جارێک لە ئەستەمبوول و جارێکیش لە بەغدا چاپ کراوە.

---

١. بۆ زانینێکی زیاتر سەبارەت بە تەیموور کاشف، بڕوانە بۆ بەشی دووهەمی ئەم کتێبە، باسی خوونکاران و ماڵەمیران.

٢. «*حلیةُالطّراز*»، دیوانی شیعری عەرەبی، کە چەند جار لە قاهیرە چاپ کراوەتەوە.

٣. «*نتایجُ الاحوال و الاقوال و افعال*»، بریتی لە هێندێک حەکایەت و کورتە چیرۆکە بۆ ڕێنوێنی و ئامۆژگاری.

٤. «*مِرأتُ التَّأمُّل فی الأُمور*»، کتێبێکە باسی بەهرە و ئاکامی ئاکاری بەرز و ڕەوشتی جوان دەکا.

ئایشە عیسمەت تەیموور سەرەنجام ساڵی ١٣٢٠ ک. م. لە قاهیرە دنیای بەجێ‌هێشت.

**چەند پارچە لە شیعرەکانی**:

بیدِ العَفاف أصونُ عزَّ حجابی — و بعصْمَتی أسْموُ عَلی أتْرابی
وَ بفكْرَةٍ وَقّادَة وَ قَریحَةٍ — نَقّادَة قَدْ كُمّلت آدابی
ما ضَرَّنی أدَبی و حُسنُ تَعَلُّمی — إلّا بكَونی زَهْرَةَ الألْباب
ما عاقَنی خَجَلی عَنِ العَلْیا وَ لا — سَدْلُ الخمار بلمّتی وَ نقابی،
عَنْ طیّ مضْمار الرّهان إذا اشْتَكتْ — صَعب السّباق مَطامحُ الرُّكاب
فَجَعَلْتُ مرآتی جَبینَ دَفاتری — وَ جَعَلْتُ مِنْ نَقْش المداد خضابی
بَلْ صَولَتی فی راحَتی و تَفَرُّسی — فی حُسْن ما أسْعی لخَیْر مآب

* * *

طافت بشهر الصوم كاسات الردی — سَحَراً وَ أكْوابُ الدُّمُوع تَدُورُ
وَ مَضَی الَّذی أهوی وَ جَرَّعَنی الأسی — وَ غَدَتْ بقَلْبی جَذْوَةٌ و سَعیرُ
ناهیكَ ما فَعَلَتْ بماء حُشاشَتی — نارٌ لَها بینَ الضُّلوع زَفیرُ
إنّی ألفْتُ الحُزْنَ حَتّی أنَّنی — لَوْغابَ عَنّی،ساءَنی التَّأخیرُ
قَدْكُنْتُ لا أرْضی التَّباعُدَ بُرْهَةً — كَیْفَ التَّصَبُّرُ وَ البعادُ دُهُورُ
أبْكیكَ حَتّی نَلْتَقی فی جَنَّة — بریاض خُلد زَیَّنَتْها الحورُ
هذَا النَّعیم بهِ ألأحبَّةُ تَلْتَقی — لا عَیْشَ إلاّ عیشُهُ المَبْرورُ
و الله لا أسْلُو التّلاوَةَ وَ الدُّعا — ما غَرَّدَتْ فَوقَ الغصُون طُیُورُ

* * *

یا بُغْیَةَ الصَّبِّ رفْقاً بالفُؤاد فَقَدْ — أشْجاهُ ما بكَ مِنْ تیه وَ مِنْ مَیَل
بالصَّد أَلْهَبْتَ قَلْباً أنْتَ ساكنُهُ — هَلّا عَطَفْتَ عَلی سُكْناكَ یا أمَلی
قابَلْتُ طَیْفَكَ لَیْلاً كَیْ أعانقَهُ — وَ قُمْتُ ألْثمُ ثَغْراً شیبَ بالعَسَل
فَأغْمَضَ الطَّرْفَ عَنّی مُعْرضاً وَ نَأی — بجانب التیه، مُذْوَلّی عَلی عَجَل
فَمُهْجَتی أُحْرقَتْ مِنْ حَرِّ ما وَجَدَتْ — وَ مُقْلَتی أُغْرقَتْ فی دَمْعهَا الهَطل

*آداب اللغـةالعربیّـه*، ب٤، ل٢١٤.*تـاریخ مـصر*، جـواهرکلام. *الاعـلام*، زرکلی، ب٤، ل٥. *الاداب العربیّه*. گۆڤاری *ماد*، ١٣٢٤ ک. هـ. ژ٢، ل١٨.

## عەبدولحەمیدی مودەڕڕیس

کوڕی حاجی عومەری نەعیمی، کوڕی ئەحمەد، زانایەکی خەڵکی خەرپووتە کە ساڵی ١٢٤٥ ک. م. هاتۆتە جیهان و ساڵی ١٣٢٠ لە دنیا دەرچووە و ژیانی خەریک خویندنەوە و تۆژینەوە و نووسین بووە.

**لە کتێبەکانی**:

١. *بُغْیَةُ القاصد فی جَواب الاسْئَلَة الوارِدَة منْ آمد*
٢. *السّمط العَبَقری فی شرحِ العقْد الجوهَری لمولانا خالد الشهرزوری النقشبندی*
٣. *البُرْهانُ المُنَوَّر فی تَحْریمِ الصُّوَرِ وَ اقْتناء المُصَوَّر*

*هدیّةُالعارفین*، ب١، ل٥٠٧. *ایضاحُ المَکنوُن*، ب١، ل١٠٧ و ١٨٠ و ١٨٩.

## شێخ عەلی سنەیی

حاجی شێخ عەلی، کوڕی گەورەی عارفی ناودار، حاجی شێخ شوکروڵای سنەیی، پیاوێکی هێژا، پارسا و ئەهلی تەریقەت بووە؛ خەتی فارسی و عەرەبی زۆر جوان نووسیوە و ساڵی ١٣٢٠ ک. م. بە لاوی و ناکاو، لە سنە کۆچی دوایی کردووە.

*خاطرات و یادداشت‌های نویسنده*.

## بەهایی

مەلا عەبدوسسەمەد، نازناو «بەهایی»، خەڵکی جوانرۆ، مرۆیەکی هێژا بووە و بە عەرەبی و کوردی شیعری گوتووە. ئەم چەند بەیتە عەرەبییە، پاژێکی قەسیدەیەکە ساڵی ١٣٢١ ک. م. هۆنیویەتەوە:

| | |
|---|---|
| بانَتْ حُمَیْرا وَ دَمْعی الیومَ مدْرارُ | وَ القَلْبُ مُلتَهبٌ وَ الرُّوحُ طَیّارُ |
| بانَتْ وَ نارُ الهَوی فی القَلْب تَشْتَعلُ | وَ العَقلُ فی خَبَل وَ الجسمُ مُنْهارُ |
| عَلیَّ منْ محَن لَمْ یَسْتَطعْ أحَدٌ | بحَمْلها لا وَ لا فُلْكٌ وَ أقمارُ |
| أدْمی حَشایَ وَ أضْنانی و أدْنَفَنی | هَوی حَدیثة عهد هجرُهَا النّارُ |
| وَكُلَّما عاهَدَتْ بالوَصْل قَدْ غَدَرَتْ | لا غَرْوَ، إنَّ حَدیثَ العَهْد غَدّارُ |
| یا وَیْلَتا قَدْ تَناءَتْ وَهْیَ هاجرَةٌ | وَ عَنْ وُصُول ثَراهَا الطَّیْفُ قَصارُ |
| وَ ما خَلَتْ عنْ انین یَوْمَ هجرتها | وَ اللهُ یعلَمُ، آصالُ وَ أسْحارُ |

أضْـــحَتْ حُمَيْـــرا بـــأرْض لا يُبَلِّغُهـــا    منّــی حــديثَ جَــوی الهجْــران، دَيّــارُ

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ شوکروڵای شەهباز

عارفێکی پارێزکار و دڵوشیار بووە کە دوای ئەوە لە سەردەمی لاویدا، ماوەیەکی بە هـەرزەکاری ڕابـردووە و هەنگاوی بە هەڵە هەڵگردووە، ویستی خودای تاکی توانا، هەستی مرۆڤایەتی لە ناخیدا ڕادەتڵەکاندووە و لـە خەوی بێخەبەری هەڵیستاندووە و لە نەکاوێک لێبـڕاوە بگەڕێتـەوە سـەر ڕاسـتەڕێ و قـەرەبووی ڕابـردوو بکاتەوە و ئەوەی کەوتۆتەسەری، بیداتەوە و دەست لە دنیادۆستی و هەلپەرستی هەڵـگرێ و واز لـە وازوازی بوون بێنێ؛ خوداپەرستی بکاتە پیشە و فەرمانی ئەو بەجێبێنێ.[1] بەم مەبەستەوە، نیوەشەوێک سـەری خـۆ هەڵدەگرێ و یار و شار بەجێدێـڵێ و بـەرەو دەرگانـەی شـێخی ڕاسـتەقینەی تەریقـەت، سـیراجەدینی گڵکۆپیرۆز پەلدەبێ و هەر لە یەکەم دیداردا، دڵ لە پێناوی ئەوینی ئـەو مورشـیدە دادەنـێ و سـەری پـێ دەسپێرێ و بە موو چییە، لە مۆچیارییەکانی لانادا و چەنای چەن ساڵ، بەبێ وچـان عیبـادەت و ڕیـازەت و سەیر و سولووک و خزمەتگوزاری میوانـانی خانـەقا دەکـا؛ تـا وردە ــوردە بـەرچاوی ڕوون دەبێتـەوە و لـە پلەکانی تەریقەت، یەک لە دوو یەک، سەردەکەوێ و بە مەنزڵگەی فەنا و بەقای تەواو دەگا. ئەوجا شـێخی پایەبەرز، کەوای دەروێشانی لەبەردەکا و ئیجازەی دەدا بگەڕێتەوە زێدی خۆی، خەڵک ڕێنوێنی بکـا و داب و دەستووری تەریقەتیان نیشان بدا.

شێخ شوکروڵا کە دەگاتەوە سنە، لە پەنای مزگەوتی «هاجەرەخاتوون»دا، خانەقایـەک دادەنـێ و ئیرشـاد دەکا و لە ماوەیەکی کەمدا باسی کەرامەت و پیت و پیرۆزی هەناسەی، لە شار و دێ دەنـگ‌دەداتـەوە و لـە هەموو لایەکەوە خەڵکی تینووی تامەزرۆ، ڕوو لە خانەقاکەی دەکەن و دەستە ـدەسـتە لەبەردەسـتی تۆبـە دەکەن.

---

[1] دەگێڕنەوە: درنگانی شەوێکی سارد بووە، ڕەشەمەست لە مەیخانە دەرکەوتووە، بچێتەوە بۆ ماڵ؛ لـە پـەنای پاسـارێک دەڵێک دەبینێ ترەکیوە و چەند تووتکی خستۆتەوە؛ لە سەرمان و برسـان دەچۆقێنـەوە و خەریکـە ڕەقهەڵـگەڕێن. ئـەو دیمەنە دەبینێ، مەستی لە سەری دەپەڕێ. باڵتەکەی بەسەریاندا دەدا و بە هەڵەداوان خۆی دەگەینێتە بەر ماڵ ودووکانی سەروپێ فرۆشێک؛ وەخەبەری دێنێ و هەرچی پارەی دەوێ، پێی دەدا و بەو نیوەشەوە، قابلەمەیەک سەروپێ، پێـی گـەرم دەکاتەوە و بۆ دەڵـەکەی دەبـا. دەڵ کـە هێنـدێک دەخـوا، گـەرمدەبێتـەوە و دوای تاوێـک، شـیر دەزێتـە گوانـەکانی و تووتکەکانیش گیانیان تێدەکەوێتەوە. دەڵەکە لەم کاتەدا سەر هەڵدێنێ و بە چاوێکی پڕ لە پێزانین، تەمەشایەکی شوکروڵا دەکا. ئەو نیگایە چی تێدا بووە و لەو تاریکانەدا، پرشنگی لە کوێوە هێناوە، نازانین؛ بەڵام بەتـەواوی دڵ و دەروونی شـوکروڵا ڕوون دەکاتەوە؛ بە شێوەیەک کە ئەمجار ئەگەر ئاورێک لە خۆی و [illegible]ووبەری دەداتەوە، دەبینێ هەیهوو ...

خوالیخۆشبوو شێخ شوکروڵا بێجگە مەقامی بەرزی عیرفانی، مرۆیەکی پشوودرێژ، بیرورد، ژیـر و بـەبیر، یەکجار زیرەک و خۆشەویست بووە و خەڵک، لە هەموو چینێک لە کاروبارییاندا پرسیان پێ کردووە و دڵیان بە ڕێنوێنییەکانی داوە.

نازناوی شێخ، «شەهباز» بووە و بەو بۆنەوە بنەماڵەکەی ئێستاش بە «شەهبازی» بەناوبانگن.

حاجی شێخ شوکروڵا سەرەنجام ڕۆژی یەکشەمە، حـەوتی مـانگی زیقەعـدەی ساڵـی ١٣٢١ ک. م. لـە شاری سنە ئەمری خوای بەجێ هێناوە و لە حوجرەیەکی خانەقاکەیدا نێژراوە.

*تاریخچەی خاندان نقشبندیّە*. بیرەوەرییەکانی نووسەر.

## مەلا موحەممەدی خاکی

لە مامۆستایانی خەڵکی گوندی «ئەحمەدبرنە»ی لای هەڵەبجەیە کە ساڵـی ١٢٦١ ک. م. لـەدایـکبـووە و پاش ماوەیەک خوێندن لە ڕۆژاوای کوردستان، بەتایبەت سلێمانی، ڕووی لە ڕۆژهـەڵات نـاوە و لـە شـاری سنەدا گیرساوەتەوە و چەند ساڵێک لەوێ خوێندوویە و ئیجازەی وەرگرتووە. ئەمجار گەڕاوەتەوە سـلێمانی و تا کۆتایی ژیانی، لەوێ ماوەتەوە و بە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە ڕایبواردووە و ساڵی ١٣٢٢ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

مەلا موحەممەد مرۆیەکی هێژا، خاکەسار و بێ دەعیە و دەمار، پارێزکار و سەر بە تەریقەی نەقشبەندی و لە دەرس‌گوتنەوەدا زۆر بەدەسەڵات بووە. بە کوردی سۆرانی و فارسی شیعری گوتـووە و نازنـاوی «خـاکی» هەڵبژاردووە.

لە شیعرە کوردییەکانی، قەسیدەیەکە لە پەسنی پێغەمبەر(د) و بنەماڵە و یارانیدا. ئەم قەسیدە ١٥٦ بەیتە و ئەمەش بەیتی سەرەتاکەی:

بیارێنێ خودا بارانی هەرچی فەیز و ئیحسانە      لەسەر ئەو باعیسی خەلقە و گوزیدەی جەمعی ئەکوانە

لە ناو فەقێیاندا باو بووە، ڕۆژانی وچان و هەواخوەشی، لە دەرەوەی شار و ئابادی، ماوەیەکیان بـە گـەڕان و گەمەوە ڕابواردووە. مەلا موحەممەد، کە لە باری زیرەکی و پارێزکارییەوە جیاواز بووە، جارێـک لـە گەمـەی «کەوشەک»دا دەیدۆڕێنێ و باقی قوتابییان تیزی پێ دەکەن و تانەی لـێ دەدەن کـە بـە تـەنیا خوێنـدن و سۆفییەتی حیساب نییە. بەتایبەت یەکێکیان کە سەید ئەحمەدی نەقیبی ناو بووە، ئـەم دوو بەیتـەی پێـدا دەڵێ:

ئەگەر دەروێش، ئەگەر سۆفی لە تەکیە و خانەقادا بـێ      گەدا بێ، یا خۆ پاشا بێ، خەڵیفە، یـاخۆ وەسـتا بـێ

لە عەرسەی کەوشەکا جێ‌ما، وەکوو دابە، ئەبێ دابێ      دەبێ سەرحیز و مل‌کز بێ، دەبێ داماو و ڕسـوا بـێ

خاکی بەم غەزەلە جوابی داوەتەوە:

کەسێ پاش کەوت ئەگەر فەرزەن خەلاتی شای لەبەردا بێ
دەبێ پشتی کەمانی بێ وەکوو گۆ سمتی هەڵ نابێ
بەجێمان باعسی بەدنامییە حەتتا لە یاریدا
لە مەیدانی عیبادەتدا بەجێما هەرکەسێ بێشەک
بەجێماویش لە «کەوشەک»دا ڕەفیقان! هەر دەبێ دابێ
ئەمە مەعلوومە لای هەرکەس چ نادان و چ دانایێ
فیداتان بم وەرن یاران لەمەولا ڕوو لە مەولا بێ
چ خوشە تەرکی خەو هەر شەو، هەموو چاوت لە خۆدا بێ
کەسی «کەوشەک» بکا «خاکی» موحەللەق باز و ئازا بێ
حەریفێ دوێ لە چایخانە دڵی مەعموور و ئاوا بێ

وە یا فێس و عەمامەی شێخولیسلامی لەسەر نابێ
بەڵێ پشتم شکا، بابێ کەسێ مابێ بەسەرما بێ
کەسێ مەقبووڵ و ماقووڵە کە چابوکدەست و ئازابێ
بە دایم چاو بەرەو ژێرە، دەبێ مەهتووک و ڕسوا بێ
قیاس ڕۆشن دەلیلێکە دەبێ ئەحکامی موجرا بێ
کە دابوون کاری نادانە، کەسی دانا بێ، دا، نابێ
دەروون عاجز لە دونیا بێ، لە مالا یەعنی دڵ لا بێ
نەسیمی نیسبەتت بۆبێ، وەکوو شەوبۆ لە شەودا بێ
بە سورعەت هەر وەکوو بابێ، بە هیممەت میسلی با با بێ
بە تەجنیس بازی دەیفەرموو جەزای چاکە دەبێ چا بێ

*شعر و ادبّیات کُردی، رفیق حلمی، جزء یکُم. تاریخ سُلیمانیّه*، ل ٢٨١.

## عەبدولغەنی زەهاوی

کوڕی مەلا موحەممەدی فەیزی زەهاوی و کاکی جەمیل سیدقی، شاعیری بەناوبانگە کە ساڵی ١٢٧٧ ک. م. لە بەغدا هاتۆتە دنیا و پیاوێکی هێژا و وێژەوان و شاعیر بووە و زبان و وێژەی عەرەبی و فارسی چاک زانیوە. جەمیل سیدقی ئەوی لە شیعردا، بەقەوەتتر لە خۆی داناوە.

عەبدولغەنی ئەفەندی ساڵی ١٣٢٣ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و جەمیل سیدقی برای، لە شینیدا، قەسیدەیەکی گەورەی نووسیوە؛ کە ئەمە بەشێکیە:

تـضَمَّنَ منـك القبـر لـو يعلـم القبـر
أديباً بَكاهُ النّاسُ وَ العلْمُ وَ الشّعْرُ
وَقَفْتُ علی قَبْر طَوی أقْرَبَ الوری
إلَیَّ وَ دَمعُ الحُزْن منْ أعْيُنی نَثْرُ
فَيا قَبْرُ أنْتَ اليومَ أكْرَمُ بُقْعَة
منَ الأرض ذات العَرض فيها انطوی حُرُّ
لَعَمْری قَد اجْتَثَّتْ يَدُ المَوْت دَوْحَةً
تَسامَتْ إلی العلْياء أغصانُهَا الخُضْرُ
لَقَدْ ماتَ مَنْ قَدْ ماتَ عزّی لمَوْته
وَ ماتَ عَزائی و السّكينةُ و الصَّبْرُ
أعَبْدَ الغنی! اسْمعْ، إذا كُنْتَ سامعاً
نداءَ أخ قَدْ نابَهُ بَعْدَك الضُّرُّ
بنَفسیَ يا عَبْدَالغَنیّ وَ أسْرَتی
وَفاؤُكَ و الحُسْنی، عَفافُكُ و الطُّهْرُ
يَعزُّ علينا اَنْ يُلمَّ بكَ الرَّدی
و يَذْبُلَ ذاكَ الزَّهرُ وَ الورقُ النَّضْرُ
رَحَلْتَ عَن الدُّنيا و خَلَّفْتَ للأسی
أخاً لكَ حُلْوُ العَيْشَ فی فمه مُرُّ
وَ ما كانَ منْكَ العُمْرُ قَدْ بَلَغَ المدی
و لكنَّما الأيّامُ شيمَتُها الغَدْرُ

يَقُولــونَ: صَـبْراً يـا جميــل! عَلَــى الَّــذى | أصــابَكَ مــنْ رُزْء وَ أنّــى لــىَ الــصَّبْرُ
وَ كُنّــا غُــصُونا أنْــتَ زَهــرةُ روْضــها | وَ كُنّــا نُجُومــاً أنْــتَ فــى بَيْنِهــا البَــدرُ

*دیوان جمیل صدقی*، ل١٦٦. *تاریخ سُلیمانّیه*، ل٢٥٦.

## حەیرانعەلیشای مایدەشتی

سەید موحەممەد ساڵەح، حەیرانعەلی شانیعمەتوڵایی، له سـەیدە حەسـەنییەکانی لـەدایـکبـووی ساڵـی ١٢٥٠ک. م. ناوچەی مایدەشتی کرماشانه؛ که قەڵەندەرێکی شـەیدا و پێـشەوای تەریقـەتی نیعمـەتوڵایی کرماشان بووه و زۆرێک له ناوداران و گەورەپیاوانی ئەو ناوانه، مرید و خۆسپاردووی بوون.

حەیرانعەلیشا پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، بۆ کاشان ڕۆیوه و ماوەیەک لـه خزمـەتی حـاجی شـێخ موحەممەد حەسەنی کاشانی، ناسراو به «عەبدعەلیشا»دا بەهرەی بردووه و گەڕاوەتەوه کرماشـان. هێنـدێک دواتر بۆ مەشهەد چووه و لەوێش یەکێکیتر له شێخانی ئەم تەریقـه، بـه نـاوی مونەووەرعەلیـشای بینیـوه. ئەوجار ڕووی له عەتەبات ناوه و که گەڕاوەتەوه بۆ کرماشـان، مـاوەی ٣٠ سـاڵ لـەو شـاره سەرپەرشـتی و خزمەتی دەروێشان و مریدانی کردووه و سەرەنجام له ١٣ی جیمـادیسـانی ساڵـی ١٣٢٣ ک. م. (١٢٨٤ ک. ه. ( له کرماشان کۆچی یەکجاری کردووه.

حەیرانعەلیشا دۆخێکی ڕۆحی تایبەت و نائاسـایی هـەبووه و هێنـدێک کەرامەتیـشیان لـێ گێڕاوەتـەوه. شیعریشی گوتووه و زۆر شیعری دڵبزوێنی کوردی و فارسی لێ بەجێماوه و بەشێک لـه شـیعره کوردییـه عیرفانییەکانی چاپ کراوه. هۆنراوەیەکی عیرفانیش به فارسی، به ناوی «*کَنزُالعرفان*»ی لێ ماوەتەوه.

حەیرانعەلیشا له شیعری فارسیدا نازناوی «حَیران» و بۆ شیعری کوردی «سەیساڵح»ی نووسیوه.

خوالێخۆشبوو غیرەت، شاعیری هێژا و ناوداری کرماشانی، له بارەیەوه گوتوویه:

ایــن جملــه اســیران کــه پریــشان توانــد | لــبتــشنەی سرچــشمەی حَیــوان توانَــد
ای دیــدەی عاشـقان بـه کویـت شـب و روز | حَیــران کــەای؟ کــه جملــه حیــران توانَــد

**دوو شیعری کوردی حەیرانعەلیشا**:

هەمـسەران! سـینەم، هەمـسەران! سـینەم | گـەنجوور گـەنج نـاس لـه سـەدر سـینەم
جــەواهیر کــۆــکــۆ هــا لــه خەزینــەم | دەفــن کــەرد قــادر نــەتۆی دەفینــەم
کــۆی تــوور قــەلبم ئاتــەشئــەفرۆزەن | ڕۆشــن وێنــەی نــار لــەیل نــەورۆزەن
دورج دەهـــانم گەوهەرئەفـــشانەن | تیـــغ زوانم ئاتـــەشفـــشانەن

* * *

هەریه بەس لـه حـەق فـەرد تـەنیای پـاک | عــەقــڵ کــول واتــا: وَ مــا عَرَفْنــاک

جـــەوابش ئامـــا لـــە یـــەزدان پـــاک / لَـــوْلاکَ لَمـــا خَلَقْـــتُ الافْـــلاک
لـــە دەرگـــای داوەر مەکـــەم گـــەدایی / لـــە بـــەنـــدەگی دەم کـــووس خـــودایی
قـودرەتنمـای بـین لـە مـەه تـا مـاهی / گـــەداییش مەکـــەن لـــە عـــەین شـــاهی
غافـــل مەنیـــشن! ئـــەو بـــارن وەیـــاد / هەر کەس وەخەیاڵ وێش کەردەن دڵـشاد
من لـە مـن نییـەن هـەرچی هـەن ئـەوەن / لـە ڕۆژ ڕەوشـەن کـێ مـاچۆن شـەوەن؟
گـــۆش دڵ بـــدەر وە ڕێـــزەی ڕازم / عاڵـــەم پـــڕ کـــەردەن نەشـــئەی ئـــاوازم
خـــودایی خـــودا نێـــژی کوهنـــە و نـــۆ / ئەشـــیا زاکـــیرەن گـــشت وە زیکـــر هـــۆ
بـــەو تـــا بنیـــشیم، وە بـــێ قیـــل و قـــال / کَالمَیِّـــت بَـــیْنَ یَـــدَی الغَـــسّال
«سـەی ساڵـەح»! لـە پـای سایەی نهاڵـی / بـــەو تـــا بکـــەیمن شـــوکر وساڵـــی

**ئەمەش شیعرێکی فارسی**:

مـا همـه دُرْدکـشان، سـاقی صـهبای همـیم / سَرخوش از جام مَی و مَست ز مینای هَمیم
ایـن همـه مُغْبَچگـان لُـولی شـیرین حرکـات / خـادم پیـر مُغـان، عاشـق سـودای همـیم
چونکـه جَمعـیم ز تفریـق گذشـتیم همـه / دست بر دست هم و خاك کف پای همیم
طعنـه بـر مـا مـزن ای شـیخ تـو از روی ریـا / همـه درمـان هـم و جملـه مـسیحای همـیم
مـا مُناجـاتی و چـون اهـل خرابـات، خـراب / پاکبـــازان ره دلبـــر یکتـــای همـــیم
مـا بـه هـر مجلـس و محفـل بـر اربـاب وفـا / صاحب نطق و بیان، طـوطی گویـای همیم
بـر سـر بـزم طریقـت ز ره صـدق و صـفا / همـه مجنـون هَمـیم و همـه لَـیلای همـیم
نعـرەی یـارب مـا مـی گـذرد از ملکـوت / چونکه در گلشن جـان بلبـل شـیدای هَمیم
تـا نهـادم سـر خـود را بـه ره پیـر طریـق / من و «حیران» ز وفا طالـب و جویـای هَمیم

*تذکرەی شُعرای کرمانشاه*، ل ٤٠-٤٢. *دیوان غیرت*، ل ٣١ و ٣٢.

## مەلا باقری شێخولیسلام

حاجی مەلا باقر، کوڕی مەلا ئەحمەدی شێخولیسلام، لە پیـاوانی زانـا و تێگەیـشتووی بنەماڵـەی مـیرانی سنەیە کە ماوەیەک شێخولیسلامی کوردستان بووە و ساڵی ١٣٢٣ ک. م. لە دنیا چووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ موحەممەدی بەرزنجی

کوڕی شێخ عەلی،کوڕی باباڕەسوول، لە سەیدەکانی بەرزنجە، پیاوێکی زانا بـووە و بێجگـە زمـانی کـوردی،

فارسی و عەرەبی و ترکیشی چاک زانیوە.

شێخ موحەممەد خوێندنی لە سلێمانیدا تەواو کردووە و پاشان ساڵی ١٣٠٠ ک. م. بۆ ئەستەمبووڵ چووە و ماوەیەک لەودوا گەڕاوەتەوە سلێمانی و بۆتە موفتی ئەوشارە.

زا و مەرگی شێخ موحەممەد ساڵی ١٢٦٩ و ١٣٢٤ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٨٥.

## سانی

کاک عەبدوڵا، کوڕی عەلی، نازناو «ثانی»، بابی کاک مستەفای سافی[١]، شاعیرێکی خاوەن زەوق بووە و هێندێک شیعری بە کوردی سۆرانی لێ بەجێماوە کە برێکیان پێڕای دیوانی سافی، لە کتێبێکدا چاپ کراوە.

سانی تا کۆتایی سییەکانی چەرخی چاردە ژیاوە.

**غەزەلێکی کاک عەوڵای سانی:**

دڵیشم چوو، گوڵیشم چوو، کە یاری گوڵعوزارم چوو — نەما عەیشم لەگەڵ شادی، بە تاراجی نگارم چوو

بەهاران فەسڵ گوڵدایێ، سەدای بولبول لە هەرلایێ — گرینم دەنگی سەمتوورە، کە غونچەی لالەزارم چوو

چ پاشایی، چ دەرویشی، غەمی عەشقت ئەگەر نۆشی — هەمیشە مەست و مەدهۆشی، کە دۆستی غەمگوسارم چوو

زەعیف و زەردی پاییزم، لە زستان یار گوتی زیزم — بە تەن بیمار و دڵزیزم، کە هاوین هات، بەهارم چوو

بە داخی دەردی هیجرانی، بە تیری تیژی موژگانی — وەهای کردوومە بریانی، ئەوا ڕۆحی ڕەوانم چوو

گوتم: «سانی» لەبەر چی وا گرفتار و پەرێشانی؟ — گوتی: بێچارە بووم، هەستیم لەدەس چوو تا کە یارم چوو

وەرگیراو لە *دیوانی سافی*.

## سەید حەسەنی چۆڕی

حاجی سەید حەسەن، کوڕی سەید عەبدولقادیر، کوڕی سەید ئیبراهیم، کوڕی سەید عەبدوڕڕەحمان، لە پشتی زانای بەناوبانگ، مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕییە کە بۆخۆشی مرۆیەکی زانا و بەرزەمژ و بێنیاز بووە و لە گوندی «چۆڕ» فەقێ ڕاگرتووە و دەرسی گوتووە و سەردەمێکیش شێخولیسلامی مەریوان بووە.

چۆڕی خوێندنی لای عەللامە مەلا عەلی قزڵجی تورجانی تەواو کردووە؛ بەڵام ماوەیەکیش لە مەدرەسەی مەلاوڕەحمانی پێنجوێنی خوێندوویە.

---

١. لە داهاتوودا باسی ئەویش دەکەین.

زۆرێک پەراوێز و پەیوەست لەم مامۆستا زانایە بەجیٚماوە کە هێندێکیان بریتین لە: پەراوێز لەسەر:

١. «*تَذهيبُ‌المنطق*»

٢. «*جلال منطق*»

٣. «*تصريف*» مەلا عەلی شنۆ

٤. «*گُلَنبوی بُرهان*»

٥. «*عَبدولحكيم شرح شَمسيّه*»

٦. هۆنراوەی «*فَريده*» لە نەحودا

٧. «*سَعدُالله*» لە نەحودا

٨. پەیوەست بۆ «*تفسير بيضاوى*» تا سوورەتی قیامەت.

٩. «*الرِّسالةُ الكلاميّة*».

چۆڕی ساڵی ١٣٠٥، هاوڕێ لەگەڵ شێخ ئەحمەد شەمسەدین، کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدین بۆ حەج چووە و لەوسەفەرەدا تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەد وەرگرتووە.

ئەم مامۆستایە پاش عومرێک دەرس‌گوتنەوە و تۆژینەوە و نووسین، سەرەنجام ساڵی ١٣٢٢ ک. م. دنیای بەجیٚهێشتووە. خواڵیٚخۆشبوو مەلیکولکەلامی مەجدی بۆ لاواندنەوەی قەسیدەیەکی داناوە کە ئەوا چەند بەیتی:

| | |
|---|---|
| ستوده سيد فاضل «حَسَن» كه در دانش | نديده است چو او ديده‌ى زمين و زَمَن |
| مهى كه بود ز هفتاد و اند سال فزون | هميشه كار وى احياى علم و شرع و سُنن |
| شد از ديار فنا شادمان به دار بقا | بدان صفت كه غريبى رود به سوى وطن |
| نوشت از پى سال وفات او «مجدى» | «بسوى دار بقا شد روان، روان حَسَن»[1] |

*عُلَماونا فی خدمة‌العلم و الدّين*، ل١٦٥ و ١٦٦. *یادی مەردان*، ب٢، ل ٥١٣ تا ٥١٦.

## شێخ مەحموودی کاکۆزەکەریایی

زانایەکی پارسا، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ یەعقووب، لە بنەماڵەی شێخانی کاکۆزەکەریا بووە کە پاش هەڵوەدا بوونێکی زۆر لە وڵاتی غەریب و خوێندن لای مامۆستایانی ناسراوی ئەو سەردەمە، سەرەنجام چۆتە قوتابخانەی تورجان و خزمەتی عەللامە مەلا عەلی قزڵجی گەیشتووە و ئیجازەی لیٚ وەرگرتووە و لە گوندی «لۆن سادات»ی ناوچەی بێڵەوار دانیشتووە و لە مەدرەسەکەیدا دەرسی گوتووە.

---

١. بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ١٣٢٢.

شێخ مەحموود جیا لە باری زانستی، عارفێکی پایەبەرز بووە و بۆ پارێزکاری و عیبادەت و بەڕێوەبردنی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر(د)، ناوی دەرکردووە و بێشک یەک لە ئەولیای بێقسەی نیوەی یەکەمی چەرخی چواردەیە.

بابی ڕەحمەتیم، کاتی خوێندنی لە لۆندا ، ماوەیەک لە کۆڕی دەرسی شێخ مەحموود بەهرەی بردبوو. هەموو جارێک باسی ئاکاری بەرز و بێنیازی ئەو کەڵەپیاوەی دەکرد و کەراماتێکی لێ دەگێڕاوە کە بە چاوی خۆی دیتبووی.

شیخ چەند ساڵی کۆتایی ژیانی باری کرد بۆ شاری سنە و تا سەر، لە قوتابخانەی مزگەوتی «ئاحەیبەڵا»ی ئەو شارەدا دەرسی‌گوتەوە. کۆچی دوایی ئەو پیاوە مەزنە، ڕۆژی پێنج شەممە ٢٩ی شابانی ساڵی ١٣٢٤ ک. م. لە شاری سنە ڕووی‌داوە و لە زیارەتانی «پیرغەریب»ی ئەوسادا، نێژراوە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## مەلا عبدوڕەزاقی سنەیی

کوڕی مەلا ئەحمەدی «ئولفەت»، لە بنەماڵەی ماڵەگەورەکانی سنە و پیاوێکی زانا و بەئاکار بووە کە ساڵی ١٣١٥ ک. م. شێخولیسلامی سنەی لە ئەستۆ گرتووە.

ساڵی ١٣٢٤ بۆ تاران دەچێ و لەوێ نەخۆش‌دەکەوێ و دنیا بەجێ‌دێڵێ. تەرمەکەی دێننەوە سنە و بە ڕێز و شکۆی زۆرەوە دەینێژن.

لە کتێبی خاطرات و یادداشت‌های من.

## شێخ حەسەنی بەرزنجی

کوڕی شێخ عەبدولکەریم، کوڕی شێخ قادر، کوڕی شێخ حەسەن، لە پشتی شێخ ئیسماعیلی قازانقای و تۆرەمەی ساداتی بەرزنجی و لە پێشەوایانی تەریقەی قادرییە کە ساڵی ١٢٦٤ ک. م. لە کەرکووک هاتە دنیا و لە گوندی «قەرەچیوار»ی لای ڕۆژهەڵاتی کەرکووک گەورە بوو. حەوت ساڵان بابی عەمری خوای کرد و کەس و کاری بۆ خوێندن ناردیانە سلێمانی و ئەویش لەوێ بە هەموو توانییەوە لەو کارەدا تێکۆشا و پاش ئەوەی بوو بە مامۆستایەکی زانا، گەڕاوە کەرکووک و لە مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی ئیجازەی وەرگرت.

ساڵی ١٢٨٩ ک. م. جارێکی‌تر چوو بۆ سلێمانی و ئەم جار بۆ وەرگرتنی تەریقەتی قادری، گەیشتە خزمەتی عارفی پایەبەرز کاک ئەحمەدی شێخ و دوای ماوەیەک سەیر و سولووک و وەرگرتنی ئیجازە، چووە گوندی «قادرکەرەم»؛ بەڵام دوای ماوەیەک، بەبۆنەی زۆر بوونەوەی جەماوەری هات‌وچووکەری

ئەویٚ ـکە بۆ بەهرەمەند بوون و وەرگرتنی تەریقەت ئەهاتن ـ ناعیلاج گەڕاوە کەرکووک و لە گەڕەکی «ئەخی حوسەین» تەکیە و خانەقایەکی دانا و تا کۆتایی ژیانی (ساڵی ١٣٢٤ ک. م.) خەڵکی ئیرشاد کرد و یارمەتی مریدانی دا.

خوالیٚخۆشبوو شیٚخ حوسەین دەرویٚشیٚکی بیٚنیاز و دڵئاگا بووە و بە زبانی عەرەبی و فارسی و کوردی شیعری گوتووە. ئەوا غەزەلیٚکی فارسی لەو عارفە:

خوشا کسی که نجوید جز از رضایت دوست | چنان کند که بود مورد عنایت دوست
به عُمر خویش نخواهد به جز محبت حق | که این جهان همه هیچ است جز محبت دوست
مباش غَرّه به تقوای خویش زاهد چون | ز گمرهی نَرَهاند مگر هدایت دوست
نسیم مرحمتی گر وَزَد به گُلشن دل | نهال عشق شود سبز از مَوَدَّت دوست
ز مرگ بیم ندارد هر آنکه عشق گزید | که هست زندەی باقی شهید حضرت دوست
گرفته آینەی دل غبار، یار کجاست؟ | که زنگ دل بزداید جلای طلعت دوست
مرا ز پای درآورد درد عصیان، کو؟ | دوای شافی این درد، غیر رحمت دوست
عظام جسم رمیمم دوباره جان گیرد | به تربتم اگر افتد گذار نسبت دوست
هر آنکه عارف و اهل طریق گشت «حسن» | جز از وصال نخواهد، به حقّ عزّت دوست

*مشاهیر الکُرد*، ب٢.

## میرزا حەبیبی سنەیی

میرزا حەبیب، کوڕی حاجی بەگەی سنەیی، دابین‌کاری میرانی ئەوکاتەی شاری سنە، پیاویٚکی دەسپاک، دروستکار و جیٚبڕوای خەڵک بووە کە دەوری ٧٠ ساڵ ژیاوە و ساڵی ١٣٢٥ ک. م. ڕووی لە جیهانیٚکی‌تر ناوە.

میرزا بە ڕیٚگای عیرفانیشدا چووە و مریدی حاجی شیٚخ شوکروڵای سنەیی نەقشبەندی بووە و هەروەها شیعریشی گوتووە و نازناوی «حەبیب»ی هەڵبژاردووە و دیوانیٚکی لیٚ بەجیٚماوە و شیعرەکانی زۆرتر پەسنی مورشیدەکەی و باسی پایەبەرزی و کەراماتی ئەوە.

**دوو غەزەلی فارسی حەبیب:**

آیا بود شبی که لب همچو شکرش | بوسم به کام خویش و نشینم برابرش
کس صورتی چنان نکشیده است در جهان | جُز حَق چُنو، کجاست کسی را مُصَوَّرش؟
محراب ابروان بنما تا امام شهر | دل بر کَنَد ز مسجد و محراب و منبرش
بردار شام زُلف تو از صبح جبهەات | تا بشنود ز جان، مَلَک الله اکبرش

راه عبور نیست در آن کوی بسکه خلق صف بستەاند بهر ملاقات بر درش
سرو سهی است قامت رعنای دلکشش روح مُجسم است سراپای پیکرش
دل می‌بَرَد ز عارف و عامی چو بگذرد با آن جمال و چهرەی بی‌زیب و زیورش
از باختر برآمده و کرده تابناک سَهْل و جَبَل دو عارض چون مهر خاورش
گُو مهرپروری کند و مهتری کُند هستند چون «حَبیب» بسی خلق کهترش

* * *

منصورصفت دیدن جانان مَزه دارد دار و رَسن و ساحت میدان مَزَه دارد
جمعیت خلق و هَدف تیر ملامت در خون خود افتادن و غلطان مَزَه دارد
چون شمع جگرسوخته در محضر معشوق افروختن و سوختن جان مَزَه دارد
دلداری و دیوانگی و دامن صحرا آوارگی کوه و بیابان مَزَه دارد
لاقیدی و بیحالی و سرگردانی سرمستی و مخموری مستان مَزَه دارد
گر لذت دیدار «حبیب» ندهد دست آشفتگی و حسرت هجران مَزَه دارد

*دیوانی دەسنووسی حەبیب*.

## سەید موحەممەدی خانەگایی

کوڕی سەید عەبدولکەریمی خەستە[١]، خەڵکی گوندی «خانەگا»ی باشووری پاوە، کە تا دەوری سییەکانی چەرخی چاردە ژیاوە، وەک بابی زەوقی شیعری هەبووە و بە کوردی شیعری گوتووە؛ ئەم دو شیعرە هی ئەوە:

شیرین مەنمانا، شیرین مەنمانا جەمین وێنەی جام، شیرین مەنمانا
پرشەی نە ڕووی فەرق ئافتاب شانا ماهتاب ئایەتی «اَحْسَنت» وانا
چونکە ستاران وەی سیرڕە زانا شی نە جامەی مەحو خەجاڵەت سانا
حۆرییان جە عەرش مەکەرۆن هانا هانا وەی شەوقە نییەن تەوانا
وەسفش دڵ جە دەس واسیف مەسانا مەر وەسف شیرین مەحبووب خانا
بیللا ئەر فەرهاد پەنەش مەزانا تێشە نە ڕووی تاش ئەڵحەد مەشانا
ئەر هەنی مەجنوون نامەش مەوانا دوبارە نە خاک مەکەرۆش هانا
دڵ وەزام سەخت جگەر نەزانا وە سیاسەنگ بۆ وێش پێش مەزانا

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٤٠١.

تــیرێ وەی دەســتوور نــە جــەرگم شــانا | شەهیدش کەردەن هەی قەیس هەی هانا!

* * *

ئەحیانــەن یــاران ئەگــەر مــن مــەردم | ئیحیــای وێرانــەی مــەزاران کــەردم
ڕاســەن مــن وارس قــەیس دوجــەیلم | عالــەم بزانــۆ مــن کوشــتەی لــەیلم
وەســیەت بــۆ یــاران، جەرگــەی دڵــداران | هەی گــورۆی خەفــەت، دەروون پــڕخاران
یــاران، یــاوەران، ئــازیزان، خوێــشان | ئــەورۆ مــەوەرام وەســەر مــەزاران
«اَلْقَــبرُ حَــقٌّ» پــەریم نــەوانان | هــوونم جــە دیــدەی لــەیلی بــسانان

چەند بەیازی دەسنووس.

## سورەییا ئەربیلی

ئەحمەد، کــوڕی ئەبووبــەکر، کــوڕی عەبــدولقادری هــەولێری، نازنــاو «ثُرَیّـا»، پیــاوێکی هێــژا بــووە کــە لــە ئەستەمبووڵدا ژیاوە و سەرکەشی قوتابخانەکانی ئەوێ کردووە و ساڵی ١٣٢٥ ک. م. لە دنیا چووە.

**لە کتێبەکانی**: «*نظمُ الاسماءِ الحُسنی*» و «*سانحاتُ الرَّحمن فی مَسألَة خَلقِ الأکوان*».

*الاعلام*، ب١، ل١٠١. *ایضاحُ المَکنُون* ب٢، ل٢. *هدیّةُ العارفین*، ب١، ل١٩٥.

## موعتەمیدولئیسلامی سنەیی

حاجی شێخ موحەممەد، ناسراو بە «مُعتَمدالإسلام»، کوڕی شێخ عەبدولکەریم، کوڕی شێخ ئەحمەد، کــوڕی شێخ موحەممەد قاسمی کانیمشکانی، لە مامۆستایانی زانا و هێژای شاری سنەیە کە ژیانی بە خۆشــناوی و خزمەت بە خەڵک و زانایان ڕابواردووە و لە وێژەوانی و نوویــسکاریدا شــارەزاییەکی باشــی هــەبووە و دەوری ساڵی ١٣٢٥ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

لە کتێبی خاطرات و یادداشت‌های من.

## بابەشێخی قەرەداغی

کوڕی شێخ ساڵەح، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ قادر، کوڕی شــێخ عوسمــان، کــوڕی شــێخ لــەتیفی گەورە، خوێندنی لە قوتابخانەکانی قەرەداغدا تەواو کردووە و ئەوجار ماوەیەک لە گونــدی «شــیوی قــازی» و دوایی لە «بیسەمل» دانیشتووە و لەگەڵ دەرس‌گوتنەوە و ڕێنوێنی خەڵک، بە کشت‌وکاڵەوە خەریک بــووە و بە کار، ژیانی بەڕێوە بردووە و ساڵی ١٣٢٥ ک. م. لە تافی لاویدا، دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*عُلَماونا فی خدمة العلمِ و الدّین*، ل ١١٥.



## قاسم ئەمین

قاسم بەگ، کوڕی موحەممەدئەمین بەگ، زانایەکی وریا و ڕۆشنبیر، نووسەرێکی هێژا و تێگەیشتوو، سەردەرچوو لە فەلسەفە و قانوون و زانستی کۆمەڵگا بووە؛ کە ساڵی ١٢٧٩ ک. م. هاتۆتە دنیا و ١٣٢٦ لە دنیا دەرچووە.

بابی لە میرانی خەڵکی سلێمانی بووە کە هەر لە سەرەتای لاوییەوە، بە فەرمانی دەوڵەتی عوسمانی، وەکوو بارمتە، لە ئەستەمبووڵ گلدراوەتەوە و لەوێ چۆتە ناو ئەرتەشەوە و سەردەمی سەڵتەنەتی ئیسماعیل پاشای خەدیوی میسر، وەکوو زابیتی لەشکر، لە میسردا خزمەتی کردووە.

قاسم لە ئەسکەندەرییە خوێندوویە و پاشان بۆ قاهیرە ڕۆیوە و خوێندنی بالای لەوێ شوێن‌گرتووە و ئەوجار چووە بۆ فەڕانسە و لەوێ دوکتۆری مافی وەرگرتەوە و ساڵی ١٢٩٩ گەڕاوەتەوە قاهیرە و بووە بە بریکار و دوای ماوەیەک کردوویانە بە ڕاوێژکاری دادگەی پێداچوونەوە (استیناف).

قاسم ئەمین لە نوێخوازانی میسر بووە کە لەمەڕ پێشکەوتنی وڵاتە ئیسلامییەکان و مافی ژنەوە زۆر وتاری نووسیوە و لە ڕۆژنامە و گۆڤاراندا بڵاوی کردۆتەوە. بە ئاوات بووە خەڵکی ڕۆژهەڵاتیش بگەنە ڕادەیەک وەکوو ڕۆژاواییان خاوەنی ژین و ژیانی خۆیان بن. پاش تێفکرینێکی زۆر، بەم ئاکامە گەیشتووە کە پێویستە پێشتر بنەماڵەکان بەخودا بێنەوە و بەند داوی نەزانی و کۆنەپەرستی لە دەست و پێی خۆیان بکەنەوە. بەتایبەت بۆ ڕزگاری ژنان زۆری حەول داوە و پڕۆپاگەندێکی زۆری کردووە، بەر بە دیاردەی چەندهاوسەری و تەلاقی بێخۆ بگیرێ.

قاسم بنیاتی کارێکی گەورەی دانا؛ بەڵام ئەجەلی بێ‌وادە، چیتر مەودای پێ نەدا و لە تەمەنی ٤٧ ساڵاندا، هەودای ژیانی پسا.

**لە کتێبەکانی**: «*تحریرالمرآة*»، «*المرآةالحدیثة*»، «*کلمات قاسم ئەمین*» و ...

*تراجُم مشاهیر الشرق*، ب١، ل ٤٢٠-٤٢٤. *الاعلام*، ب٦، ل١٩. *تاریخ آداب اللغةُ العَرَبّیة*، ب٤، ل٢٧١.

## مەلا عەبدوڵای جەلی‌زادە

حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی‌زادەی کۆیی، ناسراو بە «رئیسُ‌العُلما»، کوڕی حاجی مەلا ئەسعەد، کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای دووەمی جەلی، کوڕی مەلاوڕەحمان، کوڕی مەلا عەبدوڵڵای یەکەم، کوڕی مەلا موحەممەد (مەلازادە)، لە زانایانی هێژا و هەڵکەوتەی شاری کۆیە بووە کە نێوان ساڵانی ١٢٥٠-١٢٦٠ هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە، خوێندنی لای بابییەوە دەسپێکردووە و پاشان خزمەتی مامۆستایانی گەورەی وەک عەللامە مەلا موحەممەدی خەتێ گەیشتووە و شارەزای هەموو زانستە ئایینییەکانی ئەو سەردەمە

بووە. دوای ئەوە تا باوکی ماوە، لە خزمەتیدا، بەڕێوەبردنی قوتابخانە و قوتابییانی لە ئەستۆ گرتووە و کە ئەو لە دنیا چووە، بۆخۆی دەرسی گوتۆتەوە.

مەلا عەولا ساڵی ١٢٩٢ ک. م. سەفەرێکی بەغدای کردووە و موفتی زەهاوی (مەلا موحەممەدی فەیز) زۆری ڕێز لێ گرتووە و بەخێری هێناوە و زۆرێک لە زانایان و ویژەوانانی ئەوشارە ناسیویانە.

ساڵی ١٣٠٩ ک. م. لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ وت وویژ لەگەڵ دەوڵەتی ئێران و لابردنی ناکۆکی نێوانیان، بۆ سابڵاخ (مەهاباد) چووە و لەگەڵ نوێنەرانی ئیرانیدا دانیشتووە و ڕاسپێرییەکەی بە سەرکەوتوویی جێبەجێ کردووە و گەڕاوەتەوە و ڕێزی لێ گیراوە.

مەلا عەبدوڵڵا جگە لە جێگەی بەرزی زانستی و دینی، شاعیریش بووە و نازناوی «جەلی» بۆخۆی داناوە و هێندێک شیعری کوردی و فارسی لێ بەجیماوە؛ ئەوا دوو نموونە:

عمر عزیز رفت بە غفلت زهی زیان — کامی ندیدە بار گنە بُردە زین جهان
خار ستم بە پای خلیدە، نچیدە گُل — جز رنج نیست قسمت از این باغ و بوستان
رَزاق رزق بخشد، پس تن چرا نَهی — در زیر بار منت دونان برای نان
گر عارفی چر عَمَل جاهلان کنی — ور جاهلی نشستە چرا جای عارفان
چون مال ظلّ زائل و اقبال لابقاست — دل را بە حق گُذار و گُذر کن از این و آن
دامان عزم بر کَمَر همت استوار — دیوانەوار خود بە دیار عُمَر[1] رسان
سر را فرو نیار «جلی» بهر نان بە کس — از حق طَلَب اعانە، هُو الحیُّ مُستَعان

**دوو بەیت لە جەلی بە کوردی سۆرانی**:

کە بێریێ هاتە ناو مێگەل، سەراسەر قرمزی پۆشی — مەلا ئیدراکی چوو، شێخیش تەریق، عارف نەما هۆشی
حەبیب دیتی ڕەقیب وستاوە، چارۆکەی بەسەردا دا — گوتم: هەوری سیا هات، شەعشەعەی خورشیدی داپۆشی

حاجی مەلا هاوچەرخی شاعیری بەناوبانگ شێخ ڕەزای تاڵەبانییە و پێکەوە ئاموشۆ و نامەگۆڕینەوەی دۆستانەیان هەبووە. شێخ ڕەزا هەم بە کوردی و هەم بە فارسی، باسی مەلای کردووە:

حاجی عبدالله لە ئادەم فیلترە — با وجوودی ڕوتبەیی پێغەمبەری
ئەو بە سەد شەیطان لە کۆیێ دەرنەچوو — ئەم بە یەک شەیتان لە جەننەت دەرپەڕی

* * *

عیب در ذات تو ای کان کرم معدوم است — مگر این عیب کە لحم عُلما مسموم است
شعر من از همە سو در همە کشور ساری — علم تو در همە جا بر همە کس معلوم است

---

١. نیازی شێخ عومەر زیائەدینی نەقشبەندییە.

مــی‌رود شــعر مــن و علــم جهــانگیر شــما هر دو بی‌فایـده تـا جـای اقامـت روم اسـت
نامـه بنـویس بـه هـر نـوع دلـت مـی‌خواهـد همه سحر است، اگر نثر و اگر منظـوم اسـت

ئەم مامۆستایە لە ساڵی ١٣١٨ ک. م. دەرس‌گوتنەوە و وتاردانی قوتابخانەی کۆیەی بـۆ کورەکـەی دانـا و بۆخـۆی ساڵی ١٣٢٦ سەری یەکجاری نایەوە.

*یادی مەردان*، ب٢، ل ٥٣٩ و ٥٤٠. *عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ٣٥١-٣٥٤. گۆڤاری *گەلاوێژ*. کتێبی دەسنووسی *ریاض‌المُشتاقین*.

## شێخ ئەبووبەکری هەرشمی

زانای پارسا، غەیاسەدین ئەبووبەکر، کوڕی مەولانا موحەممەد، لە گوندی «هەرشم»ی لای هەولێر هاتە دنیـا و لە خزمەت بابیدا ڕاهات و خوێندی. پاش ماوەیەک قوتابخانەکانی تـریش ڕۆی و شـوێنی خوێندنەکـەی گرت تا بوو بە مەلایەکی تەواو و دەرسی‌گوتەوە. سەرەتێک سەفەرێکی بۆ تەوێڵێ کرد و داب و دەسـتووری تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخی پایەبەرز، سیراجەددین وەرگرت و بە سـەیر و سـولووکەوە خـەریک بـوو. پاشان گەڕاوە هەولێر و لەگەڵ دەرس‌گوتنەوە و ڕاهێنـانی قوتابییـان، ئیرشـادی خەڵـک و بانگهێـشتن بـۆ تەریقەتی دەسپێکرد.

شێخ ئەبووبەکر وازێکی زۆری لە دەرس گوتنەوەی قورئانی پیرۆز، بەتایبـەت تەفـسیری «*بیضاوی*» هەبووە و قوتابیانی مەجبوور کردووە لەگەڵ وانەکانی تـردا، حـەوتووێک لای کـەم دوو جـار دەرسـی تەفسیر بخوێنن.

ئەم مامۆستایە سەرەنجام ساڵی ١٣٢٦ ک. م. لە شاری هەولێر کۆچی یەکجاری کردووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ٣٢-٣٣. یەکـ دوو سەرچاوەی تر.

## مەلا عەبدولقادری جاف

کوڕی مەلا عەبدولموئمین، لە فەقێیانی موجازی کۆڕی دەرسی مەلا عەبدوڕڕەحمانی پێنجوێنی بووە کـە پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، ماوەیەک لە گوندی «بیارە»، لە ئاڵقەی مریدانی شـێخ عومـەر زیائـەدینی نەقشبەندیدا تەریقەتی وەرگرتووە و ئەوجار سەرەتێک لە گوندی «چرچە قەڵا» و سەردەمێک لە «پـریس» و سەرەنجام لە «قەرزاوا» (سەعدییەی ئێستا)دا دامەزراوە و دەرسی داوە و خەڵکی لەگەڵ ئامۆژەکانی ئایینـدا ڕاهێناوە و بەهاری ساڵی ١٣٢٦ ک. م. هەر لەوێ، ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

مەلا ئەولقادر لە مەنتیق و حیکمەت و کەلامـدا مامۆسـتایەکی کـەموێنـە بـووە و لـە بـواری نووسـین و خەت‌خۆشیدا ناوی‌دەرکردووە و جار وبارەش شیعری گوتووە. ئەم چەند بەیتە لە پارچـە هەڵبەسـتێکە، بـۆ

دۆستێکی چادرنشینی خۆی هۆنیوەتـەوە و پیـڕای گلـە و گازنـدە لـە حـاڵ و باڵـی خـۆی، نـاوی هـەموو کەرستەی ورد و درشتی ڕەشماڵی هێناوە:

فیراقی تـۆ لـە «هـەردەی» دڵ دەس و دەم — هەڵـیدا «ڕەشدەواری» مەینـەت و غـەم
بـە «گروێـسی» سـیاتاری پـەژارەم — بە «مـیخ»ی مەحکـەمی ناڵـە و شـەرارەم
«چڵە»ی فرمێـسکی «قوڵـف»ی چاوەکـانم — «چەڵەم» قامەت خەمیدەی وەک کـەمانم
بە «کۆمـاج»ی «هـەسـوون»ی بـێدەمـاخم — بە «تێڵا» و «چیخ»ی «ئەسپەپیچ»ی ئـاخم
«سگ» و «کوچیل» و «سەردرز»ی هەناسـم — بە سـەیلی «دوودەمـی» خـوونینی تاسـەم
لە «بـەرماڵ» و لـە «پـشمـاڵ» تاڵـە حاڵـم — دەناڵـێنم، دەڵـێم وێرانـە ماڵـم

*یادی مەردان*، ب٢، ل٥٢٦.

## مەحوی

عارفی هەستیار، حاجی مەلا موحەممەد، نازناو «مەحوی»، کوڕی شێخ عوسمان، عارفێکی زانا و شـاعیرێکی توانا بووە کە ساڵی ١٢٥٣ ک. م. لە «باڵخ»ی سەر بە سلێمانی هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە، لای بابی ـ کە مریدی شێخ سیراجەدین بووەـ خوێندوویە و تەریقەتی وەرگرتووە؛ پاشان ماوەیک لـە سـابلاغ (مـەهابادی ئێستا)، لای مەلا عەولای پیرەباب و هێندێ لە بەغدا لە کۆڕی دەرسی عەللامە موحەممەد ئەفەندی فـەیز (موفتی زەهاوی) خوێندوویە و ئیجازەی وەرگرتووە. پاشان سەفەرێک بۆ حیجاز چووە و لـە گەڕانـەوەدا لـە ئەستەمبووڵ لایداوە و دوایی گەڕاوەتەوە سلێمانی و لەوێ تەکیە و خانەقایەکیان بۆ کردۆتەوە و باقی ژیـانی بە ئیرشاد و دەرسگوتنەوە داوەتە سەر و لەوپەڕی وەج و ڕێزدا ژیاوە.

ماوەی ژیانی مەحوی ٧٥ ساڵ نووسراوە و سەرەنجام ڕۆژی جومعە، پێنجەمی مـانگی ڕەمـەزانی ساڵـی ١٣٢٧ لە سلێمانی ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە تەکیەکەی خۆیدا نێژراوە.

مامۆستا مەحوی، زیاد لە کوردی، شارەزاییەکی تەوای بەسەر زبان و وێژەی عەرەب و ترک و فارسدا بووە و شیعرێکی زۆری کوردی و هێندێک بە زمانەکانی تری لێ بەجێماوە. شیعرەکوردییەکانی یەکجار جـوان و ناسک و ڕەوانن و شاندەری دڵی ئەویندار و بیری وردی شاعیرن. دیوانی شیعری کوردی مەحوی، ساڵی ١٣٤١ ک. م. لە پەخشانگای سلێمانی چاپ کرا.

**چەند غەزەلی کوردی مەحوی**:

وەک بولبوڵ ئەو دڵە بە گوڵی ڕووی کە ڕوو دەکـا — پەروانەیـە زیـارەتی شـەمع ئـارەزوو دەکـا
من وەسڵی ئەو بەرابەری جەننەت دەگرم و ئـەو — دۆزەخ بە ئاهی سینەیی من ڕووبەڕوو دەکا
گەر عاشقی لە خوێنی جگەر قومدە، دەم مـەدە — مـەیخوارە خامکـارە هـەتا هـا و هـوو دەکـا

دونیا بە حیلە مەیلی بە ئەبنای ئەگەر دەبـوو
ئەم دایە ڕێژبارە بە فەرزەنـدی شـوو دەکـا

تا عەکسی جیلوە دەرنەکەوێ، نەک لـە چاکییـە
ئەو شۆخە چاکی سینەیی «مـەحوی» ڕوفـوو دەکـا

* * *

بە نووری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چـیبکـەم؟
بە شەمعێکی وەها چارەی شەوێکی وا نەکەم چیبکـەم؟

لەگەڵ دەستی مەلا ڕێک ناکـەوێ زوننـاری زولفـی یـار
وەکوو شێخ ئیختیاری مەزهەبی تەرسا نەکەم چیبکەم؟

لە ڕێی ئەو شۆخدا خۆم کـردە خـاک و پێـی نـەنا پێما
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم چیبکـەم؟

دەمێکە شـاری پڕشـۆری مەحەببـەت مـات و خامۆشـە
بە قانوونی تەجەننون شۆرشێ ئینشا نەکـەم چـیبکـەم؟

لە چاوا، نم نـەما بـۆ گریـە نۆبـەی سـوجدە بـەر دەریـە
سیاساڵـم نـەبارە، نـوێژی ئیستـسقا نەکـەم چـیبکـەم؟

لەسـەر تـۆم دوژمنـە دونیـا قەزییـەم «مـانعُ‌الجمـع»ە
کە تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دونیـا نەکـەم چـیبکـەم؟

بەجـێ‌مـاوم لـە یـاران، نابـەجێ مـاوم ئەجـەل زوو بـێ
بە مردن لەم قوسووری ژینە ئیستعفا نەکەم چـیبکـەم؟

ئەوا لەیلێ! بە ڕۆژی حەشر ئـەدا وادە دەڵـێ «مـەحوی»
هەتا قامی قیامـەت ئاهــ و واوەیـلا نەکـەم چـیبکـەم؟

* * *

لە دەوری خەستەخانەی عیشقی ئەو سـەوزەی کەواشـینە
لەسەر هەر خەستەیێ یا خوێندنی یا شینە یـا سـینە

شەهیدی غەمزەیە بەعـزێ، سـەقیمی عیشـوەیە جـەمعێ
دیـارە سەرنویـشتی ئـەهلی دڵ یـا شـینە یـا سـینە

بەسەر دڵدا لە قاپی فەیزەوە دێ نەشئە پەیدەرپـەی
چ غەمزەی دیدە مەخمووری کە ئەمشەو کون دەکا سینە؟

هەناسـەم دا بـە ناڵـەی عـەرزی حاڵـم کـەم کـە تاسـاوە
لە خوێنا وا دڵ و جەرگم لە خوێنی کەیلـە تـا سـینە

لە عالەمدا عەلامەت سـوبحی حەشـر ئـەم شـەو بـەیانیدا
خودا عـالـم لـە چـاکی ئـەو غەزاڵـە دەردەخـا سـینە

مـەلا تـەلقینی «مـەحوی» دانـەدا، «حَبْـلُ‌المَتـینی» ئـەو
لـە جێگـەی زیڵـەزیـڵی، ڕەئفـەتی تاهـا و یاسـینە

* * *

ئەو ئەگەر بێ یا نەبێ من داد و بیدادێ دەکـەم
گوێ بداتێ یـا نـەداتێ ئـاهـ و فـەریادێ دەکـەم

حەققی ئیخلاسە بەجێهێنانی ئادابی خولووس
پێ بزانێ یا نەزانێ من بە دڵ دادێ دەکەم

بیستوونی عیشقی شیرینە ئەوا هاتۆتە پێش
گەر لە حەق بێم یا نەیێم تەقلیدی فەرهادێ دەکەم

ئاوی تێغی وەقفی هەر تشنەلەبێ کە من نەبم
کارگەی بێ یا نەبێ لەم زاڵمە دادێ دەکەم

دەرسی عیشقم هەر لە لای پەروانە یا بولبول بووە
بیگەمێ یا نەیگەمێ هەر مەشقی ئوستادێ دەکەم

کوشتنی ئەسفەندیاری نەفسە بەستەی مەیلی پیر
گەر مەدەد کا یا نەکا لەو شاهە ئیمدادێ دەکەم

بەم نزیکانە لەبەرمە «مەحویا» ڕێگایکی دوور
بێتە دەستم یا نەیێ من کۆششی زادێ دەکەم

* * *

ئەسیر و قەیدی سەیدی کەید و شەیدی نەفسی ئەممارەم
لە دەس ئەم مارە بەدکارە سیاچارەم، چییە چارەم؟

لە هەفتا تێپەڕیم و حەفتەیێ بۆ دین و بۆ دونیا
بە کاری خۆم و کاری کەس نەهاتم وەی چ بێکارەم

چ خوەش وەختێ بوو ئەو وەختم لە گۆشەی بێکەسیدا بووم
وەکوو هایم لە دەشتی ناکەسیدا ئێستە ئاوارەم

بە ناخون سوورەتی یارم لە سەفحەی سینە نووسیوە
لە حەشرا وەختی نەشری نامەکردن منم و سیپارەم

لە جیبمدا ئەگەر یەک پارە شک نابەم چ پەروامە
خودا گەر قابیلی دیبم هەتا سەر جیبی سەدپارەم

نە شەیتان و نە دەوران و نە خزمانم بە من ناکەن
ئەوەی نەفسی خەسیسم «مەحویا» کردوویە دەربارەم

* * *

پەروانە! سووتنم وەرە بڕواکە، من نەمام
پەروانە! ئیترم نییە پەروا، کە من نەمام

ئەو نەونەمامە کەی بەری میهر و وەفا دەدا؟
بۆ من، لە دەستی جەور و جەفادا کە من نەمام

بازاڕی دەرد و کونجی غەم و میحنەت و ئەلەم
بێڕەونەق و نیشات و سەفا ما کە من نەمام

«مەحوی» کە غەمیە مەردمی غەمپەروەرێ نییە
غەم مایەوە بە بێکەس و ماوا کە من نەمام

* * *

دونیا تیاترۆیە مەوەستە تیا بڕۆ
کێ مایەوە تیا کە نەبووبێ تیا ترۆ

ڕووتورش و ڕووخوەشە لە ڕوێکا لە یەکدەما
قەهری درۆیە، میهری درۆ، هەردو هەر درۆ

* * *

ئەهلی عیبرەت ماوە گەر بێ سەیری ناسرشا بکات
دوو لە دووسی کەم شەهی کرد و کشێکی ڕێ نەهات
هاتی وا سەیری نەهاتی کەن کە سەد تیپی سەوار
پاسەبانی بوون لە ناو بەستا، پیادێ کردی مات

**دوو چوارینەی فارسی مەحوی**:

آن باد که چادر از سرت بیرون کرد
صدها چو من شیفتەات مجنون کرد
گویی که ز اشتیاق دیدارت باد
دیوانە شد و حملەی بیقانون کرد

* * *

بزدای ز دل محبت دنیا را
مفروش بە نعمت جهان، عُقبی را
ز اینجا بە کف آر توشەی آخرت
فردا ندهند رایگان آنجا را

*دیوانی مەحوی. گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل٣٦-٣٩. *مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٦٢.

## سەید ئەحمەدی نەقیب

کوڕی سەید حوسەینی قازی، کوڕی سەید ئەحمەدی نەقیبە کە ساڵی ١٢٧٦ لە سلێمانی هاتۆتە دنیا.

سەید ئەحمەد پیاوێکی زانا بووە و هێندێک کتێب و نووسراوەی لێ بەجێماوە و بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە. دوای کۆچی دوایی باوکی، گەورەیی ئاغا و ساداتی سلێمانی پێ گەیشتووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٢٧ ک. م. بۆ حەج چووە و هەر لەوێ دنیای بەجێهێشتووە.

*تاریخ سُلیمانیّە*، ل ٢٣٩.

## حەریق

مەلا ساڵەح، نازناو «حەریق»، کوڕی مەلا نەسروڵا، ساڵی ١٢٧١ ک. م. لە گوندی «زیویە»ی ناوچەی «سوورداش»ی سلێمانی هاتۆتە دنیاوە. بابی خەڵکی ئابادی «کاشتەر»ی ناوچەی بێڵەوار بووە کە دوای خوێندن، چۆتە زیویە و لەوێ ژنی خواستووە و گیرساوەتەوە.

حەریق سەرەتا لای بابی خوێندوویە و پاشان ماوەیەک لە قەرەداغ و هێندێک لە پێنجوێن و بیارە و سلێمانی شوێنی دەرس و دەورەکەی گرتووە و ئەوجار چۆتە سابلاغ و لەوێ ئیجازەی وەرگرتووە و لەوێوە خزمەتی شێخ یۆسف شەمسەدینی بورهان گەیشتووە و چۆتە نێو تەریقەتی نەقشبەندیوە و دوای سەرەتێک سەیر و سولووک، گەڕاوەتەوە سابلاغ و ژنی خواستووە و لە قوتابخانەیەکی ئەوشارەدا دەرسی گوتۆتەوە و سەرەنجام لە کۆتایی ساڵی ١٣٢٦ یان ١٣٢٧ ک. م. کاتێ کە ٥٦ ساڵی تەمەن بووە، ژیانی کۆتایی هاتووە.

حەریق لە شاعیرانی خۆش‌زەوق و دەم‌پاراوی کوردە کە بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە و زۆربەی شیعرەکانی

غەزەل و ئەویندارى و سەرانسەر وردەکاری شاعیرانەیە. دیوانەکەی ساڵی ١٩٣٨ ز. لە بەغدا چاپ کراوە.

**چەند شیعری حەریق**:

عاشقی سەروی قەدت قـومری‌سـیفەت زاری ئـەکا
ڕووی گوڵی تۆ بوڵبوڵی دڵ فێری غەمخواری ئـەکا

خوەت وەکوو سوڵتان و چـاوت حـاکم و ئەبرووتـە شـیر
تیری موژگانت وەزیرە مەشـقی خونخـواری دەکـا

کەوتە نێـو زوڵـماتی زولفانـت دڵـی ئەسـکەندەرم
خزری زیندەی ماچی لێوت، کـەی دێ ڕزگـاری ئـەکا؟

من بە میـزانی تەبیعـەت گەوهـەر ئەفرۆشـێ دڵـم
وا لـە سـایەی زوڵـفی تـۆدا کەسـبی عـەتاری ئـەکا

مورغی دڵ برژا لەبـەر قرچـەی هـەتاوی فیرقـەتت
تا بەکـەی داوی سـەری زوڵـفت گرفتـاری ئـەکا؟

مەستی بادەی چاوی ئەوم و پـێم ئەڵـێ مەسـتی مەیـە
سەیر کەن بوختانی ناحەق چۆن بـە لـەب جـاری ئـەکا

بێرە مەیدانی فەساحەت ئەسپی خۆت لنگ‌دە «حەریق»
تا بزانم کێ بە شـیعرت سـوحبەت و یـاری ئـەکا؟

* * *

چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خـوەی نوانـد
نەک نمەک‌گیربم بە مەرگی تۆ قەسەم هـیچ نـەمدوانـد

گـــوڵ بـــە تـــۆزی پێتـــەوە لاف و گـــەزافی لـــێ ئـــەدا
خوا شوکر سـۆزی نەسـیمت هـات ئەویـشی لـێ سـتاند

نشتەری موژگانی تۆ هاتۆتـە سـەر سـەفحەی دڵـم
هەر خەتێ بوو غەیری خەتتی سەبزی تۆ پـاکی کرانـد

لەشکەری ئاهم لەگەڵ جەیشی حەبەش دەعوا دەکا
حەیرەتم ماوە کە چۆن ئـەو دڵـبەرە دڵـمی ڕفانـد؟

بـۆ گوڵــی ڕووت هــاتم و پەرچــەم ئــەبینم بۆیــە وا
ماهی نەورۆزم وەکوو ماهی موحەڕڕەم خوەی نوانـد

تۆ لە ئەووەڵ گـۆی وەفـات هێنایـە نێـو مەیدانـەوە
ئیستە چەوگانی خیلافت پشتی سـەد وەعـدەی شـکاند

تۆ خودا قەت غیرەتە بۆ تـۆ ئـەرێ سـەروی ڕەوان؟
گوڵ بە بێ‌تۆ وا لە باغا خێـوەتی خـۆێ لـێ چەقانـد

با وجوود ئینساف بـدەم چاکـە گوڵـیش موشـتاقتە
هەر لە شـەوقی تۆیـە سـەرپۆش و گریبـانی دڕانـد

* * *

بەڵەک بو کێو و سەحرا وەک دەڵەک خوەی دزیەوە زستان
زەیستان چون بەری خست ئیتیفاقە هێزی پێ مـا بـێ

خـــەڵاتی شـــاهی نـــەورۆزی ئیـــشارەی ئاتـــەش‌ئـــەفرۆزی
نەسیم هێنای بە دڵسۆزی کە سـۆزی کـەس جـەفای نابـێ

ڕەئیسی هـەورە، تـۆپچی ڕەعـد، تـۆپ بـەرق و نیـزامبـاران
سەبا پێـشڕەو، تەلێعـە تەرزەیـە، فەڕڕاشـی ڕێ بـا بـێ

نەفەس دەم، دیدە پڕ ئاب و سەماوەر سینە، جەرگ ئاتـەش
کەلامم قەندە، گەر ساقی لەگەڵ من ئارەزووی چـا بـێ

* * *

له خەرمانی ئەمەل میرووی عەمەڵ جەزبی نەکرد دانێ
لە زەیقەتخانەدا ترسم هەیە ئاخر سەری دانێ

تەریدەی نەفس و شەیتان قافڵەی تاعاتی غارەت کرد
ئەگەر جاسووسی ئیمانی نەبێ دەرناچێ ئینسانێ

تەرازووی تاعەتت لەنگە، هەتاکەی ئەمسەر ئەوسەرتە
بە پارسەنگی حەیا دەس هەڵبرە، بنوارە میزانێ

مسی بێ‌تاعەتی رووکەش، مەلەک سەرڕافی ئەعمالە
موحەسسیل نەقدی قەڵب و نارەوا نابات دیوانێ

ئەوا بەردی ئەجەڵ هاتوو لە شووشەی عومریدا، سادەی
بە قوربانی پیاڵەی چاوەکەت بم تێکە فنجانێ

حەیات خۆ چوو لە نێو جامەی حەیاتی عاریەت بێ‌عار!
ئەوا داوای ئەکەن چی‌بکەم «حەریق» ڕێگەی ڕەجا کوانێ؟

*مجموعەی شعر و ادبیات کردی*، بەشی یەکەم. *تاریخ سلیمانیە*، ل٢٥٩. *مێژووی ئەدەبی کوردی*، ل٣٨٦-٣٩٩.

## مەستی ئەفەندی

ڕەسوول مەستی ئەفەندی، زانایەکی خەڵکی ناوچەی شارەزوورە کە ساڵی ١٢٢٩ ک. م. هاتە دنیا و ماوەیەکی زۆر لە قوتابخانەکانی شار و بازێڕانی کوردەواریدا خوێندی و سەرەنجام پاش وەرگرتنی ئیجازە لە مەلا موحەممەدی خەتێ، بۆ ئەستەمبووڵ ڕۆی و لەوێ چووە نێو مەدرەسەی فەرمییەوە و لە زانستە نوێیەکانیش سەری دەرهێنا و تەنانەت کتێبێکی لە بابەتی فیزیکدا نووسی کە مامۆستایانی ئەو بوارە پەسندیان کرد و لە لایەن سوڵتانی عوسمانییەوە خەلاتی بەرکەوت و سپاسی لێ کرا. ئەوجار بووە کارگێڕی دەوڵەت و سەردەمێک لە مەدرەسەکانی مووسڵ و کەرکووک و قاهیرەدا دەرسی گوتەوە. دوای ئەوە گەڕاوە ئەستەمبووڵ و بۆ سەرپەرشتی مەعاریفی شاری وان، چوو بۆ ئەو شارە و پاش چەند ساڵ، دیسانەکە گەڕاوە میسر و زبانی فەڕانسە چاک فێر بوو. ئەوجار چوو بۆ ئوورووپا و ساڵێک مایەوە و لەوێوە گەڕایەوە ئەستەمبووڵ و سەرەنجام ساڵی ١٣٢٧ ک. م. کۆچی یەکجاری کرد.

**لە کتێبەکانی**: *«الادراک لِتشریحِ الافلاک»*، *«اثبات واجب‌الوجود»*، *«حوادث عَناصر»*، *«بوومەلەرزە و ڕێگای بەرگری لە خەسارەکانی»* و *«فیزیکی نوێ»*؛ کە بەشێ لەو کتێبانە چاپ کراون.

*تاریخ سُلیمانیّە*، ل ٢٥٠.

## شێخ ڕەزا

شێخ ڕەزای تاڵەبانی[1] کەرکووکی، کوڕی حاجی شێخ عەبدوڕڕەحمانی «خالص»، لە هۆزی زەنگەنەی

١. **تاڵەبان** گوندێکی لای چەمچەماڵە کە خێڵی هەمەوەند لەوێ دەژین و مەلا مەحموودی زەنگەنە، باپیرەگەورەی شێخ ڕەزا، نیشتەجێی ئەوێ بووە.

کەرکووک، ساڵی ١٢٥٤ ک. م. لە گوندی «قۆخ»ی ناوچەی چەمچەماڵ هاتۆتە دنیا. سەرەتا لە کەرکووک، لای سەید موحەممەد بلاغی کەرکووکی و حاجی سەعید ئەفەندی حیلمیزادەوە خوێندوویە و دوای ئەوە ماوەیەک لە کۆیە و هەندێک لە سلێمانی شوێنی خوێندن و قوتابخانەی گرتووە و دوای تەوا کردنی دەرس و دەور، بۆ حیجاز چووە و لە گەڕانەوەدا گەیشتۆتە ئەستەمبووڵ و لەو شارە ترکییەکی باش فێر بووە و لەگەڵ نامیق کەمال، شاعیری بەناوبانگی ترکدا، بۆتە دۆست و دەگەڵی ئاموشۆی هەبووە.

شێخ ڕەزا زۆری سەفەر و سەیر و سیاحەت کردووە و ماوەی پازدە ساڵان بە وڵاتانی ترکیا و میسر و شام و ئێران و عیراقدا گەڕاوە و بێجگە کوردی و ترکی، لە عەرەبی و فارسیشدا تەوای کردووە و بەو چوار زبانە شیعری گوتووە.

دیوانی شێخ ڕەزا دەبێتە سێ بەشەوە: بەشێکی موناجات و سکاڵا و پەسنی خودا و پێغەمبەر و ئەولیا و گەورەپیاوانی ئایینی و پیرانی پارێزکارە؛ کە هەمووی، لە غەزەل و قەسیدە و قەتعەی، بەڕاستی شیعری یەکجار بەرز و بەقەوتن. بەشیتر، پێداهەڵگوتن و هاتنەباڵای شا و میر و بەگلەر و دەوڵەمەندانە؛ کە خوا هەڵناگرێ لەگەڵ ناوچۆڵیدا، لە باری شیعریشەوە -لەچاو شیعرەکانی تری- هێندێک کز و لاوازن.[1] بەشی سێهەم و زیاتر بەش لە دیوانی شێخڕەزا، کە هۆی شۆرەت و ناسراوی تا ئەمڕادەشی هەر ئەم بەشەیە، گەپ و گاڵتە و تەنانەت جنێو و قسەی سووکە بە هەرکی و هەرچی هاتۆتە بەر ڕێ و کەیفی نەیگرتووە. تەنانەت لە هێندێکدا، پەردەی شەرم بەتەواوی وەلا دراوە و هێچی تێدا نەماوەتەوە. خوێنەری ئەو شیعرانە، بێشک دەبێ کە شاعیرەکەی کابرایەکی هەرزەکاری شەو و ڕۆژ خەریکی لاتی و ئەڵواتی و بێمبالاتی بووە و لە هیچ شتێ کۆی نەکردۆتەوە؛ کەچی ئەوی ڕاست بێ و ئەوانەی لێ نزیک بوون و لەگەڵیدا ژیاون، گێڕاویانەتەوە و نووسیویانە، بە پێچەوانە، شێخ ڕەزا پیاوێکی دەروێشی پارێزکار و ئەهلی تەریقەت بووە و لە بەڕێوەبردنی دەستووری شەرع و بەجێهێنانی ئەرکی دینیی سەرشانیدا، یەکجار پێداگری کردووە!

بەکورتی زۆربەی شیعری شێخ ڕەزا، بە کوردی و عەرەبی و فارسی و ترکی، لەوپەڕی قەوەت و جوانی و ڕەوانیدایە و لە گش بارێکەوە، بە وردەکارییە وێژەییەکان ڕازاوەتەوە. هەموو جۆرە شیعرێک، وەکوو قەسیدە و غەزەل و چوارینە و قەتعەی، بە کاکڵ و مانای جۆراوجۆرەوە، وا وەستایانە هۆنیوەتەوە، سەری تێدا سووڕ دەمێنێ. بەتایبەت بۆ دانانی شیعری گاڵتە و تیز و تانە و فڕ کردن، گرێوی لە جەریری عەرەب و سووزەنی سەمەرقەندی و عوبەیدی زاکانی بردۆتەوە.

---

١. با پێش ڕەخنەگرتن لە شێخ ڕەزای بلیمەت، بیرێ لە خۆمان بکەینەوە: بەڕاستی ئێمە وەکوو میللەتێک چۆنە کە هونەرمەندێکی ئاوا پایەبەرزمان، بۆ بزنێکی گەڕیان تەنانەت مریشکێ، ناچار بێ قەسیدەیەک بە باڵای ئاغایەکی تێنەگەیشتوودا بهۆنێتەوە ؟

شێخ ڕەزا ساڵی ١٣١٨ ک. م. کەرکووکی بەجێهێشتووە و لە بەغدا نیشتەجێ بووە و ساڵی ١٩١٠ ز. (١٣٣٨ک. م.) هەر لەوێ کۆچی یەکجاری کردووە و لە پەنا مەرقەدی شای ئەولیا، شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە ناخی ئاخدا نووستووە.

دیوانی شێخ ڕەزا چەند جاران چاپ کراوەتەوە؛ بەڵام بەداخەوە، هەموو جارە ناتەواو و پەرژ و بڵاو پڕ هەڵە و پەڵە![1]

شێخ پێشتر «لامیع» و دوایی هەر ناوی «ڕەزا»ی بۆ نازناوی شیعری خۆی هەڵبژاردووە. ئێستا با چاوێک لە چەند شیعری ئەم شاعیرە گەورە بکەین:

**سەرەتا دوو بەیتی عەرەبی:**

لا أُبالی و إن امرتَ بقتلی — أنّا راض بما عَلَیْه رضاکا

لجَمیع الوَری بَقاكَ مُفیدٌ — أسْألُ اللهَ اَنْ یُدیم بَقاکا

**چەند شیعری فارسی شێخ ڕەزا**

یەکەم بەیتێک بە جیناسی تاممەوە لە دوو وشەدا:

شکافی کە بینی در ایوان **کسرا** — دهانیست گوید بقا نیست **کس را**

**غەزەلێکی سکاڵا:**

ای ریزەخوار خوان نوالت مە و ماهی — جُودت چو وجودت اَبد و نامُتناهی

بر نامەی اعمال سیاهم قَلَم عَفو — برکش کە بدل شد بە سفیدیم، سیاهی

بیرون شدن از ساحت ملك تو محال است — هر جا کە روم عبد توام خواه نخواهی

از عَفو و عُقُوبت نبود سود و زیانت — این هر دو بە نزد تو مساوی است، الَهی!

بودم من اگر بندەای از خواجە گریزان — بازآمدم ای بندگیت دولت شاهی

این دیدەی گریانم و این سینەی سوزان — بر صدق سُخن میدهدم هر دو گواهی

صدگونە امید است «رضا» را بە تو، هر چند — سر تا قدمش غرق گناه است و مناهی

بەندێکی پارچە هەڵبەستێک لە پەسنی پێغەمبەردا (د):

ای جهانآفرین ثناگویت — وی دو عالم مُعطر از بویت

ساکنان سرادق ملَکوت — همە قُربان یك سر مویت

گُل ز خونیندلان رُخسارت — سرو مایل بە قَدّ دلجویت

لالە در راغ داغدار رُخت — نافە دلریش خال هندویت

---

١. لەم دواییانە خوا لێ خۆشبوو مامۆستا شوکور مستەفا، چاپێکی لەو دیوانە دەرهێنا کە هەرچەندە هەڵەی پێتچنی، بەتایبەت لە شیعرە فارسییەکانیدا زۆرە، بەڵام دیسان باشترە.

نسخەی کاینات و هرچه در اوست — شرح رَمزی ز مُصحَف رویت
عرش کمتر بهای مُشت گلی — که بر او آرمیده پهلویت
سُرمه مفتون چشم ما زاغت — شَبَه از هندوان گیسویت
عارضت وَالضُّحی، خَطت وَاللیل — قُلْ هُوالله حرْز بازویت
قاب قوسین را نمی‌دانم — جز کمانهای هر دو ابرویت
روز و شب جبرئیل در پرواز — بی سر و پا همی دود سویت
روضه‌خوانی کنم به روضەی تو — همچو درویش بر سر کویت
کَز سراپردەی مقدس ذات — بر سراپای انورت صلوات

قەسیدەیەک بۆ پەسنی قوتبی تەریقەت، شێخ حوسامەدینی نەقشبەندی:

نه سر از مطلع گیلان به در آرد ماهی — نه عَلَم بر کشد از سمت بُخارا شاهی
نه ز کاشانه به بازار اَنَاالحق گویان — مَست و سرخوش گذرد پیر فَنافی‌اللهی
نه به دامن چَکَد از دیدەی گریان اَشکی — نه به کیوان جَهَد از سینەی سوزان آهی
نه ز رندان صَبُوحی‌زدەی بزم اَلَسْت — هایهویی، طَرَبی، خندەی قاهاقاهی
زیر این گُنبد فیروزه نیابی امروز — پَی به حق برده، ز اَسرار خدا آگاهی
اوحدی احمد جامی و جُنید و معروف — بایزیدی، حَسَنی، خواجەی عُبیْداللهی
کرده هر مُلْحدکی جامەی تقوی در بر — که مَنَم قُطب زمان، تا به کف آرد جاهی
قُرب یزدان نَتَوان جُست به هر اهرمنی — دست بیعَت نتوان داد به هر گمراهی
بود هر جا در فیضی همه را قُفل زدند — التجا کار خرَد نیست به هر درگاهی
فَیض خواهی ز مُریدان حسام‌الدین شو — آنکه پیش کَرَمش کُوه کَم است از کاهی
چون نشنید ز پی ختم به خلوت، گویی — خَیمه بر وادی وَحْدت زده شاهنشاهی
آنکه با یك نظرش دست دهد سالك را — قُرب صدسال عبادت به سلوك ماهی
چه غم از رَهزنی نفس گرت بدرقه اوست — پنجه با شیر علی چون بزند روباهی
آرد از همت او دامن مقصود به کف — دست از دامن مقصود، چو من کوتاهی
حاسدی گر کُند انکار کمالش چه عَجَب — یُوسفی ار فکند دست حَسَد در چاهی
ای مَتاع دو جهان جایزەی یك نگهت — خواهم از چشم «رضا» عطف نگاهی گاهی
از ثَنا زود عنان باز کشیدم که نداشت — در خور طبع روان قافیه جولانگاهی
به وجودت که بُود تَعْبیه از جوهر جُود — نَرسد رنجی و عارض نشود اکراهی

بۆ ئەتکی حاجی ئەولغەنی ناوێکی چکووسی تارانی داینـاوە کە گوایە ویستوویە بە خێری خۆی،

دەساوێک سازکا:

حــاج عبــدالغنی خلایــی ســاخت
تــا بگوینــد ذکــر او از پــس!

بهـــر تـــاریخ آن «رضـــا» گفتـــا:
توشــەی آخــرت همیــنش بــس

**دوو غەزەلی کوردی**:

ڕۆژێ نەبوو ئەم دڵبەرە بــێڕەحمــە وەفـا کـا
جارێ نەبوو ئەم کافرە شــەرمێ لــە خــودا کـا

حــەیرانن ئــەتبا لــە عــەلاجی مــەرەزی مــن
لوقمانی ویساڵت مەگــەر ئــەم دەردە دەوا کـا

کارێ کە غەم و دەردی فیراقت بە منی کــرد
سەرما بە هــەتیو، بـا بــە دەواری شــڕی ناکـا

دیوانەیە شەخسێ کە لە غەیری لەبلی لــەعلی
وەک شاهی سکەندەر تەڵەبی ئاوی بــەقا کـا

تاب و تەبی ئاتەشکەدەیی هجری وەکــوو شــەمع
نەزدیکە منیش واریــدی ســەحرایی فــەنا کـا

لــەم ڕێگەیــە تەقــدیری ئــەزەڵ وا بــوو کــە ئێمــە
پاماڵی جەفا بین و ڕەقیب ســەیر و ســەفا کـا

ڕۆح و دڵ و دین هەرسێ دەکــەم بــەزڵ و نیــساری
کامی دڵی من گەر لە لــەبی لــەعلی ڕەوا کـا

ســەردانێ لــە ڕێ عیــشق، «ڕەزا» لازمــە عاشــق،
بۆ یــار ســەر و ماڵــی ســپەر تــیری قــەزا کـا

* * *

دەمکوژێ حوکمە دەزانم بە خودا دەردی حەبیب
وەرە سا بەشقی خودا دەس لــە یەقــەم بــەردە تــەبیب

تاڵیعم نەحــسە دەترســم کــە بــە ئــازاری فــیراق
بمرم و ڕۆژێ نەبێ دەوڵەتی وەسڵم بــە نــەسـیب

چاوی فــەتتانی تــۆ کــاری هــەموو جادووگەرییــە
کە بە یەک عیشوە ئەدا عابدی سەد ساڵە فــەریب

تا لە تۆ دوورە دڵی غەمزەدە ئــەی ڕاحــەتی جـان
مەشرق و مەغربە مابەینی لەگەڵ سەبر و شەکیب

بێفەراز نابێ نەشیب، ئــەم قــسە تەحقیقــە وەلــێ
من لە ڕێی عشقی تۆ نەمدی بە خودا غــەیری نەشـیب

شێخ دەگۆڕێتەوە گەر چاوی بــە زوڵــفت بکــەوێ
خەرقە و سوبحە و سەججادە بە زوننار و ســەلیب

تاقــەتی تــاق بــووە بێچــارە لــە ژێــر بــاری فــیراق
بکە ڕەحمێ بە «ڕەزا» چاکە تەرەححوم بە غەریب

**دووبەیتییەک بە سەنعەتی ئیهامەوە**:

تۆ کە خۆت مەیلی جنێوبازی دەکەی شێخ ساڵــح
بۆ دەکەی سەرزەنشی مــن کــە «ڕەزا» هــەجاوە

غایەتی بەندە جنێوم بە دوو ـ سێ کەس دابــێ
تۆ هــەتـا ئێــستە بــەقوربان بــە هــەزارت داوە!

**هێندێک بێپەردەتر**:

«شێخڕەزا» پیر بووە ڕووی مەجلیــسی یــارانی نییــە
تاقەتی کەشمەکەش و گەردشی شارانی نییــە

دەسبەگۆچان دەگەڕێ ئێستە لەبەر زەعفــی وجــوود
مەترەقە ســەرزلەکەی قــووەتی جــارانی نییــە!

**دیسان هەڵدراوەتر**:

هــەر واقــەواقــی دڵــمە بــە دەســتی فیراقــەوە
وەک ڕێویێ کە هەردوو گونی بــێ بــە فاقــەوە

ئیمان لە تەوقیسەرمەوە وەک واشە دەرپەڕی — سمتی کە دەرپەڕانـد و سـەری نـا بـە تاقـەوە
موتریب لە عەشقی یاری عیراقی بەحەسـرەتم — بۆم هەستە وردە ـ وردە لە پـەردەی عیراقـەوە

**دیسان ... !**

*دیـوانی شـێخ ڕەزا*، چـاپی بەغـدا، ١٩٤٦ ز. شـێخ *ڕەزای تاڵـەبانی*، د. موکـەڕڕەم موکوریانی، چاپی ئاراس، ٢٠٠١، *دیوانی شـێخ ڕەزا*، شـوکور مـستەفا، چـاپی ئـاراس، ٢٠٠١، *دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی*، کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی شێخ موحەممـەدی خـاڵ و ئومێـد ئاشـنا، ئـاراس، ٢٠٠٣، *مێـژووی ئـەدەبی کـوردی*، ل ٣٤١ تـا ٣٦٢.

## موحەممەد ڕەشید پاشا

موحەممەد ڕەشید پاشای زەهاوی، کوڕی مەلا موحەممەدی فەیز (موفتی زەهاوی)، ویژەوانێکـی وشـیار و نووسەرێکی وردبینە کە لە هێندێک شار و باژێڕی عیراق و سـووریادا نایـب بـووە و پاشـان بۆتـە ئەنـدامی دادگەی پێداچوونەوە (استیناف)ی بەغدا و سەرەنجام لە کەربەلادا بۆتە بریکار.

زا و مەرگی ڕەشید پاشا سالانی ١٢٦٤ و ١٣٢٧ ک. م. ڕوویداوە.

ڕەشید کاکی جەمیل سیدقی زەهاوی شاعیری بەناوبانگە و جەمیل لە شینیدا قەسیدەیەکی گوتووە کـە وا دەسپێدەکا:

يــا ضــريحاً فيــه الرَّشــيدُ يَنــامُ — مُطْمَئِنّــا، منّــى عَلَيْــكَ الــسَّلامُ
أكْبَــرَتْ لَيْلَــة الرشــيد اللَّيــالى — وَ مَــضَتْ فــى إكبارهــا الأيّــام

تا دەڵێ:

ألمنايــا يَرْمينَنــا كُــلَّ يَــوم — بــسهام فَــلا تطــيشُ الــسَّهامُ
هَـدَّ رُكـنَ البيـت الزَّهـاوى خَطْـبٌ — جَلَــلٌ جــاءَهُمْ وَرُزْءٌ جُــسامُ
أكلْــةٌ لا تَــسُوغُ ثُــمَّ شَــكاةٌ — ثُـمَّ داءٌ فـى الجـوف ثُـمَّ حمـام
جئــتُ صُــبحاً أسـائلُ القبـرَ عنـه — وَ عَلَــى القَبــر هَيْبَــةٌ وَ احْتــشامُ
أيُّهــا القبرُ كيــف فيــك رشــيدٌ — أشَــديدٌ كــذا عَلَيْــه الــسَّقامُ؟
لا تَكُـنْ فـى وجـه الرَّشـيد عَبُوسـاً — فَهْــوَ فــى وَجْــه ضَــيْفه بَــسّامُ

*تاريخ سُليمانيّه*، ل٢٥٦. *ديوان صدقى زَهاوى*، ل١٥٩.

## عەیشی سنەیی

میرزا ئەحمەد، نازناو «عەیشی» و کەسناو «سُلطانُالـشُعَرا»، شاعیرێکی سەوداسەری دڵسووتاوی گفـتجـوان

بووە کە هەر بە لاوی سەری ناوەتەوە. شیعری زۆری گوتووە و خۆی کردوونیە حەوت بەشەوە و هەر بەشێکی ناوێکی لێ ناوە: ١. «*جَنّةُالنبیاء*»، ٢. «*جَنّةُالعُلَماء*»، ٣. «*جَنّةُالعُرفاء*»، ۴. «*جَنّةُالاشراف*»، ۵. «*جَنّةُالامَراء*»، ٦. «*جَنّةُالعاشقین*» و ٧. «*جَنّةُالخَواتین*».

ئەمن لەو حەوت دەفتەرە، تەنیا «جَنّةُالعاشقین»م دەسکەوت؛ کە زۆربەی باسی ئەوینداری خۆیە و «*گُلستان ابراهیم*»یشی پێ گوتووە. ساڵی تەواوکردنی ئەم هۆنراوەی ١٣٢٨ ک. م. نووسیوە؛ کە هەر لەو ساڵەدا لە دنیا چووە.

ئەمەش شیعرێکی عەیشی، تەخمیسی قەسیدەیەکی سەعدی:

مطلع دیوان ز نَعت خالق یکتا — از رَقَم کلک گشت زینت طُغرا
گُفت بە دیباچە اسم حق کنم انشا — «اَوّل دفتر بە نام ایزد دانا»
«صانع و پروردگار و حیّ توانا»

تا کە بە تقدیر شد ارادە چو توأم — کَنز خَفی را جلی نمود بە یکدم
ساخت ز یک امر کُنْ فَکانْش فراهم — «اکبر و اعظم خدای عالَم و آدم»
«صورت خوب آفرید و سیرت زیبا»

بندە اگر خود عراقی است و حجازی — هندی اگر هست یا ز مردم رازی
رزق فرستد کە رازقی است نە بازی — «از در بخشندگی و بندەنوازی»
«مُرغ هوا را نصیب ماهی دریا»

مرد غَنی گر بە مال از همە شد بیش — هست اگر بینوا ز فقر جگر ریش
رزق کسی را ز قسمتش نَدهد بیش — «قسمت خود می‌خورند منعم و درویش»
«روزی خود می‌بَرند پَشە و عنقا»

دادە از آب مَعین حیات بە هر حَی — زر دهد از خاک و گُل ز خار دهد وَی
از صدف آرد گهر، ربیع پس از دی — «جانور از نطفە می‌کند، شکر از نَی»
«برگ تر از چوب خشک و چشمە ز خارا»

فرع فراوان کند اصیل‌تر از اصل — میوە ز چوب آورد، رُطب دهد از نخل
قَز دهد از کرمکی و خارە کند لعل — «شربت نوش آفرید از مگس نحل»
«نَخل تناور کند ز دانەی خرما»

خلق اگر خود مخالفند و موافق — بندە اگر کاذب است یا همە صادق
هست ز گنج نَوال بر همە مُنْفق — «از همگان بی‌نیاز و بر همە مشفق»
از همە عالم نهان و بر همە پیدا»

مُـرغ خـرد کَـی رسـد بـه اوج کمـالش — عقـل بـشر را نـه ره بـه عـرش جلالـش
برتـر از آن اسـت و هـم کـرده خیـالش — «پرتـو نـور سُـرادقات جمـالش»
«از عَظمـت مـاورای فکـرت دانـا»

ذکـر وَرا ماسـوی نکـرده فرامـوش — جمله به جوش و خروش و یکسره خاموش
چشم و سر و بینی و لـب و دهـن و گـوش — «خود نـه زبـان در دهـان عـارف مـدهوش»
«حَمد و ثنـا مـی‌کنـد، کـه مـوی بـر اعـضا»

قـادری و واحـد وعلـیم و مُقَـدّر — مـر قَلَـم تُـست بـر میـاه مُـصَوّر
شـمس و قمـر را تـویی مُـدیر و مُـدَوّر — «بـار خـدایا مُهَیْمنـی و مـدَبّر»
«وز همـه عیبـی مُنزّهـی و مُبَـرّی»

ای تو مُعَرّی ز مـرگ و خـوردن و خفـتن — چون تـو خبیـری، چه چیـز از تـو نهُفـتن؟
مـا کـه نـدانیم دُر نعـت تـو سـفتن — «مـا نتـوانیم حـقّ حمـد تـو گفـتن»
«بـا همـه کَرّوبیـان عـالَم بـالا»

«عَیْـشی» شَـیدا بـه سـر نگفتـه، عَلَـن گفـت — با دوصد افغان بـه سـان مـرغ چمـن گفـت
وصف وَی از روی جهل، نی ز فطن گفت — «سعدی از آنجا که فهم اوست سُخن گفت»
«ورنـه کمـالات وهـم کَـی رسـد آنجـا»

**چوارینە**:

امـروز میـان دلبـران تـاق تـویی — شاهنـشه شـاهدان آفـاق تـویی
مـسموم ز زهـر هجـر دیـدار مـنم — زنهـار بیـا بیـا کـه تریـاق تـویی

* * *

در هجر توام جـای چـه بغـداد و چـه بلـخ — بی وصل توام آب چه شیرین و چـه تلـخ
تـا کـی بـه امیـد غُـرَّه‌ی مـاه رُخـت — هـر مـاه کـه آیـد رسـد از غُـره بـه سَلخ

*جَنّةُالعاشقین*، عەیشی.

## مەلا موحەممەد حەسەنی تورجانی

مەلا موحەممەد حەسەن، کوڕی عەللامە مەلا عەلی قزڵجی (تورجانی)، پیاوێکی زانا بووە کە ژیـانی زۆرتـر بە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە و نووسین تێپەڕ کردووە و لە نووسراوەکانی شەرحێکە بـۆ «*فـرائض*»ی بـابی نووسیویە.

مەلا حەسەن ساڵی ١٢٧٥ ک. م. لە تورجان هاتۆتە دنیا و ١٣٢٨ هەر لەوێ لە دنیا چووە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخی بورهان

شێخ یۆسف، ناسراو بە شەمسەدین، ساڵی ١٢٤٥ یان ١٢٤٦ ک. م. لە گوندی «ماوەت»ی ناوچەی «شـاربازێڕ» هاتە دنیا. بابی یۆسف جووتیار بوو؛ بـەو بۆنـەوە ئـەویش هـەر لـە منداڵـییەوە، وەکـوو بـاقی، لـە کاروبـاری کشتوکاڵدا، بەردەستیی باوکی دەکرد؛ وەها کە بـە لاوی، جووتیـارێکی تـەواو لێـزان و سـەردەرچووی لـێ دەرهاتبوو. بەڵام کە پێگەییشت، زیرەکی و لێهاتوویی لە ڕادەبەدەری، بەرەو خوێندن و فێربوونی هاندا و چووە نێو کۆڕی فەقێیانەوە و زانستێکی باشی دەسکەوت. پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، بۆ ئابادی «تەوێڵێ» ڕۆی و بوو بە مریدی قوتبی تەریقەت، شێخ عوسمانی نەقشبەندی و پێڕای بەڕێوەبردنی داب و دەستووری تەریقە، ماوەیەک ئاوکێشی و خاوێن‌کردنەوەی خانەقای گرتە ئەستۆی خـۆی؛ تـا ورده ـــورده بـەرچاوی کرایـەوە و گەیشتە پلەی سەرووی عیرفانیی و بوو بە خەلیفە و بـە وەرگـرتنی ئیجـازە و بـە فـەرمانی مورشـید، بـەرەو موکوریان بووەوە و لە گوندی «بورهان»، نێوان مەهاباد و بۆکان، خانەقایەکی دامەزراند و ڕێنـوێنی و ئیرشـادی خەڵک و ڕاسپاردنیان بە چاکە و پرینگاندنەوەیان لە خراپەی دەسپێکرد.

شێخ یۆسف زانایەکی ئاکارچاک و عارفێکی دڵـپاک بـووە؛ خـۆی لـە دووڕەنگـی و مـەرایی و کەشـف و کەرامەت نواندن، بواردووە و قەت پووڵ و پارەی مرید و مەنسووبی هەڵنەگرتووە. بۆخۆی چاکی بـەلادا داوە و لە سەر مەزرا کاری کردووە و ئارەقی ڕشتووە و خەڵکەکەش کە ئەمـەیان دیـوە، بـە دەمیـەوە هـاتوون و یارمەتییان داوە. لە مالکانی دێ، زەوینی بە ئیجارە گرتووە و بە کاری بێ‌وچانی خۆی و مـەردمی ئابـادی و مریدان، خەرجی خانەقا و میوانانی دەرهێناوە و بەم شێوە و بە کردەوە، هەموانی تێگەیاندووە کە کار بکـەن و چاوویان تەنیا لە کەرەمی خوا و کاری خۆیان بێ؛ تەنبەڵی و تەوەزەلی وەلا نێن و بزانن «دەسـتی مانـدوو لەسەر زگی تێرە».

بەم شێوە، پاش ماوەیەک لە بەرهەمی کشت و کاڵ، پارەیەکی باش کۆ بۆتـەوە و شـێخ توانیویـە گونـدی «شەرەفکەند» بسێنێ و لە شـوێنێکی پـەنای ئـەوێ، بـە نـاوی «سـۆلاوکان» ، خانەقایـەک بکاتـەوە و دوای ماوەیەکی تر، ئابادی «ئاتابلاغی»ش بکڕێ و بیکاتە مەوقووفەی خانەقا.

خۆ و خدەی بەرزی شێخ، بووە بە هۆی ڕووتێکـردنی خەڵـکێکی زۆر لـە خانـەقا بـۆ ئیرشـاد و تەنانـەت زۆرێک لە زانایان و مامۆستایانی پایەبەرزی موکری و شکاک، هاتوونەتە ڕیزی مریدانی شـێخەوە؛ کەسـانی وەک: سەید موحەممەد سەعیدی کولیجی، مەلا موحەممەد وەسیم، مەشـهوور بـە «مـەلای گورۆمـەری»، مەلا سیراجەدینی شکاک، مەلا ئەحمەدی یاراڵـی، سـەید ڕەشـید، مـەلا موحەممـەد سـادقی مرزینـگ، میسباح‌دیوان، سەیفول‌قوزاتی موکری، حەیدەری مەهابادی (سالار سەعید) و ...

ئەو کۆما خەڵکەی لە خانەقادا کۆ دەبوونەوە، بە ڕۆژ سەرقاڵی جووتیاری و شەوان خەریکی نوێژ و قورئان خوێندن و زیکر و فیکر و خەتم داب و دەستووری تەریقەت بوون و بەم جۆرە، کار و عیبادەتیان پێکەوە بووە.

شێخ یۆسف ئەگەرچی ئەولادی هێژای هەبووە، هەموو جارێ ڕایگەیاندووە و پێداگری لەسەر کردووە کە شێخیەتی بە کەلەپوور ناچێ و پاش من کەس لە زاروزێچم بۆی نییە ببێتە شێخ و مریدانم نابێ کەسیان بە شێخ بزانن. جا بەو بۆنەوە دوای خۆی، لە بنەماڵەکەی، شێخیەتی درێژەی پەیدا نەکردووە؛ بەڵام تا ئەم دواییانە، خانەقا هەر بەردەوام بووە و لە بەرهەمی مەوقووفەجاتی، داماوان و زیارەتکەران، خزمەت کراون.

شێخ یۆسف ساڵی ١٣٢٨[1] ک. م. ڕووی لە دنیا وەرگێڕا و لە سەر گردێکی نێزیک لە خانەقا نێژرا. گڵکۆی ئێستاش لای خەڵک پیرۆزە و زیارەتگەی مریدانییە.

وەرگیراو لە یادداشتی مامۆستا هەژار. *یادی مەردان*، ب٢، ل٥٠٣ و ٥٠٤.

## میرزا عەبدولقادری پاوە

کوڕی کوێخا موحەممەد، ساڵی ١٢٦٦ ک. م. لە پاوە هاتۆتە دنیا و دوای خوێندنی وانە سەرەتاییەکان لە زێدی خۆی، بۆ «کاشتەر» چووە؛ کە لەو سەردەمەدا خاوەن قوتابخانەی دینی بووە و لەوێ شوێنی خوێندنەکەی گرتووە.

لە پاشکۆی «*ڕۆژنامەی کوردستان*»ی ساڵی ١٣٤٠ ک. هـ. )١٩٦١ ز.) چاپی تاراندا، هەڵبەستێکی میرزا، بە ناوی «*کولە و عاینەمەل*» چاپ کراوە. نووسەری پێشەکی بۆ هەڵبەستەکە دەڵێ: میرزا لە کاشتەر، لە خزمەتی عارفی پایەبەرز شێخ غەفووردا خوێندوویە. ئەم گوتە لە دوو بارەوە لە ڕاست ناچێ؛ یەکەم ئەوەی کە شێخ غەفوور ساڵی ١٢٧٠ ک. م. لە دنیا دەرچووە. ئەو کاتە میرزا ئەولقادر پێنج ـ شەش ساڵان بووە. دووهەم، شێخ غەفوور بۆخۆی قەت نەیپەرژاوەتە سەر دەرس گوتنەوە و لە سەردەمی ئەودا، کەسانی تر ئەستۆگری ئەم کارە بوون؛ مامۆستایانی وەک مەلا مستەفای چەمیاڵەیی و مەلا فەتحوڵای پاوەیی و ...

ئەوی ڕاست بێ کاتی خوێندنی میرزا لە کاشتەر، شێخ ئیسمایلی کوڕەزای شێخ غەفوور مەدرەسە و خانەقای ئەوێ گەڕاندووە و وەک باسیمان کرد، وێژەوانێکی گەورە و شاعیرێکی باش بووە و دوور نییە میرزا ئەولقادر بەشێک لە دەرسەکانی لای ئەو خوێندبێ.

هەرچۆنێک بێ، میرزا پاش خوێندن، گەڕاوەتەوە پاوە و تا تەمەنی ٤٦ ساڵان لەوێ ماوەتەوە و ئەوجار دوو ساڵ ئینشابەندیی موحەممەد بەگی جوانرۆی کردووە و لە ٥٣ ساڵاندا، بە هۆێ تێکچوونی بارودۆخی پاوە و جوانرۆ، گەڕاوەتەوە کاشتەر و ماوەیەک لەوێ دانیشتووە و کە پاوە هێمن بۆتەوە، دیسان گەڕاوەتەوە ئەوێ؛

---

١. ئەم ڕستەی قورئانە: «واجْعَلْهُ رَبّ رَضیّاً»، بە حیسابی ئەبجەد، سالی کۆچی دوایی شێخی بورهانە.

بەڵام هێندەی پێ نەچووە، بۆ هەتاهەتای ژیانی، کۆچی کردۆتە کرماشان و لەو شارە گیرساوەتەوە.

میرزا ئەولقادر لە کرماشان، لەگەڵ شاعیری بەناوبانگ و عارفی سەرپەتی، سەید ساڵەحی حەیرانعەلیشادا باری ئاشنایەتی و ئام وشۆ دادەڕێژێ و لە خزمەتیدا بەهرەیەکی باش دەبا.

سروشتی جوان و ڕازاوەی هەورامان، بەتایبەت دیمەنی دڵبزوێنی شاهۆ، هەر لە سەرەتای لاوی و هەرزەکاری میرزاوە، دڵ و دەروونی ـکە بەشێکی خوا داویشی هەبووە ـ بزواندووە و سەرەنجام بە کار و تێکۆشانی بەردەوام، شاعیرێکی توانا، خۆش‌زەوق، وردبین و ناسک‌خەیاڵی لێ بەرهەم هێناوە.

میرزا کە نازناوی «قادر» بووە، شیعری زۆری گوتووە؛ بەداخەوە بەشێکی لەناو چووە و بەشێکیشی کە ماوەتەوە، هەروا پرژ و بڵاوە. ئەم شاعیرە بێژگە غەزەل، چەند هۆنراوەی تری داناوە کە هەرکام باسێکی سەربەخۆیە و لە زبان و وێژەی کوردیدا یەک بە یەک وەکوو شاکارێک دێنە ئەژمار؛ داستانی «*کولە و عاینەمەل*» یان بەسەرهاتی «*چنار و هەولی*» یا باسی «*ئاسمان و زەوی*».

میرزا ئەولقادر سەرەنجام ساڵی ١٣٢٨ ک. م. لە تەمەنی ٦٢ ساڵاندا، لە شاری کرماشان کۆچی یەکجاری کردووە.

**چەند شیعری میرزا**:

ئیمشەو قیبلەکەم لە مەن کەفتەن دوور دوور بۆ لە دیدەش، دیدەم بیەن کوور
ئیمشەو نازارم لە مەن پێوارە عەقل و فام مەن بیەن ئاوارە
ئیمشەو ئازیزم، دونیا و دینەکەم مەحبووب شیرین مەهـ جەبینەکەم،
باڵای زەریفش لێم نادیارەن کوورەی دەروونم چون کوورەی نارەن
ئیمشەو مەواچی عەزاداریمەن جە داخ دڵبەر، دەرد کاریمەن
ئیمشەو شەو نییەن، داخ دەیجوورەن جە دووری باڵات دیدەم بێ‌نوورەن
کاشکای نەکەردام ئی ئاشنایی وەی تەور نەچەشتام مەزەی جیایی
کاش وەرۆی ئەزەل تۆ نەدیام وەچەم تاوەی‌تەور قەرین نەبیام چەنی خەم
یاخوا کەس بادەی هیجران نەنۆشۆ جەرگش وە ئایر حرمان نەجۆشۆ

* * *

هاوار جە «هاوار»، هاوار چێش کەرۆن؟ هاوار هاوارم وەلای کێ بەرۆن؟
هاوار هامسەران! هاوارم بێ‌هۆن هاوار جە «هاوار»، هاوار پرسم کۆن؟
هاوار، مەتەرسۆن جە ڕووی نەدامەت «هاوار» بی زێدم تا ڕۆی قیامەت
هاوار، مەتەرسۆن «هاوار» بۆ وە جێم چون گۆر غەریب کەس نەزانۆ پێم
پێم بۆ وە حەسرەت دیدار یاران هاوارم بگنۆ وەسەر مەزاران

مەگــەر هــەم خالــۆم شــای نامــداران
ئێــل بــەگی بلــووک خــێڵ خانــەداران

بپۆشـــۆ وە تـــەن خـــەڵات خانـــان
بنیـــشۆ وە شـــاد لـــە بـــەرزەبانـــان

گـا عـەزم سـەیران «خانـەگا» و «پـاوە»
گا سەرسـەختانان «سـەردەرە» و «شـاوە»

گـا نـە سـەفای ڕای هـەرد «بیـدمیر»
جار-جار نە ڕووی لوتـف بـاوەرۆم نـەویـر

وەر نــە تــا مەحــشەر نــە هاوارەنــان
ئــاوارەی وەتـــەن: یـــار و دیارەنـــان

«قــادر» تــا ئەبــەد هــەر نــە هــاوارەن
ئــاوارەی وەتــەن، یــار و دیــارەن

* * *

من هەر تۆم هەنی نـەک واچـی تـۆم بـۆ
تـۆم بـۆ چـەنی عـام نییـەن چـەنی تـۆ

تــۆ تۆتــۆی دەروون بگێـــڵە پێـــشدا
ئەر تۆ تۆیێ دیـت غـەیر جـە تـۆ تێـشدا

تۆخــوا وێــتئاســا بــاوەڕەش وەبــەر
وە مــەودای ئـەبرووت پارەپـارەش کـەر

**سکاڵای سەرەتای هۆنراوەی «کولە و عاینەمەل»:**

یاکـــەریم حـــەق، یاکـــەریم حـــەق!
یــا فــەرد بێچــوون، یاکــەریم حــەق!

یــا بینــای بێبــاک، مــەوجوود موتــڵەق
یا سازندەی چەرخ بـێ سـتوون مەولـەق

یا ئاگا جە دەنگ پەنجـەی پـای پەخـشە
نـەزاد و نـەمـر، جـە کـەس نـە لەخـشە

یاتــای بــێهــەمتا قــەدیم ئەقــدەس
سیوای تـۆ هـیچکـەس نییـەن بـاڵادەس

یــا ڕەونــەقنمــای گــوڵان شــەوبۆ
یــا زەبــانئــامۆز دەیرییــان کــۆ

یا بـێ خەنـدە و شـین، نـەزا و نەمـەردە
یــا «عــالم العِلْــم» تەحــسیڵ نەکــەردە

یــا بــێ مــەئوا و زێـد بی یـار و رەفێـق
یا بیمیسل و ڕەنگ، دانـای بـە تـەحقیق

یا سـازندەی قـەلب بنیـادەم جـە خـاک
یــا عــیش دەر وە دڵ مۆمنــان پــاک

یا «مالِک المُلک» سـەمای سـەر بیسات
جە دەس «مەلـەخ» پێمـانـدەی نـەجات

مەعلوومــەن بــێتــۆ پەشــێوەن حاڵــم
یـە جـەور «مەلـەخ»، یـە جـەفای زاڵـم

**چەند بەیتی کۆتایی ئەم هەڵبەستە:**

گشت وەدەست تـۆن دانـای کـول حـاڵ
«مەلەخ» پـەی مـەردم کـەردی وە زەواڵ

«ئاینەمـــەلت» کـــەرد وە زەواڵ ئـــەو
ڕۆی ڕۆشــن کــەردی لـێش تاریکەشــەو

ئومێــــدم وە تــــۆن کــــەرەم فــــراوان
گۆشەی لوتف تۆ پەی گشتکەس یـاوان

مــەعلووم هــەر زوڵــمێ زەواڵــێ دارۆ
هــەر تــۆز و گــەردێ شەماڵــێ دارۆ

هەر شادی و زەوقێ شینێش هانە شـۆن
تــەنیای بــێزەواڵ، زات پــاک تــۆن

ســیوای زات وێــت شاهــــ بــێزەواڵ
نە شۆر، نە شیرین، نـە تـرش و نـە تـاڵ

یەکـــسەر فانییـــەن ویرانـــەن ماڵـــش هەرکەس کە سێوەت کـەرد وە زەواڵـش
ئافەریـدەی جیـنس ئەشـیا گـرد تـۆنی نــە هــەرجا هــەنی، نمــەز جــە کـۆنی
ئەر سەد هەم عاسی، هەم گونام بێ‌شـۆن «قـــادر» ئومێـــدش وە ئـــەلتاف تـــۆن

*ڕۆژنامەی کوردستان*، تاران، ١٣٣٥ ک. ھ. پێـشەکی هـۆنراوەی *کوله و عاینەمەل*، پاشکۆی *ڕۆژنامەی کوردستان*، ١٣٤٠ ک. ھ.

## کەوسەری سەقزی

قازی مەلا موحەممەد کەریمی سەقزی، نازناو «کەوسـەر»، جێگـری مـەلا مـستەفای قـازی، کـوڕی مـەلا موحەممەد سەلیم، کوڕی مەلا شەریفی قازی، ساڵی ١٢٦٥ ک. م. لە سەقز هاتە دنیا و خوێندنی لای مەلا موحەممەد، مامۆستای مزگەوتی جومعەی سـەقز و مـەلا عەبدوسـسەلامی بانـە تـەواو کـرد. لـەو نێوانـە، ماوەیەک لە بۆکان لای مەلا موحەممەد شەریف، دوو ساڵ لە وەتەمیش لە خزمەتی مەلا عەولای پیرەباب و دوو ساڵ لە تورجان، لە کۆڕی دەرسی مەلا عەلی قزڵجی (تورجانی) بەهرەی بـرد و پـاش خوێنـدن، لـە سەقز دادوەری دەسپێکرد و ماوەیەکیش دەرسی گوتەوە و سـەرەنجام لـە ١٢ی جیمـادیئـاخری ساڵـی ١٣٢٨ ک. م. پاش ٦٣ساڵ، لە سەقز دنیای بەجێ‌هێشت.

کەوسەر لە مریدانی شێخ عومەر زیائەدین و سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی بووە؛ خەتی جوان نووسـیوە و دیوانێکی لێ بەجێ ماوە؛ کە ئەوا دوو غەزەلی:

ای آنکـه در حجـاب تَقَـدُّس نهـان تـویی بر هـر صـحیفەای ز صـحایف عیـان تـویی
تنهـا تـویی خـدای زمـین و زمـان همـه بخـشندەی روان تـویی و جـانستان تـویی
از ماسـوای تـو سـخن آخـر بـود هـدر ذاتی کە لایق است بـە مـدح و بیـان تـویی
در بوسـتان عـشق تـو، از رهـزن هـوس جان را چە غم کە حافظ آن بوستان تـویی
مـا را کـە میهمـان و غـریبیم در جهـان فکر وطن کجاست کە خـود میزبـان تـویی
تـو واجـبُ‌الوُجـود و شـریک تـو مُمْتَنـع مـا مُمْکنـیم و خـالق امکانیـان تـویی
وقـتِ‌نَـوال، بـاد صـبا را تـویی معـین گـاه غَـضَب دلیـل سُـمُوم خَـزان تـویی
مـاییم کـاروانی بـیزاد و نَـو سَـفَر توفیـق دە کـە رهبـر ایـن کـاروان تـویی

* * *

تـا دیـدەی مـن دیـدە گـزین یـار بیـارە گـشتە اسـت دلـم عاشـق رُخـسار بیـارە
هر چنـد بـە تـن دورم از آن جـای مُبـارک لـیکن شـدە جـان بلبـل گُلـزار بیـارە
در دیدەی من هست بس ارزندەتـر از لَعـل خاشـاک و خـس کوچـە و بـازار بیـارە

باشـد پـی اربـاب صـفا در طلـب دوسـت — بهتــر ز گــل بــاغ جنــان، خــار بیــاره
از پنجــەی شــیران عَــرین بــاک نــدارد — روبـــاه نَظَـــر کـــردەی اَبـــرار بیـــاره
آه ایـن چـه نـسیمی اسـت نوازشـگر جانهـا — کایـــد همـــەدم از در و دیـــوار بیـــاره
صـوفی شـده در رقـص کـه آیینـەی دل را — داده اســت جَــلا نــسبت عطــار بیــاره
آیـد بـه تَمَنـی، مَلـک ار خیمـەی تَعلـیم — بــر پــا کنــد آن رهبــر غمخــوار بیــاره
«کـوثر» شـود آبـی کـه بـر آن نیـک بتابـد — عکـــسی ز رخ پیـــر مـــددکار بیـــاره

وەرگیراو لە یاداشتی مامۆستا نافیع مەزهەر.

## ئیسماعیل حەققی بەگ

کوڕی مستەفا زیهنی پاشا، لە کەڵەپیاوانی بنەماڵەی بابان و یەک لە ئەنـدامانی کۆمەڵـی «اتحـاد و ترقّـی»، حوقوقزانێکی هێژا و نووسەرێکی توانا و بیرمەنـدە کـە لـە سـەردەمی دەسـەڵاتی عوسمانیـدا، ماوەیـەک وەزیری مەعاریف و دەورەیەک لە پارلەمان نوێنەری عیراق بووە.

**لە کتێبەکانی**: «*حقوق اساسی*» و «*عراق مَکتوبلری*»

حەققی ساڵی ١٣٢٩ ک. م. لە ئەستەمبووڵ کۆچی دوایی کردووە و شاعیری بەناوبانگی کـورد، جـەمیل سیدقی زەهاوی، لە شینیدا شیعرێکی داناوە کە ئەوا چەند بەیتی:

جـاءَت الـصُّحُفُ حـاملات نَعیّـاً — أكْبَرَتْــهُ الأسْــماعُ فــی بَغْــداد
فَبَكَـتْ فـی بَغْـدادَ «حَقّـی» عُیُـونٌ — كــانَ حَقّــی منْهــا مَكــانَ الــسَّواد
كــانَ منــدُوبَها و كانَــتْ تُبــاهی — برَجاحاتــــه جَمیـــعَ الـــبلاد
فَبَكَیْنــــا شَــــبابَهُ وَ بَكَیْنــــا — جَلَــداً فیــه راســخَ الأوْتــاد
رَقْــدَةٌ فــی مَلْحُــودَة ســبَقَتْها — و قَفَــاتٌ لَــهُ بــصَدْر النّــادی
مـاتَ فـی مَیْعَــة الـشّباب إذالعَـزْ — مُ صــدیقٌ، إذالزَّمــانُ مُعــادی
قَــدْ لَبــسْنا ثَــوْبَ الحــداد عَلَیْـه — أنَـا وَ العلْـمُ وَ الحجـی وَ بـلادی

*مشاهیر الكُرد*، امین زَکی بیگ.

## یەمین لەشکر

میرزا موحەممەد ڕەفیعی یەمین لەشکر (لەشکر نووس)، کوڕی میرزا ئیسمایلی موشـریف[1]، کـوڕی مـیرزا

---

١. بەرپرسی ئابوورەمەنی لەشکری کوردستان بووە کە ساڵی ١٣٠٦ ک. م. مردووە.

موحەممەد ڕەفیعی موشریف، لە ویژەوانان و خۆشنووسانی بەناوبانگی کوردستان بووە کە پێڕای کاری زۆر و سەرقاڵی لە ئەرتەش، وەکوو نووسەر و تەداروکاتچی ئەو سەردەمە، دەستی لە نووسین و تەمرین بەرنەداوە و بە تێکۆشانی بێ وچان، لە خۆشنووسیدا، گەیشتۆتە ڕادەی ئوستادی و هێندێک مەشق و وێنەختەتی زۆر جوانی لێ بەجێماوە.

میرزا ڕەفیع بابی خوا لێ خۆشبوو عەبدولعەزیزی یەمین لەشکرە کە مرۆیەکی هێژا و پارسا و ئەهلی تەریق بوو؛ خەتیشی جوان دەنووسی. لەم بنەماڵە، کە بە «موشریفی» دەناسرێن، لە ڕابردوو تا ئێستا، کەسانی هەڵکەوتە زۆر بارهاتوون کە بۆ پارێزکاری و خزمەت بە کۆمەڵگا، بەناوبانگن.

میرزا موحەممەد ڕەفیعی یەمین لەشکر ساڵی ١٣٢٩ ک. م. لە دنیا چووە.

*نگرشی کوتاه بر خوشنویسی در کردستان*، چاپ ١٣٦٢ ک. ھ. ل٢١. یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا عارفی بالکی

کوڕی مەلا عەبدوسسەمەد، دەوری ساڵی ١٢٩٠ ک. م. لە گوندی «بالک»ی لای مەریوان لەدایکبووە و خوێندنی لای باوکیەوە دەسپێکردووە و پاشان چۆتە نێو جەرگەی فەقێیانەوە و زۆرێک قوتابخانەی ئایینی، بۆ فێربوونی زانست گەڕاوە و سەرەنجام ئیجازەی وەرگرتووە. پاشان لە ئابادی «دووڕۆ» لە ڕۆژهەڵاتی مەریوان، لای شێخ عەلادینی عوسمانی نەقشبەندی گیرساوەتەوە و پاش وەرگرتنی تەریقەت، بەرنوێژی و کاروباری خەتم و خانەقای گرتۆتە ئەستۆ.

لە دوای یەکەم شەڕی جیهانی، لە قوتابخانەی دووڕۆ دەرسیشی گوتۆتەوە و تا ساڵی لە دنیا چوونی (١٣٣٠ ک. م.) ئەو کارەشی هەبووە.

مەلا عارف مرۆیەکی زانا و پارێزکار و بێ دەعیە و دەمار بووە؛ خەتی جوان نووسیوە و قورئانی بە دەنگێکی خۆش خوێندووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٢٥٨.

## شێخ عەزیزی مەردۆخی

لە شێخانی مەردۆخی نیشتەجێی گوندی «تەختە» و لە مریدانی شێخ زیائەدینی عوسمانی نەقشبەندی، پیاوێکی ویژەوان و لە شیعردا خاوەن زەوق بووە و دەوری ساڵی ١٣٣٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

ئەم چەند بەیتە بەشێکی قەسیدەیەکە بە بالای مورشیدەکەیدا گوتووە:

سخن تا کی نهان دارم که بوی یار می آید　　　نسیم آستان حضرت دلدار می آید

به هر گلشن که گُل چینم بـه هـر وادی کـه بنشینم
نـسیم بامـدادی بـا شـمیم یـار مـی آیـد

من دیوانەی صحرانـشین، مـدهوش و سرمـستم
ز بوی موی و روی وی کزین کُهسار می آید

ز فیض حضرت قُطبُ‌الیقین، پـور سـراج‌الـدّین
مـرا از مبـدأ فَیّـاض حـق، اَنـوار مـی آیـد

به هر جا بگذرم، هر گوشه‌ای منزل کـنم آنجـا
نـسیم نـسبت یـار از در و دیـوار مـی آیـد

«عزیزا» چون نباشم شاد؟ کاینک مژده آوردنـد
مـــرا بهـــر ورود آســـتانش بـــار مـــی آیـــد

چەند جونگی دەسنووس. *یادی مەردان*، ب۲، ل ٥٦١.

## شێخ عەلی تاڵەبانی

حاجی شێخ عەلی، کوڕی حاجی شێخ ئـەوڕەحمانی تاڵـەبانی، لـە شـێخانی عـارفی تەریقـەتی قـادری و زانایەکی گەورەی تەفسیر و حەدیس بووە کە ساڵی ١٣٣٠ ک. م. پاش ٧٠ ساڵ، دنیای بەجێ‌هێشتووە.

خوا لێ خۆشبوو شێخ عەلی بێجگە قورئان، هەموو حەدیسی «*صحیح بُخاری*» لەبەر بووە و زۆرتر دەرسـی حەدیسی گوتووە.

چەند جونگی دەسنووس. پێشەکی *دیوانی شێخ ڕەزا تاڵەبانی*.

## ناجیمی[1] شارەزووری

ئەوڕەحمان ناجیم، کوڕی عەبدوڵڵا، لـە قوتابخانـەکانی کوردەواریـدا خوێندوویـە و دوایـی چۆتـە بەغـدا و ماوەیەک لە کـۆڕی دەرسـی مـوفتی زەهـاوی بـەهرەی بـردووە و ئیجـازەی لـێ وەرگرتـووە. پاشـان بـۆ ئەستەمبووڵ چووە و لە وەزارەتی معاریفی ئەویدا، وەکوو بازڕەسی چاپەمەنی دامـەزراوە. ماوەیـەک لـەودوا گواستوویەتەوە وەزارەتی داد و تا کۆتایی ژیان لە دادگەکانی ئەستەمبووڵدا دادوەری کردووە.

ناجیم پیاوێکی زانا بووە و هێندێک کتێبی لێ بەجێ ماوە؛ بۆ نموونـە: «*مَجمـوعَـةُ الآثـار فـی المَنشـورات و الاشعار*» و «*هدیَةُ الاُمَم و یَنبوعُ الاداب و الحِکَم*»، لە چەند بەرگدا کە بەرگی یەکەمی لە بەیرووت چاپ کراوە.

سەردەمی ژیانی ناجیم، نیوەی هەوەڵی چەرخی چاردە بووە.

*ایضاحُ المَکنوُن*، ب۲، ل٤٣٨. *هدّیَةُ العارفین*، ب۱، ل٥٥٩.

## شێخ مەعرووفی نێرگسەجاڕ

کوڕی شێخەوڕەحمان، کوڕی شێخ قادر، لە پشتی عارفی بەناوبانگ، شـێخ ئـەبولوەفا (تاجولعـارفین)، ساڵـی

---

١. **ناجِم**: واتا پیتۆڵ و هەڵکەوتە. (نَجَمَ فی بیروت شاعرٌ: اذا نَبغَ)

١٢٨٠ ک. م. لە گوندی «نێرگسەجاڕ» هاتۆتە دنیاوە و کە پێگەیشتووە، خوێندنی سەرەتایی هەر لەوێ دەسپێکردووە و ئەوجار چۆتە هەڵەبجە و بە فەقێتی خوێندوویە و ماوەیەک ڕووی لە ڕۆژهەڵات ناوە و لە گوندی «دەوڵەتاوا»ی لای ڕوانسەر، شوێنی خوێندنەکەی گرتووە و پاشان گەڕاوەتەوە هەڵەبجە و لە خزمەتی شێخ مەحموودی موفتی، کوڕی شێخ عەبدوڵلای خەرپانیدا گەیاندوویەتە ئاخر و ئیجازەی وەرگرتووە.

شێخ مەعرووف کە خوێندنی تەواو کردووە، لەسەر فەرمانی شێخ مەحموود، لە هەڵەبجە دەمێنێتەوە و لە قوتابخانەکەیدا دەرس دەڵێتەوە و کچەکەشی دەخوازێ. لەم ماوەدا سەفەرێکی «بیارە» دەکا و لە خزمەتی شێخ زیائەدیندا دەچێتە نێو تەریقەتی نەقشبەندییەوە. پاش دە ساڵ ژنەکەی عەمری خوا دەکا و شێخ مەعرووف لەوپەڕی پەرۆشیدا، هەڵەبجە بەجێدێڵێ و دەگەڕێتەوە نێرگسەجاڕ و سەرەنجام کۆچ ئەکاتە ئابادی «ئەحمەد بەرەندە» و تا کۆتایی ژیان لەوێ بە دەرس‌گوتنەوە و ئیرشادی خەڵکەوە خەریک دەبێ.

شێخ مەعرووف مرۆیەکی خێرومەند و پارێزکار بووە و بۆ حاواندنەوەی هەتیوان و منداڵانی بێ کەس‌وکار، زۆری کۆشاوە و تاقمێکی زۆریانی بارهێناوە و پێگەیاندووە. نانی بەلاشی نەخواردووە و هەرکوێ ڕۆیوە، زەوینێکی بە ئیجارە گرتووە و تێدا کشت‌وکاڵی کردووە و بە ڕەنجی شانی خۆی ژیاوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٣١ ک. م. ئەمری خوای بەجێهێناوە.

*یادی مەردان*، ب٢، ل ٥٣٢-٥٣٨.

## ئەدەب

عەبدوڵلا بەگی کەسناو «میسباح دیوان» و نازناو «ئەدەب»، کوڕی ئەحمەد بەگ، کوڕی ئیبرایم بەگ، کوڕی ڕۆسەم بەگ، کوڕی سەیفەدین، لە بنەماڵەی بابامیری موکوریانی، ساڵی ١٢٧٧ ک. م. لە گوندی «ئەرمەنی بلاغ»ی نێوان بۆکان و میاندواو هاتۆتە دنیا.

ئەدەب ماوەیەک لە سابلاغ (مەهابادی ئێستا) دەخوێنێ و پاشان بابی مامۆستایەکی زانا بانگ دەکا کە لە ماڵدا بە ئەو عەلی بەگی برای ـ کە پاشان بە ناوی سالار سەعیدی حەیدەری دەیانناسی ـ دەرس بێژێتەوە. دوای ئەوەش بە فەرمانی باوکی بۆ درێژەدان بە دەرس و خوێندن، دەچێتە تاران و لەوێش یەکێ ــ دوو ساڵ دەخوێنێ.

ئەدەب ئەگەرچی سەرجەم زۆری نەخوێندووە، بەڵام بە هۆی زەوق و زیرەکی زۆر و هەروەها بیری تیژەوە، زبان و وێژەی فارسی باش فێر بووە؛ لە نیگارکێشی و بیرکاری و مووسیقادا، شارەزایی پەیدا کردووە و هێندێک کتێبیشی نووسیوە.

میسباحی ئەدەب ئەوینداری کچێکی نوسرەت ناو بووە و زۆربەی شیعرەکانی، باسی ئەم خۆشەویستی و عاشق‌بوونەیە و ئەگەرچی دوایی بە مرازی گەیشتووە و نوسرەتی خواستووە، بەڵام تا ئاخر هەر



خۆشیویستووە و بە بەژن و باڵا و چاو و برۆیدا هەڵیگوتووە.

ئەدەب لە کۆتایی ژیانیدا تووشی شەپلە بووە و بۆ دەرمان بردوویانەتە ڕووسیا ؛ بەڵام ئیفاقەی نەکردووە و ماوەیەک لەودوا (ساڵی ١٣٣١ ک. م.) لە دنیا چووە.

دیوانی ئەدەب ، لە یەکەم شەڕی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨)، کاتێ لەشکری ڕووس چوونەتە ناو مەهابادەوە، لەناو چووە و دوایی لەم لا و لەو لا، هێندێکی کۆ کراوەتەوە و ساڵی ١٩٣٩ ز. لە بەغدا چاپ کراوە.

چەند نموونە لە شیعری ئەدەب:

گوتم: با کەم بناڵێنم، نەڵێم دەردم بە کەس چاکە
گوتی: ناڵینی جار-جارت لە دوور بێ وەک جەرەس چاکە

گوتم: مورغی ڕەوانی من ڕەوانە لەو تەنە بێ‌تۆ
گوتی: ئەو مورغە بێ‌باڵە لە لای من بێ‌قەفەس چاکە

گوتم: مەنعم دەکا زولفت لە پابەندی لەبی شەهدت
گوتی: شەهدی دەهانی من بە بێ نێشی مەگەس چاکە

گوتم: دیلی دوو هیندووتم هەتا مەستی خەیاڵی تۆم
گوتی: مەستی خەراباتی لە نێو بەندی عەسەس چاکە

گوتم: بۆ گوڵبونی قەددت خەیاڵی گوڵچنینم کرد
گوتی: بێ‌سەروی ئازادم گوڵستان بۆ هەرەس چاکە

گوتم: میهری بوتان تاکەی، خەیاڵم عوزلەتە جانا
گوتی: عیشقی پەریڕوویان هەتا ئاخرنەفەس چاکە

گوتم: بۆچ ڕێم نییە جارێ بە گوڵزارت گوڵی نەورەس
گوتی: گوڵزاری گوڵ‌خێزم «ئەدەب»! بێ‌خار و خەس چاکە

* * *

نامرێ هەرکەس کە یارێکی وەفاداری هەیە
هەر سەحەرەگاهان سەبووحی جامی سەرشاری هەیە

هەرکەسێ عومری لەگەڵ شەککەرلەبێکا ڕانەبورد
ئەلحەق ئەو شەخسە عەجەب ڕەنجێکی دوشواری هەیە

زیللەتی دونیا ئەوە یارێکی غەمخوارت نەبێ
بەختی بێدار ئەو کەسە دڵداری غەمخواری هەیە

هەرکەسێ وەسڵی دەوێ تاقەت ئەبێ بێنێ بە غەم
گوڵچنین ناچارییە هەر زەحمەتی خاری هەیە

موددەعی فەخری بە گەنجی گەوهەرە و من گەنجی تەبع
پیاوی دانا تێدەگا کێ گەنجی زەخخاری هەیە

دەفتەری فەزڵ و هونەر باوی نەما لەم عەسرەدا
فازڵ ئەو نادانەیە ئەمڕۆ کە دیناری هەیە

با نەکا قیمەت «ئەدەب» لەم عەهدەدا کالای هونەر
هەر چلۆنێ بێت مەتاعی تۆ خەریداری هەیە

* * *

گەر مەتڵەعە بۆ ماهی موقەننەع چەهی نەخشەب
ماهی مە تولۆعی لە چەهی غەبغەبە هەر شەب

گوڵزاری جەماڵە موتەشەککیل بە دو سونبول
یا بەدری درەخشندە لە مابەینی دوو عەقرەب

ئەی سەروی چەمانی قەمەری نووری قەمەر ڕوو!
ئەی غونچە دەهانی شەکەری نوتقی شەکەرلەب!

تاکەی بە جەفا ئێمە خەتاکار و گونەهبار؟
تاکەی بە ستەم ئێمە گرفتار و موعەززەب؟

گەر لوتفە هەتاکەی لەگەڵ ئەغیارە خیتابت؟
وەر قەهرە هەتاکەی منی بێچارە موخاتەب؟

سەد حەیف کە بۆ دەردی دڵی من دەمی وەسڵت
فرسەت کەم و شەو کورتە و تووڵانییە مەتڵەب

گەر بادە فەرەحبەخشە بە یادی لەبی تۆیە
نەشئەی چییە بێشەهدی لەبت جامی لەبالەب

گەر لەو مەیە، گەر مەنعە، ئەگەر کوفرە، گەر ئیسلام
گەر تابیعی قانوونە، ئەگەر خارجی مەزهەب

تاجانی لە تەندایە «ئەدەب» تۆ دەپەرەستێ
زوننار ملم زولفی خەمت، قیبلەمە غەبغەب

* * *

نیگارانی دیاری مە شەکەرلەب گوڵعوزارانن
هەموو تورکی کەمانداران هەموو عەنقا شکارانن

دزی دڵ ئافەتی جانن شکەستی دین و ئیمانن
نە بەستەی عەهد و پەیمانن نە خەستەی جانسپارانن

قەدەحدار و مەیئاشامن دڵازار و دڵارامن
دەمێ وەحشی، دەمێ ڕامن، چ ئاهوو جیلوەدارانن؟

هەموو سیمین بناگۆشن هەموو ماهی زەڕیپۆشن
دەمێ نێش و دەمێ نووشن چە جادووگەر نیگارانن؟

هەموو غیلمانبەچەن سادە، پەرینەسڵن، پەریزادە
بە خەندە نەشئەیی بادە، بە غەمزە مەیگوسارانن

بە قامەت نەخلەکەی توورن، بە تەلعەت کۆمەڵەی نوورن
بە سوورەت هەر وەکوو حوورن بە ئەبروو جانشکارانن

بە دوو لەب جووتی گوڵنارن، بە غەبغەب سێوی خونسارن
بە گیسوو دوو سیامارن، بە چاو ئەفسوونی مارانن

بە باڵا سەروی ئازادن، بە گیسوو دامی سەییادن
لە سەیدی دڵ چ ئوستادن، چ ماهیر جانشکارانن

«ئەدەب» چیبکا لە یـارانی لـە جەرگـەی نـازدارانی؟
دەمێ خونخواری بێباک و دەمێ غـەمخواری جـارانن

*دیوانی ئەدەب*، چاپی بەغدا، ١٩٣٩ ز.

## مەلا موحەممەدی نیەری

مەلا موحەممەدی مودەڕڕیس، کوڕی مەولانا عەبدولمەجیدی مودەڕڕیسی نیەری، پیاوێکی هێژا بووە کـە پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، هاوڕێ بابی لە مزگەوتی دارۆغەی سنەدا دەرسی گوتووە؛ بـەڵام مـەرگی ناکاو مۆڵەتی نەداوە و لە حەوتی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ١٣٣٢ ک. م. (ساڵێک پێش بابی) لە دنیا چووە.

لەم مامۆستایە چەند کتێب لە کەلام و مەنتیقدا بەجێماوە کە شاندەری ئەوپەڕی زانایی و زیرەکی نووسەرەکەیە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ حەمەدەمینی نەقشبەندی

کوڕی شێخ فەتحولا، زانایەکی خەڵکی هەولێرە کە خوێندنی لە زێدی خۆیدا تەواو کرد و پاشان تەریقـەتی نەقشبەندی لە قوتبی عارفان، شێخ عومەر زیائەدین وەرگرت. ئەوجار بۆ حیجاز ڕۆیی و لە شاری مەدینـەی پیرۆز، ماوەی دە ساڵان دانیشت و لە مەدرەسەیەکی ئەوێدا دەرسی گوتەوە. دوای ئـەوە ڕێگـای قـاهیرەی گرتە پێش و لە «رَواقُالاکـراد[1]»ی زانستگای ئەزهەردا، وەکوو قوتابییەک خوێندن و تۆژینەوەی دەسـپێکرد و هێندەی پێ نەچوو، بوو بە سەرپەرشتی ئەوێ و ئەمجار شانی لە دەرسگوتنەوە و نووسـین شـل کـرد و زۆرێک کتێبی نووسی وهەروەها بەشێک لە کتێبە فارسییەکانی ئیمام غەزالی کـردە عـەرەبی و سـەرجەم ١٢ نووسراوە و وەرگێڕاوەی لە قاهیرەدا چاپ کران کە بەشێکیان بریتین لە:

١. *تَنویرُ القلوب* در تصوف
٢. *هدایَةِالطّالبین لَاَحْکام الدّین* در فقه
٣. *ارْشادُ المُحْتاج الی حُقُوق اْلازواج*
٤. *فتح اْلمَسالِك فی ایضاحِ اْلمَناسِك*
٥. *العُهُودُ الوَثیقَة*
٦. *دیوانُ الخُطَب*

---

١. **رواقُالاکراد الایوبیّە**: بەشێک لە زانستگای «الأزهَر»ی قاهیرەیە کە لە سەردەمی ئەییووبیانەوە، تایبەتی بۆ مامۆستایان و قوتابیانی کورد دانراوە.

٧. *سَعادَةُ المُبتَدئین*

شێخ حەمەدەمین پیاوێکی پیرۆز بووە و زانایان و وێژەوانانی میسری زۆریان ڕێز لێ گرتووە و سەرەنجام لە ١٢ی ڕەبیعولئەوەڵی ساڵی ١٣٣٢ ک. م. لە قاهیرە ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە سەرقەبرانی «قرافە»دا نێژراوە.

*الاعلام*، ب٦، ل٢٦٩. *المُعْجَم لأعلام الشرق و الغرب*، ل٤٣٥. *ذیل کشف الظّنون*، ب٢، ل١٣١.

## شێخ مەحیەدینی قزڵبلاخی

لە شێخانی «خورخورە»ی لای سەقزە کە بۆ شوێنگرتنی دەرس و دەور، چۆتە بیارە و ماوەیەک لەوێ خوێندوویە و ئیجازەی گرتووە؛ پاشان لای شێخ نەجمەدینی کوڕی شێخ زیائەدین، تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە و ئەوجار لە هەڵەبجە، دەرسی گوتۆتەوە و بەرنوێژی کردووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٣٢ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

شێخ مەحیەدین پیاوێکی وێژەوان بووە و شیعریشی گوتووە و نازناوی «موحی» هەڵبژاردووە. ئەم چەند بەیتە بەشێکی قەسیدەیەکە بۆ پەسنی مورشیدەکەی گوتوویە:

ای آرزوی عاشق مسکین لقای تو — بادا روان بندەی مسکین فدای تو
می‌خواهم از خدا کە بجویم رضای تو — چون در رضای تُست رضای خدای تو
انوار مُرشدان دگر مُقْتَبس بود — از کوکب سراج گرامی نیای تو
خاک است اگر وجود کثیفم، طلا شود — از فیض پرتو نظر کیمیای تو
فرقم بە تاج شاهی عالم همی‌رسد — باشد چو زیر سایەی بال همای تو
از رشکْ مَعنْ زائدە پیچد بە خود چو مار — گر بشنود چو حاتم طایی سخای تو
«مُحیی» چەسان ستایش ذات تو را کند؟ — از اَبکمی چو او کە نیاید ثنای تو

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ حەمەباقری سنەیی

حاجی شێخ موحەممەد باقر، کەسناو غەیاسەدین، جێگری یۆسف بەگ، کوڕی موحەممەد شەریف بەگ، لە تۆرەمەی کەیها ساڵەح، گەورەی یەکێ لە عەشیرەکانی کوردستانی باکوور بووە کە هۆزەکەی هەڵگرتووە و لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دەرچووە و لە ناوچەی «هەوەتوو»ی سەر بە دیواندەرە و «قەرەتوورە» و «مەریوان»، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان گیرساونەتەوە.

حەمەباقر لە سەرەتای گەنجی و هەرزەکاریدا ـ وەک باوی لاوانە ـ کاتی بە سواری و تیرهاوێژی و ڕاو و کەژوانی ڕابواردووە و هێندە گوێی بۆ خوێندن و زانین شل نەکردووە. بەڵام بابی یەکجار بەئارەزوو بووە کوڕەکەی بخوێنێ و سەوادی هەبێ. سەرەنجام مل بە داخوازی باوکی دەدا و بە نابەدڵی، خوێندنی وانە سەرەتاییەکان دەسپێدەکا و تا ڕادەیەکیش فیقهـ و ئوسوول فێر دەبێ؛ تا شەوێک خەونێک دەبینێ و لە ژێر کارتێکەری ئەو خەوەدا، لێ دەبڕێ دەست لە هەموو شتێک بەر بدا و پشت لەو شێوە ژیانە پێی ڕاهاتووە بکا و وەکوو فەقێیەک بکەوێتە سەفەر و گەڕان بە قوتابخانەکاندا و بەم خەیاڵەوە، نیوەشەوێک بەبێ خەبەر و ڕاوێژ لەگەڵ ماڵەوە، هاوڕێ قوتابییەک لە شار دەردەکەوێ و ڕوو لە ڕۆژاوا دەنێ. پاش چەند ڕۆژ بەڕێوە چوون، دەگەنە گوندی تەوێڵێ، مەکۆی ئیرشادی شێخ عوسمان سیراجەدین (د). حەمە باقر بە هەواڵەکەی ئێژێ: ئێستا کە لێرەین، بۆ نەچین چاومان بەو شێخە بکەوێ وا ئەو هەموو باسی چاکەی دەکەن؟ دوور نییە بۆ سەرکەوتنمان لە خوێندندا، داوای یارمەتیشی لێ بکەین. بەم جۆرە دوو کەسی دەگەنە خزمەتی شێخ و پاش دەس‌ماچ کردن و داوای دۆعای بەخێر، هەڵدەستن بڕۆن، حەمە باقر دەبینێ جووڵەی لێ بڕاوە و ناتوانێ ببزوێ! ناعیلاج بە هاوڕێیەکەی دەڵێ: ئەتۆ بڕۆ؛ من لێرە ماومەتەوە. نیو سەعاتێک تێپەڕ دەکا و ئەو هەروا وەک چێو ڕاوەستاوە. تا شێخ بانگی دەکا و فەرمانی پێ دەدا دانیشێ و دوای دڵدانەوەیەکی زۆر، لەپڕ وای چاو تێ‌دەبڕێ، دەبوورێتەوە و وەکوو مردوویەک درێژ دەبێ. ئەمجار شێخ دەستوور دەدا بیبەنە نێو خانەقاوە و کە هاتەوە سەر خۆی، پێ‌ڕابگەن.

حەمە باقر بەم جۆرە ئەچێتە ناو ڕیزی مریدانەوە و یەک لە خەلیفە گەورەکانی خانەقا، فێری داب و دەستووری زیکر و فیکری تەریقەتی دەکا و لەو ڕۆژەوە ماوەی سی ساڵ، لە ژێر چاوەدێری مورشیدی پایەبەرزیدا، خەریکی عیبادەت و سەیر و سولووک و سەرپەرشتی کارو باری خانەقا دەبێ و دەگاتە ڕادەیەک، شێخ کەڵپۆسی دەروێشی پێ خەڵات دەکا و ئیجازەی ئیرشادی پێ دەدا. ئەوجار ئەگەڕێتەوە بۆ شاری سنە و لە پەنا مزگەوتی گەڕەکی «جەننەت»دا، خانەقا و تەکیەیەک دەکاتەوە و ئەپەرژێتە سەر ڕێنوێنی و ئیرشادی خەڵک.

ئەو مزگەوت و خانەقایە، لەو کاتەوە ناوی دەبێتە خانەقای حاجی شێخ حەمە باقر و ئێستاش هەر وای پێ ئێژن.

هێندەی پێ ناچێ لە هەمو لایەکەوە، خەڵکێکی زۆر بۆ تۆبە و ئیرشاد، ڕوو دەکەنە خانەقا و لە ودمی هەناسەی گەرمی ئەوەوە، پیت و بەرەکەتیان دەس دەکەوێ.

خوا لێ خۆشبوو حاجی شێخ حەمە باقر، لە ١١ی ڕەبیعول‌ئەوەڵی ساڵی ١٣٣٢ ک. م. دنیای بێ بەقا بەجێ دێڵێ و خەڵکێکی زۆر تەرمەکەی بەو پەڕی ڕێز و حورمەتەوە بەڕێ دەکەن و لە زیارەتانی «سەرتەپ»[١]ی خەسراوادا دەینێژن.[٢]

---

١. ئەو گردە ئێستا «**تەپ شێ حەمە باقر**» و «**تەپ شەرەفول‌مولک**»یشی پێ ئێژن.

٢. دواجار لەسەر گڵکۆی شێخ، گۆمبەزێکیان کردووە.

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## وەهمی کوردستانی

شاعیر و وێژەوانێکی خەڵکی مەریوانە کە لە کۆتایی پەنجاکانی چەرخی چواردەدا ژیاوە و مریدی شێخ نەجمەدین، کەوکەبی عوسمانی نەقشبەندی بووە.

وەهمی بە کوردی سۆرانی و فارسی شیعری گوتووە و ئەم چەند بەیتە، بەشێکی غەزەلێکە لە جونگێکدا، کە بە ناوی ئەوەوە نووسراوە:

ئەرێ هەی قیبلەکەی دینم، ئەتۆ بڕوانە بتبینم
که من مردم بکەی شینم، که شینی تۆیە یاسینم

مەکە ئیزهاری بێزاری هەتا ساتێ بە بێ زاری
بێ ئیمکانی تەسکینی دڵی بیمار و غەمگینم

چناری قەددی تۆم دی وا سوروشکم چاوەکم بووبوو
بە جۆباری چناری چەم کە شایەد بێتە تەسکینم

تەماشای چەند شیرینە دەڵێی جەیرانە ببینە
سەراپا ئافەتی دینە کەوا بردی دڵ و دینم

مەداری فەخرە بۆ «وەهمی» وەکوو سەعوە بەڵێ دائیم
گرفتار چەنگی بازم من، ئەسیری نازی شاهینم

وەرگیراو لە جونگە دەسنووسەکان.

## مەلا عەلی ئەفەندی

زانای هێژا و سۆفی پارسا، شێخ مەلا عەلی ئەفەندی حوسامی کەرکووکی، کوڕی زانای پایەبەرز، مەلا ئەبووبەکر ئەفەندی، مەشهوور بە «گچکەمەلا»، لە مامۆستایان و پیاوماقووڵانی شاری هەولێر و خەڵیفەکانی شێخ موحەممەد بەهائەدینی نەقشبەندی و جێگری بەڕێزی (شێخ عەلی حوسامەدین) بووە کە دوایی لە کەرکووکدا ژیاوە.

مەلا عەلی لەمەڕ سۆفیگەری و تەریقەتەوە، هێندێک کتێب و نووسراوەی هەیە؛ یەکیان کتێبێکە بە ناوی: «*سراجُ الطالبین*»، بە زبانی فارسی، لە پەسنی شێخ حوسامەدیندا، کە ساڵی ١٣١٥ ک. م. نووسیویە و لە ١٣٢٢دا لە کەرکووک چاپ کراوە.

مەلا عەلی بە کوردی سۆرانی و فارسی شیعری گوتووە.

پێشەکی *سراجُ الطالبین*.

## مەلا ئیبراهیمی شێخولیسلام

کوڕی مەلا مستەفا، کوڕی مەلا لوتفوڵای شێخولیسلام، پیاوێکی هێژا لە بنەماڵە بەناوبانگەکانی شاری سنە و دوایین شێخولیسلامی ئەم زنجیرەیە کە ساڵی ١٣٢٤ ک. م. ئەم پلەیەی پێ دراوە و تا کاتی مەرگ

(١٣٣٢) لەگەڵی بووە.

*تاریخ مردوخ.*

## ئەمینوسسادات

سەید سەعدەدین، ناسراو بە «*اَمینُ‌السّادات*»، کوڕی سەید موحەممەد سەعید، کوڕی سەید مەهدی، کـوڕی سەید ڕەحمەت، کوڕی سەید سەعدی، لە پشتی سەید شێخ ئەحمەدی وەلی (باوە شـێخ ئەحمـەد) و لـە ساداتی حوسەینی «باینچۆ»یە کە لە گوندی «کوچک چەرمگ» ژیاوە و پیاوێکی پارێزکـار بـووە و سـاڵانێکی زۆر، ڕۆژووی دوازدەمانگەی نەفەوتاوە و لە شەونوێژ و عیبادەتی تردا، کیشاویەتەوە سەر باب و کاڵی چـاک و پاکی و لەگەڵ ئەوەدا دەسەڵات و ماڵ و سامانێکی زۆر و زەبەندی هەبووە و بۆ میوانـداری و دڵاوایـی جێـی حاتەمی تایی گرتووە.

سەید سەعدەدین زۆر جاران بۆ تاران ڕۆیوە و لەگەڵ پیاوانی ئـایینی و دەوڵـەتی و ناسـراوانی پاتەختـدا چاوپێکەوتن و وتوویژی بووە و لە هەموو شوێنێ زۆر ڕێزی لێ گیراوە.

ئەو خوا لێ خۆشبووە سەرەنجام ڕۆژی دووشەمبە ٢٢ی زیحەجەی ساڵـی ١٣٣٣ ک. م. ئـەمری خـوای بەجێ‌هێناوە و لە گوندی «کوچک چەرمگ»دا نێژراوە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من.*

## مەلا عەبدولمەجیدی نیەری

عەللامە مەلا عەبدولمەجیدی مودەڕڕیس، خەڵکی ئابادی «نیەر» لە ناوچەی ژاوەرۆیە کـە زانایـەکی شـارەزا بووە و پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، لە مزگەوتی دارۆغەی شاری سنەدا ساڵانێکی زۆر دەرسی گوتـۆە و حەوتوویەک دوو جاریش کۆڕی مۆچیاری داناوە.

مەلا عەبدولمەجید مرۆیەکی زۆر پارێزکار و بەوەج بووە بە باڵایەکی بەرز و ڕیشێکی سپی و جوانـەوە کـە سام و شکۆی زۆرتر کردۆتەوە. خەڵک زۆریان ڕێز لێ گرتووە و لە ڕێنوێنییەکانی بەموو لایان نەداوە.

ئەم مامۆستا بەڕێزە، ساڵی ١٣٣٣ ک. م. لە شاری سنەدا ڕووی لە جیهانی‌تر ناوە و لە زیارەتانی «تایلە»دا نێژراوە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من.*

## شێخ تـاهیری مائی

کوڕی مەلا ڕەحمان و برای بچووکی شێخ تاها، لە پیاوانی زانست و وێژەوانی و ئاشـنا بـە زبـان عـەرەبی و فارسی بووە کە لە گوندی «مایی» سەر بە ناوچەی بادینان لە باکووری کوردستاندا ژیـاوە و ساڵـی ١٣٣٣ ک.

م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

شێخ تاهیر شیعر و نووسراوەی بە کوردی و فارسی و عەرەبی زۆر بووە کە زۆربەی پاش مەرگی، لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٣٤٣دا، فەوتاوە و کەمیان ماوەتەوە؛ یەکیان کتێبێکە بە ناوی *«مرئاةالطلاب»*، لە مەڕ داب و دەستووری وتوویژەوە.

*الاکراد فی بهدینان*، ل ٢١٠.

## حوسەینی عەونی

کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئەحمەد، زانایەکی هێژایە کە باپیرانی لە کوردستاندا سەودایان کردووە و بابی بۆ بەغدا چووە و حوسەین لەوێ لەدایکبووە و پاش دەرس و دەور، لە نەجەف دادوەری کردووە و ساڵی ١٣٣٤ ک. م. لە ئەعزەمییەی بەغدا دنیای بەجێ‌هێشتووە.

حوسەین عەونی بە عەرەبی و ترکی و فارسی، هێندێک نامیلکەی نووسیوە و چەند کتێبیشی بە عەرەبی لە مەنتیق و مەعانی و بەیان و نەحودا داناوە کە هێندێکیان چاپ کراون.

*الاعلام*، زرکلی، ب٢، ل٢٧٣.

## شێخ نیعمەتوڵای هەزارکانیانی

کوڕی شێخ عەبدولکەریم، لە شێخانی مەردۆخی لقی هەزاکانیانە کە ساڵی ١٢٥٩ ک. م. لەوێ هاتۆتە دنیا. خوێندنی لای بابی دەسپێکردووە و پاشان ماوەیەک لە قوتابخانەکانی سنەدا خوێندوویە و ساڵێکیش لە خزمەتی زانای پایەبەرز، شێخ عەبدولقادری موهاجیر بەهرەی بردووە و ئیجازەی وەرگرتووە. ئەوجار کەوتۆتە گەشت و گەڕان، سلێمانی و ئەستەمبووڵی بینیوە و لە گەڕانەوەدا چۆتە هەولێر و لەوێ گیرساوەتەوە و تا کۆتایی ژیانی (١٣٣٤ ک. م.) لەو شارەدا دەرسی گوتۆتەوە.

شێخ نیعمەتولا پیاوێکی هێژا و بەدین بووە و شەرح و پەراوێزێکی زۆری بۆ کتێبانی دەرسی مەنتیق و ئاداب و عەقاید داناوە و چەند کتێبیشی لە مەڕ هەیئەت و نەحو و سەرفەوە نووسیوە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٢١٦.

## فانی سنەیی

مەلا ئەحمەدی شەهید، کوڕی مەلا عەبدولکەریم، لاوێکی هێژا و لێهاتوو بووە کە پاش تەواو کردنی خوێندنی ئایینی، دەرس‌گوتنەوە بە فەقێیانی دەسپێکردووە؛ بەڵام پاش ساڵێک و دوان، یەکەم شەڕی جیهانگر قەوماوە و لەشکری ڕووس هێرشی هێناوەتە سەر ئێران، بەتایبەت کوردستان و تاڵان و ماڵانێکی

تەواوی کردووە. خەڵکی شار و دێهاتیش کە دیویانە دەوڵەت و ئەرتەش هیچ نییـە تـا شـتێک بکـا، وەخـۆ کەوتوون و بە هەرچی دەسیان کەوتبێ، بۆ جـەهادی دژی داگیرکـەر، چوونەتـە پێـشوازیانەوە. یـەک لـەو دەیان شەڕە، لە ملەی «ئاریز»، لە چەند فرسەقی ڕۆژاوای شاری سـنەوە، ڕوویـداوە و زۆرێـک لـە مـەلایان و قوتابییەکانیان تێدا بەشدارییان کردووە. مەلا ئەحمەدیش یەک لەو مامۆستا خەباتکارانە بووە کە لە ناوقەدی کێوەکەدا، وەبەر گوللەی دژمن کەوتووە و شەهید بووە (ساڵی ١٣٣٤ ک. م.).

مەلا ئەحمەد شیعریشی گوتووە و بۆ خۆی نازناوی «فانی» داناوە. ئەم غەزەلە هی ئەوە:

تـا عطـر دو گیـسوی تـو در انجمـن افتـاد صد نقـص بـه بـازار گُـل انـدر چمـن افتـاد

چون قامت زیبـای تـو را سـرو چمـن دیـد پایش به گل اندر شد و حیران چو من افتـاد

گوییـد بـه عطـار دگـر مُـشک نـساید کز عطر دهن، مُشکِ خُتن بی‌ثَمـن افتـاد

جانـا تـو ببـین محفـل عـشاق و نگـه کُـن تا چند کس از حسرت تـو بی‌کفـن افتـاد

مـستور نمانـد کـه تـوی قاتـل جمعـی این راز به هـر محفـل و در هـر دهـن افتـاد

«فـانی» کـه در ایـن دار فنـا گـشت از اول بـا حلقـەی مـوی تـو چنین در محَـن افتـاد

یاداشتەکانی نووسەر.

## عیرفانی سنەیی

زانای تاقانە، حاجی شێخ عەبدولحەمید، نازناو «عیرفان»، کوڕی شێخ عەبدولکەریم، کوڕی شێخ ئەحمەد، لـە شێخانی بنەماڵەی بەناوبانگی کانیمشکانی قوسەیرانییە کە لە ١٠ی مانگی ڕەمـەزانی ساڵـی ١٣٧٣ ک. م. لە شاری سنەدا هاتۆتە دنیا و خوێندنی سەرەتایی لای بابی و کاکی (حاجی شێخ موحەممەدی موعتەمـەد ئیسلام) دەسـپێکردووە؛ ئـەوجار بـۆ درێـژەدانی دەرس و دەور، سـنەی بـەجێ‌هێـشتووە و ماوەیـەک لـە پێنجوێن، خزمەتی مەلاوڕەحمانی پێنجوێنی گەیوە و بەهرەی بردووە و پاشان بۆ بەغدا چووە و چەند سـاڵ لای مامۆستایانی ئەو شارە خوێندوویـە و ساڵـی ١٣٠٥ ک. م. لـە دەسـتی عەللامـە حوسـەین سـەبری، مامۆستای «ئەعزەمییە» ئیجازەی وەرگرتووە. بە شوێن ئەوەدا بۆ حیجاز ڕۆیـوە و لـە ناوەڕاسـتەکانی ساڵـی ١٣٠٦ گەڕاوەتەوە سنە و زیاتر لە ٢٥ ساڵان لـە مزگـەوت و قوتابخانـەی «ڕەشـی قەڵابـەگی» ئـەو شـارەدا دەرسی گوتووە و بەرنوێژی کردووە.

خوا لێ خۆشبوو حاجی شـێخ عەبدولحەمیـد، فـەقیهێکی هێـژا و کـەموێنـە، ویژەوانێکـی کـۆڕڕازێن و خۆش‌قسە و دەم پاراو و شاعیر و نووسەرێکی وردبین و خاوەن زەوق بووە کە شیعر و پـەخـشانی عـەرەبی زۆر جوان و ڕەوان نووسیوە و بە کوردی و فارسیش شـیعری گوتـووە. سـەردەمی لاوی، جاروبـار سـواریی کردووە و دەستی بۆ تفـەنگ بـردووە و لـەم بوارەشـدا لێهـاتوو بـووە. چەنـد جـار خزمـەتی شـێخ عـەلی

حوسامەدین گەیشتووە و لە مریدانی هاتۆتە ئەژمار. کتێب و نووسراوە و پەراوێزی زۆری داناوە کە بەداخەوە زۆربەی فەوتاوە و زۆر کەمی ماوە.

عیرفان لە سەردەمی شەری یەکەمی جیهانی و کاتی هێرشی تاونەتاوی ڕووسان بۆ سەر شاری سنە، بارئەکات بۆ گوندی «ڕەزاو» لە هەورامان؛ بەڵام هێندەی پێ ناچێ نەخۆش دەکەوێ و ڕۆژی پێنجشەمبە ٢٦ی شابانی ساڵی ١٣٣٤ ک. م. کۆچ و باری بەرەو دنیای هەتاهەتایی دەگوێزێتەوە.

ئەمەش چەند شیعری عیرفان:

ای ساخته ز مهر دل انور آینه    دیده در او هر آنچه درآید در آینه
در فکرتت بود صور عقل و حس عیان    مانا که فکرت تو بود دیگر آینه
آیینه گر مثال نماید بدیع نیست    عین وجود راست دلت مظهر آینه
آیینه را مدیح چه گویی که اوفتاد    از عکس مهر طبع تو پشت سر آینه
کی دیدەای برابر هر بدگهر شود    صافی ضمیر خویش چو بدگوهر آینه
در پای همت تو کمین پایه آسمان    در پیش فکرت تو کهین چاکر آینه
چون آفتاب طبع تو تابد، فتد ز برق    آتش به خرمن رخ مەمنظر آینه
اشراقیان اگر به ضمیرت نظر کنند    منکر شوند سادەی صورتگر آینه
اعمال زشت غیر نبینی به چشم از آن    کاخلاق نیک خود بودت بهتر آینه

لە شەڕی نێوان شێخ مەحموودی نەمر و عرووساندا، شێخ دەستێکی باشیان لێ دەگوێزێتەوە و شکستێکی تەواویان بەسەردا دێنێ. عیرفان بەم بۆنەوە قەسیدەیەکی گەورەی، دەوری ٧٥ بەیت هۆنیوەتەوە؛ کە ئەم چەند بەیتەی لێ دەخوێنینەوە:

حَبَّذا فَيْلَقٌ وَ حَبَّ اللّواءُ    حِزْبُ حَقٍّ يَهابُهُ الأعداءُ
رايةٌ كالْعقاب يَخْفقُ مِنْ هزَّ    تهِ النَّسْرُ في السَّما و السَّماءُ
فَيْلَقٌ كاللُّيوث يَوْمَ نزال    أسْدُ غاب فَرِيسهَا الرُّوساءُ
رُجَّتِ الأَرْضُ مِنْ سُيُول خُيُول    ضاقَ عَنْها الفَلا وَ ضاقَ الفَضاءُ
رَكْبُ خَيْل يَوْمَ اللّقاء «أشدّا    ءُ عَلَى الكُفْر بَيْنَهم رُحَماءُ»
خَيْلُ رَكْب بَرُّوا و كَرّوا و جَرّوا    فتْيَةٌ في الوغى لَهُمْ بَأساءُ
يا لَقَوم سَلُّوا السُّيُوفَ فَمِنْهُم    سُعداءٌ وَ مِنهُمُ شُهَداءُ
جاهَدوا الإنجليزَ و الرُّوسَ حتّى    مِنْ دماهُمْ قَدْ سالَت البَطحاءُ
تَرَكوهُمْ قَتْلى وَ جَرْحى وَ طَرْحى    وَ قَناسيلهم لَهُمْ أُسَراءُ
اَو قَدوالنّارَ في فَيالق عُبّا    دالصَّليب كَأنَّها سَيْناءُ

یـا لَهـا مـنْ کَتیبــة قادَهَــا القَــرْ          مُ الَّــذی اسْتَأْنَــسَتْ بــه الأحْیــاءُ
قَرْمٌ اجدادُهُ شُمُوسُ سَمَا الفَضْـ          ـل وَ کُلُّ الوری لَهُمْ حرْباءُ
فَرْعُ سَعْد نَما منْ أصْل سَعید          طابَ منْ طیب أصْله السُّعَداءُ
هُوَ «مَحمودٌ» إذ صُنُوفُ البَرایا          حَمدَتْهُ لاسیَّما الْکُمَلاءُ
وَرثَ المجَدَ وَ المکارمَ و السّو          دَدَ و الْجُودَ و الْعدی شُهَداءُ
ساسَ أمْرَ الْمُجاهدینَ معَ الرّو          س النّحُوس الذی اعْتَراهُ البلاءُ
قُرءَتْ منْ حُسامه سُورةُ الْفَتـ          ـح وَ قَدْ جَوَّدَت بهَا القُرّاءُ
تُلیَتْ منْ لوائه آیَةُ النَّصـ          ـر وَ قَد أفْصَحَتْ بهَا الْخُطَباءُ

تا له کۆتاییدا دەڵێ:

یا هُماماً إلَیْه شُدَّ الرّحالُ          وَ نَوَتْهُ الْقَوافلُ الشَّعْثاءُ
لَمْ تَزَلْ ناصراً لدین النبیّ الْـ          ـمُصطَفی وَ المَوْلی لَکَ الْوَقّاءُ
دُمْتَ بالعزّ مابقی اللّیْلُ تَغْشی          و عقیب الدُّجی تجَلّی الضیّاءُ
عش عَزیزاً یَفُزْ بکَ الْفُقَراءُ          دُمْ کَریماً یَفُزْ بکَ الضُّعَفاءُ
وَ اغْنم الْمَدْحَ إنَّ فی مَدْح «عرْفا          نکَ» بالحَقّ تاهَت العُرَفاءُ

جارێک دۆستێکی به سەرو چاو و گەردنی بریندارەوە دەچێتە لای. عیرفان هۆی بریندار بوونی لێ دەپرسێ، جواب دەداتەوە: ژنەکەم ـ کە ناوی «ساحیبە» بووە ـ لێیداوم و دەری‌کردووم! ئەمیش دەسبەجێ ئەم دوو بەیتەی پێدا دەڵێ:

یا ضَرْبَة منْ ذات لَطْم غَدَتْ          کاتبَة وَ لَیْسَت الکاتبَه
قَدْ رَسَمَتْ بعارضَیْ بَعْلها          هذا جَزا عَبْد عَصی صاحبَه

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## ئایشەی تورجانی

خاتوونێکی زانا و هێژا، کچی عەللامە مەلا عەلی قزڵجی (تورجانی) بووە کە لە خزمەتی بابیدا ئەوپەڕی بەهرەی بردووە و له هەموو زانستە باوەکانی دەورانی خۆیدا، شارەزاییەکی تەواوی دەسکەوتووە و ئیجازەی وەرگرتووە و پاش ئەوە تا دواکاتی ژیانی، به چینی ژنان و هەروەها کوڕانی خزم و کەس و کاری، دەرسی گوتووە و ڕایانی هێناوە.

ئایشە خاتوونی تورجانی، خاوەن هۆش و بیرێکی تیژ و زەین و زەوقێکی بەقەوەت بووە و بەهۆی تێکۆشانی بەردەوامیەوە، گەیشتۆتە ڕادەیەک، کەم مامۆستا توانیویە کێشەی لەگەڵدا بکا. تەنانەت براکانی

(مەلا حوسەین و مەلا حەسەن) کە هەکیان لە پیاوانی هێژا و خاوەن زانست بووگن، لە زیرەکی و بڕشت و زانیاریدا، ئەویان لە خۆ سەرتر دیوە.

ئەم خاتوونە لە نیوەی یەکەمی چەرخی چاردەدا ژیاوە.

جونگێکی بنەماڵەی تورجانی.

## نەجمی

شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ نەجمەدین، کوڕی شێخ عومەر زیائەدین، لە ئابادی بیارە هاتۆتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی تەواو کردووە و ساڵی ١٣٣٥ ک. م. لە تافی لاویدا، دنیای بەجێ‌هێشتووە.

شێخ موحەممەد مرۆیەکی هێژا و خاوەن زانست و تێگەیشتوو بووە و شیعریشی گوتووە و نازناوی «نەجمی» هەڵبژاردووە؛ ئەم غەزەلە هی ئەوە:

چو آن مَه دلبری دیگر نباشد — وگر باشد مرا دلبر نباشد
کُنم قربان وی این جان ناچیز — مرا جز این هوس در سر نباشد
از اینجا رفت و من افتادەام زار — چو مرغم حیف بال و پر نباشد
نباید زندگانی گفت عمری — که یار نازنین در بر نباشد
گرفتارم به دردی سخت و جانکاه — کَسَم جُز لُطف حق یاور نباشد
تحمّل چون کنم این رنج هجران — گرم فریادرس داور نباشد
مرا گنجی است از فقر و قناعت — چه باك است ار زر و زیور نباشد
جز آن پیر بزرگم دستگیری — در این ویرانە بیوم و بر نباشد
امیدم گوشەی چشمی است از وی — که غیر از وی مرا سرور نباشد
تو خود جانا مرا گە مهتری کُن — چو «نجمی» جانفدا کهتر نباشد

*یادی مەردان*، ب٢، ل ٢٨٥. جونگێکی دەسنووس.

## شێخ موحەممەدی ئەبولوەفا

عەللامە شێخ موحەممەدی ئەبولوەفا، لە کوردانی سابڵاغ (مەهابادی ئێستا)، زانایەکی هێژا و دیندار بووە کە بۆ خوێندن و فێر بوون، تا قاهیرە چووە و لە «رَواقُ‌الاکراد[1]»ی ئەزهەردا، وەکوو قوتابی دامەزراوە و ساڵی ١٣٠٤ ک. م. بۆخۆی ئەو شوێنەی سەرپەرشتی کردووە و تا دواڕۆژی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٣٥ ک. م. کە لە

---

١. **رواقُ الأکرادُ الایوبیّه**: بەشێک لە زانستگای ئەزهەری قاهیرە کە لە سەردەمی ئەیوبییەکانەوە بۆ کورد تایبەت کرا.

دنیا چووە، ئەم مەقامەی هەبووە.

شێخ موحەممەد، بەو بۆنەوە کە لە سلێمانی خوێندوویە و ماوەیەک لەو شارە ژیاوە، بە «سلێمانیەیی» ناوبانگی دەرکردووە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٢١.

## حەمدی سلێمانی

مەلا حەمدوون، نازناو «حەمدی»، شاعیرێکی توانا و دەمپاراو، لە چاو بێبەش، بەڵام خاوەن بیرێکی تیژ بووە و قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە و بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە.

مەلا حەمدوون لە کۆتایی ژیانیدا سەفەرێکی ئەستەمبووڵ دەکا و فێری ترکیش دەبێ و هەر لەوێ، ساڵی ١٣٣٥ ک. م. لە تەمەنی ٦٥ ساڵاندا، سەر دەنێتەوە.

ئەم شیعرە بەشێک لە قەسیدەیەکی دوور و درێژە کە سەبارەت بە یەکەم شەڕی جیهانی گوتوویە:

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کە دونیا شڵەژاوە — هەرکەس بە جەخارێ جگەری قیمە کراوە

دونیا پڕی ئاشووبە، خەلایق بە عموومی — ئاسایشی لێ مەنعە ئەڵێی جونبوشی ئاوە

وەک تەرزە ئەبارێ بە هەموو دەم ئەسەف و غەم — هەوری غەزەب و قەهری خودا توند و بەتاوە

ئەو وەزعە کە ناوی بە «سەفەربەر» ئەبەن ئەمڕۆ — فەرمانی بە خوێن ڕشتنی ئەم عالەمە داوە

گیرۆدەیە ئەم عالەمە هەرکەس بە سیاقێ — کەوتووتە کەشاکەش بە قومادەی ئومەراوە

جەندەرمە ئەسوورێتەوە وەک واشەیی برسی — بۆ لاشەیی میللەت بە فڕوفێڵی غەزاوە

فەوتاوە لەبەر سوخرەکەر و قاتر و یابوو — حوشتر سەقەت و شەل بووە، گا پشتی شکاوە

کەر شەوقی زەڕینی نییە حەتتا لە بەهارا — ترسی هەیە نەک بیخەنە ژێر باری قەزاوە

بۆ گرتن و بۆ کوشتنی ئەم عالەمە یەکسەر — ئەم عەرسەیی ئافاقە ئەڵێی حەڵقەیی داوە

نیک و بەدی ئەم عالەمی ئیسلامە بەجارێ — کەوتوونەتە ژێر حەڵقەیی زەنجیری بەڵاوە

هەر شەش جیهەتی گرتووە ئاشووب و موسیبەت — مێشوولە مەجالی نییە بفڕێ بە هەواوە

ئەم زاڵمی سەفاکی سەفەربەر لکە ئەمڕۆ — نامەی فەرەحی داوە بە دەم بادی سەباوە

دەشت و جەبەل و شیو و جەزیرەی هەموو دونیا — گوڵ-گوڵ بووە سەر پاکی بە خوێنی شوهەداوە

تەییارە بە ئەسبابی شەڕ و فیتنەوە دایم — جەولانی ئەڵێی هەورە بەسەر مەرکەزی باوە

باڵۆنی هەڵۆشێوە لەگەڵ دێتە بزووتن — عالەم لە نەزەریایە، دەڵێی پۆری خوراوە

ئەم جووتە بەلازادەیی باڵندەیە ئەمڕۆ — سەییارەیە، سەییالەیی بەرقی بەهەواوە

بەرق و غەزەبی دانە و نارنجەک و بومبا — ئاگر ئەپژێنێ بە زەمیندا لە سەماوە

لەو ڕۆژەوە دونیا هەیە تا ئەم دەمە بێ شەک
مەغلووبەیی بەم غایەتە نەبووە و نەکراوە

بنچینەیی دەرکەوتووە ئاساری شەریعەت
یەکسەر هەرەسی بردووە تانێکی نەماوە

ئەم دینە لە پێشا وەکوو زەمزەم بوو بە ڕوونی
هیچ غەششی نەبوو ئێستە دەڵێی لێڵی قوڕاوە

یارەببی لەبەر خاتری پەیغەمبەرەکەی خۆت
ڕەحمێ بکە بەم کۆمەڵی ئیسلامە کە ماوە

لەت ـ لەت بووە بەم چەکوشە سەعاتی دڵی عالەم
ڕەققاس و جەر و زەمبەرەک و چەرخی سواوە

«حەمدی» دڵی یەخسیری فەرەنگی غەمە
بەربوونی بە بەربوونی گرۆی بەسرە و فاوە

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل٢٣- ٢٦.

## شێخ عەبدوڕڕەحمانی قەرەداغی

شێخ ئەبوو موحەممەد، عەبدوڕڕەحمان، کوڕی شێخ موحەممەدی «ابنُ‌الخیّاط»، ساڵی ١٢٥٣ ک. م. لە قەرەداغی سەر بە سلێمانی لەدایکبووە و زۆرتر لای بابی خوێندوویە. لە تەمەنی ٢١ ساڵاندا بۆ بەغدا چووە و لەوێ ماوەیەک لە خزمەتی عەللامە موحەممەد ئەفەندی فەیز (موفتی زەهاوی) خوێندوویە و ئیجازەی وەرگرتووە. ساڵی ١٢٧٦ ک. م. دەگەڕێتەوە قەرەداغ و هێندێک لەودوا بۆ گوندی «تەوێڵێ» دەچێ و لە بەردەستی شێخ عوسمان سیراجەدینی نەقشبەندیدا، تۆبە دەکا و دەچێتە نێو تەریقەتەوە و بە فەرمانی مورشید، سەرەتێک دەمێنێتەوە تا بەشی خۆی وەردەگرێ؛ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی. ساڵی ١٢٩٩ ک. م. بۆ کەرکووک دەڕوا و لەو شارە چوار ساڵ دەمێنێتەوە و دەرس‌دەڵێتەوە. ساڵی ١٣٠٣، لەسەر داخوازی والی بەغدا، کەرکووک بەجێ‌دێڵێ و لە بەغدا نیشتەجێ دەبێ و تا کۆتایی ژیان (١٣٣٥ ک. م.) لەوێ بە نووسین و دەرس‌گوتنەوەوە خەریک دەبێ و زۆرێک لە مامۆستایانی هێژا، لە کۆڕی دەرسی ئیجازە وەردەگرن.

شێخەوڕڕەحمان کتێبی زۆری نووسیوە کە هێندێکیان بریتین لە:

١. «*دَقایقُ‌الحقایق*»، لە نەحودا
٢. «*الا یقاظ*»، شەرحی نامیلکەی «*وضع‌الفاظ*»
٣. «*مواهبُ‌الرَّحمن*»، لە بەیاندا
٤. «*مُلَخَّصُ الاقوال*»، لەمەڕ کێشەی خەلقی کردەوە و کارەوە
٥.«*اَسنی المَطالب*»، لە باسی زانستی واجیبدا
٦. «*تُحفةُ‌اللّبیب*»، لە مەنتیقدا
٧. «*تبیان*»، باسی ناسخ و مەنسووخ لە قورئاندا
٨. «*اَلأَجوِبَةُ البَهیّة*»
٩. «*اَلتحقیقُ العالی*»، شەرحی قەسیدەی «*اَمالی*»، لە کەلامدا

١٠. «*مَنهَجُ الوصول*»، لە ئوسوولی فیقهـدا

١١. «*تنبیه الاصدقاء*»، باسی «تقلید» و «اجتهاد» و «استفتاء» و «افتاء». ئـەم کتێبـە لـە ساڵـی ١٣١٦ ک. م. نووسراوە و ساڵی ١٣٣٠، لە سەردەمی ژیانی نووسەریدا، چاپ کراوە.

پێشەکی *تنبیه الاصدقاء*. *تاریخ سُلَیمانیّه*، ل ٢٦٢.

*الاعلام*، ب ٤، ل ١١٠. *مشاهیر الکُرد*، ب ٢، ل ١١ و ١٢.

## قازی عەبدولفەتاح

ناسراو بە «افتخارُالشَّریعە»، کوڕی مەلا موحەممەد ڕەزا، خەڵکی گوندی «پاڵنگان» لە ناوچـەی ژاوەڕۆیـە کـە پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، بۆ بەغدا چووە و ماوەیەک لە خزمەتی مەلا موحەممـەد سـەعید، کـوڕی عەبدولقادری نەقشبەندی، مامۆستای مەدرەسەی ئەعزەمییە بەهرەی بردووە و ئیجازەی وەرگرتووە و ساڵی ١٣٠٠ ک. م. کۆچی کردۆتە شاری سنە.

قازی فەتاح پیاوێکی هێژا بووە و چەند ساڵان دادوەری کردووە؛ بە خەتی جوانی خۆی، زۆرێـک کتـێبی نووسیوەتەوە و سەرەنجام لە ٢٥ی زیقەعدەی ساڵی ١٣٣٥ ک. م. لە ئابادی ماسـان، لـە باشـووری شـاری سنە، دنیای بەجێهێشتووە و هەر لەوێیان ناشتووە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا حوسەینی تورجانی

مەلا موحەممەد حوسەین، کوڕی عەللامە مەلا عەلی قزڵجی تورجانی، لە مامۆستایانی هێـژا و ناسـراوی ڕۆژگاری خۆی بووە کە خوێندنی لای بابیەوە تەواو کردووە و ئەوجار دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکردووە.

مەلا حوسەین چەند کتێبیـشی نووسـیوە؛ یەکـەم: «*مُصطلحات علمُ الحدیث*»، دووهـەم: لـە نـەحو و سێهەمین لە حیکمەت و خواناسیدا.

زا و مەرگی ئەم مامۆستایە، ساڵانی ١٢٧٨ و ١٣٣٥ ک. م. ڕوویداوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## عارف سائیب

کوڕی مەلا قادر، ساڵی ١٣٠٧ ک. م. لە شاری سلێمانی هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێنـدی. پاشـان گەیـشتە هەولێر و وەکوو قوتابی لە فێرگەی ڕاهێنانی دادوەران ڕاگیرا و لە ئەزموونەکەیدا سەرکەوت و کرا بە قازی لە شارباژێڕدا. دوایی چەند ئیشی تریشی کرد؛ ساڵـی ١٣٣٤ بـووە ئینـشابەندی تایبـەتی شـێخ مـەحموودی



مەلیک و ساڵێک لەودوا (١٣٣٥) لە گوندی «قەرەچنار» شەهید کرا.

عارف سائیب نووسەرێکی زیرەک و بیرمەند و شاعیرێکی خۆش زەوق و دەم پاراو بووە؛ دیوانێک لە شیعرەکانی کۆ بۆتەوە کە دوای شەهید بوونی لەناو چووە. لەم سێ بەیتەدا باسی حاڵی شڕی خۆی دەکا کە چۆن لە دەستی جەندرمەی ترک، گەیشتۆتە گیانی:

| | |
|---|---|
| کافر بەزەوی دێتەوە بەم حاڵە پەشێوە | وا دەربەدەر و قوڕبەسەر و تووشی بەڵا خۆم |
| بۆ شاری سولەیمانیە فەریاد و فوغانم | دایم لە خەیاڵ و غەم و تەبدیلی هەوا خۆم |
| کەوتوومەتە ناو تاقمی جەندەرمە خوا مەرگ | دوچاری هەزار دەردیسەر و قەهر و سزا خۆم |

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل ٢٦١. *شیعر و ئەدەبیاتی کوردی*، ڕەفێق حیلمی.

## مەلا ڕەحمەتی گوڵ

مەلا ڕەحمەتوڵڵا، کوڕی ئەحمەد، کوڕی مستەفا، لە هۆزی گوڵ، نیشتەجێی ئابادی «قەرەبڵاغ»ی لای کەرکووک، مرۆیەکی هێژا و تێگەیشتوو بووە و زیاد لە زمانی خۆی، بە عەرەبی و ترکی و فارسیش شیعری گوتووە و زۆربەی شیعرەکانی ناڵە و زاڵە لە دەستی ناحەقیکاری کاربەدەستانی عوسمانی و لێقەوماوی و داماوی گەلە بەستەزمانە بێ دەرەتانەکەی بووە.

مەلا ڕەحمەت ساڵی ١٣٣٦ ک. م. هەر لە زێدی خۆی، کۆچی دوایی کردووە.

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ١٩، ل ٤٠٦.

## مەلا عەبدولکەریمی سنەیی

حاجی مەلا عەبدولکەریم لە پشتی مەلا عەباسی کوڕی مەولانا گوشایشی مەردۆخی و لە پیاوە ناسراوەکانی شاری سنەیە کە ماوەیەک بۆ خوێندن، بەرەو غوربت چووە و دوای وەرگرتنی ئیجازە، گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و لە مزگەوتی فاروقی، ساڵانێکی زۆر دەرسی گوتۆتەوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٣٦ ک. م. لە دنیا چووە.

خوا لێ خۆشبوو مەلا عەبدولکەریم، خۆشنووسێکی لەزەبر بووە و زۆرێک کتێبی بە خەتی نەسخ و نەستەعلیق نووسیوەتەوە. بۆخۆشی دوو کتێبی داناوە:

١. دەورەیەک فیقهـ و ئەحکامی ئیسلامی، بە گوێرەی ڕێبازی ئیمام شافیعی، بە زبانی فارسی

٢. نامیلکەیەک لە قەرائەت و تەجویددا

مامۆستا سێ کوڕی هێژای بووە: مەلا عەلی شەکیبا، مامۆستای قوتابخانەی فاروقی، مەلا حەسەنی شەکیبا، سەرپەرشتی پەروەردەی کوردستان و هەمەدان و کرماشان و مەلا حەسەنی شەکیبا، کە ماوەیەک مامۆستای مەدرەسە بوو؛ دواجار کتێبفرۆشییەکی باشی لە سنە دانا.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ ئیسمایلی مەجزووب

حاجی شێخ ئیسمایل، کوڕی شێخ شەهابەدین، کوڕی شێخ موحەممەد ئەمین، لە تۆرەمەی حاجی شێخ مستەفای تەختە، عارفێکی زانا بووە کە لە سنەدا ژیاوە و لای پیری تەریقەت، حاجی شێخ حەمە باقری غەیاسی تۆبەی کردووە و ساڵانێکی زۆری بە زیکر و فیکر و عیبادەت و ڕاهێنانی مریدان ڕابواردووە و تا ڕادەیەک نوقمی عیرفانەکەی بووە و حاڵی لێ هاتووە کە «مەجزووب»یان پێ گوتووە.

کۆچی یەکجاری ئەو ڕەحمەتییە، دەوری ساڵی ١٣٣٦ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخچەی خاندان مردوخ.*

## فائیز ئەفەندی بەرزنجی

سەید ئەحمەد ناسراو بە فائیز ئەفەندی، کوڕی سەید مەحموود، کوڕی سەید ئەحمەد، کوڕی «عبدُالصَّمد فضل‌الدّین»، کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیی سەعدانی، ساڵی ١٢٥٨ ک. م. هاتۆتە دنیا و خوێندنی لای عەللامە مەلا ئەحمەدی نۆدشی و سەید مستەفا بەرزنجی و ئەحمەد ئەفەندی پیر حوسەینی (موفتی سلێمانی) تەواو کردووە و بەدوویدا چەند کاری، لە دەرس‌گوتنەوە تا دادوەری، لە شارانی کۆیە، کووت، کەربەلا و مووسڵ و ... لە ئەستۆ گرتووە و دوایین پیشەی ئەندامەتی کۆڕی گەورەی پەروەردە لە ئەستەمبووڵ بووە و هەر بەم ئیشەوە، ساڵی ١٣٣٦ ک. م. لە دنیا چووە.

فائیز ئەفەندی نووسەرێکی زانا و وێژەوان بووە و زۆرێک کتێبی نووسیوە؛ کە هێندێکیان بریتین لە:

١. «*روضةُالازهار فی شَرح غایةُالاختصار*»، لە فیقهدا، بە فارسی.

٢. «*خلاصةُالعَقیده*»، لە ئوسوولی دیندا، بە عەرەبی

٣. «*إرشادُ العباد الی صَحیح الاعتقاد*»

٤. «*أنفُس الفوائد*»، لە کەلامدا

٥. «*خیرُالاثَر*»، لە پەسنی پێغەمبەردا (د)

٦. «*اَلسَّیفُ المَسلوُل*»، لەمەڕ باب و کاڵی پێغەمبەرەوە (د)

٧. «*تُحفَةُالاخوان*»، لە مەعانی و بەیاندا

٨. «*اَلبَدرُالکامل*»، باسی بەکارچوون و لق لێبوونەوەی وشە

٩. «*اَلحَمیدیّه*»، لە سەرف و نەحودا، بە ترکی

١٠. «*اَلدُّرُّ المنطوم فی ایضاحِ ما یَشتَملُ عَلی سَبْعَة عُلُوم*»

١١. «*زُبدَةُ الامال*»، لەمەر بنەماڵەی پێغەمبەری مەزن (د)

١٢. «*السّحرُ الحلال فی تعریفات العُلوم*»، کە لە ئەستەمبووڵ چاپ کراوە
١٣. «*کُنزُاللّسین*»، کە بریەتی لە ١١ خشتەیە و هەر خشتەیەک لە مەڕ زانستێکەوە
*هـــدیّـــةالعـــارفین*، ب١، ل١٩٣. *الاعـــلام*، ب١، ل١٨٣.
*تاریخ سُلیمانیّە*، ل٢٣٦. *ایضاحُ المَکنون*، ب١ ل١٣٥ و ١٣٦.

## تاهیر بەگ

کوڕی عوسمان پاشا[١]، کوڕی موحەممەد پاشا، کوڕی کەیخوسرەو بـەگی جـاف[٢]، ساڵـی ١٢٩٥ ک. م. لـە شاری هەڵەبجە هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێنـدنی سـەرەتایی فارسـی و عـەرەبی دەسـپێکرد و لـەودوا بـۆ شوێنگرتنی دەرس و دەوری ئایینی و ئەدەبی، ماوەیەکی لە کەرکووک و سلێمانی تێپەڕ کرد.

تاهیر بەگ لە ویژەوانیـدا زەوق و لێهاتوویـەکی بێـدادی بـووە و هـەر لـە سـەرەتای لاوییـەوە، شـیعری شاعیرانی کورد و فارسی زۆر خۆێندووە و بۆخۆشی شیعری گوتووە. دواییش کە بۆتە فەرمانداری هەڵەبجە، هەر دەستی لە خوێندن بەرنەداوە و کۆڕی شاعیران و ویێژەوانانی هاوچەرخی خۆی تەرک نەکردووە. جـارو بارەش شیعرێکی گوتووە و نازناوی «تاهیر»ی بۆخۆی داناوە. بێجگـە زبـانی کـوردی، شـارەزای عـەرەبی و فارسی و ترکی و ئینگلیسیش بووە و نەختێک فەڕانسەشی زانیوە. شـیعری زۆری بـە سـێ زبـانی کـوردی (سۆرانی و گۆرانی)، فارسی و ترکی گوتووە کە زۆربەیان فەوتاون و تەنیا دیوانێکی چکۆلـەلێ ماوەتـەوە کـە جارێک ساڵی ١٣٥٥ ک. م. لە بەغدا و جارێکی تر ساڵی ١٣٥٧ لە سلێمانی چاپ کراوە.

تاهیر بەگ سەرەنجام ساڵی ١٣٣٧ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە و لە گوندی «عەبابەیلێ»، نیـو فرسـەقی شاری سلێمانییان ناشتووە.

**چەند شیعری تاهیر بەگ**:

قوربانی ڕوخت بم کە شکستی بە قەمـەر دا — حەیرانی لەبت بم کە ڕەواجی بە شەکەر دا
هەر لەحزە ئەدەی وەعدەیی وەسڵ و نییـە ئەسـڵی — کارت وەکوو دونیایە هەر ئەمڕۆیە بـە فـەردا
مەقسوودی لەسەرکوشتنی عوشـشاقی زەعیفـە — وەختێ کە دەکا خەنجەری تێژی بـە کەمـەردا
هەرچەند دەکەم سەعی لەبـەر خـوێنی سوروشـکم — خاکێ نییە بیکەم بە هەوەس گاهێ بەسەردا

---

١. دایکی تاهیر بەگ، عادڵە خاتوون، کچی قادر بەگی ساحیبقەران، لە ژنانی هێژای دەورانی خۆی بووە و ماوەیەک لە شاری سنەدا ژیاوە و تاهیر بەگ زۆر جاران بۆ چاوپێکەوتنی دایکی، سەری لە سنە داوە و بەو بۆنەوە زبانی فارسـی فێـر بووە و شیعری فارسی باشتر ناسیووە.

٢. عەشرەتی جاف لە تایفە گەورەکانی کوردە کە پێشتر کۆچەر بوون و بوونەتە دوو دەستەوە: جافی مورادی لە ڕۆژاوا و جافی جوانڕۆ لە ڕۆژهەلات.

ناحەق نییە ناوەستێ ئەگەر پردی تەحەممول
سیروانی سروشکم کە ئەکا هاژە لە سەردا
دڵ ڕۆیشتووە قوربان! لە وجوودم بە خەیاڵت
دایم لە سەفەردایە ئەگەرچی لە حەزەردا
مەیلت هەیە «تاهیر» کە بپرسی لە برینم؟
بڕوانە کە ئەم شۆخە چ تیری لە جگەردا!

* * *

فدای ڕوخساری ئاڵت بم دەڵێی خورشیدی تابانە
بەلاگەردانی بالات بم دەڵێی شمشادی بوستانە
لە سایەی تیغی ئەبرووی تۆ لە ڕۆژی حەشردا جانا!
بِحَمْدِاللّه حیسابی من لەگەڵ جەمعی شەهیدانە
لە ئاهم گەر بسووتێ ئاسمان باوەڕ بکەن ئەمشەو
ئیتر یاران چە باکم من لە سەردی فەسڵی زستانە
کە زوڵفی عارزی پۆشی، وتم: یا ڕەب چ سحرێکە؟
لە لایەک زوڵمەتی کوفرە لە لایێ نووری ئیمانە
دەبێ کاول بێ موڵکی دڵ بە تاراجی سپاهی غەم
هەتا شاهەنشەهی عشقت لەوێدا میسلی سوڵتانە
بە دەس بادی سەبا چونکە پەشێوا نەزمی زولفانت
منی چارە سیا بۆیە هەموو نەزمم پەرێشانە
مەکەن تیماری زەخمی جەرگی «تاهیر» ئەی تەبیب ئاخر
بزانن تا لە حەشرا ئەو شەهیدی تیری موژگانە

* * *

موقەددەر گەر نەبێ ئاخر لە میهری مەهـ ڕووخانم چی
لە ناڵەناڵی نیوەی شەو لە ئاهی بەربەیانم چی
نیشانەی ئیفتخاری من لە سینەم داغی هیجرانە
بڕو ئەی ناسحی موشفق لە ڕوتبە یا نیشانم چی
لە بازاری مەحەببەت موشتەری هەر نەوعە جنسێکم
بەسە من هەر خەریدارم لە سوود یاخۆ زیانم چی
غەرەز وابوو موقابیل کەم لەگەڵ گوڵ، ڕەنگی ڕوخسارت
وەگەرنە بێ قەدی سەروت لە سەیری گوڵستانم چی
کە من میحرابی ئەبرووی تۆ هەمیشە سوجدەگاهم بێ
ئیتر وەک زاهدی خودبین لە میعادی جنانم چی
شەوم وەک ڕۆژی ڕووناکە لە شوعلەی ڕوومەتی ئاڵت
لە سەیری شەوقی سەییارە و لە ماهی ئاسمانم چی
بە نەیرەنگی فەڵەک جانا لە دڵما دەرنەچوو میهرت
کە من یەکڕەنگ و یەکنەوعم لە تەبدیلی زەمانم چی
وتم: بێ ئالەتی کوشتن مەکە تۆ قەسدی جانی من
وتی: من خاوەنی غەمزەم لە شمشێر و کەمانم چی
بە من قەت نادرێ تەفسیری ئایاتی سەری کوڵمت
مەحاڵە «تاهیرا» شەرحی، لە تەفسیر و بەیانم چی

* * *

تا بە کەی قوربان بناڵم من بە ئێش و دەردەوە
دەس بە ئەژنۆ، قوڕ بەسەر، دایم بە ڕەنگی زەردەوە
ڕۆژی ئەووەڵ بوو کە زانیم من ئەبێ دێوانە بم
عاشقی تۆم، نەوعی مەجنوون وا بە کێو و هەردەوە
مەرحەمەت کە زوو بڕۆ قاسید بڵێ دەردی دڵم
نازی پاپۆشت ئەکێشم من بە تۆز و گەردەوە
هەر وەکوو قەوس و قەزەح با دەس لە گەردەن دانشین
تۆ بە سوخمەی ئاڵ و سوور و من بە ڕەنگی زەردەوە
یەکنەفەس چاکی نەهێنا کەعبەتەینی بەختەکەم
شەش‌دەرم گیراوە داماوم بە دەستی نەردەوە
ئیلتماسی «تاهیر»ی بێچارە قەت سوودی نییە
تۆ کە دایم شەڕفرۆشی بەو دڵەی وەک بەردەوە

دونیا کە هەموو لەحزە بە مەعشۆقی کەسێکە | بنواڕە کە چەن قەحبە؟ چ کۆنەتەرەسێکە!
عالەم هەموو وەک تەیرە، تەمەع دانە، ئەمەل داو | سەییادە ئەجەل، ساحەتی دونیا قەفەسێکە
لەم حوجرەیی شەش‌گوشە کە ڕێ مەعبەری عامە | یارەب چییە؟ هەرکەس بە هەواو و هەوەسێکە
سەد قافڵە ڕابورد و ئەتۆ غافڵی ئەی دڵ! | گوێ بگرە لە هەر لایێ کە ناڵەی جەرەسێکە
شادی و غەم و ئەندوهـ چییە؟ هەر زەحمەت و ڕەنجە | ئیقباڵ و زەواڵیش بە خودا هەر نەفەسێکە
«تاهیر» مەبە ئازوردە، زەمان عادەتی جەورە | دونیا کە هەموو ڕۆژێ ژنی بولهەوەسێکە

* * *

یاران! فەرهادم، یاران فەرهادم | جانشین خاس قەوم فەرهادم
ئەوڕۆ کە فەرهاد پۆشانۆ کەفەن | ئەرواش کەرد فدای شیرین ئەرمەن
پەرسا نام یەک‌یەک دەروون پڕدەردان | هەردەگێلانان، هەناسەسەردان
وەیس و ڕامین و مەجنوون غەمبار | یەکسەر تەعداد کەرد ئەو ڕۆژ شومار
وات کێ بۆ لایق پەی مەقام من؟ | گوم نەبو تا حەشر سەودای نام من
من کەرد گوزیدە پەی وارسی ویش | سپەردش وە من کالای ئێش و نێش
شێتی و مەدهوشی و وێڵی سەرکێوان | عەزاب دووری دەرد بێدەرمان
بێخورد و خاوی، سەودای ئیشتیاق | ئاگری هیجران، زووخاوی فیراق
نویسا نە دەفتەر وە هوون زامان | یەک‌یەک پەرێ من هەرچێ پێش ئامان
وات: یا سەرمەشقەن پەی تۆ بزانی | ئیسمت مەشهوور بۆ فەرهاد سانی!
یاران فەرهاد مەرد وە ناکامەوە | پەری ئاخ و داخ من هەر مامەوە
شەرت بۆ چون فەرهاد شێت دەروە دەر | وێم کەم وە سەرگەرد خاڵان دڵبەر
بەڵ وێنەی فەرهاد دێوانەی شیرین | خەلاس بم جە دەس ئی دونیای نەنگین
یە «تاهیر» واتەن، دەروون پڕ جە غەم | زامش جە زامان فەرهاد نییەن کەم

* * *

شەماڵ! یار نەدیت؟ شەماڵ یار نەدیت؟ | وەختێ تۆ ئامای، دیدەم یار نەدیت؟
ئەو دیدەی سەیوان پڕخومار نەدیت؟ | ئەو توڕڕەی چین‌چین سیامار نەدیت؟
دڵدار دڵبەر ستەمکار نەدیت؟ | ئاهووی خوتەنی خوەش‌ڕەفتار نەدیت؟
ئەو پەنجەی قرمز حەنایی نەدیت؟ | ئەو نوور دیدەی بینایی نەدیت؟
سینەی سیم بەور پەروەرش نەدیت؟ | غونچەی نەشکوفتەی بێ‌گەردش نەدیت؟
نەدیت تۆ بەیۆ بە عشوە و نازێ | بپەرسو ئەحواڵ من لە ڕێوازێ؟



تــەحقێق بــۆ شــەماڵ ئــەو شــۆخ شــەنگە
نــە دیــدەی شــاباز ئــەو دڵ چــون ســەنگە

هیچ نییەن وە تـەنگ مەینـەت بەردەکـەش
بێ‌قەیدەن نە حـاڵ خەسـتەی دەردەکـەش

وەی لــە هەرکەســێ بــێ‌وەفــا و مەیلــەن
دەروون وە بــادەی بــێ‌مــەیلی کەیلــەن

بــە وێنــەی «تــاهیر» هــەر دەردەدار بــۆ
دیــدەی مــەخموورش دایم بیمــار بــۆ

**ئەم غەزەلە، «تاهیربەگ» و «ناری» پێکەوە هۆنیویانەتەوە:**

بە غەمزەی چاوی مەخمووری سیاهی مەستی مەی کردین
بە ماچی لێوی موستەغنی لە ئەنواعی مـەزەی کـردین

ترازا بەندی سـوخمەی ئاڵـی گوڵـناری بـە ئـاهی مـن
کەچی دەستی لەسەر دانا لە سـەیری بـاخی بـەی کـردین

بە هەوری پەرچـەم و ئـەبرۆی، ڕوخ و زوڵـفی کـە داپۆشـی
لە شەوقی ڕوئیەتی بـەدر و هـلالی یـەک‌شـەوەی کـردین

ئەگـەرچی کوشـتمی خـۆ قـابِض‌الارواحـی موژگـانی
بە قانوونی مەسێحایی لە خەندەی لێوی حەی کـردین

عەلاجی دەردی دڵ «ناری» لە «تاهیربەگ» تەمەنناکـە
بەڵێ ئەمڕۆ گوڵ‌ئەندامێ بە تیرێ جەرگی پەی کردین

**دوو غەزەلی فارسی:**

گلبــرگ تَنــا! بُرقــع نیلــی ز ســر انــداز
آتــش بــه مــن ســوختەی دربــدر انــداز

بنمــای بــه عــشّاق دو چــشمان ســیاهت
صد تیر ز یک غمزه به جـان و جگـر انداز

بـر رغـم حـسودان صـنما! خیـز چـو ساقی
گُلفــام مــی کُهنــه تــو در جــام زر انــداز

بـــردار حجـــاب ســـیه از روی لطیفـــت
صد ولْوَله در زُهـره و شـمس و قمـر انداز

امـــروز علـــی‌الـــرغم رقیبـــان مَکُـــنَم دور
این جـور و جفـا را تـو بـه روز دگـر انداز

کـــس نیـــست ســـتاند ز بُتــان داد دل تــو
«طـاهر» تـو شـکایت بـه بـردادگـر انـداز

* * *

ز ســتمهای تــو دل هــیچ مُکــدّر نکــنم
خـاک پـای تـو بـه صـد گـنج برابـر نکـنم

من که محراب دو ابروت بود سجده‌گهـم
قبلـه‌گــاه دل خــود مــسجد و منبــر نکــنم

گفتـه بـودم کـه بـده بوسـه‌ای از قنـد لبـت
چو نـدادی دگـر ای دوسـت مکـرّر نکـنم

من دگر میـل بـدان دیـدەی نـرگس نـدهم
تکیــه بــر وعــدەی آن دلبــر کــافر نکــنم

هیچ شب نیست که تـا صـبح مـن از درد فـراق
سینه را ز آتـش غـم کـورەی مَجْمَـر نکـنم

اگرم بخت شود یار از این پس «طاهر»!
تکیه جز بر کرم حضرت داور نکنم

*دیوانی تاهیربەگ*، سلێمانی، ١٣٥٥. *گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، عەلی کەمال، ل ٣٠- ٣٢.

## سالم

عارفی بێنیاز، شێخ موحەممەد سەلیم، نازناو «سالم»، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ عەبدولکەریم، کوڕی شێخ عەبدولغەفار، لە پشتی شێخ ئەحمەدی عەللامەی مەردۆخی، ساڵی ١٢٧٤ ک. م. لە گوندی «تەختە»ی لای شاری سنە، هاتە دنیا و کە پێگەییشت، فارسی و عەرەبییەکی سەرەتایی لای بابی خوێند و ئەو عەمری خوای کرد، ماوەیەک لە سنە لە خزمەتی شێخ موحەممەدی «فَخرُالعُلَما»ی مەردۆخی دژنی، ئەدەبیاتی ناسی و ئەوجار چووە سابلاغ (مەهاباد) و سەردەمێک لە خزمەتی مەلا عەولای پیرەباب بەهرەی برد و لەوێوە گەیشتە سلێمانی و لە ساڵە دواییەکانی ژیانی شێخ عەبدولقادری موهاجیردا، چەند دەرسی ئوسوول و کەلامی بەلاوە خوێند و پاشان ڕۆی بۆ بیارە و لە مەلا عەبدولقادری بیارێ، ئیجازەی وەرگرت.

سالم کە لە دەرس‌ودەور بۆوە، لە خزمەتی شێخ عومەر زیائەدیندا تۆبەی کرد و چووە ناو ڕیزی مریدانییەوە و ماوەیەکی بە سەیر و سولووکەوە ڕابوارد و دوای وەرگرتنی ئیجازەی ئیرشاد، گەڕاوە سنە و باقی ژیانی بە دەرس‌گوتنەوە و ئیرشادی خەڵک تێپەڕ کرد و سەرەنجام ساڵی ١٣٣٧ ک. م. لە تەمەنی ٦٣ ساڵاندا، ئەمری خوای بەجێ هێنا. گڵکۆی ئەو ڕەحمەتییە لە زیارەتانی شێخانی سنەدایە.

سالم خاوەن زبانێکی پاراو لە شیعردایە و بە کوردی و فارسی و جاروبار عەرەبیش شیعری گوتووە و شیعرەکانی زۆرتر عیرفانین. هەروەها لەسەر زۆرێک کتێبی دەرسیی فەقێیان، پەراوێزی نووسیوە.

**ئەوا چەند شیعری سالم:**

تەم و خەم و هەم، جەم بەستەن وە هەم
گرتەن گرداگرد ڕووی چەرخ نۆهەم

نەمەز یە چێشەن چ نێش و ئێشەن؟
دوود هەناسەی کێهە دڵڕێشەن؟

نەمەز بەزم عەیش نۆش عاشقان
شێویان و دێویان دەرد وامقان

یاخۆ نە خوسووف بەدر دوو هەفتەن
زوڵفش نە سەفحەی جەمین ئاشوفتەن

وە شنۆی ڕازت دڵەی دۆسانت
دۆسان ڕاسان پالابۆسانت

وەش‌کەر، مەدهۆش کەر، جە گرد عەلایق
بێعەلاقە کەر جە گشت خەلایق

حەیفەن، مێمانەن بێتۆ بێناز بۆ
بێنەشئەی بادەی دۆس، مەینەت‌گاز بۆ

هۆرێزە دەورێ دەور وە پیاڵە
جوان کەر وە مەی پیر سەدساڵە

ماه مونەووەر! وەخت تولۆعەن
پەرێ تۆ غورووب عەیب و مەمنۆعەن

وەختــێ کـــە قەمـــەر ئاشـــکارا بـــۆ سـوهەیل مەحاڵـەن جـلۆەش یـارا بـۆ
غــەیر جــە تــۆم نییــەن «دیّارُالبــشر» قەسەم بە «روضە»ی پـاک پەیغەمبـەر(د)

**لە شیعرە فارسییەکانی**:

ای عـالم و آگــە ز فعـال مـن جاهــل هـستم ز عبـادت کـسل و غافـل و کاهـل
در بندگی نفـس و هـوی مُسْرِع و چابـک در کـسب معاصـی و گنـە عامـل و شـاغل
از مـشرع شــرع نبـوی کـام نَـشُد تَـر امـا ز سـرم تـا بـە قـدم غـرق رذایـل
نە دین و نـە دنیـا و نـە عُقبی، همگـی شـد پامـال خیـال تبـە و فکـرت باطـل
شـد وقـت نفیـسم همـە در غفلـت عـصیان شـد عمـر عزیـزم بـە عبـث ضـایع و باطـل
نە درس و نە تعلیم و نە ذکـر و نـە تـصوف نـە کـسب معـانی نـە مبـانی نـە جـداول
نــە شــاغل تحقیــق ز اســفار فنــونم نــە راغـب افکـار رسـائل نــە مـسائل
نـە مـانع دعـوی و نـە نـاقض نـە معـارض نــە مایــل تحریــر دعــاوی نــە دلایــل
نــە ناقـل و نــە مُنتقـل و مثبــت و نـافی نـە مـدعیم مـن نـە مُحـاکم نـە مُجـادل
نـە شـایق آداب و نـە منقـول و نـە معقـول نـە میـل اصـول و نـە فـروع و نـە محافـل
نـە شـاعر و نـە کاتـب و نـە فلـسفەبـافم نـە قـوّت تـألیف، نـە تـصنیف رسـائل
داننــد مــرا پُرهنــران عاصــی عــامی خواننـد مـرا بـیبَـصَران عـالم عامـل
افــسوس کــە اینــانم هرگـــز نــشناسند خود نیک شناسم کـە نـشد هـیچم حاصـل
بـا ایـن همــە نومیـد نـیم از کـرم حـق نومیــد نگــردد ز کــرم بنــدەی ســائل
«لا حَــوْلَ وَ لا قُــوَّة إلا بـــک یـــارب» احـوال مـرا نیـک کـن از رحمـت شـامل
با کاملەی قـدرت تـو «کُنْ فَیَکُون» است امـر مُتَعَـسّر چــە بــە عاجـل بــە آجـل
اصـلاح تـو اَی «سـالم» عاصـی بـود آسـان گــر نــیمنگــاهی فکنـد مرشـد کامـل

**لە قەسیدەیەکی عەرەبی، بۆ پەسنی مورشیدەکەی، شێخ عومەر زیائەدین**:

زَهـــــقَ الباطــــلُ و الحــــقُّ ظَهَــــر عــن «ضــیاء» وجْــە مَوْلانــا «عُمَــر»
قَـــدْ بَـــدا کَالبَـــدْر مـــنْ بُـــرْج الــسَّنا فـــی سَـــموات المَعـــالی وَ الخَطَـــر
أصْـــبَحَتْ تَتْلُـــو لـــسانُ الحـــال لـــە دَنَـــت الــسّاعَـــة وَانْــشَقَّ القَمــر

تا دەڵێ:

قَــلْ لمَـــنْ لَـــمْ یُـــدْرکوا وَ اسْــتَکبَرُوا بئْـــسَت الـــــشّیمَةُ، کَلّـــا وَ القَمــــر
ســــاءَ مــــا کُنْـــتُم زَعَمـــتُمْ أنَّـــەُ قَـــدْ نَجَـــوْتُمْ عَنْــــەُ، کَلّـــا لا وزر

لە کۆتاییدا ئێژێ:

رَبَّنا قَلْباً «سلیماً» هَبْ لَنا راسخاً فی حُبّ مولانا عُمَر

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل٣٠٦ و ٣٠٧. یاداشتەکانی نووسەر.

## عیرفان

مەلا عەبدولا، کوڕی مەلا ڕەسوول، پیاوێکی زانا و شاعیرێکی ناسراو بە «عیرفان»، لە شاگردانی مەلاوڕەحمانی پێنجوێنییە کە ئیجازەی لێ وەرگرتووە و لە زبان و وێژە و ڕیازیدا، شارەزاییەکی تەواوی هەبووە و زیاد لە کوردی و عەرەبی، فارسی و ترکیشی زانیوە و ژیانی زۆرتر بە دەرس‌گوتنەوە تێپەڕ کردووە.

وەک مامۆستا خاڵ لە *گۆڤاری کۆڕی زانیاری* کورددا دەڵێ، هێندێک نووسراوەشی لێ بەجێ‌ماوە؛ وەکوو: نامیلکەیەک لەمەڕ «رُبع مُجیَّب» و یەکی تر لە بارەی «اُسطُرلاب»ەوە، کە تورکی بووگن کردوونی بە عەرەبی.

زا و مەرگی عیرفان، ساڵانی ١٢٧٦ و ١٣٣٧ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخ سُلیمانیّە*، ل٢٧١. *گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد*، بەغدا، س١٩٧٣ ز. ل٦٨٩.

## مەلا عەبدولعەزیزی دەرەتفێ

کوڕی سلێمان و خەڵکی گوندی «هەرگێنە»ی لای شارۆچکەی پێنجوێنە کە ساڵی ١٢٨٠ ک. م. لەدایک‌بووە و لای عەللامە مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی، خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە. ئەوجار بۆتە مەلای ئاوایی «دەرەتفێ» لای مەریوان و لەوێ دەرسی گوتۆتەوە و بەرنوێژی و ڕێنوێنی خەڵکەکەی کردووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٣٧ ک. م. لە دنیا چووە.

حاجی مەلا عەزیز پیاوێکی هێژا و توێژەر و خۆش‌سەروزمان بووە و بۆ پیاوچاکی و پارێزکاری ناوی‌دەرکردووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل ٢٩٨.

## شێخ تاها مایی

زانای هێژا، شێخ تاها، کوڕی مەلاوڕەحمانی قازی، ساڵی ١٢٥٩ ک. م. لە گوندی «مایی» ناوچەی بادینان هاتۆتە سەر دنیا و لە ژێر چاوەدێری بابیدا ڕاهاتووە و وانە سەرەتاییەکان فێر بووە. ئەوجار ماوەیەک لای مامی (قاسمی زەریر) خوێندوویە و کە بای‌باڵی‌داوە، چۆتە گوندی «ئوترووش» و لە قوتابخانەی شێخ عەبدولهادی یەحیەوی، کوڕی عەللامە مەلا یەحیا مزووری، شوێنی خوێندنەکەی گرتووە. دوای ئەوە بۆ مووسڵ ڕۆیوە و لە خزمەتی عەللامە عەبدوڵڵای عومەری ــ سەرۆک زانایانی مووسڵ ــ فەقێتی کردووە و کە ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە زێدی خۆی. زۆری نەخایاندووە دڵی چۆتەوە سەر عیرفان و بۆتە مریدی

شێخ موحەممەدی بامەڕنی و شوێنگریی تەریقەتی نەقشبەندییەی هەڵبژاردووە.

شێخ تاها زیاد لە پلە و پایەی زانستی و عیرفانی، شاعیر و وێژەوانیش بووە و بە کوردی و فارسی و عەرەبی شیعری گوتووە و هێندێک نووسراوەشی لێوە بەجیٚماوە؛ دوویان «*قلائدُالفرائد*» و «*منهاجُ‌الوصول*»یان ناوە.

لە شیعرە عەرەبییەکانی شێخ تاها، قەسیدەیەکی گەورەیە لە پەسنی پێغەمبەری ئیسلامدا (د)، کە ئەمە بەیتێکیە:

لا تَعْجَبَنَّ لِمَنْ أسرى بِهِ الله — مِن قابَ قَوْسَينِ أوْ أدْناهُ أدْناهُ

شیعرە کوردییەکانی مامۆستا ـ کە بە کرمانجین ـ ناسکی و جوانییەکی تایبەتیان هەیە؛ ئەوا دوو بەیتی:

مە دەرزیکەک هەبوو ئەمما چە دەرزی؟ — نەبوو ئاسن ژەوی ڕەنگی ئو تەرزی

کەسی جارەک وەرارەک پێ دورووبا — دبوو بێ خیری خۆ خەییات و تەرزی

بەداخەوە زۆربەی شیعر و نووسراوەکانی ئەم شاعیرە زانایە، ساڵی ١٣٤٣ ک. م. لە هێرشی چەکدارانی ئینگلیسی بۆ باکووری کوردستان، سووتان و لەناو چوون.

شێخ تاها ساڵی ١٣٣٧ ک. م. دنیای بەجیٚهێشتووە.

*الاکراد فی بهدینان*، ل٢٠٨ و ٢٠٩.

## زەنگەنەی کرماشانی

ئەسەدوڵلا خان، کوڕی حوسەین‌قولی خانی زەنگەنە، شاعیرێکی کوردی کەلهوڕی فارسی‌بێژە کە لە ١٣ی ڕەجەبی ساڵی ١٢٦٤ هاتە دنیا و ٢٧ی ڕەمەزانی ١٣٣٨ ک. م. لە کرماشان، دنیای بەجیٚهێشت.

ئەسەدوڵلای زەنگەنە لە خزمەتی حاجی شێخ موحەممەد حوسەینی کرماشانی، ناسراو بە «عەبدعەلیشا» بەهرەی برد و ئیجازەی وەرگرت و بەم بۆنەوە نازناوی «عەبدعەلی» بۆ خۆی هەڵبژارد.

**غەزەلێکی زەنگەنە:**

وَقت آن شد که دَر خلوت دل باز کنیم — دست در گردن آن دلبر طَنّاز کنیم

ساغر و شیشەی مَی را بە میان بنشانیم — مطربان فلکی را همه آواز کنیم

با بُتی، سیم‌تنی، لالەرُخی در خلوت — مجلس خالی از اوهام جهان ساز کنیم

سالکان را ز نظر پردەی غفلت بدریم — با خبرشان هم از انجام هم آغاز کنیم

چشم دل را بگشاییم و تماشای رُخش — با بُت خویش در راز نهان باز کنیم

تا رسد ساغر می از نظر «عبدعلی» — بر سر مُلک و مَلَک از عظمت ناز کنیم

تذکرەی شُعرای کرمانشاه، پەراوێزی ل١٤٥.



## مەلا عەبدولقادری کانیکەوە

زانای پایەبەرز، مەلا ئەولقادری مودەڕڕیس، کوڕی مەلاوڕەحمان، کوڕی مەلا یۆسـف، ساڵـی ١٢٨٠ ک. م.[١] لـە گوندی «کانی‌کەوە»ی ناوچەی بازیان لە کوردستانی باشوور هاتە دنیا و کە پێگەیشت، بۆ خوێندن، شار و دێیەکی زۆر گەڕا و زانیارییەکی باشی دەسکەوت. ئەمجار ماوەیەک لە پێنجوێن، لە خزمەتی مەلاوڕەحمانی پێنجوێنی بەهرەی برد و پاشان خزمەتی عەللامە حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشی گەیشت و ئیجازەی لێ وەرگرت.

مەلا ئەولقادر پاش وەرگرتنی ئیجازە، سەرەتێک لە گونـدی «کوچـک‌چـەرمگ»ی حـسەین‌ئـاوا فـەقێی ڕاگرت و هێندێک لەودوا شێخ عومەر زیائـەدین، بـۆ «بیـارە»ی بانـگ کـرد کـە لـە قوتابخانەکـەی ئەوێـدا دەرس‌بێژێتەوە. مەلا ئەولقادر ئەم داوەتەی وەرگرت و ساڵـی ١٣٠٢ ک. م. ڕۆی بـۆ ئـەوێ و تـا دواکـاتی ژیانی (١٣٣٨ ک. م.) دەرس‌گوتن و فەقێ ڕاهێنانی لە مزگەوت و مەدرەسەی بیارەدا لە ئەستۆ بوو. پێـڕای ئەوەش بۆخۆی چووە جەرگەی مریدانی شێخەوە و تەنانەت ئیجازەشی لێ وەرگرت.

مەلا ئەولقادر مامۆستایەکی یەکجار سەرکەوتوو بووە و زۆرێک لە زانایانی ئەم دواییانەی کورد، لـە کـۆڕی دەرسی ئەو دەرهاتوون و ئیجازەیان لە دەستی ئەو ساندووە. هەروەها زیاد لە پلە و پایەی زانستی، لە بـاری پارێزکاریشەوە یەکجار بەرچاو بووە و هاوچەرخەکانی وەکوو عارف و وەلییەکی شەرعی ناویان لێ بردووە.

پێشەکی *دیوانی مەلا حەسەنی شاهۆ*، چاپی بەغدا.

*عُلَماونا فی خدمة‌العلمِ و الدّین*، ل٣٠٧ و ٣٠٨.

## مەلا ڕەسوولی دێلێژەیی

کوڕی مەلا شەریف، ساڵی ١٢٨٠ ک. م. لە گوندی «دێلێژە» لەدایکبووە و کە خـۆی ناسـیوە، بـۆ خوێنـدن خزمەتی زۆر مامۆستا گەیشتووە و کە بۆتە مەلا، چۆتە «بیارە» لـە خزمـەتی شـێخ نەجمـەدینی عوسمـانی نەقشبەندیدا تۆبەی کـردووە و ماوەیـەک بـە سـەیر و سـولووکەوە خـەریک بـووە و پاشـان لـە سـلێمانی گیرساوەتەوە و بەرنوێژی و مۆچیاری خەڵکی کردووە و ساڵی ١٣٣٨ ک. م. لە دنیا چووە.

حاجی مەلا ڕەسوول شاعیریش بووە و بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە و بۆ خۆی نازناوی «فەوزی» هەڵبژاردووە.

*عُلَماونا فی خدمة‌العلمِ و الدّین*، ل ٢٠٩.

## موجریمی دینەوەری

حاجی نیعمەتوڵا جەیحوون‌ئابادی مـوکری، کـوڕی مـیرزا بـەهرام، نازنـاو «مُجرِم»، یـەکێ لـە پێـشوایانی

---

١. هێندێک ساڵی لەدایکبوونیان ١٢٧٢ ک. م. نووسیوە.

ئـەهلیحـەق[١] و سەرسـپاردووی بنەماڵـەی شاحەیاسـی موکرییـە کـە ساڵـی ١٢٨٨ ک. م. لـە گونـدی «جەیحوونئاباد»ی ناوچەی دینەوەری کرماشان هاتە دنیا و خوێندنی لە دینەوەر و کرماشـان تـەواو کـرد و ساڵی ١٣١٨ گەڕایەوە زێدی خۆی و دانیشتە پای ڕیازەت و گۆشەنشینی و پێڕای سەفەرێک بۆ لالەش، بـە نیازی زیارەت، کوردانی کاکەیی ناسی و سەرەنجام ساڵی ١٣٣٨ ک. م. دنیای بەجێهێشت.

موجریم کتێبێکی بە شیعر هۆنیوەتەوە، بە نـاوی«*شـاهنامەی حَقیقَـت*»، بـریتی لـە ژینامـەی پێـشەوایانی ئەهلیحەق و داب و دەستووری ئایینی ئەو خێڵە، لە ١١١١٦ بەیتدا. ئەم کتێبە لە لایەن بەشـی ئێراناسـی ئەنستیتۆی ئێران و فەڕانسەوە، بە پێداچوونەوەی دوکتور موحەممـەدی مـوکری، ساڵـی ١٣٤٥ ک. هـ. لـە تاران چاپ کرا. ئەوا چەند بەیت لەو کتێبە:

تـــو اســـلام چـــون دانـــه بـــادام دان　　شکـــسته شـــود چـــون بـــه دور زمـــان،
بـــرون آیـــد آن مغـــز انـــدر دلـــش　　بـــود انـــدر آن مغـــز حـــق منـــزلش
کـــه آن مغـــز دیـــن حقیقـــت بـــود　　همـــان پوســـت جـــام شـــریعت بـــود
شـــده حـــق بـــه بطـــن شـــریعت نهـــان　　شـریعت چـو دُرّی است در بحـر و کـان
چـــو بیـــرون شـــدی دُر ز بحـــر یقـــین　　شـــود سُـــفته آن دُر ز آیـــین دیـــن
یکـــی گـــوهر از بطـــن آن دُرّ پـــاک　　بـــرون مـــیشـــود منجلـــی زان مغـــاک
حقیقـــت بـــود آن گُهـــر از هـــدف　　کـــه گـــوهر ز دُر بـــود و دُرّ از صـــدف
صـــدف هـــست اســـلام در هـــر مـــصاف　　بـــود از ازل تـــا ابـــد پـــاک و صـــاف

ئەم شاعیرە عارفە، دیوانێکیشی بە زبانی کوردی گۆرانی هەیە؛ ئەمەش چەند بەیتی بە ناوی «تەڵقین»:

فلان کەس مەردەن، فلان کەس مـەردەن　　یاشـا ئەمانـەن فـلان کـەس مـەردەن
گـەر گوناکـارەن، ئـەر کـردار کـەردەن　　وە دیـن یـاری حەسـرەتش بـەردەن
پـەنا وە دەرگـای سوڵـتان ئـاوەردەن　　خیانـەت وە دیـن یـاری نەکـەردەن
یاشـا! قـەبووڵ کـەر لالـە و ڕەجامـان　　بـوگزەر جـە تەقـسیر جـورم و گونامـان
ڕۆح فـلان کـەس وە فـانی ویـەرد　　وە بـار گونـا ڕووش وە عوقبـا کـەرد

---

١. ناوی سەرەکییان، «**یارسان**» و «**تایفەسان**»ە. یارسان کورتکراوەی «یارستان» و وەک خۆیان ئێژن، واتا یارانی حـەق. لە کتێب و گوتەی جێبڕوایان، دەفتەری «سەرەنجام» یان «پردیوەر»ە کە سوڵتان سحاک (ئیسحاق) بە کوردی گـۆرانی نووسیویە. سوڵتان سحاک یان سهاک، نازناو «سـاحیب کـەرەم»، وەک دەڵـێن، لـە چـەرخی حەوتـەمی کۆچیـدا، لـە بەرزنجەی شارەزوور هاتۆتە دنیاوە و بابی شێخ عیسا و دایکی ئیراک خاتوون،کەسناو «ڕەمزبار» بووە. پاش مردنی شـێخ عیسا، سوڵتان ئیسحاق لە بەرزنجەوە بۆ ناوچەی «شێخان» لە هەورامان چووە و لەوێ ماوەتـەوە؛ تەمـەنی لـە سـەتیش تێپەڕیوە و بە دانەری ڕێبازی یارسانی دەزانن.

یـا حـەق نەسـازی نگـوون عـەزابش هـەرچی بپرسـۆن ئێـدەن جـەوابش
ئەوەڵـش یـارەن، ئـاخرش یـارەن پـیرش بنیـامین، شـاخاوندگارەن

سرسپُردگان، چاپی تەوریز، ساڵی ١٣٤٩ ک. ه.

## شێخ سەمیعی بەرزنجی

کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ عەلی، کوڕی شـێخ فازیـل، کـوڕی شـێخ نیزامـەدین، خەڵـکی گونـدی «چنارە»ی لای هەڵەبجەیە و ساڵی ١٢٦٢ ک. م. لـە دایـک بـووە و دوای فێربـوونی وانـە سـەرەتاییەکان، ماوەیەک لای مەلا عەولای کۆیە و سەرەتێک لە کـۆڕی دەرسـی مـەلا ئـەولقادری کـانی کـەوە لـە بیـارە خوێندوویە و پاشان بۆ هەولێر ڕۆیـوە و هەیئـەت و ئەستێرەناسـی لـە خزمـەتی مامۆسـتای ئـەم زانسـتە، مەلائەفەندی خوێندووە و ئیجازەی وەرگرتووە.

شێخ سەمیع ساڵی ١٣١٥ کۆچی کردووە بۆ شاری حەلـەب و تـا کۆتـایی ژیـان (١٣٣٨ ک. م. ) لـەوێ ماوەتەوە و خەریکی دەرس‌دان و فەقێ ڕاهێنان بووە؛ زۆریش ناوبـانگی دەرکـردووە و پـاش کـۆچی دوایـی شێخ حەسەنی مودەڕڕیسی کورد، دەرس‌گوتنەوە لە قوتابخانەی ئەحمەددییەی حەلەب ــ کـە تایبـەت بـە زانایانی کورد بووە ــ بەو دراوە و کەسانی وەک حـاجی موحەممـەدی ڕاغیـب ئەفەنـدی «طبّـاخ»، خـاوەنی کتێبی «*اعلام النُّبلاء*»، لایەوە خوێندوویانە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٢٦.

## کەوکەبی نەقشبەندی

عارفی پایەبەرز، شێخ نەجمەدین، کوڕی شێخ عومەر زیائەدینی عوسمانی نەقشبەندی، هەر لـە سـەرەتای منداڵییەوە لە خزمەتی مامی (شێخ موحەممەد بەهائەدین)دا، لەگـەڵ داب و دەسـتووری تەریقـەت ئاشـنا بووە و دوای ئەوەش لە ژێر چاوەدێری بابیدا، سـەیر و سـولووکی دەسـپێکردووە و پلـەــپلـە لـە پلـەکانی تەریقەت سەرکەوتووە. لە پاڵ ئەوەش لە خوێندنی زانستەکاندا نوکوولی نەکردووە و تـا ڕادەیـەکی بـەرچاو سەرف و نەحو و فیقهـ و تەفسیر فێر بووە.

شێخ نەجمەدین دوای کۆچی دوایی باوکی، لە گوندی «بیـارە»، کـاری ئیرشـاد و بـەڕێوەبردنی خانـەقا و ڕاهێنانی مریدانی لە ئەستۆی خۆی گرتووە و تا کۆتایی ژیانی، ساتێکیش لە ئیرشـاد و ڕێنـوێنی خەڵـک و تەڵقینی داب و دەستووری تەریقەت، دەستی بەرنەداوە و بۆخۆشی، لەگەڵ مریدان و ڕێپێوان، هەمیشە لـە کۆڕی خەتم و زیکر و فیکر و نوێژی جومعە و جەماعەتەکاندا، بەشداری کردووە. یـەکجـار خاکەسـار و بـێ دەعیە و دەمار و دەروێش ئاسا و نەوس‌کوژ و ڕووخۆش بووە و لەم بارەوە ناوی دەرکردووە. کەسانێ کـە لـە

نزیکەوە ناسیویانە و دەگەڵیدا ژیاون، لەمەڕ بەرزی ئاکار و کەسایەتی هەڵکەوتە و تەنانەت کەشف و کەرامەتییەوە، داستانی زۆر دەگێڕنەوە.

شێخ نەجمەدین زەوقی شیعریشی هەبووە و نازناوی «کەوکەب»ی بۆ شیعری خۆی داناوە و هێندێک شیعری عارفانەی لێ بەجێماوە؛ کە ئەوا دوو نموونەی:

به راهش صرف کردم نقد ایام جوانی را — که شاید در جوار دوست یابم زندگانی را
من اینجا شادمانی را نمی‌خواهم، نمی‌خواهم — به جُزد اندر کنار وی نجویم شادمانی را
در این دنیا نخواهم کامرانی را بدان امید — که آنجا با عزیزانت بیابم کامرانی را
خدایا این حیات فانی از من گیر و رحمی کُن — به لطف خود نصیبم کن حیات جاودانی را
به اوج آسمان جا دارد ار سایم کلاه فخر — که باشم بندەی ناچیز مر فاروق ثانی را

* * *

بی‌حالیم از دست دل زار و زبون است — گه عاشق و گه خسته و گه مست جنون است
از داغ فراق رخ دلدار جفا جو — هر ساعتم از چشم، روان چشمەی خون است
عشقت ز کفم رشتەی تدبیر برون کرد — دل بسته به تقدیر و ندانیم که چون است
ما سالك راهیم، در این راه خدایا! — نا امنی و بیراهه و اشکال فزون است
مرغ دل «کوکب» ز غم حملەی صیاد — فریاد و فغانش ز فلك رفته برون است

زا و مەرگی شێخ ساڵانی ١٢٨٠ و ١٣٣٧ یان ١٣٣٨ ک. م. ڕوویداوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## ئیسماعیل پاشای بابان

کوڕی موحەممەد ئەمین ئەفەندی، کوڕی ئەمیر سەلیم، لە زانایانی چەرخی چاردە، پیاوێکی مێژووزان و توێژەر و کتێبخوێن بووە لە بنەماڵەی بەناوبانگی بابان کە سێ کتێبی بایەخداری لێ بەجێماوە:

١. «*ایضاحُ المَکنوُن*»، وەکوو پەراوێزی «*کَشفُ الظّنوُن*»، کە لە ساڵی ١٢٩٦ تا ١٣٢٠ ک. م. بە دەستییەوە بووە و یەکەم جار ساڵی ١٣٦٤ ک. م. لە ئەستەمبووڵ چاپ کراوە

٢. «*هدیّةُ العارفین*»، لەمەڕ ناوی نووسەرانەوە، لە ٢ بەرگدا، کە ئەویش ساڵی ١٣٦٤ ک. م. چاپ بووە

٣.«*آثارُ المُصنّفین*»، لە ٢ بەرگدا.

*الاعلام*، ب١، ل٣٢٥. پێشەکی بەرگی یەکەمی *کشف الظّنون*، چاپی ئوفسیتی تاران، ١٣٨٧ ک. م.

## موحەممەد تەیموور بەگ

کوڕی ئەحمەد تەیموور پاشا، کوڕی ئیسماعیل پاشا[١]، نووسەرێکی هێژا ، شاعیرێکی توانا و داستان‌نووسێکی یەکجار بەجەوهەر بووە کە لە میسردا ژیاوە و پاش قۆناخی دواناوەندی، سەرەتا بۆ برلەن لە ئەڵمانیا دەڕوا، بەشکوو بژیشکی بخوێنێ، بەڵام هەرچۆنێک بووە، دوای هێندێک چۆتە فەڕانسە و حقوقی خوێندووە و دوای سێ ساڵ گەڕاوەتەوە میسر و وازی چۆتە سەر داستان نووسین و لەم بوارەدا هەڵیداوە و چەند کاری وەک پێشەکی ئامادە کردووە کە بۆخۆی نووسەر و شانۆگێڕی بووە. بەداخەوە ئەجەڵی بێ وادە مەودای نەداوە و لە تەمەنی ٣٠ ساڵاندا، قەباڵەی ژیانی هەڵپێچاوە و کارەکانی ناتەواو ماوە.

**لە بەرهەمەکانی**:

١. «*و میض الرّوح*»، بریەتی لە سەرجەمێکی شیعر و پەخشانی

٢. «*حیاتناالتّمثیلّیه*»

٣. «*المَسرَحُ المصری*»

**شیعری ئەوە**:

لَیْلَـــــةٌ کُلُّهـــا عَنـــاءٌ وَ هَـــمٌّ — وَ شَـقاءٌ وَ القَلـبُ مِنْهـا مُعَـذَّب

ذُقْـتُ فیهـا المُـصابَ کَأساً دهاقـا — ضاعَ رُشْدی فیها وَ لَمْ أَلْـقَ مَهْـرَب

فَفُــؤادی مِــنْ نــاره یَتَلَظّـی — وَ دُمُـوعی مِـنَ المَحـاجر تُـسْکَب

قَدْ دَعَوْنی فَتَی القـریض وَ حَـسبی — مِنْـهُ فـی القَلـب جَمْـرَةٌ تَتَلَهَّـب

مـا نَظَمْـتُ القَـریضَ أَبْغـی نَـوالاً — مِـنْ کبیـر، وَ لا اُحـاول مَکْـسبْ

بَـلْ أقُـولُ الأشـعار کَیَمْـا اُنـاجی — کُـلَّ حُـرٍّ مِـنْ بُؤسـه یَتَعَـذَّبْ

ذاکَ رَأیـی فیمـا اُسَـمّیه شـعْراً — وَ لِکُـلٍّ فـی الشّعْر رأیٌ و مَذْهَب

*الآدابُ العَرَبّیه*، چاپی بەیرووت، ب٣، ل٩٧. *الاعلام*، ب٦، ل٢٤٧.

## خاتوو خوەرشیدی مەریوانی

کچی شێخ مەعرووفی کەلووس و دایکی شاعیری بەناوبانگ قانیعی مەریوانی و لە سەیدەکانی «تەراتەوەن»ە کە منداڵ بووە، باوکی لەبەر ناعیلاجی، لە مەریوانەوە کۆچی کردووە بۆ سنە و خوەرشی لە ماڵی ژنە ماقووڵێکی ئەردەڵانیدا نیشتەجێ بووە و ئەو خاتوونە پێی خوێندووە و تا ڕادەیەک گەیشتووە کە شارەزاییەکی باشی لە زبان و وێژەی فارسیدا پەیدا کردووە و تا ئەندازەیەکیش سەرف و نەحو و بەیان و

١. باسی ڕیشە و ڕەتەوەی ئەم بنەماڵە و زاروزێچیان لە بەشی دووهەمی ئەم کتێبەدا.



مەنتیق و زبانی عەرەبی فێر بووە.

خاتوو خوەرشی کتێبێکی بە فارسی لەمەڕ داب و دەستووری ماڵداری و بەخێو کردن و بارهێنانی منداڵ، هەر لە کۆرپەییەوە تا پێدەگا نووسیوە و دیوانی شیعرێکیشی هەیە کە هیچیان چاپ نەکراون. ئەم خاتوونە لە هونەری تەونەوانی و کاری فەرش بەتایبەت نەخش و نیگار کێشان و بەرهەمهێنانی ڕەنگی جۆراوجۆر بۆ قاڵیدا، ناوبانگی دەرکردووە و نەخشەکانی ئێستاش بە ناوی «خورشیدی» لە کوردستاندا مەشهوورن.

ئەم خاتوونە هونەرمەندە، تا چلەکانی چەرخی چواردەی کۆچی ژیاوە.

ئەمەش شیعرێکی کوردی سۆرانی خاتوو خوەرشید کە بۆ مۆچیاری «عادڵە»ی کچی هۆنیویەتەوە:

کچم! ڕۆڵەی کزۆڵەی بوردەباریم چرای ڕووناکی بێدەستی و هەژاریم

کچم! پارچەی نەژاکاوی زەمانەم نەتیجەی ئیهتمامی خوێندەواریم

وەرە گوێ ڕاگرە بۆ پەندی دایکت فەرەحبەخشی دەروونی بێقەراریم

نەخوەی هەرگیز فەریبی سادەڕوویان نەبیتە هۆی زیادی شین و زاریم

کچم! هۆشی حەیا و ناموسی خۆت بێ نەکەیت کارێ زیاد کەی دەردی کاریم

کچم! هۆشیاری خۆت بە تاکوو مردن وەکوو من بە زرەنگی و هۆشیاریم

کچم! وەڵڵا هەموو داخی کچانە نەخۆشین و کزەی بێئیختیاریم

نە تەنها وەسیەتم بۆ تۆیە ڕۆڵە هەواداری کچانی کوردەواریم

*گوڵاڵەی مەریوان*، بەشی ١، ل ٧٠. *دەشتی گەرمیان*، بەشی ٥.

## مەلا ڕەسوولی مەنفی

کوڕی مەلا مەحموود ناوێک بووە خەڵکی «بەیتووش» کە پاش دوایی هاتنی خوێندنی، چۆتە کۆیە و ڕەسوول لەوێ هاتۆتە سەر ئەم دنیایە و ئەویش دەرسی مەلایەتی خوێندووە و کە تەواوی کردووە، شانی لە دەرسگوتنەوە و فەقێ ڕاگرتن شل کردووە و بە هۆی تێکۆشان و لێهاتوویی زۆرەوە، ناوی دەرکردووە و هەموو خۆشیانویستووە.

مەلا ڕەسوول زەوقی شیعریشی هەبووە و نازناوی «مەنفی» بۆ خۆی داناوە و هەروەها هێندێک نووسراوەشی لێ بەجێماوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٤٠ ک. م. ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە.

*ڕۆژمێری چیا*، ساڵی ١٣٦٤ ک. ه.

## مەلا سەعیدی موفتی

ساڵی ١٢٩٥ ک. م. لە گوندی «سوویل»ی سەر بە سلێمانی هاتۆتە دنیا. پیاوێکی زانا بووە و لای مەلا

ڕەحمانی پێنجوێنی دەرسی خوێندووە و ئیجازەی وەرگرتووە و ماوەیەکیش موفتی ناوچەی کفری بووە و ساڵی ١٣٤٠ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ٢٢٥.

## شێخ تاهای بالیسانی

شێخ مەلا تاها، کوڕی شێخ عەلی، خەڵکی ناوچەی خۆشناوەتی سەر بە هەولێرە. خوێندنی لای باوکییەوە دەسپێکردووە و پاشان بۆ هەولێر چووە و لای مامۆستایانی ئەو شارە خوێندوویە و ئیجازەی وەرگرتووە و ئەمجارە گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و دەرسی گوتۆتەوە و بەرنوێژی جەماعەتی کردووە.

کە بابی لە دنیا چووە (١٣٢٦ ک. م.)، چۆتە بیارە و بۆتە مریدی شێخ نەجمەدینی نەقشبەندی و سولووکی دەسپێکردووە و پێگەیشتووە. بە کۆچی یەکجاری شێخ نەجمەدین، دیسان گەڕاوەتەوە بیارە و ئەمجار دەستی ئیرادەتی داوەتە دەستی شێخ عەلادینی جێگری شێخی ڕەحمەتییەوە و لەسەر دەستووری شێخی تازە، قوتابخانەی بیارەی گەڕاندووە؛ بەڵام زۆر تاقەتی نەهێناوە و پاش ماوەیەک بەجێی‌هێشتووە و گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و بە کشت‌وکاڵەوە خۆی خەریک کردووە.

شێخ تاها مرۆیەکی زانا، دیندار، پارێزکار و خەڵک‌دۆست بووە و زۆری بەهرە بە فەقێ و خەڵکی ئاسایی گەیاندووە؛ بە ڕەنجی شانی خۆی ژیاوە و قەت بۆ خزمەتی ئایینی، دەستی بۆ کەس دانەکێشاوە. هەروەها بۆ میوانداری و خزمەت بە هەژاران و داماوان، نوکوولی نەکردووە.

شێخ لە گوندی بالیسان خانوویەکی بۆ خۆی و خێزانەکەی کردۆتەوە؛ شەوەناوێک بەسەریدا ڕووخاوە و کوشتوویە (١٣٤٠ ک. م.).

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ٢٥٢.

## ئەمین فەیزی بەگ

ئەفسەرێکی زانا و وێژەزانی خەڵکی سلێمانییە کە لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانلیدا، سەردەمێک سەرپەرشتی مەکتەبی چەکداری بەغدا و ماوەیەکیش لە سلێمانی کارگێڕی کردووە و دواجار تا پلەی سەرلەشکری گەیشتووە و ساڵی ١٣٢٦ ک. م. وەنیشتە بووە.

ئەمین فەیزی کە کار و ئەرکی چەکداری لە کۆڵ کەوتووە، زۆرتری کاتی بە گەشت و گەڕان و خوێندن و نووسینەوە خەریک بووە. ماوەیەک بۆ ئورووپا چووە و دواجار لە ئەستەمبووڵ گیرساوەتەوە. لە وانەی ڕیازی و سروشیتدا چاک سەری‌دەرچووە و کتێبێکی لەم دوو بابەتە، بە ترکی نووسیوە، بەناوی «*اجمالی نتایج*». ئەڵبەت کتێبی تریشی هەیە؛ وەکوو: «*تَفرقة الریاضیّة فی قواعد الجبر*» و «*هوای نَسیمی*» و هەروەها دیوانی

شیعر بە ناوی «*شُعاعات*».

ئەمین فەیزی هێندێک پێش مەرگی، کتێبێکی بە ناوی «*انجُمن ادیبان*»، لە ئەستەمبووڵدا چاپ کردووە کە ئەمن نەمدیوە؛ بەڵام وەک دەڵێن ناوی بەشێک لە شاعیرانی کورد و بەرهەمەکانیانی تێدا کۆ کردۆتەوە. بۆخۆشی شاعیرێکی باش بووە و لەگەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانی کەرکووکیدا نامە و شیعرگۆڕینەوەیان هەبووە. شێخ ڕەزا لە وەرامی شیعرێکیدا وای بۆ نووسیوە:

ز نُطفەی قَلَمت در مشیمەی قرطاس نتیجەهاست بە قیمت گرانتر از الماس

صَحیفە مُعجز پیر است بسکە چون مریم بە بر گرفتە موالید عیسوی انفاس

هزار سال بمانی کە این عجب نبود بشر نیند مگر خضر زندە و الیاس؟

کاتێکیش کە ئەمین فەیزی، بەرگێک لە کتێبی «*هوای نَسیمی*»، پاش چاپ، بە دیاری، بۆ شێخ ڕەزا دەنێرێ، شێخ ڕەزا ئەم شیعرەی بۆ دەنووسێ و بۆ یەمەنی بەڕێ دەکا؛ کە فەیزی ئەو دەم لەوێ بووە:

اَلا ای هنرمند یار قدیمی تُوی خسروان را سزای ندیمی

ز حکمت بپرداختی نامەای را کە دادی در آن نامە داد حکیمی

«هوای نسیمی» از آن گشتە نامش کە جان پروراند هوای نسیمی

بە دانش تو را هیچ همتا ندیدم مگر جوهر فرد و دُرّ یتیمی

تو خواهی سفر در «یمن» دورتر کُن اَمین فَیضیا در دل من مُقیمی

دیسان شێخ ڕەزا بۆی هۆنیوەتەوە:

تا بە ضرب‌المثل همی گویند کە دُعا از برای آمین است

خاطرش شاد باد امین فیضی ز آنکە دریای دانش و دین است

بەداخەوە لە شیعری ئەمین فەیزی، ئەم سێ بەیتە زیاترم دەس نەکەوت:

گەر ڕەفێقت یاری سادق بێ چ باکی ڕێگەتە؟ گەر کەسێ بەدخۆ لەگەڵتا بێ جەهەننەم جێگەتە

* * *

کە جەیشی غەم هوجوومی کرد، نیزامی عومری من تێکچوو

ئیتر مومکن نییە ئاسایشی حاڵی پەرێشانم

بینای بورجی بەدەن ڕووخا بە گوللەی حادسات ئەمڕۆ

نەما قوەت لە ئەژنۆما، بڕا پشتم، شکا شانم

کۆچی یەکجاری ئەمین فەیزی، دەوری ساڵی ١٣٤٠ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٤٣. *شعر و ادبیّات کُردی، رفیق حلمی*.

## میرزا شوکروڵای سنەیی

ناسراو بە «فَخرُالکُتّاب»[١]، کوڕی میرزا عەبدوڵلای خەتات، لە پیاوانی زانا و هێژای نیوەی یەکەمی چەرخی چاردەیە کە شیعری ڕەوان و پەخشانی جوان و خەتی خۆش بووە. بەداخەوە لە نووسراوەکانی تەنیا کتێبێکم دەس کەوت بە ناوی «*تحفەی ناصریّە*». ئەم کتێبە باس لە مێژووی میران و ڕووداوانی کوردستان دەکا و تا ساڵی ١٣١٩ ک. م. سەردەمی دەسەلاتداری «ناصرالمُلک»ی قەرەگوزلوو هاتووە و لە پێشەکیشدا، کورتەیەک باسی دۆخی جوگرافیایی ڕۆژهەلاتی کوردستان دەکا.

میرزا شوکرولا کتێبەکەی بەناوی «ناصرالمُلک»ەوە، ناوناوە؛ کە بۆخۆشی دەڵێ خەیرێکی لێ نەدیوە و پێچەوانەی ڕاستی، باسی مرۆڤایەتی و چاکەی دەگەڵ خەڵکی کردووە! جا کە کتێب تەواو دەبێ، بەرگێکی دەگەڵ خۆی بۆ تاران دەبا و پێشکەشی ناسرەدین‌شای قاجاڕی دەکا؛ بەشکوو خەلاتێکی دەسکەوێ و مەقامێکی بدرێتێ.

هاتنە دنیای«فَخرُالکُتّاب»، وەک خۆی لەو کتێبەدا نووسیویە، ساڵی ١٢٧٥ ک. م. ڕووی‌داوە و سەرەتی لاوی، دابینکار و ئینشابەندی سلێمان خانی «شَرَفُ‌المُلک» بووە و دواجار بۆ تاران چووە و خزمەتی بە میرزا عەلی‌ئەسغەر خانی ئەتابەک کردووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٤٠ ک. م. مردووە.

ئەمەش دوو نموونە لە شیعری:

ای ذات تو بر کل ممالک مالک وی راهروان راه عشقت سالک
من حمد تو از کلام تو می‌جویم اَنتَ اَلباقی و کُلُّ شیء هالک

* * *

دیگر هوای کار، من از سر به در کنم تا کی ستیزه با فلک بدسیَر کنم
تا کی کنم تملق بیجا به این و آن تا چند عُمر صرف به بُوک و مگر کنم
من پایمال غصه شدم، دوست زنده باد از مُلک او جلا به بلاد دگر کنم
دستی به دست اهل و عیال شکسته بال دست دگر برآرم و خاکی به سر کنم
چون از کلام خویش ندیدم اثر کنون این شعر خواجه آرم و ختم سمر کنم
«باید شدن به میکده گریان و دادخواه کز دست غم علاج دل آنجا مگر کنم»

*تُحفەی ناصریّە*. جونگێکی دەسنووس.

## مەقسوود ئەفەندی

زانایەکی هەڵکەوتەی تەفسیر و ئوسوول بووە کە ماوەیەکی زۆر لە تورکیادا ژیاوە و دوایی بەرەو شام چووە و

---

١. دەبێتە بابی میرزا عەبدولمەجیدی «مَجدُالمَمالک» و باپیری زانای پایەبەرز، مامۆستا عەبدولحەمیدی میهی «بدیعُ‌الزَّمانی».

هەر لەوێ دنیای بەجێهێشتووە.

**لە کتێبەکانی**:

١. «*شرحُ الشّافیه*» ٢. «*شرح کلمة التّوحید*» ٣. پەراوێز لەسەر تەفسیری «*بیضاوی*».

مەقسوود ئەفەندی تا ناوەڕاستەکانی چەرخی چاردە ژیاوە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٢٠٣.

## موحەممەد سەعیدی زەهاوی

مەلا موحەممەد سەعید ئەفەندی موفتی[1]، کوڕی مەلا موحەممەدی فەیز (موفتی زەهاوی)، ساڵی ١٢٦٨ ک. م. هاتە دنیا و خوێندنی لە بەغدا، لای بابی پایەبەرز و زانایانی تری ئەو شارە تەواو کرد و کە باوکی دنیای بەجێهێشت، جێی گرتەوە و بوو بە موفتی بەغدا. دوای هەڵپێچانی دەوڵەتی عوسمانی و سەربەخۆیی عیراق، سەرپەرشتی گشتی ئەوقافی ئەو وڵاتەی پێ سپێرا و تا دوایی ژیان (١٣٤١ ک. م.) لەسەر ئەو ئیشە بوو.

موحەممەد سەعیدی موفتی زەهاوی بێجگە پلەی بەرزی زانستی، لە باری پارێزکاری و درووستکاری و خەڵکدۆستییەوە بەناوبانگ بووە.

ژینامەی *مُفتی فیض زَهاوی*. *عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*.

## عەبدولقادری عەونی

حاجی عەبدولقادر ئەفەندی عەونی[2]، کوڕی موحەممەد عەلی ئاغا، شەرعزانێکی ئاگا و شارەزا لە هەموو زانستە عەقلی و نەقڵییەکاندا بووە و بۆ ڕاستبێژی و گفتجوانی و بە ڕاشکاوی قسە کردن، هاوتای کەمتر هەڵکەوتووە و هەموو چینێکی خەڵک ڕێزیان لێ گرتووە.

ساڵی ١٢٦٥ ک. م. لە شاری «سیورک»، لە باکووری کوردستان هاتۆتە دنیا و ماوەی پەنجا ساڵ لە مەدرەسەی فەیزییەی ئەوێ دەرسی گوتووە و جارو بار وتاری داوە و زۆرتر بە زبانی خۆی (کوردی کرمانجی) قسەی کردووە؛ ئەگەرچی ترکی و فارسیشی باش زانیوە. چەند جار لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، کاری دادوەری و پلەی موفتیگەری پێی پێشنیار کراوە؛ بەڵام نەیپەژێراوە و بایەخی پێ نەداوە. پاش ئەوەی کە قوتابخانە ئایینییەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا، کەوتوونەتە بەر بەرنامەی

---

١. باوکی زانای ناوداری بەغدا، ئەمجەد زەهاوییە.

٢. دەبێتە بابی مامۆستا موحەممەد عەلی عەونی، کە لە جێی خۆیدا باسی دەکەین.

ڕەسمییەوە، وەکوو سەرۆکی کۆڕی مامۆستایانی شاری «چرمۆک»، سێ ساڵ خزمەتی کردووە و پاش ئەو ماوە، گەڕاوەتەوە سیورک.

حاجی عەبدولقادر ڕێبازی ئەبووحەنیفەی پەیڕەوی کردووە و لە تەریقەتدا، بە ڕێگای نەقشبەندیدا چووە و لە ناو و ناوبانگ، خۆی پاراستووە و لە هەموو بارێکەوە وەلییەکی شەرعی بووە.

کۆچی دوایی ئەم مامۆستا پایەبەرزە، ساڵی ١٣٤١ ک. م. ڕووی‌داوە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٣١ و ٣٢. *الاعلام*، ب٥.

## خالیسی تاڵەبانی

شێخ موحەممەد، نازناو «خالص»، کوڕی شاعیری بەناوبانگ شێخ ڕەزای تاڵەبانی، مرۆیەکی بەڕێز و شاعیرێکی هێژا بووە کە بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە. بەداخەوە لە شیعرەکانی، بێژگە شێنێ کە ساڵی ١٣٢٦ ک. م. بە بۆنەی شەهید بوونی شێخ سەعیدی بەرزنجی (کوڕی کاک ئەحمەدی شێخ و بابی شێخ مەحموودی نەمر) هۆنیویەتەوە، شتێکی ترم دەس نەکەوت. ئەوا چەند بەیت لەو قەسیدە:

جهان بی‌مروّت را کجا با کس صفا باشد؟ — مکن باور که گردون را به جُز جور و جفا باشد

نه گردون را به کام بنده‌ای بوده است گردانی — نه زال چرخ را در دیده آزرم و حیا باشد

گهی با ابن‌مُلْجَم، شیر یزدان را زند ناوک — گهی همدست شمر اندر مصاف کربلا باشد

سر آن نوجوان را چون برید آن مرد دون‌همت؟ — که می‌دانست رویش بوسه‌گاه مصطفی باشد

سری کز عرش برتر، بسترش آغوش پیغمبر (ص) — به خاك انداختن پیش یزید این کی روا باشد؟

گذشتم ار چه شایان گذشتن نیست کردارش — پس از آن ماجرا، آخر چرا این ماجرا باشد؟

«سعید» آن پور کاك‌احمد، حفید شیخ برزنجی — به ناحق کشته و در خون خود غلطان چرا باشد؟

به قتلش تازه‌کردی ای فلك زخم دل حیدر — خدا زیر و زبر سازد تو را، کان خون‌بها باشد

بسی را کُشتی از پاکان دین ز آغاز تا فرجام — تو را آخر نباید گاه شرمی از خدا باشد؟

بریزان اشك حسرت «خالصا» از دیدگان هردم — که آل فخر عالم را ولا اندر بلا باشد

زا و مەرگی شێخ موحەممەد، سالانی ١٢٩٠ و ١٣٤١ ک. م. ڕووی‌داوە.

گۆڤاری *کۆڕی زانیاری کورد*. پێشەکی *دیوانی شێخ ڕەزا تاڵەبانی*.

## مەلا ئەحمەدی دوەیسە

عارفی ناوازە و هێژا، مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلا فەتحولا، خەڵکی گوندی «دوەیسە»ی لای سنە، مرۆیەکی پارێزکار و پیرۆز و بێ‌نیاز بووە کە بڕێک کەرامەتیشیان لێ گێڕاوەتەوە.

مەلا ئەحمەد ماوەیەکی زۆر لە ئاوایی «کوچکچەرمگ»، لە قوتابخانەی سەیدی پایەبـەرز، سـەعدەدینی «أمینُ‌السّادات»دا، دەرسی گوتووە و بەرنوێژی کـردووە و سـەرەنجام ڕۆژی شـەمبەی ٢٢ی ڕەجەبـەمـانگی ساڵی ١٣٤١ ک. م. لە دنیا چووە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ شەمسەدینی کەسنەزانی

کوڕی شێخ فەزڵوڵا، کوڕی شێخ شەریف، لە پشتی مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی مەریوانی، پیاوێکی زانا و پارسا، خەڵکی گوندی «کەسنەزان»ی سەر بە سەقز بووە کە دوای تەواو کردنی دەرس و دەور، بۆ بیارە چووە و لای قوتبی عارفان، شێخ عۆمەر زیائـەدین، تەریقـەتی نەقـشبەندی وەرگرتـووە و ماوەیـەک لـەوێ خەریکی فێربوون و بەڕێوەبردنی داب و دەستووری ئەم تەریقە بووە و کاتـێ کـە مورشـیدەکەی ئیجـازەی ئیرشادی پێ داوە، گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و باقی ژیانی بە عیبادەت و خزمەت بە خەڵـک داوەتـە سـەر و ساڵی ١٣٤٢ ک. م. لە گوندی «هەرشەل» لە باشووری کوردستان، کۆچی یەکجاری کردووە.

*عُلَماونا فی خدمة‌العلم و الدّین*، ل٢٣٤.

## مەلا عەبدوڵڵای موفتی دشی

عەللامە مەلا عەبدوڵڵا، کوڕی مەلا مەحموودی دشی، ساڵی ١٢٧٣ ک. م. لـە ئـاوایی «دشـە»ی هـەورامان هاتۆتە دنیا. هەشت‌ساڵان بووە، بابی عەمری خوای کردووە و تا تەمەنی پازدەساڵانیش، لەبـەر بـێ‌کەسـی، ئاوڕی لە خوێندن نەداوەتەوە. لەو کاتەدا شێخ موحەممەد بەهائەدینی عوسمانی نەقشبەندی، لـە هەمبـەر ئەوەوە کە بۆخۆی قوتابی مەلا مەحموود بووە و مەلا مەحموودیش مرید و موجازی باوکی پایەبەرزی (شێخ سیراجەدین)، سەرپەرشتی و ڕاهێنانی ئەگرێتە ئەستۆی خۆی و ئەینێرێتە شاری سنە و پێی دەخوێنێ.

عەبدوڵڵا لە سنەدا ماوەیەک فەقێتی دەکا و پاشان دەچێ بـۆ ئـاوایی «نۆدشـە» لـە هـەورامان، خزمـەتی عەللامەی بەناوبانگی ئەو سەردەمە، حاجی مەلا ئەحمەد و دوای ئەوەش لەسـەر ئیـزنی شـێخ بەهائـەدین، ڕێی هەولێر ئەگرێتە بەر و لای مامۆسـتای پایەبـەرز، عومـەر ئەفەنـدی، شـوێنی خوێندنەکـەی دەگـرێ و سەرەنجام ساڵی ١٢٩٩ ک. م. ئیجازە وەردەگرێ.

مەلا عەبدوڵڵا سەرەتا لە گوندی «گولـپ»، سـەرەتێک دەرس ئەیژێتـەوە؛ بـەڵام بـەهۆی گـیر و گـرفتی بنەماڵەکەی، دەگەڕێتەوە بۆ دشە و لەوێ بە هەموو توانەوە، دەرس‌گوتنەوە و ڕاهێنانی قوتابییان دەسپێدەکا.

ساڵی ١٣١٣ بە سەفەر بۆ سنە دەڕوا و گەورەپیاوانی شار، کە بە ڕادەی زانایی تێگەیشتوویی دەزانن، لێـی داوا دەکەن بمێنێتەوە و هەموو جۆرە پێداویستییەکیـشی بـۆ دابـین دەکـەن. ئـەویش داوەتی خەڵـکەکە

قبووڵ دەکا و دەبێتە مامۆستای مزگەوتی «پیرعومەر».

ساڵی ١٣٢٥ بۆ تاران ئەچێ و لەگەڵ زۆرێک لە زانایان و پیاوماقووڵانی پاتەختدا ئاشنا دەبێ و لە زۆربەی دانیشتنەکاندا، بە زمانێکی پاراو و گفتێکی جوان و ڕەوان، پێڕای قسە و باسی زانستی و ئاینیی، لای زانایانی پاتەخت، پلە و پایەی بەرز و ڕادەی هێژایی خۆی ڕادەنێ و هەر لەو سەفەرەیدا، سەرناوی موفتی پێ دەدرێ.

مەلا عەبدوڵلای موفتی کە دەگەڕێتەوە سنە، لە مەدرەسەی «دارُالاحسان»دا دەرس گوتنەوە دەسپێدەکاتەوە و تا کۆتایی ژیان، دەس لە پەرەپێدانی زانست و ڕێنوێنی خەڵک بەرنادا و سەرەنجام لە شەوی سێ‌شەممە، ٢٥ی ڕەبیعول‌ئاخری ساڵی ١٣٤٢، لە شاری سنە دەس لە ژیانی دنیا بەردەدا و تەرمەکەی، لە سەر شانی خەڵک و لەوپەڕی ڕێزدا بەڕێ دەکرێ و لە سەر زیارەتانی «تەپ شێخ حەمە سادق» دەنێژرێ.

ئەم مامۆستایە لە هەموو زانستێکی باودا، تاقانەی ڕۆژگاری خۆی بووە. بە زیرەکییەکی لە ڕادە بەدەر و بیرێکی یەکجار تیژ و گفت و زمانێکی زۆر ڕەوان و پاراو، لە وتوویژ و کێشەدا، کەس لەگەڵی دەری‌نەبردووە؛ لەگەڵ ئەوەش لەوپەڕی خاکەساری و پاکی و پارێزکاری و میواندۆستیدا ژیاوە و هێندی بیر لە ماڵ و سامانی دنیا نەکردۆتەوە. قەڵەمی، بە شیعر و پەخشان، زۆر جوان بووە و کتێب و نامیلکەیەکی زۆری نووسیوە کە لە ئاڵوگۆڕی شار و دێدا، بەشێکی فەوتاوە و ئەوی ماوە بریتییە لە:

١.کتێبێکی فارسی بە ناوی «*فرایض و مواریث*»

٢. کتێبێک لە نەحودا بە ناوی «*اَکبرّیه*»

٣. نامیلکەیەکی عەرەبی، سەلماندنی پێغەمبەریی دوایین ناردراوی خودا (د)، بە هێنانەوەی بەڵگەی ئەقڵی

٤. نامیلکەیەک لە کەلام و عەقایددا

٥. «*عەقیدە*»، هۆنراوەیەکە بە زبانی کوردی هەورامی؛ کە ئەوا بەشێکی:

هەرچی مەوجوود بۆ، ئەزەڵ تا ئەبەد — جە خەیر و جە شەڕ، جە نیک و جە بەد
خوا جە کەردەوەی ئیختیاری بۆ — خوا هەر وە قودرەت زات باری بۆ
گرد جە ڕۆی ئەزەڵ حەق مەعلووم کەردەن — یەکسەر وە ڕشتەی تەحریر ئاوەردەن
وەر جە کاینات قەڵەم بی مەئموور — جە «لَوْحُ‌المحفظ» کەردەنش مەستوور
بێ‌قەزا و قەدەر، بێ‌تەقدیر حەق — مەتاوۆ نەسیم بجمنۆ وەرەق
نەواچی وەختێ گرد وە تەقدیر بۆ — مەشیۆ ئیختیار بەستەی زەنجیر بۆ
تەکلیف و عەبدی فاییدەش نییەن — هەرچێوە کەرۆ موقەددەر بییەن
چونکە جوابت پێسە مەداوە — زەمانە نییەن وە لای خوداوە
ئەزەڵ تا ئەبەد مەعلووم بییەن لێش — کاینات یەکسەر هەرکام نە جای وێش

جــــەمێعش زانــــان، جــــەلاش ویــــەردەن | جــە دمــای زانــان، تەقــدیرش کــەردەن
عــــــیلمش موحیتــــــەن، یــــــوەن ڕوودادی | نە جەبرەن پەی وێش نــە پــەی عیبــادی
مـــەزانۆ هەرکـــەس فیکـــرش مەجمۆعـــەن | عـــــیلم تابعـــــەن، عەمــــەڵ مەتبۆعـــــەن
زەمــان مــەتبۆع ئــەر ســەد لاحیــق بــۆ | واجبــەن بِالــذّات هــەر ئــەو سـابیق بــۆ
ئینـــە کافییـــەن پـــەی ئـــەهل و فـــامی | شــەرحت گەرەکــەن، عــیلم و کــەلامی

بەشێک لە قەسیدەیەکی فارسی کە لە جوابی دۆستێکیدا نووسیویە:

چە نکهتی است معطر در این ستوده سحر | کە شد دماغ ز عطرش بری ز رنج و کـدر
زدود زنـگ ملامـت ز صـفحەی خـاطر | ربـود گـرد کـسالت ز جـسم ایـن احقـر
مگـر نـسیم صـبا بـود و امـر لیلـی شـد | کـە کـرد بـر سـر مجنـون دلفگـار گـذر
و یـا بـە مـژدەی شـیرین، بـە دیـدن فرهـاد | بــە بیــستونش فرســتاد خــسرو خــاور
بلـی بـە پرسـش ایـن بنـدەی ارادتمنـد | زبـان گـشادە بـە لطـف آن مـە بلنـداختر
سپهر مجد و جلالت، قرین حشمت و جـاه | انیس جود و سماحت، الیف فضل و هنـر
عَدوی ظلم و ستم، دوستدار عـدل و کـرم | ظهیر حُکم و حکم، همرکاب فتح و ظفـر
شبی چو صبح سعادت بـە خـواب شـد چـشمم | زهــی منــام کــە صــدرە ز یَقظَــتم بهتــر
ز خـاک پـای تـوام تـاج فخـر بـر سـر بـود | ز گــرد راە تــوام دیــدە گــشت روشــنتر
نظر بە روی توام همچو شمس و حربـا بـود | فــدای بــدر جمالــت کتــان تــن یکــسر
گهی بە لطف و مودّت، گهی بـە قهـر و عتـاب | خطـاب عالیـت از بنـدە بـرد هـوش و خبـر
چــو دیــدە بــاز گــشودم، نیــافتم رویــت | فرو دویـد ز چـشمم، ز غـصە خـون جگـر
در ایــن ملامــت و افــسوس نــاگهم قاصــد | چو جان بە جسم درآیـد، نمـود روی از در
پــس از ســتایش و اکــرام رُقعــەات خوانــدم | نـە رُقعـە بلکـە یکـی دُرج پـر ز دُرّ و گُهـر
از اینکـە شـفقت و الطـاف کـردەای اظهـار | وز آنکـە بـود گلایـە در آن بـسی مـضمر
نثـار آنْـتْ نمـودم بـە صـدق جـان و جنـان | ز شرم اینْت عرض گشت جرْم قلب و جگـر

دوو بەیتی عەرەبی، سکاڵایەک پێڕای ئاماژە بە خاڵێکی فیقهی:

یــارَبِّ أعْـضاءَ الوضُــوء عَتَقْتهـا | منْ فَضْلكَ الوافی وَ أنْـتَ الواقی
وَ الْعتقُ یَسریْ فی الفَتی یـا ذالْغنـی | فَامْــنُنْ عَلَـی الفـانی بعتْـق البـاقی

ئەم مامۆستا بەرزە، سەرەنجام شەوی سێشەمبە ٢٥ی مانگی ڕەبیعـولئـاخری ساڵـی ١٣٤٢ ک. م. لـە شاری سنە، دنیای بەجێ هێشت. خەڵکی شار بەوپەڕی ڕێزەوە، تا زیارەتانی «تـەپ شـێخ حەمـە سـادق» بەڕێیان کرد و لەوێیان ناشت.

ئەم چەند بەیتە لە قەسیدەیەکە، خوا لێ خۆشبوو شێخ حەیبەلای کاشتەری لە شینیدا گوتوویە:

ای مُفتـی اسـلام بـه خـاك ار خُفتـی — غـم نیست کـه منـزل بـه فلـك بگرفتـی
ای کـاش کـه زنـدگی نمانـدی کـس را — روزی کـه تـو تـرك زنـدگانی گفتـی
صـد رشـته ز معرفـت گـرفتیم بـه کـف — از بـس کـه گُهرهـای حقیقـت سُـفتی
بـس غنچـه ز مـشکلات علمـی هـر صبح — از ناشـئەی نـسیم تـو بـشکفتی
چـون خواجـەی بیهقـی بـه مأخَـذ قائـل — هـر مـسأله را کـه شـافعی بنهفتـی
اَفـسوس کـه شـد خـاربُن جهـل سـتَبر — رفـت آنکـه خـس و خـار جهالـت رُفْتـی
غم نیست اگر تو تـرك مـا کـردی، چـون — زی ایـزد بـی‌نیـاز رفتـی، مُفتـی!

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ نەجمەدینی مەردۆخی

کوڕی شێخ جەلالەدین، کوڕی شێخ موحەممەد وەسیمی دووەم، زانایەک لە بنەماڵەی مەردۆخییە کە پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، زیاد لە دەرس‌گوتنەوە، لە داوەری شەرعیشدا، جێ بڕوای هەمووان بووە و چەند نامیلکەی بریتی لە فتوا و باسی فیقهی لێ بەجێ ماوە.

شێخ نەجمەدینی «**حُجةُالاسلام**» لە ٩ی مانگی جیمادی‌سانی ساڵی ١٣٤٢ ک. م. لە دنیا چووە.

*تاریخچەی خاندان مردوخ.*

## مەلا سەلاحەدینی پاوە

کوڕی حاجی عەوەز، عارفێکی بێ‌نیاز بووە شوێنگری تەریقـەتی نەقـشبەندی و لـە مریـدانی شـێخ عومـەر زیائەدینی بیارێ کە ساڵی ١٣٤٢ ک. م. لە دنیا چووە.

خوا لێ خۆشبوو سەید بەهائـەدینی شەمـسی قورەیـشی بـۆ شـینی مـەلا سـەلاح شـیعرێکی درێـژی هۆنیوەتەوە کە ئەمە تەڵبژێرێکیە:

سـەر کـەرد نـە دیـدەم سـێڵاو هـۆنین — سـفیدی نامـە جـە هـوون بـێ‌ڕەنگـین
سـەودا وە جـەرگم تاسـێم بـەردەوە — زام کۆنـە و نـۆم تـازە کـەردەوە
حەسـرەتا پـەری مـەولانای دیـنم — شـای «اَشـرفُ‌الحـاج»، «صـلاح‌الـدّین»م
شـارەزای شـارای سـارای تەریقـەت — هومای هەوای ئـەوج سـەمای حەقیقـەت
ڕەوشـەنی خەڵـوەت ڕیـازەت‌کێـشان — نـوور بینـایی دیـدەی دەروێـشان
جـە سـەر ملـەی کـۆی فـەنا ویـەردە — مـەنزڵ وە تاقچـەی ڕەزای حـەق بـەردە

چەم وە سورمەی نوور لەقای حەق ڕەشتە ... دڵ مـەزەی چەشـنی عبـادەت چەشـتە
هەڵمەت پەی هیممەت مەعریفەت بەردە ... سەحرای ناهـەموار عیرفـان تـەی کـەردە
موتیـــع فـــەرمان ســـاحیبان شـــەرع ... دارای قەناعـــەت ئـــەهل تـــەقوا و وەرع
بەڵـــەد وە ئـــەوزاع عالـــەم تەقـــدیس ... دانـــا وە ڕەویـــەی تـــەعلیم و تـــەدریس
تەشـــریفش بـــەردەن پـــەی «دارُالبقـــا» ... چۆڵکەردەن حـوجرە و مزگـی و خانـەقا
یـــاران، یـــاوەران، قـــەومان و خوێـــشان ... بـدان وەسـەدا هـەرکام پـەی وێـشان
پـــاوەیی جـــە پـــاوە یانـــەش نـــەمانۆ ... بایـــەقوش نـــە دەور یانـــەش بوانـــۆ
بـای فـەنای پـاییز جـە باخـان خێـزۆ ... گـــەڵای نـــەمامان بـــێوادە ڕێـــزۆ
ســەدای شــەتاوان بــا هــەر نــەجنیۆ ... ئـاو جـە سـەر سـەراو هەوڵـی نـەکنیۆ
نەسـیم نەویـەرۆ بـا جـە سـەر بـەرزان ... نـەدۆ نـە دەمـاغ ڕایحـەی تـەرزان
ئـــێلاخنـــشینان وەفـــراو نـــەنۆشـــان ... تۆخـــدا بـــا ســـیپاڵ ماتـــەم بپۆشـــان
شەرت بـۆ تـا مەحـشەر، نـەبۆ وە تـەزویر ... بـەر نەشـۆ «حـاجیسـەلاح»م جـە ویـر
جەی دونیای بێسوود پەی وێش خاسش کەرد ... تەشریف وە جەننەت سەرای ئەبـەد بـەرد
هـــەزار و سێـــسەد، چـــل و دوو تـــەمام ... ئیحرام بەسـت حـاجی پـەی «دارُالسّلام»

*حدیقەی سُلطانی*، ل ١٣٧ تا ١٤٠.

## میرزادەی عیشقی

سـەید موحەممـەد ڕەزا مـیرزادەی عیـشقی، کـوڕی حـاجی سـەید ئـەبولقاسمی کوردسـتانی، لـە ١٢ی جیمادیئاخری ساڵی ١٣١٢ ک. م. (١٨٩٣ ز.) لە شـاری هەمـەدان هاتـە دنیـا و هـەر بـە منداڵـی چـووە مەکتەبخانە و پاشان لە مەدرەسەی ئالیانس، فارسـی و فەڕانـسەی خوێنـد و پـێش وەگـرتنی بڕوانامـە، لـە تیجارەتخانەی بازرگانێکی فەڕانسی، وەکوو وەرگێڕ دامەزرا و لە ماوەیەکی کەمدا فەڕانسەیەکی باش فێر بـوو. لەم ماوەدا جارێک لەگەڵ دەستەیەکی ئاڵمانی، سەفرێکی بۆ کوردستان ـ زێدی باب و کاڵی خۆی ـ کرد

سەرەتای یەکەم شەڕی جەهانی (١٩١٤–١٩١٨ ز.) لە هەمـەدان بـوو؛ لـەو سـەردەمە، دەفتـەرێک لـە شیعرەکانی بە ناوی «*نامەی عشقی*» بڵاو کردەوە. کە شەڕ هەڵگرسا، بـە پـشتیوانی لـە عوسمـانی و وێـڕای هەزارانی تر، لە ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە، ڕێ ئەستەمبووڵی گرتە بەر و چەند ساڵـێک لـەوێ مایـەوە و لـە لقـی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و فەلسەفە لە دارولفونوونی بابی عالیدا، وەکوو گـوێگر بەشـداری کـرد و هـەروەها ساڵی ١٣٣٦ ک. م. «*نوروزنامە*»ی هۆنییەوە و هەر لەوێ لە چاپیدا.

کە باری شەڕ گۆڕا و ئیمپراتووری عوسمانی شـکا، عیـشقی گەڕایـەوە هەمـەدان و پاشـان ڕێـی تـارانی

گرتەبەر و چەند ساڵی ئاخری ژیانی لەوێ ڕایبرد. لەو سەردەمە، گوڵۆڵەی حوکمەتی قاجارپش کەوتبووە لێژی و مەترسی سەرهەڵدانی ڕژیمێکی ملهوڕی تر، بە دەستی ڕەزاخانی سەردار سپە، هەست پێ دەکرا. عیشقی جاروبار، لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی پاتەختدا، دژی ئەم ڕەوتە، شیعر و وتاری بڵاو دەکردەوە؛ شیعری *«کفن سیاه»* و *«ایده آل مرد دهقان»*، هی ئەم کاتەیە. ماوەیەکیش خۆی ڕۆژنامەی *«قرن بیستُم»*ی بڵاو کردەوە؛ بەڵام بە حەڤدە ژمارە کۆتایی هات.

میرزادەی عیشقی لاوێکی ئازا و بەجەرگ، شاعیرێکی بەهەست و نیشتمانپەروەر و نووسەرێکی ڕۆشنبیر و خاوەن شەرەف بووە کە دیتنی بارودۆخی نالەبار و خەڵکی داماو و هەژار، گڕی تێبەرداوە و بەم بۆنەوە، شیعر و نووسراوەی یەکجار ئاورین بووە و قەڵەمی بە ڕاشکاوی و بێ کۆکردنەوە، کەسی هەڵنەبواردووە و بەتایبەت وەکوو تیرێک لە جەرگی ڕەزاخان و نۆکەرانی هەڵچەقیوە. زۆربەی شیعرەکانی باسی وەتەن و میللەت و قسەی خوێن ڕشتن و تۆڵەکردنەوەیە؛ هەروەک ناوی شیعرێکی *«عید خون»* ناوە. وتارەکانیشی لە تاران و هەمەداندا، هەر وا بوون و بۆنی خوێنی لێ دەهاتن.

کاتێ کە سەردار سپە و سەرەکوەزیر لێ بڕان قاڵی قاجار ببڕنەوە، عیشقی جارێکی تر ڕۆژنامەی *«قرن بیستُم»*ی لە چاپداوە و زۆر توند بەرهەڵستیان وێستاوە؛ بەڵام هەر ئەوە و هەر ئەو ژمارە بوو. لە بەرەبەیانی ١٢ی تیر مانگی ساڵی ١٣٠٣ ک. هـ. )١٩٦٤ ز.) دوو کەس چوونە سەری و لە ماڵەکەی خۆیدا وەبەر گوللەیان دا و لای نیوەڕۆی ئەوڕۆژە، لە نەخۆشخانەدا، گیانی پاکی، لەشی ئازراوی بەجێ هێشت. دۆستان و لاگرانی، تەرمەکەیان بە چاوی تەڕەوە بردە مزگەوتی سپەهسالار و بەیانی ئەو ڕۆژە، لەسەر دەست و شانی خەڵکێکی زۆرەوە ، تا زیارەتانی «ئیبنوبابویە» بەرێ کرا و لەوێ نێژرا.

چەند شیعری عیشقی:

صد افغان خویش را بی‌خانه دیدن — خود اندر خانەی بیگانە دیدن
سپس بیگانەی بی‌خانمان را — بە جای خویش صاحبخانه دیدن

* * *

مکش که بیهده این نقش می کشی نقاش — که خون بگریی، اگر پی بر ی بە احوالم
چه حاجت است پس از من بماند این تمثال — فلک چه کرد بە من، تا کُند بە تمثالم

* * *

من ای پیری! جوانی را نخواهم — بمیرم زندگانی را نخواهم
چو نام نیک باشد زندگی چیست — چو باقی هست فانی را نخواهم

* * *

خاکم به سر ز غُصه به سر خاک اگر کنم — خاک وطن چو رفت، چه خاکی بەسر کنم

آوخ کُلاه نیست وطن تا که از سرم | برداشتند، فکر کُلاهی دگر کنم
مرد آن بود که این کُلَهش بر سر است و من | نامردم ار که بی‌کُله آنی به سر کنم
زیر و زبر اگر نکنی خاك خصم را | ای چرخ زیر و روی تو، زیر و زبر کنم
جایی است آرزوم، اگر من به آن رسم | از روی نعش لشکر دشمن گذر کنم
بد هر چه می‌کنی بکن ای دشمن قوی | من نیز اگر قوی شوم از تو بتر کنم
من آن نیم به مرگ طبیعی شوم هلاك | وین کاسه خون به بستر راحت هدر کنم
معشوق عشقی ای وطن ای مهد عشق پاك | وی آنکه ذکر عشق تو شام و سحر کنم،
عشقت نه سرسری است که از سر به در شود | مهرت نه عارضی است که جای دگر کنم
«عشق تو در وجودم و مهر تو در دلم | با شیر اندرون شد و با جان به در کنم»

* * *

در هفت آسمانم الا یك ستاره نیست | نامی ز من به پرسنل این اداره نیست
بی‌اعتنا به هیأت کابینه‌ی فلك | گردیده‌ام که پارتیم یك ستاره نیست
بیچاره نیستم من و در فکر چاره‌ام | بیچاره آن کسی است که در فکر چاره نیست
من طفل انقلابم و جز در دهان من | پستان خون دایه‌ی این گاهواره نیست
احوال من نموده دل سنگ خاره نرم | آخر دل تو سنگ‌تر از سنگ خاره نیست
من عاشقم گواه من این قلب چاك چاك | در دست من جز این سند پاره‌پاره نیست

* * *

هزار بار مرا مرگ به از این سختی است | برای مردم بدبخت، مرگ خوشبختی است
گذشت عمر به جان‌کندن ای خدا مردم | ز دست این همه جان کندن، این چه جان‌سختی است
رسید جان به لبم، هر چه دست و پا کردم | برون نشد، دگر این مُنتهای بدبختی است
رجال ما همه دزدند و دزد بدنام است | که دزد گردنه بدنام و دزد، پاتختی است
بمیر «عشقی» ار آسایش آرزو داری | که هر که مُرد شد آسوده، زنده در سختی است

پێشەکی و دەقی *کُلّیات مصوَّر عشقی*، چاپی تاران.

## عەلی حیکمەت ئەفەندی

لە مامۆستایانی زانای دەورانی خۆی بووە لە تیرەی «سیامەنسوور»ی لای کەرکووک، کوڕی حاجی

عەبدولوەهاب، کوڕی ئیسماعیل، کوڕی مەحیەدین، کە ساڵی ١٢٦٠ ک. م. لە کەرکووک هاتۆتە دنیا[1] و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکردووە و دوایی بۆ کۆیە چووە و لای زانای بەرێز، حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادە، ماوەیەکی تر خوێندوویە و ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە کەرکووک.

حیکمەت لە مەنتیق و فەلسەفە و کەلام و ڕیازی و تەنانەت سروشت و جوگرافی و میژوودا مامۆستا بووە و بە بۆنەی شارەزایی لە حیکمەت و فەلسەفەدا، ناوی «حیکمەت»ی پێ دراوە.

عەلی حیکمەت لە کەرکووک سەرەتێک لە مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغا و چەلێک لە خانەقای سەید ئەحمەد و ماوەیەک لە مەدرەسەی مەیدان، قوتابییانی بارهێناوە و لە ماوەی ژیانیدا سەرجەم، دەوری حەفتا فەقێی پێگەیاندووە و ئیجازە داوە.

**لە نووسراوەکانی**: پەراوێز بۆ: *«شرح مطالع»*، *«شرح مواقف»*، *«شرح تجرید»*ی شێخی تووسی و *«فناری منطق»*.

ئەم مامۆستایە جگە لە کوردی، فارسی و عەرەبی، ترکیشی زانیوە و جار ـــ جار شیعریشی گوتووە و سەردەمێکیش دادوەری کردووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٤٣ یان ١٣٤٨ ک. م. لە شاری کەکووک دنیای بەجێهێشتووە.

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س١٩٤٥ ز. ل٤١ و ٤٢. ل٤٠٣. *عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل٤٠٣.

## شێخ عەبدوڵلای فەیزی

خەڵکی ناوچەی مووش، لە باکووری کوردستان، لە نیوەی یەکەمی چەرخی چاردە لە ئەستەمبووڵدا ژیاوە و پیاوێکی زانا، وێژەوان و شاعیر بووە و بە کوردی کرمانجی و عەرەبی شیعری گوتووە.

فەیزی سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی بووە و بە شەو و ڕۆژ، بەشێک دەرسی گوتووە و کتێبانی خوێندۆتەوە و بەشێکیش عیبادەتی کردووە و داب و دەستووری تەریقەتی بەجێهێناوە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٤٨.

## شوکری فەزلی

زانا و وێژەوانێکی کوردی نێشتەجێی بەغدا بووە کە زیاد لە کوردی و عەرەبی، فارسی و ترکیشی باش زانیوە و چۆتە نێو کاری دەوڵەتییەوە و بۆ چەند ڕۆژنامەی عیراق وتاری نووسیوە و ساڵی ١٣٤١ ک. م. بۆتە سەرپەرشتی نووسینگەی سەرەکوەزیریی عیراق و تا دوایین ساڵی ژیان (١٣٤٤)، ئەو کارەی لە

---

١. نووسەری کتێبی *«عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین»*، دەوری ساڵی ١٢٧٥ی نووسیوە.

ئەستۆ بووە.

**لە کتێبەکانی**: ١. *«تاریخ عراق از ادوار باستانی تا قرن چهاردهم»* ٢. *«مکتبة‌الفضلی»*، لە زانستە جۆراوجۆرەکاندا.

شوکری شیعریشی گوتووە و هێندێک شیعری عەرەبی و فارسی و ترکی و کردی لێ بەجێماوە.

*الاعلام*، ب٣، ل ٢٥١.

## مەجدی «مَلِکُ‌الکلام»

میرزا عەبدولمەجید، نازناو «مەجدی» و کەسناو «مَلِکُ‌الکلام»، کوڕی میرزا کەریم، کوڕی میرزا ڕەجەب، کوڕی شێخە بەگ، لە زنجیرەی بەناوبانگی «امیر اختیارالدینی»یە کە هەر لەمێژەوە تا ساڵی ١٣٠٩ ک. م. حوکمەتی بانەیان بەدەستەوە بووە.

مەجدی لە ئەستێرە درەوشانەکانی ئاسمانی زانست و وێژەوانییە کە ساڵی ١٢٦٨ ک. م. لە شاری سەقز هاتە دنیا و هەر لەوێش خوێندی و بەهۆی زیرەکی و لێهاتوویی سرشتییەوە، لە ماوەیەکی کەمدا، ناوی و ناوبانگی شیعر و پەخشانی، هەموو کۆڕێکی وێژەوانی ئەودەورانەی وڵاتەکەی گرتەبەر.

عەبدولمەجید تازەلاو بوو، بابی عەمری خوای کرد. هێندێک لەودوا بۆ خوێندن، کەوتە گەڕان بە شارانی ئێراندا و سنە و کرماشان و هەمەدان و تەبریز و تاران و ئەسفەهانی بینی و لە هەرکام لەو شارانە، خزمەتی زانایان و وێژەوانایان گەیشت. پاش ماوەیەک ئەمجار بە ماڵەوە چوو بۆ سنە و بوو بە مونشی حاجی «ظفرُالمُلک»ی ئەردەڵان. ساڵی ١٣٠٦ ک. م. حەجی کرد و کە گەڕاوە، سەپەرشتی نووسینگەی حوکمەتی گرتە ئەستۆ. ئەم کارەی لە دەورانی دەسەڵاتی حەسەنعەلی خان «امیرنظام»ی گەڕووسی، ساڵی ١٣٠٩ و هەروەها ئەولقاسم خان «ناصرالمُلک»ی قەرەگوزلوودا هەر هەبوو. لەم ساڵانەدا لە لایەن دەوڵەتەوە، خەڵات کرا و کەسناوی «مَلِکُ‌الکلام»ی پێ درا.

«مَلِکُ‌الکلام» دەوری ساڵی ١٣٣٠ ک. م. بەو نیازە کە منداڵانی لە شوێنێکی گەورەتردا گەشە بکەن و دنیا باشتر بناسن، کۆچی کرد بۆ تاران و دەیویست لەوێوە بۆ ئورووپا بچێ، کە یەکەم شەڕی جیهانی قەوما و تازە لە تاران مایەوە. بۆخۆی پێڕای قەسیدەیەک، هۆی ئەم کۆچ و بارەی باس کردووە:

مرا دوازده طفلند زیرک و دانا ... کە هر یکی بە مثل یوسفند و من یعقوب
بە سوی قاهرە و لندنم بباید شد ... برای تربیت کودکان زروی وجوب

**واتا**: ئەمن دوازدە منداڵی زیرەک و زانام هەیە؛ هەرکام بۆم وەکوو یۆسفێک و من یەعقووبیان. بۆ ڕاهێنانیان ناچارم ڕوو لە قاهیرە و لەندن بکەم.

لە تاراندا، تا دوامین ڕۆژەکانی ژیانی، بە خوێندن و توژینەوە و کڕوکاش و نووسین و بەهرەگەیاندنی



ڕابوارد. ئەوی تەنیا لە شیعر لێی بەجێ‌ماوە، پتر لە سەدهەزار بەیتە؛ کە بەداخەوە تەنیا دەفتەرێکی گچکـەی لێ چاپ کراوە. دیوانی مەجدی پڕە لـە بابـەتی جۆراوجـۆری ویژەیـێ، کۆمەڵـگایی، مێژوویـی، زانـستی و تەنانەت گەپ و گاڵتە کە بە هەموو شێوەیەکی وەک: قەسیدە و غەزەل (عیشقی و عیرفانی) و مەسـنەوی و تەرجیع و چوارینە، بەرگی شیعری دەبەر کردووە.

**بەرهەمە پەخشانەکانی بریتین لە**: «سفرنامەی حجاز»، «مقّالات»، «مُنـشآت»، نامیلکەی جۆراوجۆری خواناسی و تاکەپەرستی و عیرفان و مۆچیاری و لێکۆڵینەوەی ژیرانەیە.

شاعیرێک لە باسیدا گوتوویە:

| | |
|---|---|
| گَنج پنـهـانـی بـود دیـوان مَـجـدی، لاجـرم | تا نگردد آشـکارا کـس نمـی‌دانـد کـه چیـست |
| نیـست پیـغـمبـر ولی از هـمَّـت روح‌القُـدُس | نظم و نثرش در فصاحت تالی نـصٍّ جلـی اسـت |

**واتا**: دیوانی مەجدی، گەنجینەیەکی شاراوەیە و تا دەرنەکـەوێ، کـەس چوزانـێ چـی تێدایـە. ڕاسـتە پێغەمبەر نییە، بەڵام لە هیممەتی جوبراییل، شیعر و پەخشانی شوێنگری دەقی قورئانە.

«مَلکُ‌الکلام» پێڕای ئەوە کە بێ شک یەک لە پیتۆڵانی بواری ویژە و زانستی چەرخی ڕابـردوو بـووە، لـە باری خەڵک‌دۆستی و خێرخوازی و ئاکاری بەرز و کردەوەی شیاو و ڕووی خۆشیـشەوە، هەڵـکەوتووی نـاو زانایان و مامۆستایانی ئەوسەردەمە هاتۆتە ئەژمار.

حەسەن‌عەلی خان «امیرنظام»ی گەڕووسی ـ کە خۆیشی پیاوێکی ویژەوان و زانای بە هـەموو مانـا بـووە ـ لەمەر مامۆستا مەجدییەوە، ئاوای گوتووە: «ایالت کردستان به مثل شما مُنـشی و ادیـب دانـشمندی، بـر ایـالات دیگر شرف دارد».

**واتا**: ولاتی کوردستان بە مونشییەکی ویژەوان و زانا وەک ئێوەوە، لە باقی وڵاتان سەرە.

ڕەحمەتی موحەممەد حوسەین خانی فورووغی «ذکاءالمُلـک»، لـە جـوابی نامەیەکیـدا نووسـیویە: «آیات بیّنات فضل و هنر، یعنی غُرَر دُر رُخامەی مُشکین آمەی حکمت‌اَثر را نامە نبود؛ شفای بیمار بـود و معجزه و کرامَت نمود. جواب آنچنان مکتوب، به همان سیاقِ بدیع و اُسلوب مرغوب، کار حضرت فیـل است و صاحب و صابی در این پهنه میـدان، مقهـور و ذلیـل. مـا سپر انـداختیم و تـسلیم شـدیم؛ از روی حقیقت نه از راه فروتنی ...».

**بە کورتی یانی**: ئەو نامەی تۆ نووسیوتە، هێند جوان و ڕازاوە و بەقەوەتە، جوابی بۆ من نادرێتەوە!

جارێک «اَدیبُ‌الممالـک»ی فەراهانی لە ئەسپ ئەکەوێ و دەستی دەشـکێ. مەجـدی ئـەم دوو بەیتـەی بـۆ دەنێرێ:

| | |
|---|---|
| چون یافـت سـپهر دون بـر آزار تـو دسـت | هم دست تو را شکست و هم روی تـو خَـست |
| بـر بَـست در عـیش بـه روی مـن از آنـک | نـه دسـت تـو را، دل مـرا هـم بشکـست |

«اَدیبُ‌الممالك» لە جوابیدا نامەیەک دەنووسێ؛ کە ئەمە دوو ڕستەی: «قول دادەام جواب شعر جنابعالی را بدهم هرچند در این میدان فَرَسی خَشبی و قَمَری نَخْشبی است. واقعاً از مجارات و استقبال ابیات جنابعالی استعفا دادم کە: لمْ یُدْرِكِ الظّائعُ شَأوَ الضَّلیع».

**بە کورتی یانی**: بڕیارم داوە جوابی شیعرەکەتان بدەمەوە؛ بەڵام چاری کەڵەگەت بە لاواز ناکرێ.

«مَلِكُ‌الکلام»ی مەجدی سەرەنجام ڕۆژی سێشەممبە، ٢٦ی زیقەعدەی ١٣٤٤ ک. م. (١٩٢٦ ز.)، لە تەمەنی ٧٥ ساڵاندا، دنیای بەجێ‌هێشت و لە زیارەتانی «آب‌انبار قاسم خان»ی تاراندا نێژرا.

**چەند نموونە لە شیعری مەجدی**:

**کوردی سۆرانی**:

لە دوولا زوڵفی لەو لاوە لە سەروی قامەت ئالاوە ‌ ‌ ‌ خەم و پێچی هەموو داوە، چ لەم‌لاوە چ لەولاوە
موژەی وەک نێشی پەیکانە، هەمیشە کاری پێکانە ‌ ‌ ‌ دڵی هەر خوێش و بێگانە بە ئەم پەیکانە، پێکاوە
لە جەوری غەمزەکانی تۆ کە بێچارەکوژە و جادوو ‌ ‌ ‌ چ خوێنێ بوو، چە جەرگێ بوو کە نەڕژاوە و نەبرژاوە
سەبا بێنێ ئەگەر بێنێ لە زوڵفت دین و دڵ دێنێ ‌ ‌ ‌ وەلیکن کەی دڵ و دینێ لەبۆ عوششاقی تۆ ماوە؟
نە یاقووتە کە دەیبینی لە نێوی کان بە ڕەنگینی ‌ ‌ ‌ لە ڕەشکی لێوی تۆ خوێنی دڵی کانە کە گرساوە
لە داوی تورڕەیی پەرچەم دڵی ئاشوفتە ناکا ڕەم ‌ ‌ ‌ کە ئازادی لە قەیدی غەم خودا لەم داوە پێداوە
وەرە بەڵکەم نەجاتم دەی لە مەوجی قولزمی بێ‌پەی ‌ ‌ ‌ لە «مەجدی» غافڵی تاکەی؟ کە بێ‌تۆ غەرقی گێژاوە

**غەزەلێکی فارسی**:

چو ذات پاك تو را عقل در نیافت کماهی ‌ ‌ ‌ تو را چه داند؟ چون من جَهول ساهی و لاهی
زهی کە سیر خرد در سرادقات جلالت ‌ ‌ ‌ نموّ موی بود در فضای نامتناهی
فضای نامتناهی کجا و موی ضعیفی ‌ ‌ ‌ کە غایتش دو سە گز در دمیدن است و تباهی
همه تو بینم، وین طُرفە کز منی تو نهفتە ‌ ‌ ‌ ندانمت کە از این غیبت و حضور چه خواهی؟
ندید ماهی ز اب محیط هیچ نشانی ‌ ‌ ‌ نبیند ار چە جز آب محیط دیدەی ماهی
چە قطرەای است کە بر قدرت تو نیست دلیلی ‌ ‌ ‌ چە ذرّەای است کە بر ذات تو نداده گواهی
زبان حاجتم از عجز بستە است و ندانم ‌ ‌ ‌ جز اینکه گویمت از روی اضطراب، الهی!
زبان حال من از تو کند سؤال کە یارب! ‌ ‌ ‌ حَلال ده چو مَرا بازداشتی ز مناهی
کسان بە جاه و حشم فخر می‌کنند و لیکن ‌ ‌ ‌ اسیر حُکم تو «مجدی» بە فضل تُست مباهی

**چوارینە**:

ای گشتە دم مسیح وقف دهنت ‌ ‌ ‌ از جان فرشتە آفریدند تنت
از غایت ناز کی خَراشد بدنت ‌ ‌ ‌ سازند اگر ز بوی گل پیرهنت

ای بَس که به خون تپیدم از دیدەی خویش نادیده کس آنچه دیدم از دیـدەی خـویش
چـون شـمع شـب فراقـت از سـر تـا پـای بگـداختم و چکیـدم از دیـدەی خـویش

* * *

ای رفتــه بــه سـیر بـرگ‌ریـزان رزان جان از لـب تـو بـه حسرت انگشت‌گـزان
هرگــــز نــــشنیدیم و ندیــــدیم، رود غیـر از تـو بهـاری بـه تماشـای خـزان

* * *

ای زُلـف تـو چـون مـشک تتـاری، تـاری چون جان و خرد ز عیـب و عـاری، عـاری
انـدر دل مـن کـه مـزرع مهـر و وفاسـت از نـاوک غمـزه رخـم کـاری، کـاری

*دیوان مَجدی*، چاپی تاران، گوڤاری *ماد*، چاپی تاران، ١٣٢٤ ک. ھ. ژ١ و ٢.

## تاهیر فوئاد

شێخ تاهیر، نازناو «فوئاد»، کوڕی شێخ لەتیفی بەیدری، لە زنجیرە سەیدەکانی بەرزنجـە، ساڵـی ١٣١٠ ک. م. لە شاری کەرکووک هاتە دنیا و کە پێگەیـشت، لای شـێخ موحەممـەدی بەیـدری و عـەلی حیکمـەت ئەفەندی سیامەنسووری خوێندی؛ بەڵام لە نیوەچڵی خوێندندا، یەکەم شـەڕی دنیـاگر قـەوما و تـاهیریش وەکوو زۆر لاوی تر، ناردرا بۆ شەڕ و دوای ساڵێک دووری لە نیشتمان، گەڕاوە کەرکووک و تا کۆتـایی شـەڕ، لە گوندەکانی سەید ئەحمەدی خانەقادا ژیانی بردەسەر و ساڵی ١٣٤١ ک. م. ژنی خواست.

تاهیر فوئاد مرۆیەکی خۆش‌زەوق، ئەدەب‌دۆست و تێکەڵی خەڵک بووە و لـە ماڵـەکەیدا لـە کـەرکووک، ژوورێکی وەکوو کتێبخانە، بۆ شاعیران و نووسەران تـەرخان کـردووە و هـەموو ڕۆژێ ئـەو خێـڵە تێـدا کـۆ بوونەتەوە و قسە و باسی جۆراوجۆریان کردووە و کەسێ شیعر یان نووسـراوەیەکی تـازەی بووبـێ، بـۆ بـاقی خوێندووتەوە.

فوئاد زیاد لە کوردی و عەرەبی، فارسی و ترکیشی زانیوە و بەم دوو زبانـەش شـیعری گوتـووە. بەشـێکی دیوانەکەی، مامۆستای هێژا، گیوی موکوریانی، ساڵی ١٣٨٩ ک. م. لە چاپخانـەی کوردسـتان لـە هـەولێر، چاپی کرد.

وەک مامۆستا گیو لە لاپەڕەی ٧٩ی دیوانەکەی تاهیر فوئاددا دەڵێ، کاتی چاپی ئەو کتێبـە، واتـا ساڵـی ١٣٨٩ ک. م. ٤٥ ساڵ بووە کە شاعیرەکەی لە دنیا چووە. بەم حیسابە تاهیر فوئاد دەبێ ساڵـی ١٣٤٤ ک. م. مردبێ؛ کە تەمەنی دەوری ٣٥ ساڵ بووە و بە جوانی ژیانی کۆتایی هاتووە.

تاهیر فوئاد بە بۆنەی هەڵبوونی ئاوری یەکەم شەڕی جیهانییەوە، قەسیدەیەکی دورودرێـژی گوتـووە کـە ئەوا چەند بەیتی:

وەهە وەهە! لەم ئاگرەی کە لە دونیا کرایەوە
ئەم داوی فتنەیە کە بۆ عالەم نرایەوە

دەرگای ڕاحەت و تەرەب و ئەمن داخرا
ئاشووب و دەرد و حادسە دەرگەی کرایەوە

سەمتووری بەزمی عشرەتی یاران لە نەغمە کەوت
مەجلس بەتاڵ و سوحبەتی یاران بڕایەوە

ئەو مەنزەرەی سەفا و سوروورەی کە دیتمان
وەک پەردەیی تەیاترۆ زوو دادڕایەوە

هەر عەیش و نۆش و شادی و دڵخۆشیێ کە بوو
بەم میحنەت و فەلاکەت و دەردە درایەوە

لاڵ بم کە نەقشی شێوەیی میهر و وەفا «فوئاد»
وەک ناوی تۆ لە سینەیی عالەم سڕایەوە

**ئاوێنەی حەقیقەت**:

وەرە ئەی دڵ هەتا شەمعی حەواست پەرتەوی ماوە
بە غەفڵەت فەیزی هۆشت دامەنێ فرسەت کە یەکتاوە

ئەگەر فیعلت لە مەیدانا نییە قەولت لە کارا بێ
عەمەڵ گەر غەیرمومکن بوو، نەزەر ڕێگەی نەبەسراوە

لە بەزمی زندەگیدا مفتە گوفتار و تەماشایی
زمان تا بەندی نەپساوە، چرای دیدە نەکوژراوە

لە خوار و ژووری ئەم دونیایە دققەت کە بزانی تا
زەمین بۆ وا زکی داوە، فەڵەک بۆ پشتی کۆماوە؟

لە کونجی عالەمی تەجرید و تەوحیدا تەئەممول کە
لە بۆچی جوزء و کول تەعبیری دوو تۆیە کە یەکداوە

بە دوربینی خیرەد سەیرێکی ئەجرامی سەماوی کە
بزانە دەستی سونعی حەق چ تەرتیبێکی داناوە

بە ئیمعانی نەزەر ئەوزاعی ئەم جیرمانە بڕوانە
کە خوا هەر یەک بە حکمەت قودرەتێکی خاسی پێداوە

فەزایی ئەم جیهانە وا بە تاڵی تێ مەگە هەرچی،
لە عەرسەی کایناتایە بە بێهوودە نەخولقاوە

لە تەختی خاکەوە تا سەتحی ئەفلاک هەرچی تێدایە
هەموو فەردێ وەزیفە و ڕێگەیەکی پێ سپێراوە

موعەماییێکە ئەم کەونە کە هەر نوقتەی تەماشا کەی
لە هەر جوزئێکیا سیرڕی هەزاران نوکتە شاراوە

هەتا لێ ورد ئەبی ئەرواحە تا دەڕوانی ئەجسامە
نە کەس ئەنواعی زانیوە، نە ئەقسامی ژمێراوە

نە حەدد و عەددی مەعلوومە، نە ئاغاز و نە ئەنجامی
گەلێ ئەهلی فنوون بەم داخەوە هەروا سەری ناوە

حەکیمانێ کە وا شەمسی زوکا تیمسالی حیسیانە
لە کەشفا غەیری حەیرەت زەڕڕەیەکیان بۆ نەبینراوە

کەوابێ لافی دانایی گەزافە، جەهلە بۆ ئێمە
کە خالیق هەر مەگەر بۆخۆی بزانێ چی بینا ناوە

بەنیئادەم کە پایەی عەقڵ و نوتقی پێ بەخشراوە
بە لوتفی سوورەت و حوسنی تەبیعەت هەڵبژێراوە

* * *

بە خودبینی وەها ئەسپی غورووری خوەت مەکە پڕتاو
کە ئەم مەیدانە زۆر سواری وەکوو تۆ تاوی لێداوە

مەکێشە ڕەنجی خۆڕایی لەگەڵ ئەم کەیدی دنیایە
عەبەس تەعمیری سەربانی مەکە، دیواری ڕووخاوە

لە یەک لاوە زیاعی وەخت و لایێ بێسوباتی عومر
لە هەر دوو لایەوە هەریەک برینێکە دەمی داوە

قەناعەت موشکڵە و حرسیش دەوای نایێ چییە تەدبیر؟
هەموو ئەربابی عەقڵ و فەن سەری لەم کارە شێواوە

بە چاکی بێ و خەراپی زندەگی دەڕواتە سەر ئەمما
جەفایی تەعنەیی لائیم لە ئینسان ئیشی تێکداوە

ئەگەر قانع بە هیچـی پێـت ئـەڵـێن بێکارەیـە و دوونـە
ئەگەر سەعییش لە کەسبا کەی دەڵێن دینی بە لا نـاوە
بـەلا زۆر و بـەدەن بـێتاقـەت و ژینـیش وەهـا ناسـک
دڵی سەرگەشتە چی بکا لەم هـەموو دەردە کـە ئـاڵاوە

دیوانی *تاهیر فوئاد*، چاپی هەولێر، ١٩٦٩ ز.

## شەریعەتمەداری سنەیی

شێخ موحەممەد ئەمین، کەسناو «شەریعەتمەدار»، کوڕی حاجی شێخ موحەممەدی «حافی» سمێرانی ـکە لە پێشتر باسیمان کرد ـ پیاوێکی زانا بووە، لە گوندی «سمێران» لە باشووری سنە هاتۆتـە دنیـا و پاشـان بـۆ سنە کۆچی کردووە و لە مزگەوتێک کە دوایی بە ناوی خۆیەوە ناسراوە، دەرسیداوە و دەوری ساڵـی ١٣٤٥ ک. م. لە دنیا چووە.

ڕەحمەتی شەریعەتمەدار پیاوێکی عارفی سەر بە تەریقەتی نەقشبەندییە. ساڵی ١٣٠٢ سـەفـەرێکی بـۆ تاران کردووە و چۆن بووە، تا ساڵی ١٣٠٦ لەوێ ماوەتەوە و پاشان گەڕاوەتەوە سنە. لەو ماوەدا کە لـە تـاران بووە، کتێبێک بە ناوی «رياضُ‌المَعصومين»ی لـەمـەڕ شـان و شـکۆی ئیمامـان و یـارانی پێغەمبـەرەوە (د) نووسیوە. شێخ جگە لەم کتێبە، لە باسی فیقهـ و بڕواشدا نووسراوەی هەیە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## فوئاد فێسچیزادە

شەهیدی ڕێبازی ئازادی ، دوکتور فوئاد، کوڕی حوسەینبەگی فێـسچیزادە، خەڵـکی دیاربـەکر، یـەک لـە هەزارانێکە وا بۆ ئازادی زمان و بیر و قەڵەم تێکۆشا و بەرامبەر بە دەزگای ملهوڕ و دژ بە ئینسانی عوسمـانی ڕاوەستا و گیانی لە پێناوی ئامانجە بەرزەکەیدا دانا.

دوکتور فوئاد پیاوێکی زانا بوو کە حوقۆقی خوێندبوو؛ زۆر جوانی دەنووسی و بۆ ڕزگاری گەلەکەی لە ژێـر باری نالەباری ناحەقی و زۆربێژی، لە ناو و دەرەوەی وڵاتدا، زۆری حـەول دا و سـەرەنجام لـە ساڵـی ١٣٤٥ ک. م. (١٩٢٦ ز.)، بە دەستی داگیرکەرانی نیشتمانەکەی، بە سێدارە شەهید کرا.

مامۆستا قانیع، شاعیری بەناوبانگ، لەم بارەوە ئێژێ:

ئەی دوکتـور فوئـاد! ئـەی شـێری نـەمر!
هـەتا قیامـەت بـۆ کـورد کەڵـکگـر
نـەمردووی، نـامری، نەخـشی دڵـمانی
ئێمـە بولبوڵـین تـۆ هـەم گوڵـمانی
سەرتەقەکێـشی، نیـشتمانپـەروەری
لاوی دلێـری، کـانی جەوهـەری
هەرچەنـد کـە ئێـستە لاشـەت پەنهانـە
زەخـیرە و مێـژووی بـو ئـەم زەمانـە
قارەمـانی گـەل! شـێری ڕۆی مەیـدان!
ئـاخر لەسـەرچی وا تۆیـان خنکـان؟

بۆیـــێ وا تۆیـــان هەڵکێـــشا بـــە دار
کــە هەوڵــت ئــەدا بــۆ چــینی هــەژار

کۆشـــشت ئـــەکرد لـــە دەورەی دەوران
ئــەتوت ئــازاد بــن گــەلی بــێدەســتان

ســووچت ئــەوە بــوو کــە ئــەتوت کــوردم
کوردی بـە نـاමووس بـە دەسـت و بـردم

سووچت ئەوە بـوو فـەرمووت نیـشتمانیم
بیـــشمخنکێنن، هـــەر کوردســـانیم

سووچت ئەوە بـوو دوژمـن هـۆز نـەبووی
سووچت ئەوە بوو جاسووس کۆز نـەبووی

ئـاخر بـۆ کـوژرای؟ هەسـێرەی کـوردان
چـــرای ڕوونـــاکی هەناســـەســـەردان

تۆ هەرگیز نامری هـەر لـە پـێش چـاوی
لـــە مێژوومانـــا خـــاوەنی نـــاوی

تـۆهـەرگیز نـامری قوربـانی کـوردان!
ڕوونـــاکی دڵـــی وێـــڵی بـــنبـــەردان

تـــۆ هـــەرگیز نـــامری لاوی نیـــشتمانی
لـــە دڵ دەرنـــاچی تـــۆ بـــە ئاســـانی

ڕۆحـت بێـدار بـێ کـە گـەل هۆشـیارن
ئێـسته چـاو بـازن، چـاک خوێنـدەوارن

تـازە بـە پـارە ناخـڵەتێن بـۆ کـەس
ڕێگـای ڕزگـاری بـەر نـادەن لـە دەس

وەهـا نـەزانی کـە ئێـستەش کاسـن
دوژمـــنی خوەیـــان زۆر بـــاش ئەناســـن

چ لادێ، چ شـار، خـەریک هـاتوچـوون
خـــەریک وەرگـــرتن حـــەیا و ئابـــڕوون

کچـان دەسئـەگرن بـە دەس برایـان
ئەســـــووڕێنەوە لـــــە دووی هیوایـــــان

دەڵێن کاتێ کە دوکتوریان بۆ پای سێدارە دەبرد، بۆ دوایین جار داوایان لێ کرد لـە کـورد بـوونی خـۆی حاشا بکا. ئەو لە وەرامدا، بە دەنگی بەرز شیعرێکی ترکی خوێندەوە کـە دەڵـێ: «کـێ دەتوانـێ بەهەشـتی کوردستان لە بەرچاوی من بخا؟ ئەو ئاو و خاکە، میراتی باب و کاڵی منە. بە هەموو گیانەوە تێدەکۆشـم لـە داگیرکەرانی بستێنمەوە».

هێشتا شیعرەکەی تەواو نەکردبوو، ژێری پێیان کێشاوە.

بەندی چوارەمی *دیوانی قانیع (شاخی هەورامان)*، چاپی بەغدا، ل ٨٧ و ٨٨. یاداشـتەکانی نووسـەر.

## مەلا موحەممەدی مەولانا

کوڕی مەلا عارف، کوڕی عەللامە حاجی ئەحمەدی نۆدشی، مەشهوور بە «حـاجی مامۆسـا» و لـە زانایـان و مامۆستایانی ناوداری شاری سنە بووە کە لە قسەزانی و ڕاستبێژی و زەبری زماندا، نـاویدەرکـردووە. دوای کۆچی دوایی بابی، تا بووە (ساڵی ١٣٥٤)، لە مزگەوتێکدا کە بە ناوی ئەو بنەماڵەوە، مزگەوتی «مەولانا»ی پێ دەڵێن، دەرسی گوتۆتەوە.

**لە کتێبەکانی**: «*تُحَفَةُ الابرار فی حُرمةِالتَّربی بزِیِّ الکُفّار*».

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ شەمسەدینی حوسەینی

کوڕی عارفی پایەبەرز، حاجی شێخ ڕەزا، لە سەیدە ڕەسەنەکانی گوندی «لۆن سادات»ی ناوچەی بێلەوار، مرۆیەکی بێنیاز و هێژا، ئاکار بەرز و بەرزەمژ بووە و ساڵی ١٣١٠ ک. م. دوای کۆچی دوایی بابی، سەرۆکیی سادات و بەڕێوەبردنی مزگەوت و قوتابخانەی لۆنی گرتۆتە ئەستۆی خۆی و سەبارەت بە بارودۆخی قوتابخانە و فەقێیان، جەخت و بەختێکی زۆری کردووە؛ بە شێوەیەک کە لە دەورانی ئەودا، ژماری قوتابییان گەیشتۆتە دەوری ١٢٠ کەس.

شێخ شەمسەدین شوێنگری تەریقەتی نەقشبەندی و ئەهلی سەیر و سولووک بووە و هەموو چینێکی خەڵک ڕێز و حورمەتێکی تایبەتیان لێ گرتووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٤٦ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

تاریخچەی سادات لۆن.

## مەلا موحەممەد سەعیدی عوبەیدی

مەلا موحەممەد سەعید، کوڕی ئەحمەد، کوڕی فەتاح، ساڵی ١٣٠٠ ک. م. لە ئاوایی «عەبابەیلێ» هاتە دنیا و کە پێگەییشت و خوێندنەوە و نووسین و وانە سەرەتاییەکان فێر بوو، ماوەیەک لە هەڵەبجە خوێندی و ئەوجار چوو بۆ کەرکووک و دوو ساڵ لە خزمەتی عەلی حیکمەت ئەفەندی، مەنتیق و ڕیازی خوێند و پاشان ڕووی لە بیارە کرد و لە کۆڕی دەرسی مامۆستای پایەبەرز، مەلا قادری کانیکەوەیی، ماوەیەک بەهرەی برد و سەرەنجام ئیجازەی لێ وەرگرت. بە شوێن ئەوەدا گەڕاوە زێدی خۆی و تا دواساڵی ژیان (١٣٤٦ ک. م.) دەرسیگوتەوە و قوتابییەکی زۆر لە بەردەستیدا پێگەییشتن؛ یەک لەوانە، زانای بەڕێز، مەلا کەریمی مودەڕڕیس، مامۆستای ئێستای ئەعزەمییەی بەغدایە کە لە ساڵانی ١٣٣٩ و ١٣٤١ک. م. لە خزمەتی بەهرەی بردووە.

مەلا موحەممەد سەعیدی عوبەیدی مرۆیەکی خاکەسار و بێ دەمار، گۆشەگر و بێنیاز، سۆفی مەشرەب و خاوەن ئاکاری بەرز بووە کە کاسبی کردووە و بەوە ژیاوە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ٥٥٠ و ٥٥١.

## شێخ لەتیفی قازی

کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ لەتیفی سێهەم، کوڕی شێخ عەبدوڵڵا، کوڕی شێخ عوسمان، کوڕی شێخ لەتیفی دووهەم (کەبیر)، کوڕی شێخ مەعروف، کوڕی شێخ لەتیفی ئەوەڵ، لە شێخانی مەردۆخی قەرەداغە کە

دەوری ساڵانی ١٢٩٠ ک. م. لە هەڵەبجە هاتۆتە دنیا و پاش ماوەیەک خوێندن لای بابی، چۆتە بیارە لە خزمەتی مەلا قادری کانی‌کەوەیی ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە هەڵەبجە و دوای ئەوە باوکی کۆچی یەکجاری کردووە، دەرس‌گوتنەوە لە قوتابخانەکەیدا وە ئەستۆ گرتووە و کە ئاگری یەکەم شەڕی دنیاگر دامرکاوە، دادوەری دیوانی شەرعی هەڵەبجەشی پێ سپێراوە و سەرەنجام لە ساڵی ١٣٤٦ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

شێخ لەتیف مرۆیەکی هێژا، خۆپارێز و بێ‌نیاز بووە و هێندێک نووسراوەشی لێ بەجێ‌ماوە.

*عُلَماونا فی خدمة‌العلمِ و الدّین*، ل٣٦٧.

## شێخ عارفی شەهبازی

حاجی شێخ عارف، جێگری خوا لێ خۆشبوو حاجی شێخ شوکروڵای سنەیی، پیاوێکی عارف و هێژا بووە کە لە سێبەری بابی ئاکاربەرزیدا ڕاهاتووە و هەر لە سەرەتای لاوی و تافی هەرزەکارییەوە، لەگەڵ ڕێڕەوان و مریدانی خانەقای باوکیدا دانیشتووە و ئاودەنگ بووە و دواجار خزمەتی قوتبی تەریقەت، شێخ عەلی حوسامەدینی گلکۆ پیرۆز چووە و سەری پێ سپاردووە و پاش ماوەیەکی درێژخایەن ڕیازەت‌کێشان و سولووک‌کردن، بە مەقامی ئیرشاد گەیشتووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٤٧ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## سەید موحەممەدی قاری

سەید موحەممەد، کەسناو «ظهیرُالاسلام»، پیاوێکی هێژا و پارسا و شەرع‌زانێکی دڵپاک بووە کە ساڵانێکی زۆر لە شاری سنە بە پێی شەرعی ئیمام ئەبووحەنیفە (د) دادوەری کردووە و بەو بۆنەوە کە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە، «سەیدی قاری»یان پێ گوتووە.

ڕەحمەتی زەهیر، مرۆیەکی پاڵەوان و وەرزشکار بووە و لە زۆرەبانێ و مێڵ‌گێڕان و وەزنە هەڵگرتندا، ناوبانگی دەرکردووە و لەمەڕ زۆری شان باهۆیەوە، داستانی زۆریان گێڕاوەتەوە و تا ساڵە دواییەکانی ژیانیشی وەرزشەکەی دانەناوە و سەرەنجام پاش عومرێکی درێژ، دەوری ساڵی ١٣٤٧ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

بنەماڵەی «ظهیراعظمی»، زاروزێچی ئەون.

یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا عەبدوڵڵای نارنجی

پارێزکارێکی زانا بووە کە هەر لە سەرەتای خوێندنەوە، بە پارسایی و دڵپاکی و ئاکارچاکییەوە ناسراوە و لەگەڵ خوا

لێ خۆشبوو مەلا عەبدوڵلای دشی (موفتی)، لە خۆش و ناخۆش و سارد و گەرمدا، یار و ئاریکاری یەک بوون. مەلا عەولای نارنجی پاش وەرگرتنی ئیجازە، دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی «لەیلاخ» لە ڕۆژهەلاتی سنە و لە گوندی «باشماخ» دادەمەزرێ و باقی ژیانی بە دەرس گوتنەوە و بەرنوێژی و ڕێنوێنی خەڵک، بە ڕاسپاردن بۆ چاکە و پرینگاندنەوە لە خراپە، تێپەڕ دەکا و دەوری ساڵانی ١٣٤٧ ک. م. بەرەو خێر و بێری هەتاهەتایی دەڕوا.

دوورەپەرێزی و نەوس کوژی مەلا عەبدوڵلا تا ڕادەیەک بووە، سەر سفرەی کەس دانەنیشتووە و ئەگەر بۆ سەفەرێک یان ماڵی دۆستێکی چووبێ، لە تۆشەبەرەکەیدا هێندێک وردەنانی بووە؛ لەوەی خواردووە. تا هێزێکی تێدا ماوە، کاری کردووە و بژیوی خۆی ژن و منداڵی دەرهێناوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ ئەسعەدی شارەزووری

شێخ موحەممەد ئەسعەدی نەقشبەندی، کوڕی شێخ مەحموود ساحیب و برازای مەولانا خالیدی شارەزووری «ذی‌الجَناحَین»، پیاوێکی زانا و عافێکی پایەبەرز بووە و هێندێک نووسراوەی بایەخداری لەمەڕ سۆفییەتی و سۆفیگەرییەوە لێ بەجێ‌ماوە؛ کە بریتین لە:

١. *الجَواهرُ اُلمکنونَة*
٢. *نورُ الهدایَة وَ العرفان*
٣. *الفُیوضاتُ الخالدیَّة*
۴. *جمعُ القَلائد وَ مَجمع الشَّوارد فی فَرائد مَوْلانا خالد*
۵. *بُغیَةُ اُلواجد فی مَکتوبات حَضْرَة مَوْلانا خالد*

شێخ موحەممەد ئەسعەد لە خانەقای سوڵتان سلێمان خان، لە «مروج‌الاخضر»ی دمشقدا وتاری داوە و خەڵکی ئامۆژگاری کردووە.

زا و مەرگی شێخ ئەسعەد ساڵانی ١٢٧١ و ١٣٤٧ ک. م.[1] لە دمشق ڕوویداوە.

*الاعلام*، ب١، ل٢٩٤. *کشف‌الظّنون*، ب١، ل٣٩٧. *بَغیَةُالواجد*، چاپی دمشق.

## ئەحمەد تەیموور پاشا

کوڕی ئیسماعیل پاشا[2](ڕوشدی تەیموور)، کوڕی موحەممەد، بە ڕەگەز کورد، لە زانایان و وێژەوانانی

١. لە کتێبی *عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٥٠٥، بە هەڵە ساڵی لەدایکبوون، چۆتە جێی ساڵی لە دنیا چوون.
٢. ژینامەی ئیسماعیل ڕوشدی پاشا و چۆنیەتی کۆچی ئەو بنەماڵە بۆ میسر، لە بەشی دووهەمدا باسی کراوە.

بەناوبانگ و مێژوزانانی پایەبەرز و ئەندامی کۆڕی زانیاری عەرەبییە؛ کە بە شێوەی ڕۆژاواییان کرۆکاشی زانستی کردووە و هەموو بەرهەمێکی، لای خاوەن بیروڕایان، جێی متمانەی تەواوە و جگە لەوە کە لە مێژوو نووسیدا، مامۆستای بێ‌قسەی چەرخی ڕابردوو دێتە ئەژمار، لە بواری شیعر و ئەدەبیشدا، خاوەن لێهاتوویی و شارەزاییەکی تەواو بووە.

ئەحمەد تەیموور ساڵی ١٢٨٨ ک. م. لە قاهیرە هاتە دنیا و سێ‌مانگان بوو، بابی عەمری خوای کرد و خۆشکی زانای (عایشە تەیموور) بەخێوکردن و ڕاهێنانی گرتە ئەستۆی خۆی و لەم بارەوە زۆری حەولدا.

ئەحمەد وانە سەرەتاییەکانی لە مەدرەسەی فەڕانسی و زبان و وێژەی، لای زانایانی ئەو سەردەمە خوێند و کە پێگەییشت، شارەزاییەکی باشی لە زانستە گشتییەکاندا دەسکەوتبوو. ٢٩ ساڵان بوو ژنەکەی دنیای بەجێ‌هێشت و ئەو چیتر ژنی نەخواست؛ نەوەک باوەژن بێتە سەر منداڵەکانی.

بابی ئەحمەد تەیموور، کتێبخانەیەکی هەبووە و ئەحمەد کە بۆتە خاوەن پلە و پایەیەکی زانستی، بۆ ڕێک‌وپێک کردن و پەرەپێدانی، تێکۆشیوە و بەتایبەت لە ساڵی ١٣١٩ ک. م. بەولاوە، بەردەوام کتێبی لێ زیاد کردووە؛ بە شێوەیەک کە کاتی مەرگی، ژماری کتێبەکانی ـکە «الخَزانةُ التَیموریّە»ی پێ گوتراوە ـــ بە هەژدەهەزار بەرگ گەیشتووە و زۆربەی زۆری، دەقی دەسنووسی بەنرخ و نایابی کتێبان بووە، کە ئەحمەد تیموور بۆ زۆرێکیان پێشەکی و پەراوێزی داناوە؛ پێڕستی دەرهێناوە؛ لەمەڕ نووسەری کتێب و بابەتەکەیەوە لێکۆڵیوەتەوە و گوتاری زانایانەی بۆ نووسیوە. ئەم کتێبخانە یەکجار گرانباییە، پاش مەرگی ـــ بەرامبەر بە وەسیەتی خۆی ـ بە کتێبخانەی نەتەوەیی میسر دراوە و ئێستا، لە شوێنێکی تایبەت، بە ناوی خۆیەوە ڕادەگیرێ.

ئەحمەد تەیموور پاشا، پیاوێکی دڵپاک و دڵاوا و خاکەسار بووە؛ قەت خوێندنەوە و تۆژینەوە و نووسین، ماندووی نەکردووە؛ تا ئەو کاتە کە چۆرتمێکی‌تری هاتە سەر ڕێ و یەک لە کوڕانی بە ناوی موحەممەد، جوانەمەرگ بوو. ئەو کارەساتە زۆری شڵەژاند و تووشی سەکتەی کرد و سەرەنجام دڵی لە لێدان خست (ساڵی ١٣٤٨ ک. م.).

**کتێب و بەرهەمەکانی ئەحمەد تەیموور:**

١. *التَّصْویرُ عند العَرب*

٢. *نَظْرَةٌ تاریخیة فی حُدُوث المَذاهِب الأربعه*

٣. *تصحیحُ لِسان العَرَب*

٤. *تصحیحُ القاموس المُحیط*

٥. *أبوالعَلاء المَعَرّی وَ عَقیدَتُهُ*

٦. *الیَزیدیَّةُ وَ مَنْشَأ نحلتهم*

٧. *ضبطُ الأَعْلام*

٨. *قَبْرُ السُّيوطى*

٩. *اَعْيانُ القَرْن الرّابع عَشَر*

١٠. *الآثارُ النَّبويَّه*

١١. *تَراجم المُهَنْدسين العَرَب*

١٢. *التَّذْكرَةُ التَّيْموريّه*

١٣. *قامُوسُ الكَلمات العاميَّه*

١٤. *ذَيْلُ طَبَقات الأطبّاء*

١٥. *ذَيل تاريخ الجَبْرتى*

١٦. *مُعْجَمُ الفَوائد*

١٧. *الألْقابُ و الرُّتب*

١٨. *نقدُ القسْم التّاريخىّ منْ معارف فَريد وجْدى*

١٩. *البَرقيّات للرّسالَة وَ المقالَة*

٢٠. *فهرسٌ لخزانَة الأدَب للْبَغدادى*

٢١. *الالفاظُ العاميَّةُ المصريَّة*

٢٢. *اوهامُ شُعَراء العَرَب فى المَعانى*

٢٣. *تاريخُ الأسْرَة التَّيموريَّة*

*تاريخ آداب اللغة العَرَبّيه*، ب٤، ل١٠٦. گوڤاری *یادگار*، س٣، ژ٣، ل٣١. گوڤاری *ماد*، س ١٣٢٤، ژ٢، ل٢٨. *الاعلام*، ب١، ل٥٩.

## شێخ موحەممەد وەسیمی خەتات

شێخ موحەممەد وەسیم، مەشهوور بە «شێخ ئاغەبرا»، کوڕی شێخ جەلال، لە پشتی عەللامە حاجی شێخ موحەممەد سەعیدی تەختی، پیاوێکی هێژا و زانا بووە و هەموو جۆرە خەتێکی، لە نەسخ و نەستەعلیق و سولس، جوان و وەستایانە نووسیوە و لە خۆشنووسانی سەردەمی خۆی هاتۆتە ئەژمار و ساڵی ١٣٤٨ ک. م. لە دنیا چووە.

*تاریخچەی خاندان مردوخ*.

## شێخ ئیسماعیلی کاکۆزەکەریایی

شێخ ئیسمایلی لۆنی، لەدایکبووی دەوری ساڵی ١٣٠١ ک. م. کوڕی پارێزکاری هێژا، شێخ مەحموودی

کاکۆزەکەریایی، لە قوتابخانەکانی کوردەواری خوێندوویە و کە تەواوی کردووە، گەڕاوەتەوە زێـدی خـۆی و تا دواسالّی ژیانی (١٣٤٨ ک. م.)، لە مەدرەسەی دینی ئەوێدا دەرسی‌گوتۆتەوە و فەقێی ڕاهێناوە.

شێخ ئیسمایل مرۆیەکی یەکجار زیرەک و وریا و خاوەنی ئاکـاری بـەرز بـووە و کـاتێکی لـە دەرسـدان بـۆ مابێتەوە، بە عیبادەت و خوێندنەوەی ڕابواردووە و جاروباریش کشت‌وکاڵی کردووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## موحەممەد ماجیدی کوردی

کوڕی موحەممەد سالّەح، کوڕی شێخ فەیزوڵای کوردی مەککی، سەرەتای چـەرخی سـێزدە، بـاپیری لـە کوردستانەوە کۆچی کردووە بۆ مەکەی پیرۆز و ماجید لەو شـارە هاتۆتـە دنیـا و دوای ئـەوە بـای‌بالّـی‌داوە، خوێندنی دەسپێکردووە و بە هۆی بیری تیژ و زیرەکی و تێکۆشانی زۆرەوە، لە ماوەیەکی کەمدا خوێنـدنی تەواو کردووە.

موحەممەد ماجید هـەر لـە سـەرەتای خوێندنـەوە، وازێکـی زۆری لـە کتێـب و کتێبخانـە بـووە و لـەو سەردەمەوە کتێبی کۆ کردۆتەوە و دوایی بە خەرجی خۆی پەخشانگایەکی دامەزراندووە و کاری لەچاپ‌دان و بڵاوکردنەوەی کتێبانی کردۆتە پیشەی خۆی و کتێبخانەیەکی گەورەی لە مەککەدا داناوە.

دوای ئەوە پاشایەتی حیجاز کەوتۆتە دەستی ئالی سوعوود، بووە بە نوێنەری خەڵک و چۆتە ئەنجومـەنی شووراوە. ماوەیەک لەودوا نوێنـەری مەزرینگـەی مـەعاریفی پـێ سـپێراوە و دوای ئـەوەش سەرپەرشـتی ئەوقافیان پێ داوە و سەرەنجام سالّی ١٣٤٩ ک. م. دەستی لە دنیا بڕاوە.

**لە کتێبەکانی**: *«کَنزُ العُمّال»، «مُعْجَمُ التَّخامیس»* و *«المُنْتَجّاتُ الماجدیّە»*.

*الاعلام*، ب٧، ل٣٢٨.

## شێخ یەحیای مەعریفەت

حاجی شێخ یەحیای مەعریفەت، کەسناو «اعتضادُالاسلام»، کوڕی شێخ عەبدولحەمید، لەدایک‌بووی سالّـی ١٢٩٠ ک. م. و لە زنجیرە شێخانی مەردۆخی، پیاوێکی ڕۆشنبیر و تێگەیشتوو، بیرمەندێکی زۆر ورد و وریا و بلیمەتێکی قەڵەم پاراو و خۆش‌خەت بوو کە بێژگە زانستە ئایینی و وێژەییـەکان، ڕیـازی و حیساباتیـشی دەزانی و لە ئەستێرەناسی و ئوستورلابیشدا سەری چاک دەردەچوو.

خوا لێ خۆشبوو مەعریفەت، بۆ کرانەوەی چاو و گوێی خەڵک و بەرهەڵستی ملـهوران و ناحـەقیکاران و پشتیوانی لە مەشرووتە و ئازادیخوازان، بە دانانی ڕۆژنامە و نووسین و بڵاوکردنەوەی گوتـاران، زۆری حـەول دا. مەدرەسەیەکیشی لەسەر دابی نـوێ، بـە نـاوی «مەعریفـەت» دانـا؛ کـە بـە هـۆی دژایـەتی هێنـدێک

کۆنەپەرستەوە، پاش ماوەیەک داخرا. ساڵی ١٢٩٩ ک. م. بوو بە سەرۆکی مەعاریفی کوردستان و ماوەیەکیش سەرپەرشتی مەعاریفی ڕۆژاوای ئێرانی پێ سپێردرا.

ئەم مامۆستایە چەند کتێب و نووسراوەشی هەیە؛ یەکیان دەورەیەکی فێرکاری دینی، بۆ قوتابییانی کوردستانە؛ بە ناوی «*شَرعیّات*»، کە چەند ساڵان لەسەریەک چاپ دەکرایەوە. ئیتر، کتێبێکە لەمەڕ سۆفیگەرییەوە، بە ناوی «*خَیطُ‌الشُّبَحات*».

دیسان لە کارە باش و بایەخدارەکانی، کۆکردنەوە و هەڵەبژاری دیوانی مەستوورەی ئەردەڵانە؛ کە جاری یەکەم، ساڵی ١٣٠٤ ک. م. لە تاراندا چاپی‌کرد.

ئەمن تەنیا جارێک چاوم بەو زاتە کەوت؛ ساڵی ١٣٤٧ ک. م. بوو، لە قوتابخانە دەمخوێند. هاتبوو بۆ ماڵمان، باوکم ئیجازەنامەیەکی فوتوای بۆ بنووسێ. لەبیرمە بابم کتێبێک لە تەنیشتی بوو، هەڵیگرت و کردیەوە، کاغەزێکی لێ دەرهێنا و گوتی: وەک بڕیارم دابوو، پێش هاتنتان ئەوەم نووسیوە. باش بوو بۆخۆشتان هاتن. فەرموو بیخوێنەوە! گرتی و بە دەنگێکی بەرز خوێندیەوە و سپاسی کرد. لە بەیانیدا، بەرگێک لە دیوانەکەی مەستوورەی، بە ناوی منەوە ناردبوو.

مەعریفەت ساڵی ١٣٥٠ ک. م. (١٩٣١ ز.) لە شاری هەمەدان، دنیای بێ بەقای بەجێ‌هێشت و تەرمەکەی لەوپەڕی ڕێزدا بەڕێ‌کرایەوە بۆ سنە و لە بارەگای بنەماڵەی خۆیاندا نێژرا.

غەزەلێکی ڕەحمەتی یەحیای مەعریفەت، پێڕای هێندێک زاراوەی ئەستێرەناسی:

| | |
|---|---|
| سیەروزم ز هجر ای صبح وصل یار تنویری | ز روز تیرەی خود خستەام ای شام تأخیری |
| دل اندر عُقدەی بعد و رقیب اندر میان حائل | رُخ دلبر گرفته اوج حُسن از چرخ تدویری |
| به خواب اندر قمر با ذوذنب دیدم شده طالع | رُخ و دنبالەی چشمت کند زین خواب تعبیری |
| چه نیکو شد قرین، بدر جمال و زهرەی خالت | ولی بختم ندید از این قران سعد تأثیری |
| دو زلفت همچو مار و نار و عقرب خویش بنماید | به هر صورت ز اوضاع شب هجر است تفسیری |
| ز زخم غمزه در دلها هزاران نقش بنمودی | که اقلیدس نداند کرد از این اشکال تحریری |
| سواد تار مویت گشته در کوی ذَقَن ظاهر | ز تَدویرات موهومی بر افلاک است تصویری |

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ جەلالی قەرەداغی

کوڕی شێخ لەتیف، کوڕی شێخ عەبدوڵڵا، کوڕی شێخ عوسمان، کوڕی شێخ لەتیفی گەورە، دەوری ساڵی ١٢٩٥ ک. م. هاتە دنیا و لە قوتابخانەکەی بابی لە قەرەداغدا خوێندی و ڕاهات و پلە‌ـپلە سەرکەوت و ئیجازەی وەرگرت. پاشان بوو بە ئیمام و مامۆستای مزگەوتێکی سلێمانی.

شێخ جەلال مرۆیەکی هێژا، دوورەپەرێز، ئاکاربەرز و جێگری بەجێگەی باب و کاڵی بووە و لە هەر کۆڕێکدا دانیشتووە، دانیشتوانی ئامۆژگاری کردووە. عەللامە شێخ عومەری ئیبنول‌قەرەداغی ـکە خزمی نێزیکی بووەـ مامەی پێ گوتووە و بە هەر بۆنەیەکەوە، بۆ لای چووە و لە هاونشینی و هاودەنگی ئەو، دڵی کراوەتەوە و بەهرەی بردووە.

مامۆستا شێخ جەلال ساڵی ١٣٥٠ ک. م. مالاوایی دنیای بێ بنیای کردووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل١٣٩ و ١٤٠.

## وەحشەتی کوردستانی

فەرەجوڵای وەحشەت شاعیرێکی هێژای خەڵکی لای سنە بووە کە بە زاراوەی سۆرانی شیعری گوتووە و دەوری ساڵەکانی ١٣٥٠ ک. م. مردووە.

ئەم غەزەلە هی ئەوە:

چاوەکەت فەتتانە تۆ تەعلیمی دەستانی مەکە	فێری مەشقی شیری ئەبروو، تیری موژگانی مەکە

نووری ڕوخسارت کە جەبری کوفری زوڵفی کردووی	زوڵفەکەی لێ لا مەدە، ئەمجار لە ئێمانی مەکە

حاجەتی شانەی نییە، تەرتیبی زوڵفت تێک‌مەدە	دەس بزیوە ئەم قەلە فێری گوڵستانی مەکە

دڵ کە پەروەردەی ویساڵە دەردی دووری پێ‌مەدە	تابی ئەم بارەی نییە غەمباری هیجرانی مەکە

ئەی ڕەفێق بیستوومە یار تەدبیری قەتڵی کردووم	لێگەڕێ با بمکوژێ توخوا پەشیمانی مەکە

گەر بڵێن «وەحشەت» لە هیجرت خوێن‌دەگریێ ئەو دەڵێ:	فێڵە دەیکا لێگەڕێ، قەت گوێ لە گریانی مەکە

لە جونگێکی دەسنووس.

## شێخ موحەممەد تاهای شیروانی

شێخ موحەممەد تاها، کوڕی عارفی دڵ‌وشیار، شێخ ئیسمایل، کوڕی حەسەن بەگی شیروانی، ساڵی ١٢٥٠ ک. م. لە شاری هەولێر هاتە دنیا و هەر لەوێ بای‌باڵی‌دا و خوێندنی دەسپێکرد و دوای فێربوونی وانە سەرەتاییەکان و هێندێک فارسی و عەرەبی، چووە قوتابخانە دینییەکانەوە و لە کۆڕی دەرسی مامۆستایانی وەک: مەلا موحەممەد و مەلا ئەحمەد و مەلا ڕەسوولی هەولێر و هەروەها مەلا موحەممەد ئەمینی «قەڵاسنجی» بەهرەی برد. ئەوجار ماوەیەک لە سلێمانی لە خزمەتی مورشیدی پایەبەرزی قادری، کاک ئەحمەدی شێخ (بەرزنجی)، تەریقەتی قادری وەرگرت و بەشوێنیدا چووە «تەوێڵێ» و لای گەورەی تەریقەی نەقشبەندی (شێخ موحەممەد بەهائەدین) و ماوەیەک داب و دەستووری مرید و ڕێپێو فێر بوو. سەفەرێکیش بۆ بارزان ڕۆی و لە شێخانی ئەوێ بەهرەی برد و پاشان گەڕاوە زێدی خۆی و لەوێوە چووە

بەغدا و لای مامۆستایانی ئەوێش، ماوەیەک خوێندی و ئیجازەی گرت.

شێخ تاها دوای تەواو کردنی دەرس و دەور، لە بەغدا مایەوە و باقی ژیانی بە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە و نووسین و ڕێنوێنی خەڵک ڕابرد و سەرەنجام لە ڕۆژی سێهەمی مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٣٥٠ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشت و لە سەرقەبرانی شەهیدان، لە پەنا «کرخ»یان ناشت.

شاعیران و زانایانی هاوچەرخی، شینێکی زۆریان بۆ گێڕا؛ یەکیان قەسیدەیەکی عەرەبییە، هی شێخ مەحموود ئەفەندی کە ئاوا دەسپێدەکا:

اَنورَ الدّین یا مَن قَدْ تَجَلّی بأرْدیةِ المعارف وَ الکمال
شَقیقُکَ فی جنان الخُلْد «طه» غَدا لله ضَیْفاً ذی الجَلال

یەکی تر، شین‌نامەیەکی زانای هێژا، حاجی موحەممەد ڕەشید ئەفەندییە بەم دەسپێکەوە:

لَعَمْرُکَ ما شخصٌ منَ الهَمّ خالیاً فَمنْ اَیْنَ تَصْفُو للانام اللّیالیا

**لە کتێبانی،** «*شرح اصول النَحو*»یان ناو بردووە.

*لباب الالباب*، موحەممەد ساڵح سوورەبەردی.

## سارم سوڵتانی ئەردەڵان

سەیفوڵڵا خانی ئەردەڵان (سارم سوڵتان)، کوڕی حەبیبەڵا خان، کوڕی عەباسقولی خانی سەرتیپ، کوڕی ئامانوڵا خانی والی ئەردەڵان، ساڵی ١٢٤٥ ک. هـ. )١٨٦٦ ز.) لە سنە هاتە دنیا و لەوێ و چەن شوێنی‌تر خوێندی و پاشان چووە نێو ئەرتەشەوە و تا پلەی سەرهەنگی سەرکەوت و سەرەنجام ساڵی ١٣٥٠ ک. م. (١٩٣١ ز.)، لە تەمەنی ٦٥ ساڵاندا، لە تاران کۆچی یەکجاری کرد.

سارم خان وازێکی زۆری لە شیعر و وێژە بوو. زۆربەی کاتی وچانی، بە خوێندنەوەی دیوانی شاعیران و کتێبە وێژەییەکان ڕادەبرد و لە هێندێک کۆڕی ئەدەبیشدا بەشداری دەکرد و بۆخۆشی شیعری دەگوت و نازناوی «سارم» بوو. ئەم غەزەلە هی ئەوە:

دلم از حلقەی گیسوی تو وا نتوان کرد پای دیوانە ز زنجیر رها نتوان کرد
گفتمش مُشک ختا بر سر گیسوی زدی گفت خاموش کە تشبیە خطا نتوان کرد
خواستم دل بنهم در سر زُلفش دیدم بسکە دل بر سر هم ریختە، جا نتوان کرد
در وجودی بە ودیعت بود ار یک جو جود چیست کام دل سائل کە روا نتوان کرد
ذرّەای نور هدایت بودت گر در دل نیک دانی کە طلب جز ز خدا نتوان کرد
گر بپرسند ز من حد نکوکاری چیست گویم آنست بە تحقیق کە تا نتوان کرد
قسمتم روز ازل کرد قضا خون جگر چون کنم چارە کە تغییر قضا نتوان کرد

هست «صارم» ز تو نومید، که حافظ فرمود: «تکیه بـر عهـد تـو و بـاد صبا نتـوان کـرد»

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ ئەمینی خاڵ

حاجی شێخ ئەمین، کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ ئیسمایل، کوڕی شێخ مـستەفا، لـە پـشتی مـەلا ئەبووبەکری موسەنیفی چۆڕی، زانایەکی هەڵکەوتە و عارفێکی بێ‌نیازی خەڵکی سلێمانییە، کە ساڵی ١٢٥٩ یان ١٢٦٠ ک. م. لە دایـک بـووە و خوێنـدنی لای بابییـەوە دەسـپێکردووە و لـە کـۆڕی دەرسـی شـێخ عەبدولقادری موهاجیر بە ئەنجامی گەیاندووە و پاشان خزمەتی شێخ موحەممەد بەهائـەدینی نەقـشبەندی گەیشتووە و تەریقەتی لێ وەرگرتووە و ماوەیەکیش بە سەیر و سولووکەوە ڕایبواردووە.

شێخ ئەمین مرۆیەکی پارێزکار و خزمەتگوزاری خەڵک بووە؛ زبان و وێژەی کوردی و عـەرەبی و فارسـی باش زانیوە و بۆخۆشی جاروبارە شیعری گوتووە. لە شاری سلێمانی، هەم دەرسـی داوە و هـەمیش تۆبـەی داداوە و خەڵکی ئیرشاد کردووە. لە کۆڕ و دیداری سەرزلان و دنیادۆستان خوەی پاراستووە و زۆرتر لەگـەڵ زانایان و قوتابییـان و خـەڵـکی ئاسـایی دانیـشتووە و سـەرەنجام ساڵـی ١٣٥٠ ک. م. (١٩٣١ ز.)، دنیـای بێ‌بنیای بەجێ‌هێشتووە و لە زیارەتانی «گردی‌سەیوان»ی سلێمانییان ناشتووە.

زانا و توێژەری بەڕێز، مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ، نەوەی حاجی شێخ ئەمینە.

*تاریخ سُلیمانیّە*، ل ٢٣١. *یادی مەردان*، ل ٥٠٩ و ٥١٠.

## قازی میرزا عەلی مەهابادی

کوڕی قازی میرزا قاسم، کوڕی میرزا مەحموود، لە بنەماڵەی قازییەکانی سابڵاغە کە دەوری سـێ چـەرخ، کوڕ لەدووی باب، دادوەرییان کردووە و بۆ زانست و هێژایی و پایەبەرزی، ناویان دەرکردووە.

قازی میرزا عەلی لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٢٧٩ ک. م. لە شـاری سـاوجبولاغی مـوکری (مـەهاباد) هاتە دنیا و هەر لەوێش خوێندنی تەواو کرد و لە خزمەتی مەلا عەولای پیرەباب ئیجـازەی گـرت و پاشـان دەرس‌گوتنەوە و دادوەری دەسپێکرد و ماوەی چل ساڵان بە هەموو شێوەیەک خزمەتی کرد.

قازی شوێنگری تەریقەتی نەقشبەندی و مریدی شێخی بورهان بوو. چەند کتێبی نووسیبوو کـە لەگـەڵ باقی کتێبەکانی کتێبخانەکەیدا، لە یەکەم شەڕی جەهانی و کاتی هەڵمەتی ڕووسان، سووتان و لـەناوچوون و تەنیا شەرحێکی قەسیدەی «بانَت سُعاد» لەو وەیشوومە ڕزگاری هات.

قازی عەلی مرۆیەکی ئاگا و داوەرێکی دڵاوا و وتاربێژ و نووسـەرێکی توانـا بـوو؛ دەرکـی ماڵـی هەمیـشە بەڕووی خەڵکدا کرابۆوەوە و لە ڕێی ئازادی و ڕزگاری میللەتەکەیدا، زۆری گەزەن لێ‌کەوت و زیانی بـینی و

تەنانەت چەند جاران کەلەپچە کرا و لە زیندان خرا و سەرەنجام پاش ٧٢ ساڵان ژیانی پڕپیت، ساڵی ١٣٥٠ ک. م. لە مەهاباد ئەمری خوای بەجیٚهێنا و هەر لەویٚ نێژرا.

شەهیدانی نەمر، قازی موحەممەد و میرزا قاسمی سەدری قازی، کوڕی قازی عەلین.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٨٦. ڕۆژنامەی کوردستان، چاپی مەهاباد، س١، ژ٧.

## سەید موحەممەدی حەکیم

بژیشکی پایەبەرز و بلیمەت، سەید موحەممەدی ئەلیاسی، مەشهوور بە حەکیم، کەسناو «اَشرَفُ‌الحُکَما»، کوڕی سەید خدر، لە بنەماڵەی سەید ڕەحمەتی «باینچۆ»یە کە ساڵی ١٢٥٢ ک. هـ. )١٨٧٣ ز.) هاتە دنیا و کە پێگەییشت، چوو بۆ هەورامان و لەویٚ خوێندنی تەواو کرد. پاشان چووە ناو ڕیزی مریدانی پیری پارسا، شێخ زیائەدینەوە.

باب و باپیرانی سەید موحەممەد، زۆربەیان دەستی بژیشکییان هەبووە و ئەم لێهاتووییە لە ناویاندا وەک کەلەپوور هاتووە. بەتایبەت سەید موحەممەد، هەر لە سەرەتای لاوییەوە، وازێکی زۆری لەسەر ئەو کارە بووە و هەر لەو سەردەمەوە، نەخۆشانی بە شێوازی تایبەتی خۆی دەرمان کردووە و لە ناو هەموو بژیشکان و برینگەراندا هەڵکەوتووە.

وەک دەیگێڕنەوە و هێندێک بەڵگەی لیٚ بەجێماویشی دەیسەلمێنن، سەید موحەممەد، هەر نەخۆشێکی دیوە، بە نەخۆشییەکەی زانیوە و زۆر نەخۆشینی گرانی بە هۆی زانستی بەربڵاوی لەمەڕ دەرمانی جۆراوجۆر، بەتایبەت گوڵ و گیاوە، لە ماوەیەکی کورتدا، دەرمان کردووە. هەروەها بۆ برینگەری و شکستەبەندی، وێنەی کەمتر هەڵکەوتووە. زۆر جاران، ئێسکی خراپ شکاوی، بە لێزانییەکی سەیر و سەمەرە، خستۆتەوە جیٚ، یان بێژین ناوەتەوە سەر یەک و خۆشی کردۆتەوە.

دەیگێڕنەوە جارێک خاوەن دەسەڵاتێکی بە لەش کەڵەگەت، ئێسکی ڕانی لە کاسیلکەی دەرچووە و لە حەکیمانی تاران هیچیان هیچی پیٚ نەکراوە و ئەویش زۆر حاڵی شڕ بووە. بەهەڵکەوت خزمێکی نەخۆشەکە دێتەوە بیری ماوەیەک وا لە کوردستان بووە، باسی حەکیمێکی پیتۆڵیان دەکرد بە ناوی سەید موحەممەد. هەرچۆنێک بووە، دەیهێننە سەری نەخۆش.

سەید موحەممەد کە دەیبینیٚ، تێدەگا خستنەوە جێی ئێسکی لەشێکی وا پڕ ماسوولکە و پتەو، پێویستی بە هێزێکی یەکجار زۆر و لەسەرخۆیە. چ بکا؟ فەرمان دەدا گامێشێک دێنن، خوێیەکی زۆر، بە ئاڵفێکی وشکەوە دەدەنە دەرخواردی. بۆ بەیانی نەخۆشەکە بە شێوەیەکی تایبەت لە سەر پشتی گاکە دادەنیٚ و هەردوو پێی لە ژێر زگیەوە، بەو شێوە بۆخۆی زانیویە، توند دەبەستیٚ. ئەوجار دەفرێکی گەورە پڕ لە ئاو دەکەن و لە پێش گامێشی تینووی دادەنێن. گا هەر ئاو دەخواتەوە و هەر ورگی وردە ــ وردە گەورە

دەبێتەوە. لە ناکاو تەقەیەک دەکا و ئێسک ئەچێتەوە جێ!

ناوبانگی سەید موحەممەدی حەکیم دەگاتە ڕادەیەک کە ساڵی ١٣١٠ ک. هـ. )١٩٣١ ز.) لەسەر داخوازی هەموو مامۆستایانی گەورەی شاری سنە، حوکمەت کەسناوی «اَشرفُ‌الحُکَماء» و ئیجازەی فەرمی هەموو جۆرە نشتەرگەری و شکستەبەندی دەداتێ.[1]

لە باری ئاکاریشەوە، سەید موحەممەد پیاوێکی دیندار، مەردمدۆست و خزمەتگوزار بووە و زۆربەی کات و ساتی ژیانی، بۆ دەرمانی نەخۆشان و لەش‌بەباران تەرخان کردووە و بێ ئەوەی کاری بە کەسایەتی و پلە و پایەی نەخۆشەکەوە بووبێ، خزمەتی بێ دریغی بە مرۆ مانا، لە هەر چین و بە هەر ئایینێک، لا گرینگ بووە و بەس.

ئەم پیاوە پیرۆزە، لە دنیا چوونیشی داستانێکی جێی تێڕامانە. تا ئەم دواییانە، لە کوردستان و بەتایبەت شاری سنەدا، دوو پیشە پاوانی جوو بوو؛ یەکەم بژیشکی و دووهەم زێڕینگەری. تەنانەت وایان لێ کردبوو، زۆرێک لە موسوڵمانان پێیان عەیب بوو زێڕ بفرۆشن یان بژیشکی بخوێنن!

بەم بار و دۆخەوە، دیارە هەڵکەوتنی کەسێکی وەک سەید موحەممەدی حەکیم، تا چ ڕادەیەک لای چینی جوولەکە گران و شکانی ئەو پاوانەیان چەند پێ ناخۆش بووە. سەید ساڵی ١٣١٤ ک. هـ. )١٩٣٥ ز.) بەو حاڵە کە تەمەنی ٦٣ ساڵ بووە و وەک دەڵێن، تا ئەو کاتە ئاگای نەخۆشی نەزانیوە؛ لەپڕ هاتۆتە لادا و گیانی پاکی، لەشی بەجێ هێشتووە. ئاخۆ دەرمانخواردیان کردبێ؟

حوکمی دەوڵەتی بە مۆری شارەوانی (نەزمییە) وشایەتی کۆمەڵی زانایان، ساڵی ١٣١٠ ک. هـ. یاداشتی سەید جافر و سەید عابدی ئەلیاسی. یاداشتی نووسەر.

## فەرەجوڵلای زەکی

کوڕی کەیخودا ڕەحیمی مەریوانی، دەوری ساڵی ١٣٠٠ ک. م. هاتۆتە دنیاوە. پیاوێکی هێژا و لێهاتوو بووە و خوێندنی لە قوتابخانەکانی کوردستاندا دەسپێکردووە و پاشان بۆ درێژەپێدانی، ڕووی لە وڵاتانی عەرەب ناوە و سەرەنجام لە میسردا گیرساوە و تا دوا کاتی تەمەنی (ساڵی ١٣٥٠ یان ١٣٥١ ک. م.) لەوێ ژیاوە.

زەکی لە قاهیرە، بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی خۆی و هەروەها خزمەتێکی زانستی، کەوتۆتە بیری لەچاپدانی هێندێک کتێبی پێویست و نایاب و بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارە، بە یارمەتی تاقمێک لە خوێندکاران و کتێبدۆستان، بەشدارگەیەکی داناوە و خۆی سەرپەرشتی گرتۆتە ئەستۆ. بەم جۆرە توانیویە ماشێنێکی چاپ بسێنێ و لە قاهیرەدا، چاپخانەیەک بە ناوی «مطبعه کُردستان» دانێ و بە یارمەتی هاوکارانی کوردی، وەکوو شێخ مەحیەدینی کانیمشکانی،

---

١. ئەمن بۆخۆم ئەو حوکمەم دیوە کە لە پەراوێزیدا، یەک بەیەک زانایانی ناسراوی ئەو سەردەمە، پەسندیان کردووە و شایەتییان لەسەر داوە و مۆری خۆیان پێدا ناوە.

چەند کتێبی بایەخدار چاپ بکا؛ کتێبانی وەک: *«شروح تَلخیص»*، لە ٤ بەرگدا، *«شروح شَمسیّە»*، *«شروح عقاید»*، *«المُحاکمات فی ماجری بین عُلَماء مصر و العراق من استعارات»*، *«تاریخ شرفنامە»* و ...

یاداشتەکانی نووسەر.

## ئەبولبەقای سنەیی

حاجی مەزهەری ئەبولبەقا، کەسناو «مظهرُالاسلام»، کوڕی حاجی شێخ موحەممەدی «مُعتمدُالاسلام»ی سنەیی، کانیمشکانی، ساڵی ١٢٩٩ ک. م. لە شاری سنە چاوی لە ڕووی دنیا هەڵێنا و لە پەنای بابی هێژا و مامی زانایدا (حاجی شێخ عەبدولحەمیدی عرفان) ـــکە هەردوویان لە موجتەهیدە گەورەکانی ئەو سەردەمە بوون ـ بارهات و زانستە باوەکانی ئەو دەورانەی، لە قوتابخانەی ئەو دوو پایەبەرزەدا خوێند.

حاجی مەزهەر، هەر لە کاتی فەقێتیەوە تێگەیشتبوو کە بۆ قەرەبووی دواکەوتوویی کۆمەڵگاکەی، پێش هەموو شتێک ئاڵوگۆڕێکی فەرهەنگی (کولتووری) و دامەزراندنی مەدرەسەی وا پێویستە کە تێدا زانستی نوێ فێری قوتابی بکرێ؛ بەڵام ئەو بە تەنیا هێچی پێ نەدەکرا. نە هێندەی پوڵ و پارە هەبوو، نەش دواکەوتوویی و بێئاگایی خەڵکەکە، ڕێگای کاری وای پێ دەدا. ناچار ئەم ڕا و تەگبیرە، وەکوو ئاواتێک، هەروا لە دڵی خۆیدا مایەوە؛ هەتا ساڵی ١٣٢٣ ک. م. کە «سالارُالدَّولە» بوو بە حاکمی کوردستان و وتاربێژ و ئازادیخوازی بەناوبانگ، میرزا نەسروڵای «ملکُالمُتکلّمین» لەگەڵی هات و حاجی مەزهەر ـکە بیر و بۆچوونی ئەوی زۆر پەسند بووـ لەگەڵی بووە دۆست و بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، داوای یارمەتی لێ کرد. ئەو خوا لێ خۆشبووەش، بەو هەموو خەڵکدۆستی و خێرخوازییەوە کە بووی، بۆ کاری وا سەری دەخورا. لای حاکمەوە هێندە لەسەری ڕۆیشت، تا بەرایی دانانی قوتابخانەیەکی سەرەتایی شەش کەلاسەی لێ ساند. سەرەنجام مەدرەسە دانرا و ناوی بوو بە «سالارییە» و مەزهەریش کرا بە سەرپەرشتی. بەم جۆرە ئارەزووی چەنای چەن ساڵەی هاتە دین و خەڵکیش لەم کارە باشە پێشوازییان کرد و منداڵەکانیان بۆ خوێندن و فێر بوون، ناردە ئەوێ. بەڵام کە «جلالُالدّولە» بوو بە حاکم، هێندێک بیروشکی کۆنەپەرستی لێ ڕاست بوونەوە و مەدرەسە داخرا.

دوای بەسەرچوونی دەورانی ملهوڕی قاجار و ڕاگەیاندنی مەشرووتە لە ئێران و دامەزرانی دام و دەزگای کارگێڕی دەوڵەت بە داب و دەستووری تازەوە، مەزهەر چووە نێو مەزرینگەی ماڵییە؛ بەڵام هەر خولیای دانانەوەی مەدرەسەکەی و خوێندنی منداڵە هاوشارییەکانی بوو. سەرەنجام بە یارمەتی تاقمێک لە ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە، کەسانی وەک: حاجی «فتحُالمُلک»ی ئەردەڵان، حاجی شێخ یەحیای مەعریفەت، سارمسوڵتانی ئەردەڵان و میرزا حەبیبی ئەسفەهانی«انتخابُالمُلک» ـکە ئەو کاتە سەرۆکی گومرکی کوردستان بووـ دیسانەکە مەدرەسە ڕێخرایەوە.

مەزهەری ڕەحمەتی، نەک هەر لەم خزمەتە گەورەدا، بە شێلگیری و خەباتێکی بێوچان سەرکەوت، بەڵکوو لەو کاتە کە دوژمنانی ئازادی و مەشرووتە و دەستە و بەستەی ئاغا و دەرەبەگ، بە هەموو شێوەیەک تێدەکۆشان نەهێڵن مەشرووتە سەربگرێ، بە هاوقۆڵی ئازادیخوازانی وەک: حاجی شێخ ئیبرایم و سالار ئەشرەفی کەمانگەر، بەرهەڵستیان بوونەوە و بۆ ڕۆشن کردنەوەی خەڵک، ڕۆژنامەیەک بە ناوی «تمدُّن»ی دەرهێنا. شیاوی باسە لەبەر نەبوونی ئامرازی چاپ لە کوردستاندا، ئەو ڕۆژنامە، بە شێوەی چاپی مۆمی نوسخەی لێ زیاد دەکرد و لە ترسی نەیاران، پەنامەکی بڵاو دەکرایەوە.

**لە کتێبەکانی**: *«السَّیفُ المَسلوُل عَلی شانی ابنِ البَتول»*، *«حدیقةُ الورد»*، شەرحی *«لامیةُ الکُرد»*[1]، بە عەرەبی، کتێبی *«جُغرافیا»*، بە فارسی بۆ مندالانی پۆلی سەرەتایی، *«خَشفُ الاسرار»*، ڕەدی *«کَشفُ الاسرار»*، بە فارسی، دیوانی شیعر، بریتی لە قەسیدە و غەزەل.

مەزهەر ساڵی ١٢٩٨ ک. ھ. (١٩١٩ ز.)، بەماڵەوە چوو بۆ تاران و لە مەزرینگەکانی وەزارەتی داراییدا، چەند پلەی بەرزی پێ درا و دوایی لە ساڵی ١٣٥٠ ک. م. (١٩٣١ز.)، لە ژێر عەمەلێکی نشتەرگەریدا دەرنەهات و دنیای بەجێهێشت.

ڕۆژنامەی شگرف، تاران، س ١٣٣١ ک. ھ. یاداشتەکانی نووسەر.

## ئەسعەد ئەفەندی خێلانی

کوڕی حاجی عومەر ئەفەندی، لە عەشیرەتی خێلانی لای ڕواندز، زانا و مامۆستایەکی ناودارە کە زۆر سالان لە شاری ڕواندزدا دەرسی گوتووە و دادوەری کردووە.

ئەسعەد ئەفەندی لە مریدان و خەلیفەگەورەکانی پیری تەریقەت، شێخ عەلی حوسامەدین بووە و لە پارێزکاری و عیبادەت و بەڕێوەبردنی فەرمانی خوادا، یەکجار شێلگێری کردووە و تا ساڵی ١٣٥٠ ک. م. ژیاوە.
*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٤١٤.

## شێخ مەسعوودی دژنی

کوڕی شێخ ئیسمایل، کوڕی شێخ ئیمامی مەردۆخی، ساڵی ١٢٧٥ ک. م. لە گوندی «دژن»ی ناوچەی ژاوەرۆ هاتە دنیا و خوێندنی لە شاری سنە تەواو کرد و ماوەیەک لە خزمەتی مامی، وێژەوان و زانای پایەبەرز، شێخ موحەممەدی«فخرُالعُلَما» (حەیران)، بەهرەی برد و ئیجازەی وەگرت.

شێخ مەسعوود مرۆیەکی هێژا و پارسا، خێرخواز و خۆش سەروزمان، ئاکاربەرز و خاکەسار بووە؛ خەتی

---

١. قەسیدەیەکی عەرەبییە هی ڕەحمەتی حاجی شێخ عەبدولحەمیدی عیرفانی سنەییە؛ لە ڕیزی *«لامیةُالعرب»* و *«لامیةُالعَجَم»*دا.

نەسخ و نەستەعلیقی جوان نووسیوە و بەشێکی باشی لـە بیروهۆشـدا پـێ گەیـشتووە و سـەرەنجام ساڵـی ۱۳۵۰ ک. م. لە زێدی خۆیدا، دنیای بەجێهێشتووە.

*تاریخچەی خاندان مردوخ.*

## شێخ عەبدوڵای هەزارکانیانی

کوڕی شێخ حوسەین، کوڕی شێخ حەسەن، کوڕی شێخ موحەممەد عارف، لە پشتی شـێخ شەمـسەدینی وەلی مەردۆخی، خەڵکی گوندی «هـەزارکانیان»ی ناوچـەی «سـاراڵ»، باڵایـەکی بـەرز و سەروسـیمایەکی پێکەوتووی هەبووە؛ جوان و گونجاو قسەی کردووە و قسەکانی زۆر بە دڵەوە نیشتووە.

شێخ عەبدوڵڵا بژیشکێکی خاوەن بەش و لە بژیشکی کۆن و نوێدا سـەردەرچوو بـوو. قـانوونی بووعـەلی سینا و چەند کتێبی مێژوویی تری لەم بارەوە خوێندبوو. پـاش تـەواوکردنی دەرس و دەور، ماوەیـەک لـە بەردەستی دوکتور سەعیدخان (پیرووز) ـ کە لە ئەمریکا و ئورووپا خوێندبووی ـ کاری کرد و لەم بابەتیـشەوە زۆرێک شت فێر بوو. لە گیاناسیشدا سەری چاک دەردەچوو؛ زۆرتر نەخۆشـانی بـە گیـا دەرمـان دەرکـرد. کتێبێکیشی لەمەڕ هێندێک گیای دەگمـەنی نەناسـراو و تایبەتمەنـدی هـەرکامێکیان و هـەروەها بـڕێک نەخۆشی و شێوەی دەرمان و بەرگری لەو نەخۆشییانەوە نووسی؛ کە پاش لە دنیا چـوونی، کـەس نـەیزانی لای کێ کەوت و چی لێهات!

شێخ عەبدوڵڵا هەموو ساڵێک جارێک و دوان، لەسەر داخـوازی خەڵـک، سـەری شـاری سـنەی دەدا و نەخۆشانی دەرمان دەکرد. لە یـەک لـەو سـەفەرانەدا، نـەخۆش کـەوت و ماوەیـەک کەوتـە سـەر جـێ و سەرەنجام لە ڕۆژی شەشەمی مانگی شەوالی ساڵی ۱۳۵۱ ک. م. گیانی پاکی دنیای بـەجێهێـشت و لـە سەر گردێک لە ڕۆژاوای شاری سنە، بە ناوی «تەپ شێخ حەمە سادق» ئەسپەردەیان کرد.

ئەمن ئەو دوایین سەفەرەی دێتەوە بیرم؛ ئەگەرچی منداڵـێکی دە ــ دوازدەساڵـە بـووم. لـە هاوسـایەتی ئێمەوە، لە حوجرەیەکی مزگەوتی شەریعەتمەداردا مەنزڵی کردبوو؛ خزمێکی خۆیشی، بۆ جێبـەجێکـردنی کاروبار و خزمەتی میوانان، لەگەڵ خۆی هێنابوو. بابی ڕەحمـەتیم گـەلێک خۆشـیدەویـست؛ زۆرجـار بـۆ سەردانی دەڕۆیشت و پێکەوە دەهاتنەوە ماڵ. ئەو کاتە ئـەمن تـازە خوێنـدنی سـەرفم دەسـپێکردبوو. بـە میهرەبانییەوە ڕیشەی وشەیەکی لێم پرسی؛ کە هێشتا ئەو وشەیەم لـەبیر مـاوە. بـە هەڵـکەوت دروووسـتم جواب داوە و ئەویش لاواندمیەوە و دۆعای خێری بۆ کردم.

خوا لێ خۆشبوو شێخ عەبدوڵڵا زەوقی شیعریشی هـەبوو؛ کـە بـەداخـەوە تـەنیا ئـەم چەنـد بەیتـەم لـە غەزەلێک دەسکەوت:

بکـش خنجـر بـزن بـر سـینەی مـن      مبـادا دیگـری در دل نـشیند

دریغـــم آیـــد انـــدر خانـــه‌ی تـــو — کـــسی دیگـــر در آن مـــسکن گزینـــد
ز چـــشم خـــویش بیـــزارم چـــو بیـــنم — اگـــر خواهـــد کـــسی غیـــر از تـــو بینـــد
نـــدارم تـــاب آن بیـــنم کـــسی را — کـــه زان گُلـــبن گلـــی از بوســـه چینـــد
تعـــالی‌الله از آن صـــورتگر پـــاک — چـــه زیبـــا نقـــشها مـــی‌آفرینـــد؟

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ شوکروڵای خەتیب

ئیمامی جومعە و وتاربێژی سنە، کوڕی شێخ عەبدولوەهابی مەردۆخی، مرۆیەکی هێژا، بەڕێز، دڵپاک، میهرەبان و دڵاوا بوو. لە ڕۆژهەڵاتی باشووری شاری سنەوە، باخ و مەزرایەکی هەبوو، بە ناوی «وێڵە»؛ ساڵێ چەن جار، مامۆستایان و پیاو ماقووڵان و خەڵکی تری بۆ ئەوێ بانگ دەکرد و چەند ڕۆژان، لە بەرەبەیانەوە تا درنگان، خزمەتی دەکردن.

لە وەیشوومەی یەکەم شەڕی دنیاگردا (١٩١٤ـــ ١٩١٨ ز.)، کە قات و قڕی کەوتۆتە وڵات و هەزاران کەس لە خەڵکی ڕەش و ڕووتی شاری سنە و دەور و بەر، لە برسان و نەخۆشیان، بەلادا هاتوون، ئەو خوا لێ خۆشبووە، بێژگە ئەوەی بە سەروماڵەوە بۆ یارمەتی لێقەوماوان تێکۆشاوە، بۆخۆی چاکی لێ بەلادا کردووە و تەرمی مردوانی پاش شۆردن و کفن‌کردن، ناشتووە؛ بەشکوو باقی خەڵکیش چاوی لێ ببرن و لەم کارە گرینگە نەسڵەمێنەوە.

لە کارەکانی تری ئەو ڕەحمەتییە، ڕاگرتنی دوو ـ سێ فەقێ لە مزگەوتی ئیمام، لە نێزیکی ماڵی خۆیان، بە خەرجی خۆێ بوو؛ کە هەرچی بیتوانیبا، دەرسیشی پێیان دەگوتەوە.

زا و مەرگی شێخ شوکروڵا، ساڵانی ١٢٨٤ و ١٣٥١ ک. م. ڕوویداوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ نەجیبی قەرەداغی

کوڕی شێخ لەتیف، کوڕی شێخ عەبدوڵڵا، کوڕی شێخ عوسمان، کوڕی شێخ لەتیفی گەورە، دەوری ساڵی ١٢٨٣ ک. م. هاتۆتە دنیا و لە قوتابخانەکانی عێراق خوێندوویە و لە دەستی مامی پایەبەرزی، شێخ حەسەنی قەرەداغی، ئیجازەی وەرگرتووە.

شێخ نەجیب پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، لە قەرەداغ دەرسی گوتۆتەوە و لە زانایان و مامۆستایانی هەڵکەوتەی سەردەمی خۆی بووە و زۆر جاران زانای بەناوبانگ، شێخ عومەری قەرەداغی باسی پلەی بەرزی زانست و هێژایی ئەوی کردووە.

ئەو ڕەحمەتییە ساڵی ١٣٥١ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٦٠٣.

## شێخ جەعفەری ئەمینشەرع

«حُجّةُالاسلام» شێخ موحەممەد جەعفەری «امینُالشَّرع»، کوڕی شێخ جەلال، کوڕی شێخ موحەممەد وەسیمی دووهەم، لە زانایانی هەڵکەوتەی بنەماڵەی مەردۆخییە کە بەهۆی دوورەپەرێزی و پارێزکاری و ڕاست و درووستییەوە، خەڵکەکە زۆریان خۆشویستووە و ڕێزیان لێ گرتووە.

شێخ پێڕای دەرسگوتنەوە، داوەری شەرعیشی لە ئەستۆ بووە و سەرەنجام لە ٢٢ی جیمادیسانی ساڵی ١٣٥١ ک. م. لە سنە، کۆچی یەکجاری کردووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## ئەدیبی زەندی

مەلا ڕەسوولی ئەدیب، کوڕی مەلا سادق، کوڕی خەلیفە ڕەحمانی زەندی، ساڵی ١٢٩١ ک. م. لە گوندی «شاوەڵی» هاتە دنیا و لە قوتابیانی وەفایی، شاعیر و وێژەوانی بەناوبانگی مەهابادییە.

ئەدیب مرۆیەکی دەم پاراو، دڵپاک، بەوەج، دڵاوا و میواندۆست بووە؛ بێجگە لە شاعیری و وێژەوانی و خەتخۆشی، لە بژیشکی کۆنیش سەریدەرچووە و هەروەها نەجاری و ئاشەوانیشی چاک زانیوە. بە کوردی و فارسی و عەرەبی، شیعری هەیە و لە هەولێر دیوانێکی لێ چاپ کراوە.

مەرگی ئەدیب، ١٢ی جیمادیئەوەڵی ساڵی ١٣٥١ ک. م. لە شاری شنۆ ڕوویداوە.

**دوو نموونە لە شیعرەکانی**:

ڕوت شەمسی تەمووزە هەموو پڕ تابش و تاوە ئەگریجەیی چین-چینە لە ڕووت پەخش و بڵاوە
حەیرانی دەمت بم بە مەسەل شووشە گوڵاوە قوربانی دوو زولفت کە دەڵێی سونبولی خاوە
مەیلت ئەوە چەن ڕۆژە لەسەر وەعدە نەماوە

ڕۆژێ نییە مەستانە کە عەهدێ نەشکێنی وەک کاهڕوبا ئەو دڵی مسکین نەڕفێنی
وەک قەوس و قەزەح ساتێ بە ڕەنگێ نەنوێنی بێگیان، بەدەنی خەستە جگەر! بۆچی دەمێنی
وەک شووشەیی ناسک دڵی بێچارە شکاوە

پێم فەرمووگوناهم چییە ئەی سەروی دڵارام چیدی مەکە دڵڕەنجە ئەسیری منی ناکام
کوا تاقەتی ئەو جەورە هەموو تاب و توانام ئەبرۆوی کەچت حاڵی دەمی مەرگی نیشاندام
تەهدیدی سەری تیری موژانت بەعەلاوە

ئــاوارە و بەدبــەخت مەگــەر وامقــی عــەزرام لەومەم چ دەکەن کوشتە و سەرگەشتەیی لـەیلام
غەرقی غەم و سەوداسەر و ئاشوفتە و شــەیدام بۆ دانەیی خاڵت بە فەریب چووم دڵی کێــشام
سەرتاسەری دەوری قەمەرت دانــە و داوە
سێوی چەنەکەت ئاوی حەیات و چەهــی زەمــزەم ئەی گیانی عەزیزم بە فیدای ئەو ســەر و پەرچــەم
ئەورۆ کە دەڵێم خاکی هەموو دەر وەســەرم کــەم پرسیم: چییە دەرمانی برینی دڵــی پڕخــەم؟
فەرمووی کە دەوای سەختە «ئەدیب» کـاری تـەواوە

* * *

چاوەکەت مەستە بە ناحەق فێری مەیخانەی مــەکـە
لێگەڕێ مەخمووری بەزمی دوردی پەیمانەی مەکـە
زولفی سازاوت دەسا تــەرتیب و چــینی تێـکمــەدە
حەیفە تووشی جەوری ڕیــش و کێــشی لەرزانــەی مەکـە
پەرچــەمت جــێ ئاشــیانەی بولبولــی تــەبعی منــە
چونکە کێشکچی شەوە، تۆ مــەنعی هێلانــەی مەکـە
گەردەنم پێ خۆشە حەڵقەی تای تەنافی زوڵفەکەت
چاوەکــەم ئیتــر حەوالــەی تــەوق و زۆلانــەی مەکـە
دڵ بــە مــەیلی خــوەی دەمێکــە عاشــقی بالاکەتــە
تۆخودا مایـل بـە غــەیری خــۆت و بێگانــەی مەکـە
هەر لە ئەوەڵ تۆ دڵت بــردووم بــە نـازی چاوەکــەت
تازە فێــری ڕاهـ و ڕەسمــی تــەبعی پەروانــەی مەکـە
عاشقی خونچــەی دەمــت تاکــەی دەبــێ ئــاوارە بــێ
مــەحرەمی ڕازە حەوالــەی چــۆڵ و وێرانــەی مەکـە
خۆت دەزانی وەک «ئەدیب» کەس بەندەگی پــێ نــاکرێ
وا بە ڕسوایی لــە نــاو ئــەم خەلقــە ئەفــسانەی مەکـە

*دیوانی ئەدیب*، چاپی هەولێر.

## سەبری ماردینی

عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی سەبری، کوڕی ئەبووبەکر، کوڕی عومەر، ساڵی ١٢٩٢ ک. م. لە ماردین هاتە دنیـا و لای مامی (مەلا تاهای مشکینی) و چەند کەسێکی تر لە مامۆستایانی مـاردین، خوێنــدنی تــەواو کــرد و

پاشان چووە نێو دام و دەزگای دەوڵەتەوە و وەکوو دوایین ئیش، بووە بازرەسی دیوانی بالای سزا لە ئەستەمبووڵدا و سەرەنجام ساڵی ١٣٥١ ک. م. لە زێدی خۆی کۆچی یەکجاری کرد.

سەبری مرۆیەکی بەئیمان، درووستکار، دڵپاک و خزمەتگوزاری خەڵک بووە و بێژگە کوردی، فارسی و عەرەبی و ترکیشی باش زانیوە و بەم چەند زبانە کتێبیشی نووسیوە. ئەو بابی زانای هەڵکەوتە، شێخ عومەر وەجدی، سەرپەرشتی «رواقُ‌الاکراد»ی ئەزهەری میسرە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٦.

## ئەحمەد شەوقی

ئەحمەد شەوقی بەگ، کوڕی عەلی بەگ، کوڕی ئەحمەد، لە شاعیرانی بەناوبانگی چەرخی چاردەی میسرە کە «امیرُالشُّعراء»یان پێ گوتووە. زا و مەرگی ئەو، ساڵانی ١٢٨٥ و ١٣٥١ ک. م. لە شاری قاهیرە ڕوویداوە؛ بەڵام شک لە کورد بوونیدا نییە. وەک خۆی دەڵێ:

سَمعْتُ بِأُذْنی مِنْ اَبی وَ هُوَ قائلٌ     منَ الکُرد أصْلی، جئتُ فی العُرب ناشئا

شەوقی لە قاهیرە خوێندنی دەسپێکرد؛ سەرەتا لەسەر شێوازی کۆن و لە مەکتەبخانەدا و دواجار لە مەدرەسەی نوێکار، پۆلی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کرد و چووە کالیجی حوقۆق و دوو سالیش هەر لەوێ، وەرگێڕانی خوێند. ئەوجار لە ساڵی ١٨٨٧ ز. تەوفیق پاشا (خەدیوی میسر) ناردی بۆ فەڕانسە و لەوێ چوار ساڵی تر حوقۆق و زبان و وێژەی فەڕانسەی خوێندەوە و ساڵی ١٨٩١ ز. گەڕاوە میسر و لە دەفتەری خەدیو عەباس حیلمی پاشادا بوو بە ئینشابەندی تایبەتی زبانی فەڕانسە.

کاتی یەکەم شەڕی جەهانی ـ کە دەوڵەتی بریتانی خەدیوی دەرکرد ــ شەوقیشی بۆ سپانیا وەدەرنا (١٩١٥ ز.) بەڵام کە شەڕ کۆتایی هات (١٩١٩ ز.)، گەڕاوە میسر و بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی ڕیش‌سپییان (شیوخ) و تا دواکاتی ژیان، لەو مەقامەدا مایەوە.

شەوقی لە گەورە شاعیرانی میسرە کە لە هەموو شێوە شیعرێکدا، وەکوو: پەسن و غەزەل و قەسیدە و شین و ڕاوە و چوارینە و ... گاڵەی پێ کردووە. لە شیعری شەوقیدا قەت گت و گرێیەک بەدی ناکرێ؛ وشە هێندە بەجێ و ڕستە ئەوەندە ڕەوان و مانا تا ئەو ڕادە تەڕ وتازەیە، خوێنەر حەیرانی دەبێ. شیعری سەرانسەر ژیانی خۆیە و ئەوی دیویە و بە دەور و بەریدا ڕوویداوە، سەرۆدەری بۆ دانانی شیعر بووە. شیعری شەوقی لە هەموو دنیای بەربڵاوی عەرەبدا دەنگیداوەتەوە و لای هەموو عەرەبێکی خوێندەوارەوە، ناسراوە. شەوقی هاوتا و هامپلەی موتەنەببی، شاعیری ناوداری عەرەب دانراوە و شیعری عەرەب ـ کە ڕووی لە کزی و داهێزاوی نابووـ بە سەرهەڵدانی ئەو، دیسانەکە گەشایەوە. ئەحمەد شەوقی بە شیوەیەکی ڕازاوە، چیرۆکی شانۆیی لە شیعردا خونجاندووە و گرۆی لەوانی پێش ئەو دەستیان بۆ ئەم کارە بردبوو، بردۆتەوە.



ئەم هونەرمەندە گەورە، لە سونگەی هونەرەکەیەوە، ماڵ و سامانێکی باشی پێگەیشتووە و شوکور بە تێر و تەسەلی ڕایبواردووە.

**لە کتێبەکانی**:

١. *«الشَّوقيّات»*، کە دیوانی شیعرەکانییە لە چوار بەرگدا
٢. *اسْواقُ الذَّهَب*
٣. *دُوَلُ العرب و عُظَماءُ الاِسلام*
٤. *مجنون ليلى*
٥. *مصْرع كليوپاترا*
٦. *اَميرَةُ الأنْدلس*
٧. *فتحُ مصْر*
٨. *على بيگ كبير*
٩. *السِّتّ هُدى*
١٠. *عَذْراءَ الهِنْد*
١١. *رواية آخر الفَراعنه*
١٢. *رواية الآس*

و چەند حیکایەتی تر.

نووسەران و شاعیرانێکی زۆر لە بارەی ئەحمەد شەوقییەوە، وتاریان داوە و نامیلکەیان نووسیوە؛ کەسانی وەکوو: ئەمیر شەکیب ئەرسەلان، عەبباس مەحموود عەقاد، ئانتوان جەمیل، مەحموود حامید شەوکەت و عومەر فەڕڕوخ. کوڕەکەشی (حوسەین شەوقی)، مەقالەیەکی دوور و درێژی بە ناوی *«اَبی شَوقی»* نووسیوە.

**ئەمەش چەند نموونە لە شیعری شەوقی**:

وُلِدَ الهُدى، فَالكائناتُ ضِياءُ ... وَ فَمُ الزَّمانِ تبَسُّمٌ وَ ثَناءُ
الرّوحُ وَ الْمَلأُ الْمَلائكُ حَوْلَهُ ... للدّين وَ الدُّنْيا به بُشَراءُ
وَ العَرشُ يَزْهُو وَ الحَظيرَةُ تَزْدَهي ... وَ الْمُنْتَهى وَ السّدرَةُ العَصْماءُ
و حَديقَةُ الفُرْقان ضاحكَةُ الرُّبا ... بالتَّرْجُمان شَذيَّةٌ، غَنّاءُ
وَ الوحْيُ يَقْطُرُ سَلْسَلاً منْ سَلْسَل ... وَ اللَّوحُ و القَلَمُ البَديعُ رُواءُ
نُظمَتْ أسامي الرُّسْل فَهْيَ صَحيفَةٌ ... في اللَّوح، وَ اسْمُ مُحَمَّد طُغْراءُ
اسْمُ الجَلالَة في بَديع حُرُوفه ... ألفٌ هُنالكَ وَ اسْمُ طه الباءُ

* * *

خَـــدَعوها بقَـــوْلهِمْ حَـــسْناءُ وَ الغَـــوانی یَغُـــرُّهُنَّ الثَّنـــاءُ
أتُراهـــا تَناسَـــت اسْـــمیَ لَمّـــا کَثُـــرَت فـــی غَرامِهـــا الأسْـــماءُ
إنْ رَأتْنـــی، تَمیـــلُ عَنّـــی کَـــأنْ لَـــمْ تَـــکُ بَیْنـــی وَ بَیْنهـــا أشـــیاءُ
نَظْـــرَةٌ، فابْتِـــسامَـــــةٌ، فَـــسلامٌ فَکَـــــلامٌ، فَمَوعِـــــدٌ، فَلقـــــاءُ
فَفِـــــراقٌ یَکُـــــونُ فیـــــه دَواءٌ أوْ فِـــراقٌ یَکُـــون عَنْـــهُ الـــدّاءُ
یَـوْمَ کُنّـا ـ وَ لا تَـسَلْ: کَیْـفَ کُنّـا؟ نَتَهـادی مـِـنَ الْهَــوی مـا نَـشاءُ
وَ عَلَینـــا مـــِنَ العَفـــاف رَقیـــبٌ تَعبَـــتْ فـــی مراســـه الْـــأهْواءُ
جـــاذَبَتْنی ثَـــوْبی العـــصیّ وَ قالَـــتْ أنْـــتُم النّـــاسُ أیُّهـــا الـــشُّعَراءُ
فَـــاتَّقُوالله فـــی قُلُـــوب العَـــذاری فالعـــــذاری قُلُـــــوبُهنَّ هَـــــواءُ

* * *

لامَ فـــیکُمْ عذولُـــــهُ وَ أطـــــالا کَـــمْ إلـــی کَـــمْ یُعـــالجُ العُـــذّالا؟
کُـــلَّ یَـــوم لَهُـــمْ أحادیـــثُ لَـــوْم بَـــدَأتْ راحَـــــةً، وَعـــادَتْ مَـــلالا
بَعَثَـــتْ ذکـــرکُمْ، فَجـــاءَتْ خفافـــاً وَ اقْتَـضَتْ هَجْـرکُم، فَراحَـتْ ثقـالا
أیُّهـــا المُنْکَـــرُ الغَـــرامَ عَلَیْنـــا حَـسْبُکَ اللهُ، قَـدْ جَحَـدْتَ الجَمـالا
آیَــــةُ الحُــسْن لِلْقُلـــوب تَجَلَّـــتْ کَیْـــفَ لا تَعْـــشقُ العُیُـــونُ امتـــالا؟
لــکَ نُــصْحی وَ مـا عَلَیْـکَ جـدالی آفَـــــةُ النُّـــصْح أنْ یَکـــونَ جـــدالا
وهـــب الرُّشـــد أنَّنـــی أنَ ا أسْـــلُو مـــا مـــن العَقْـــل أنْ تَـــرومَ محـــالا

*الاعلام*، ب١، ل١٣٣. *عُصُورُالادب العَرَبی*، ل ١٣٦. *تاریخ ادبیّات عرب*، تورجانی‌زاده، ل ٣٠٤. *تـــاریخ سُـــلیمانیّه*، ل٢٥٦. گۆڤـــاری *مـــاد*، س١٣٢٤ ک. ه. ژ٢، ل٢٨.

## واڵەی کەلهوڕی

عەلینەقی ئازادی، نازناو «واله»، کـوڕی ئاغاخـان، لـە هـۆزی کـەلهوڕ، ساڵـی ١٣٠٠ ک. م. هاتۆتـە دنیـاوە؛ مرۆیەکی لەبار و زیرەک و تێگەیشتوو بووە، لە زبان و وێژە و مێژوو سەری دەرچووە، بـە کـوردی و فارسـی شیعری گوتووە و پەخشانیشی جوان نووسیوە. لە سەرتای لاویدا، بۆتە ئینشابەند و دابین‌کاری جوامێرخـانی «ضرغامُ‌الدَّولە» و بابی (داودخانی ئەمیر ئەعزەم). کتێبێکی لەمەڕ مێژووی کـەلهوڕەوە هۆنیوەتـەوە، دەوری یازدەهەزار بەیتە؛ ئێشتاش چاپ نەکراوە! دوایی بە ماڵەوە چۆتە ناوچەی قەسرشیرین و لە گوندێکی ئـەوێ، بە ناوی «شوهانەگمرە» گیرسایەوەتەوە.

لە ژمارەیەکی گۆڤاری کوردی «*گەلاوێژ*»دا، نازناوی ئەم شاعیرە «لاله» و ناوی بابیشی «ئاغەشوان» نووسراوە

و دوو بەیتی فارسیشی بەناویەوە هێناوە؛ ئەڵبەت پڕ لە هەڵە!:

بشنو از کلکم چه سان دم می‌زنند رشحه‌اش بر نار دل دم می‌زنند
گوید آن دستی که زد با تیشه‌ام جان نبرد از پیشه و اندیشه‌ام

**قەتعەیەکی کوردی**:

لە تەقدیری فەڵەک ڕۆژێک ڕویم بۆ «قەسر»، سا چەم دی؟
شەکەت هەم ماندوو و برسی، نەمێنم، قاتڵی خوەم دی
شنەفتم ئەو مەکانە بەزمی خەسرەو عەیشی شیرینە
سروودی باربود، دەنگی نەکیسا، سەوتی مەریەم دی

بەداخەوە باقی ئەم شیعرە وا شێوابوو، بۆ نووسین نەدەبوو.

واله وێدەچێ ساڵی ١٣٦٧ ک. م. لە دنیا چووبێ.

ڕۆژنامەی *خورنشین*، چاپی تاران. گۆڤاری *گەلاوێژ*، چاپی بەغدا.

## شێخ موحەممەدی ئایەتوننەبی

حاجی شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ عەبدولکەریم، کوڕی شێخ موحەممەدی نەقشبەندی، ناسراو بە «آيةُالنَّبی»، شاعیرێکی زانا و عارفێکی هێژا، مرید و موجازی شێخ بەهائەدینی نەقشبەندی بووە و چەند کتێبی نووسیوە؛ یەکیان بە ناوی *«گُلشَن معرفت»*، لە شەش بەرگدا، بریتی لە زۆر باسی فیقهی، ویژەیی، مێژوویی و عیرفانییە. ئیتر بە ناوی *«گنجینه»*، هەر لەسەر شێوازی پێشووە؛ بەڵام زۆرێک شیعری کوردی و عارەبی و فارسی خۆیشی تێدا هێناوە.

**چەند شیعری شێخ موحەممەد**:

یاحەی! سپەردم، یاحەی! سپەردم دونیا و دین وێم بە تۆ سپەردم
هەرتا کە تاوام، تاوانان کەردم ئانە عەفو تۆ، ئینە ڕووی زەردم
ئەر مەلاوەنیم، وەر مەتاوەنیم مەقسوود هەر ئێدەن بە وێت یاوەنیم
وەرنە من تابیم مەینەتی دڵڕێش تۆمێم نەکێلان دڵ وەش کەرۆ پێش
مووی سیام نە پای عسیان سفید کەرد ڕاگەی ڕاس‌خاسان ها جە یادم بەرد
سیاهەی ئەعماڵ بەدیم تەمامەن خوا سا مەرگێ ڕزگاریم کامەن
ئارۆ عەداڵەت حوکمت بۆ فەردا مەشێو من کام خاک کەرۆن وەسەردا؟
یاڕەب من بەندەی پەسەندیدەی تۆم هەرچی هەم ئاخر ئافەریدەی تۆم
تۆ کەردی ئیجاد جە عەدەم ماوا تا کە «خَلَقْتُ الخلْقَ» فەرماوا

ئـەرچی تاعـەتم هـیچ نامـا جـە دەس
«وَ لا تقنَطُـوا»ت ئومیـدم هـەن بـەس
تۆ ساحیب ئیحسان من دەرویـش ڕیـش
ئیحسان ئەو خاسەن پـەریٚ ئـەهل ویـش
سـاخۆ ئـەر ئەهلـەن، وەگـەر نائەهلـەن
هەردوو جە لای تۆ موسـاوی و سـەهلەن
بـەو بدیـە وە ڕووی بـێئیختـاریم
وە ڕەنـگ پەشـێو خـەجاڵـەتبـاریم
«فـانظُر بعـین اللطـف إلینـا
کُـن لَنـا ولا تکُـنْ عَلینـا»

* * *

کاکـە یەکتاکـەی جەرگـەی مـەفاخر
سـەرلیٚشـێویاکەی زەمانـەی ئـاخر
بـۆچ هەوەسـیاگی خـاوی غەفـڵەتی؟
تاکـەی خەواڵـووی خـاو خەجـڵەتی؟
ئەڵـبەت نیـشانەی ئاخرزەمانـە
کـە بـەختی زەمـان هـەر لـە نەمانـە
ناشـوکری نـەویٚ لـە گـشت جـیٚ و مـاوا
خـوەر لـە ئـەنبیا و وەلی بـوو ئـاوا
بەرەکەت لاچـوو، دیـن کەوتـە کوربـەت
ئیـسلام و ئیمـان کـەوتـەن نـە غوربـەت
هـاوار لـەم ڕۆژە لـە گرفتـاری
فـەریاد لـە کـەردەی ڕیٚ بـەدکرداری
دەس‌بـەکـار نییـە، تـا دڵ بـەکـار بـیٚ
دڵ بیٚـدار نییـە تـا دۆس دیـار بـیٚ
نـازانم چێیـە بـیٚڕەحمـی یـارە؟
یـا بەدئیقباڵـی خۆمـە دڵتـارە؟
ئەڵبەت کـە مـەحرووم نـەزەرگای پـیرم
خـوەم خـەتابارم، سـاحیب تەقـسیرم
خەتای کەس نییە هـەر خـەتای خوەمـە
نەتیجـەی ئـیخلاس خدمـەتم کەمـە

**لە پێنج باڵێکی فارسی:**

ای دوسـت بیـا روی تمنـا بـه خـدا کُـن
آسـوده شـو از خلـق و ره کبـر رهـا کـن
در راه طَلَـب تـرك همـه روی و ریـا کـن
پروانـه‌صـفت نقـد دل و جـان بـه فـدا کـن

تـا شـمع دلـت بـاد درخـشنده چـو اختـر

افـسوس بـر ایـن عُمـر گرانمایـه کمـاهی
بگذشـت بـه بی‌حاصـلی و رنـج و تبـاهی
وامانـده‌ای انـدر پـس دیـوار منـاهی
در دفتـر اعمـال بـه جـز نقـش سـیاهی

چیزی دگرت نیست بـرای صـف محشر

امـشب مـن و دل هـر دو گرفتـار فـراقیم
تـا صـبح گرفتـار دو صـد بنـد نفـاقیم
آزرده ز چپگـردی ایـن سـبع طبـاقیم
گـه در یمـن و گـه بـه بیابـان عـراقیم

ای بـاد سـحر! مـژده‌ی وصـلی بـه مـن آور

زا و مەرگی شێخ موحەممەد، ساڵانی ١٢٦٢ و ٢١ی زیحەجەی ١٣٥١ ک. م. ڕوویداوە.

یاداشتەکانی نووسـەر، بـە ڕوانـین بـۆ: *گُلشَن*

*معرفت و گنجینـه*، دوو کتێبی خاوەن ژینامەکە.

## موفتی سەقزی

مەلا عەبدولعەزیز، کەسناو «صـدرُالعُلما»، ساڵی ١٢٩٦ ک. م. (١٨٧٧ ز.) لە سەقز هاتۆتە دنیا. بابی (حـاجی شێخ شوکروڵا) مرۆیەکی پارێزکار بووە و میعماری کردووە.

عەبدولعەزیز دوای خوێندنێکی سەرەتایی، چوو بۆ «بیارە» و لـە خزمـەتی زانـای نـاوازەی ئـەو دەورانـە، مـەلا عەبدولقادری مودرڕیسدا سەردەمێک بەهرەی برد و سەرەنجام ئیجـازەی وەرگـرت. ئـەوجا بـەرەو ڕۆژهـەڵات گەڕایەوە و بوو بە مامۆستای گوندی «یەنگی‌کەند». چەند ساڵ لـەودوا چـووەوە بـۆ زێـدی خـۆی (سـەقز) و لـە مزگەوتی پیرغەزالی دامەزرا و بە بۆنەی لێوەشاوی خۆیەوە، لـە ماوەیـەکی کەمـدا نـاوی داکـەوت و کەسـناوی «صدرُالعُلما»یان پێ دا.

ساڵی ١٣٣٨ ک. م. بوو بە سەرپەرشتی مەعارف و ئەوقافی سـەقز و پێـڕای ئـەوە، داوەری مەحکەمـەی شەرعیشی پێ سپێرا و لەم کاتەوە، ناوی «موفتی» پێ برا.

موفتی سەقزی مرۆیەکی خاوەن ڕێز، لە دۆستیدا پێداگر و لە کاروباراندا زۆر بەبڕشت بوو.

ئەم مامۆستایە سەرەنجام ساڵی ١٣٥٢ ک. م. لە تاراندا دڵی لەکارکەوت و تەرمەکـەیان لـە سـەرقەبرانی «ئاب‌ئەنباری قاسم‌خان»دا ناشت.

بلاڤۆکی وەرزیی فرهنگ سقز، ساڵی ١٣٣٨ ک. هـ . یاداشتەکانی نووسەر.

## سەبری نەعیمی

شێخ مەحیەدین، کوڕی شێخ موحەممەد نەعیم، کوڕی شێخ موحەممەد نەسیمی «نـەوەرە»، کـوڕی شـێخ شەمسەدین، لە شێخانی کـانی‌مـشکان[1]، زانایـەکی بـەئیمان و تـوێژەر بـووە کـە لـە سـنە و مەدرەسـەی «دارُالاحسان» خوێنـدنی دەسـپێکردووە. سـاڵـی ١٣١٢ ک. م. بـە شـوێنی زانیاریـدا، شـار و وڵاتی خـۆی بەجێ‌هێشتووە و تا ساڵی ١٣١٦ لە «تەرسووس»ی سەر بە ناوچەی «ئەتنە» لە تورکیادا ماوەتەوە.

ساڵی ١٣٢٠ ک. م. جارێکی تر کەوتۆتە گەڕان و ئەمجار ڕووی لە خاکی عارەبان ناوە و سـەرەنجام لە قاهیرەدا گیرساوەتەوە و لە زانستگای ئەزهەر، وەکوو قوتابی، خوێندنی دەسپێکردووە. پاش چەنـد ساڵ، لێ‌براوە کتێب و نووسراوەکانی ئیمام موحەممەدی غەزالی و ئیمام فەخری ڕازی، کە تا ئەو کاتە چاپ نەکراون، لە چاپ بدا و بۆ ئەم مەبەستە کتێبخانە گەورە و ناسراوەکانی قـاهیرە، ئەسـتەمبووڵ و

---

[1]. **کانی‌مشکان**: گوندێکە لە ڕۆژاوای باشووری شاری سنەوە، باب و کاڵی شێخانی قوسەیرانی خەڵکی وێن.

قوونییە لە تورکیا، دمشق و حەلەب لە سووریا و «خَزانةُالکُتُب»ی جامیعی زەیتوونییە لە تـوونس و ... دەپشکنێ.

سەبری لەم نێوانەدا سەرێکی زێدی خۆی (سنە) دەدا؛ بەو نیـازە لـە نووسـراوەکانی مامۆسـتایانی زانـای هاوولاتیشی، ئەوی دەستی بکەوێ، بۆ چاپ لە قاهیرەدا، لەگەڵ خۆی بیبا.

لەو کتێبانە کە بە تێکۆشانی ئەو چاپ کراون، *«الاربَعین فی اُصوُل الدّین»* و *«معِیارُالعلم»*ی ئیمام غەزالییـە، کە یەکەمیانی دوو جار،ساڵی ١٣٢٨ و ١٣٣٤ ک. م. لە چاپ داوە.

سەبری لە «رواقُالاکراد»ی ئەزهەردا بووە و زۆربەی سات و کاتی بە خوێندنەوە و تۆژینەوە تێپەڕ کردووە. چەند کەسێکی وەکوو شێخ قادری کوردی و شێخ حەسەنی نـەعیمی، بـۆ کـاری چـاپ و بڵاوکردنـەوەی کتێبان، یارمەتییان داوە.[١] ئەو کتێبانە زۆرتریان لـە پەخـشانگای «کُردسـتان العلمیّـە»ی قـاهیرەدا ـ کـە هـی فەرەجولای زەکی کوردی بووە ـ لە چاپ دەرچووە.

دیسان لەو کتێبە بایەخدارانە وا سەبری بۆ یەکەم جـار لـە ساڵـی ١٣٥٢ ک. م. چـاپی کـرد، هـۆنراوەی «العَقیدةُالمَرضـیّە»ی مامۆستای زانا و شاعیری توانای کورد، مـەلا عەبـدوڕڕەحیمی مەعـدوومی تاوەگۆزییـە، مەشهوور بە «مەولەوی کورد».

زەکەریا مەحیەدین، لە ئەفسەر و پیاوە پایەبەرزەکانی میسر لە زەمانی جەمال عەبدولناسردا، کوڕی ئـەم شێخ مەحیەدینەیە.

وەرگیراو لە تۆی پەراوێز و پاشەرۆکی *العَقیدَةُالمَرضیّە*، نووسراوەی سـەبری و پێـشەکی مامۆسـتاهەژار لەسـەر وەرگێـڕاوی *شـەرەفنامەی بدلیـسی*.

## شێخ موحەممەد عەلی تاڵەبانی

شـێخ موحەممـەد عـەلی کـەرکووکی، کـوڕی حـاجی شـێخ عـەلی ئەفەنـدی، کـوڕی شـێخ عەبدوڕڕەحمانی خالیسی، ساڵی ١٢٧٣ ک. م. لە کەرکووک هاتە دنیا و لە ژێر چـاوەدێری بـابی ئاکاربەرزیدا بارهات و ماوەیەک بە خوێندنی سەرف و نـەحو و عەقایـد و فیقهـەوە خـەریک بـوو. پاشان وازی چووە سەر فێربوونی داب و دەستووری تەریقـەی قـادری و دوای ماوەیـەک سـەیر و سولووک، جێ باوکی گرتەوە.

شێخ موحەممەد عەلی دەروێشێکی خاکەسار، جوامێر، دڵاوا و پارێزکار بووە و ساڵی ١٣٥٢ ک. م. لە دنیا چووە و کوڕەکەی (شێخ جەمیل) جێی گرتووە.

---

١. وەک نووسراوە، سەبری بۆ چاپی شەرەفنامە، هاوکاری فەرەجولا زەکی و عەونی کردووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل ٥٥٢.

## مەلا موحەممەدی بەرلووتی

«بەرلووت» گوندێکی سەر بە ناوچەی «کەلار» لە باشووری کوردستانە. مەلا موحەممەد لەوێ هاتە دنیا و کە پێگەیشت، تێدا خوێندنی دەسپێکرد و وانە سەرەتاییەکان فێر بوو. پاشان ڕێی شار و باژێڕانی کوردستانی گرتە بەر و چەند ساڵان فەقێتی کرد و سەرەنجام لە بیارە، لای مەلا قادری کانیکەوەیی ئیجازەی وەرگرت. هەر کە دەرس و دەوری کۆتایی هات، گەیشتە خزمەتی شێخ عومەر زیائەدینی نەقشبەندی و تۆبەی کرد و سەری پێ سپارد. دوای ئەوە گەڕاوە زێدی خۆی و دەرس‌گوتنەوە و ئیرشادی دەسپێکرد و بەهرەیەکی زۆری بە خەڵک گەیاند.

مەلا موحەممەد پیاوێکی پارێزکار و پیرۆز بووە و بۆ بەڕێوەچوونی ژیانی، کشتوکاڵی کردووە و چەندسەر حەیوانی ڕاگرتووە و بە نانی مەلایەتی نەژیاوە. بەو حاڵەش هەمیشە ئامادەی دەرس‌گوتنەوە و ئامۆژگاری و ڕێنوێنی خەڵک بووە و بەشێ لە کاتیشی، بە عیبادەت و بەڕێوەبردنی داب و دەستووری تەریقەت تێپەڕ کردووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٥٣ ک. م. لە دنیا چووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل ٥٦١.

## مەلا مەحموودی مەزناوێ

«مەزناوێ» گوندێکی لای کەرکووکە، عەشرەتێک بە ناوی «شێخبزینی و شوان»ی تێدا دەژین.

مەلا مەحموود ساڵی ١٢٧٥ ک. م. لەوێ هاتە دنیا و لە «پشدەر» خوێندنی دەسپێکرد و کە هێندێک سەوادی کرایەوە، چوو بۆ سلێمانی و ماوەیەک لە قوتابخانەکانی ئەوێدا خوێندی و دواجار چووە خزمەتی شێخ عەبدولقادیری موهاجیر و ساڵێک بەهرەی برد و پاشان ئیجازەی وەرگرت.

مەلا مەحموود بە بۆنەی خزمایەتی لەگەڵ شێخ عەلی ئەفەندی خالیسی کەرکووکیدا، دوای وەرگرتنی ئیجازە، چوو بۆ کەرکووک و لە مزگەوتێکی ئەوێدا دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکرد و دوایی لە ساڵی ١٣٥٣ ک. م. کۆچی یەکجاری کرد.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل ٥٦٠. یەک ـ دوو سەرچاوەی تر.

## شێخ عەبدولقادری کەمانگەر

حاجی شێخ عەبدولقادری مەولانایی کەمانگەر، کوڕی حاجی شێخ عەبدوڵلای ماسانی، کوڕی مەولانا ئەحمەدی «کۆڵەسارە»، عارفێکی ئاگا و خێرومەند، خێرخواز و میهرەبان و میواندۆست بوو کە تەریقەتی

نەقشبەندییەی لە بابی وەرگرت و تا کۆتایی ژیان، لە «ماسان»دا، بە ئیرشاد و ڕاهێنـانی مریـدان و ڕێنـوێنی خەڵکەوە دەپەرژا و ساڵی ١٣٥٣ ک. م. ڕووی لە دنیای‌تر نا. شێخ قادر ٨٢ ساڵی عـومر کـرد. ئـەم چەنـد بەیتە، بابم لە شینیدا دایناوە:

مـسند آرای مقـام جـدّ و بـاب
پـاک‌طینـت، مرشـد و الانـصاب

عکـس روی خواجگـان نقـشبند
نقـش حـال دودەی تحـت‌القُبـاب

یادگـار حـزب نیکوسـیرتان
بـادەبخـش جـستجویان شـراب

شـیخ عبـدالقادر آن روشـن ضـمیر
عـارف دریـادل و عـالی‌جنـاب

تا لە کۆتاییدا دەڵێ:

الغَـرَض در سـنّ هـشتاد و دو سـال
رُخ کـشید آن آفتـاب انـدر نقـاب

گفت هـاتف مـژدە «کـای اصـحاب دیـن!
پیـر ماسـان را ارَم باشـد مـآب»[١]

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## نەهانی کۆیی

شێخ مەحیەدینی نەهانی، کوڕی شێخ عەبدولکەریم، شاعیرێکی هێژا بووە، نازناوی «نەهانی» کە ساڵی ١٢٨٢ ک. م. لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە، ساڵی ١٣٤١ چۆتە هەڵەبجە و ١٣٥٣ ک. م. لەوێ لە دنیا دەرچووە.

*ڕۆژژمێری چیا*، ساڵی ١٣٦٥ ک. ه.

## مەلا ئەحمەدی ڕۆژبەیانی

کوڕی بەکر ئاغای بەیرەقدار، شەرعزانێکی هێژا و زانایەکی کارا بووە، لە گوندی «فـەرۆخان»دا ژیـاوە و لـەوێ ـکە خاوەن بەشیش بووە ـ دەرسی گوتووە.

پاش ئەوەی مەلیک مەحموودی بەرزنجی، لە ساڵی ١٣٤١ ک. م. لە بەند و تەبعیـدی بریتانیـا ڕزگـاری هات و لە هیندووستان گـەڕاوە، مـەلا ئەحمـەدی بانـگ کـردە سـلێمانی، دەرس‌گوتنـەوەی مەدرەسـەی گەورەی ئەوێی پێ سپارد و کردیە موفتی؛ بەڵام لەبەر شێواوی و دانەمـەزراوی بـارودۆخی سـلێمانی، دوای دوو ساڵ، ناعیلاج چووە ئاوایی «باداوا».

ساڵی ١٣٤٥ ک. م. حیکمەت ئەفەندی، زانا و مامۆستای بەناوبانگی کەرکووک، کۆچی یەکجاری کـرد و لە مەلا ئەحمەدیان داوا کرد بچێتە ئەوێ و قوتابخانەکـەی حیکمـەت بـەڕێوە ببـا. کـەچی لـەوێش زۆری

---

١. بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ١٣٥٣.

نەخایاند، هێندێکی لێ ڕاستەوە بوون و ئەویش ناچار کەرکووکی بەجێ‌هێشت و دیسان گەڕاوە باداوا.

ساڵی ١٣٤٩ ک. م. بە یەکجاری گەڕاوە فەرۆخان و لەوێ دەرس‌گوتنەوە و خزمەتی دینی دەسپێکرد و سەرەنجام ساڵی ١٣٥٣ ک. م. لە بشێوەیەکدا شەهید کرا.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ حەیدەری تەوێڵێ

کوڕی شێخ عەلی، ساڵی ١٢٦٥ ک. م. هاتۆتە دنیا و خوێندوویە و ئیجازەی وەرگرتووە و پاشان گەڕاوەتەوە «تەوێڵێ» و مەلایەتی کردووە و دوایی، ساڵی ١٣٥٣ ک. م. لە بیارە دنیای بەجێ‌هێشتووە.

شێخ حەیدەر قەت ژنی نەخواستووە و دەستی لە کەس دانەکێشاوە و بە ڕەنجی شانی خۆی ژیاوە و مریدی قوتبی عارفان، شێخ موحەممەد بەهائەدین بووە. دوای ئەویش، لە خزمەتی شێخ عومەر زیائەدین، تۆبەی تازە کردۆتەوە. کات و ساتی زۆرتر بە عیبادەت و دەرس‌گوتنەوە ڕابواردووە و بە خەتی جوانەوە، زۆر کتێبانی نووسیوەتەوە و لە هەموو بارێکەوە، مرۆیەکی پارسا و بێ‌نیاز بووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل ١٨١.

## ئەحمەد موختار بەگ

کوڕی عوسمان پاشا[1] و برای تاهیر بەگی جاف، ساڵی ١٣١٦[2] ک. م. لە شاری هەڵەبجە هاتە دنیا و کە پێگەییشت، چووە مەکتەبخانەی ئەودەم بۆ خوێندن و بە هۆی لێهاتوویی سرشتیی و زەوقی خواییەوە، لە ماوەیەکی کەمدا بەشێکی زۆر لە زانستی مامۆستایانی خۆی دەسکەوت و بە خۆێندنەوەی زۆر کتێبی وێژەیی و دیوانی شاعیران، چاوی بە تەواوی لە زمان و شیعردا کرایەوە و هەروەها بێژگە کوردی، عەرەبی و فارسی و ترکی و ئینگلیسیش فێر بوو.

ئەحمەد موختار، شیعری کوردی زۆر ناسک و جوانی داناوە و جاروبارە بە فارسیش شیعری گوتووە. لە باری ئاکاریشەوە، بۆ جوامێری و خەڵکدۆستی و خۆش‌سەروزمانی، ناوی دەرکردووە. ساڵی ١٣٤٢ ک. م. بوو بە جێگری سەرۆکی هەڵەبجە و ١٣٤٤، وەکوو نوێنەر، چووە پارلەمانی عیراق. ئەم کەسایەتییە پایەبەرزە، سەرەنجام لە ساڵی ١٣٥٣ ک. م. کەوتە بەر گوللەی ناکەسێکی بەکرێ‌گیراو و شەهید بوو. خەڵکێکی زۆر، تەرمەکەیان بردەوە «عەبابەیلێ» و لەوێ ناشتیان.

---

١. دایکی ئەحمەد بەگ، عادڵە خاتوونی ساحیبقەران، لە شێرەژنانی هێژای دەورانی خۆی بووە.

٢. بە هەڵکەوت، سارستەی «احمد مختار بگ»، بە حیسابی ئەبجەد، بەرامبەرە بە ١٣١٦، ساڵی لەدایکبوونی.

**چەند غەزەلی کوردی ئەحمەد بەگی جاف:**

گریە و گرەی تـەنووره بلێسەی هەناوەکـەم
سیروان و تاجەڕۆیە خورەی ئـاوی چاوەکـەم

شێواوی زولفی خاوی کەسـێکم مـنی هـەژار
بۆیـە پەشـێوە ئێـستەکـە بـیری بڵاوەکـەم

ڕۆژێ بـــە پێکەنینـــەوە، یـــار پـــێ‌وتم وەرە
بۆ پاسی نیوەشەو، سەگی قول هەڵـکراوەکەم

ئەم کۆمەڵی گوڵاڵە کە سوورن لە دەشـت و کێـو
ئاویـان دراوە گـشتی بـە خوێنـە ڕژاوەکـەم

تۆبی و خودا دەسا وەرە ئەی نووری چاوەکەم
سارێژ کە زامـی لـەتلـەتی جەرگـە براوەکـەم

باوەڕ مەکەن ببن بە عەرەب کوردی شـارەزوور
بێ‌تـرس ئەڵـێم، لـە ڕاسـی دراوە کڵاوەکـەم

ئەی گیانەکەم بە چاوی ڕەشت سـوێند ئـەخوەم کـە مـن
بۆ دینی چاوی تۆیە کە هەر چاوەچاو ئەکـەم

* * *

بە بەردی فیرقەتت شیشەی دڵی ئاوارە مەشـکێنە
لە ناو زومرەی ڕەقیبان عاشقی بێچـارە مەشـکێنە

ئەگەر ڕۆح و دڵ و ئیمان تەڵەب‌کا بیدەرێ عاشق!
کە تفڵ و خوردساڵە قەت دڵی ئەو یارە مەشـکێنە

دەخیلم ئەی نەسیمی سـوبحگاهی، مەسـکەنی دڵـمە
پەرێشانی مەکە تۆ زولفی ئەو نـازدارە مـەشـکێنە

کە من پەروانەیی شەمعی سەری دوو کوڵمی تۆم جانـا
دڵی «ئەحمەد» بە فیتنەی ئەو سەگی پەتیارە مەشکێنە

* * *

لە خەو هەڵسن، درەنگە، میللەتی کورد! خـەو زەرەرتانـە
هەموو تاریخی عالـەم شـاهیدی فـەزڵ و هونەرتانـە

دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیب و بێ‌کـەس و مەزڵـووم
بە گورجێ قەتعی کەن ئەو ڕێگـە دوورە وا لەبەرتانـە

بخوێنن، چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تێغـی دوژمنتـان
هـەموو ئـان و زەمانـێ عـەینی قەڵـغان و سـپەرتانە

بە خۆڕایی لە دەستی بەرمەدەن ئەم خاکە مەحبووبـە
کە تۆزی وەک جەواهیر سورمە و کـوحلی بەسـەرتانە

بە بێ‌قەدریی بەسـەریا ڕامـەبوورن، حورمـەتی بگـرن
گوڵاڵەسوورەی ئـەم سـەحرایە، خوێنـاوی جگەرتانـە

دمێکـە ئـەم وڵاتـە وا ئەسـیری پەنجـەیی جەهلـە
لە سـایەی عیلمـەوە ئەمـڕۆ ئیتـر نەوبـەی زەفەرتانـە

زبانی حاڵی «ئەحمەد» هەر ئەڵێ وریـا بـن، ئـەی میللـەت
بـزانن بـەردی ئـەم شـاخانە، ئەڵـماس و گوهەرتانـە



که دڵبەر خوەی نواند، خوەرشیدی خاوەر زوو فەراری کـرد
خەجاڵەت ما و بە زەردی عەزمی پشتی کۆهـساری کـرد
بە سـۆزی سـینە نـاڵانی لـە فەسـڵی پـایزا بوڵـبوڵ
کەرۆیـە نـاو گوڵـستان و خەیاڵـی نەوبـەهاری کـرد
خودا ڕۆژی ئەزەل ئەو بەژن و باڵایەی کـە تەسـویر کـرد
لە شەوقی ئەو بوو، خەلقی عەرعەر و سەرو و چناری کـرد
وتی: میسکی خەتا، بۆ من خەتایـە، لافی بۆنخۆشـی
کە هات و بۆنی عەتری پەرچەمی شێواوی یاری کرد
ڕەقیب وەختێ کە دی یـار میهرەبانـە دەرحـەقی عاشـق
تەقی کرد وەک سەگ و تۆپی لە داخـا ئینتیحـاری کـرد
لە حەسرەت لێوی لەیلا بوو کە مـەجنوون شـێت و ڕسـوا بـوو
بە جارێ کەوتە کێو و دەشت و سـەحرا، تـەرکی شـاری کـرد
کە بیستی موژدەیی تەشریفی تۆ، عاشق لە خۆشـیدا
گیـانی مـابوو تـەنها وو ئەویـشی زوو نیـساری کـرد
بژی ئەو شاهی حوسنە وا لە ڕووی لوتـف و کـەرەمکـاری
کەوا یادێکی حاڵـی «ئەحمـەد»ی ڕووت و هـەژاری کـرد

* * *

دێتە گوێم دەنگێ بە سۆز و شـیوەن و گریانـەوە
نالـــەیی دڵـــمە لـــە داخـــی خـــاکی کوردســـتانەوە
ئیسمی وجدان و عەداڵەت بێ موسەممایە و درۆ
بـۆ سیاســەت ئـەم قـسە کەوتۆتـە سـەر لێوانـەوە
ئەم قەراری عوسبە وا خەڵکی ئەڵێن بۆ کورد ئـەبێ
هەر قسەی ڕووتـە و قـسەش ناچێتـە نـاو گیرفانـەوە
ئەمڕۆ با وا بـێ بـەڵام ڕۆژێ ئـەبێ ئـەولادی کـورد
دێنـەوە مەیـدان بـە عـیلم و سـەنعەت و عیرفانـەوە
نەوجەوانانی وەتەن تەوحید ئەکـەن ئـەم میللەتـە
هەر لە کرماشان هەتا ورمـێ و سـنە و بۆکانـەوە
ڕێکئەخەن وەزعییەتی وان و جزیـرە سەربەسـەر
عەقرە و زاخۆ ئەبەستن ڕێـک بـە قـەد بۆتانـەوە
خانەقین و مەندەلی، خاکی لوروستان یەکبەیەک
وەک وەسا ئەدروون بە باڵای مەنتیقەی بابانـەوە
بەچکــەشــێرانی عــەشـایر بوقــڕانی دوژمنـــان
هەر وەکوو ڕۆستەم ئەکەونـە هـاتن و جۆلانـەوە
پاش قڕانی موددەعی دەست پێئەکەن تەعمیری موڵک
ڕێگــەیی ئاســن ئەچێتــە شــاخی هەورامانــەوە

*ادبیّـات و شـعر کـوردی*، رفیـق حلمـی. *تـاریخ سُـلیمانیّە*، ل٢٤٢. *گوڵدەســـتەی شـــوعەرای هاوعەســـرم*، ل٥– ٨.

گۆڤاری *ماد*، چاپی تاران. *مێژووی ئەدەبی کوردی*، ل ٥٠٠.

## مەلا موحەممەدی پێنجوێنی

کوڕی سەعید، خەڵکی پێنجوێن، ساڵی ١٢٨٧ ک. م. هاتۆتە دنیا و بەو بۆنەوە دایکی، خوشکی عەللامە مەلاوڕەحمانی پێنجوێنی بووە، ناوی «خوشکەزا»ی بەسەردا براوە.

موحەممەد دوای ئەوە پێگەییشت و وانە سەرەتاییەکان فێر بوو، بۆ خوێندن کەوتە گەڕان؛ ماوەیەک لە تورجان و مەهاباد و پاشان گەڕاوە پێنجوێن و سەرەتێک لای خاڵی خوێندی و ئیجازەی وەرگرت. ئەوجار لە گوندێکی لای مەریوان و سەردەمێک لە «نسارە»ی سەر بە پێنجوێن، دەرسی گوتەوە و وردە وردە ناوی‌دەرکرد و بوو بە قازی پێنجوێن.

مەلا موحەممەد پیاوێکی زانای هەمیشە خەریکی خوێندنەوە و تۆژینەوە بووە و قورئانی پیرۆزی لە چەند بەرگدا کردۆتە کوردی و «*تەزکاری ئیمان بۆ قەومی کوردان*»ی ناو لێ ناوە. پاش سەربەخۆیی عیراق و هاتنە ئارای بارودۆخی نوێ، ئەم هەر وەج و ڕێزی خۆی هەبووە و دادوەری کردووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٥٤ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل٥٣٨.

## سیدقی زەهاوی

جەمیل سیدقی، شاعیر و بیرمەندی گەورەی عیراق، چوارشەمبە، دوایین ڕۆژی مانگی زیحەججەی ساڵی ١٢٧٩ ک. م. لە بەغدا هاتە دنیا. بابی (مەلا موحەممەدی فەیزی زەهاوی) موفتی گەورەی عیراق، لە هۆزی ناوداری بابان.

وەک لە باسی مەلا موحەممەدی فەیزدا گوتمان، وشەی «زەهاوی» بەو بۆنەوە بۆتە کەسناو بۆ ئەم بنەماڵەیە کە باپیری جەمیل (بابی مەلا موحەممەدی فەیز) ـکە موحەممەدبەگی ناو بووەـ لە سلێمانیوە دەڕوا بۆ ناوچەی «زەهاو»ی لای کرماشان و ماوەی دوو ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە و لەو خێڵە ژن دەخوازێ و موحەممەد لەو ژنەیە. ئەم بنەماڵە کە دەگەڕێنەوە بۆ سلێمانی، شۆرەتیان دەبێتە «زەهاوی».

جەمیل زانستە حوجرەییەکانی لە خزمەت باوکی و چەند مامۆستای تری بەغدادا، خوێند و زۆرێک لە وانە نوێیەکانیشی، بە خوێندنەوەی کتێبی عەرەبی و ترکی و هەروەها لە خزمەتی زانایاندا فێربوو. شیعر هۆنینەوەشی سەرەتا بە زبانی فارسی دەسپێکرد و دواجار شیعری عەرەبیشی دانا و لە زۆرێک ڕۆژنامە و گۆڤاری وڵاتە عەرەبییەکان، وەک: عیراق و شام و لوبنان و هەروەها تورکیا، پێڕای وتارەکانی، بڵاو بوونەوە.

جەمیل ئەم بەیتەی ١٥ساڵان گوتووە؛ کاتێ کە تازە دەستی بۆ شیعرگوتن بە عەرەبی بردووە:

أمـا آنَ أنْ نَـأبى عَلَـى الـوطَن الْعـارا فَنَرْكَـبَ أخْطـاراً و نَقْـضىَ أوْطـارا

جەمیل سیدقی یەکەم کەسێکە لە عیراقدا کە باسی مافی ژنانی هێنایە ئاراوە و بەرهەڵستی ملـهوڕیی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی بوو. ساڵی ١٣٠٣ ک. م. لە سەردەمی لاوی (تەمەنی ٢٤ ساڵاندا)، بووە ئەندامی کۆڕی مەعاریفی بەغدا. بە شـوێن ئـەوەدا کرایـە سەرپەرشـتی چاپەمـەنی دەوڵـەتی و بەرپرسـی ڕۆژنامەی ڕەسمی«الزَّوراء». ٣٠ ساڵان بوو ژنێکی ترکی لە بنەماڵـەیەکی ئابڕوومەنـد خواسـت و ئەگـەرچی منداڵی لێ نەبوو، بەڵام ـ وەک خۆی دەڵێ ـ باشترین دۆستی دەورانی پیری و زورهانی ئـەو بـووە. ساڵـی ١٣١٦ لێبڕا بچێتە ئەستەمبووڵ. لەپێشدا چووە قاهیرە و کەڵەپیاوانی وێژەوانی و ڕامیاری میـسری بـینی و دوای ماوەیەک گەیشتە ئاستانە (پاتەختی عوسمانی) و لەوێ بە ئەندامەتی گرۆی چاکسازی، بۆ وتاربێژی و ڕێنوێنی، ناردرایە یەمەن و ماوەی نۆ مانگ لەو وڵاتە ماوە. لە گەڕانەوە بۆ ئەستەمبووڵ، لەگەڵ ئازادیخوازانی ترکدا پێوەندی گرت و چووە ناو کۆمەڵی دژ بە زۆرەملی و لەپەستا شێعر و قەسیدەی بە ناوی هەڵبەستەوە، دا بە ڕۆژنامە و گۆڤارە میسرییەکان. لە ئاکامدا پێیان زانی و ناردیانەوە عیراق.

کە مەشرووتە ڕاگەیەنرا، سیدقی گەڕاوە ئەسـتەمبووڵ و کرایـە مامۆسـتای فەلـسەفە و ئـادابی عـەرەبی زانـستگای ئاسـتانە. دوای ساڵـێک گـەڕاوە بەغـدا و لـە زانکـۆی حوقۆقـدا، قـانوونی شارسـتانییەتی، بـە دەرس گوتەوە. لەم ماوەدا، دیسانەکە بوو بە نوێنەر لە کۆڕی هەڵبژێردراوان لە پاتەختی عوسمانلیدا. جەمیل سیدقی ئەم جارە بە ڕاشکاوی باسی لە مافی میللەتی عەرەب هێنایە پێش و زۆری خزمەت پێیان کرد.[1]

دوای یەکەم شەڕی دنیاگر و دەسەڵاتداری بریتانیا بەسـەر عیراقـدا، ماوەیـەک وەکـوو ئەنـدام و دواجـار سەرۆک، لە کۆڕی معاریف و زانستەکاندا، قانوونی بە ترکی نووسراوی، کردە عەرەبی.

کە فەیسەڵ بوو بە شا لە عیراقدا، سیدقی چوو بۆ میسر و لەوێوە سووریا و ئـەمجار لوبنـانیش گـەڕا. لـەو سەفەرانەیدا، دەگەیشتە هەرکوێ، بۆ ڕێزلێنانی، لە لایەن زانایان و وێژەوانانەوە، کۆبوونەوەیان ڕێکدەخـست و داوایان لێ دەکرد قسەیان بۆ بکا. شیعرەکانیشی، یەک لە دوو یـەک، لـە چاپەمـەنی ئـەو وڵاتانـە، چـاپ دەکران. بە دامەزرانی مەشـرووتە لـە عیراقـدا، سـیدقی گـەڕاوە زێـدی خـۆی و بـوو بـە ئەنـدامی کـۆڕی ریش‌سپییان (شیوخ) و ماوەی چوار ساڵ ئەم پۆستەی هەبوو.

جەمیل سیدقی زەهاوی عومری هـەموو لـە خـەبات و گێرەوکێـشەدا تێپـەڕ کـرد و هەمیـشە ئـازراوی ناحەقیکاری دەسەڵاتداران و چەوساوەیی هەژاران بوو. زۆر جاران تەبعیدیان کرد و لە ئەسـتەمبووڵ چەنـد جار گیرا و لە زیندان توند کـرا؛ بـەڵام دڵـی بـەتین و سـەری نەترسـی، بـەم شـتانە سـارد نـەدەبۆوەوە و دانەدەنەوی. لە هەر دەرفەتێکـدا، ئـەچووە نێـو خەڵـکەوە و بـە هەڵـدانی گەندەڵـییەکانی دام و دەزگـای

١. کوردێکی وا نەترس و پیتۆڵ بێ؛ بەڵام هاوار بۆ مافی عەرەب بکەی! دیارە ئەوانیش گەلێک پێزانن! و.

دەسەڵاتداری، وشیاری دەکردنەوە. لە بارەی خۆیەوە دەڵێ: «کە منداڵ بووم، بەهۆی کارە نائاساییەکانمەوە، بە شێتیان دەرکردم؛ بە لاوی، لاساری لاژگیان پێ گوتم؛ پیر بووم، بوومە نەترسی گوێنەدەر و ئێستە بە زورهانی، لەدینلادەرم پێ ئێژن؛ بۆچی؟ لەبەر ئەوە بیر وڕای خۆم بە ڕاشکاوی دەردەخەم و قەت لە کەس کۆم نەکردۆتەوە.»

هەرچۆنێک بێ، جەمیل سیدقی یەک لە ئەستێرە درەوشانەکانی ئاسمانی شیعر و وێژەی عەرەبە و جێی خۆیە کە «امیرُالشُّعَرا»ی دەورانی خۆی پێ بگوترێ. ئەڵبەت ئەو بێجگە لەمەش، فیلەسووف و بیرمەندێکی پایەبەرزە. ئەوی لەمەڕ مردن و ژیانی دوای مەرگ و کێشەی خولقان و زۆر باس و گرفتی تری مرۆ لە چەرخی بیستەمی زایینیدا، هێناویەتە ئاراوە، هەموو جێی تێڕامانە.

لە بەرهەمەکانی جەمیل سیدقیدا، جاروبار شتی دژبەیەک و ناتەبا دێنە پێش چاو. جارێک لە خودا و ڕۆژی پەسلان و ... دڕدۆنگە و جارێکی تر، عارفێکە ئاو لێڵ ناکا! بۆ وێنە لەم شیعرانەدا، کە هەستی خۆی کردۆتە داوەر، دەڵێ:

| | |
|---|---|
| و لَیس یُبالی میّتُ فی حَفیرة | بأنَّ ضریحاً فیه قَدْ نامَ، ضَیِّقُ |
| وَ سائلَة هَلْ بَعْدَ أنْ یَعْبَث الْبلی | بأجْسامنا، نَحْیی وَ نَرْنُو و نَنْطقُ |
| فَقُلتُ مُجیباً إنَّنی لَسْتُ واثقاً | بغَیْر الَّذی حسّی لَهُ یَتحَقَّقُ |
| وَ هَیْهاتَ لاتُرْجی الْحیاةُ لمَیِّت | إلیْه البلی فی قَبْره یَتطَرَّقُ |

کەچی لە لایەکی ترەوە، کە هێندێک هێور بۆتەوە و کوڵی دڵی دامرکاوە، پێڕای سکاڵایەک لەگەڵ ئافرێنەریدا، ئێژێ:

| | |
|---|---|
| إلیْكَ إلَهی! فی بكاء أُجیدُهُ | قَصیداً إذا ما نابَنی الخطْبُ أضْرَعُ |
| إلیكَ بداجی اللَّیل فی الْبحر إنْ طَغی، | إلَیْكَ إذا ما ریعَ قَلْبیَ أفْزعُ |
| قَرَأتُ اسْمَكَ المحمودَ فی اللَّیل وَ الضُّحی | إذَ الشَّمسُ تَسْتَخْفی، اذَا الشَّمس تَطْلعُ |
| فَأیْقنْتُ أنَّ الْكَوْنَ بالله قائم | وَ آمَنْتُ أنَّ الله للكَوْن مُبدعُ |
| وَ أنَّكَ مَعْنی وَ الخَلیقَةُ لَفْظَةُ | وَ أنَّكَ حُسْنٌ وَ الطَّبیعَةُ بُرْقعُ |

لە جێژنێکی مەولوودی پێغەمبەر(د) لە ئەعزەمییەی بەغدادا، داوای لێ دەکەن بەشداری بکا و شیعرێکیش بخوێنێتەوە. ئەویش قەسیدەیەک ئامادە دەکا و دەیخوێنێتەوە؛ کە ئەمە دوو بەیتی:

| | |
|---|---|
| قالُوا امتَدحْ خَیرالبریَّة أحْمَدا | بقَصیدة تَشْدُو برفْعَة شانه |
| فَأجَبْتُهُمْ ماذا أقُولُ بمَدْح مَنْ | أثْنی عَلَیْه اللهُ فی قُرْآنه |

ئەم شیعرانە بۆمان دەردەخەن کە جەمیل سیدقی ــ پێچەوانەی بۆچوونی هێندێک ــ بڕوای بە خوا و ڕۆژی سەڵا و پێغەمبەر و قورئان بووە و ئەگەر جارــ جار، وەکی حەکیم عومەرخەیام یان ئەبولعەلای

مەعەڕڕی یا تەنانەت مەنسووری هەلاج، زۆر پرسیاری هەڵنەهێنراوی داهێناوە، پرتە و بۆڵە یان گازندەیەکی کردووە، تاوێک بووە؛ هاتووە و چووە و لە قووڵایی بیر و بڕوایدا، ڕەنگی نەداوەتەوە.

وەک لە ژینامەی موفتی زەهاوی، بابی جەمیل سیدقیدا گوتمان، حاجی میرزا ئەحمەدی دیـوانبـەیگی شیرازی، نووسەری ژینامەی «*حدیقةالشُعرا*»، ساڵی ١٢٩٧ ک. م. بۆ زیارەتی عەتەبات چووە بۆ عـیراق و لـە بەغدا شێخ عاسیمی سنەیی دیوە و باسی ئەم باوک و کوڕە پیتۆڵەی بیـستووە و بـەنیـازی چاوپێکـەوتنیان بووە؛ بەڵام دەستی نەداوە و هێندێک لە بەرهەمەکانیانی لە عاسیم سەندووە و لە ژینامەکەیدا هێناویە. ئـەو کاتە جەمیل، دەوری ٢٠ ساڵی بووە؛ ئەم دوو شیعرە فارسییەی کە ١٧ سـاڵان داینـاوە، عاسـیم بـە دیـوان بەیگی داوە:

عاشـق یکتـا نمـی‌باشـی الا ای دل چـرا؟ — می‌شوی هر لحظه بر معشوقه‌ای مایل چـرا؟

می کنی از امر ایزد، خویش غافل تا به کی — دوری از حق می کنی، گیری ره باطل چرا؟

گر نداند مُرغ چون میرد، رَهَد از هـر غمـی — آن قدرها رقصد از شادی چو شد بسمل چـرا؟

در درون تست مطلوب تـو ای مجنـون زار — بهـر لیلـی مـی‌روی انـدر پـی محمـل چـرا؟

جاهلان را هر که هم‌صحبت شود جاهل شـود — مـی‌شـوی بـر اهـل دنیـا «صـدقیا» مایـل چـرا؟

* * *

بـی‌رقیـب انـدر جهـان دلـدار کـو؟ — انـدر ایـن گُلـشن گُـل بـی‌خـار کـو؟

گـر فکنـد از رُخ نقـاب آن آفتـاب — دیـدەهـا را طاقـت دیـدار کـو؟

سیدقی زەهاوی ساڵ و نیوێک پێش کۆچی یەکجاری، واتا مانگی ڕەزبەری ساڵـی ١٣١٣ ک. هـ. (١٩٣٤ ز.)، لە لایەن دەوڵەتی عیراقەوە، هاوڕێ لەگەڵ شاعیری گەورەی تری ئەوێ «احمَد حامِد الصرّاف»[١]، چـوو بۆ تاران و لە جێژنی هەزارەمین ساڵی لەدایک بوونی فیردەوسیدا بەشداری کرد و شیعرێکی خوێندەوە کە هەر لەسەر کێشی «*شاهنامە*»ی فیردەوسی هۆنیویەتەوە؛ ئەوا چەند بەیتی:

بـە فردوسـی از مـن سـلامی بریـد — پـس از عـرض حرمـت پیـامی بریـد

کـە ای شـاعر خفتـە در زیـر خـاک — نهـان از نظـر دور از جـان پـاک

سـر از خـاک بـردار وانگـە ببـین — چـە شوری است بهـرت بـە روی زمـین

فـرو ریخـت اعجـاز از خامـەات — بیفـزود از آن قـدر شـهنامەات

جهـانی بـرای تـو جمـع آمـدە — بـرای ثنـای تـو جمـع آمـدە

ز هـر مملکـت صـد صـدا مـی‌رسـد — ز هـر سـر نـوایی جـدا مـی‌رسـد

١. وەک مامۆستا هەژار لە پێشەکی خەیامەکەیدا فەرموێ، ئەوی[illegible] کوردە! و.

چـو پـر شـد ز شـعرت زمـین و زمـان ســـتودند نـــام تـــو در هـــر زبـــان
هـــزار اســـت در قبـــر خـــود خفتـــه‌ای ولـــی زنـــده اســـت آنچـــه تـــو گفتـــه‌ای

شیعری جەمیل سیدقی، زۆرتر عەرەبین و چاپ کراون؛ بەڵام شیعری فارسی، کەم و کوردی، دەگمەنـە. دیوانەکانی بریەتین لە: ١. *الکلامُ المَنظوُم* ٢. *الُّلباب* ٣. *دیوان الزَّهاوی*

**کتێبەکانی**:

١. *الکائنات*، لە فەلسەفەدا

٢. *الجاذبِیَّةُ و تعلیُلُها* لە زانستی سروشتدا

٣. *الدَّفعُ العام و الظواهر الطّبیعیَّة و الفلکیة* ـ لە هەیئەتدا

٤. *العابُ الداما*

٥. *الفجر الصّادق فی اثبات الخوارق*

٦. *المُجْملُ ممَا أری*

٧. *خَطَراتُ الفَلْسَفَة*

٨. *رسالَةٌ فی الّنور*

٩. *رسالَةُ فی البصر*

١٠. *الخطُّ الجدید*

١١. *رسالَةُ الحمام*

١٢. *لیلی و سمیر*

١٣. حکمت *اسلامیه درس لری* (بە ترکی)

١٤. وەرگێڕاوی چوارینەکانی خەییام بە عەرەبی

١٥. *عیونُ الشّعر*

١٦. *رسالَةُ الخیل و سباُقها*

١٧. *مُحاضَرَةٌ فی الشّعر*

جەمیل سیدقی زەهاوی، لە کۆتایی ژیانیدا نەخۆش کـەوت و سـەرەنجام لـە ٢٩ی زیقەعـدەی ساڵـی ١٣٥٤ ک. م. (١٩٣٦ ز.)، دنیای بەجێهێشت و لە زیارەتانی ئەعزەمییەی بەغدایان ناشت.

شاعیری گەورەی ئێران، مامۆستا موحەممەد تەقی بەهار (مَلِکُ‌الشُّعراء)، لە شینیدا، تەرکیببەندێکی نـۆ بەندی هۆنیوەتەوە، کە ئەوا سێ بەشی:

دجلەی بغداد بـر مـرگ زهـاوی خـون گریـست نی خطا گفتم که شرق از نیل تا سیحون گریست
اشـک‌ریـزان شـد عـراق از مـاتم فرزنـد خـویش همچو یونان کز غـم هجـران افلاطـون گریـست

زین بلای عام یعنی مرگ سلطان سخن — مردم شهری به شهر و بدو در هامون گریست
از غم شعر روانش فکر از گردش فتاد — در فراق طبع پاکش لفظ بر مضمون گریست
زد گریبان چاک، نظم و ریخت بر سر خاک، نثر — از غم او هر یکی موزون و ناموزون گریست
دوش بر خاک مزارش خیمه زد ابر بهار — خواست تا در هجرش از چشم «بهار» افزون گریست
خندەای دندان‌نما زد برق و گفتا کای حسود — قطره کمتر زن، تو آب‌افشانی و او خون گریست

* * *

شد زهاوی خسته و زین دهر پرغوغا گذشت — دست‌افشان پای‌کوبان از سر دنیا گذشت
بود عمری سرگران از زحمت غوغای دهر — زین سبب پیرانه‌سر زین دهر پرغوغا گذشت
برگ امیدش ز دلها چون شقایق زود ریخت — لیک داغش لاله‌سان، کی خواهد از دلها گذشت
عالَمی فضل و ادب را برد با خود زیر خاک — گرچه از این خاکدان خود یکه و تنها گذشت
تلخکامی‌ها کشید از دهر لیکن در سخن — کام گیتی کرد شیرین پس به استغنا گذشت
در بر کیهان اعظم کیست انسان ضعیف — کش توان گفتن که شد فرتوت یا بُرنا گذشت
عمر اگر یک روز اگر صدسال، می‌بایست مرد — نیکبخت آنک از جهان آزاده و دانا گذشت

* * *

روح صدقی در جنان شاد است گویی نیست هست — جاودان از محنت آزاد است گویی نیست هست
در بهشت خاطر و گلخانەی افکار خویش — همنشین با سرو و شمشاد است گویی نیست هست
روح شاعر غیر زیبایی نجوید در جهان — خاصه آن کو پیر استاد است گویی نیست هست
هرکه زیبایی بجوید غرقه در زیبایی است — زانکه خود زیبا ز بنیاد است گویی نیست هست
روح چون زیبا بود او را خدا جویا بود — این حدیثم از نبی یاد است گویی نیست هست
نیست مشکل گر به حق واصل شود روح جمیل — گر جز این گوییم بیداد است گویی نیست هست
غرق غفران باد روحش وین دعا را بی‌خلاف — جبرئیل آمین فرستاد است گویی نیست هست

**چەند شیعری عەرەبی:**

لَقَدْ کُنْتُ فی دَرْب ببغدادَ ماشیا — و بغْدادُ فیها للْمُشاة درُوُبُ
فصادَفْتُ شَیْخاً قَد حَنی الدَّهرُ ظَهْرهُ — لهُ فی الصّراط المستقیم دبیبُ
عَلَیْه ثیاب رثَّةٌ غَیرَ أنَّهُ — نظافٌ فَلَمْ تَدنَسْ لَهُنَّ جُیُوبُ
یسیرُ الهُوَیْنا و الجماهیرُ خَلْفَهُ — یَسُبُّونَهُ، و الشَّیخُ لَیْسَ یُجیبُ
لَهُ وَقْفَة یَقوی بها ثُمَّ شَهْقَةٌ — تَکادُ لَها نفْسُ الشَّفیق تَذُوبُ
تَدُلُّ غُضُونٌ فی وسیع جبینه — عَلی أنَّهُ بَیْنَ الشُّیُوخ کَئیبُ

فَساءَلْتُ مَنْ هذا، فَقال: مُجاوبٌ — هُو «الحقُ» جاءَ الیَومَ فَهو غریبُ
و قلتُ لهُ: إنا غریبان ههُنا — و کُلُّ غریب للْغریب نَسیبُ
فجئت إلیه ناصراً و مُؤاذراً — و دمعی لإشفاقی علیه صبیبُ

* * *

قَد أتانی طیف لَیْلی لیْلَةً — بَعْدَ صَدٍّ و الدُّجی مُعْتکرُ
فتعاتبْنا علی طول النَّوی — و کلانا حالفٌ مُعتذرُ
و بکیْنا ساعَةً کاملَةً — بعُیُون دَمْعُها یَنْهمر
وتَعانَقْنا و فی أحْشائنا — لَوْعَةٌ نیرانُها تَسْتَعرُ
قَبَّلتْنی مثلَما قَبَّلْتُها — وَ هُناكَ النَّجْمُ عَیْنٌ تَنْظُرُ
و تحادثَنا إلی ان طَلَعَ ال — صبحُ وَ انجابَ الدُّجی یَنْحَسرُ
فَمضَی الطَّیْفُ و ولّی هارباً — وَ هو لا یلْوی و لا یَنْتَظرُ

*الزَّهاوی (دراسات و نصوص)*، بیروت ١٩٦٦ ز. *الاعلام*، ب٢، ل١٣٢. *تاریخ ادبیّات عرب*، تُرجانی‌زاده، ل٣١٠. *دیوان زَهاوی*، میسر، ١٣٤٣ ک. م. *تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٥٣. گۆڤاری *یادگار*، س٣، ژ٩، ل٦٤- ٦٨ و س٥، ژ١ و٢.

## مەلا ئەحمەدی ڕەببانی

مەشهوور بە «مەلا لاسوور»، کوڕی مەلا خوسرەو، ساڵی ١٢٨٥ ک. م. لە گوندی «پیریۆنس» هاتە دنیا؛ لە زانایان و مامۆستایانی ناوداری ناوچەی موکوریانە کە لە کەلام و حیکمەت و مەنتیقدا شارەزاییەکی ئەوتۆی هەبووە و بەسەر کتێبانی ئەم زانستانەدا، هێندێک پەراوێزی بایەخداری نووسیوە.

مەلا ئەحمەد پاش فێربوونی وانە سەرەتاییەکان، ماوەی چوار ساڵ لە مەدرەسەی تورجان، لای مەلا موحەممەد حەسەنی قزڵجی خوێندوویە و پاشان ماوەیەکیش لە خزمەتی مەلا موحەممەد حەسەنی بورهانی بەهرەی بردووە و ئیجازەی وەرگرتووە. ئەوجار لە گوندی «خۆش‌قشلاخ» و «مەرخوز»ی لای سەقز، دەرسی گوتۆتەوە و دوایی، پاش ٧٠ ساڵ ژیان، ساڵی ١٣٥٥ ک. م. ئەمری خوای بەجی‌هێناوە هەر لە مەرخوز نێژراوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ عومەری قەرەداغی

مامۆستای وریا و زانای هێژا، شێخ عومەری قەرەداغی مەردۆخی، مەشهوور بە «ابنُ‌القَرَداغی»، کوڕی عارفی زانا، شێخ موحەممەد ئەمینی غەفاری، کوڕی شێخ مەعرووف، کوڕی شێخ عومەر، کوڕی شێخ لەتیفی گەورە، ساڵی ١٣٠٣

ک. م. لە شاری سلێمانی هاتە دنیا و کە پێگەییشت، لای بابی خوێندنی دەسپێکرد و پاشان لە مامۆستایانی تری سلێمانی بەهرەی برد و دوایی هاتە خزمەتی مامی (شێخ نەجیبی قەرەداغی) ماوەیەک خوێندی و ئیجازەی وەرگرت. بەشوێن ئەوەدا بە هاوقۆڵی شێخ مەعرووفی برای، لە قوتابخانەی باوانییاندا، دەرس گوتنەوەیان دەسپێکرد و هەر ئاوری یەکەم شەڕی جیهانی کوژایەوە (ساڵی ١٣٣٨ ک. م.)، خانەقای پێشووی مەولانا خالیدیان لە شاری سلێمانی ـکە لە ڕووخابووـ ئاوەدان کردەوە و شێخ عومەر دەرس گوتنەوەی تێدا گرتە ئەستۆ.

شێخ عومەر ئەگەرچی عومرێکی زۆری نەکردووە و ساڵی ١٣٥٥ ک. م.[١] کاتێ کە ٥٣ ساڵی بووە، دنیای بەجێ‌هێشتووە، بەڵام یەکجار مامۆستایەکی سەرکەوتوو بووە و زۆرێک لە خەرمانی زانستی، بەشیان بردووە و ئیجازەیان لێ وەرگرتووە. هەروەها بەرهەمی نووسراوەشی بەرچاوە و هێندێک شەرح و پەراوێزی بایەخداری لێ بەجێماوە کە بڕێکیشیان لەچاپدراوە؛ وەکوو: پەراوێز لەسەر: *«جمع‌الجوامع»*، *«تذهیب‌الکلام»*، *«تشریح‌الافلاک»* و *«اشکال‌التاسیس»*ی شێخ بەهایی، *«گُلَنبَوی بُرهان»*، *«آداب گلنبوی»*، *«تصریف»*ی مەلا عەلی شنۆ، *«فَریده»*ی شێخی تووسی لە نەحودا. ئەمجار شەرحی: *«مَقولات عَشر»* و هۆنراوەی *«فرائض قزلجی»*. دوو کتێبی: *«رُبع مُجیَّب و مُقَنطرات»*، شەرح و دەق لە *«فرائض، مواریث»* و ...

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل٤١٥. *تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٧٧. *الاعلام*، ب٥، ل١٩٩.

## وەجدی سەقزی

میرزا سەمەد، نازناو «وەجدی»، برای گچکەی زانا و شاعیری بەناوبانگ، مەجدی «مَلکُ‌الکلام» ، شاعیرێکی هێژا و گفت جوان بووە و تا ناوەڕاستەکانی چەرخی چواردە ژیاوە.

وەجدی ماوەیەک وڵاتی خۆی بەجێ‌هێشتووە و بە شارانی عیراق و تورکیە، بەتایبەت شاری ئەستەمبوولدا گەڕاوە و ئەوجار گەڕاوەتەوە سەقز و تا کۆتایی ژیانی، لەوێ ژیاوە.

ئەم چەند بەیتە، بەشێکی قەسیدەیەکە بۆ کاکی (مەجدی) نووسیوە:

از حال خود چه شرح دهم کاتش محن — چون شمع کرد در تن من استخوان مُذاب
بی‌آنکه هیچ معصیتی سر زند ز من، — بی‌آنکه هیچ سیّئه‌ای سازم ارتکاب
پیوسته از خدای شدم مورد غضب — دایم ز کردگار شدم مهبط عقاب
هرگز نگشتم از فلک ایمن که همچو طفل — در خویشتن به لحظه بدیدم صد انقلاب
گر پرسیم کنون که چه سانی ز فرط ضعف — نتوانمست ز دل به زبان برکشم جواب

١. لە کتێبی *«یادی مەردان»*، ل٤١٧. ساڵی ١٣٥٣ ک. م. نووسراوە.

پــیش آمــده مــرا ســفر ملــک نیــستی ناچــار عَنقریــب نَهَــم پــای در رکــاب
بــر روی مــوج حادثــه زد خیمــه هــستیم تا دم زنم به سر شـودم عُمـر چـون حُـباب
دیگــر روا مــدار کــزین بــیش در ســقز گردم همی محل شماتت ز شیخ و شاب

یاداشتەکانی نووسەر. چەند جونگی دەسنووس.

## حەمدی ساحیبقەران[1]

ئەحمەد بەگ، نازناو «حەمدی»، کوڕی فەتاح بەگ، کوڕی حاجی ئیبرایم بـەگ، کـوڕی مـەحموود بـەگ، کـوڕی ئەحمەد بەگی گەورە (ساحیبقەران)، ساڵی ١٢٩٥ ک. م. لە سلێمانی هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکرد.

حەمدی زبانی فارسیشی زانیوە و جاروبار بەم زبانە شیعری داناوە؛ بەڵام زۆربەی شیعرەکانی بـە کـوردی سۆرانین. جارێک دیوانی شیعرەکانی لە سووتمانێکدا سووتا و لەسەرڕا دیوانی پێکنایەوە.

ئەحمەد بەگ ماوەیەک سەپەرشـتی گـومرک و دوای ئـەوە، بەرپرسـی شـارەداریی لـە ئەسـتۆ بـووە و سەردەمێک هاوڕێیی شێخ مەحموودی بەرزنجی کردووە. ئەو لەگەڵ مستەفا بەگی «کوردی» و ئەوڕەحمان بەگی «سالم»دا لە بنەماڵەیەکن.

حەمدی ساحیبقەران شاعیرێکی بەرزەمژ، نەترس و قسەخۆش بووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٥٥ ک. م. لە سلێمانی کۆچی یەکجاری کردووە.

**چەند نموونە شیعری حەمدی**:

سوبح پێناکەنێ، تا بێنەوایێ شـەو بـە دڵ نـەگری گوڵێ ناپشکوێ تـا بولبـولی سـوبحی بـە کـوڵ نـەگری
بەری نابێ درەختی باغی عالەم تا هەموو وەکیەک بە یەک سۆز و بە یەک شۆر و بەیەک دەم چڵبەچڵ نـەگری

* * *

١. بنەماڵەی ساحیبقەران، لە ئەحمەد بەگی گەورەوە دەسپێدەکا؛ کە یەک لە ١٢ سوارەی بەناوبانگی مەریوانە. وەک دەڵێن لە سوارکاری و تیرهاوێژی و دلێریدا، هاوتای هەڵنەکەوتووە و بەم بۆنەوە «صاحبقران»یان پێ گوتووە؛ واتا سەرکەوتووی خاوەنی نگین. یەک لە کوڕانی ئەحمەد بەگ، مەحموود بەگی ناو بووە کە بۆ خاکی بابان چووە و سەرپەرشتی چەکـدارانی حـاکمی بابانی کردووە. پێنج کوڕی هەبووە: ئەمین بەگ، حەمید بەگ، مستەفا بەگ، داود بەگ و ئیبرایم بەگ. ئەمین بۆ ئەستەمبووڵ چووە و دوای هێندێک بۆ حیجازیان ناردووە و لە مەککە مردووە. حەمید چۆتە سنە و لەو شارە دانیشتووە. کوڕێکی بووە، قادر بەگی ناو بووە، بابی عادڵەخاتوونی ژنی عوسمان پاشای جاف، دایکی شاعیری بەناوبانگ، مستەفا بەگی کوردی؛ کە باسـیمان کردووە. داود بەگ چۆتە مەککە و لەگەڵ ئەمینبەگی برایدا ژیاوە و هەر لەوێ سەریناوەتەوە و دوو کوڕی لـێ بـەجێمـاوە: عوسمان و حوسەین. حاجی عوسمان بەگ دوو کوڕی بووە: ساڵەح و داود. ئیبرایم بەگ لە سـلێماندا ژیـاوە و کـوڕێکی لـێ بەجێماوە، بە ناوی فەتاح بەگ؛ بابی ئەحمەد بەگی ساحیبقەران، نازناو «حەمدی» کە ئەوا دەکەین.



نازی گەردوون بۆ ئەکێشم ئەو بە ڕۆژی ڕووتـەوە
من بە ماهی نەخشەبێکی شوعلەوەر وەک ڕووتەوە
بەر دەخا ئاهووی خوتەن بۆ نافەیێکی موشـکبوو
عەنبەری سارا فرۆشـم مـن بـە سـایەی مووتـەوە
تاقی ئەبرووتم موڕادە ڕوو بە قیبلەم بـۆ نـوێژ
ئەهلی قیبلە چی بەسەر میحرابی تـاق و جووتـەوە
تا قیامەت من منەتباری خەمی هیجرانی تۆم
ئەو ئەخۆم و عامیانە نـیم بـە تـەنگی قووتـەوە
بۆ گەدایی کۆیی جانان سـەڵتەنەت هـەر مردنـە
گەر خودا ڕەحمی لە دڵ نیێ، بێ لەتەک تابووتـەوە
عیشقی شیرینت ببێ عاشق! لەگـەڵ ئـەم وەسـفەدا
کووهـکەندێکی چ حـەققەت تـۆ بەسـەر بازووتـەوە
دڵبەرت ڕۆیی، ڕەقیبت کەوتە دووی، خاکـت بەسـەر
«حەمدی» بنواڕە! سەگێکە وا بـە دووی ئاهووتـەوە

* * *

خوزگە ئەمزانی بەسەرمانا فەڵەک بۆچ ناز ئـەکا؟
حیفزی ئادابی قەواعید بۆچ بە ئەمـری شـاز ئـەکا؟
تێنەگەیوە ئێمە ئەیزانین موسەببیب هـەر ئـەوە
حوشترە قەززاز، مریشکە هێلکە هەروەک قاز ئـەکا
شینە شاهۆیە لە ئەوجی کەهکەشـاندا وەک شـەهێن
بۆ شکاری قورسی مانگ و جیرمی ڕۆژ پەرواز ئـەکا
ساقی کوێرە، کاسە کەل، بادە نەسیبی شـێت و شـەل
مـوتربی ناسـازە تـاری بـەزمی عالـەم سـاز ئـەکا
جاهیل و کـەمفـام دایم گەیوەتـە وەسـڵی نیگـار
ماچی سەر کوڵمی لەتیفی هەر بـە جووتـە و گـاز ئـەکا
کەر لە کوێ کەوتوو، لە کوێ کوندە دڕاوە سەیری کەن؟
ئاشـەوان دانی نییـە، بەردئاشـەکەی بـیراز ئـەکا
تەبعی «حەمدی» دەستگاهێکە بـە میعمـاری غـەزەڵ
نەوبەری هاوعەسـرەکانی ئەلبـسەی مومتـاز ئـەکا

* * *

ئەحواڵی ئـەم زەمانـە لـە کایـەی منـاڵ ئـەچێ
دونیایـەکی چ پووچـە لـە زەرفی بـەتاڵ ئـەچێ
لەم باغە هەردەمـە کـە دەگـا مێوەیـێ ئەڵـێی:
ئـەم کۆنـە گومبـەزە لـە دوکـانی بـەقاڵ ئـەچێ
نەقس و کەماڵی ئەهلی جیهان موعتەبـەر نییـە
هەر دوو موحەققەقە کە بە دەسـتی زەواڵ ئـەچێ
ئیقباڵ و شوومی تـابیعی عـیلم و جـەهل نییـە
ڕێکەوتـە، بـازە ئەمـڕۆ، سـبەینێ لـە داڵ ئـەچێ
بـازاری دەهـرە قیمـەتی ئەشـیا بـە جێگەیـە
مێشێ لە ڕووی نیگارێ بنیـشێ لـە خـاڵ ئـەچێ
هەر ناڵە، وا لـە بـورجی جـەلالا وەکـوو هـیلال
هەر ماهە، وا لـە کـونجی مـەلالا لـە نـاڵ ئـەچێ
بەو عومرەوە کە بوویەتی «نـۆح»یـش وتوویـەتی
دونیا لـە ڕیحلـەتا لـە خـەوی بـێخـەیاڵ ئـەچێ
زۆرتـر لـە بێنـەوا، بـە مـەنافیع ئـەگا غـەنی
ئەم تا ببـێ تەنـەززول ئـەکا، ئـەو بـە بـاڵ ئـەچێ

*تـاریخ سُـلیمانیّە*، ل ٢٤١. *گوڵدەسـتەی شـوعەرای هاوعەسرم*، ل ١٩. *مێژووی ئەدەبی کوردی*، ل ٤٣٦.

## حافیز موحەممەدی ئاماسیەیی

حافیز موحەممەد سەباتەدین، خەڵکی ئاماسیە، ساڵی ١٣٠٩ ک. م. لە بنەماڵەی «شەکیوی» هاتۆتە دنیا و خوێندنی لە کوردستانی باکوور و باشوور دوایی هێناوە و زیاد لە کوردی، بە فارسی و عەرەبی و ترکی شیعری گوتووە و لە شێستەکانی چەرخی چاردەی کۆچیدا، کۆچی دوایی کردووە. دیوانی شیعرێکی لێ بەجێ ماوە و ئەمە وێنەی شیعری:

| | |
|---|---|
| به هرجا رو کنی یا جلوءات در اهتزاز آری | میان دلبران تنها تویی صد امتیاز آری |
| اگر من بندەم تو خسرو خوبان، چه خواهد شد؟ | چو محمود ار گهی ای دوست! یادی از اَیاز آری |
| کشیدم رنج آزارت، چشیدم زهر نازت را | از این پس از تو می‌خواهم که ناز آری، نیازاری |
| تو را گاهی جفا گر بود، دنبالش وفایی بود | کنونم انتظار آن است آن رفتار باز آری |

گۆڤاری گەلاوێژ. چەند جونگی دەسنووس.

## مەلا موحەممەدی باڵەقۆڵوو

حاجی مەلا موحەممەد، مەشهوور بە «حاجی خەلیفە»، کوڕی مەلا سەعید، لە ٢٧ی ڕەبیعولئەوەڵی ساڵی١٢٧٣ ک. م. هاتۆتە دنیا و دوای خوێندنێکی سەرەتایی بە لای بابیەوە، بۆ سلێمانی چووە و لەوێ درێژەی بە خوێندن داوە و پاشان چۆتە سنە و ئیجازەی وەرگرتووە. ئەوجار گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و ساڵانێکی زۆر مامۆستای گوندی «باڵەقۆڵوو» و «جامبلاغ» و چەند شوێنی تربووە. لەوەپاش چۆتە مەهاباد و لە خانەقای نەهری، تا کۆتایی ژیان (٢٧ی ڕەمەزانی ١٣٥٦ ک. م)، دەرسی گوتۆتەوە و خزمەتی ئایینی کردووە.

حاجی مەلا موحەممەد مرۆیەکی هێژا و پارسا، ڕەوشت جوان و گفت ڕەوان و لە مریدانی سەید عەبدولقادری گەیلانی‌زادە بووە. سێ جار حەجی کردووە و لەمەڕ ئەو سەفەرانەوە، کتێبێکی نووسیوە. شیعریشی گوتووە و نارناوی «بەها»ی هەڵبژاردووە. ئەم غەزەلە هی ئەوە:

نگاری مەهوەشی زیبا نیقابی شەرمی لاداوە
لە شووری عاشقان ئەمڕۆ دەڵێی مەحشەر هەڵستاوە

بە غەمزەی چاوی مەستی ساحری سەیدی دڵی وا کرد
وەکوو بیژەن لە چای ئەفراسیابی مەینەتا ماوە

لە جیلوەی قامەتی سەروت خەجاڵەت سەروی جۆبارە
لەبەر غونچەی دەمت ئەی جان فدات بێ، غونچە داماوە

لەبەر موشکی دوگیسووت بای سەبا وا عەنبەرئامێزە
لە بازاڕی خوتەندا موشکی ئەزفەر بێ‌ڕەواج ماوە

مەگـەر مـاری زوحاکـە، قاتـڵی خەڵـکە سیازوڵـفت؟
وەیا ڕەشماری گەنجە، دەوری گەنجی ڕوومـەتی داوە
وە یا هەوری ڕەشە بەو ڕەنگە پۆشی ماهی ڕوخسارت؟
شەوی دەیجوورە، یا زولفـە کـە ڕۆژی ڕووتی پۆشـاوە؟
مەگەر گوڵباخییە ڕووت وا کـە سـوور و نـاز و پـڕئاوە؟
کە هەرکەس دێ وەکوو بولبول دەبێ شەیدا هەتا مـاوە
پەری یـاخۆ فرشـتەی وا لـەتیف و دڵـبەر و شـۆخی؟
وەها لەو حوسنی شیرینت خـەلایق گـشت عەجـەب مـاوە
بلـۆرە گـەردەنت یـا کەهـڕوبا یـا شووشـە یـا زێـڕە
لـەتیـف و زەرد و سـاف و دڵـبەرە، پـڕتاب و پـڕئاوە
بەدەن گوڵباخ، لیباس گوێنـار، چ شـیرین ئیتتفاقێکـە
عەجەب مەششاتەیێ بەو گوڵبونە ئـەو بـەرگی پۆشـاوە
«بەها» ڕۆحی فیدای دووچاوی جادووی مەستی غـەممازت
بە غەمزە سەد وەکوو هـارووت و مـارووتی فریـب داوە

ڕۆژنامەی کوردستان، چاپی تاران، س ١٣٣٦ ک. ه.

## مەلا حەسەنی بامەڕنی

کوڕی مەلا ئەحمەدی بابەک، ساڵی ١٢٨٤ ک. م. لە گوندی «بامەڕنی»سەر بە ناوچەی بادینان هاتۆتە دنیـا و ساڵی ١٣٥٦، هەر لەوێ لە دنیا چووە. باپیرانی ڕەتەوەی خۆیان دەبەنەوە سەر حەزرەتی ئەبووبـەکر (د) و لە نێوانیاندا زۆر کەسانی هێژا هەڵکەوتوون.

حەسەن لە ژێر چاوەدێری باوکیدا، بارهات و خوێندنی لە بامـەڕنی دەسـپێکرد و لـە چەنـد شـوێنیتـر شوێنی گرت و سەرەنجام ئیجازەی وەرگرت و ئەمجا گەڕاوە زێدی خۆی و شانی لە خوێندنەوەی کتـێبی وێژەیی و دیوانی شاعیران شل کرد و بۆخۆشی شیعری گوت.

وەک نووسیویانە، شیعری مەلا حەسەن، بە کرمانجی و لەوپەڕی جوانی و ڕەوانیدان.

*الاکراد فی بهدینان*، ل ٢١٠ و ٢١١.

## مەلا موحەممەد سەعیدی فازیل

مەلا موحەممەد سەعید، خەڵکی دێهاتی «دەربەند»ی لای دیواندەرە، پیاوێکی بەڕاستی هێژا بووە؛ بەتایبەت

زبان و ویژەی فارسی چاک زانیوە و لە دیوانی شاعیرانی وەک فیردەوسی و سەنایی و عەتتار و نیزامی و کەلیم باش سەری دەرچووە.

مەلا سەعید پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، باری کردووە بۆ شار و لە سنە نیشتەجێ بووە و پێڕای بەجێهێنانی ئەرکی دینی خۆی لە مەحکەمەیەکی شەرعیدا، کات و ساتێکیشی بۆ خوێندنی دەقە ویژەییەکانی زبانی فارسی، تەرخان کردووە و بە نەختە داهاتەکەیەوە ساچاوە و بە سەربەرزی ژیاوە و دواییش لە پاییزی ساڵی ١٣٥٦ ک. م. ئەمری خوای بەجێ هێناوە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## فەریق حاجی مستەفا

یەک لە ئەفسەرانی کوردی لەشکری ترکان بووە کە دوای هەڵوەشانەوەی عوسمانی و سەربەخۆیی عیراق، لە ئەرتەشدا، تا پلەی سەرتیپی (جنراڵی) چووە و کار و پۆستی زۆر و گرینگی لە ئەستۆ گرتووە.

فەریق حاجی مستەفا پاشا، پیاوێکی زانا بووە؛ ساڵی ١٩٢٢ ز. مافی لەچاپدانی حەوتەنامەیەک بە ناوی «*بانگی کوردستان*»ی وەرگرتووە؛ کە وانەی ویژەیی و زانستی، بە زبانی کوردی تێدا نووسیوە و تا چواردە ژمارەی لە سلێماندا دەرخستووە و ساڵی ١٩٢٥ ز. سێ ژمارەی تری لێ بڵاو کردۆتەوە و ئەوجار داخراوە.

زاو و مەرگی حاجی مستەفا پاشا، ساڵانی ١٨٦٨ز. و ١٩٣٦ ز. بەرامبەر بە ١٢٨٦ ک. م. و ١٣٥٦ ک. م. ڕوویداوە.

مێژووی ئەدەبی کوردی، ل ٥٥٠ و٥٥٣.

## شێخ مستەفای هەڵەبجە

شێخ مستەفای موفتی هەڵەبجە، کوڕی شێخ مەحموود، کوڕی عەللامە شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی، ساڵی ١٢٩٥ ک. م. لە هەڵەبجە هاتە دنیا و لای بابی خوێندنی دەسپێکرد و پێش ئەوەی تەواوی بکا (١٣١٩ ک. م.)، بابی ئەمری خوای بەجێهێنا. ناچار چوو بۆ بیارە و لە خزمەتی مەلا عەبدولقادری مودەڕڕیس، دەرسەکەی تەواو کرد و ئیجازەی وەرگرت. ئەوجار گەڕاوە هەڵەبجە و جێی بابی گرتەوە، بەرنوێژی و وتاربێژی و دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکرد.

شێخ مستەفا مرۆیەکی زانا، میوان‌خۆشەویست و خزمەتگوزاری چینی مامۆستا و زانا بووە و لەماڵیدا هێژایان بەردەوام کۆڕیان گرتووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٥٦٧ و ٥٦٨.

## سەید عەبدولعەزیزی شێخولئیسلام

حاجی سەید عەبدولعەزیز، کوڕی سەید عەبدولمەجید «ناظِمُ‌السّادات»، کوڕی سەید عەبدوڕڕەحمان، کوڕی سەید عەبدوڕڕەحیم، کوڕی سەید مەحموود، کوڕی سەید زەکی شێخولیسلام، لە زانایانی بەناوبانگی سنەیە کە لای عەللامە مەلا عەبدوڵڵای موفتی دشی، خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە. ئەوجار لە مزگەوت و مەدرەسەی «وەزیر»ی شاری سنە، بەرنوێژی کردووە و دەرسی گوتۆتەوە و پاش ماوەیەک بووە بە جێگری شێخولیسلامی ئەو کاتە و سەرەنجام ساڵی ١٣٣٨ ک. م. پایەی شێخولیسلامی پێ دراوە.

ڕەحمەتی سەید عەبدولعەزیز، پیاوێکی ئاگا و بەشەرەف، لەسەرخۆ و بێ‌نیاز بووە؛ زبان و وێژەی فارس و عارەبی باش زانیوە. جاروبارە شیعری گوتووە و پەخشانی فارسیشی جوان نووسیوە. ئەگەرچی ئیشی شێخولیسلامی و دادوەری، کاتێکی زۆری بۆ نەهێشتۆتەوە، بەو حاڵەش تا کۆتایی ژیانی دەرس‌گوتنەوەی نەفەوتاندووە و زۆرتر لە ماڵەوە بە دەرس و دەوری فەقێیاندا ڕاگەیشتووە.

حەسسانی کوڕی سابیت، ئەسحابەی مەشهوور، دوو بەیتی لە پەسنی پێغەمبەردا (د)، گوتووە؛ ئێژێ:

وَ أحسَنُ منکَ لَمْ ترَقَطُّ عَیْنی — وَ أجملُ منکَ لَمْ تَلِدِ النّساءُ
خُلقْتَ مُبَرّاً مِنْ کُلِّ عیبٍ — کَأنَّکَ قَدْ خُلقْتَ کَما تشاءُ

سەید عەبدولعەزیز وای کردۆتە فارسی:

زهی طلعت حضرت فخر عالم — که بسته است از نور راه تماشا
چنان در نکویی فزون است، گویی — که خود خالق و آفریده کماشا

ئەو خوا لێ خۆشبووە، وشەی «خُلَقْتَ»، لە باڵی ئاخری شیعرەکەی حەسسانی، «خَلَقْتَ» خوێندووتەوە و بەو شێوەش وەریگێڕاوە و نووسیویە: ئەگەر وابێ، جوان‌تر و ڕەوان‌ترە.

جارێک لەمەڕ حەرام یان حەڵاڵ بوونی گوێ‌گرتن بۆ گرامافۆن، بەم ڕستە لە بابی ڕەحمەتیم پرسیاری کردبوو: «أری تَری الکرامافون کَأصْله فی جنْسه وَ فَصله و السَّلامُ علیکم و علی من لدیکُم.»

زا و مەرگی مامۆستا ساڵانی ١٢٨١ و ١٣٥٧ ک. م. لە سنە ڕوویداوە.

ئەم شیعرە بابم بۆ شینی دایناوە:

یا لَحبر حَلاّل ألْف رُمُوز — بدیع مِنَ الکَلام الوجیز
خَیْر أخیار زُمرةِ آلاذْکیاء — جَوْهر الفَضْل خالص الإبریز
شیخ الاسلام غُصْن دَوْح الرّسالَه — الحَسیب النَّسیب «عبدالعَزیز»
خَلَستهُ یَدُالمنیَّة منا — قصْدَ صَوْن لَهُ بحرْز حَریز
مدْفن الآل مَهْبط النُّور مأوی — اَهْل بَیْت فازُوا بأوْفی تَمیز
أسفا مِنْ فراقه ألْفَ ألْف — إذ ذَوی عُودُ غُصْنه الْمهزُوز

قَــدْ تَرَکــت العُیُــونَ ذات دُمُــوع سَــیّدی و الــصُّدُورَ ذاتَ أزیــز
ذَهَــبَ الــرُّوح و الهنــا و الــسُّکونُ یَــوْمَ تَــشْییع نَعْــشک المجْنُــوز
هــاتفٌ قــال: اذ حَلّلْــتَ ثراکــا «جنَّــةَ الخُلْــد حَــلَّ عَبْــدالعَزیز»[1]

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من.*

## مەلا عەبدوڵڵای پەسوێ

حاجی مەلا عەبدوڵڵا، خەڵکی گوندی «پەسوێ» لە ناوچەی لاجـان، زانایـەکی شـارەزای حیکمـەت و کـەلام و مەنتیق و ڕیازی و عارفێکی یەکجار پارێزکار بووە کە تا بۆی لوابێ، شەونوێژی نەفەوتاندووە و کە لە دەرس‌گوتنەوە بۆتەوە، زۆربەی کاتی بە عیبادەت و زیکر و فیکر و بەجێ‌هێنانی داب و دەستووری تەریقەت ڕابواردووە.

مەلا عەولا پاش خوێندن، لای شێخ عومەر زیائەدینـەوە تۆبـەی کـردووە و تەریقـەتی نەقـشبەندی لـێ وەرگرتووە. دوای ئەوە لەسەر داخوازی حاجی ئێلخانی، ماوەیەک لە بۆکان و دوایی تـا دواکـاتی ژیـانی، لـە تورجان دەرسی داوە و فەقێ لە هەموو لاوە، بۆ بەهرەگرتن لە کۆڕی دەرسیدا، ڕوویان لەوێ ناوە.

یادی مەردان، ب٢، ل٥٢٢ و ٥٢٣.

## میرزا جەنابی کوردستانی

حەبیبولای ئاموزگار، مەشهوور بە میرزا جەنابی کوردستانی، لەدایکبووی ساڵـی ١٣٠٠ ک. م. یـەک لـە خۆشنووسانی هێژا و خاکەسار و بێ دەماری شاری سنە بوو کە عومری بە فێرکاری خۆشنووسی تێپەڕ کرد و ساڵی ١٣٥٧ ک. م. بە نەخۆشی و هەژاری مرد.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من. نگرشی بر خوشنویسی در کردستان*، ل ١٦.

## مەلا عەبدوڵڵای عەبابەیلێ

کوڕی شێخ قادر، ساڵـی ١٢٩٥ ک. م. لـە گونـدی «عەبابـەیلێ» هاتـە دنیـا و کـە پێگەییـشت، خوێنـدنی دەسپێکرد و بە زۆرێک شار و دێی کوردستاندا گەڕا و لە کـۆڕی دەرسـی زۆر مامۆسـتایان بـەهرەی بـرد و سەرەنجام لە مەدرەسەی «بیارێ»، پاش وەرگرتنی ئیجازە، چووە نێو ڕیزی مریدانی قـوتبی عارفـان، شـێخ عومەری زیائەدینەوە.

مەلا عەولا پیاوێکی هێژا، دوورەپەرێز، نەوس‌کوژ و خەریکی زیکر و فیکر و عیبادەت بـووە و لـە کەشـف و

١. بە حیسابی ئەبجەد ئەبێتە ١٣٧٥.

کەراماتی زۆریان لێ گێڕاوەتەوە. بێژگە دەرس گوتنەوە، فتوایشی داوە و تا دوا کاتی ژیـانی (ساڵـی ١٣٥٧ ک. م.) بۆ پەرە دان بە دینداری و ئاشنا کردنی خەڵک لەگـەڵ بنـەمای ئایینـدا کۆشـیویە. هێنـدێک کتێـب و نووسراوەشی هەبووە؛ یەکیان کتێبێکە لە «وضع»دا، بە ناوی «*وضع محمّدی*»، کە بۆ منداڵێکی خۆی نووسیوە.

*عُلَماونا فی خدمة العلم و الدّین*، ل٣٥٩ و ٣٦٠.

## شێخ موحەممەد ئەمینی قورەیشی

سەیدی پارێزکار و عارفی بێدەمار، شێخ موحەممەد ئەمینی قورەیشی، کـوڕی خـوا لـێ خۆشـبوو سـەید فەتحولڵا، لە پشتی باوە شێخ ئەحمەدی «باینچۆ»، ساڵی ١٢٦١ ک. ه. لـە گونـدی «کەوڵـە»، نێـوان سـنە و دیواندەرە، هاتە دنیا. هێشتا سی ساڵی تەواو نەکردبوو، بە دووی یەکدا، هاوسەر و تاقە منداڵـەکەی سـەری یەکجارییان نایەوە و بەجێیان‌هێشت. ئەم کارەساتە جەرگبڕە، زۆری داگەڕاند و هەموو دنیای لە لا بێ بایەخ کرد و بە یەکجاری پشتی‌تێکرد و ڕووی کردە دەرگانەی تاقانە و کەوتە بیری بەجێ‌هێنانی فـەرمانی ئـەو و بەم جۆرە، حاڵ‌وباڵی گۆڕا و چووە ناو دنیایەکی دیکەوە.

شێخ حەمەدەمین ئەگەرچی تا ڕادەیەک دەوڵەمەند بوو، بەڵام ژیانێکی سـاکاری هەڵـبژاردبوو؛ زۆربـەی داهاتی بۆ داماوان و لێقەوماوان خەرج دەکرد. پارێزگـاری گەیانـدبووە ڕادەیـەک، ماڵـی کـەس نـەدەچوو؛ بشچووبا، سەری سفرەیان دانەدەنیشت. ئەگەر سـەفەرێک ئەکەوتـە بـەری، تۆشـەبەرەیەک نـانی وشـکی هەڵدەگرت و تا دەگەڕاوە، بەوە دەژیا. بەڵام بە و هەمووانەوە، قەت دوورەپەرێزی نەدەکرد و لـە ڕێنـوێنی و ئامۆژگاری خەڵک، خۆی نـەدەبوارد. دیـارە تەکیـە و خانەقاشـی دانەمەزرانـد و ماڵـی خـۆی و مزگـەوتی گوندەکە، شوێنی ڕاگرتنی میوانان و ئیرشادیان بوو.

ساڵی لە دنیا چوونی ئەم پیرە پیاوچاکەیان، ١٣١٧ ک. ه. نووسیوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا حەسەنی خەتات

کوڕی مەلا ڕەزا، کوڕی مەلا فەزلولڵا، سەردەمی لاوی، هاوکاتی یەکەم شەڕی جەهانی، لە دێیەوە هاتە سنە و پێڕای درێژەدان بـە خوێنـدن، بـە هـۆی وازی زۆری لـە خـەت و خۆشنووسـی، لای مامۆسـتایانی ئـەم هونەرەوە، مەشقی کرد و بە تێکۆشانی زۆر و لێهاتوویی سرشتی، بووە یـەکێک لـە خۆشنووسـانی دەورانی خۆی؛ بەتایبەت لە خەتی سولس و توغرا نووسی و قەتعەدا یەکجار هەڵیدا.

لە کارەکانی مەلا حەسەن، هێندێک سەرمەشق و قەتعە، لە بڕێک ماڵی سنەدا ماوەتـەوە کـە شـاندەری

پلەی بەرزی هۆنەری ئەو مامۆستا هونەرمەندەیە.[1]

مەلا حەسەن ساڵانی ئاخری ژیانی، بە تاقی تەنێ، لە سووچی مزگەوتاندا خەتاتی دەکرد و هەر لەوێش ڕۆژیدەکردەوە و زۆرتر بە فرۆشتنی کارەکانی، ژیانی دەبردەسەر و سەرەنجام ساڵی ١٣٥٨ ک. م. سەرینایەوە و لە ژیانی سەر ئەم جیهانە پێنەزانە ڕزگاری هات.

دەڵێن باب و کاڵی مەلا حەسەن لە بنەماڵەی بەناوبانگی شێخولیسلامەکانی شاری سنە بووگن کە چۆن بووە، لە شار باریان کردووە و چوونەتە گوندی «نۆدشە» لە هەورامان و حەسەن لەوێ لە دایک بووە.

*نگرشی کوتاه بر خوشنویسی در کردستان*،

چاپ ١٣٦٢ ک. ه. ل١٤. یاداشتەکانی نووسەر.

## سەید ئەحمەدی وەلی

زانیاری بەئاکار، حاجی سەید ئەحمەدی سەجادی، مەشهوور بە «وەلی»، کوڕی سەید موحەممەد سادق، کوڕی سەید سەعدەدین، کوڕی سەید مەجید، لە سەیدە حوسەینییەکانی گوندی «کەلجێ»، ڕۆژی یەکشەمە، ١٤ی سەفەرە مانگی ساڵی ١٢٩٢ ک. م. لە سنە هاتە دنیا و لای مامۆستایانی ئەو شارە خوێندی و پاش ماوەیەک، لە خزمەتی عەللامەی پایەبەرز، مەلا عەبدوڵڵای موفتی دشی، ئیجازەی وەرگرت. دواجاریش چوو بۆ بیارە و لە بەردەستی شێخ عومەر زیائەدیندا تۆبەی کرد و ئەوجار گەڕاوە بۆ سنە.

سەید ئەحمەد هەر لە سەرەتای لاوی و سەردەمی خوێندنەوە، مرۆیەکی پارێزکار و زۆر خەریکی عیبادەت بووە و بە «وەلی» ناویدەرکردووە. لە مزگەوتی «میرزا فەرەجوڵا»ی سنەدا، بۆ بەرنوێژی دامەزرابوو؛ جارـ جاریش دوو فەقێی لە حوجرەیەکدا ڕادەگرت و دەرسی پێیان دەگوت؛ بەڵام زۆرتری کات و ساتی بە عیبادەتەوە ڕادەبوارد. هەموو شەوێ بۆ شەونوێژ هەڵدەستا و تا کازیوەی بەیان خەریکی زیکر و فیکر دەبوو. دوای نوێژی بەیانی، قورئانی دەخوێند و تا چاشتێکی دێر، بە ڕاز و نیاز لەگەڵ خوای خۆیدا ڕایدەبرد. هەروەها زۆربەی ڕۆژان بەڕۆژوو دەبوو.

خەڵکەکە زۆریان خۆش دەویست و بڕوایان پێ هەبوو؛ بەو بۆنەوە هەموو جۆرێک خزمەتیان دەکرد. ئەویش درنگانی شەو، بە کووچە و کۆڵاناندا دەگەڕا و ئەوی بۆیان هێنابوو، بە ماڵە هەژاراندا بڵاوی دەکردەوە و ئەگەر تۆزێکی بۆ خۆی و ژن و منداڵی هەڵبگرتایە.

حاجی سەید ئەحمەدی وەلی ساڵی ١٣٥٨ ک. م. سەفەرێکی هەورامانی کرد؛ بە ڕێگادا نەخۆش کەوت

---

[1]. لەم دواییانەدا، وێنەگری هونەرمەند، کاک سدیقی مونەققی، بە حەول و تێکۆشانێکی چەند ساڵە، ژمارێکی بەرچاو لە کارە بایەخدارەکانی مەلا حەسەنی دۆزییەوە و کۆی کردنەوە و بۆتە دەفتەرێکی نایاب. بزانین کەی بۆی دەست بدا چاپی بکا؟!

و لە گوندی «نجیٚ»، سەربە ناوچەی ژاوەرۆ، ئەمری خوای بەجیٚهیٚنا و هەر لەویٚیان ناشت.

لە کتیٚبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## ڕوستەم حەیدەر

موحەممەد ڕوستەم، کوڕی عەلی حەیدەر، ساڵی ١٣٠٦ ک. م. لە بنەماڵەیەکی کوردی کۆچەر، لە شاری «بەعلبەک»، هاتە دنیا و کە پیٚگەییشت، لە دمشق خویٚندی. پاشان چوو بۆ ئاسانە (ئەستەمبووڵ) و لە مەدرەسەی «مەلەکییە»، شویٚنی دەرسەکەی گرت. ئەوجار گەیشتە ئورووپا و لە زانستگای «سووربون»ی شاری پاریس، لە ڕشتەی زانستە ڕامیارییەکاندا، خویٚندنی بە ئاکام گەیاند و لە دانانی کۆڕی «**العَربیّة الفتاة**»دا بەشداری کرد. پاش ئەوە گەڕاوە سووریا و دوای هیٚندیٚک لە قوتابخانەی «سوڵتانییە»ی بەیرووت، بوو بە مامۆستا و لەویٚوە ناردرایە «سەلاحییە»ی قودس. وانە دەرسییەکانی لەم دوو خۆندنگەیە، لە کتیٚبیٚکدا بە ناوی «*میٚژووی کۆن، میٚژووی ئیسلام، چەرخە ناوەندییەکان و سەرەتای میٚژووی نویٚ*»، کۆ کردەوە.

لە برِانەوەی یەکەم شەری جیهانیدا، پەنامەکی چووە پاڵ ئەمیر فەیسەل کوڕی حوسەینەوە. ماوەیەک لەودوا، چوو بۆ ئورووپا و وەکوو نویٚنەری حیجاز، لە کونفرانسی «ویرسای»دا بەشداری کرد و لە پاریسدا مایەوە. ساڵی ١٩٢١ ز. کاتیٚ کە فەیسەل لە سەر تەختی عیراق دانیشت، ڕوستەم حەیدەیری کردە دەبیر و سەرپەرشتی دەفتەری تایبەتی خۆی. هیٚندیٚک لەودوا بوو بە وەزیر موختار لە ئیٚراندا و پاشان (ساڵی ١٩٣٤ ز.)، کرایە وەزیری دارایی عیراق. سەردەمی سەڵتەنەتی مەلیک غازی (ساڵی ١٩٣٧ ز.)، ئەندامی ئەنجومەنی باڵا بوو. بە شویٚن ئەوەدا، جاریٚکی تر وەزارەتی دارایی پیٚ سپیٚرا و لەم پۆستەدا بوو کە ئەفسەریٚکی دەرکراوی عەرەب، بەناوی حوسەین فەوزی، لیٚیدا و کوشتی (ساڵی ١٣٥٨ ک. م.).

ڕوستەم حەیدەر لە پیٚشقەراوڵانی ڕامیاری عیراقی سەربەخۆ بوو. فەڕانسەو عەرەبی و ترکی و ئینگلیسی باش دەزانی. کتیٚبیٚکی بە زبانی فەڕانسە، بە ناوی «*موحەممەد عەلی لە سووریا*» نووسی کە وەکوو بڕوانامە، دای بە زانستگای سووربون.

لە سەرەتای پاشایەتی پەهلەوی لە ئیٚراندا، نویٚنەری تایبەتی بەغدا لە تاران بوو. لەو سەردەمە، بۆ دامەزرانی پیٚوەندییەکی دۆستانە نیٚوان دوو وڵاتدا، زۆری حەوڵ دا.

*الاعلام*، ب٦، ل٣٦٠. گۆڤاری *ماد*، س١٣٢٤ ک. ه. ژ٢، ل٢٧.

## شیٚخ حوسامەدینی نەقشبەندی

دوایین ئاڵقە لە زنجیرەی پیرانی پارسا، قوتبی تەریقەت، شیٚخ عەلی حوسامەدینی عوسمانی نەقشبەندی، کوڕی ڕیٚزداری شیٚخ موحەممەد بەهائەدین و نەوەی شیٚخ عوسمان سیراجەدین، ساڵی ١٢٧٨ ک. م. لە

شارۆچکەی «تەوێڵێ» هاتە دنیا. پێنج ـ شەش ساڵان بوو، باپیری عەمری خوای کرد و تازە ببووە بیست، بابیشی لە دنیا چوو. لەو کاتەوە ئیرشادی تەریقەت و تەکیەداری کەوتە سەر شانی و تا کاتی کۆچی داویی، ماوەی ٦٠ ساڵی تەواو، ئەم کارەی لە ئەستۆ بوو.

ئەو زاتە لە سێ شوێن خانەقای هەبووە و بەپێی وەرزی ساڵ، ماوەیەک لە «تەوێڵێ»، سەرەتێ لە «خوڵمار» و هێندێک لە «باغەکۆن» دانیشتووە و خانەقایشی، دوازدە مانگی خوا، لە مریدان و زیارەتکاران، جمەی هاتووە.

شێخی پایەبەرزی ئێمە، حوسامەدین، زاتێکی ممبارەک بوو. لە زانستی ئایینی بەشی خۆی دەسکەوتبوو؛ بایەخێکی زۆری بە هاودەنگی زانایان و مامۆستایان دەدا و لێیانی دەخوازی، لە لای ئەو، بۆ وتوویژ و کێشەی دینی و زانستی ـ بە تایبەت تەفسیر و حەدیس ـ کۆڕ بگرن. سام و شکۆیەکی خودایی هەبوو؛ ئەگەر قسەی دەسپێدەکرد، هەموان ـ لە بژاردە و ڕەمەکی ـ وسەیان لێ دەبڕا و بە هەموو گیان، گوێیان دەگرت.

شێخ لەگەڵ هەرکەسێک بەرامبەر بە ڕادەی خۆی دەجووڵاوە. کاتێ کە ڕووی قسەی لە مامۆستایەک دەکرد، باقی تێنەدەگەییشتن. عارفێکی بەمشوور بوو. بەو هەموو بەرزی و دەسەڵاتەوە، هەم هەژارانی ئەحاواندەوە و هەم بە دەوڵەمەنداندا ڕادەگەییشت؛ با لەسەر زامی ئەوان مەڵهەمێک دانێ و پێش بە لووتبەرزی و دەماری ئەمان بگرێ و بۆ هەردوو لا، ڕێشاندەر و بەرەو ڕێبازی ڕزگاری، ڕێنوێن بێ.

گەورەترین کەرامەتی حوسامەدین، کەسایەتی بەرز و پشوودرێژی و لەسەرخۆیی و دەمپاراوی لە ڕادە بەدەری بوو. خزمەت بە خەڵک و خێرخوازییەکەی، تەنیا باری تەریقەت و ئیرشادی نەدەگرتەوە؛ ئەوی پەنای پێ ببردایە، ناهمێ نەدەگەڕاوە.

مەنزڵگەی نزیک لە سنووری سێ دەوڵەتی ئێران و عیراق و تورکیا بوو. بە وردبینی و دوورنواڕی تایبەتی خۆی، وای دەسووڕاند، دەسەڵاتدارانی هەرسێک لا، ئەوپەڕی ڕێزیان لێ دەگرت و کاربەدەستان ـ لە مەزرینگەیی و چەکدار ـ بۆ ئاسانکاری لە داخوازی هەرکەسێکی ئەو بیناردایە، هەموو حەولی خۆیان دەدا.

لە مەکتەبی پیرۆزی ئەودا، پیاوانێکی زۆر بەهرەیان برد و پلە و پایەیان بەرز بووەوە؛ لەوانە دوو کەسایەتی بەرچاوی ئەو سەردەمە، خوا لێ خۆشبوان: شێخ حەبیبوڵای مودەڕڕیسی کاشتەری و ئەسعەد ئەفەندی خێلانی (ڕواندزی) بوون.

چەند کەسی تر لە خەلیفە ناودارەکانی، کە بەشێکی زۆر لە ژیانیان بە سەیر و سولووک یان خزمەت بە خەڵکی خانەقا و دەزگای ئیرشادی مورشیدەکەیان تێپەڕ کرد، یان ڕاسپێراوی ئیرشاد لە شوێنانی تر بوون، بریتین لە خوا لێ خۆشبوان: حاجی شێخ عەبدوڵڵای شەهبازی، سەید تاهای حوسەینی لۆنی، حاجی شێخ عەلی ئەوێهەنگی، مەلا موحەممەد سادقی ئەوێهەنگی، شێخ عارفی شەهبازی، سەید عەلی نوێنی، عەللامە حاجی شێخ عەبدولحەمیدی مودەڕڕیسی سنەیی (کانیمشکانی)، سەید سابیری سەڵواتاوایی،

سەید عەبدوڕڕەحیمی هەیبەتولایی، سەید عەبدوڵڵای حەزرەتی، سەید ئەحمەدی هۆیەیی، شێخ موحەممەدی دادانە، مەلا موحەممەد ڕەشیدی مودەڕڕیسی مەریوانی، سەید بەهائەدینی کێلانە، شێخ عەبدولقادری سیویە، شێخ حەبیبولای حوسامی خواشتی و میرزا عەبدوڵڵای کاتبی سنەیی.

کۆچی دوایی ئەو پایەبەرزە، مانگی زیحەجەی ساڵی ١٣٥٨ ک. م. (زستانی ساڵی ١٩٣٩ ز.) لە باخەکۆن ڕوویدا و هەر لەوێ نێژرا.

شێخ، هاوینی برێ ساڵان، بۆ چاوپێکەوتنی مرید و مەنسووب، ئەهاتە هاوینەهەوارێکی لای ڕۆژهەڵات، بە ناوی «کراویەدۆڵ» و دووـ سێ مانگ دەمایەوە. شوێنێکی کوێستان و خۆش بوو. بەم جۆرە خەڵکی ئەم دێویش دەرفەتیان دەبوو، بە بێ دەردیسەری، خزمەتی بگەن. ئەمنی هەژار، دوو جار لەو شوێنە، ئەو بەشەم بە نسیب بوو. جاری هەوەڵ منداڵ بووم؛ بەڵام جاری دووهەم، هاوینی ئەو ساڵە بوو کە زستانەکەی، شێخ دەستی لە ژیان بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا. لەو سەفەرەدا ئەمن بە چاوی خۆم کەشف و کەراماتێکم لەو مەزنەوە بینی کە زۆر کاریتێکردم و بڕوایەکی تەواوم پێ پەیدا کرد.

ئەم پارچە شیعرە بەشێکی قەسیدەیەکە، بۆ کۆچی یەکجاری ئەو زاتەم داناوە:

دردا از این عزای محَنزای جانگزا — یعنی وفات قُطب جهان پیر پارسا
شیخ الشیوخ عارف آزادەی هُمام — سلطان دین، نظام زمین، آیت خدا
فرزانە آیتی ز مکاتیب نقشبند — برجستە رهبری ز دبستان اصفیا
یعنی «حُسام ملت و دین»، شمع انجمن — تنها نمونەای ز نیاکان اتقیا
سَبّاح بحر معرفت آفریدگار — بر کشتی طریقت نقشیّە ناخدا
پور «بها»، نوادەی پاک «سراجدین» — شمع هُدی، حبیب خدا، کوه اعتلا
بگزیدە مُلْهَمی کە بە قرن اخیر بود — فرخندە پیر محرم دربار کبریا
خلقی ز یُمن همّت انفاس پاک او — با ذات حق شدند بە کام دل آشنا
عُمر شریف وی ز ثَمانین گذشت و بود — افزون ز شصت سال بر این خلق مقتدا
افشاند از غبار علایق دو آستین — مردانە زد بە نفس فریبندە پشت پا

* * *

یا سیدی تو رفتی و ما را گذاشتی — با داغ مرگ خویش قرین دوصد بلا
امروز از وفات تو ای مرشد مُراد — در ماتمند جملە مریدان بیریا
هم صوفیان بە سان پدرمردە غمزدە — هم مخلصان بە درد فراق تو مبتلا
ما راست در عزای تو ای شیخ مستطاب — جانخستە، دلشکستە، زبانبستە، تن دوتا
گر ما ز محضر تو بە ظاهر شدیم دور — خود شادمان گزیدە مکان نزد مصطفی

مــشمول رحمـــت و کـــرم ذات ایـــزدی — بـــا جر گـــهی مقـــدس اقطـــاب اولیـــا

یـــارب بلنـــددار مقامـــات آن بـــزر گ — وز مـا بـه خیـر، خـدمت او را بـده جـزا

یـارب همـاره همـت وی بـاد دسـتگیر — مـا را بـه تنگنـای جهـان پـر از عَنـا

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## مەلا عەبدولعەزیمی حەسەناوایی

زانایەکی تەمەن درێژ بوو کە لە گوندی «حەسەناوا»، لە باشووری شاری سنەدا دەژیا و ساڵانێکی زۆر، لەگەڵ دەرس‌گوتنەوە و بەرنوێژی، پارچە زەوینێکی بە کرێ گرتبوو، تا ئەو ڕۆژەی دەیتوانی، کشت‌وکاڵی دەکرد و بە داهاتەکەی دەژیا.

ئەمن تازە خوێندنم دەسپێکردبوو، گەیشتمە خزمەتی. پیاوێکی پارێزکار و پیرۆز هاتە پێش چاوم. تەمەنی لە نەوەدیشی تێپەڕاندبوو؛ بەو حاڵەش دەستی لە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە بەرنەدابوو؛ تەنانەت چەند فەقێ لە خزمەتیدا بوون و دەیانخوێند. کتێبە دەرسییەکانی یەک بە یەک، لە هەوەڵەوە تا دواخر، بە خەتی خۆی نووسیبوەوە و ڕایگرتبوو. جاروبارە بە کوردی و فارسی شیعری دەگوت.

ئەو پیاوە پیرۆزە سەرەنجام ساڵی ١٣٥٩ ک. م. ماڵاوایی یەکجاری لە دنیا کرد.

ڕەحمەتی مەلاولەزیم لە قوتابیانی موجازی عەللامە مەلا عەلی تورجانی بوو.

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## فەهیمی سنجاوی

ژینامەی ئەم شاعیرە، دۆستی زانام، مامۆستا سەید تاهیری سەیدزادەی هاشمی، لە کرماشانەوە، بۆ نووسین لەم کتێبەدا بۆی ناردم؛ کە ئەوا دەیبینین:

خوا لێ خۆشبوو میرزا فەتحوڵای فەهیم، شاعیرێکی تێگەیشتوو، بیر تێژ، زیرەک، خۆش زەوق، قسەخۆش و گاڵتەبێژ بووە کە ساڵی ١٣١٥ ک. م. لە گوندی «زالواو»ی ناوچەی سنجاوی، سەر بە کرماشان هاتۆتە دنیا. هەر بە منداڵی هاوڵەی تووش بووە و چاوی لێ ساندووە؛ بەڵام وەک خۆی دەڵێ:

اگرچـــه مـــرا در جهـــان رنـــج داد — بـــه پـاداش طبعـی ســخن‌سـنج داد

هۆشی لە ڕادە بەدەر و لێهاتوویی یەکجار زۆری زەینی، بۆی قەرەبووی کردۆتەوە.

هێندێک پاش کوێر بوون، دایک و باوکیشی ماڵاوایی یەکجارییان لە دنیا کردووە و بەجێیان‌هێشتووە. لەو کاتەوە یەک لە سەرۆک عەشیرەتانی خێرومەندی سنجاوی، بە ناوی خودامرووەت خان، سەرپەرشتی گرتۆتە ئەستۆی خۆی و زۆری لەگەڵ خەریک بووە، هێندێک داستان و چیرۆکی کوردی و فارسی پێ

لەبەر کردووە. بەم جۆرە سەرەتا *«امیر ارسلان»* و *«اسکندرنامە»* و بڕێ کتـێبی لـەم بابەتـە لەبـەر دەکـا و بـە شوێنیدا دەپەرژێتە سەر *«شاهنامە»* و چەند کتێبی‌تری لەو چەشنە. هەروەها لە کتێبە کوردییەکان، چەنـد کتێبی ئەویندارى و پاڵەوانی وەکوو: *«شیرین و فەرهاد»*ی مەلا وەڵەد خانی گۆران، *«حەوت لەشکری»* مەلا ئەڵماسی کنۆڵەیی، *«خوسرەو و شیرین»*ی خانای قوبـادی و ئـی‌تـریش. ئـەمجار زەوقـی شـیعری خـۆی گوڵ‌دەکا و چەند دەفتـەری شـیعر، بـە کـوردی ئەهۆنێتـەوە؛ یەکـەمیان هەڵبەسـتێکە لەمـەڕ چێرۆکـە پاڵەوانییەکانی خێڵی سنجاوی، بریتی لە ١٢ هەزار بەیت. پاش ئەم کارە گەورە، شیعری فارسیش ئێژێ.

فەهیم لە ساڵی ١٣٥٩ ک. م. (١٩٤٠ ز.) لە زێدەکەی خۆیدا، چاوی لە دنیا پۆشی و بەرگی مەرگی پۆشی.

ئەوا بەشێک لە سەرەتای داستانی پێکدادانی چەکدارانی دەوڵەت و هەورامییەکان؛ کە ساڵی ١٣١٠ ک. ه. )١٩٣١ ز.) هۆنیویەتەوە.

| | |
|---|---|
| نخـستین بـە نـام خداونـد پـاک | خداوند پروین و بهـرام و خـاک |
| خداونـد جـان و جهـان و سـپهر | خداوند صاحب فرّ و قهـر و مهـر |
| اگـر چـە مـرا در جهـان رنـج داد | بە پاداش، طبعـی سـخن‌سـنج داد |
| «دری را بە حکمت ببندد خُـدای | بە درهـای دیگـر شـود رهنمـای» |
| گنـاهم بـبخش ای شــە دادگــر | ز چــون و چــرا گفتــنم درگــذر |
| در این داستان هوش‌بخشم تـوی | فکندم چو این مهـرە نقـشم تـوی |
| مـن ایـن نغزبـازی بـە پایـان بـرم | ز شـاە جهـان گـنج شـایان بـرم |
| چــە گنجــی بــود بهتــر از داد او | حرام اسـت بـادە کـە بـی یـاد او |
| بدە سـاقی آن آب آتـش بـە مـن | بە گـردون بـرآرم درفـش سـخن |
| ز رزم‌آوران و زنــــــــــام‌آوران | بــسنجم، بگــویم: یکــی داســتان |

یاداشتی مامۆستا سەید تاهیری هاشمی.

## وەهبی کەرکووکی

مەلا فەتاح، نازناو «وەهبی»، پیاوێکی هێژا بووە و شیعری چاکی گوتووە. ساڵی ١٢٩٦ لە کـەرکووک هاتۆتـە دنیا و ١٣٥٩ ک. م. لە مووسڵ لە دنیا چووە.

*یادی ئەدیبان*، ل٤٤.

## شێخ بابەعەلی تەکیەیی

کوڕی شێخ عەلی مەلا، مرۆیەکی هێژا و بەدین بووە کە ساڵی ١٢٧٥ ک. م. لە گونـدی «تەکیـە»ی لای

قەرەداغ هاتۆتە دنیا و خوێندنی زانستی و ئایینی، لە سلێمانی و چەند شوێنی تر تەواو کردووە و ساڵێکیش لە هەولێر لە خزمەتی عەللامەی دەوران، حاجی عومەر ئەفەندی بەهرەی بردووە و ئیجازەی لێ وەرگرتووە. پاشان گەڕاوەتەوە سلێمانی و تا کۆتایی ژیان دەرسی گوتۆتەوە و زۆرێکی بەهرە گەیاندووە و ئیجازە داوە.

شێخ بابە عەلی زانایەکی پارسا و بە زیکر و فیکر و وەک دەڵێن، خاوەن کەرامەت بووە و سەرەنجام ساڵی ۱۳۵۹ ک. م. لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل۱۱۳.

## مەلا عەزیزی پریسی

زانای پایەبەرز، مەلا عەبدولعەزیز، کوڕی موحەممەد، لە عەشرەتی «هوورحەسەن»، خەڵکی باژێڕی «سەید سادق»ی ناوچەی شارەزوور، ساڵی ۱۳۰۳ هاتە دنیا و لە هەڵەبجە و عەبابەیلێ خوێندی و لە بیارە تەواوی کرد و ئیجازەی گرت. پاشان چووە ڕیزی مریدانی شێخ نەجمەدین کەوکەبی عوسمانی نەقشبەندی و ماوەیەکی تر، لە خانەقای بیارە، خەریکی فێربوونی داب و دەستووری تەریقەت بوو؛ ئەوجار چووە گوندی «پریس» و تا دوایی، لەوێ دەرسی‌گوتەوە و بەرنوێژی کرد.

مەلا عەزیز مرۆیەکی عارف و پارسا بووە و خەڵک، لە هەموو چینێ، ڕێزیان لێ‌گرتووە و ساڵی ۱۳٦۰ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل۲۹۹.

## میرزاخانیی کەلاتەری

کەربەلایی عەلی خان، ناسراو بە میرزاخانی، کوڕی نیعمەتوڵا خان، لە بنەماڵەی موکری، لە گوندێکی سەر بە «هەرسین»ی کرماشان هاتۆتە دنیا و مرۆیەکی دارا و لەگەڵ ئەوەدا بەئیمان بووە و پووڵ و پارەی بۆ یارمەتی هەژاران و داماوان و خزمەتی میوانان و غەریبان خەرج کردووە.

میرزاخانی وازێکی زۆری لە زبان و وێژەی‌کوردی و فارسی بووە و هێندێکیش عەرەبی زانیوە و سەرەنجام ساڵی ۱۳٦۰ ک. م. لە تەمەنی ٦۰ ساڵان، ئەمری خوای بەجێ‌هانیوە.

حامیدی تەوەکول‌مەلایری لە شینیدا گوتوویە:

شب شنبه چهار از ماه شوال — به سال یکهزار و سیصد و شصت
علی خان بن نعمت‌خان مکری — از این دنیای فانی رخت بربست
چو از خاصان درگاه خدا بود — به خاصان خدا در خُلد پیوست

**شیعرێکی کوردی میرزاخان:**

موفارقـەت سـەخت، موفارقـەت سـەخت
دەرد نییەن وێنـەی موفارقـەت سـەخت

هیجران ئەو یـار تـازە بەربەسـت ڕەخـت
مەخسووس پەی کەسێ هەرچون من بەدبەخت

وە تــەوفێق حـــەق وە ڕەنـــج گیـــانی
وە دەســـت ئـــاوەردم دۆس ڕۆحـــانی

ژ دیـــدار ئـــەو موددەتـــێ بـــێم شـــاد
ئـاخر دەس تەقـدیر شـادیم دان وە بـاد

هــەی هـاوار ژەی بــەخت دڵـگیریمەوە
ژەی غـــەریب‌کەفتـــەی ئەســـیریمەوە

ئاتــەش گــیر بیــەن دڵــەی پــڕ دەردم
ڕووە بەرنـــــەمارۆ ڕوخـــــسارەی زەردم

بـــوینم ســـوورەت عـــەزیز بـــەرادەر
تەلعـــــەت زیبــــای والا کلاتـــــەر

خدمــەتش مــەبۆ پــەریم مویەســـسەر
دیدەن ئەو دیدار کەفت وە ڕۆی مەحشەر

فـەرموودەی شـەریف شـاهـ مەردانـەن
فـــیراق دۆســـــان بــــار گرانـــــەن

بـــەی تـــەورە دادەن مـــەدار دونیـــا
«خـــالقُ الأشـــیا»، حــــەکیم دانــــا

دونیـا جـای ڕەحمـت فـیراق و دەردەن
کەسێ نەی دونیا دڵ خوەش نەکـەردەن

مـن هـەنی پـیرێ ئوفتـادەی شکەسـت
عـومرم ڕەسـیدەن تـا وە سـاڵ شەسـت

دۆس عـــــەزیزێ ئامـــــا وە دەســـــتم
لوتــف و کــەرەمش بی وە پابەســـتم

ناگـەهان تەقـدیر ئـەو لـە دەس سـەندم
کــەرد وە قەیــد غــەم گرفتــار بەنــدم

وە هـــەر حاڵـــەتێ خـــودا یـــارش بـــۆ
دوعــای ئــەهل دڵ نگەهـــدارش بـــۆ

حدیقەی سُلطانی، ل٢٣٢. یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا عەبدوڵڵای وڵزی

حاجی مەلا عەبدوڵلا، خەڵکی گوندی «ولز»، دەوری ساڵی ١٢٨٥ ک. م. لەدایک‌بــووە و دوای تــەواوکردنی دەرس و دەور و وەرگــرتنی ئیجـازە لـە بیـارە، لای شـێخ عومـەر زیائـەدین تۆبـەی کـردووە و تەریقـەتی نەقشبەندی وەرگرتووە. ئەمجارە کۆچ و باری بەرەو موکوریان پێـکـناوە و لـەوێ دەرسـی‌داوە و خزمـەتی ئایینی بەجێ‌هێناوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٦٠ ک. م. بە یەکجاری دەستی لە دنیا بەرداوە.

مەلا عەولا لە هەموو زانستەکان ، بەتایبەت ریازی و ئەستێرەناسیدا شارەزا و بۆخۆشی پیـاوێکی چـاک و پاک و پارسا و خەریکی زیکر و فیکر بووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل٣٥٨.

## مەجدەتی سنەیی

عــەبدولمەجیــدی فــەڕڕەهــی، کەســناو «مَجـدُالمَمالک» و نازنـاو «مَجـدَت»، کـوڕی مـیرزا شـوکروڵای



«فَخرُالکُتّاب»ی سنەیی و بابی عەبدولحەمیدی میهی «بدیعُالزَّمانی»، ماوەیەکی زۆر لە سنە، ئینشابەندیی میرزا یۆسفی موشیردیوانی کردووە و دوای ئەوە دامەزراوە و لە چەند شاردا، سەرپەرشتی تۆمارگە (ثبت احوال) بووە و دوایی چۆتە تاران و دەوری ساڵی ١٣٦٠ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

مەجدەت شاعیر و نووسەرێکی مێژووزان و وێژەوان و خەتجوان بووە و کتێبێکی لەمەڕ مێژووی کوردستانەوە نووسیوە کە تا ئێستا ڕووناکی نەبینیوە.

**ئەم ئامۆژگارییە، هۆنراوەی ئەوە:**

اگر سعادت و اقبال جاودان خواهی — نَصیحتی کُنمت نیک بشنو ای فرزند!
به جز به فضل خداوند اعتماد مکن — به هیچ چیز، بُرندت اگر چه بند از بند
چو اعتماد نمودی به فضل بارخدای — به روی خویش در کسب و سعی نیز مبند
به غیر خویش مکن اعتماد و پست مباش — کز اعتماد به نفس است قدر مرد بلند
ز دسترنج خود ار جامه از پلاس کنی — نکوتر است که پوشی ز دست غیر پرند
به کارنیک گرای و ثبات ورز در آن — که کار نیک کند مرد را سعادتمند
همیشه پند، تو از کار دیگران بر گیر — نه آنکه دیگری از کار تو بگیرد پند
هر آنچه را نپسندی ز دیگران بر خویش — برای دیگری آن را ز خویشتن مپسند
ز دور چرخ، جفا گر رسد مشو غمگین — وگر زمانه به کامت شود مشو خرسند
هوای سروری اندر سرت اگر باشد — به سوی خلق نکو مردوار تا ز سمند
به گوش هوش نیوش این نصایح «مجدت» — که کام روح از آن پُر شود ز شکّر و قند

یاداشتەکانی نووسەر.

## سەید عارفی لۆنی

عارفێکی زانا و سەیدێکی پارسا لە بنەماڵەی لۆن ساداتە کە دەوری ساڵانی ١٣٦٠ ک. م. پاش ٧٠ ساڵ، ڕووی کردە بارەگای خودا و دەستی لە ژیان بەردا.

سەید عارف مرۆیەکی بەڕێز، بەرزەمژ، دڵفراوان، نووسەر و خەت جوان بوو. ماوەیەکی درێژخایەن لە گوندی «لۆن»، جگە لە دەرس گوتنەوە و دادوەری شەرعی، بەرنوێژی و ئیمامەتی جومعەشی دەکرد.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ حەبیبوڵڵای کاشتەری

زانای دڵئاگای پارسای هێژا، شێخ حەبیبوڵڵای مودەڕڕیسی ڕۆحانی «ئەبوومسلیم»، کوڕی حاجی شێخ

ئیسماعیل، کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ عەبدولغەفووری کاشتەری، بابی نووسـەری هـەژاری ئـەم ڕووپەڕانە، ساڵی ١٢٧٨ ک. م. لە گوندی «کاشتەر»ی ناوچەی بێڵەوار هاتۆتە دنیـا و کـە بـای‌باڵـی‌داوە، لـە مەدرەسەی گوندەکەدا ـکە ئەودەم بەرقەرار بووە ــ خوێنـدنی دەسـپێکردووە و لـە ژێـر چـاوەدێری بـابی پایەبەرزیدا، قۆناغە سەرەتاییەکانی وەرگرتووە. ئەوجار ـ وەکوو دابی فەقێیانی ئـەو ڕۆژگـارە بـووە ــ زێـدی خۆی بەجێ‌هێشتووە و لە دێیەکی ناوچەکە، بەناوی «لـۆن سـادات»، چۆتـە خزمـەتی عـارفی هێـژا، شـێخ مەحموودی کاکۆزەکەریایی و پاش دوو ساڵ گەیشتۆتە ئاوایی «ماسـان» و لـەوێش ماوەیـەک خوێندوویـە. ساڵـی ١٣٠٨ ک. م. بـە فـەرمانی بـابی، بـۆ سـنە ڕۆیـوە و لـە مزگـەوتی دارۆغـە، خزمـەتی عەللامـە عەبدولمەجیدی مودەڕڕیسی نیەری گەیشتووە و لە ماوەی سێ ساڵێکدا کـە لـەوێ بـووە، بێژگـە دەرسـی مامۆستا، هەرکوێ کتێبێکی باشی بینیوە، بە ئەمانـەت وەریگرتـووە و خوێندوویـە و وەک خـۆی دەیگـوت، زۆربەی زانیاری مێژوویی و وێژەیی کە هەیبوو، هی خوێندنی شەوانەی ئەو سێ ساڵە بووە.

بە کورتی لـە تەمـەنی ٢٣ سـاڵاندا ئیجـازە وەردەگـرێ و بەشـوێنیدا کچـی مامۆسـتاکەی دەخـوازێ و دەگەڕێتەوە بۆ کاشتەر.

لەو سەردەمە، بەو بۆنەوە کە باوکی هێشتا ماوە و چەند برای گەورەتری هـەبووە، بـە ئارخـەیانی شـان ئەداتە ژێر کاروباری مەدرەسەی کاشـتەر و ئەپەرژێتـە سـەر فـەقێ ڕاگـرتن و دەرس‌گوتنـەوە و گـوڕ و گەشەیەکی تازە بەو خوێندنگە دەدا. لە دوای ئەوە، بەو نیازە کە وەک باب و کاڵی، لە باری عیرفانیـشەوە زانیارییەکی دەسکەوێ، لەسەر بەرایی بابی، ڕوو لە «بیارە» دەکا و خزمەتی قوتبی عارفـان، شـێخ عومـەر زیائەدین دەگا و ماوەیەک لە بارەگایدا بەهرە دەبا. پاشان بۆ «باغـەکۆن»، ناوەنـدی ئیرشـادی حـەزرەتی حوسامەدین دەڕوا. لەوێ دوای چەند ڕۆژێـک، لـە ناخیـدا هەسـت بـە گـۆڕانێکی نائاسـایی دەکـا؛ بـە شێوەیەک کە بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، ئەکەوێتە ژێر نیگای سیحراوی شـێخەوە و ئەبێتـە مریـدی و تەریقەتی نەقشبەندی لـێ وەردەگـرێ. پـاش دوو مانـگ سـەیر و سـولووک، لەسـەر ئیجـازەی شـێخ، ئەگەڕێتەوە بۆ کاشتەر و وەک پێشوو ئەچێتەوە سەر دەرس‌گوتنەوەکەی؛ بەڵام ئەمجار بە وردی، هـەموو فەرمان و ڕاسپێرییەکانی شێخ حوسامەدین ئەگرێتە گوێ؛ تا پاش ساڵێک، ئیجازەی خەلافەتی پێ دەدا و کەڵپۆسی دەروێشی خەڵات دەکا.

شیاوی باسە ئەمیش وەکوو باب و باپیرانی، لـە ئیرشـاد کـردن و تۆبـە دادان و تەریقـەت نیـشاندان بـە خەڵک، خۆی بواردووە و ئەوەی بە باشتر زانیوە لە ڕێگای دەرس‌دانـەوە و ناسـاندنی دیـنی ڕاسـتەقینە بـە خەڵک، خزمەت بکا.

ساڵی ١٣٢٠ ک. م. بابی کۆچی یەکجاری دەکا و هەموو کـار و ئـەرکی میوانـداری و جوابدانـەوە بـە خەڵک و زۆر گیر و گـرفتی تـر، ئەکەوێتـە سـەر شـانی و دەرفـەتی خوێنـدن و دەرس‌گوتنـەوەی بـۆ

ناهێڵێتەوە. بەو بۆنەوە چار لەوەدا دەبینێ، لەوێ بار بکا و بچێتــە شــوێنێ بتوانــێ بخوێنــێ و بنووســێ و دەرس بێژێتەوە و لە ژیانی بەرهەمێکی باشتری دەس بکەوێ. لەسەر ئەو بیر و بڕوایە، بڕیار دەدا بچێ بۆ سنە و بەم جۆرە ساڵی ١٣٤٤ ک. م. بەماڵەوە ڕادەگوێزێتە ئەو شارە و لە قوتابخانەی «عەبدوڵڵا بـەگ»، وەکوو مامۆستا دادەمەزرێ. لەو مەدرەسەدا هەمیشە دوو حوجرە تایبەت بە فەقێ بووە و لە هــەرکام لــە حوجرەکاندا، چوار قوتابی خوێندوویانە.

ئەو ڕەحمەتییە، لە هەرچوار وەرزی ساڵدا، هەموو ڕۆژێک سەر لە بەیانی ـ ئەگەرچی مەدرەسە بە ماڵەوە دوور بوو ـ بە پێیان دەڕۆی و دەرسی دەگوتەوە و دوای نوێژی نیوەڕۆ دەهاتــەوە. بــڕێ ڕۆژیــش قوتابییــان، دوای نیوەڕۆ ئەهاتنە ماڵ و لەو زانستانە کە شــارەزای بــوو، وەکــوو: تەفــسیر و حــەدیس و زبــان و وێــژەی عەرەب، لای دەیانخوێند.

لە ماوەیەکدا کە بابم نیشتەجێی سنە بوو، تاقمێکی زۆر لە ئاڵقەی دەرســی بــەهرەیان بــرد و ئیجازەیــان وەرگرت؛ مامۆستایانی وەک: مەلا حامیدی شاهینی، عەبدولحەمیدی بەدیعوززەمانی (میهی)، مەلا بــەهای شادمان، مەلا حەیدەری ئەوێهەنگی، مەلا شێخ حەســەنی تاڵــشی، مــەلا نەجمــەدینی تەجــرەیی، شــێخ موحەممەد قەسیمی مەردۆخی و ...

خوا لێ خۆشبوو شێخی ڕۆحانی، بیرێکی تیژی هەبوو؛ ئەوجار کتێب‌خوێندنەوەش ماندووی نەدەکرد. لە ئەدەبیات، نەخوازە زبان و وێژەی عەرەبدا، مامۆستای بێ‌قــسەی ڕۆژگــاری خــۆی بــوو؛ فیقهـــ و تەفــسیر و سونەتیشی چاک دەزانی. بەتایبەت حەدیسی سیحاحی زۆرتر بە بەڵــگەوە، لەبــەر بــوو. بنەماڵــەی بــەڕێز و یارانی پایەبەرزی پێغەمبەری مەزن(د) و تابیعین و گەورەپیاوانی زانستی و دیــنی، یــەک بــە یــەک، بــاش دەناسین و هەموو باسە ئاکاری و ئایینییەکانی ژیانی هەرکامیانی دەزانی. ئەگــەر دەچــووە نێــو کۆڕێکــەوە، گشت تامەزرۆی بیستنی قسەکانی دەبوون و هەر دەمی دەکــردەوە، بــە گفــتی جــوان و گوتــەی ڕەوان و دڵبزوێن، ڕۆح و گیانی دانیشتوان و گوێگرانی دەگەشــاندەوە. زۆربــەی ڕۆژانی ســێ‌شــەمبە و جومعــە، لــە بەیانییەوە، بۆ چاوپێکەوتنی میوانان، لە ماڵ دادەنیشت و خەڵک ـ لە خوێندەوار و ڕەمەکی ـ دەهــاتن و ئــەو بە دەنگێکی بەرز و لەسەرخۆ، باسێکی دینی و مێژوویی دەسپێدەکرد.

هەموو شەو بۆ شەونوێژ هەڵدەستا و هێندێک پێش نوێژی بەیانیش، دیسان لــە خــەو ڕادەبــوو؛ دوای دوو ڕەکات نوێژی فەرز و مەسنوونات و تەعقیبات، ماوەیەک ڕوو لە قیبلە، خەریکی ڕاز و نیاز دەبوو. کە ڕەنگــی ئاسمان دەگۆڕا، خوێندنەوەی قورئانی بە دەنگێکی نەرم و خۆش، دەسپێدەکرد.

زۆرتر یادی خودای لە دڵدا بوو. زۆر جــاران کــاتی تــەنیایی، لەبــەر خۆیــەوە شــیعرێکی مــۆرە دەکــرد و فرمێسک بە چاوانیدا دەهاتە خوار. بالایەکی بەرز، سەر و سیمایەکی نوورانی، ڕیشێکی سپی و جوان؛ بــەڵام لەشێکی یەکجار لاوازی هەبوو. لەم دواییانەدا زۆر کەم‌هێز ببــو؛ ئەگــەرچی قــەت نەیناڵانــد و نەینوانــد. تــا

ئاخری ژیان بەبێ چاویلکە، ڕێزترین خەتی دەنووسی و دەخوێندەوە. خەتی نەسخ و نەستەعلیقی جوان دەنووسی و زۆربەی کتێبە دەرسییەکانی بە خەتی خۆی نووسیبوەوە. بە فارسی و عەرەبی جاروبارەش کوردی شیعری دەگوت و شیعرەکانی لەگەڵ ڕەوانیدا، پتەون.

لە ماڵ و سامانی دنیا، شتێکی وای نەبوو؛ تا مابوو نەیتوانی خانوویەک بسێنێ؛ لەگەڵ ئەوەدا، ماڵی هەمیشە پڕ لە میوانی دوور و نزیک و هەمەجۆرە بوو.

مامۆستا ڕۆحانی سەرەنجام شەوی یەکشەمبە، عەرەفەی جێژنی قوربانی ساڵی ١٣٦٠ ک. م. بەرامبەر بە حەوتەمی بەفرانباری ساڵی ١٣٢٠ ک. هـ. )١٩٤١ ز.)، دەستی لە ژیان بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا. ڕۆژی جێژن، لەوپەڕی ڕێزدا، بەڕێ کرا و لە سەر گردی زیارەتانی «شێخان» نێژرا.

**لە بەرهەمەکانی**:

شێخی ڕۆحانی لە کتێب و نامیلکە و شیعر، بەرهەمی زۆری هەبوو کە فرەیەکیان کەوتبوە دەستی ئەم و ئەوو. دوای لە دنیا چوونی، حەولێکی بێوچانم دا کۆیان بکەمەوە و نوسخەیان لێ بگرم. هێندێکیان ئێستەش دەستم نەکەوتنەوە... ئەوانەی کە ئێستا لە لای منن، بریتین لە:

١. «*شرحُ الصَّدر فی التَّوسُّل باهلِ البَدر*»، هۆنراوەیەکی عەرەبییە، ١٢٠ بەیت، بریەتی لە سکاڵا و ناوی یەک بە یەکی ئەسحابەی بەدر و دەسەوداوێن بوونیان

٢. «*النَّظمُ الاسْنی فی التَّوسُّل بأسماءِ الله الحُسنی*»، هەڵبەستێکی عەرەبی ٥٩ بەیتییە، بریتی لە سکاڵا و دەستەوداوێن بوون بە تاکەتاکەی نێوانی خودا

٣. «*نظمُ شمایل النَّبی*»، مەسنەوییەکی بریتی لە ٥٠٦ بەیتە، هەڵگوتن و هەڵدانی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەری مەزن (د)

٤. «*اسماعیل نامە*»، هۆنراوەیەک بە فارسی، باسی قوربانی کردنی حەزرەتی ئیسماعیل

٥. «*غایَةُ السّول فی نظم سیرةِ الرَّسول*»، هۆنراوەیەک بریەتی لە ٦٣٠ بیت، باسی ژیانی پێغەمبەر (د)، لە هاتنە دنیاوە تا کۆچی دوایی، بە عەرەبی

٦. «*بدرنامە*»، هەڵبەستێک بە فارسی، لەمەڕ غەزوەی بەدرەوە، ١٤٥٠ بەیت

٧. نامیلکەیەکی فارسی، لە بارەی چۆنیەتی ڕابیتە، لە داب و نەریتی نەقشبەندییەدا

٨. «*باکورةُ النَحو*»، مەسنەوییەکی بە عەرەبی، ١٩٢ بەیت لە نەحودا

٩. «*نُخبَةُ الادَب*»، مەسنەوییەک لە بەدیع و جوانکاری شیعریدا، ٨١٠ بەیتی عەرەبی

١٠. «*نظمُ الادَب*»، مەسنەوییەک بە عەرەبی لە داب و دەستووری وتوویژدا

١١. «*تخمیس قصیدە بُردە، شیخ بوصیری*»

١٢. «*تشطیر قصیدە بُردە، شیخ بوصیری*»

١٣. «*تشطیر قصیده مضریّه، شیخ بوصیری*»

١٤. «*حدیقةُالفوائد*»، هۆنراوەیەکە لە بەحری ڕەجەزدا، باسی «*حروف مُفرَدات*»ی زبانی عەرەبی

١٥. نامیلکەیەک بە فارسی لەمەڕ هاتنە دنیای حەزرەتی موحەممەدەوە (د)

١٦. مەسنەوییەکی عەرەبی لەمەڕ ناردنی پێغەمبەر (د) و غەزوەکانی

١٧. سەرجەمی فتواکانی

١٨. خوتبە عەرەبییەکان

١٩. دیوانی شیعر

٢٠. سەرجەمی ئیجازەنامە، نامیلکە و نووسراوەکانی

**چەند شیعری ئەو خوا لێ خۆشبووە:**

اهـوال مـرگ و فتنـه‌ی قبـر و غـم سؤال — هنگامـه‌ی قیامـت و بـازار بازخواسـت

اظهارنامـه‌ی عمـل و ورطـه‌ی صـراط — در دوزخ اوفتادن خلق از چپ و ز راست

افـسوس در مـزاج تـو بـاری اثـر نکـرد — وز غلفـت و غـشاوَه‌ی تـو ذرّه‌ای نکاسـت

از هـول سـوء خاتمـه و کـار آخـرت — بگداخت سنگ خاره و از کوه ناله خاست

در حیرتم «حبیب» کز ایـن هـول جانگـداز — چونت جگر دولخت نگشت و دلت به جاست

در روز رسـتخیز امیـدی اگـر بـود — تنهـا شـفاعت و کـرم ذات مـصطفاست

* * *

هـان ای اجـل بیـا ببـر ایـن جـان خسته را — برهـان ز جـور حادثـه جـسم شکـسته را

هـر روز از تـو پیـک و پیـامی همـی‌رسـد — تهدیـد مـی‌کنـد تـن از هـم گسـسته را

موی سفید و سستی اعصاب و پشت کُـوژ — بـستند شـاهراه حـواس خجـسته را

چون جسم کاست جان به ضرورت بـه در رود — دام شکـسته گـشت سـبب مـرغ رسـته را

زینسان کـه کاسـتم نبـری ترسـم از اجـل — زین نخل‌بن، نـصیب نـه خرمـا نـه هـسته را

فرتـوت گـشته‌ام مـن و تـو دیـر مـی‌کنـی — مُشکل رسـی بـه بـسْمل از حَبس جَسته را

* * *

ای وصـف تـو لا یُـسْألُ عَمّـا یَفْعَـل — میـدان خـدائیت اَبَـد همچـو ازل

داد از سـتم پهلـوی کـافرکیش — غـارت‌کـن مـال و دولـت و علـم و عمـل

خـاموش کـن مـشعله‌ی چـارده قـرن — دسـتور ده خـلاف وحـی منـزل

برداشـت حجـاب از رخ و دسـتار ز سـر — کاویـد دل امثـل ثُـمّ الأمْثـل

خـون همـه ایتـام و محـاجیر مکیـد — بربـود زر و سـیم و سـواد و صـیقَل

جوری است نه چون جور غلام ثَقَفی — دوری است نه دور پُور دخت بجْدل
عصری است در او ادیب فرزانه، کئیب — منظوم در او مختل و سالم معتل
دلها همه مجروح و جگرها بریان — بدعت همه مستعمل و سنت مهمل
معبد همه ویران و مفاسق آباد — مسجد همه معبر شد و طاعت مختل
از بستن راه حج نباشد کس را — پروا که شده است استطاعت منحل
بسته است ره چون و چرا بر عالم — خواهد که بود همچو خدا لا یُسْأل
دجال نگر منازعت میورزد — با عزّت و کبریای حق عَزَّوجل
لا حَوْل وَ لا قُوّة الّا بالله — و الأمرُ الیه انْ قَضی او أمْهَل
یارب همه بندگانت افسرده دلند — چون مُرغ فتادهاند اندر بسمل
از زندگی خویش به جان آمدهاند — تا کی بود این مُشکل ما لاینحل
وقت است خدایا که فرو اندازی — این جرگهی ظلم را به درک اسفل
یارب مدهش مهلت و درهم شکنش — زان سان که شکست شرع شاه مُرْسل
ای عزت حق به دفع ظالم بشتاب — وی حفظ خدا به سوی مظلوم اعجل

* * *

یا رسولَ الهدی جُعلتُ فداکا — لَیْسَ لی مَنْ به ألوذُ سواکا
قَدْ أتَیْتُ الذُّنُوب حَتّی بدالی — أنَّنی نلْتُ شقْوَةً و هلاکا
و اتَّبعتُ الهَوی و أسْرَفْتُ فیه — وَ نَسیتُ الْهُدی بتَرْك هَواکا
واقترفتُ الْحجابَ للْقَلْب حَتّی — حُرم الاتِّعاظَ وَ الإدراکا
فَإذا کانَ فی القیامة نُودی — مَنْ أشَرُّ الْوَرَی، لقُمْتُ هُناکا
لَیْسَ لی قُربَةُ بها أسْتَقیلُ — ما تعاطیتُ منْ خلاف رضاکا
غَیْرَ أنّی امرُؤٌ کثیرُ الغرام — هائم البال مولعٌ بهواکا
خالطَتْ منّی العظامَ وَ لَحْماً — و عُرُوقاً مَحَبَّتی إیاکا
أنْتَ یا سَیّدی أحَبُّ الأنام — وأعَزُّ عَلَیَّ ممَّنْ سواکا
لَیْسَ و الله فی الْوری لی حَمیمٌ — اَوْ خَلیلٌ مَحَبَّةً ساواکا
فإذا ما یُنشِّرُ الامْلاكُ — صُحُفَ الْمُسْلمین تَحْتَ لواکا
فَقَدُوا فی صَحیفَتی و کتابی — طاعةً أو بضاعَةً غَیْرَ تاکا

ئەم چوارینەی لە پشت بەرگی *«صَحیح بُخاری»*دا نووسیوە:

افسوس که نادیده رخت جان دادم — با حسرت دل سر به لحد بنهادم

لیـک از کلماتـت گهـری چنـد بـه‌جـان — انـــدوختم و از ایـــن غنیمـــت شـــادم

ئەم دوو بەیتەش هی ئەوە:

سیرم از زنـدگی و زحمـت دهـر — بــــــا دل زار تمنـــــــا دارم

بـــه هـــواداری اولاد رســـول — رو بـه صـحرای عـدم بگـذارم

ئەمەش نموونەیەک لە پەخشانی عارەبی شێخی ڕۆحانی، کە بۆ پێشەکی *«شرحُ‌الصَّدر فی التَّوسُّل بأهل البَدر»* نووسیویە:

بسم‌اللهِ و الحمْدُ لله و الصّلوةُ و السّلام علی سیّدنا محمد رسول الله و علی آله و أصحابه الّذینَ جاهَدُوا و اجْتهدوا فی الله. و بعْدُ فَقَد دهمنی همٌّ لا طاقَة لی بتحمـلِ کربـه، و زاحمنـی خَـوْفٌ مـنْ أذی ظـالمٍ لا قَـدْرَةَ لـی بحربـه فَاشْتدَّت الحالُ و صعُبَتْ، و ضاقتْ عَلَیَّ الأرضُ بما رحُبت، فَقَصَدْتُ إلی نَظْمِ أسماء اصـحاب بـدْر، و التّوسـلِ بهم فی تفْریج الشّدَّة و شرح الصّدر، و قدْ سبق منّی نَظْمٌ آخرُ جلیلٌ لها منْ بحر الطَّویل، و أحببتُ نظمها الآنَ منْ بَحْرِ الخَفیف، تَفؤُّلاً بالتَّخفیف، فجاء بحمدالله نظماً رائقاً فائقا، و لکیدا لباغین إنْ شاءالله تعـالی حاجبـاً و عائقـا، و لعنایة الله تعالی جالباً و سائقا، صدَّقَ الله تعالی بفَضله الْعمیم فالی، و آمَنَ بمَنّـه العظـیمِ روعـی و أحْـسَنَ حـالی، و خَفَّفَ أثْقالی، و کَشَفَ أهوالی، و عَمَّ بنوالی، و بالخَیْرِ نوی لی...»

ئەم قەسیدە، زانای ویژەوان، خوا لێ خۆشبوو سەید موحەممەد باقری حیرەت «رُکنُ‌الاسـلام»، لـە شـینیدا دایناوە و تێدا جوانکاری «توشیح»[1]ی بەڕێوە بردووە:

گشت چون ماتمزده گریان زمین و آسمان — در عزای رحلت شیخ‌الـشیوخ انـس و جـان

شیخ عیسی دم «حبیب‌الله روحانی» کـه بـود — در کمـال زهـد و تقـوی همـسر روحانیـان

تـار بـادا چـشم انجـم تـا نبینـد بعـد شـیخ — شیخی اندر زمـره‌ی اقطـاب و اوتـاد جهـان

رهـــروان کعبـــه‌ی مقـــصود را خیرالـــدّلیل — رهزنـــان وادی دیـــن را ســـنان جـــان‌ســـتان

وه کــه آن روح مُجــسم را نبــد بالاتفــاق — در شریعت، در طریقت، در حقیقت شبه و مـان

حــافظ عهــد الــست و ســاقی بــزم بلــی — بلکه مـست دائمـی از جـام امـر کـن فکـان

آن یگانــه نایــب نُــواب پیغمبــر کــه بــود — ختم بروی حلم و عدل و شرم و علم بـی‌کـران

نام او چون نام حق حرز روان شیخ و شـاب — ذکر او چـون ذکـر حـق ورد زبـان عارفـان

یاد حق مضمر بود در یاد او، زیرا که هست — مـضمر انـدر یـاد او آرام دل، قـوت روان

حُسن خَلق و خُلق بیش از حد آن شیـخ جلیـل — می‌دهد بر متنهای فـضل حـق بـا وی نـشان

---

[1] لە چوونە پاڵ یەکی یەکەم پیتی هەرکام لە بەیتەکان، باڵی ئاخری پارچەهەڵبەستەکە دروست دەبێ کە باڵی شـادە مێژوویە و لێرەدا «گشت روحانی حبیب‌الله امام قدسیان»ە و بە حیسابی ئەبجەد ئەبێتە ١٣٦٠ ک. م. ئەم جوانکارییـە لـە بەدیعدا، «تەوشیح»ی پێ دەڵێن.

بی‌حضور او محاضر چون دل دور از سرور / بی‌شهود او مشاهد چون تن خالی ز جان

یاد ایادمی که بودم در جوار لطف او / با نشاط انباز و با عیش و طرب همداستان

بر سماط فضل او بودم کهینه ریزه‌خوار / بر کلام معجزآسایش کمینه ترجمان

اللهالله ای همای عُلْو علیُّون علم / از چه رو پرواز کردی ناگهان از آشیان

لاف هستی کز هما دور است، وی را نیست عار / ز آشیان مختصر خاصه که باشد زاستخوان

هر سبب کانجا به وهم آید مسلم نیست جز / جلوه‌ی جَلَّ شأنه عنْ تفاسیر البیان

آری آری جلوه‌ی حق است کاهل‌الله را / باز دارد از خیال ما سوی‌الحق جاودان

مرگ را صدها گزیند بر حیات آن‌کس که او / کرده‌ی خود را چنان بیند، دم رفتن شیان

آفرین بر «شیخ روحانی» که فرمود ابتیاع / جلوه‌ی حق را به بذل نفس و جان و خان و مان

ماند از بی‌مایگی از حج جسمانی و لیک / از پی تکمیل قدر و جاه آن صدر زمان،

قائد توفیق شام حج اکبر، پیر را / گشت رهبر تا به کام دوست با بخت جوان،

در جوار خاص مکه حجةالاسلام را / شد به جان حاضر به سان کعبه‌ی مُحرم نشان

سال حج جان شیخ از حرفهای اوّلی / زین موشّح نظم می‌گردد مریدان را عیان

یارب از فضلت بر اخلافش به رحمت کن نظر / ویژه «باباشیخ» بهتر شاخ بیخ دودمان

از پی تاریخ سال رحلتش تازین سپس / شمسی و هجری نگردد مشتبه بر همگنان،

نک به هجری سال فوتش خامه‌ی «حیرت» نوشت / «گشت روحانی حبیب‌الله امام قدسیان»

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ ڕەحمانی زەوقی

کوڕی ئەحمەد، کوڕی موحەممەد، خەڵکی بدلیس، ساڵی ١٢٧٧ ک. م. هاتە دنیا و لە زێدی خۆی و باقی شارەکانی دەور و بەر خوێندی و پاشان چوو بۆ میسر و لە «جامعُ‌الازهر»ی قاهیرە، دەرس و دەوری تەواو کرد. لە مانگی ڕەبیعول‌ئەوەڵی ساڵی ١٣١٣ ک. م. بوو بە مامۆستای «رواقُ‌الاکراد»ی ئەو زانستگایە و ساڵی ١٣٣٥ کە شێخ مستەفای سلێمانی، لە دنیا چوو، ئەم بوو بە سەرپەرشتی ئەوێ و تا کاتی کۆچی یەکجاری (زیقەعدەی ١٣٦٠ ک. م.) ئەو مەقامەی هەبوو.

شێخ ڕەحمان پیاوێکی پاک و پارێزکار، خاکەسار و یەکجار زانا بووە و بە هۆی لێهاتوویی و گونجاوی و تێگەیشتوویەوە، شێخ موحەممەدی عەبدوه، موفتی میسر، پێشنوێژی مزگەوتی ڕەواقی عەبباسیشی پێ سپاردووە.

*مشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٢٠ و ٢١.

## شێخ نوورەدینی شیروانی

شێخ نوورەدین ئەفەندی، کوڕی شێخ ئیسماعیلی شیروانی، کوڕی شێخ حەسەن بەگ، ساڵی ١٢٨٣ ک. م. لە هەولێر هاتە دنیا و دوای تێپەڕکردنی سەردەمی ساوایی، بۆ قوتابخانە ڕۆیی و دوای ئەوەش بوو بە فەقێ و کاتێ کە کاکی پایەبەرزی (شێخ تاها ئەفەندی) بوو بە مامۆستا لە کەربەلا، ئەمیش ڕەگەڵی کەوت و لە خزمەتی زانایان و مامۆستایانی ئەوێ، وەکوو میرزا باقری یەزدی بەهرەی برد. هەروەها پێڕای خوێندنی دینی و ئەدەبی، ماوەیەکیش لە دوو بژیشکی بەناوبانگی ئەو زەمانە: نیزامەدین بەگ و تەفێق بەگی سۆفی، ئەو زانستە فێر بوو. کە لە کەربەلا گەڕاوە ـ لە هەولێر و بەغدا ـ خوێندنی درێژە پێدا و تەوای کرد و ئیجازەی وەرگرت.

نوورەدین ئەوجار خزمەتی فەرمی دەسپێکرد و لە چەند شوێنان، وەکوو مامۆستا و کارگێڕ و سەرۆک، دامەزرا؛ بۆ وێنە: مامۆستایی لە مەدرەسەی ڕەشیدییەی بەغدا و بەسرە، کارگێڕی نەخۆشخانەی «غُربا» و وانەی مامۆستایانی کەرکووک و بەغدا و گوتنەوەی دەرسی فەلسەفە و پەروەردە و ئاکار لەوێدا، بوونە ئەندام لە ئەنجومەنی مەعاریفی بەغدا و سەرۆکی زانکۆی ئەعزەمییەی بەغدا، بۆ ماوەی شەش ساڵ. دوای ئەوە، لەسەر داخوازی خۆی، کاری ڕەسمی نایە لاوە و باقی ژیانی بە نووسین و دەرس‌گوتنەوە لە قوتابخانەی دینی ئۆزبەکییە و وتاردان لە مزگەوتی حاجی ئەمین لە پەنای کەرخی بەغدادا تێپەڕ کرد.

شێخ نوورەدین پیاوێکی زانا، پارسا، درووستکار و مەردمدۆست بووە و زۆر بەرهەمی نووسراوەی لێ بەجێ‌ماوە.

**لە کتێبە چاپکراوەکانی:**

١. *خلاصة تاريخ الاسلام*

٢. *الفلسفة العليمة و الفلسفة الاخلاقية*

٣. *حقيقة الحقايق*، في ماوراءُالطبيعه

٤. *المنطق القديم و المنطق الجديد*

٥. *الفلسفة العليا*

٦. *زبدة الهندسة*

٧. *تاريخ التربية*

**بەرهەمە چاپ نەکراوەکانی:**

١. *قانون المناظره*

٢. *آدابُ البحث*

٣. *البعثُ بعدالموت*

٤. *علم‌الخلاف*

٥. *تاریخ‌القرون الاولی*

٦. *مختصر تاریخ بیزانس القسطنطنیه*، بە زمانی ترکی

٧. *السنوحات الالهیه فی شرح احوال السلسلة النقشبندیه* و هی تریش.

کۆچی دوایی شێخ نوورەدین، دەوری ساڵی ١٣٦٠ ک. م. ڕوویداوە.

*لُب‌الالباب*، سوورەبەردی.

## ئەبووبەکر ئەفەندی (مەلا گچکە)

عەللامە ئەبووبەکر ئەفەندی هەولێری دووهەم، کوڕی حاجی عومەر ئەفەندی، کوڕی مەلا ئەبووبەکری یەکەم، کوڕی مەلا عوسمان، لە پیاوە بوودە و ناسراوەکانی هەولێر بووە کە لە زانستە عەقلییەکان، بەتایبەت هەیئەت و ڕیازیدا، شارەزاییەکی تەواوی دەسکەوتووە و قوتابیان پاش تـەواوکردنی دەرس و دەور، تەنانـەت لـە ڕێگـای دووریشەوە، خۆیان گەیاندۆتە کۆڕی دەرسی، بەشکوو لەو دەریای پڕ گەوهەری زانستە، بەشێکیان بەرکەوێ.

مەلا ئەبووبەکر بەو بۆنەوە کە هاوناوی باپیری بووە، «مەلا گچکە»یـان پـێ گوتـووە و بۆخـۆی لـە گونـدی «باداوا»، لە شەش کیلۆمیتری هەولێر دانیـشتووە و هـەموو ڕۆژێـک بـۆ دەرس‌گوتنـەوە، چۆتـە مزگـەوت و مەدرەسەی قەڵا و گەڕاوەتەوە.

مەلا گچکە پیاوی دین و دنیا بووە و مـاڵ و سـامانێکی زۆری پـێ گـەیوە و هـەموو خـەرجی قوتـابی و مەدرەسە و مامۆستایانی، لە گیرفانی خۆی داوە. هەروەها لە گوندە دراوسییەکانی «باداوا»یشدا، بە خـەرجی خۆی، قوتابخانەی داناوە و لە هەموویاندا مامۆستا و قوتابی، بێ کەم و کووڕی و بە ئارخەیانی ژیاون.

عەللامە ئەبووبەکر ئەفەندی مرۆیەکی زۆر لەسەرخۆ، بەمشوور و جێ ڕێز و متمانـەی خەڵـک و دەوڵـەت بووە؛ لەوپەڕی سەربەرزی و دەسەڵات و ئابڕوومەندیدا ژیاوە و دەرکی میوانخانەی ماڵـی، قـەت دانـەخراوە. هەرکەسێ کەلی کارێکی لێ خستووە، تا لە دەستی هاتبێ، بۆی جێبەجێ کردووە و داخوازی بێ‌ئـەنوایانی تا پێی کرابێ، بەجێ‌هێناوە.

ئەم زانا خێرومەندە سـەرەنجام ساڵـی ١٣٦١ ک. م. دەسـتی لـە ژیـان بـەرداوە و ڕووی لـە دەرگانـەی ڕەحمەتی خودا ناوە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٣٥٨. یەک ـ دوو سەرچاوەی تر.

## شێخ عەبدولکەریمی خانەشووری

کوڕی سەید ئەحمەد، کوڕی سەید موحەممەد، کوڕی سەید عەبـدوڕڕەحیم، دەوری ساڵـی ١٣٠٣ ک. م. لە گوندی «خانەشۆر»ی ناوچەی باباجانی هاتە دنیا و هەر لە زێدی خۆی خوێندنی سـەرەتایێ دەسـپێکرد.



پاشان ڕووی لە ناوچەی شارەزوور نا و لە دێی «ئەحمەد بەرەندە»، لای شێخ مەعرووفی نێرگسەجاڕەوە ماوەیک مایەوە. لە پاش ئەوە ڕۆی بۆ هەڵەبجە و لەگەڵ شێخ بابارەسوولی بیدنی بەرزنجەییدا ـ کە ئەوکاتە ئەویش فەقێ بوو ـ یەکیان ناسی. ئەم دووە وا بوون بە دۆستی یەکتر، لەوە بەولاوە تا فەقێ بوون لێک نەبڕان و پێکەوە بۆ «پریس» و شوێنانی تر، وەکوو سلێمانی و بیارە چوون و خوێندنیان تەواو کرد.

ساڵی ١٣٣١ ک. م. شێخ مەعرووفی نێرگسەجاڕ، مامۆستای «ئەحمەد بەرەندە» عەمری خوا دەکا. لەسەر داخوازی خەڵکەکە و پشتیوانی شێخ نەجمەدینی نەقشبەندی، شێخ عەبدولکەریم بۆ ئەو شوێنە دەڕوا و تا دواکاتی ژیان (ساڵی ١٣٦١ ک. م.) لەوێ دەمێنێتەوە.

شێخ عەبدولکەریم مرۆیەکی سۆفی‌ئاسای دڵاوای خێرخوازی خەڵک بووە. جارو بارە، بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە و ئەم دوو شیعرە هی ئەون:

وەرە ئەی دڵ وەکوو پەروانە باڵی عیشق پەیداکە
بە دەوری شەمعی شەرعی ئەنوەرا سەدسۆز بەرپاکە
لە تەعنەی شێتەکانی وەک حوبارای ڕێگە لێ‌گومبوو
مەڕەنجە و بێ بە یەک شوعلە هەموویان تەفر و توونا کە
تەرەفداری شەریعەت شێرە وەک سیددیق و فارووقە
لە حێزەفێلی ڕێوی بوولەهەب یا جەهل بێباکە
ئەگەر باوڕ بە من ناکەی وەرە تۆزێ بە چاوی دڵ
تەماشای حوسنی ئیقدامی مودیری «وارماوا» کە
دەسا ئەی ئەهلی فەزڵ و مەعریفەت هەردەم بە سۆزی دڵ
تەمەننای نەسرەت و تەوفیقی ئەم زاتە بکەن چاکە
قوبووڵی کەی بە لوتفی خۆت خودایا ئەم تەمەننایە
بە حەققی ئەو کەسەی فەرمووتە پێی «لولاک لولاک»

ئەم شیعرەی بۆ شینی مستەفا خانی قوبادی، کە ساڵی ١٣٢٧ ک. م. لە شەڕ لەگەڵ قەڵخانیاندا شەهید بووە، گوتووە:

این چه غوغایی است می‌خیزد ز ارکان جهان — شور محشر شد هویدا در زمین و آسمان
داغدار و سوگوار این مصیبت مرد و زن — واله و سرگشته‌ی این ماجرا پیرو و جوان
از تنور دیده شد بسط زمین طوفان اشک — سرخ شد از جوش سیل خون دل هفت‌آسمان
شد پریشان خاطر مجموع اعیان زمین — گرد حسرت بر جبین بنشست ارکان زمان
کاکل زیبارُخان بریده از تیغ جفا — سنبل زلف بتان پژمرده از باد خزان

زانکه آن میر نکوسیرت به ناحق شد شهید
وز دم تیغ عدو غلطید در خون ناگهان
در مصاف کافران مانند شاه کربلا
جان به جانان داد و از دنیای فانی شد نهان
«مصطفی‌خان قبادی» رادمرد پاک‌دین
مرغ روحش شد طفیل مصطفی اندر جنان
از وفاتش سبعه‌ی سیاره بی‌تاب و توان
وز عزایش چشمه‌ی چشم ثوابت خون‌چکان
«فانیا» کوتاه کن آه و فغان زیرا کنون
او بود آسوده‌خاطر در نعیم جاودان
خاصه‌ی دست قضا بر لوح خاطر زد رقم
رمز سالش: «خیمه زد بر مأمن دارالامان»[1]

*یادی مەردان*، ب٢، ل٦١٨– ٦٢٨. جونگێکی دەسنووس.

## مەلا عەبدوڵڵای بەیتواتی

کوڕی مەلا موحەممەد ئەمین، زانایەکی خەڵکی هەولێرە کە لە قوتابخانەی حاجی قادری ئەو شارە دەرسی داوە و ساڵی ١٣٦١ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

مەلا موحەممەد ئەمینی بابیشی پیاوێکی زانا و هێژا بووە و ماوەیەک پێکەوە لەو مەدرەسە دەرسیان‌گوتۆتەوە.

لە نوسراوەکانی مەلا عەبدوڵڵا، کتێبێکە بە ناوی *«المحَنَةُ الوهَبّیه»*، شەرحی نامیلکەی *«الارادةُ الجُزئّیه»*ی مەولانا خالیدی شارەزووری. ئەم کتێبە ساڵی ١٣٤٧ ک. م. چاپ کراوە و لەو ساڵە، مەلا موحەممەد ئەمینی بابیشی لەسەر دنیا بووە.

پێشەکی *المحَنَةُ الوهَبّیه*.

## سافی هێرانی

حاجی شێخ مستەفا، نازناو «سافی»، ناسراو بە «کاک مستەفا»، کوڕی مەلا عەبدولا، کوڕی شێخ عەلی کە بە حەوت پشت دەگاتەوە بە شێخ سلێمانی میری سۆران، ساڵی ١٢٩٤ ک. م. لە گوندی «هێران» هاتۆتە دنیا. پێشەکی لای بابی خوێندن و نووسینی دەسپێکردووە و ئەوجار شارانی هەولێر و ڕواندز و کۆیەی بینیوە و لە قوتابخانەکانیاندا خوێندوویە و سەردەمێک ڕووی لە ناوچەی لاجان ناوە و لەوێش حەولی خوێندنی داوە و سەرەنجام لە زانستە دینییەکان و زبان و وێژەی عەرەبدا گەیشتۆتە مرازی خۆی.

بابی سافی (مەلا عەبدوڵڵا) ـ وەک لە شوێنی خۆیدا باسیمان کرد ـ شاعیر بووە و ئەمیش زەوقی شیعری لەوەوە پێ گەیشتووە. بەتایبەت کە خۆشەویستی «زیبا»ی هاوسەری، لە لایەکەوە و وازی زۆری بە

---

١. ئەم ڕستە بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە ١٣٢٧.

سروشت و دیمەنە دڵبزوێنەکانی «هێران» و «نازەنین»، لە لایەکی ترەوە، یەکیان گرتووە و لە ماوەیەکی کەمدا، شاعیرێکی باشی لێ بەرهەم هاتووە.

سافی تا ماوەیەک کە باوکی ماوە، خەریکی گەشت و گەڕان و ڕابواردن و ئەویینداری بووە و کە باوکی لە دنیا چووە، لەسەر ڕێوشوێنی باوانی، ژیانی دەروێشانەی هەڵبژاردووە و چۆتە نێو تەریقەتی قادرییەوە.

سافی مرۆیەکی حەسانی و دڵناسک بووە؛ هەرکوێ دەنگێکی خۆشی بیستبێ، فرمێسکی بە چاودا هاتووە. بە زبانی کوردی و فارسی و ترکی شیعری داناوە و دیوانە چکۆلەیەکی بە پێشەکی مامۆستا عەلائەدینی سەجادییەوە، ساڵی ١٩٥٣ ز. لە بەغدا چاپ کراوە.

شێخ مستەفای سافی سەرەنجام ساڵی ١٣٦١ ک. م. دوای ماوەیەک نەخۆشی، لە گوندی «هێران» دنیای بەجێهێشتووە و هەر لەوێیان ناشتووە.

شیاوی باسە، هەر وەک سافی خاتوو زیبای خۆش ویستووە، خاتوونیش ئەویینداری مێردەکەی بووە و لەگەڵ دڵیدا گەڕاوە و کە کۆچی یەکجاری کردووە، زۆری تاو نەهێناوە و مەودایەکی کەم بەشوێنیدا، دەستی لە ژیان بەرداوە و لە پەنای ئەودا نێژراوە.

**چەند شیعری سافی**:

جانا! لە فیراقی تۆ پەشێواوە دڵی من
پەروانەیی شەمعی تۆە، سووتاوە دڵی من

سەرتا بە قەدەم غەرقەیی خوێناوە دڵی من
وەحشیسیفەتە بەستەیی نێو داوە دڵی من

* *

دڵ ئەلبسەیی خوێنی هەموو دەم کە لە بەردا
دەیزانی فەلەک کینەیی وی مابوو لەسەردا

چەند عاشقی کوشتوون و خوێنی بە هەدەردا
لەم تالیعی بەرگەشتەیە چون ماوە دڵی من؟

* *

دایم کە لە دەست جەوری زەمانە بە جەفایە
پەیوستە بە جەور و ئەلەم و دەرد و بەڵایە

بۆ عاشقی بێچارەیە ئەم عادەتە وایە
بۆیە کە لە گۆشەی غەمەدا ماوە دڵی من

* *

تابووری بەڵا وا لە دولا هاتەوە یاران
بۆ قەتڵی سەری عاشق و مسکین و هەژاران

مەعلوومە کە دەرناچێ لەبەر تیری سواران
چەند دەفعە لە دەم قازەخیان داوە دڵی من

* *

سەرقافڵەچی! دەستی منت دامەنە قوربان
ماژۆ بە عەجەل مەحمەلی لەیلی بە هەموو ئان

مەجنوونسفەتان مانەوە لەم ڕێگە پەرێشان
بێچارە لە یارانی بەجێماوە دڵی من

* *

دایم لـە هـەوای قامـەتی تـۆ حاڵـی پەشـێوە
هـەردەم لـە فیراقـی تـوە وا کـەوتووە جێـوە

ئەم قورپەسەرە ڕۆحی گەییشتە سـەری لێـوە
دەرمـانی بکـە تـاکوو نەفـەوتاوە دڵـی مـن

* *

ئەی بادی سەبا! قاسـیدی جانـانی روحئـەفزا
نامەی غەم و دەرد و ئەلەمم تـۆ بـەرە بەغـدا

تا چەند لە ئەو میحنەتەدا بـێسـەگی دەرگـا
موددەیکە وەکوو «سافی» کـە شـێواوە دڵـی مـن

* * *

ئەی پەرتەوی ڕەنگت بە مەسـەل عـەینی چرایـە
وەی حەلقەیی زولفت شەبەهی دامـی بەڵایـە

کردووتە نیشانەی سەری موژگانی خەدەنگت
بۆیە دڵەکەم بـێکەسـە، لـەم گۆشـە خزایـە

سەوداسەری تۆم، مەمخەرە زیندانی جـودایی
حەیفە کە دەخەی بەندە لە ئەو چاهی بەڵایـە

بێیار و دەلیل پا مەنێ ڕێی عەشـقی جوانـان
چەند سەر لەسەر ئەم ڕێگە لە سـێدارە درایـە

پەروای نییە ئەسڵەن لەقسەیزاهیدی خودبین
مەعلوومـە حـەیای عاشـقی بێچـارە ڕژایـە

گیراوی سـەری زوڵـفی تـۆ تـا مردنـە قوربـان
چۆن باوەڕە حەپسی تۆ لە ئەم قەیدە ڕەهایـە

خوێنم بـڕژێ سـوورەتی نـاوی تـۆ دەکێـشێ
تا نـەمکوژی نـازانی کـە «سـافی» بـەوەفایـە

* * *

لە تـاوی چاوەکـەی مەسـتت دووچـاوم پـڕ لـە خوێنـاوە
حەنایی پەنجەکەی دەستت بە خوێنم ڕەنگی هێناوە

ئەوی دەردی فیراق پێ کـردوم ئەسـڵا بـەیان نابـێ
لـە نێـو ئیـسلامدا نـەبوە، لـە لای کـافر نەقـەوماوە

هـەتا مـردن بناڵـێنم لـە غـەم تەسـکینی دڵ نایـە
لە سۆزی فیرقەتی جانان وەهـا مـەفتوون و شـێواوە

دەوای وەسڵی نەبێ ئەسڵا شفای دەردی دڵـم نابـێ
لە ڕێ ڕەببا عیلاجم کەن، نەفەس تاکوو لـە سـنگ مـاوە

بڵێسەی ئاوری دووریت وەها جیسمی منی سـووتاند
بە دایم دووکەڵـی ئـاهم دەچێتـە عەرشـی ئـەعلاوە

لە بەدبەختیمە بۆیە لەیلەکەم بێمەیلە دەرحەق مـن
سەبەب توولی شەوی هیجرانە، تالع هەر لە خەو ماوە

لە «سافی» گەر دەپرسن بـۆچی وا پەژموردەیـە ئیـستە؟
لە خزمەت یاری doورە بۆیە وا غەم دەوری لـێ داوە!

**من و دڵ**، پارچە هەڵبەستێکی پێنج باڵە کە سێ باڵی هەوەڵی هەر بەندێک هی سافی، باڵی چوار، لە تاهیر بەگ و پێنجەم، شیعری نالییە:

من و دڵ ئەمڕۆ ئەو شۆخە لە خوشی یەکبەدەی کردین — لە جامی لەعلی سەر خۆش و، موقیمی مەیکەدەی کردین
هەتا مەحشەر خومار و مەستی ناز و نەشئەکەی کردین — بە غەمزەی چاوی مەخمووری سیاهی، مەستی مەی کردین
بە ماچی لێوی موستەغنی لە ئەنواعی مەزەی کردین

بە ئەو یارە بڵێن یاران! چییە سووچ و گوناهی من؟ — نەسیم ئەنگوت و شەو ڕۆیی چەمەن واڵا بو ماهی من
چە قەوماوە؟ مەگەر قوربان کەوا بەستووتە ڕاهی من — ترازا بەندی سوخمەی ئاڵی گوڵناری بە ئاهی من
کەچی دەستی لەسەر دانا، لە سەیری باخی بەی کردین

لەبۆ یەک مەرحەبایێ چوومە لای یارم بە سەرخوشی — نقابی خستە ڕوخسار و بە جارێ کەوتە خامۆشی
کە وام دی ڕۆیی ئارامی دڵ و سەبر و فەرامۆشی — بە هەوری پەرچەم و زوڵفی ڕوخ و ئەبرووی کە داپۆشی
لە شەوقی ڕوئیەتی بەدری هیلالی یەکشەوەی کردین

ڕەفیقانم! کەسێ عاشق نەبێ لەم سیرڕە نازانی — لە لایێ یار حەیاتبەخش و لە لایێ قابزی جانی
لە هەر دوو لاوە تەسلیمم بڵێن دەستم بە دامانی — ئەگەرچی گوشتمی خۆ «قابضُ‌الأرواح»ی موژگانی
بە قانوونی مەسێحایی بە خەندەی لێوی حەی کردین

لەبەر خوێنرێژی عوششاقان نیگارم گەرچی بێباکە — وەلێ ئەی دڵ! لە ڕووی ئومێدەوە جارێ تەماشا کە
مەڵێ «سافی» زەمان ئاخر بوو کەس ئیمدادی کەس ناکا — دەوای دەردی دڵی «نالی» لە «تاهیربەگ» تەمەننا کە
بەڵێ ئیمڕۆ گوڵەندامێ بە تیرێ جەرگی پەی کردین

**پێشوازی لە غەزەلێکی بەناوبانگی حافیز، بە سەرەتای**:

«چندانکە گفتیم غم با طبیبان — درمان نکردند مسکین غریبان»

وەرنە تەماشا دوست و ئەحیبان — ئەو بێڕەحمیەی دیم لە موحیببان — خەبەری دەردم چەندان تەبیبان
دەرمانیان نەکرد زامی غەریبان

بولبول کە دایم بە شین و زارە — حەقیە کە غونچەی لە دەست ئەغیارە — ئەو گوڵ هەموو دەم هەر لە لای خارە
بو شەرم ناکا لە عەندەلیبان؟!

بۆیە لە لای یار من هاوارم کرد — ڕازی دڵی خۆم پاک ئیزهارم کرد — دەردەکەی پەنهان عەرزی یارم کرد
چونکی ون نابێ دەرد لە تەبیبان

خوایە شادی بێ، بەس بێ غەمگینی — بۆ دڵی موشتاق هەر تۆی موعینی — یاڕەب ئەو جارەش بیکەی ببینی
چاوی موحیببان ڕوویی حەبیبان



قوربـان بـا بـەس بـێ ئـەوقاتی فەسـڵت — لە ڕێگەی خودا بـەوکانی ئـەسـڵت — ئەی شاهی خووبـان لـە خـوانی وەسـڵت
تاکەی هەر مـن بم لـە بـێنەسـیبان؟!

ئەی دڵ! لەم شۆرە قـەت نـابووی شـەیدا — گـەر مـەیلت کردبـا وەلایـی بەغـدا — **«سافی»ش وەک «حافظ» کەی دەبوو ڕیسوا**
ئەگەر گـوێ دابـا پەنـدی ئـەدیبان

دیوانی سافی، چاپی بەغدا، س ١٩٥٣.

## مەلا ڕەشید بەگی بابان

کوڕی فەتاح بەگ، لە بنەماڵەی میرانی بابان، ساڵی ١٣٠٠ ک. م. لە سلێمانی هاتـە دنیـا و خوێنـدنی لـە قوتابخانەکانی ئـەوێوە دەسـپێکرد و سـەرەنجام لـە پێنجـوێن، لای عەللامـەی دەوران، مـەلا ڕەحمـانی پێنجوێنی ماوەیەک خوێندی و ئیجـازەی وەرگـرت. دوای ئـەوە گـەڕاوە زێـدی خـۆی و لـە قوتابخانـەی شێخسەلامی ئەوشارە، بوو بە مامۆستا.

مەلا ڕەشید دوای یەکەم شەڕی جەهانی، چوو بۆ ئەسـتەمبوڵ و تـا کۆتـایی ژیـان (١٣٦٢ ک. م.) لـە قوتابخانە و مەدرەسەکانی ئەوێدا دەرسی گوتەوە.

**لە کتێبەکـانی**: شەرحی *«منظومةُ الفَریدە»*، نووسـراوی شـێخ جەلالـەدینی سـیوتی، لـە نـەحودا، شـەرحی *«احادیث صُحاح بُخاری و مُسلم»*، بە ناوی *«اِقترانُ النَّیّرَین فی مَجْمَعِ البَحریت»*، کە چاپ کراوە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٢٠٧ و ٢٠٨.

## دوکتور سەعیدخانی کوردستانی

کوڕی مەلا ڕەسووڵ، نازناو «پیرووز»، لە بژیشکانی زانا و یەکجار پسپۆڕ و بەناوبانگی نیوەی یەکەمی چەرخی چواردەیە کە ساڵی ١٢٤٢ ک. م. لە سنە هاتۆتە دنیاوە. بابی پیاوێکی خوێنـدەوار بـووە کـە لـە سـەرەتای چەرخی سێزدەدا، لە لای سنووری تورکیاوە بەرەو باشوور هاتووە؛ ماوەیەک لە مـەریوان و پاشـان لـە سـنە گیرساوەتەوە و لەو شارە، پێشنوێژی کردووە و قوتابخانەیەکی گەڕاندووە.

سەعید ـ کە یەکجار زیرەک و لێهاتوو بووە ـ لـە ژێـر چـاوەدێری بابیـدا، بـە واز و پـشتگرییەکی زۆرەوە خوێندن دەسپێدەکا؛ بەڵام هێشتا سێزدە ساڵی تەواو نەکردووە، سێبەری بابی لە سـەر نامێنـێ و نـاعیلاج دەبێ پێڕای خوێندن، کارێک بدۆزێتەوە و ژیانی خـۆی و بنەماڵـەکەی دابـین بکـا. هـەرچۆنێک بـووە بـە ڕێنوێنی و یارمەتی دۆستانی باوکی، چەندماڵێک پەیدا دەبن کە لە پێنـاو دەرس گوتنـەوە بـە منـداڵانیان، پارەیەکی کەمی بدەنێ.

ساڵی ١٢٨٥ ک. م. کەشەیەکی یووحەننا ناو، لە شاری «ورمێ»وە دەگاتە سنە و لـە کلیـسای ئـەو شـارە

دادەمەزرێ. یووحەننا زبانی فارسییەکی وای نەزانیوە و شوێنی کەسێک گەڕاوە فێری فارسی بکا؛ سەعیدی پێ دەناسێنن؛ کە لەم کاتەدا، لە قوتابخانەیەک دەرسی مەلایەتی خوێندووە و مەلا سەعیدیان پێ گوتووە.

ئەم ئاشنایەتییە بەتەواوی چارەنووس و تەنانەت ئایینی سەعید دەگۆڕێ و بەرە و بوارێکی ڕەچاونەکراوی دەبا.

کەشە یووحەننا دوای ماوەیەک، سەعیدی یەکجار خۆش ویستووە و لەگەڵی زۆر دۆستانە جووڵاوەتەوە. هێندێک کتێبی پێ دەدا بیانخوێنێ و بیر و بۆچوونی خۆی بۆ بگێڕێتەوە. ئەم کتێبانە، ئایینی خاچپەرستییان بانگەشە کردووە و سەعید کە لاوێکی هەژار و بێئەزموون بووە، لە لایەکەوە میهرەبانی و یارمەتی لەبن‌نەهاتووی یووحەننا و لە لایەکی ترەوە، خوێندنەوەی کتێبانی وا جوان و ڕازاوە و باسی دواکەوتوویی موسوڵمانان، وردە ـ وردە بەرەو هۆگری دینی مەسیحی دەبا و نیاز بە خوێندنەوەی ئینجیل، حەزێکی زۆری بۆ فێر بوونی زمانی سوریانی تێدا بەدیدێنێ.

ساڵی ١٢٦٠ ک. هـ. )١٨٨١ ز.) یەک لە میسیۆنیرانی کلیسا، لە هەمەدان، بە ناوی جیمز هاکس ـ کە مامۆستای زبانی فارسیش بووە ـ لە دنیا دەچێ و لە سەعید داوا دەکەن کە بچێ بۆ ئەوشارە و بە جێی ئەو، دەرسی زبانی فارسی بێژێتەوە. سەعید قەبووڵ دەکا و نیوەشەوێک سنە بەجێدێڵێ و دەگاتە هەمەدان. لەوێ پاش ماوەیەک، دینی مەسیح وەردەگرێ و هەروەها ئینگلیسییەکی باشیش فێر دەبێ و وەکوو بەردەست و وەرگێڕی دوکتور ئەلیکساندر، کار دەستپێدەکا و وردەوردە وازی ئەچێتە سەر بژیشکی و بڕیار دەدا هەرچۆنێک بووە، فێری ئەو زانستە ببێ.

سەعید پاش ماوەیەک ئەچێ بۆ تاران و میسیۆنیرانی ئەوشارە، زۆر بە گەرمی دەوری دەگرن و هێندەی ڕێز لێ دەنێن، بە تەواوی لەسەر دۆستان و ئایینی تازە، دڵگەرمی دەکەن.

بەهاری ساڵی ١٢٦٦ ک. هـ. )١٩٠٧ ز.) دوکتور ئەلیکساندر لەگەڵ خۆی ئەیباتەوە بۆ هەمەدان و پاش ساڵێک دەستی ئەنێتە نێو دەستی «ڕیبکا»ی کچی کەشە سیمۆن. داهاتوو دەریخست کە ڕیبکا چەند بۆ سەعید، هاوسەرێکی دڵسۆز و بەئەمەگ بووە و چۆن تا دواکاتی ژیانی، لەگەڵی بە خۆشەویستییەوە هەڵیکردووە.

سەعید بە ڕاهێنان و لە ژێر چاوەدێری ئەلیکساندردا، کەم ـ کەم فێری بژیشکی دەبێ و سەردانی نەخۆش دەکا و هاوکات، کتێبانی کۆن و نوێ لەمەڕ ئەو زانستەوە دەخوێنێ و تا ڕادەیەک چاوی تێدا دەکرێتەوە.

ساڵی ١٢٧٠ (١٨٩١ ز.) سەفەرێک بۆ شاری ورمێ دەکا و کە دەگەڕێتەوە هەمەدان، دەبینێ ئەلیکساندر خۆی وەنیشتە کردووە و دەستی لە کار کێشاوە و دەرکی دەرمانخانە داخراوە. لەسەر داخوازی خەڵک، ڕەزا دەدا کە تا هاتنی دوکتورێکی تر لە ئەمریکاوە، دەرمانی نەخۆشان و گەڕاندنی دەرمانخانە بگرێتە ئەستۆی خۆی و بە تێکۆشانێکی لە ڕادەبەدەر، شان ئەداتە ژێر هەموو کار و ئەرکی نەخۆش بینین و

دەرمان درووستکردن و تەنانەت پەرستاری و کێشک کێشان و سەردانی شەوانەی نەخۆشان.

ساڵی ١٢٧٢ (١٨٩٣ ز.) دوکتور هاڵمز لە ئەمریکاوە دەگاتە هەمەدان و سەعید کە لەم کاتەدا دوکتور سەعیدیان پێ گوتووە و ١٢ ساڵ بووە کە لەوپەڕی دروستکاریدا، وەکوو مامۆستای زبانی فارسی، بەردەستیی دوکتور و سەرەنجام دوکتور، خزمەتی کردووە، لە میسیۆنیری دەسدەکێشێ و هێندێک پارە لە دۆستانی قەرز دەکا و دەچێ بۆ وڵاتی سوێد و ڕۆژی نوهەمی مانگی حەوتی ساڵی ١٨٩٣ ز. دەگاتە ستوکهۆڵم و پاش لادانێکی کورت، دەڕواتە شاری لەندەن لە بریتانیا.

دوکتور سەعید ماوەی دوو ساڵ لە لەندەن، لەگەڵ بژیشکێکی ناسراوی ئەوێ، بەناوی دوکتور وارن، کار دەکا و ئەو دوکتورە بۆ خوێندنی باڵا، یارمەتییەکی باشی دەدا و سەرەنجام دوکتور سەعید، دەورەی پسپۆڕی لەشکاوی و فیزیۆلوژی لە زانستگای «کوک»ی لەندن تێپەڕ دەکا. لەگەڵ ئەوەشدا، بەشێک لە کاتی ڕۆژ، دەرمانسازی و میکرۆبناسی دەخوێنێ و بەوەندەشەوە ناوەستێ و پسپۆڕی بژیشکی چاویش وەردەگرێ و لە کۆتاییدا ئەچێتە نەخۆشخانەی «سەنجۆرج» و پسپۆڕی لە نەخۆشییەکی تایبەتی وڵاتانی گەرمەسێریش دەستێنێ و پاش دووساڵ و نیو، ساڵی ١٢٧٤ ک. هـ. )١٨٩٥ ز.) دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و لە هەمەدان، لەگەڵ بنەماڵەکەی یەک دەگرنەوە و سەردان و دەرمانی نەخۆشان، دەسپێدەکاتەوە.

بەهاری ساڵی ١٢٨١ (١٩٠٢ ز.)، جارێکی تر دەچێ بۆ بریتانیا و دەبێتە ئەندامی «پولیکلینیک»ی لەندەن و لەسەرڕا ئەکەوێتەوە خوێندنی تاقم ناسی و میکرۆب ناسی و نوێ کردنەوەی زانستی بژیشکی چاو. هەروەها ئەو هەلەی بۆ دەڕەخسێ کە بە هۆی دۆستی لەمێژینەیەوە (دوکتور پاتریک)، چاوی بە دوکتور هانس، دۆزەرەوەی باسیلی خۆرە بکەوێ و هێندێک زانیاری لەمەڕ ئەو نەخۆشییە تووش و حەستەمەوە دەسکەوێ. ئەم سەفەرەشی، ساڵێکی خایاندووە.

دوکتور سەعید خان ساڵی ١٢٨٤ ک. م. (١٩٠٥ ز.) لە هەمەدانەوە کۆچ ئەکا بۆ تاران و تا ساڵی ١٢٩١ (ماوەی حەوت ساڵ) دەمێنێتەوە. لەو ساڵانەدا، نەخۆشان لە هەموو لایەکەوە، ڕوویان لە مەحکەمە و ماڵی کردووە و دا و دەرمانی خۆیان وەرگرتووە. پاشان لەسەر داوای «وکیلُالمُلک»ی کوردستانی و سەید نەجمەدینی «هەمرۆڵە»، لە دوای سی ساڵان دووری لە نیشتمان، ئەگەڕێتەوە بۆ شاری سنە. چەند ڕۆژێکیش ئەچێ بۆ گوندی هەمرۆڵە و لەوێوە بە داخوازی سانانی هەورامان، سەفەرێکی ئەو ناوچە دەکا و لەوپەڕی میهرەبانی و دڵفرەوانیدا، بەبێ ئەوەی شتێ لە کەسێ گلبداتەوە، پێیاندا ڕادەگا و نەخۆشیان دەرمان دەکا. دوکتور سەعید لەو سەفەرەیدا دوو مانگ و نیوی پێچووە و ئەوجار گەڕاوەتەوە.

لە کوودەتاکەی ساڵی ١٢٩٩ ک. هـ. )١٩٢٠ ز.)، ماڵی دوکتور لە تاران بووە و لەگەڵ ئەو هەموو بشێوە و ئاژاوە و بێقانوونییەدا، بەو بۆنەوە کە هەموو چینێک خۆشیانویستووە و ڕێزیانلێگرتووە، گەزنێکی لێ نەکەوتووە.

هاوینی ساڵی ١٣١٥ (١٩٣٦ ز.)، لە وەرامی بانگێشتنی خەڵکدا، جارێکیتر ئەچێتەوە بۆ سنە و سەردەمێک لە ناو هاوشارییەکانیدا، سەرقاڵی سەردان و دەرمانیان دەبێ.

دوکتور سەعید خان هاوینی ساڵی ١٣١٦ (١٩٣٧ ز.) دیسان دەگەڕێتەوە هەمەدان. لەو بەینانەدا، ڕۆژێک دوو چەکداری شارەوانی دەچنە سەری، دەیگرن و دەیبەن. دوایی دەردەکەوێ کە هۆی ئەو گرتنە، دۆزینەوەی چەند نامەیەکی دۆستانە بووە کە بۆ سەرۆکێکی عەشایری کوردستانی نووسیوە. دوکتور پێیان ڕادەگەیەنێ کە: ئەمن قەت کارم بە سیاسەتەوە نەبووە و نابێ؛ بەڵام خەڵکی کوردستان ـ کە هاونەژادی منن ـ بۆ دەرمانیان دێن بۆ لام و ئەمن وەکوو بژیشکێک لەسەرمە ئەوی لە دەستم دێ، بیکەم. دیارە ئەوانیش بە نامە یان هەر شێوەیەکی تر بووە، خۆشەویستی خۆیان دەردەبڕن و منیش دەبێ جوابیان بۆ بنووسمەوە.

هەرچۆنێک بووە، دوکتوریان سێ مانگ و نۆ ڕۆژ لە زینـدان ڕاگرتووە و کە ئازادیان کردووە، چیتر نەچۆتەوە مەتەب و بە نیازی خوێندنەوە و کتێب نووسین، لە ماڵ دانیشتووە؛ بەڵام نەخۆشان ڕێگای ماڵیشیان دۆزیوەتەوە و ئەویش تا پێیکراوە، دەستی بەڕووی کەسەوە نەناوە و بۆ دەرمانیان تێکۆشاوە.

ساڵی ١٣١٨ ک. هـ. )١٩٣٩ ز.)، هاوسەری خۆشەویستی (ڕیبکا)، ماڵاوایی یەکجاری لێ دەکا. ئەم ڕووداوە بۆ دوکتور سەعید، بە تەمەنی زۆر و لەشی نەخۆشەوە، یەکجار گران بووە و تەواو پەکی پێ خستووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٦١ ک. م. (١٩٤٢ ز.) لە ماڵی خۆی لە هەمەداندا، دنیای بەجێهێشتووە.

دوکتور سەعید خان خاوەن ڕۆحێکی بەرز و دڵێکی بەرفراوان و یەکجار میهرەبان بووە. بۆ یارمەتی هەژاران و داماوان، قەت خۆی نەگووشاوە و درێغی نەکردووە. لەگەڵ هاو زمانان و هاو شارییەکانیدا، بە کوردییەکی پوخت و بێ گرێ و لەوپەڕی هاودڵی و یەکڕەنگیدا، قسەی کردووە و جووڵاوەتەوە. یەکجار زەین تیژ و بیر قووڵ و خاوەن هەست بووە و قسەی کەسی تا ورد نەکردبێتەوە و ڕاستییەکەی بۆی دەرنەکەوتبێ، وەرنەگرتووە. بۆ خوێندنەوەی ئینجیل و سەرلێدەرکردنی، زبانی عیبری باش فێر بووە. عەرەبیشی زانیوە و جاروبار شیعریشی داناوە و نازناوی «پیرووز»ی هەڵبژاردووە. کتێبە شیعرێکی بە زبانی کوردی هەورامی، بە ناوی «نزانی» هۆنیوەتەوە؛ کە ساڵی ١٣٠٩ ک. هـ. )١٩٣٠ ز.) لە چاپی داوە.

*طبیب محبوب*، وەرگێڕان لە ئینگلیسییەوە: ج. رسولی، دکتر آلن، چاپی تاران.

## مەلا ئەحمەدی فەوزی

مەلا ئەحمەد، کوڕی حاجی عەلی، نازناو «فەوزی»، لە هەڵەبجە هاتۆتە دنیا و دوایی بەرەو موکوریان چووە و لە گوندی «کولیجە»ی سەر بە مەهاباد، قوتابخانەیەکی گەڕاندووە.

شاعیری بەناوبانگی کورد، مامۆستا هێمن، لە سەرەتای لاوییەوە، لە کولیجە لای مامۆستا فەوزی خوێندوویە و زۆری لێ بەهرە بردووە و وەک لە پێشەکی «*تاریک و ڕوون*»دا ئێژێ:

«دەبێ بڵێم مـن دەسـکردی فـەوزیم. ئـەو هەڵیوەشـاندمەوە و تێکـی‌هەڵـشێلام و سـەرلەنوێ دروستی‌کردمەوە. ئەو دەرکی زانین و فێربوونی بۆ کردمەوە ... ئـەو تێـی‌گەیانـدم مـن ڕۆڵـەی کـوردم و کوردیش نەتەوەیەکی بێ‌بەش و چـارەڕەش و زۆرلێکـراوە و دەبـێ ڕۆڵـەکانی لـە پێنـاوی ڕزگارکردنیـدا، فیداکاری بکەن ... ئەو فێری کردم چۆن بنووسم و چۆن شیعر بڵێم ... ئەو حاڵی کردم کـوردی زمـانێکی ڕەوان و بەربڵاو و دەوڵەمەندە ... کەم وابوو لەسەر کتێـب دەرسـم پـێ بـڵێ؛ دوڕ و گەوهـەری نایـابی لـە دەریای قووڵ و بێ‌بنی زانستی خۆی دەردێنان ... بەڕاستی مامۆستا و شاگرد نەبوین، پیر و مورید بـووین. من تا ڕادەی پەرەستین، ئەوم خۆش‌دەویست ...

فەوزی بە بڕوای من، یەکێکە لە گەورەپیاوانی مێژووی کوردستان ... پێشەوا قازی‌موحەممەدی شەهید، شانازی بەوە دەکرد کە شاگردی فەوزی بووە.

فەوزی زانایەکی گەورە، ئەدیبێکی کەم‌وێنە، کوردێکی پاک و بێ‌باک بوو؛ بەڵام شـاعیرێکی بـاش نـەبوو. بیرێکی تیژ و وردی هەبوو؛ ئەمما تەبعەکەی ئەوەندە ڕەوان نەبوو بتوانێ بیخاتـە نـاو چوارچێـوەی شـیعری عەرووزییەوە؛ ئەودەمیش شیعری سپی نەببووە باو ... مامۆستا غەزەلێکی حافزی تەخمیس کردبوو کـە لـە ناو شیعرەکانیدا پەسندم کردبوو. ئەوەش بەندێک لەو تەخمیسەیە کە بە بڕوای من وەستایانەیە:

گهی شـوی ز امیـران پـادشـه محسوب
گهی وزیـر و به درگاه پـادشـه محبوب
گهی شـوی به سـر دار ناگهان مصلوب

**به چشـم عقـل در این رهـگذار پُـر آشـوب**

**جهان و کار جهان بی ثبات و بی محل است»**

مامۆستا هێمن، ساڵی کۆچی دوایی فەوزی ١٣٢٢ ک. هـ./ ١٣٦٢ ک. م. (١٩٤٣ ز.) گوتووە؛ کەچی خـاوەنی *مێژووی ئەدەبی کوردی*، ساڵی ١٩٢٣ ز. (١٣٤٣ ک. م.) نووسیوە و گوتەی مامۆستا هێمن لە ڕاست نزیکترە.

ئەمەش غەزەلێکی کوردی فەوزی کە لە شینی مەلا قادری جاف، کوڕی مەلا موئمیندا ـ کە ساڵی ١٣٢٦ ک. م. لە دنیا چووە ـ گوتوویە:

| | |
|---|---|
| دیـده از هجـر دوسـت شـد بـی‌نـور | جـان و تـن از وفـات او رنجـور |
| گـاه در بحـر اشـک غرقـه بـه خـون | گـه ز فریـاد و نالـه دل پـر شـور |
| حـسرت و آه در دل افـزون شـد | کـه عـدو شـد ز مـردنش مـسرور |
| در بیابـان هجـر او دائـم | مـی کـنم نالـه بـا دل مکـسور |
| آنکـه او بهـر مغلقـات علـوم | حیـدری بـود در جهـان مـشهور |



ولَـــــد حیـــــدر و حیبـــــب الــــــه مُتَّقـــــی همچـــو قاســـم و طیفـــور
هـــــاتفی در وفـــــات او ناگـــــاه قـــالَ تـــاریخُ مَوتـــه «مَغفـــور»[1]

پێــشەکی *تاریــک و ڕوون*، دیـوانی هــێمن. مێــژووی *ئەدەبی کوردی*، ل ٥٤٩. *یادی مەردان*، ب٢، ل٥٢٦.

## سەید موحەممەد ڕەئووفی سائیب

سەید موحەممەد ڕەئووفی سائیبی حوسەینی، کوڕی سەید عەبدوڵڵا، کـوڕی حـاجی شـێخ موحەممـەد، کوڕی حاجی شێخ ئەحمەدی حوسەینی، لە گوندی «لۆن سادات»ی ناوچەی بێڵەوار هاتـە دنیـا و هـەر لـە سەردەمی تازە لاوییەوە خوێندنی دەسپێکرد و زبانی فارسی و عەرەبی و زانستە دینییەکان باش فێـر بـوو. ئەوجار دەوری ساڵی ١٣١٠ ک. هـ. )١٩٣١ ز.)، لە شاری سنەدا ئیجازەی وەرگرت و گەڕاوە زێدی خـۆی و ژنی خواست و هێندێک لەودوا بوو بە مامۆستای گوندی «ئەلەک»ی لای کامیاران.

سەید موحەممەد ڕەئووف لەو گوندە جار و بار فەقێشی ڕادەگرت؛ بەڵام هەڤـیازی گـەورەی ئـەو مامۆسـتایە، پارێزکاری و دینداری و لەگەڵ هەژاریدا، بێ‌نیازی بوو. شەوان کەمتر دەنووست و بـە عیبـادەت و خوێندنـەوەی تەفسیر و حەدیس و فیقهی ڕۆژ دەکردەوە. بۆ بەجێ‌هێنانی سوننەتی پێغەمبـەر (د)، زۆری تێدەکۆشـا. کـەمتر قسەی دەکرد و زۆرتر خەریکی زیکر و فیکر و قورئان خوێندن دەبوو. ئەگەر ناوی پیرۆزی پێغەمبەر (د) ببردرایە، ڕەنگی دەگۆڕا و لە حاڵی ئاسایی دەردەچوو؛ لەڕاستیدا فەنا فی ڕەسووڵ بوو. بە ژیانێکی نەمر و نەژی ڕایبوارد و بە نەخۆشی کۆتایی هات و دەوری ساڵی ١٣٦٢ ک. م. بەر ڕەحمەتی خودا کەوت.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## موحەممەد ئەمینی کانیمشکانی (نەوید)

شێخ موحەممەد ئـەمین لـە شـێخانی کانیمـشکان، مامۆسـتایەکی هێـژا و پارسـا و دەمپـاراو، باڵابـەرز و کەڵەگەت، بەڕیشێکی سپی و پڕەوە، ساڵی ١٣٦٢ ک. م. لە شاری سنە کۆچی یەکجاری کرد.

ئەمن، وەک لەبیرم بێ، دوو جار چاوم بەو خوالـێ‌خۆشـبووە کـەوت. یەکـەم جـار ساڵـی ١٣١٩ ک. هـ. (١٩٤٠ ز.) بوو کە بۆ دیتنی بابم هاتبوو. جاری دووهەم لە میوانییەکدا بوو کە شێخ شوکروڵای ڕەحمـەتی، ئیمام جومعە و وتاربێژی ئەودەمی شاری سنە، هەموو زانایان، مامۆستایان و فەقێیانی بـۆ بـاخی «وێـڵە» لـە ڕۆژهەڵاتی باشووری شار، بانگێشتن کردبوو؛ شێخ موحەممەد ئەمینیش هاتبوو، ژمارێک لـە قوتابییـانی لـە

---

١. بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ١٣٢٦ ک. م.

پاڵێک، بە دەوری خۆدا کۆ کردبۆوە و لە بارەی هێندێک وشەی تایبەتەوە کە لە یارییەکی باوی فەقێیاندا دەگوترێنەوە، بە تام و لامەوە قسەی دەکرد و داستانێکی لەو بارەوە دەگێڕاوە. داخەکەم ئێستا هێچم لەو قسانە لەبیر نەماوە؛ بەڵام وەک لەودوا بیستم، کتێبێکی لەمەڕ یارییە ڕەواکانەوە نووسیوە و تێیدا یەک بە یەک کایەکانی ناساندووە و بەوردی، چۆناوچۆنی داب و دەستووری هەرکامیانی شی‌کردۆتەوە.

خوا لێ خۆشبوو شێخ موحەممەد ئەمین لە قوتابخانە و مزگەوتی «ڕەشی قەڵابەگی»دا دەرسی‌دەگوتەوە و ڕیازی و هەیئەتی زۆر باش دەزانی.

بیرەوەرییەکانی نووسەر.

## جەلی‌زادەی کۆیی

مەلا موحەممەد ئەفەندی، کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی، زانایەکی تۆژەر لە بنەماڵەی جەلی‌زادە، ساڵی ١٢٩٧ ک. م. لە شاری کۆیە هاتە دنیا و لە ژێر چاوەدێری بابیدا ڕاهات و خوێندی. هێشتا هەژدە ساڵان بوو، بە هۆی زیرەکی و لێهاتوویی سرشتی و حەولدانی بێ‌وچانەوە، هەموو خوێندنی باوی ئەو سەردەمانەی تەواو کرد و ئیجازەی وەرگرت و پێڕای خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە و نووسین، دەرس‌گوتنەوەشی دەسپێکرد.

مەلا موحەممەد، دوای کۆچی دوایی بابی (١٣٢٦ ک. م.)[١]، کەسناوی «رئیسُ‌العُلماء»ی پێ درا و ساڵی ١٣٣٩ بوو بە قازی کۆیە و پاشان چووە نێو کۆڕی دانەرانی دەستووری عیراقەوە. دوای ئەوەش چەند جاران وەکوو نوێنەر، کرایە ئەندامی پارلەمانی بەغدا؛ بەڵام ساڵی ١٣٤٧ ک. م. لە هەموو کارێکی ڕەسمی دەستی‌کێشا و کات و ساتی خۆی بۆ تۆژینەوە و دەرس‌گوتن، تەرخان کرد.

موحەممەد ئەفەندی مرۆیەکی شاعیر و وێژەوان بووە و زۆربەی شیعرەکانی ئامۆژگاری و بانگەوازە بۆ پێکەوبوون و لەبەرچاو ڕاگرتنی مافی هەموانی.

**لە کتێبەکانی:**

١. *المعقول فی علم الاصول*

٢. *القائد فی علم العقاید*

٣. *أبهی المآرب فی إثبات الواجب*

٤. *کَشْفُ الأَستارُ فی مَسْألَة الاخْتیار*

٥. *الإله و الطَّبیعَةُ و العَقْلُ و النُّبوَّةُ و المعْجزاتُ و الکرامات*

٦. *اَلْمَشاهد عَلَی طِراز المَواقِف وَ اَلْمقاصد*

---

١. *الاعلام* ساڵی ١٢٩٨ ک. م. نووسیوە.

٧. *اَلْحَدْسُ سُلَّمُ الاِرْتِقاء*

٨. *غايتى و أملى فى عِلْمى و عَمَلى*

٩. نامیلکەی «*حقیقت اسلام*»

١٠. نامیلکەی «*حقیقت ایمان*»

١١. *خرابُ العالَم*

١٢. عەقیدەی ئیسلامی بە زمانی کوردی

١٣. دیوانی شیعر ی کوردی

١٤. داستانی کوردی «خەون و کەرامەت»

١٥. فڕیفڕی، قەلفڕی

مامۆستا هەروەها هێندێک کتێبی لە ئوسوول و مەنتیق و حیکمەت و ئەدەبیاتدا نووسیوە کە زۆربەیان لەچاپ دەرچووە.

ئەم زانا هێژایە، ساڵی ١٣٦٢ ک. م. لە شاری کۆیە، گیانی پاکی بە خودای تاک ئەسپارد.

*عُلَماونا فى خدمة العلم و الدّين*، ل٥٣٤. *الاعلام*، زرکلی، ب٧، ل١٢٤.

## شێخ بابارەسوولی بەرزنجی

زانای پایەبەرز، شێخ بابارەسوول، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ سەمەد، کوڕی شێخ سلێمانی بەرزنجی، ساڵی ١٣٠٣ لە گوندی «بیدن»ی لای سلێمانی هاتۆتە دنیاوە. خوێندنی لە زێدی خۆی و هەڵەبجە و قزڵڕوبات و سلێمانی بووە و لە بیارە تەواوی کردووە و لای مەلا قادری مودەڕڕیسی بیارەیی، ئیجازەی وەرگرتووە. پاشان شێخ نەجمەدینی کەوکەبی عوسمانی تۆبەی داداوە و چۆتە نێو تەریقەتی نەقشبەندییەوە. تا ساڵی ١٣٣٧ ک. م. کە مورشیدەکەی کۆچی یەکجاری کردووە، لە سووچی خانەقای بیارەدا خەریکی سیر و سولووک بووە و جاروبارەش دەرسی گوتووە.

ساڵی ١٣٣٨ ک. م. مەلا قادریش دنیا بەجێدێڵێ و مورشیدی ئەو سەردەمەی بیارێ (شێخ عەلائەدین)، بۆ دەرس گوتنەوە لە مەدرەسەکەیدا، بانگی دەکا؛ بەڵام دوو ساڵی زیاتر نامێنێتەوە و چەند ساڵێک دەبێتە مامۆستای قوتابخانەی «سۆڵە» و چەند شوێنی تر و سەرەنجام ساڵی ١٣٤٦ ئەڕواتە مەدرەسەی «عەبابەیلێ» و تا دواکاتی ژیان (١٣٦٢ ک. م.)، لەوێ ئەرکی دینی و زانستیی خۆی جێبەجێ دەکا و بەهرەی بە کەسانێکی زۆر دەگا.

شێخ بابارەسوول زانایەکی هەڵکەوتە و گۆشەنشینێکی خاوەن حاڵ و جەزبە بووە و بە فارسی و جار ـ جار کوردیش شیعری گوتووە و نازناوی «مەلوول» و «بابا»ی هەڵبژاردووە. وەک مەلا کەریم دەفەرموێ، هێندێک

نووسراوەشی لێ بەجێ ماوە.

**ئەوا دوو غەزەلی کوردی و فارسی بابا**:

ناتیقەی حاڵی وەتەن، دەرسی وەتەن تەقریر ئـەکا
کاتبی دڵ حەرفەکانی یەکبەیەک تـەحریر ئـەکا

گفتوگۆییێکی خوەش و پڕمەغزە دایم دێتە گـوێم
وا ئـــەزانم هــاتیفێکی غەیبییـــە تەفـــسیر ئـــەکا

پێم ئەڵێ بۆ غەم ئەخۆی، سوڵتانی سەیاسی وەتەن
هەر بە قانوونی مەحەببەت دوژمنی تەسخیر ئـەکا

عاقیبەت میعماری فیکری ئیتتفـاقی قـەومی کـورد
«دارُالإحسان»ی بیلادی کوردەکـان تـەعمیر ئـەکا

سیلـسیلەی کاکۆڵـی ئاڵـۆزاوی مـەحبووبی وەتـەن
وابزانـــە زووبـــەزوو وا عاشـــقی زەنجـــیر ئـــەکا

خزمەتی خاکی وەتەن، فەرزێکی عەینـە بـۆ هـەموو
داخڵی ئەم حوکمەیە، کێ فـەرقی جـوان و پـیر ئـەکا

زوڵمەتی جەهل ئەرچی زۆری سەندووە باکت نـەبێ
نـــووری عیلمـــی عالمێکـــە، عالـــەمێ تـــەنویر ئـــەکا

هەرکەسێ فیکری مـەزاری بـاوک و بـاپیری هـەبێ
بۆ بەقای ئیعزازی خاکی خـۆی چلـۆن تەقسیر ئـەکا؟

پیـاوی دانـا دائیمـەن نـەفعی عومـوومی مەتـڵەبە
جاهیلی ناپیـاوە هـەر بـۆ نـەفعی خـۆی تـەدبیر ئـەکا

لووتی وەرچەرخان لە شووشەی پڕ گوڵاوی شـیعری مـن
مونیکری ئاساری کوردی بۆنی پیـاز و سـیر ئـەکا

کەعبە کەچنابێ بە کوردی بەحـسی کوردوسـتان ئەکـەم
پێ بڵێن واعیز بە تورکی بۆچی من تـەکفیر ئـەکا

* * *

مـن گـوی بلادیـدەی چوگـان فـراقم
حیـــران و سراســـیمەی میـــدان فـــراقم

از حـال مـن شـیفته جانـا خبـرت نیـست
عهدیـست کـه در گوشـەی زنـدان فـراقم

تـو فـارغ و آسـوده و سرمـست وصـالی
مـــن ســـاکن ویرانـــەی کنعـــان فـــراقم

تـو سـاقی بـزم حـضر یـار، ولـی مـن
دُردی کـــش میخانـــەی هجـــران فـــراقم

از یوسـف خـود دورم و محـروم عزیـزا
مـــاتمزدەی کلبـــەی احـــزان فـــراقم

عمری است گرفتارم و رنجـور و پریـشان
ســـودازده و بـــی ســـر و ســـامان فـــراقم

پروانـەی بـیبـال و پـرم از اثـر هجـر
شبهاسـت کـه مـن شـمع شبـستان فـراقم

مینـالم و ایـن سـوز نهـان مـی کـنم اظهـار
دل ســـوختەی آتـــش ســـوزان فـــراقم

از نـام و نـشانم خبـر ار هـست وگـر نیـست
«بابـــا»ی جفادیـــدەی حرمـــان فـــراقم

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الـدّین*، ل١١٦ تـا ١٢٠. *یادی مەردان*، ب٢، ل ٥٩١ تا ٦١٧.

## غەیاسەدینی نەقشبەندی

کوڕی گەورەی شـێخ بەهائـەدینی ئامێـدی و لـەدایـکبـووی ساڵـی ١٣٠٧ ک. م. هـا لـە ڕیـزی پیـاوە

ناسراوەکانی بواری زانیاری و ڕامیاری لە کوردستاندا کە شارەزای زۆربەی زانستەکان بووە و ئیجازەی لە دەستی مامۆستای بەناوبانگ، شوکری ئەفەندی، موفتی ئامێدی ساندووە.

غەیاسەدین شاعیر و وێژەوانیش بووە و بایەخێکی زۆری بە زمان و نەتەوەی خۆی داوە و چەند دەورە لە پارلەمانی عیراقدا، لە لایەن خەڵکی باکوورەوە، وەک نوێنەر هەڵبژێردراوە و هەر لەو سەردەمەدا، ساڵی ١٣٦٣ ک. م. لە بەغدا، ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

*الاکراد فی بهدینان*، ل ٢١١.

## فایق بێکەس

کوڕی عەبدوڵلا بەگ، خەڵکی سلێمانی، ساڵی ١٣٢٠ ک. م. هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکرد و لە یانەی زانستی (دارُالعُلوُم) بەغداوە سەری دەرهێنا و عەرەبییەکی چاک فێر بوو؛ هێندێکیش لە ئینگلیسیدا چاوی کرایەوە. ئەوجار دامەزرا و لە چەند شوێنانی وەکوو سلێمانی و «حیللە» دەرسی گوتەوە.

بێکەس هەر بە منداڵی هەتیو کەوتووە و دایک و باوکی مردووە. بۆخۆشی هاوڵەی لێ کەوتووە و چاوێکی کوێر کردووە. دواجاریش کە پێگەیشتووە، لەبەر ڕاستبێژی و کۆنەکردنەوە لە کەس و هەروەها هێندێک لاقەیدی، زۆرێک گیر و گرفت و چەوتی و چەڵەمەی تووش هاتووە و بەو بۆنەوە کە مرۆیەکی گوێ‌نەدەر و سەرپەتی بووە، لە کەس و کاری خۆیشی خەیر و خۆشییەکی نەدیوە و ناچار پشتی لە هەموان کردووە و وێدەچێ بەو بۆنەوە نازناوی «بێکەس»ی بۆ خۆی داناوە.

شیعری بێکەس زۆرتر ڕەخنەیە لە درۆ و دووڕەنگی، ئاماژەیە بە کەم و کووڕی و گەندەڵی کۆمەڵگا و باسی نیشتمانی. ئەم شاعیرە هەموو شێوە شیعرێکی هۆنیوەتەوە و لەم بارەوە، خاوەن زەوق و لێهاتوویەکی باش بووە.

بێکەس ساڵی ١٣٦٣ ک. م. لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و هەر لەو شارەیان ناشتووە.

**چەند شیعری فایق بێکەس**:

ئەی مانگ! من و تۆ هەر دوو هاودەردین    هەر دوو گرفتار یەک ئاهی سەردین
تۆ وێڵ و ڕەنگ‌زەرد بە ئاسمانەوە    منیش دەربەدەر بە شارانەوە
دەخیلتم ئەی مانگ! قیبلەی دڵداران    دەرمانی دەردی دڵی بیماران
شەوێکە ئەمشەو بگەرە فریام    بێ یار و هاودەم عاجز و تەنیام
دڵزار و بێزار خەیلێ غەمگینم    گیرۆدەی داوی لەیل شیرینم
دڵبەندی عەشقی ئەو بەڵەک‌چاوەم    شێت و شەیدای ئەو ئەگریجە خاوەم
لەو ساوە ئەوم کەوتوتە خەیاڵ    گریانە پێشەم، بوومە کۆی زوخاڵ
ئەی مانگ! تۆ شوعلەی عەشقی پیرۆزی    تۆ نەشئەبەخشی دڵی بەسۆزی

قەســەمت ئــەدەم بــە عەشــق و جــوانی ‌ بـــە نەســـیمەکەی بـــەری بـــەیانی
بەســەرهاتی خــۆت بــۆ مــن بــەیان‌کــە ‌ دەردی گـــرانم نـــەختێ ئاســـان‌کـــە
دوچـــاری چـــی بـــووی وا پەشـــێواوی؟ ‌ لەبـــەرچی پەســـت و مـــات و دامـــاوی؟
پــێم بــڵێ توخــوا چــەن جوانانــت دی؟ ‌ چەن جووتە یـاری دەس‌لـەملانـت دی؟
چـــەن کـــۆڕی بـــەزمی عاشـــقانت دی؟ ‌ چەن قەوم و میللەت، چەن شـارانت دی؟
چـــەن کفـــنی ئاڵـــی شـــەهیدانت دی؟ ‌ چـــەن بـــێ‌کەســـانی پەرێـــشانت دی؟
چـــەن دەربـــەدەر و مـــاڵ‌وێرانــت دی؟ ‌ چـــەن چـاوی ســووری بــەگریانت دی؟
ئەی مانگ! ئەوندە سەیری دونیـات کـرد ‌ ســـەیری نفـــاق و زوڵـــم و ڕیـــات کـــرد
تـــاوا بـــەم ڕەنگـــە کـــاری لـــێ‌کـــردی ‌ ڕەنـــگ و شـــوعووری بـــەجارێ بـــردی

* * *

ئەی وەتەن! مەفتوونی تۆم و شێوەتم بـیر کەوتـەوە
وەختی بەدبەختی و ئەسارەت پێ بە بەندی کۆتـەوە
من لە زیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم، وا تـێ‌نەگـەی
حەپس و تێهەڵدان و زللەت تۆی لە بـیر بردۆتـەوە
بـەو خوایـەی بـێ‌شـەریک و لامـەکان و واحیـدە
عـەشـقی تـۆ جـۆرێ لـە دڵـما ئـاگری کردۆتـەوە
ئـاگرێکی وا هــەزار ســاڵ ئـاوی بڕژێنیتــە ســەر
قەت گـڕ و کـڵپە و بڵێـسەی تـا ئەبـەد نەکوژێتـەوە
باسی مەحزوونی و کەساسی خوەت نەکەی تۆخوا وەتەن
چونکــە بــەو باســە بــرین و زامەکــەم ئەکولێتــەوە
ماتـەمینی تابەکـەی؟ دەی پێکەنـە و سـەر هەڵـبڕە
موفتەخــەر بــە، شــوهرەتت وا عالــەمی گرتۆتــەوە
نەگبــەتی لاچــوو، ســەعادەت بۆتــە پــشتیوانی تــۆ
کەوکەبی بەخت و فریـشتەت بـەرزە ئەدرەوشـێنەوە
گـەرچی بەینێکـە زەلیـل و دیلـی دەسـتی زاڵـمی
نەوبــەتی شــادیتە، ئــەمجا ناحــەزت لێــکبێتــەوە
بەسیە تەعنـەم لـێ مـەدە هـەر ڕۆڵـەکەی جـارانتم
هێندە حیلمت بێ هەتاکوو دەست و پێم ئەکرێتـەوە

شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گـەر خـودا دەسـتم بـدا

دوشمنت پەتکەم، وەکوو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە

**پرسیار و وەرام:**

تۆ چیت؟ مـن گـوردم، نەتـەوەی کـوردم — خـۆ ترسـنۆک نی؟ نەخـەیر، نەبـەردم

چی تۆی زەبوون کرد؟ دوو دڵی و نیفـاق — چـون ڕزگـار ئـەبی؟ هـەر بـە ئیتفـاق

بـڵێ چیـت دەوێ؟ بـەرزی وەتـەنم — بـەخۆڕایی؟ نـا! بـە گیـان و تـەنم

کـوا چـەکت چییـە؟ سـەودای وڵاتم — ئـەی پـشتیوانت؟ عـەزم و سـوباتم

چیـت لـەبارایـە؟ خـۆ بـەختکـردن — بـۆچی؟ لـە ڕێگـەی میللـەتا مـردن

ڕاستت پـێ بـڵێم؟ فـەرموو، گـوێم لێتـە — بەواتـەم ئەکـەی؟ سـەرم لەڕێتـە

بە ڕاستی و پـاکی هـەوڵ و تـێکۆشین — لـە کـورتی و کینـە و درۆ چاوپۆشـین

ئەمانـەت نـەبێ، کـارت زۆر لەقـە — بەشـت هەمیـشە سـۆکیە و شـەقە

* * *

دڵـێ لـە خۆیـا دایم تـەڕ نـەبێ — سەرخۆشـی بـادەی ڕووی دڵـبەر نـەبێ

مـەفتوونی بـاڵای قـەد عەرعـەر نـەبێ — لـە ڕاز دڵـداری باخەبـەر نـەبێ

سـا، خـوا ئـەو دڵـە دایم پەسـتی کـەی

دڵـێ هێلانـەی عەشـقی یـار نـەبێ — بـە تـیری نـازی برینـدار نـەبێ

کوشـتەی ئـەو دیـدەی پـڕخومار نـەبێ — بـە جـامی شـەراب نەشـەبار نـەبێ

سـا، خـوا ئـەو دڵـە دایم پەسـتی کـەی

شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، ڕەفیق حیلمی.

## ساڵح زەکیبەگی ساحیبقەران

کوڕی عوسمان بەگ، کوڕی داود بەگ، کوڕی عومەر بەگ، کوڕی ئەحمـەد بـەگی گـەورە، لـە بنەماڵـەی بەناوبانگی ساحیبقەران و پیاوە ویژەوان و ڕامیارەکانی کوردستانە کە چەند مەقامی بـەرزی لـە عیراقـدا بـە دەستەوە بووە و زۆر خزمەتی بەنرخی سیاسی و ئەدەبی بە کورد و کوردستان کردووە.

ساڵح زەکی بەگ کتێبێکی لەمەڕ بارودۆخی مێژوویی و جوگرافیایی کوردستانەوە، بە کوردی و عـەرەبی و ترکی، لە ساڵی ١٣٤٤ ک. م. بڵاو کردۆتەوە و دوایی ساڵی ١٣٦٣ ک. م. سەری یەکجاری ناوەتەوە.

گۆڤاری گەلاوێژ.

## مەلا مەحموودی جوانڕۆیی

ساڵی ١٣٠٠ ک. م. هاتۆتە دنیا و دوای بەسەرچوونی سەردەمی منداڵی، خوێندنی دەسپێکردووە و لە زۆر قوتابخانەی کوردستاندا خوێندوویە و سەرەنجام ساڵی ١٣٣٠ ک. م. لە شاری کەرکووک، لای عەللامە عەلی حیکمەت ئەفەندی ئیجازەی وەرگرتووە. ئەوجار گەڕاوەتەوە ڕۆژهەڵات و لە گوندی «بالک»ی لای مەریوان، ماوەی ١١ ساڵ دەرسی گوتۆتەوە و لە پاش ئەوە، چۆن بووە، لە بالک باری کردووە و چۆتە گوندی «دەرەتفێ» و تا دواکاتی ژیان (١٣٦٣ ک. م.) لەوێ ماوەتەوە و خزمەتی کردووە.

مەلا مەحموود مرۆیەکی زانا، نووسەر، لە زبان و وێژەی فارسیدا سەردەرچوو، خۆشنووس، شارەزای ڕیازی و ئەستێرەناسی بووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٥٦٣.

## عەبدوڵڵا بەگی هەورامی

کوڕی موحەممەد شەفیع بەگ، لە خانانی عەشرەتی حەسەن‌سانی هەورامانی تەخت، شاعیرێکی باش بووە و شیعری کوردی هەورامی، جوان گوتووە.

ساڵی ١٣٥٠ ک. م. (١٩٣١ ز.) بە فەرمانی ڕەزا شا، زۆرێک لە کەڵەپیاوانی کوردستان و گەورەی هۆزە کوردەکان، گیران و لە شارانی تاران و ئەسفەهان و دامغان و سمنان و ... لە بەندیخانە خران. عەبدوڵڵا بەگیش یەک لەو بەندییانە بوو کە لە زیندانی شارەوانی ئەسفەهان، ماوەی دەساڵان توند کرابوو. زۆربەی شیعرەکانی لەو ساڵانەدا داناوە؛ یەکیان:

یاران، هامسەران! ئیمشەو خاوێ دیم — جە زیندان سەخت عەجەو خاوێ دیم
ئازادی وەتەن، هەوارانم دیم — ئێلاخانی چۆڵ، کۆساڵانم دیم
وەنەوشەی وەشبۆ چنوور هەردان — ئامانە خاوم، پەی دەوای دەردان
چەنی هامسەران نشستە بیم شاد — بە کەیف و ئاهەنگ غەم مەدام وە باد
گۆش وە سەدای ساز، چەم وە نگاوە — جە قاوەخانەی کەماڵاواوە
لێو بە پیاڵەی عەقێق ڕەنگەوە — گاهێ پڕ بە شەوق، گا بە خەندەوە
جەی عەیش و نشات، جەی خەوی بەتاڵ — زیندانم ئەسڵەن نامان وە خەیاڵ
هەر پاسەم زانان، وێم شەهریارم — چەرخی کەجکردار نەدان ئازارم
پاسەم مەزانا شای خاوەن بەختم — نەزانام مەزڵووم زیندان سەختم

لە کۆتاییدا ئێژێ:

یارەب! هەرکەسێ ئەوڕۆش نەهات بۆ — زام زەدەی تەقدیر جە ڕۆوی بسات بۆ

| | |
|---|---|
| کەشــتی نگیــشنش هــەر ســەرنگوونەن | نــە گێجــاوی گــێج ڕوودی جەیحوونــەن |
| مـۆرەی ئیقبالــش دوو شــەش نــاوەردەن | چــەنی بەدبــەختی مامەڵــەش کــەردەن |
| خـــــورد و خـــــوەراکش ژاراوی زەردەن | خــاوی شــیرینش هــەر ئــێش و دەردەن |
| یارەب! بـە حاجـەت ڕەسـوولی حـەبیب | خـــاکی غـــەریبیم نەکـــەری نەســـیب |

عەبدوڵڵا بەگ ساڵی ١٣٦٣ ک. م. لە تەمەنی ٦٧ ساڵاندا، گیانی لە زیندانی لەشی دەرچووە.

*پیرشالیار*، ل ٥٧- ٥٩.

## سەید قیداری هاشمی

ناســراو بــە «ســیدُالدَّوله»، کــوڕی ســەید عەبــدولقادر، کــوڕی ســەید ڕەســوول، لــە بنەماڵــەی ســەیدە ناودارەکانی«سۆڵە»ی سەر بە ساداتی بەرزنجەیــە کــە ساڵــی١٣٠٠ ک. م. لــە گونـدی «دەوڵــەتاوا»ی لای ڕوانسەر هاتۆتە دنیا و ١٣٦٣، هەر لەوێ لە دنیا چووە.

کەسانی ئەم بنەماڵە، ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، سەرباشقەی زانـست و عیرفـان و ڕێبەری تەریقەتی قادری بوون.

«سیدُالدَّوله» پیاوێکی باڵابەرز و پێکەوتوو، شاعیر و وێژەوان، دەمپـاراو و قـسەجـوان بـووە و بـۆ وردبـینی وتاربێژی، هاوتای کەمتر هەڵکەوتووە. بێژگــە سەرقاڵــی ئیرشــاد، لــە کاروبـاری کۆمەڵایــەتی و ڕامیاریــشدا سەریدەرچووە و تا پێی کرابێ، بەدەم خەڵکەوە بووە و بۆ خزمەتیان نوکوولی نەکردووە.

ساڵــی ١٣١٠ ک. هـ. )١٩٣١ ز)، لەبــەر ناســراوی و وەج و ڕێــزی لــە لای خەڵــک، لەگــەڵ ســەرۆکی عەشیرەتاندا گیراوە و خراوەتە زیندانی شارەوانی ئەسفەهان و تا شۆرشی خەرمانانی ١٣٢٠ (١٩٤١ ز.)، لـە بەندا سەریکردووە.

سەید پاش خەلەستن لە بەند و گەڕانەوە بۆ کوردستان، دوورەپەرێزی گرتۆتەبەر و تـا ئـاخری ژیـان، لـە گوندی «دەوڵەتاوا»، بە تەکیەداری و بەڕێوەبردنی میوانان و ڕێبوارانەوە ڕایبواردووە.

شاعیری توانا، سەید تاهیری سەیدزادەی هاشمی ـکە ئێستا ماڵی لە کرماشـانە ــ کـوڕی ئـەو خـوا لـێ خۆشبووەیە.

ئەمەش قەسیدەیەکی ڕەحمەتی «سیدُالدَّوله» کە لە زینـدانی ئەسـفەهان، بـۆ پەسـن و دەسـتەوداوێنی پێغەمبەر (د) دایناوە:

| | |
|---|---|
| کی توان وصف جمال تو نمودن، کی بەجـا؟ | حسن روی تو کجـا، فهـم مـن اخـرس کجـا |
| وصف آن مو چون توانم، ایـزدش «واللیـل» گفـت | مدح آن رو کی بدانم، گفته ایزد «والـضُّحی» |
| تـو بـە زیبـایی و خـوبی فـرد و فخـر عـالمی | گر کنم با هر چە تشبیه تو خبط اسـت و خطـا |

بدر بر بام فلک دعوی همتایی نمود | غیرت سرپنجه‌ی حسن تو بنمودش دو تا

یافت گر تشریف نعل سم یکرانت هلال | تا قیامت نور از آن می کرد خورشید استضا

گر نبودی نور تو در جسم و جان بوالبشر | چون فرشته سجده می کردند او را در سما؟

«رحمةللعالمینی» و «شفیعُ المُذنبین» | جز در امید تو نبود محل التجا

عاصی گم کرده راه و مذنب برگشته بخت | دارد امید شفاعت از تو و عفو از خدا

یا «رسول‌الله»! غریبم، بی کس و رنجور و پیر | دردمند و زار و زندانی، پریشان و گدا

رنج من رنجی است آن را کس نمی‌داند علاج | درد من دردی است کانرا کس نمی‌فهمد دوا

نی ز تن خارج شود تب لحظه‌ای در روز و شب | نی ز دل غم می‌شود کم ذره‌ای صبح و مَسا

نی ز سوزش سینه‌ام فارغ شود یک‌ثانیه | نی ز ریزش دیده‌ام از اشک و خون گردد رها

نی ز آه آتشین ساکت نشینم لمحه‌ای | نی پذیرد محنت و رنجوری من انتها

در پریشانی چو زلف مهوشان آشفته‌ام | در سیه‌روزی چو بخت عاشقان بی‌نوا

هر قدر زشت و تبهکار و پلیدم، سیدی! | عترتم، عترت ندارد مَلجأی جز «مصطفی»

حق کریم‌العفو باشد، تو شفیع مذنبین | «قَیْدر» بدبخت تا کی باد در قید بلا؟

باد صلوات و سلام از ذُوالجَلال مُسْتعان | بر تو و بر آل اطهار تو تا روز جزا

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## ناری

مەلا موحەممەد، مەشهوور بە «کاکە حەمە»، نازناو «ناری»، کوڕی مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلا ڕەحمان، ساڵی ١٢٩١ ک. م. لە گوندی «کێکن»ی سەر بە ناوچەی «شلێر و ناوخوان» هاتە دنیا. کە هێندێک بە خۆدا هات و بابی وانە سەرەتاییەکانی فێر کرد، بۆ خوێندنی زیاتر، بە زۆرێک لە قوتابخانەکانی سێ پارچەی کوردستاندا گەڕا و چەند شار و شارۆچکەی وەکوو سنە و سلێمانی و بانە و مەهاباد و وان و هەولێری بینی و سەرەنجام لە ڕواندز گەیشتە خزمەتی عەللامە ئەسعەدی خێلانی و پاش ماوەیەک خوێندن و بەهرە بردن، ئیجازەی لە دەستی وەرگرت و گەڕاوە مەریوان و لە زێدی خۆی (کێکن)، جێی بابی ـ کە عەمری خوای کردبوو ـ گرتەوە و پاش سێ ساڵ، ژنیشی خواست.

ساڵی١٣٢٥ ک. م. لەسەر داخوازی حوسەین بەگ، خاوەنی گوندی «بێڵوو»ی مەریوان، بە ماڵەوە چوو بۆ ئەوێ و تا ئاخر لەوێ مایەوە و دەرسی گوتەوە.

ناری وێژەوانێکی هێژا و شاعیرێکی توانایە کە شیعری لەگەڵ ناسکی و مانای ورد و تازەدا، سەرانسەر بە وردەکاری شاعیرانەوە خەملاوە و لەوپەڕی جوانی و ڕەوانیدایە. بۆخۆی سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی و لە

مریدانی شێخ حوسامەدین بووە و لەگەڵ هەژاری و نەداریدا، بەرزەخۆیی و بێنیازی گرتۆتەبەر و بە ئاکاری پەسند و ڕێوڕەوشتی ڕندەوە ژیاوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٦٣ ک. م. لە بێلوو، دەستی لە ژیانی دنیا بەرداوە.

**چەند شیعری ناری**:

نەفەس سەمتوورە، سینەم ساز و دڵ نەی — حکایەتخوانی دووری تۆن پەیاپەی
بە زیکری تۆ وەکوو سۆفی هەمیشە — مەقاماتی «فنافی‌اللّه» ئەکەم تەی
چ شیرینە لەگەڵ شەهدی حوزوورا — لە تۆ خەندە و لە من ئاوازی ئۆخەی
ئەگەر سایەی سەری تۆ بێ بە تاجم — چ موحتاجم بە تاج و ئەفسەری کەی
غەزەل قەت نابڕێ هەرگیز بە باڵات — ئەزانم بۆ کەوا مایل بە تاقەی
هەواپەیمایی ئەوجی فیراقت — بە تەییارەی سەبووری کەی دەبێ تەی؟
لە مەیخانەی خەیاڵی شەوقی تۆدا — بە نەشئەی یادی تۆ دڵ مەستە بێمەی
لە وشکی وا نەمامی باخی نەزمم — بە پووشی ڕیشی سۆفی بوو شکۆفەی
بەسەرچوو دوور لە تۆ باخی خەیاڵات — نە بوونی ما نە بۆنی ما نە غونچەی

* * *

چاوەکەم! بۆیێ بە دایم کار و پیشەم زارییە — حاکمی چاوت لەگەڵ من مایلی غەددارییە
شۆڕش و ناڵینی کەس بێوەجهـ و بێعیللەت نییە — ئاهی من فەریادی بولبوڵ، ئێشی بێغەمخوارییە
من هەر ئەو ڕۆژە دەسم شۆری لە ڕۆحی خوەم کە دیم — حەزرەتی خونخواری ئەبرۆت مەشرەبی خونخوارییە
گەر دەپرسی بۆچی بێ نەشئە و مەلوول و عاجزی؟ — ڕوومەتی زەردم عەزیزم! شاهیدی بێیارییە
کەم بە خەندە بێبەلام و حەیفە تانەم لێمەدە — لێمگەڕێ تۆ بی و خوا ئەم جارە دەردم کارییە
دڵ لە شامی پەرچەمی ڕووتا بە دایم بێخەوە — چونکە کێشکچی بە شەودا عادەتی بێدارییە
حیکمەتی پڕمەسئەلەی کوڵمت لە بۆ کێ حەل دەبێ — هەر سەحیفە سەد ئیشارە و ڕەمزی تێدا جارییە
خاڵی ڕوخسارت «هدایەت»بەخشە شەرحی زوڵفەکەت — «قازی»ئاسا حاشیەی ئەگریجەکانت «لاری»یە
ڕووت وەکوو ئاتەش، موژەت وەک شیشە، ئەبرۆت قیمەکێش — میروەحەت زولف و کەبابت جەرگی پارەی «ناری»یە

* * *

موددەتێکە من گورفتارم بە دەس سەوداتەوە — بووم بە داوی چینی زولف و پەرچەمی تاتاتەوە
گەر دەپرسی حاڵی پەروانەی دڵم دوور بێ لە ڕووت — وا لە سۆزشدا لە سایەی شەو چرای گۆناتەوە
مێشی ڕۆحم نافڕێ بەس باوەشێنی کە بە ناز — چونکە پابەندە بە شەهدی ڕوومەتی زیباتەوە
مەنعی قوولابی موژەت ناکەم لە ڕاکێشانی دڵ — چون ئەسیری زولفی خاوی خۆیەتی، ئەیباتەوە

وا سـەرم دانـا بـە عـەزمی بـەردەبازی ڕێگەکـەت
مەرهەمی دەردی سەری مـن وا بـە گـەردی پاتـەوە
ئاهی چـاوت موڵـکی سـەبر و تاقـەتی بـردم بـە زۆر
موسحەفی ڕووی تۆ بە گژیـا چـیٚ ئەگـەر نەمداتـەوە
چاوی خوێنخواری بە خوێنم فێرە وەک لێـوی بـە مـەی
لێگەڕێن ئێوە و خودا، ئەو شـۆخە بـا بیخواتـەوە
شـین و واوەیلایـە، ئاسـاری قیامـەت هەڵدەسـیٚ
گوڵبەدەن ئەمڕۆ ڕووە و مەشریق ئەگـەر لار کاتـەوە
لەبشەکەر! فەرموو بە زوڵفت باوەشـێنی بـەسبکـا
میـشی ڕۆحـم گـەر بنیـشێتەو بـە قەنـدی چاتـەوە
خەتتی دەرسی عیشقی «ناری» وەک ڕوقوومی خاڵـەکەت
وا بە لەوحی گـەردەنی بـیٚگـەردی وەک میناتـەوە

* * *

سوورەتی «یس» کە وەسفی حـەزرەتی ئـەولا ئـەکا
ئەهلی دڵ مایل بە جیلوەی سـوورەتی «طـه» ئـەکا
ئاسمان وەک موشتەری هـەردەم بـە میـزانی وەفـا
کەسبی هەر شاهی بە یـادی دەوڵـەتی ئەسـرا ئـەکا
گەر تەسەوور کا مەسیحی تەختی عەرشی ئەعزەمی
تا ئەبەد تەرمی بەیـانی ڕەفعـەتی عیـسا ئـەکـا
نووری عەشقی کەوتە سەر tووری دڵی مووسا مەگەر
وا لە سەر سینەی بە شەوقی دڵ یـەدی بـەیزا ئـەکا
خاکی بەر دەرگاهی قەسری گەر بەسەردا کا کەسـیٚ
تـا ئەبـەد نـەفرەت لـە تـاجی قەیـسەر و دارا ئـەکا
بۆ خەلیلان گـەر نەسـیمی گوڵـشەنی لوتفـت ببـیٚ
ناری نەمروودی بە سـەحنەی «جنّـةُالمـاوی» ئـەکا
تاقی کەسرا بۆ بە بەرقی نووری حوسنی شەق نەبیٚ؟
سەیلی حـوکمی نـاری فـارس زایـل و ڕیـسوا ئـەکا
نەرگـسی مەسـتی سـیاهت عـەینی «ما زاغ‌البـصر»
شەمعی بیٚسایەی وجوودت شـەرحی «کرَّمنـا» ئـەکا
ئادەمی خاکی، بەسەر زومرەی مەلەکـدا بـیٚ گومـان
تۆی سەبەب، نازش بـە ڕوتبـەی «عَلَّم‌الاسـما» ئـەکا
کاشفی «واللیل»ە توڕڕەی پەرچـەمی شـەبڕەنگی تـۆ
ئافتـابی تەلعـەتت تەفـسیری «والـضُّحی» ئـەکا
ئایەتی میعراجـی پایـەی قـابقەوسـەینت عەجـەب
وەسفی ئیعـزازت لـە تـەختی نـازی «أوأدنـی» ئـەکا
عەکسی ئـەلفی قامـەت و ئەبرووتـە گـەر «ن والقلـم»
سیدقی مەزموونی کەلامت کەشفی «ما أوحی» ئـەکا
بـا وجـوودی پەرتـەوی میهـری جـەمالی ئـەنوەرت
کیٚ خەیاڵی قەسری خولـد و سـایەیی تووبـا ئـەکا؟
سەلسەبیلی لوتفی تۆ بیٚشک لە عەرسەی مەحـشەرا
تەشنەلـەب فـارغ لـە بـادەی جـامی «أ عطَینـا» ئـەکا
چی لە دەوڵەت کا ئەسیری بەنـدی عەشـقی ئەحمـەدی
عەشقی مەحموودی بە عاشق کەسبی ئیستیغنا ئەکا
«ناریـا» وەسـفی جەماڵـی حـەزرەتی «خَیْـرُ البَـشَر»
کەی بە سەد دەفتەر هـەتا مەحـشەر بەشـەر ئینـشا ئـەکا

بۆ پەسنی شێخ حوسامەدینی نەقشبەندی گوتوویە:

بە مەولا گەر لـەمـەولا دڵ بـە قوربانـت نـەبیٚ نابـیٚ
بە دڵ گەر دڵ موتێع و بەنـدە فـەرمانت نـەبیٚ نابـیٚ
کەسیٚ مەقسوودی کەسبی دەوڵەتی قوربی حەقێقەت بـیٚ
غوڵامـیٚ بـۆ غوڵامـانی غوڵامانـت نـەبیٚ نابـیٚ

ڕەواجی نەقدی بێسککەی وجوودی کەس لە عالەمـدا
هـەتا مەقبوولـی سـەرڕافانی دەربانـت نـەبێ نابـێ
زوهووری نووری تووری مەعریفەت بۆ چاوی بێنوورم
بە تـۆزی سـورمەڕەنگی خـاکی دامانـت نـەبێ نابـێ
فەلەک مەشهوورە لا فی ئیقتیداری ڕەفعەتی ئـەمما
وجوودی بۆ سەریری سـەتحی ئـەیوانت نـەبێ نابـێ
سەرم سەمتوورە سینەم نەی، سوراحی دیدە ئەشکم مەی
مەزەی مەی با نەویدی نەی لە دیوانـت نـەبێ نابـێ
لە بۆ گوڵ شۆری بولبول شۆرشی تووتی لە بـۆ شـەککەر
لە شەوقی لەعلی لێوی شەککەرئەفشانت نـەبێ نابـێ
بە لالەی مەعریفەت تەعمیری قەتعەی «باغـەکۆن»ی دڵ
هەتا میعماری بەستی فەیزی ئیحـسانت نـەبێ نابـێ
لە ڕۆژی کەشمەکەشدا «ناریا» هـەرگیز نـەجاتی دڵ
«حسام‌الدین» کـەفیلی بـاری عیـسیانت نـەبێ نابـێ

یەک لە کوڕانی ناری، لەو کاتە خەریکی خوێندن دەبێ، نامەیەک بـۆ بـابی دەنووسـێ و لێـی داوا دەکـا چەند شیعرێک لە شیعرەکانی خۆی بۆ بنێرێ. ناری بەم غەزەلە جوابی نامەکەی دەداتەوە:

تالب کە هەموو لەحزە خەریداری غەزەڵ بـێ
زەحمەت، بە خودا مەیلی لەسـەر عـیلم و عەمـەل بـێ
تالـب ئـەوەیـە، تـالبی دیـوانی خـودا بـێ
تالب ئەوەیـە غـەرقی خـەیالاتی ئـەزەل بـێ
فەرزەندی مەلا، ڕۆڵە! ئەبێ سەرفی حـەیاتی
بۆ دیققەتی «بیضاوی» و تەفسیری «جَمَل» بـێ
بێجیلوەیە، تەسبیحی کـەف و جەزبـەیی سـۆفی
تا فیکری مەی و دەنگی نەی و سازی ئەمەل بـێ
گەر شـوربی دەوا، عاقبـەتی نـەفعی نـەبـێ هـیچ
لای خەستە وەکوو زەهرە، ئەگەر عـەینی عەسـەل بـێ
ئەفسووسە ببـێ مـورغی هومـا فـەرعی بـە قـالاو
زۆر موشکیلە گەر بازی سپی، فەرعی بە قـەل بـێ
گـەر دووری، ئـەتۆ! وارسـی ئـادابی پـدەر بـە
نەزدیکـە پـدەر یـار و هـەمئاغۆشـی ئەجـەل بـێ

ئەمەش نموونەیەک لە پەخشانی ناری کە بە شێوازی «بحر طویل»ی فارسی دایناوە و بۆ شـێخ باباعـەلی، کوڕی شێخ مەحموودی نەمری نووسیوە؛ کە لەو کاتە لە قاهیرە خوێندوویە:

«ئەی قیبلەیی ئەربابی وەفا! شەمعی شەبستانی سەفا! ڕەونەقی دیـوانی ئـەدیبانی لـەبیبانی دەبـستانی هونەرپەروەر و ئەهلی عورەفا! تاجی وجووهی شورەفا! سەدری عوموومی نوقەبا! فەخری جـەمیعی نوجـەبا! لالەیی گوڵزاری عەلی! گوڵبونی باغ و چەمـەنی تـاقمی ئـەقتاب و وەلی! کـانی گوهـەر! نـووری بەسـەر!

ئەفسەری سەر! کەوکەبی فەرخوندەسیەر! تاکوو لەسەر دەورەیی ئەم چەرخە ببێت و بگەڕێ شەمس و قەمەر! جیسمی ڕەئووفت بە ئەلەم عاجز و ئەفسوردە نەبێ؛ زاتی لەتیفت بە هەم و میحنەت و غەم، هەمدەم و پەژموردە نەبێ. بۆ منی بێبەرگ و نەوا، یەعنێ بە قانوونی وەفا، ویردی زەبانم ئەمەیە، زیکری جەنانم ئەمەیە: مەزهەری ئەلتافی خودا بی؛ لە حەوادیس بەری و بێغەم و بێدەرد و بەلا بی؛ لە هەموو مەحفیل و مەجلیس، فەرەحئەنگیزی دڵی ئەهلی دڵ و عوقدەگوشا بی. بە دڵ ئاسوودە لە ناز و لە گریشمە و نەزەری دڵبەری شیرین کەمەر و سیمبەر و جیلوەگەر و شۆخ و زوڵەیخا سیفەتی میسری و تورکانی خەتا بی. بە خەتا پەنجەیی تەرسابەچە یا موغبەچەیێ ـ وەک جگەری من ـ بە دەمی، جامەیی تۆ پارە نەکا؛ تۆ بە غوڵامی قەدی وەک عەرعەر و دوو نەرگسی جادووگەر و فەتتان و جەفاپێشە و خوونخوارە نەکا. بینە سەر بەحسی گلە و عیللەتی بێمەرحەمەتی. یەعنێ دەلیلم ئەمەیە: شێوە خەتی ئەحسەنی تۆ، نیسبەتی پیراهەنی تۆ، مەتڵەبی عوششاقە نەبوو؛ گەنجی دڵی یارە نەبوو؛ ئافەتی ئەغیارە نەبوو؛ کونجی هەواخاهە نەبوو؛ ڕەنجشی بەدخاهە نەبوو. مەخفی و پوشیدە نەبێ، چاکە لە ڕووتا کە ئەگەر ڕووتە وە یا تاقی دوو ئەبرووتە، وەکوو کەعبە وەهایە. بە سەری تۆ، دڵەکەی من بە مەسەل قیبلەنمایە؛ لە هەموو بەخشش و جوودی قەڵەمت قانع و ڕازی بە سلاوێک و دوعایە.»

*مێژووی ئەدەبی کوردی*، ل٤٥٥. چەند جونگی دەسنووس.

## مەعرووفی ڕەسسافی

کوڕی عەبدولغەنی، کوڕی مەحموود، لە هۆزی کوردی جەبباری باشووری کەرکووک، ساڵی ١٢٩٤ ک. م. لە بەغدا هاتە دنیا. هێشتا منداڵ بوو، بابی عەمری خوای کرد و ئەوجار دایکی گرتیە ژێر باڵی خۆی و بە پایەوە دانیشت و بۆ ڕاهێنانی، ئەوی شیاو بوو کردی.

مەعرووف ماوەیەک لە مەکتەبی «رصّافە»ی بەغدا و سەرەتێک لە قوتابخانەی «عَسكريّە» خوێندی. پاشان لای مەحموود شوکری ئالووسی ـ کە لە زانا هەرەگەورەکانی ئەو سەردەمەی بەغدا بوو ـ بەهرەی برد و لە ماوەیەکی کەمدا، شارەزاییەکی تەواوی لە زبان و وێژەی عەربدا پەیدا کرد و پاشان لە مەدرەسەیەکی بەغدا بوو بە مامۆستا و هێندێک لەودوا لە «الاعدادالملكيّە»دا دەرسی گوتەوە.

ڕەسسافی ساڵی ١٣٢٧ ک. م. چوو بۆ ئەستەمبووڵ و لە قوتابخانەی «ملكيّە»دا دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکرد و هەر لەوێ گوڤاری «جريدةُالعرب»ی دەرهێنا. ساڵی ١٣٣١ بوو بە نوێنەری شاری «منتفك»ی عیراق و هەر شەڕی دنیاگر دامرکا، لە ئەستەمبووڵەوە چوو بۆ فەلەستین و لە خوێندنگەی بالای شاری قودس، زمان و وێژەی عەرەبی، بە دەرس‌گوتەوە. کە عیراق لە عوسمانی جوێ بۆوە، گەڕاوە زێدی خۆی و بوو بە بازڕەسی فێرگەی بەرزی زبانی عەرەبی؛ بەڵام خۆشی لەو کارە نەدەهات؛ بەجێیهێشت و ڕۆژنامەیەک بەناوی

«الامل»ی دەرکرد؛ کە ئەویش دوای ماوەیەک بەر بە بڵاوکردنەوەی گیرا. ناعیلاج بۆ سەرەتێک بەغدای بەجێهێشت و ڕۆیە ئەستەمبووڵ و لە گەڕانەوەدا (ساڵی ١٩٣٠ ز.) کرایە ئەندامی ڕاوێژگەی نووسینی بڕیارنامەی نێوان دەوڵەتی بریتانیا و عیراق و بەدووی ئەوەدا، ساڵی ١٩٣٧ ز. بوو بە نوێنەری پارلەمانی عیراق و پاشانیش پۆست و پایەی بەرزی زانستی و ڕامیاری جۆراوجۆری دەسکەوت و سەرەنجام ساڵی ١٣٦٥ یان ١٣٦٦ ک. م. لە بەغدا، بۆ هەمیشە دەستی لە دنیا و هەموو شان و شکۆیەکی بەردا.

مەعرووفی ڕەسسافی هەر لە سەردەمی خوێندندا، ئاوڕێکی لە شیعر و شاعیریش داوەتەوە و وردە وردە تێیدا هەڵکەوتووە. جوانترین شیعرەکانی، پێش ڕژانی دەوڵەتی عوسمانی، لەمەڕ یەکگرتن و سەرهەڵدان دژی ملهوڕی و دیتکاتوری داناوە و لە دەورانی کوودەتای ڕەشید عالی گەیلانی، لە بەغدا ( سەرەتاکانی دووەم شەڕی جیهانی)، هەڵبەستە شۆڕشگێڕانەکانی خۆی بڵاو دەکردەوە و لە وتاربێژانی ئەو کاتە ئەهاتە ئەژمار.

ڕەسسافی زانایەکی ڕۆشنبیر و شاعیرێکی توانا و لە سەرووی ئەمانەوە، پیاوێکی ئازادیخواز و خەباتگێڕ بووە و لەگەڵ جەمیل سیدقی زەهاوی ـ شاعیری تری کورد ـ هەرکام لە ڕێبازێکەوە، بۆ ڕوونکردنەوەی هزر و بیری خەڵک تێکۆشیون.

مەعرووف هەمیشە هەژار و بێئەنوا بووە و کاتێ کە لە دنیا چووە، بێژگە بەرەشڕەیەک، هیچی بەجێ نەهێشتووە.

**لە کتێبەکانی:**

١. *آراءُ أبی العلاء المعَرّی*

٢. *المحاضرات فی الأدب العربی*، لە دوو بەشدا

٣. *نفحُ الطّیب فی الخطابَة و الخطیب*

۴. *حلّ اللّغز المُقَدَّس* ـ لە مەڕ ژیانی پێغەمبەرەوە (د)

۵. *کتاب الآلة و الادوات*

۶. *دفعُ الهُجْنَة*

٧. *الرَّسائل و التَّعْلیقات*

٨. *الأناشید المدْرسّیَة*

٩. دیوانی شیعر

بۆ بەڕێ کردن و ناشتنی تەرمەکەی، خەڵکێکی زۆر لە کەڵەپیاوانی زانستی و ڕامیاری بەغدا، بەشدار بوون و لەگەڵ ڕێز و پێزانییەکی شیاوی کەسایەتی ئەودا، بە خوێندنەوەی گوتار و شینگێڕی زۆرەوە، لە پەنای دۆست و هاوزمانی بەناوبانگی، خوا لێ خۆشبوو جەمیل سیدقی زەهاویدا ئەسپەردەیان کرد.

**چەند شیعری ڕەسسافی:**

عاهَدْت نَفْسیَ و الأیّامُ شاهدَةٌ     أنْ لا أقرَّ علی جَور السَّلاطین

وَ لا أصادق كَذّاباً و لَوْ مَلكاً و لا أخالطَ إخْوان الشّياطين

* * *

أشربْتُ حُبَّ بلاد ما نَشأتُ بها إلّا لأدْفَع عَنْها كُلَّ عُدْوان
أخْلَصتُ حبّى لها حتّى نَسيتُ به نَفْسى وَ أهْلى وَ أحْبابى و خلاّنى
يا موطناً لسْتُ منْهُ فى مُوادعَة عشْ بعدَ موتىَ عيشَ الوداع الهانى
إنْ سَرَّك الدَّهْرُ يوْماً سرَّنى و اذا آذاك بالْمُعجزات الدَّهْرُ آذانى
آلَيتُ مُنْذُ بَلَغْتُ الحُلْمَ فى وطَنى أن لا أقابلَ نَعْماءَ بكُفْران
وَ أنْ أكُونَ لَهُ عَوْناً أُوازرُه بالنَّصر، أوَّلَ آنْصار وَ أعْوان

* * *

هى الأخْلاقُ تَنْبُتُ كَالنّبات إذا سُقيتْ بماء المكْرُمات
تَقُومُ اذا تَعَهَّدَها الْمُرَبّى عَلى ساق الْفَضيلة مثمرات
وَ أخلاقُ الْوليد تُقاسُ حُسْناً بأخْلاق النّساءالْوالدات
وَلَمْ أرَ لْلخلائق منْ مَحَلٍّ يُهَذّبُها كحضْن الأمَّهات
فَحضْنُ الأمّ مَدْرَسَةٌ تَسامَتْ بتَرْبية البَنينَ أو البَنات
وَ لَيْسَ رَبيبُ عالية المَزايا كَمثْل رَبيب سافلَة الصّفات
وَ لَيْسَ النَّبْتُ يَنْبُتُ فى جنان كَمثْل النَّبْت يَنْبُتُ فى الفلاة
فَياصَدْر الْفَتاة رحبت صَدْراً فأنت مَقَرٌّ اَسْنَى الْعاطفات
نراك إذا ضَمَمْت الطّفلَ لَوْحاً يَفُوق جَميعَ ألْواح الحياة
لأخْلاق الصَّبىّ بك انْعكاسٌ كَما انْعكَسَ الخيالُ عَلَى المراة
و ما ضَرَبانُ قَلْبك غَيْر دَرس لتَلْقين الْخصال الْفاضلات
فَكَيفَ نظُنُّ بالأبناء خَيْراً إذا نَشأوا بحضْن الجاهلات
وَ هَلْ يُرْجى لأطفال كمالٌ إذا ارْتَضَعوا ثُدىَّ الناقصات
ألَمْ نر فى الْحسان الغيد قَبْلاً أوانس كاتبات شاعرات
وَ قَدْ كانَتْ نساءُ القَوم قدْماً يَرُحنَ الى الْحُروب معَ الغُزاة
يَكُنَّ لَهُم على الأعْداء عَوناً وَ يَضْمُدْنَ الجُرُوحَ الدّاميات
وَ كَمْ منْهُنَّ مَنْ اُسرتْ و ذاقَتْ عَذابَ الهُون فى أسْر العدات
فَماذا الْيَوْمَ ضَرَّ لَو الْتفَتنا إلى أسْلافنا بَعْضَ التفات
فَهُمْ سارُوا بنَهج هُدىً و سرْنا بمنْهاج التَّفرق و الشَّتّات

*الاعلام*، زرکلی، ب٨ ل١٨٤. *عصورالادب‌العربی*، کاظمی.

## مەلا مارفی کۆکەیی

مەلا مەعرووف ناسراو بە «مەلا مارف»، کوڕی ئیبراهیم، مەشهوور بە «پەڕبلاو»، کوڕی عەبدولقادر، کوڕی عەبدولعەزیز، خەڵکی گوندی «کۆکە»ی لای بۆکان، ساڵی ١٢٩١ ک. م. (١٨٧٤ ز.) لە گوندی «حاجی‌خۆش»ی لای مەهاباد هاتۆتە دنیاوە. بە منداڵی دەردی هەتیوی چێشتووە و دوایی بەرەو ڕۆژاوا ڕۆیشتووە و ماوەی دوو ساڵ و نیو لە سلێمانی خوێندوویە و ساڵی (١٨٩٠ ز.) گەڕاوەتەوە و هێندێک لەگەڵ برایانیدا لە ئاوایی «کۆکە» دانیشتووە و پاشان گەیشتۆتە تورجان و لای مەلا ساڵەحی قزلجی خوێندنی تەواو کردووە. بە شوێن ئەوەدا ماوەیەک لە «زەنبیل» و سەرەتێک لە «دەروێشان» مەلایەتی کردووە و ساڵی ١٣٠٣ ک. هـ. )١٩٢٤ ز.) کۆچی کردووە بۆ مەهاباد و لە مزگەوتێکی ئەوشارە، بەرنوێژی کردووە و دەرسی گوتووە و سەرەنجام ١٩ی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٦٤ ک. م. (١٩٤٥ ز.) هەر لەوێ، دنیای بەجێ‌هێشتووە.

مەلا مارف مرۆیەکی کەم‌دەست و بەلەنگاز بووە و لەگەڵ ژیانی ناتەواو و پەرێشانیدا ساچاوە و وەک دەڵێن ٤٠ ساڵان، سەرباری دەردان، کوێریش بووە؛ بەو حاڵەش بە کوردی و فارسی و عەرەبی شیعری گوتووە. ساڵی ٤٠ و ٤١ی هەتاوی (١٩٦٢ ز.) شیعرە کوردی و فارسییەکانی لە مەهاباد چاپ کرا؛ بەلام بەداخەوە سەرانسەر هەڵە و پەڵە!

**ئەوا دوو ـ سێ نموونە لە شیعری مەلا مارفی کۆکەیی**:

**غەزەلێکی کوردی**:

سۆفی وەرە! هەنگامی گوڵ و فەسڵی بەهارە — وەقتی تەرەب و عەیش و مەی و گەشت و گوزارە
پیشە و عەمەلت حیلە و تەزویر و ڕیایە — تۆ بەشقی خودا پێم بڵێ ئەم کارە چ کارە؟
تێ‌فیکرە، تەماشاکە لە کووچە و لە خیابان — سۆزی نەیە، نەشئەی مەیە، ئاوازەیی تارە
ڕای خستووە فەڕڕاشی سەبا فەرشی زومورڕود — وەک ئەتلەسی یەکڕەنگە بە بێ گەرد و غوبارە
دەڕژێنێ لە ئاوپاشی فەلەک ئاوی موقەتتەر — سەققایی ڕەبیعی بە قەتارە و بە مەتارە
سەرتیپی بەهاری لە گوڵ و لالەیی ڕەنگین — چەن تیپی لەسان دا، لە پیادە و لە سەوارە
موستەحفیز و نەوبەت چییە بۆ باغ و گوڵستان — کەبکی دەری و بولبول و قومری و قەنارە
سۆسەن بە زمانێکی تەڕ و تازە خەریکە — بۆ مەدح و سەنای سانیعی ئەم نەقش و نیگارە
سەحرایە لەبەر عەتری گوڵ و لالە و سونبول — وەک دەشتی خەتا و خوتەن و موڵکی تەتارە
شاعیر! وەرە تۆ بەشقی خودا ڕوو لە چەمەن کەین — سوحبەت لەگەڵ ئەم عالەمە، هەر دەرد و چەغارە

بەشێ لە قەسیدەیەکی فارسی:

مـــــشو مکــــــدر و آزرده از نیامـــــدنم اســـیر قیـــد بـــلا و مـــصیبت و محـــنم
قـضا بـه دام قـدر بسته دسـت قـدرت مـن کـه دامـن تـو بگیـرم، بـه پـات سـر فکـنم
بیـــا ببـــین بـــه هـــوای گـــل گلـــستانت گهی چو قمری و گـاهی چـو بلبـل چمـنم
گمـــان مبـــر ز خیـــال تـــو فـــارغم یـــارا ببـــین کـــه خـــار فراقـــت دریـــده پیـــرهنم
اگـــر نظـــر کنـــد آن ســـرور ســـتودهسـیر ز راه لطـــف بـــه عمـــق قریحـــه و ســـخنم،
یقـین کنـد کـه بـه یـاد جمـال شـیرینش بـــه بیـــستون محبـــت نظیـــر کـــوهکنم
ز لــوح حافظــه بیــرون نمــیشــود نامــت وداع تـا نکنـد تـن ز جـان و جـان ز تـنم

وەک لە بڕێک شیعریدا دەردەکەوێ، مەلا مارف لە مریدانی شێخ عەلی حوسامەدینی نەقشبەندی بووە:

خواهی رسی به مطلب دنیا و دیـن «ادب» رو خـــاک آســـتانەی پـــور بهـــا نَـــسَب
نایـب منـاب فخـر عجـم، سـرور عـرب یعنی حسام ملـت و دیـن شـاه خـوشلقب

*دیوانی مەلا مارفی کۆکەیی*، چاپی مەهاباد، ١٣٤١ ک. ھ .

## مەلا ئەحمەدی موحیبی

لە مامۆستایانی هێژای شاری سنە بووە کە نێزیک بە ٨٠ ساڵ ژیاوە و ژیانی یەکسەر بە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە و بەرنوێژی و ئامۆژگاری تێپەڕ کردووە و دەوری ساڵەکانی ١٣٦٤ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

ئەو خوا لێ خۆشبووە، پیاوێکی دوورەپەرێز و بێ‌نیاز بووە و بێجگە کتێب، وازی لە هیچ شتێکی تر نەبووە. سەرف و نەحو و مەعانی و بەیانی یەکجار باش زانیوە و قوتابی زۆرحەولیان‌داوە خزمەتی بگەن و لەم زانستانەدا بەهرەی لێ بەرن.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## سەیفولقوزلاتی موکری

میرزا حەسەن، ناسراو بە «سَیف‌القُضاة»، کوڕی میرزا قاسمی قازی، کوڕی میرزا مەحموود و برای میرزا عەلی قازی، لە بنەماڵەی بەناوبانگی قازییانی ساوجبولاغی موکرییە کە باب و کاڵ، پشت بە پشت، سەرۆکی ناوچەکە بوون و لە نێوان خەڵکدا دادوەرییان کردووە.

سەیفولقوزات زانایەکی هێژا، شاعیرێکی توانا و مرۆیەکی بوودە و دەهندە بووە؛ چەند کتێبی کوردی و فارسی و عەرەبی، بە خەتی جوانی خۆی، لێ بەجێ‌ماوە. خوێندنی ئایینی و وێژەوانی، لە خزمەتی مامۆستایانی وەک: مەلا شەفیعی بۆکانی و مەلا حەسەنی قزڵجی و مەلا ساڵەحی سەدراباتی تەواو کردووە و پاشان لە گوندی «گوێگجەلی» لای میاندواو گیرساوەتەوە و تا دواکاتی ژیان، لەوێ پێڕای خزمەتی ئایینی،

قۆڵی بۆ کشت و کاڵ و باخەوانی هەڵماڵیوە و بەوە ژیاوە.

میرزا حەسەنی سەیفولقوزات سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی و مریدی شێخی بورهان بووە. هەموو ساڵێ مانگێکی لە خانەقای شەرەفکەند، لە پەنای زیارەتی مورشیدەکەی، سەیر و سولووکی کردووە و لەگەڵ زانایان و مامۆستایان ڕایبواردووە. ٦٧ ساڵ ژیاوە و لە کۆتایی ساڵی ١٣٢٣ ک. ه. (١٩٤٥ ز.)، بەرامبەر بە ساڵی ١٣٦٤ ک. م. ئەمری خوای بەجێ هێناوە و لە خانەقادا نێژراوە.

لە بەرهەمە فارسییەکانی شتێکم دەس نەکەوت؛ ئەوا چەند شیعری کوردی ئەو مامۆستایە:

تفلی دڵم بە ناڵە و زاری و فوغان ئەڵێ
خوەش بەو شەوە کە ڕۆژی ڕوخی دڵبەرم هەڵێ
زولفت وە لادە ڕووت بنوێنە بە دەفعەیێ
شەو ڕابرێ، ستارە نەمێنێ، قەمەر هەڵێ
بەو زولفی میروەحەت مەکە مەنعم لە شەهدی لێو
تەیرێکە دڵ زەعیفە، دەترسێ لە داوەڵێ
تفلی دڵم گرۆی شەکەری لێوی گرتووە
بەو دوو هەنارە ژێری کەوە بیخە باغەڵێ
ئەو قافییەت بە سانی دڵی موددەعی «حەسەن»!
تەنگە، درەنگە، مەیلی بە جەنگە، هەڵێ! مەڵێ

* * *

بۆچی زمانی دایکی لە ئێمە مەنع کرا؟
ئەو هێندە زوڵم و فەرق و جودایی و جەفا چییە؟
دەکرانە دیل و بوونە ئەسیری لە نێو عەجەم
هەورامی، سابڵاخی و عێلی جەلالییە
هێندێکی بۆ ئەراک و بۆ سمنان و داموغان
دەستەیکی بۆ ئەوێنە کە جێ شێخی سەعدییە
یا دەرکراوی مەوتنە یا حەبسی بێ‌گوناه
کوردێکی مەزن و عاقڵ و مێردی حیسابییە
هەر ماڵە کوردێکی کە دەچوی دەتدی شیوەنە
ئەورۆکە هەر دێیەکی دەچی سەیر و شادییە

* * *

عەنبەری زوڵفت بە دەم سەبا دە
لەسەر مانگی ڕووت، هەوری مووت لادە
تا ڕۆژ وەکوو شێت ڕوو لە کێوان کا
تۆزێ غوسسە و غەم، هەستە بە بادە
لە عەشقت مردم وەسیەت بێ لە تۆ
بۆ خۆت بمنێژە، تەڵقینم دادە
تا بڵێن زوححاک مار لەسەر شانی،
تایەک لە زوڵفی چین‌چینت بادە
بە جامی دیدەی جەمشیدی جەمە
بە تەختی سینەی وەک کەیقوبادە
گوتم: کوشتمت بە غەمزە، فەرمووی:
شێوەم شیرینە، پیشەت فەرهادە
تاکوو پامال بێ خوێنی مەزڵوومان
پەنجەی شمشاڵت، ڕەنگ وە خەنادە
بە هومێدی وەم بی بۆ سەر قەبرم
بۆیە وا «حەسەن» بە مردن شادە

**داخ و مخابن لەبەر دووبەرەکی و ناتەبایی:**

چون دژمنین دەگەڵ یەک و نیمانە ئیتتحاد
ڕامان دەدەن بە جارێ لە هەورازێ بۆ نشێو

فکرێ بە حاڵی خۆ کەن و بگرین بە حاڵی خۆ — هی بێسەری و عەداوەتی خۆتانە دێتە ڕێو

ڕەشماڵە ماڵ و کەشک و پەنیرە مەتاعی مە — قەسر و سەرایی خەڵکی دییە پڕ لە زێڕ و زێو

*دیوان سَیف‌القُضاة*، چاپی تاران، ١٣٦١ ک.

ه. *دەنگی گیتی تازە*، ژ ١٦، س٣، ل٣٤٢.

## ناهیدی سەقزی

عەبدوڵڵای ناهید، مەشهوور بە «افتخارالسُلطان»، کوڕی مستەفا بەگ، کوڕی ئاغا فەیزوڵا بەگ، لە عەشیرەتی فەیزوڵابەگی، کە بە پشت دەگەنەوە بە باباعومەر، ناسراو بە «باباامیر»، ساڵی ١٢٦٨ ک. ه. )١٨٨٩ ز.) لە گوندی «سلێمانکەندی» لای سەقز ـ کە هی خۆیان بووە ـ هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە، هەر لەوێ خوێندوویە و پاشان بۆ مەهاباد چووە.

لە مەهاباد، ماوەیەک لە مەدرەسەی ڕەحمەتی قازی عەلی ـ لە مامۆستایانی ڕێزداری ئەوێ ـ عەرەبی خوێند و بەشوێنیدا گەڕاوە زێدی خۆی و لەگەڵ کشت و کاڵ و گەیشتن بە کاروباری گوندەکە، بە هۆی وازی سرشتی و لێهاتووی، هێندێک لە کاتیشی بۆ نیگارکێشی و ژەندنی تار، تەرخان کرد. لە پاش ئەوە کە مامۆستایەکی زمانی فەڕانسەی ناسی، لێبڕا فێری ببێ و چەند کتێبیشی لێ خوێند و هێندێکیش زمانی ڕووسی فێر بوو. لە سەرینەی ئەوانە، لە هەیئەت و جوگرافی و مێژووشدا زانیارییەکی تا ڕادەیەک باشی دەسکەوت.

ناهید پیاوێکی زانا، میهرەبان، میوانخۆشەویست و بێ دەمار بووە و دانیشتن لەگەڵ زانایان و وتووێژی زانستی یەکجار حەز پێ‌کردووە. لە بەرهەمە هونەرییەکانی، چەند تابلۆی وێنەکێشی بە ڕەنگی چەورە کە بە قسەی سەردەرچوان، لەوپەڕی جوانی و قەوەتدایە.

**لە کتێبەکانی**:

١. *پهلوانان گمنام*، لە سێ بەرگدا، کە دووی چاپ بووە

٢. *چگونە بە مریخ رفتم*

٣. *مصاحبە با شیطان*

۴. *خاطرات من*، چاپ تهران، ١٣۶٢، بە کوشش احمد قاضی

ئەم مامۆستایە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا، بەهۆی وردبینی و دوورنواڕی و تێگەیشتوویەوە، بەشێکی بەرچاوی لە هێورکردنەوەی بار و دۆخی ناوچەکەدا بووە و ساڵی ١٣١٦ ک. ه. )١٩٣٧ ز.) وەکوو نوێنەر، بۆ پارلەمانی تاران چووە و تا ساڵی ١٣٢١ (١٩٤٢ ز.) لەوێ ماوەتەوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٦٤ ک. م. لە گوندی «سلێمانکەندی»، کۆچی دوایی کردووە.

بلاڤۆکی وەرزی *فرهنگ*، شاری سەقز، س١٣٣٨ ک. ھ، ژ٣.

## ئازادیی کە لهوڕی[1]

عەباس‌خانی ئازادی، کوڕی ئاغەخان، لە عەشیرەتی کەلهوڕ، مرۆیەکی ڕێزدار و خۆشناو و شاعیرێکی هێژا و خاوەن زەوق بووە کە ساڵی ١٣٦٤ ک. م. لە تەمەنی ٧٥ ساڵاندا، دنیای بەجێ‌هێشتووە.

**نموونەیەک لە شیعرەکانی**:

هامــسەران! فــانی، هامــسەران! فــانی
بــــەقا نـــەدارۆ ئـــەی دونیـــای فـــانی

پـــیر مـــەوی دڵڕێـــش وە پەشـــیمانی
بــــەقا نـــەدارۆ ئـــەی دونیـــای فـــانی

عەقڵ و هـۆش و فـام لـە لات ڕەم مـەبۆ
زەڕەی جوانیـــت یـــەکجار کـــەم مـــەبۆ

داناییـــت حیـــساب کـــەر وە نـــادانی
بــــەقا نـــەدارۆ ئـــەی دونیـــای فـــانی

دوو سەف دەندان نەسـب جـای دەهـەن
یەکایـــەک وە گـــاز مـــەبۆ ڕیـــشەکەن

ئـەو ڕیـز و ڕازان شـەکەرین چێـو قـەن
کـــەس نمـــەواچۆ کـــەلامت وەچـــەن

قـــــەدر جـــــوانی وێـــــت نمـــــەزانی
بــــەقا نـــەدارۆ ئـــەی دونیـــای فـــانی

زەڕڕەی زەریفـــــی پێـــــت نمـــــەمانۆ
ئەسـلەن وە قـــەدرت کـــەس نمـــەزانۆ

عـــەیب بەشـــەریت ئاشـــکار مـــەبۆ
عـــەیاڵ و ئـــەولاد لێـــت بێـــزار مـــەبۆ

مـەردەن خاسـتەرەن جـەی زینـدەگانی
بــــەقا نـــەدارۆ ئـــەی دونیـــای فـــانی

ئەگـەر وە جاگـەی جەمـشید شـا بیـت
خـاوەن سەڵـتەنەت، تیـپ و سـپا بیـت

چـون دارا و خەسـرەو غـەنی و دارا بیـت
جـە گـشت عاڵـەمێ فەرمانـڕەوا بیـت

بنیـــشی لـــە بـــان تـــەخت کـــەیانی
بــــەقا نـــەدارۆ ئـــەی دونیـــای فـــانی

ئەر چون فریدوون زەحاک لـە بـن کـەی
ئـاوێزان لـە نـاو چـای دەمـاون کـەی

درەفـش کـاوەی ئیمـداد بوڵـەن‌کـەی
هەفت‌ئەقلیم قسمەت وە سێ فـەرزەن کـەی

وێـــت وە شاهەنـــشای عاڵـــەم بـــزانی
بــــەقا نـــەدارۆ ئـــەی دونیـــای فـــانی

ئەر چون مەنووچەر عاڵەم یەکسەر کـەی
سـام وە سـپەدار سـپا و لـەشـکەر کـەی

دنیـا لـە ناڵـەی شـەیپوورت کـەڕ کـەی
سپای سەلم و تـوور زێـر و زەبـەر کـەی

ئەوان سەرگوم کـەی هـەر وێـت بمـانی
بــــەقا نـــەدارۆ ئـــەی دونیـــای فـــانی

لە یاداشتەکانی نووسەر.

---

[1]. برای عەلی‌نەقی‌خانی ئازادی، نازناو «واله»یە، کە باسی ئەویشمان لە لاپەڕەی ٦٤٨ کردووە.

## مەلا موحەممەد سادقی ئیمامەت

دەوری ساڵی ١٣٠٠ ک. م. لە گوندی «ئەوێهەنگ»ی سەر بە ناوچەی «ژاوەرۆ»، هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکرد. پاشان چوو بۆ سنە و سەردەمێک لە قوتابخانەکانی ئەو شارەدا، بە هەموو توانەوە خوێندی و لە خزمەتی عەللامە مەلا عەبدوڵڵای موفتی دشی، خوێندنی تەواو کرد و ئیجازەی وەرگرت. ئینجا گەڕاوە زێدی خۆی و تا دوا دەمی ژیان، خەریکی دەرس‌گوتنەوە و خزمەت بە خەڵکەکەی بوو. شیعریشی دەگوت و هۆنراوەیەک لە فەرائیزدا لێوە بەجێ‌ماوە.

مەلا موحەممەد سادق سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی و لە مریدانی شێخی پایەبەرز، حوسامەدین ئەهاتە ئەژمار. باخەوانی و کشت‌وکاڵی دەکرد و لە بەرهەمی کاری خۆی بەڕێوەدەچوو. لە باری ئاکاری پەسند و پارێزگارییەوە، شوێنی زانایانی پێشینی گرتبوو؛ «وەلی شەرعی»یان پێ دەگوت؛ کە بەڕاستی وابوو.

کۆچی یەکجاری ئەو مامۆستایایە، ساڵی ١٣٦٥ ک. م. لە ئەوێهەنگ ڕوویداوە.

*عُلَماونا فی خدمة‌العلم و الدّین*، ل٢٤٦.

## مەلا حەسەنی دزڵی

مامۆستای زانا و شەرعزانی ئاگا و شاعیری توانا، مەلا حەسەنی مەردۆخی، نازناو «هیجری»، لە بنەماڵەی مەردۆخییەکانی هەورامانە کە ساڵی ١٢٧٥ ک. م. لە گوندی «وەیسا»ی ئەو مەڵبەندە هاتە دنیا. شەش‌ساڵان لای باوکی خوێندنی سەرەتایی دەسپێکرد و کە گەیشتە ڕادەی تازەلاوی، خۆی گەیاندە خزمەتی حاجی شێخ یۆسف لە «دگاشێخان» و سەرف و نەحوی بەلاوە خوێند. بە جحێڵی ڕووی لە موکوریان نا و هەرکوێ مامۆستایەکی زانای ناسی، لە خزمەتیدا ماوەیەک فەقێتی کرد؛ تا سەرەنجام لە دەستی مامۆستا «هەولێری» ئیجازەی وەرگرت.

وەک لە شیعر و پەخشانی مەلا حەسەندا دێتە بەرچاو، هێندێک لێکدانەوە و بۆچوونی فیقهی ئەم مامۆستایە، لەگەڵ بڕوای باوی مەلایانی ئەو سەردەمە و تەنانەت ئێستاش، یەک ناگرێتەوە و بگرە پێچەوانەیان دێتەوە. بۆ وێنە لەمەڕ تەڵاقەوە، زانایانی فیقهی شافیعی دەڵێن، بە سەر زاری پیاودا هاتنی وشەی سێ‌تەڵاقە ـبە هەر بۆنەیەکەوە و لە هەر بارودۆخێکی ڕۆحیدا بێـ دەبێتە هۆی کەوتنی تەڵاق و ژن و مێرد لێک حەرام دەکا!

ئەم فتوایە، بە درێژایی مێژوویەکی هەزار و ئەوەندە ساڵان، لە ناو بەشێکی بەرچاو لە موسوڵماناندا، زۆر بنەماڵەی بێ‌تاوانی لێک هەڵوەشاندۆتەوە و مەگەر خوا بۆخۆی بزانێ چەندها ئاڵۆزی و نەخۆشی کۆمەڵگایی بارهێناوە.

وەرزێرێکی نەخوێندەوار کە لە مەلابانگدانەوە لە مەزرا ڕەنجی‌داوە و ئارەقی ڕشتووە، ئێواران برسی و ماندوو کۆسپێکی دێتە ڕێ، شێت و دەهەری دەکا، تەڵاقی لێ دەخا، چ دەکەم و چ دەکەم؛ دیارە

هیچیشیان لە دەستی نایە. هەر هێندێک دێتەوە سەر خۆی و هێـور دەبێتـەوە، دەزانـێ ئـەوی ڕسـتوویە، بایەخێکی نەبووە و ڕەنگە بە عەقڵی ئەوکاتەشی پێبکەنێ. بەڵام پێکەنینی چی؟ بە پێـی فتـوای مـەلایان و لەبەر ئەو وشە سیحراوییە سەرانسەر نەگبەتی و مەینەتە هاتۆتە سەر زاری، قوڕی عالەم چۆتە سەری خـۆی و بنەماڵەکەیدا. ژنی بێخەبەر و بێتاوانی پێویستە دەست لە ماڵ و منداڵ و مێردی بەردا و بچتەوە بۆ باوان و ئەگەر ئەوەشی نەبوو، با وێڵی کۆلانان ببێ و چی بەسەر دێ، حەقی بەسەر شەرعەوە چییە؟!

مەلا حەسەن بوێرانە و بە ڕاشکاوی، هەموو ئەو فتوایانەی بە هەڵە زانیوە. یەکەم تـەڵاق خـستنی بـەجێ سوێندخواردن، ڕەت کردۆتەوە و زیاد لەوەش ڕایگەیاندووە تەنیا ئەو کاتە تەڵاق دەکەوێ کە پیاو بیهەوێ لە ژنەکەی جوێ بێتەوە؛ ئەویش بەو مەرجە کە کاتی تەڵاق خستن، تەواو لەسەرەخۆ بووبێ و بـە تووڕەییـەوە ئەو لەبزەی لە دەم دانەکەوتبێ. تازە لە سـەرینەی ئەوانـە هـەموو، هـۆی دانـانی سـێ تـەڵاقی لـە لایـەن شەرعەوە، سێ جار دەرفەتی پەژیوان بوونەوە زانیوە؛ بەشکوو ئەو کارەسـاتە نەقـەومێ و بنەماڵـەیەک لێـک هەڵنەشێوێتەوە. کەوابوو چۆن دەبێ سێ تەڵاق پێکەوە بکەوێ؟

دەگێڕنەوە جارێ یەکێک دەچێ بۆ لای و نەقلی خۆی دەگێڕێتەوە کە چۆن لە شـتێک قوشـقی بـووە و بەبێ هێچ پێوەندییەک بەسەر ژنەکەیەوە، بەجێ سوێند، تەڵاقی خستووە و ئێستا بـە ڕای هـەموو مـەلایان، ژنەکەی لێ حەرام بووە و سەری دنیای لێ هاتۆتە یەک.

مامۆستا بە بێ تێڕامان پێ دەڵێ نە تەڵاقت کەوتووە و نە هیچ. بچۆوە ماڵی خۆت و لەوە بەولاوە ژیرانـەتر بژی!

خەبەری ئەم باسە ـ کە لە لای هەڵەبجە ڕووی داوە ـ دەگاتە حاکمشەرعی کەرکووک و لەویشەوە موفتی بەغدای تێدەگا و هەموو لە مەلا حەسەن تووڕە دەکا. والی بەغدا کە مرۆیەکی لەسەرخۆ بووە و بـە ناسـکی کارەکە دەزانێ، چار لەوەدا دەبینێ کۆڕێکی گەورە لە شەرعزانان پێکبێنێ و مەلای تێدا لە ئـەزموون بـدا. کۆڕ دادەمەزرێ و مەلا حەسەن هەموان بێدەنگ دەکا. والی پلەی داوەری دادوەرانی پـێ پێـشنیار دەکـا؛ بەڵام ئەمی تینووی خوێندن و زانین، داوا دەکا بۆ مەدینە یان قاهیرەی بنێرێ. بەم جۆرە مەلا حەسەن بـۆ میسر دەڕوا و لە زانستگای ئەزهەردا دادەمەزرێ.

وەک لە کتێبی شیعر و بەسەرهاتەکەیدا نووسراوە، مامۆستا پاش یازدە ساڵان خوێندن و دەرسگوتنـەوە لە ئەزهەر، بیری نیشتمان دەکەوێتە سەری و وا دڵ و دەروونی دادەگرێ، بەجارێک دەست لە مامۆسـتایی ئەزهەر بەردەدا و دەگەڕێتەوە بۆ هەورامان و دەڵێ:

شـــەرتە هـــەورامان بـــەجێنەهێـــڵم    مەگـــەر ئـــەو ســاتە کــە بــەجێــدێـڵم

بارێکی تر لە کەسایەتی مەلا حەسەنی مەردۆخی، بەرهەڵـست بوونـەوەی لـە بەرامبـەر شـێوەیەک لـە عیرفان و سۆفیگەری لە کوردستانە کە تا ئەم دواییانە، وەکوو نەخۆشییەکی گـەورەی کۆمەڵـگاکەمانی لـێ

هاتبوو. مامۆستا هاوچەرخی قوتبی تەریقەت شێخ حوسامەدینی نەقشبەندییە کە پێشتر باسیمان کرد.

لەبەر بڕشت و دەسەڵاتی لەڕادەبەدەری شێخ لە نێوان هەموو چینێکدا، بڕێک لە مریدانی پێشمەرگەی، جاروبار تا لای خودایان دەگەیاند. کوا کەس دەیوێرا ڕەخنەیەک لەو بارودۆخە بگرێ یان بۆچەیەک بێژێ.

مەلا حەسەن لەم بارەشەوە باری خۆی نەگۆڕاوە و لە هەر دەرفەتێکدا کە دەستی داوە، بە بێ کۆکردنەوە و مەرایی، ڕەخنەی زانایانەی خۆی ڕاگەیاندووە و دیارە لە پێناویدا زۆرێکی لە خۆی لالووت کردووە و زۆر جار بەر هەڕەشە و گوڕەشە و جنێو و نافاتیش کەوتووە و لە ئاکامدا دەستەنگی و لاکەوتەیی بۆ بارهێناوە.

جارێک شێخ بانگی دەکاتە لای خۆی و کە دەبینێ چەند پیاوێکی زانا و پارێزگارە، زۆری ڕێز لێ دەگرێ و تێدەکۆشێ بەشکوو بەرەو لای خۆی ڕاکێشێ؛ تا ئەو ڕادە لێی داوا دەکا بەو قەڵەمە جوان و بەتوانەی خۆیە، نامەیەک بە زبانی شێخەوە بۆ خەلیفەیەکی بنووسێ و هێندێک ئامۆژگاری بکا. هەر بە کاکڵی ئەم نامەدا، خوێنەر ڕادەی تاکەپەرستی خاوێن و هزر و بیری پاک و بێ خڵتی نووسەرەکەی بۆ دەر دەکەوێ.

**ئەوا کورتەیەکی ئەو نامە:**

«بسم‌الله‌الرحمن الرحیم. الحمدُ لله الَّذی خلق الإنسانَ مِنْ ذَکرٍ وَ أنثی... و الصّلوة و السّلام عَلی عَبْدِهِ و رسولِهِ وَ مَن اتّبعه بِإحْسانٍ إلی یَومَ لا یَنفَعُ مالٌ و...»

سپاس خداوندی را سزاست که دستور داد برابرش سجده کنند و کسی را به مشارکت در خلق و امر و تأثیر دعوت نکرد. و پیغمبری را ستود که بزرگترین افتخارش عبودیت بود. خدایی که خود را «وَحْدَه»، «لاشریک»، «لَمْ یَلِد»، «رحمان» و «رحیم» خواند؛ و اجازت نداد «نَعْبُدُ» و «نَستَعین» را دیگران ـ که مخلوقند ـ تصاحب نمایند. خدایی که خود را خالق و همه‌ی موجودات را مخلوق خواند؛ بی‌تأثیر در الوهیت و غفاریت و قهاریت. چه کسی را یارای ادعای شراکت در نظم و خلق؟... عباد صالح خدا آنانند که در راه رضای او گام بردارند و خود را برتر و موثر در شفا و روزی و بهشت و جهنم ندانند...

... مگر می‌توان مدعی قطبیت بود و خورد و خوراک را از خلق خدا جدا کرد؟ مگر می‌شود ادعای عبدیت خدا را داشت؛ اما عبد شکم و زمین و اسب و باغ و... بود؟ مگر می‌توان مُرشد شد وخود هدایت نشده باقی ماند؟...

...آگاه باش! مرگ در کمین است. جواب او را چه خواهید داد که: من در بستر نرم، زمستان، گرم و تابستان، خنک با «ما تَشتَهی الأنْفُس» زیستم و مَردم را وعده‌ی بهشت دادم و مدعی شفا بودم... پس بدان در چنین روزی من هم نمی‌توانم برایت کاری کنم. آیا جواب خدا را توانی داد؟...

... از خاک هستی و به خاک باز خواهی گشت؛ زیادی فاصله با فقرا زیادی فاصله با خداست. به خدا قسم نمی‌شود آنچنان زیست و با خدا بود. تلخی نچشیده، رنج ندیده، غصه نخورده و شبها را با ناله و راز و نیاز با خدا به روز نرسانیده، چگونه چنین و چنان شده؟

ایــن کُــلاه و ایــن عبــای خرقــه‌پــوش مــــی‌توانـــد راهـــزن گیـــرد بـــه دوش

نصیحتم گوش کن، لذت عشق نوش کن؛ دنیا را آغوش مکن؛ خدا را فراموش مکن!...»

**واتــا:** وه‌ناوخودا که ده‌هنده و دلۆڤانه. سپاس بۆ ئه‌و که‌سه مرۆی له نێر و مێوینه‌یه‌ک وه‌دی هێنـا ... دروود و سه‌لام بو به‌نده و ڕاسپارده‌ی و ئه‌وی شوێنگریه به چاکه، تا ئه‌و ڕۆژه که ماڵ و ... به‌هره‌یه‌ک نادا و ...

دیسان سپاس هێژای خودایه‌که فه‌رمانی دا کڕنووشی بۆ به‌رن و که‌سی به هاوبه‌ش و هه‌واڵ هه‌ڵـنه‌بژارد و په‌سنی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ی دا که گه‌وره‌ترین شانازی، به‌نده‌واری بـوو. خودایـه‌ک کـه خـۆی بـه «تـاک» و «بێ‌شه‌ریک» و «نه‌زاو» و «ده‌هنده» و «دلۆڤان» ناو برد و ڕێی نه‌دا که‌سانی تر ـ که داهێنراون ـــ بیانپه‌رسـتن و پشتیان پێ ببه‌ستن. خودایه‌ک که خۆی به‌دیهێنه‌ر و هه‌موو بوونه‌وه‌ری به‌دیهێنراو ناو نا؛ بێ ده‌سه‌ڵات لـه خوایه‌تی و به‌خشنده‌گی و لێهاتوویی. کێهه‌یه ده‌سه‌ڵاتی هاوبه‌شی له وه‌دیهێنان و دامه‌زرانیدا هه‌بێ؟ ...

به‌نده‌ی گونجاوی خوا ئه‌وانه‌ن وا له ڕێگای ڕه‌زای ئه‌ودا هه‌نگاو ده‌نـێن و خـۆ بـه سـه‌رتر و ده‌سـدار لـه خۆش‌کردنه‌وه و به‌ش و به‌هه‌شت و جه‌هه‌ننه‌مدا نازانن ...

... چۆن ده‌بێ خۆ به قوتب بزانی و به‌ش و بژیوی خه‌ڵک بخۆی؟! کوا ده‌گونجێ بێژی به‌نده‌ی خـودای و کۆیله‌ی زگ و زه‌وی و باخ و ئه‌سپ و ... بی؟ که‌ی ده‌کرێ مورشید بیت و ڕێ لێ شێواو داکه‌ویت؟...

... وریا به! مه‌رگ وا له بۆسه‌دایه و خـۆی لێـت ماتـه داوه. چـۆنی جـواب ده‌ده‌یتـه‌وه ئه‌گـه‌ر لـه سـه‌ر دۆشه‌کی نه‌رم، به زستاندا گه‌رم و هاوینان فێنک، وا که دڵت ده‌یخوازێ بژیت و خه‌ڵـکی واده‌ی به‌هه‌شـت بده‌ی و بێژی خۆشیان‌ده‌که‌یه‌وه ... بزانه! له ڕۆژی وادا منیش کـارێکم پـێ نـاکرێ بـۆتی بکـه‌م. بۆخـۆت جوابی خودات بۆ ده‌درێته‌وه؟ ...

... له خاکی و ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ خاک. دووربوونه‌وه له داماوان، دوورکه‌وتنه‌وه له خودایه. سوێند بـه‌و خوایـه ناتوانی وا بژیت و له‌گه‌ڵ خودا بیت. تاڵی و سوێری نه‌چه‌شتوو، ده‌رد و مه‌ینه‌ت نـه‌دیتوو، خـه‌م و خه‌فـه‌ت نه‌خواردوو، شه‌وان به ناڵین و کڕووزانه‌وه و سکاڵا له ده‌رگانه‌ی خوادا ڕۆژ لێ هه‌ڵنه‌هاتوو، چۆناوچۆن وات لێ هاتووه؟

ئه‌م خه‌رقه و عابا و مێزه‌ری سه‌رته ڕێـگریـش ده‌کـرێ بیـکاتـه‌بـه‌ری

گوێ بگره له‌م مۆچیارییه! ئه‌ویـنداری ڕزگارییه. ئامێز بۆ دنیا مه‌که‌وه! خودای خۆت له‌بیر مه‌به‌وه!

* * *

به‌و حاڵه‌ش ده‌بینین که له شینی کۆچی یه‌کجاری شێخ حوسامه‌دیندا، له‌سه‌ر داخوازی دۆستێکی و بـه ناوی ئه‌وه‌وه، مه‌سنه‌وییه‌کی ئاورینی هۆنیوه‌ته‌وه. تۆ بڵه‌ی خۆی په‌سند و ئاکاری به‌رزی شـێخ تـا ئـه‌و ڕاده کاری کردبێته سه‌ر هه‌ستی مامۆستا که له دنیا چوونی هێنده‌ی خه‌مبار کردبێ؟ ئه‌گه‌ر وایه، بۆچی وه‌کـوو زۆربه‌ی مامۆستیانی ئه‌و سه‌رده‌مه، نه‌چووه ژێر ئالایه‌وه، تا هێندێک پێی بحه‌سێته‌وه؟ که‌چی به پێچه‌وانـه،



ئەو هەمووە خۆی تووشی دەردیسەر و سەخڵەتی کرد!

بەڵام ناوبانگی مەلا حەسەنی دزڵی زیاتر بە بۆنەی شیعرەکانیەوەیە کە زۆرتر گاڵتەی تێکەڵ بە تیز و تانەن. مامۆستا زیاد لە هەورامی، بە سۆرانیش شیعری گوتووە و هەروەها بە فارسی و عەرەبیش، بۆ گەپ و گەمە، هێندێک شیعری جوان و دڵبزوێنی داناوە.

**چەند نموونە لە شیعرەکانی**:

برا هەتاکەی ئەم دەردیسەرە؟
ئێژی ئەو سەگە و ئەویتر کەرە!

ئەوە نافامیێ، بەچکە عەوامە
ئەویان نۆکەری باوک و باوامە

سەییدگیان! توخوا چاوێ کەرەوە
خۆت بۆ لای زەمان باوات بەرەوە

ئەولادی حوسەین! مەبە بە یەزید
بۆچی گیانی دا سەرداری شەهید؟

بۆ دەس‌ماچ‌کردن؟ یا بۆ نان و ئاو؟
یا هەرچێ بێژێ، بێژن بەسەرچاو؟

مامۆستای گەورەم! لە جێ ڕافیعی
نەوەوی مەسلەک، موفتی شافیعی

عەمەڵ بە گفتە و عیلمت واجیبە
من بمرم ترس و فلس حاجیبە!

یا شێخ بە گیانی غەوسی گەیلانی
شای نەقشبەند و پیری ڕەببانی

خۆت بە پەیڕەوی ڕەفاعی زانی
بۆچی خۆت ناونا بە غەوسی سانی؟!

شێخی مار و تیخ، زەرگ و بەرد و دار؟
دین و مار و زەرگ؟! هەزاران هاوار

بۆخاتر پیری هیند و غەجدەوان
پیری سەمەرقەند، پیری هەمەدان

تەپڵەکەت لێدە بەرەو هیندوستان
ئیتر بەسیانە خەڵکی کوردستان

وتیان شارەزوور خوشە بۆ میوان
میوان دوسەدساڵ؟! ئامان سەد ئامان

ئەگەر نۆبەیش بێ، ئێمە بەسمانە
بەش کوڕاوکوڕ و هەرچی کەسمانە

ئاغا بۆخاتر هەلاکوو و تەیموور
عەناز و...، زەڵم و شارەزوور

چۆن بووگە ئێوە ساحیبی دنیان؟!
سەروەر و سالار دنیا و مافیهان؟!

چۆن ئێوە ساحێو موقەددەراتن؟
ساحیب جەریمە و خاوەن خەڵاتن؟

هەرچەن ئەزانم تۆ بێ‌تاوانی
فێرکراوی، خۆت بە هەق ئەزانی

خودا من بگرێ، لەسەر هەتا پام
حەڵاڵم کرد بۆت بە فتوای حەرام

بە خاتر کراس یا تەغارێ جۆ
ئەم هەژارانەم خستە باوکەڕۆ

فتوامان بۆ دان، بووبە قەواڵە
کێ ئێژێ حەرام زوانی لاڵە؟

نە خۆت، نە باوات، نە باواگەورە
نە ئەم زەمانە و نە هی ئەو دەورە

نە ڕۆژێ جووت و نە ڕۆژێ گێرە
خاتوونیش نە دەشت نە ڕانەبێرە

کــێ دیویــە مالیــک بــۆ ئیحیــای مــەوات — پاچــێ هەڵــگرێ و بــۆ کێوێــک بــڕوات؟
ساڵـــەها هـــات و ساڵـــەها چیـــوە — کـــێ ڕۆژێ کـــاری مـــالکی دیـــوە؟
گـــیرام خـــاوەنی زەویـــن و بـــاخی — خـاوەنی موڵــک و مووچــە و ئوجــاخی
بـــێئیجـــازەی تـــۆ مـــازوو نـــاکرێ! — بـە بـێ دەســتوورت بـە ڕوو نـاخورێ!
کــچ بــە بــێئیزنــت نــادرێ بــە شــوو — خـاوەن ئـیرادەی لـە بـووک و خەسـوو
ئـــا توخـــوا کاکـــە ناوەکـــەت بێـــژە! — لـــە دەســـتەڵاتت ســـەرم زۆر گێـــژە
ئــەر تــۆ خــالیقی یــا فــەردی ئــەعزەم — خـودایش وا ناکـا، هـەر بـە خـوا قەسـەم
خـــۆ خـــوا جوزئـــێ ئیختیـــاری دا — تـۆ لێـت سـاندمەو، موفـت و مەرحـەبا
هــاوار ئــەم خەڵــکە چــی لــێ قــەوماوە — ئیختیـــار مـــاڵ و خـــەیزان نـــەماوە!
ڕەش و ڕووتــەکان! بــە خــودا قەســەم — بـە گیـانی ئێـوەی بـێنـەوا قەسـەم!
گوریـــسی زوڵـــم هـــەتا مەحکـــەم بـــێ — زووتـــر ئەبڕیـــەت، خـــاترت جـــەم بـــێ
ڕۆژێ ئـــــەبینن لـــــەم شـــــارەزووره — لـــەم دێ نزیکـــە و لـــەو دێیـــە دووره
نــە دەنگــی تــەپڵ و هــەرا و هوریایــە — تـــاپۆی ڕەش و مـــۆر ڕووبـــە فەنایـــە
نـــاوی مالیـــــک و ئاغـــا نـــــەماوە — ئەبێتـــە عەیبـــە، ئـــەم بـــەزم و بـــاوە
ئەبیتـــــەو خـــــاوەن ژن و مناڵـــــت — خـــاوەنی ڕەنـــج و وەزع و ئەحواڵـــت
ڕیـــش و مێـــزەره، بـــە قـــەتع و یـــەقین — جێگـەیان ئـەدەن بـە عـیلم و بـە دیـن
ئــەو ڕۆژه «حەســەن» ئــەگا بــە ئــاوات — ئێـژێ بـە دیـدار موحەممـەد سەڵـوات

ئەم شیعرەی بە پەیکێکدا بۆ دۆستێکی بە ناوی موحەممەد ئەمینی هەمەوەندی کە لە سابلاغ (مـەهاباد) بووە، ناردووە:

ای عازم ساوجبلاغ! عـرض سـلام ایـن حـزین — بـر خـوان بـرای آن کـه نـامش در دهـانم انگبـین
چابـکِ همـەونـدی کـه او در وقـت غـارت بارهـا — بر کنـــده بُزهـــا پوســـت را، درویـــشها را پوســـتین
.......................................................................... — اول محمـــــد آمــــده، آخـــــر نقـــــیض للأمـــــین
بـــاری اگـــر مرســـولەای ننوشـــت ســـوی ایـــن طـــرف — منعش نباشـد زان مکـان، گـر غافـل اسـت از مـا چنـین
شـــهر ســیەچـــشمان وی همچـــون غـــزالان خُـــتن — تعطیـر نـاف دلبـرش، چـون نافـەی آهـوی چـین
پیکـــان مژگـــان ســیە بـــر ســـینەی هـــر کـــس زنـــد — فـــوّاره‌اش بـــالا رود تـــا آســـمان هفتمـــین
بـــەرخـــۆلـــةٌ، ذوشـــحمةٌ، تاقـــانـــةٌ فـــی بلـــدة — قتّـــالـــةٌ بـــالغمزة، بـــا آن دو چـــشم نرگـــسین
لَـو عـــانَق الانـــسانُ بالبِنْـــت التـــی مـــن قـــربکم — صـادر شـود بـی‌اختیـار از وی ریـاح فـا و سـین
درویـشهای کولـکنین، ڕیـش نێـری و زوڕناکـەپۆ — سەر چۆلەکەی گون‌کوولەکە، مانند جـاموس بطـین

بینند چـون آن لُعبتـان، چـون دیوشـان در بـر کـشند    با بۆڵەبۆڵ و فیشەفیش، بـا لرفـەلـرف و ئـاخنین

ئەمەش قەتعەیەکی مولەممەع، گازندە لە نابەرامبەری:

...چ هاوار و هەرا و هوریایە بو الأخباز و برســیســک

بە سـێحەی انَّـا جُعْنـا، بـە برسـیمە دەبـێ بچـڕی

فەڵەک ئاوێکی بۆ ڕشتین ئەبێ برسی و کز و کـوێر بـین

احامیر و اکالب، شَحم و لَحم و تـویش ئـەبێ بقـڕی

وەکوو من زیکری گێتە و وێردی چایی، سەرفی عیلمی کـە

وەگەرنە ریحـی اَمعـاءِ و اَوارِگ زیـاد ئـەکا و ئەتـڕی

بە کام دەستوور و کام یاسا، اَعالِم ڕووت و برسی بن؟

لە هـەر بـوالعلم و بـولزانین دەپرسـم، قـالَ: لا اَدْری

حەسەن! ڕۆژێ ئەبێ عـالیم ببێتـە سـاحیبی عالـەم

اولــوالأزوار! اولولــسەروار! اولوالــدینار! ئــەبێ بمــری

ئەگەر ڕۆژێ عیلم جێگای «اولول» بگرێتـەوە کاکـە!

کەر و بل باوی نامێنــێ، وەکـوو کـۆلارە هەڵـدەفڕی

لە جوابی پایەبەرزێکدا کە داوای هاوکاری لێ کردووە:

| | |
|---|---|
| قــودرەت و ســەروەت، جــاه و جــەلالت | پێــشکەش بەوانــەی پێیــان شــیرینە |
| سەد تف و لەعنـەت لـە قوربـان، قوربـان | لــە «ئاغــا فــەرمووی» یــەکجارم قینــە |
| خــۆم زەلیــل ناکــەم بــۆ فلــس و دینــار | ئــەویــش لــە ســایەی عیــززەتی دینــە |
| پـێم خۆشــە نـانی جـۆی ڕەشـی عـەباڵ | دوینــەی خەجیجــە و فاتــە و جەمینــە |
| کاڵـــە و کلاشـــی کـــاری هـــەورامان | نایـدەم بـە قـونرەی چـەرمی سـەکینە |
| ئیـسلام و عیــززەت، عــیلم و کەرامــەت | کــورد و شــەرافەت، ڕەسمــی دیرینــە |
| هەی هوو، چەن دوورین مـن و نۆکـەری! | ئەمــەش هــەر جــۆرێ کاســەلێــسینە |
| «ســەلام ســەییدی»، «ویرمەنــە دینــار»، | خۆیــەکــی پــیس و زۆر ناشــیرینە |
| ناکەومـــە پینـــەی درۆی ئاغایـــان | کــەوش و کراســی خــۆم ئەکــەم پینــە |
| ئــاخر مــن قورئــان وا لەســەر ســینەم | «الطیّبـــاتُ للـطیبینـــه» |
| مـن هەڵـوی بـەرزی لووتکـەی دالانـیم | هــەرگیز وەک قــالاو ناکەومــە چینــە |
| «حەســەن» بــۆ مــەقام نۆکــەری ناکــا | ســەدجار ڕیامــە ئــەو جــۆرە ژینــە |

ئەم دوو بەیتەشی بە گاڵتە و بە زبانی دۆستێکی کەوشدووریەوە گوتووە:

وه فیدای بالآت بام وه‌گر که‌سمه‌وه ئینه لنگوو تۆن ئینا ده‌سمه‌وه
هه‌ر دوو لنگ ساف و چه‌رمه‌ی بلوورەن وەسەت پەی زینەت، خاڵێوەش سوورەن

مەلا حەسەن دەوری ٩٠ ساڵی عومرکردووه و ئەگەرچی یەکجار نەوس‌کوژ بووه، دە ساڵی دوایی ژیانی زۆر بە دەسکورتی و هەژارییەوە تێپەڕ کردووه. لەبەر پیری و لاوازی وای لێ هاتووە دژوار ڕێگەی بڕیوه؛ بەو حاڵەش ناعیلاج بە لێڕەواردا گەڕاوە و چڵ و چێوی کۆ کردۆتەوە و بە کۆڵ کێشاویە. مامۆستایەک کە تا ئەو تەمەنە قەت گوێی بۆ دنیا شل نەکردووه و خۆی لە قەرەی دنیادۆستان نەداوه و تەنانەت دیاریشیانی وەرنەگرتووه، ئێستا بە پیری و زورهانی، بەو هەموو زانست و کەسایەتییە بەرزەوە، ناچارە فەرمانی شەرع بۆ «سدّجوع» بەڕێوە ببا و هەموو ئێوارانێک کاسەیەک هەڵگری و دەرکی ماڵی ئاغای دێ لێدا، بەشکوو چێشتێک بۆ خۆی و ژنە لە خۆی داماوترەکەی بێنێ!

بێ‌گومان ڕۆژێک منداڵانمان بە خوێندنەوەی بەسەرهاتی پیاوان و ژنانی وا، تێدەگەن کە سووچی گەورەیان ئەوە بووە زۆر کەوتوونەتە پێش ڕۆژگاری خۆیانەوە.

مەلا حەسەن سەرەنجام ساڵی ١٣٦٥ ک. م. لە دزڵی سەری یەکجاری نایەوە و هەر لەوێیان ناشت.

دیوانی *مەلا حەسەنی دزڵی مەردۆخی*، به کوشش احمد نذیری، چاپ ١٣٨٠. *چێشتی مجێور*، چاپ ١٩٩٧، پاریس، هەژار، ل ١٢٣ و ١٢٤.

## شەمسی قورەیشی

سەید بەهائەدینی شەمس، کەسناو «شمس‌الاشراف»، کوڕی سەید موحەممەد، کوڕی سەید «عبدالمطّلب» پاوەیی، پیاوێکی هێژا و شاعیرێکی توانا بوو کە بە کوردی و فارسی شیعری دەگوت و لە مزگەوتێکی شاری سنە بە ناوی «مزگتەهەژارە» بەرنوێژی دەکرد و لە حوجرەیەکیشیدا قوتابخانەیەکی دانابوو، منداڵان و تازەلاوانی بە نووسین و قورئان خوێندنەوە ڕادەهێنا.

شەمس شوێنگرتووی تەریقەتی نەقشبەندی و مریدی قوتبی عارفان، شێخ عومەر زیائەدین و مرۆیەکی پارسا، بە عیبادەت و یەکجار نەوس‌کوژ بوو.

چەند هۆنراوەی لێوە بەجێ‌ماوە؛ هێندێکیان بریتین لە: «*شمس‌العقاید*»، «*معراج‌نامە*» و «*مەلودنامە*»بە کوردی؛ کە هەرسێکیان چاپ کراون. هەروەها «*عقاید*»، بە شیعری فارسی و دیوانی شیعر، بە کوردی و فارسی.

خوا لێ خۆشبوو شەمس، باڵایەکی کورت، ڕیشێکی ناونجی و سەروسیمایەکی نوورانی هەبوو. دەوری ساڵی ١٣٦٥ ک. م. لە دنیا دەرچوو. بەم بەیتەدا وادیارە تەمەنی لە حەفتا تێپەڕی کردبێ:

دوای حەفتا ساڵ عومر ویەردە دڵ ژەنگ قەسوەت عیسیان ئاوەردە

**لەم شیعرەیدا باسی گۆشەگیری و نەوسکوژی خۆی دەکا:**

عیلمی بێبەهرە و درەختی بێسـەمەر مـن نامـەوێ
چاوی بێئەشک و فوغـانی بـێئەسـەر مـن نامـەوێ

عاشقێ کوڵمی لە ڕەنگی ئەشکی چاوی سوور نـەبێ
ڕۆژ نەناڵێ، شەو نەسووتێ تـا سـەحەر مـن نامـەوێ

ئـەو دڵـە دایم نـەڕێژێ خـوێنی پـەیکانی مـوژە
بێمەزەی تیری نگای گۆشەی نـەزەر مـن نامـەوێ

هەر دڵێ فارغ لە عەشقە و هەر سەرێ سەودای نییە
ئەو لە جوملەی خەڵقی ئینسان و بەشەر من نامەوێ

گەر لەسەر سینەی نیشانی داغـی هیجـران سـوور نـەبێ
یا لە دەردی دڵ نەبێ کونکون جگەر مـن نامـەوێ

دڵبەرێ گەر خوڵقی چاک و لەفزی شـیرینی نـەبێ
گەر ببێ حوسنی وەکوو شەمس و قەمەر من نامەوێ

خەرقەپۆشی و گوشـەگیری، بـۆ ڕەزای خـالق نـەبێ
بـۆ مـەعاش و جـەلبی دونیـا الحـذر مـن نامـەوێ

ماڵی دونیا غەیری حەسرەت عاقیبەت سوودی نییـە
زادی ئیمـان توشـەیە، بـاقی هـەدەر، مـن نامـەوێ

چاو لە موڵکی جەم بکە، تا موڵکی دونیا جەم نەکەی
تـاجی شـاهی داکـەوێ ئـاخر لەسـەر مـن نامـەوێ

بۆچ لەبەر کەم ئەتڵەس و دیبـای حـەریر و پـەڕنیان
غەیری کفنێ تۆ نەکـەی ئـاخر لەبـەر مـن نامـەوێ

فەقری خومم چاکە بە ئاسان تەی دەکـەم ڕێگـەی ڕویـن
کۆڵی سەنگین و سەفەر، ڕێگەی خەتەر من نامـەوێ

دەوڵـەتی دونیـا حیـسابی سـەختە ڕۆژی ئـاخرەت
ئیقتداری موڵک و باغ و دەشـت و دەر مـن نامـەوێ

بـەم هەژاریمـە لـە «مزگەوتـە هـەژارە»، گۆشـەگیر
گەر بدەن «شەمسا» جیهانم سەربەسەر من نامـەوێ

**تەخمیسی غەزەلێکی حافیز:**

جلوەی نور جمال و کشف ظلمت امشب است | نشئەی جام وصال ذات وحدت امشب است
وعدەی دیدار یار و بزم قُربت امشب است | «آن شب قدری که گویند اهل خلوت امشب است»
«یارب این تأثیر دولت از کدامین کوکب است»

مُشت خاك اندر کفت شد کوری چشم حسد | گردن خصم تو آمد رشتەی حبل المَسَد
دست بد آید بە سویت قطع باشد از جسد | «تا بە گیسوی تو دست ناسزایان کم رسد
«هر دلی در حلقەای از ذکر یارب‌یارب است»

تیر مژگان تو را هر کس نکردە جان هدف | یا ندارد شور عشقت کی بود اهل شرف
بستەی زلفم، نباشم رشتەی عقلم بە کف | «کُشتەی چاە زنخدان‌توام کز هرطرف»
«صدهزارش گردن جان زیر طوق غبغب است»

دانەی خالش گرفتە خرمن عمرم گرو | کردە داس ابروانش سبزەی جانم درو
تیر مژگان بر کمانش بین، چە خوش آید بە دو | «تاب خوی بر عارضش بین کافتاب گرم‌رو»
«در هوای آن عرق تا هست هر روزش تب است»

من گدای کوچە و او شاە بر تخت برین | کی رسد دست گدایان دامن شاە چنین
می‌کشد از لاغری نعش تنم موری حزین | «اندر آن موکب کە بر پشت صبا بندند زین»
«با سلیمان چون برانم من کە مورم مرکب است»

حاتم طی، از عطای وی شدش آوازە طی | ریزەخوار خوان او کیخسرو و شاهان کی
فاش گوید «شمس» همراە نوای ساز نی | «من نخواهم کرد ترك لعل یار و جام می»
«زاهدا معذور داریدم کە اینم مذهب است»

شیعرە عارفانەکانی شەمس، جێگایەکی تایبەتی لە نێو تەکیە و خانەقا و دڵی خەڵکی ، بەتایبەت لە شاری سنەدا کردۆتەوە و لە هەموو کۆڕی مەلوودییەکدا، دەنگ‌خۆشان بە هەوای جۆراوجۆر و لەگەڵ دەفدا دەیخوێننەوە دڵ و گیانی خەڵکی پێ دەگەشێننەوە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ موحەممەد سادقی نەقشبەندی

جێگری شێخ موحەممەد بەهائەدین و برای بچووکی شێخ عەلی حوسامەدینی نەقشبەندی، ساڵی ١٢٩٠ ک. م. لە گوندی «تەوێڵێ» هاتۆتە دنیا. سەرەتا لە قوتابخانە خوێندوویە و پاشان لای مەلا جاسمی سلێمانیوە دەرسی مەلایەتی تەواو کردووە و ئەوجار لە ژێر چاوەدێری برای پایەبەرزی (حیسامەدین)دا،

فێربوونی داب و دەستووری تەریقەت و سەیر وسولووکی دەسپێکردووە. پاش ئەمانـە لـە گونـدی «گوڵـپ» دامەزراوە و خەریکی خزمەت بە خەڵک و نیشاندانی تەریقەت بووە.

ڕەحمەتی شێخ موحەممەد سادق لە زبان و ویژەی فارسدا سەری دەرچـووە و خوازیـارانی زانـینی ئـەو زمانە لە کوردستانی باشوور، بەتایبەت دیوانی حـافیز و مەسـنەوی مـەولانا جەلالـەدینی ڕۆمـی، گرفـت و پرسیان بۆ لای ئەم هێناوە.

کۆچی دوایی شێخ موحەممەد سادق، دەوری ساڵی ١٣٦٥ ک. م. ڕووی داوە.

تاریخ المشاهیر الالویةُ العراقیّة، بەشی یەکەم، ل١٦٢.

## مەلا موحەممەد سەعیدی دێلێژەیی

کوڕی حاجی مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی، لە زانایـان و ناسـراوانی کوردسـتانە کـە سالـی ١٣٠٤ ک. م. لـە سلێمانی هاتۆتە دنیا و دوای تەواکردنی دەرس و دەور، لـە قوتابخانەیـەکی ئەوێـدا بـە نـاوی «خـومخانـە» دەرسی گوتۆتەوە و ساڵی ١٣٦٥ ک. م. سەری یەکجاری ناوەتەوە.

مەلا موحەممەد هێندێک بەرهەمی نووسراوەشی هەبووە؛ یەکییان کتێبێکە لە «فرایض» و «مواریث»دا، بە کوردی.

*تاریخ المشاهیر الالویةُ العراقیّة*، ج١، ل١٥٧. *عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٥٣٩.

## شێخ عەبدوڵڵای شەهبازی

حاجی شێخ عەبدوڵڵای شەهبازی، جێگری هێژای عارفی پارسا، حاجی شـێخ شـوکوروڵای سـنەیی[1]، لـە خەلیفە بەوەجەکانی شێخ حوسامەدینی نەقشبەندی بووە کە دوای کۆچی دوایی بـابی، لـە شـاری سـنەدا ڕێنوێنی و ئیرشادی خەڵکی گرتۆتە ئەستۆی خۆی و ژیانی بـە پارێزکـاری و دوورەپـەرێزی و سـەربەرزی تێپەڕ کردووە. خەڵکیش لە بەرامبەرەوە زۆریان ڕێز لێ گرتووە و جێی بـڕوا و متمانـەیان بـووە. بـەتایبـەت بازاڕییان لە کاروباریاندا چاو لە دەمی ئەو بوون و بێ بەرایی شێخ، دەسیان بە ئاودا نەکردووە.

حاجی شێخ عەبدوڵڵا ساڵی ١٣٦٥ ک. م. پاش ٧٠ ساڵ، دنیای بەجێ‌هێشتووە و لە پەنا گـڵکۆی بـابی، لە مزگەوتی «هاجەرەخاتوون»یان ناشتووە.

دوای ئەویش کوڕی ڕێزداری (حاجی شـێخ عوبەیـدیللای شـەهبازی) ئیرشـادی کـردووە؛ کـە ئـەویش دەوری ساڵی ١٣٨٥ ک. م. لە دنیا چووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٦١٠.

## سەید ئەحمەدی شێخ ئەحمەدی

کوڕی سەید حامید، لە پشتی باوەشێخ ئەحمەدی باینچۆیە کە ساڵی ١٢٧٩ ک. م. لە گوندی «کوچکچەرمگ» لەدایک بووە و هەر لە قوتابخانەی ئەوێ و لە ژێر چاوەدێری بابیدا، خوێندنی سەرەتایی ئایینی، تەواوکردووە. پاشان بە شێوەی فەقێیانی ئەو سەردەمە، بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەی، بۆ سەفەر چووە و ماوەیەک لە قوتابخانەکانی سنە و سەقز و مەریوان، هێندێک لە سلێمانی و قەرەداغ و هەڵەبجە، خزمەتی مامۆستایان گەیشتووە و لە کۆڕی دەرسیاندا دانیشتووە و تا بۆی دەستی دابێ، لێیان فێر بووە و سەرەنجام لە بیارە لای ڕەوانشاد مەلا قادری کانی‌کەوەییەوە ئیجازەی وەرگرتووە.

سەید ئەحمەد ئەمجار چۆتە ڕیزی مریدانی شێخ عومەر زیائەدینەوە و ماوەیەکی بە ڕیازەت و پاکژکردنەوەی نەفس تێپەڕ کردووە و پاشان لەسەر ئیزنی مورشیدەکەی، گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و لە گوندی «هەمرۆڵە»، لە پەنای پیری تەریقەت، شێخ نەجمەدیندا ــکە ئەودەم گەورەی سەیدەکانی باینچۆ بووە ــ گیرساوەتەوە و ساڵانێکی زۆر لەوێ دەرسی‌گوتۆتەوە و ڕێنوێنی خەڵک و لە نێوانیاندا دادوەری کردووە.

سەید ئەحمەد پیاوێکی پارێزکار وخێرخواز و خەڵکدۆست بوو، بەم بۆنەوە خەڵک زۆریان خۆش‌دەویست و گەورە و پچووک ڕێزیان لێ‌دەگرت.

دوای کۆچی دوایی سەید نەجمەدین لە ساڵی ١٣٣٨ ک. م. سەید ئەحمەد گۆزایەوە ئاوایی «کێلەچەرمگ»ی لای «حوسەین‌ئاباد» لە باکووری سنە و لە داهاتی موڵکێ کە لەوێی ساندبوو، ژیانی بەڕێوە دەبرد و خەریکی نووسین و وەرگێڕان دەبوو تا سەرەنجام ساڵی ١٣٦٥ ک. م. وادەی تەمەنی دوایی هات و مەلی گیانی لە هێلانەی دنیا هەڵفڕی.

لە سەید ئەحمەد ئەم کتێبە دەسنووسانە بەجێ‌ماوە، کە تا ئێستا هیچیان لێ چاپ نەکراوە:

١. وەرگێڕاوەی «*احیاءالعلوم*»ی ئیمام غەزاڵی تا ڕوکنی عیبادات

٢. «*کلام حضرت علی*»، بە ڕیزی ئەبجەدی

٣. وەرگێڕاوەی «*عینُ‌الفرائض*»، بە فارسی

٤. وەرگێڕاوی بەشێک لە «*فتاواءُالحدیثّیه*»ی شێخ ئیبنوحەجەر

٥. پەراوێز لەسەر کتێبی «*اعانةُالطّالبین*»، بە عەربی

٦. پەراوێز بۆ کتێبی «*عَقیدَةُالمَرضیّة*» لە کەلامدا، بە عەرەبی

٧. «*واجبات دینی*»، لەمەڕ عیبادەت و مامەڵەوە، بە فارسی

٨. «*ایمان و اسلام*»، لەمەڕ بڕواوە، بە کوردی.

وەرگیراو لە یاداشتی کاک سەید مەحموودی شێخ‌ئەحمەدی.

## مەلا عیسامەدینی ماجیدی

زانای پایەبەرز و بەناوبانگ، مەلا عیسامەدین، کوڕی عەللامە قازی عەبدولکەریمی ماجیدی، ساڵی ١٢٨٢ ک. ه. لە گوندی «درگا سلێمان»ی سەر بە شاری سەقز هاتە دنیا و لە ژێر چاوەدێری بابیدا گەورە بوو.

عیسامەدین خوێندنی قورئان و وانە سەرەتاییەکانی لە خزمەت باوکیدا و لە پەنا فەقێیانی تر دەسپێکرد و دوای ئەوە ماوەیەک لە سەقز بوو بە فەقێی حاجی مەلا قادری خەلیفەزادە و هێندێک لە «هێجانان»ی باشووری سەقز، لای خەلیفە مەلا ڕەحیمی هەوشاری خوێندی و سەرەتێک لە خزمەتی مەلا سادقی سەردەرابادی لە «ئاڵەکۆ» بەهرەی برد و لەم کاتەدا ـکە ببووە موستەعیدێکی زیرەک و زانا و زیاتر لە جاران وازی لە خوێندن و فێربوون بوو ـ ڕووی نا لە شارەزوور و چووە کۆڕی دەرسی مەلا عەزیزی مودەڕڕیس لە گوندی «پریس» و زۆرێک مایەوە و سەرەنجام ئیجازەی وەرگرت.

مەلا عیسام ئەگەرچی ئیجازەشی هەبوو، بەڵام لە هەرکوێ ناوی مامۆستایەکی شارەزای ببیستایە، خۆی دەگەیاندێ و سەرەتێک لە خزمەتیدا هەدای دەدا و بە حەز و وازێکی زۆرەوە لای دەیخوێند و لێی فێر دەبوو. بۆ وێنە لە «ڕەشەوێ» سەر بە مەریوان، خزمەتی مەلا موحەممەد ئەمینی مودەڕڕیسی گەیشت و پاش گەیشتن لە وەرامی زۆرێک لە پرسیارەکانی، لای ئەویشەوە موجاز بوو؛ لە موکوریان، لای مامۆستایان حاجی بابەشێخی سەیادەت لە «جەمیان»، مەلا سەید حوسەین لە «کانیە ڕەش»، حاجی مەلا کەریم لە «باغچە» و هەروەها مەلا عەلی حەفیدی وڵزی لە «تورجان»، هەرکام سەردەمێک خوێندی و لە زانستیان بەهرەی برد و سەرەنجام لە دارولعیلمی «تورجان»یش ئیجازەی ئیفتا و تەدریسی ساند.

مەلا عیسامەدین، کە ئەمجار بە شایەتی مامۆستایانی ناوبراو، یەک زانا هەمەزانەکانی ڕۆژگاری خۆی بوو، دەرس‌گوتنەوە و ڕێنوێنی خەڵک و دادوەری نێوانیانی دەسپێکرد و بە بۆنەی وردبینی و ئاکاری بەرزیەوە، یەکجار زوو لە نێوان خەڵکدا ڕێز و خۆشەویستی دەسکەوت.

مامۆستا لە دەورانی دەرس‌گوتنەوەیدا کەسانی زانای وای بارهێنا کە ئەوانیش بۆخۆیان سەرچاوەی خێروبێر بۆ دەوروبەریان بوون. بۆ وێنە خوا لێ خۆشبوان: مەلا موحەممەد ئەمینی شەریعەتی، مەلا حوسەینی عەلایی و حاجی مەلا ساڵەحی ڕەحیمی.

بەداخەوە خۆری ژیانی ئەم مامۆستا زانایە، ساڵی ١٣٢٥ ک. ه. )١٩٤٦ ز.)، کاتێ کە هێشتا ٤٣ ساڵی تەمەن بوو، ڕۆنیشت و دنیایەک زانستی لەگەڵ خۆی بردە ناخی خاکەوە.

وەرگیراو لە یاداشتی بنەماڵەی ماجیدی. ڕۆژنامەی *شهاده*، س٤، ژ١٦٥، ل٣.

## مەلا فەیزوڵای غەریب

زانایەکی خەڵکی «خانەگا»ی لای پاوە کە پاش خوێندن لە باشووری کوردستان، لە گوندێکی سەر بە

خانەقین، ماوەی دەساڵ بەرنوێژی کرد و دەرسی گوتەوە. ئەوجار گەڕاوە ڕۆژهەڵات و سێ ساڵیش لە زێدی خۆی خزمەتی کرد. دواجار لەسەر داوای عەلیخانی بەهرامی کەمانگەر «شجاع‌الممالک»، چووە گوندی «وەلیئاوای کۆرەدەرە» و لەوێ ساڵی ١٣٦٥ ک. م. ماڵاوایی یەکجاری لە دنیا کرد.

ئەو خوا لێ خۆشبووە لە مامۆستایان و شەرعزانانی هەڵکەوتەی زەمانی خۆی هاتۆتە ئەژمار و جاروبارەش شیعری گوتووە و ناوی بنەماڵەیی و نازناوی «غەریب»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## مستەفا مەزهەری سلێمانی

لە زانایانی باشووری کوردستان و سەیدەکانی بەرزنجە، بنەماڵەی قازانقایە کە ساڵی ١٣٠٧ ک. م. لە سلێمانی لەدایک بووە و ١٣٦٥ لە دنیا چووە.

مستەفا سەرەتا لە زێدی خۆی خوێندوویە و پاشان بۆ بەغدا چووە و ساڵی ١٣٢٢، دەورەی یانەی زانستی مامۆستایانی تەواو کردووە و بە شوێن ئەوەدا لە قوتابخانەیەکی شاری نەجەف بۆتە مامۆستا و لە چەند شاری تریش مامۆستایی کردووە. ماوەیەکیش بازرەسی قوتابخانەگەلی کەرکووک بووە و هەر بەم ئیشەوە، بۆ هەولێر و مووسڵیش چووە. سەرەنجام بۆتە جێگر و ئەوجار سەرۆکی مەعاریفی کەرکووک و هەر لەوێ لە دنیا چووە.

مستەفا مەزهەر فارسی و عەرەبی و ترکی باش زانیوە و مرۆیەکی هێژا، بەئاکار، جوامێر و خێرخوازی خەڵک بووە. ئەم شێعرە بەشێ لە قەسیدەیەکە مامۆستا بێخودی سلێمانی لە شینیدا گوتوویە:

دیسان هەوری بەڵا هات، سایقەی وەسڵی گوڵان ڕۆیی
شەوی ماتەم پەیا بوو، ڕۆژی خۆشی بولبولان ڕۆیی

تەمی غەم تا قیامەت بۆچی دانەگرێ وڵاتی کورد؟
کە زاتێکی وەفادار و نەجیب و خانەدان ڕۆیی

بچووک بۆ قوڕ نەپێوێ، گەورە تۆخوا بۆ بەکوڵ نەگری
کە عاسای دەستی پیر و هێزی ئەژنۆی گەنجەکان ڕۆیی

سەدای باوک و برا ڕۆی خەلق و گرمەی سینە، ناڵەی دڵ
وەکوو ڕەعدی بەهار ئەمڕۆ زەمین تا ئاسمان ڕۆیی

مشۆرخۆری گەلی میللەت جەنابی «موستەفا مەزهەر»
کە بانگی حوسنی خولقی بۆ هەموو کوردوستان ڕۆیی

لە غایب بوونی ئەو باوکی فەقیر و خادمی قەومە
لەسەر هوش و لە دڵ سەبر و لە تەن تاب و تەوان ڕۆیی



ئەگەرچی میللەتی کوردی دوچاری دۆزەخـی غـەم کـرد
بەڵام شوکری خوا، خوەی بۆ بەهەشتی جاودان ڕۆیـی
موحاسیب موهمەلی ئەم شعرە گەر جەمع و جبایەت کـا
ئـەزانێ کـەی ڕەوانی پـاکی بـۆ بـاغی جنـان ڕۆیـی
وەتەن! «بێخود» وەکوو منداڵـەکانی بـۆچ نەناڵـێنێ
«مودیری دایـرەی بـەرزی مـەعارف زی‌نـشان ڕۆیـی»

*دیوانی بێخود*. چەند گۆڤاری کوردی.

## زیوەری سلێمانی

مەلا عەبدوڵڵا، نازناو «زیوەر»، کوڕی مەلا موحەممـەد، کـوڕی مـەلا ڕەسـوول، ساڵـی ١٢٩٢ ک. م. لـە سلێمانی هاتۆتە دنیا و هەر لەو شارە خوێندنی دەسپێکردووە. بەشوێن ئەوەدا لە شارانی تری کوردستان، وەکوو مەریوان، مەهاباد، بانە، ڕواندز، هەولێر و کەرکووک، شوێنی گرتووە و سەرەنجام ئیجازەی ساندووە. پاشان ماوەیەک دەرسی دینی گوتۆتەوە و ساڵی ١٣٤١ ک. م. لە مەدرەسـەی روشـدییەی چەکداریـدا دامەزراوە و بووە بە مامۆستای وێژەی کوردی و فارسی و عەرەبی و ترکی. ساڵی ١٣٦٠ وەنیـشتە بـووە و سەرەنجام ساڵی ١٣٦٦ ک. م. لە تەمەنی ٧٣ ساڵاندا کۆچی یەکجاری کردووە.

زیور لە زمان و وێژەی کوردیدا شارەزاییەکی تەواوی هـەبووە و ترکـی و فارسیـشی بـاش زانیـوە بـەو زمانانەش شیعری گوتووە.

شیعر و پەخشانی زیوەر تەنیا لەمەڕ بابەتێک و دوانەوە نییە؛ بەڵکوو هەموو جۆرە باسی ئایینی، وێژەیی، کۆمەڵایەتی، نیشتمانی و ئەوینداری لێ بەجێ‌ماوە.

**چەند نموونە لە شیعرەکانی**:

جـەژنی ڕەمـەزان هاتـەوە، ئـەییامی سـورووره
لایێ بە نەوای عود و نـەی و چـەنگ و چەغانـە
واعیـز دەمـی بەسـراوە، وەکـوو فنـدق و بـادام
زاهیـد سـەری کـز کـردووە، بـازاڕی کەساسـە
بەم شارە بڵێم جەننەتـە تەسـدیقی ئەکـەن زوو
ئەم جەژنە کەوا مەنبەعی سەد ڕەحمەت و لوتفە
بۆ کوشتنی من کیسوەتی جەللادی لەبەر کـرد
جەمعییەتی خەڵکی هەموو وەک جەمعی سـەحیحە

هەر جێگە کە من سەیری ئەکەم مەجمەعی نوورە
بـازاڕ و دەر و کووچـە و کـۆ وادیـی تـوورە
یار پـستە دەهـەن مـوحیبی ئـەمواتی قوبـوورە
شاهید غەمی دەر کردووە، خوەی شەمعی حوزوورە
لایـێ هـەموو غیلمانـە، لـە لایـێ هـەموو حـوورە
ئـەو شـۆخە لەگـەڵ ئێمـە بـە عینـوان و غـورووە
بـالای سـەراپا کـە ئەڵـێی ئـاگری سـوورە
شادی لە دڵـی ئێمـە وەکـوو جـەزری کوسـوورە

«زیـوەر» چییـە؟ تـۆبیخەیـە بـەرتیری مەلامـەت
تۆ شاهی سـولەیمانی و ئـەو هـەر وەکـوو مـوورە

* * *

عەرەق ناخوەم کە تووشی دەردیسەر بم
گرفتـاری هـەزار ئـێش و خەتـەر بم
هەچی خوا حەز بکا ئەیکەم بە سیرڕی
ئیتـر بـۆ شەرمەسـاری نـاو بەشـەر بم
عەرەق ناخوەم کە عومرم کورت و کەم بێ
بـە گـەنجی بـۆ گرفتـاری زەرەر بم
عـەرەق نـاخوەم کـە دوچـاری وەرەم بم
هیلاکـی خەسـتەگی قـەلب و جگـەر بم
لـە بـۆن و بۆگـەنی بێـزارە تـەبعم
فیـدای ئـەمری خـودا و پەیغەمـەر بم
ئەگـەر فـەزڵ و هونـەر لـەم کارەدایـە
لە خـوا خواسـتەم وەهایـە بـێهونـەر بم

* * *

تکـانی ئابـڕووی چەمـەن بـە ڕووی ئابـدارەوە
شکانی نرخی نەستەرەن بە زولفی موشـکبارەوە
چمە لەمەی، لە نەی، لە جام، ئەگەر بە لەنجە بێتە لام
بـە ڕووی تابـدارەوە، بـە چـاوی پـڕخومارەوە
عـەرەق نییـە لـە عالـەما کـە لابـەرێ لـە دڵ خـەما
جگە لە قەترە عارەقێ لە ڕووت کە دێتە خـوارەوە
نیـشاتی مـن جەمالـی تـۆ، بـەراتی مـن وسالـی تـۆ
خەیاڵی من لە خاڵی تۆ بە عیشوە لێم مەشـارەوە
عەزیزەکەی حـەبیبی مـن، نگارەکـەی تـەبیبی مـن
کە شەقبەرێ ڕەقیبی من وەرە بە سەد وقـارەوە
فدای خەدد و قەددی تۆ، چەمەن بە فەوجی گوڵـیەوە
بە بوڵبوڵ و بـە چـڵیەوە، بـە قـومری و چنـارەوە
فەرەنگڕوو و زەنگموو، عەجـەمسـیاق و ڕووسخـوو
ئەناسرێ کە کوردە زوو بە پێچـی لار و خـوارەوە
نیـساری زولفـی عەنبـەری هـەموو ولاتی گوڵـعەمەر
بە عەرد و بەرد و دارەوە، بـە ئـاوی سـەرچنارەوە
ئەمن گەیاندمە «ئـەنوەری»، فنـوونی شـعر و شـاعری
ئەتۆی گەیانتە سامیری، بە چـاوی سـیحرکارەوە

* * *

باعسی دووریتـە گـەر دڵ ناڵـە و ئـەفغان ئـەکا
دەردی هیجرانە سەبەب گەر دیدە خوونئەفشان ئـەکا
هەر زەمان ناری فیراقـت دێتـە نـاو کـوورەی دەروون
میروەحەی ناڵەم لە هەر لا ئاگرێ پەخشان ئـەکا
تۆ کە جەللادی بە ئەڵماسی موژەت دڵ کون مەکـە
زەخمی ئەبرۆت کارییە چارەی لە هـەر دەرمـان ئـەکا
شەمعی ڕووت کەوتۆتە ناو زوڵمانی زولفـی وەک شـەوەت
دڵ وەکوو پەروانـە هـەردەم مـەیلی خۆسـووتان ئـەکا
نەوغەزاڵـێکی تیایــە دڵـــڕفێن و دڵــبەرە
سا بە خۆڕایی نییـە دڵ مـەیلی «کـانیئاسکان» ئـەکا
قەت بە مەقسوود و مەرامم ئاسمان دەوری نـەدا
بـاغی خەڵـکی دڵگوشـاد و بـاغی مـن وێـران ئـەکا
گەر هیلالی ئەبروانت بێتـە عەرسـەی زاهـیری
سەد وەکوو «زیوەر» بە جارێ دێـت و خـوەی قوربـان ئـەکا

*سۆزی نیشتمان، گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل٣٤. گۆڤاری *هیوا*،ساڵی یەکەم، ژ٩، ل٤١.

## مەلا عەبدولعەزیزی فەوزی

کوڕی حاجی مەلا موحەممەد ئەمین، کوڕی حاجی مەلا ئەحمەدی چاومار، ساڵی ١٢٩٢ک. م.[1] لە سلێمانی هاتە دنیا. خوێندنی لە کوردستانی باشوور لای مەلا ڕەحمانی پێنجوێنیوە تەواو کرد و ئیجازەی لێ وەرگرت. پاشان گەڕاوە سلێمانی و لە جێی بابی دەرسی گوتەوە و بەرنوێژی کرد. دوای هێندێک بە شێوەی فەرمی بوو بە موفتی و هاوکات کرایە ئەندامی کۆڕی زانیاری عوسمانی. ساڵی ١٣١٨ ک. م. کرایە موفتی شاری «بروسە» لە وڵاتی ترکان؛ بەڵام نەیکرد. ساڵی ١٣٢٠ بۆ شاری «ئورفە»ش ناوی دەرچوو؛ ئەویشی نەکرد و سلێمانی بەجێ نەهێشت. دوای دامەزرانی حوکمەتی عیراق، لەگەڵ ئەوە هەر موفتی سلێمانی مایەوە، سەرۆکی «مجمعُ الهدایةُ الاسلامیّة»شی پێ سپێردرا.

مەلا عەبدولعەزیز جێ ڕێزی هەموو چینێکی خەڵک بووە. تەنانەت خاوەن دەسەڵاتانی دەوڵەتیش، پلەی زانست و کەسایەتی بەرزیان لەبەرچاو گرتووە. ئەم زانایە پاش عومرێک ژیان بە سەربەرزی و خزمەتی زانستی و ئایینی، ساڵی ١٣٦٦ ک. م. لە دنیا چووە.

مامۆستا شیعریشی گوتووە و نازناوی «فەوزی » هەڵبژاردووە. ئەم چەند بەیتە هی ئەوە:

| | |
|---|---|
| پڕ زمان و دڵمە یارب! قُلْ هُو اللّە احَد | زیکر و فیکری زاهیر و باتینمە اللّە الصّمد |
| گێژەڵوولەی مەعسییەت ڕێگەی هیدایەت ون ئەکا | لَمْ یَلِدْ! ڕەوشەن کە بەرچاوم و لَمْ یولَدْ! مەدەد |
| نەفی و ئیسباتە کە زیکری ڕێ بە حەق پیشان ئەدا | وامنیش ڕێبواری ئەو ڕێیەم خودا بمکەی بەڵەد |
| مەشریق و مەغریب لە دەرکی زاتی تۆ کوێر و کەڕن | لَمْ یَلِدْ و اللّە ئەزەل چەشتت وَلَمْ یُولَدْ ئەبەد |
| عاقیبەت مەحموودی کردی چونکە ئیخلاس ئاخری | لَمْ یَکُنْ لە کاری پێکهێنای لەگەڵ کُفواً احَد |

پێشەکی و ل ٣١ی دیوانی بێخود. *عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ٢٩٥.

## مەولانا عەبدولعەزیمی موجتەهید

کوڕی مەلا عەبدولمەجید، کوڕی مەلا حەمزەی حەکاک، کوڕی مەلا عەباس، مەشهوور بە «ئەیاز»، لە پشتی زاهیدی بەناوبانگ، سلێمان بەگی بانە ـ کە لە مەدینەی پیرۆزدا نێژراوە ـ لە زنجیرەی شێخانی کاکۆزەکەرییین.

عەبدولعەزیم سەرەتا خوێندنی لای بابیەوە، کە پیاوێکی هێژا و مامۆستایەکی زانا بووە، دەسپێکردووە و دوای ئەوەش ماوەیەک لە قوتابخانەی «نەسیردیوان»، لای سەید عەبدوڵڵای چۆڕی چۆکی شاگردی داوە. پاش لە دنیا چوونی ئەو مامۆستایە، ساڵی ١٣٠٧ ک. م. ڕووی لە کوردستانی باشوور ناوە و سەردەمێک لە بیارە لە خزمەتی عەللامە مەلا قادری کانیکەوەیی خوێندوویە و سەرەنجام ئیجازەی وەرگرتووە. بە شوێن

---

[1] لە کتێبی «*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*»دا ساڵی ١٢٨٨ نووسراوە.

ئەوەدا ماوەی حەوت ساڵان لە پێشگای پیرۆزی شێخ زیائەدین عومەری نەقشبەندیدا تەریقەتی وەرگرتووە و بە لانشینی خانەقا، خەریکی سەیر و سولووک بووە و دوای پێ خەڵات بوونی کەڵپۆسی خاکەساری و وەرگرتنی ئیجازەی خەلافەت، گەڕاوەتەوە زێدی خۆی (شاری سنە) و تا دواکاتی ژیان لە چەند قوتابخانەدا، یەکیان مەدرەسە و مزگەوتی «تووبا خانم»، خەریکی تۆژینەوە و دەرس‌گوتنەوە و نووسین بووە.

موجتەهیدی ڕەوانشاد، زانایەکی بێ‌نیاز و هێژایەکی سەرفەراز بوو کە هەموو ژیانی بە خۆشناوی و نەوس‌کوژی و خزمەتی زانستی تێپەڕ کرد. یەکجار خواناس و پارێزکار و بێ تەما لە دنیا بوو. لە کتێب بەولاوە، دڵی سەر هێچ شتێ نەدەچوو. لە ماڵێکی فەقیرانەدا، بەو پەڕی سادەگییەوە دەژیا. لەگەڵ هەژار و دەوڵەمەند، مەزرینگەیی و بازاڕی و چەکدار و دەسەڵاتداردا ئاموشۆی دەکرد و هەموو زۆریان ڕێز لێ دەگرت. ئەگەر دەرسی دەگوتەوە، بۆ کەس پەکی نەدەخست و هەرکەس میوانی بووبایە، فەقێیەکان و دەرسەکەیان کاکەبەشانەیان هەبوو. قوتابییانیش یەکجار بە ئاواتی دانیشتن لە کۆڕی دەرسی مامۆستا و بەهرە بردن لە خەرمانی پڕپیت و پیرۆزی زانستی ئەو بوون.

مەولانا عەبدولعەزیم، کە خەڵکی سنە «مەلاولەزیم»یان پێ دەگوت، کتێب و نووسراوەیەکی زۆری لێ بەجێ ماوە؛ هێندێکیان بریتین لە:

١. پەراوێز بۆ «*جمع الجوامع*»، لە ئوسوولدا

٢. پەیوەست بۆ «*تقریب المرام*»، لە حیکمەتدا

٣. پەراوێز بۆ «*تحفه*»ی شێخ ئیبنوحەجەری هەیتەمی مەککی، لە فیقهدا

٤.پەراوێز لەسەر «*خلاصة الحساب و تشریح الافلاک*»ی شێخ بەهائەدینی عامیلی

٥. نامیلکەیەک لە سەلماندنی هەبوونی خوادا

٦. نامیلکەیەک لەمەڕ سۆفیگەرییەوە

٧. نامیلکەیەکی بەبەڵگە، لە بارەی پێویست بوونی شۆردنی پا لە دەسنوێژدا

٨. نامیلکەیەک لەمەڕ حەرام بوونی موتعەوە

٩. نامیلکەیەک لە بارەی ئیجتیهادەوە

١٠. نامیلکەیەک بۆ ڕەت کردنەوەی مەزهەبی وەهابی

١١. نامیلکەیەک باسی ئیمان‌هێنانی ئەبووتالیب، بابی حەزرەتی عەلی (د).

زا و مەرگی مەلاولەزیم ٤ی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٨٥ و بەیانی ڕۆژی هەینی ٢٣ی ڕەمەزانی ١٣٦٧ ک. م. هەردوو لە شاری سنە ڕووی‌داوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## حوسەین حوزنی موکوریانی

سەید حوسەینی حوزنی، نازناو «داماو»، کوڕی سەید لەتیفی موکوریانی، ساڵی ١٢٩٦ ک. م. لە مەهاباد هاتە دنیا[١] و هەر لە سەرەتای تازەلاویدا، پاش هێندێک خوێندن، هەوای لێکۆڵینەوە لە کورد و کوردستان و هەروەها ڕۆژنامەوانی کەوتە سەری. دوازدە ساڵان بوو، بۆ خوێندن لە مەهاباد دەرکەوت و لە ناوچەکانی باشووری کوردستان کەوتە گەڕان. ماوەیەک مۆرسازی و حەکاکی و وێنەگری کرد. پاشان لێبڕا ماشینێکی چاپ دەست بخا و ڕۆژنامە و کتێبانی پێ چاپ بکا. سەرەنجام ساڵی ١٩١٥ ز. توانی دەزگایەک لە ئاڵمان بسێنێ و بۆ یەکەم جار، بە ناوی «چاپخانەی کوردستان»، لە شاری حەلەب بیخاتە ڕێ. دوای ئەوەش، ساڵی ١٩٢٥ ز. چوو بۆ ڕواندز و لەوێ چاپخانەیەکی بە ناوی «زاری کرمانجی» دامەزراند.

لە مێژووی ڕۆژنامەوانی کورددا، حوزنی یەکەم کەسە و هەروەها یەکەم کەسێکە لەگەڵ توژینەوە لە مێژووی کورد و کوردستان، کتێب و نووسراوەی کوردی لەچاپ داوە.

مینورسکی ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی، لەبارەیەوە دەڵێ: «ڕاستییەکەی ئەوەیە کە حوزنی بۆ ڕوونکردنەوەی مێژووی کورد و ناساندنی میللەتەکەی، ئەوی لە دەستی هاتووە، کردوویە.»

هەروەها پڕوفسۆر واسیلی نیکیتینی کوردناسیش بە ئەمەگناسییەوە ئێژێ: «حوزنی بەسەر من و هەموو ڕۆژهەڵاتناسی ترەوە، زۆری منت هەیە.»

مامۆستا حوزنی لە مانگی ئاپریلی ساڵی ١٩٤٧ ز. (١٣٦٦ ک. م.)، لە شاری بەغدا ـ وەک دەڵێن ـ لە لایەن دەستە و دایرەی بریتانییەکانەوە، دەرمانخوارد کرا و کوژرا.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی**:

١. *خونچەی بەهارستان*، چاپی حەلەب، ١٩٢٥ ز.

٢. *خۆشی و ترشی*، چاپی ڕواندز، ١٩٢٥ ز.

٣. *بارهێنانی کرمی ئاوریشم*، وەرگێڕاوە

٤. *ئاورێکی پاشەوە*، لە ٣ بەرگدا

٥. *پێشەوای ئایینی*، ١٩٢٦ ز.

٦. *وێنەگەری و کۆڵین*

٧. *مێژووی کورد و نادرشا لە خاکی ئێراندا*، ڕواندز ١٩٣٤

٨. *مێژووی زەند*، ڕواندز ١٩٣٤ ز.

٩. مێژووی ناودارانی کورد، ڕواندز ١٩٣٤ ز.

---

١. مامۆستا هەژار لە چێشتی مجێوردا، شوێنی لەدایکبوونی، گوندی «نیچکە»ی لای بۆکان ناو دەبا؛ کە ئێستا نەماوە.



١٠. میژووی میرانی سۆران، ڕواندز ١٩٣٥ ز.

١١. *کوردی زەند*

١٢. *کوردستانی موکوریان*، ڕواندز ١٩٣٨ ز. و دەیان کتێبی تر کە چاپ نەکراون.

**گۆڤار و ڕۆژنامەکانی**:

١. گۆڤاری *ڕووناکی*، لە هەولێر، س١٩٣٦ ز.

٢. *زاری کرمانجی*، ڕواندز، س١٣٣٤ ک. م.

٣. *دەنگی گیتی تازە*، بەغدا.

*روزنامەنگاری در کردستان*، چاپ مهاباد، ل٦٢-٦٤.

*چێشتی مجێور*، چاپی دووەم، ٢٠٠٧، ل١٠٨-١١٢.

## مەلا حوسەینی پسکەندی

زانای پارسا، مەلا حوسەین، کوڕی حاجی‌خەلیفەی پیرۆتی پسکەندی، ساڵی ١٢٨٢ ک. م. لە گوندی «پسکەند» هاتۆتە دنیا و دوای خوێندنێکی سەرەتایی لە زێدی خۆی، چۆتە سلێمانی و لەوێ پاش ئەوەی بۆتە موستەعید، لای مەلا ڕەحمانی پێنجوێنی -کە ئەو سەردەمە لە سلێمانی دەرسی گوتۆتەوە ـ خوێندوویە و دواجاریش کە مامۆستا گەڕاوەتەوە پنجوێن، ئەمیش لە خزمەتیدا چۆتە ئەوێ و تا کۆتایی هاتنی دەرس و دەور، لەو زاتە بەهرەی بردووە و دوایی ئیجازەکەشی لە دەستی ئەو وەرگرتووە. ئەمجار گەڕاوەتەوە سلێمانی و لە مزگەوت و قوتابخانەیەکی ئەوێدا، مامۆستایی و بەرنوێژی کردووە. لەو دواییانەش، ماوەیەک لە «جامع کبیر»ی ئەوشارەدا دەرسی داوە و سەرەنجام لە ٢٨ی مانگی زیقەعدەی ساڵی ١٣٦٧ ک. م. ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە.

مەلا حوسەین مرۆیەکی بەڕێز و دیندار، زانایەکی هەڵکەوتەی دەورانی خۆی و شوێنکەوتووی تەریقەتی قادری و مریدی کاک ئەحمەدی شێخ بووە و زۆرێک لە مامۆستایانی هێژای دوای خۆی، وەکوو عەللامە شێخ عومەری قەرەداغی، لە خزمەتیدا دەرسیان خوێندووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ١٧٦.

## موحەممەد ئەمین زەکی‌بەگ

مێژووزانی ناودار و ڕامیاری زانا، کوڕی حاجی ڕەحمان، کوڕی موحەممەد ئاغا، ساڵی ١٢٩٧ ک. م. لە سلێمانی هاتە دنیا. سەرەتا لە قوتابخانەدا وانە سەرەتاییەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی فێر بوو. بە شوێنیدا، ساڵی ١٣١٢، چووە نێو مەدرەسەی فەرمییەوە و ماوەیەک لە سلێمانی و پاشان لە بەغدا خوێندی.

ئەوجار گەییشتە ئەستەمبووڵ و لە زانکۆی ئەفسەری، ئەندازیاری خوێند و بە باشترین دەرەجەوە تەواوی کرد. ساڵی ١٣٢٢ ک. م. بوو بە سەرپەلی لەشکری شەشەمی بەغدا و ساڵێک لەودوا، وەکوو ئەندازیاری لەشکری دووەم ناردرایە شاری ئورفە.

ساڵی ١٣٣٣، هاوڕێ لەگەڵ چەند ئەفسەری تری عیراقیدا، بۆ دەورەیەکی پسپۆڕی چوو بۆ فەڕانسە و ساڵێک مایەوە و پاشان گەڕاوە ئەستەمبووڵ. ساڵی ١٣٣٤ بۆ لەشکری یەکەمی ستادی ئەرتەشیان نارد و ساڵی دواتر بوو بە سەرۆک و بەرپرسی دەزگای ڕاگەیاندنی بەغدا.

پاش ڕووخانی حوکمەتی بەغدا، بە هێزە چەکدارەکانییەوە ڕۆی بۆ ئەستەمبووڵ و ساڵی ١٣٣٦ جێگری سەرلەشکری، لە لەشکری حەوتەمی ئاتاتورک (مستەفا کەمال)ی پێ سپێردرا. ساڵێ بە شوێن ئەوەدا، ناردیانە شەڕی فەلەستین و لەوێش ساڵێک مایەوە و ساڵی ١٣٣٨ ک. م. بۆ قەفقازیان هەنارد.

لە کۆتایی ساڵی ١٣٤٤دا گەڕاوە عیراق و بە پلەی سەرتیپی (جنرالی)، بوو بە سەرۆکی زانکۆی ئەفسەری. ساڵی ١٣٤٥ وەکوو نوێنەری سلێمانی، چووە پارلەمانی بەغدا و بەدووی ئەوەدا چەند جار بوو بە وەزیری کار و ڕێوبان و مەعاریف (١٣٤٧) و بەرگری (١٣٤٩ تا ١٣٥١ ک. م.) و سەرەنجام بۆ جاری دووهەم بوو بە نوێنەری پارلەمان.

ساڵی ١٣٦٣ بە بۆنەی نەخۆشی ڕۆماتیسم و ماندوویی زۆرەوە، دەستی لە کاری فەرمی بەردا و سەرەنجام ساڵی ١٣٦٧ ک. م. دنیای بەجێهێشت.

ئەمین زەکی‌بەگ میرێکی کارزان، زانایەکی هێژا و ڕامیارێکی خزمەتگوزاری نیشتمان و زمان و میللەتی خۆی بوو. بێژگە کوردی، عەرەبی، فارسی، ترکی، ئنگلیسی و فەڕانسەی باش دەزانی. جار ـ جار بە کوردی شیعری دەگوت. لە مێژوو، بەتایبەت مێژووی ڕۆژهەڵاتدا، بۆخۆی سەرچاوەیەکی جێبڕوا بۆ توێژەران بوو.

**هێندێک لە کتێب و نووسراوەکانی:**

١. *عثمانلی اردوسی*، بغداد، ١٣٢٤ هـ. ق.

٢. *عثمانلی اسفاری حقنده تدقیقات*، اسلامبول، ١٣٢٦ هـ.ق.

٣. *عراق نصل غایب ایتدک*، اسلامبول، ١٣٢٦ هـ. ق.

٤. *حرب عمو میده عثمانلی جبهه لری وقایعی*، اسلامبول ١٣٢٧ هـ.ق.

٥. *سلمان پاک، میدان محاربه سی وذیلی*، اسلامبول ١٣٣٨ هـ. ق.

٦. *عراق سفری الرّمز*، اسلامبول ١٣٣٧ هـ. ق.

٧. *بغداد وصول حادثه ضیاعی*، اسلامبول ١٣٣٨ هـ.ق.

٨ *عراق تاریخ حرب مختصری*، اسلامبول ١٣٣٩ هـ. ق.

٩. کورد و کوردستان لە سێ بەرگدا، بە کوردی، چاپی بەغدا

١٠. کوردانی بەناوبانگ، بە زبانی کوردی، چاپی بەغدا
١١. تاریخی سولیمانی، بە کوردی، چاپی بەغدا

بێژگە ئەم کتێبانە، نامیلکەی زۆری لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەستەمبووڵ و بەغدادا چاپ کراوە

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، عەلی کەمال باپیرئاغا، ل ١٠. *الاعلام*، زرکلی، ب٦، ل ٣٧٠. *گۆڤاری گەلاوێژ*.

## سالار موئەیید

میرزا ئەبولبەها مەلەکولکەلامی، ناسراو بە سالار موئەیید، کوڕی زانا و شاعیری بەناوبانگ، میرزا عەبدولمەجیدی مەلەکولکەلام (مەجدی)، پیاوێکی هێژا بووە و زۆرتر لەگەڵ شیعر و زبان و وێژەدا ژیاوە. لە شاری تاران دانیشتووە و لە مەزرینگەیەکی دەوڵەتیدا کاری کردووە و ساڵی ١٣٦٧ ک. م. لە تەمەنی ٦٣ ساڵاندا دنیای بەجێهێشتووە.

ئەم شیعرە بە ناوی «فداکاری در راه وطن»، واتا: خۆ بەخت کردن لە ڕێی نیشتماندا، شیعری ئەوە:

شنیدم کە در جنگ ژاپن و روس — چو بر شد ز هر دو سپە بانگ کوس
زن و مرد ژاپن بە راه وطن — گذشتند از هستی خویشتن
زنی بود زان قوم بشکستە بال — بدیدە بسی گردش ماه و سال
یکی نوجوان داشت هشیار و گُرد — بە هر کار و هر پیشە با دستبرد
پسر روز رفتی پی کسب مال — کە شب مادرش خسبد آسودەحال
قضا را شبی مادر و آن پسر — بە دریای فکرت شدە غوطەور
بە مادر چنین گفت پور دلیر — کە ای مادر نیکرأی و هژیر
شنیدم من امروز کز دشت جنگ — بە گردون شدە بانگ توپ و تفنگ
ز غُریدن توپ خارا شکاف — شدە قتلگاه جوانان مصاف
ز روسی سپاهی گران و گشن — نمودە است حملە بە سوی وطن
جوانان رزمآور این دیار — همە گشتە تازان سوی کارزار
مرا نیز باید شدن سوی جنگ — نزیبد در این کار لختی درنگ
مبادا ز دشمن زیانی رسد — وطن را غم ناگهانی رسد
چە گویی کنون، رأی و فکر تو چیست؟ — پس از من نگهدار و یار تو کیست؟
بدو گفت مادر کە ای بچەشیر — روان شو بە میدان چو شیر دلیر
بە میدان کین تاز با تیغ تیز — مکن همچو نامرد فکر گریز

اگــر خــواهی ای نورسـیده جـوان / کــه گــردد روانــم ز تــو شــادمان

سـر و جـان بـه راه وطـن کـن نثـار / کــه ایــن اســت آیــین مــردان کــار

یقــین دارم ای پــور بــا هنــگ و فــر / چــو گیــری پــی جنــگ راه ســفر

دلت سـوی ایـن مـادر خسته است / که دل بر چو تو نوجوان بسته است

پــی آنکــه نبــود خیالــت پــریش / شـتابان شـوی در پـی کـار خـویش

هم‌اکنون کـنم خویـشتن را هـلاک / مکـان سـازم انـدر دل تیـره خـاک

بگفت این و نوشید یـک جام زهـر / خبر منتشر گـشت در کـوی و شـهر

کـه اینگونـه جـان‌داد یـک پیـرزن / بــه صــد شــادمانی بــه راه وطــن

وطـن را چنـین حفـظ بایـد نمـود / کـه گـوی سـعادت ز میـدان ربـود

کـسی کـو نـدارد وطـن را عزیـز / تـو دیوانـه خـوانش، نـه اهـل تمیـز

وطن همچو جسم است و ما جـان او / بــه جــان بــود بایــد نگهبــان او

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## ئەسەدوڵڵاخانی کوردستانی

یەک لە ئازادیخوازانی گەورەی دەورانی سەرەتای مەشرووتەی ئێران و کوردێکی خەڵکی سنەیە کـە هـەر بە منداڵی زانستە سەرەتاییەکانی خوێند و ئەوجار لەگەڵ بابی چوو بـۆ ئەسـتەمبووڵ و لـە قوتابخانـەکانی ئەوێـدا، شـوێنی خوێندنەکـەی گـرت. دوای ئـەوەش دیـسان بـاوکی بردیـە تـاران و لـە مەدرەسـەی «دارولفونوون»دا کردیە قوتابی.

ئەسەدوڵڵاخان یەکجار زیرەک و لێهاتوو بوو؛ زبانی فارسی و فەڕانسەی وا قسە دەکرد، کەس نەیـدەزانی ئەو دوو زبانە، زبانی دایکی خۆی نین! ترکی و ئینگلیسیشی دەزانی.

لە بزووتنەوەی ئازادیخوازیدا، لە کوردستان لەگەڵ دەوڵەت بەشەڕ هات و یەکجار دلێرانە خۆی ڕاگـرت و ئەگەرچی لە تۆپی شەڕ سەری دەرنەدەچوو، بە تاقە تۆپێکی کـۆن ـکـە دەسـتی ئـازادیخوازان کـەوتبوو ـ هێزی چەکداری دەوڵەتی بەزاند و تێک شکاند. هەر لەو شەڕەدا، گوللەیەک لێـی دا و باڵـی برینـدار کـرد؛ بەڵام ئەو گوێی نەدا و چەند ساعەت بەو حاڵەوە، پاڵەوانانە شەڕی کرد.

لە دەورەی دووهەمی دانانی دەستووری ئێراندا، وەکوو نوێنەری کوردستان، چوو بۆ پارلـەمانی «شـوورای میللی» و یەک لە ڕێبەرانی فیرقەی «اجتماعیّون و انقلابیّـون» بوو. عەللامـەی دیهخـودا، لـە *لغتنامـە*دا، تێـر و تەسەل باسی کارەکانی ئەسەدوڵڵاخان دەکا. لە بەشێکیدا دەڵێ:

«در آن وقت کـه مجاهـدین دمکـرات دسـت بـه یـک سلسله تـرور و آدمکـشی زده بودنـد، اسـدالله‌خـان

کردستانی، در دو نطق معروف خویش ـ که در صورت‌جلسات مجلس شورای ملی مظبوط است ـ با بیانی سخت شیوا و دلنشین، هر دو فرقه را به جلوگیری از هرج‌ومرج دعوت کرد. آن بیانات در مجلس به طوری موثر واقع شد، که غالب وکلای هر دو حزب گریستند ...»

**واتا**: «لەو کاتەدا کە شورشگێرانی دموکرات زنجیرە ڕەشکوژییەکیان دەس‌پێوە دابوو، ئەسەدولّلاخانی کوردستانی، لە دوو وتاری شۆرەتی خۆیدا ـ کە لە سوورەتجەلەسەکانی مەجلیسی شوورای میللیدا نووسراوە ـ بە زبانێکی یەکجار پاراو و دلّبزوێن، لە هەر دوو دەستەی داوا کرد پێش بە ئاژاوە بگرن. ئەو قسانە لە مەجلیسدا ئەوەندە کاریگەر بوو کە زۆربەی نوێنەرانی هەردووک حیزب، گریان...»

کۆچی دوایی ئەسەدولّلاخان، ساڵی ١٣٦٨ ک. م. (١٩٤٨ ز.) لە تاران ڕوویداوە و لە زیارەتانی «ظهیرالدّوله»ی شمێراندا نێژراوە.

*دائرةُالمعارف یا فرهنگ دانش و هُنر*، ب١، چاپ ١٣٥٢ ک. ه. ٧٩٥. *اطلاعات عمومی ریاحی*، ل١٢١. *لغتنامەی دهخدا*، ل٢٢٦٤.

## شەرقی «مَلِکُ‌الکلامی»

حاجی میرزا عەبدولحەمیدی «ملکُ‌الکلامی»، ناسراو بە «امیرُالکتاب»، ناودراو بە «ابوسعید» و نازناو «شەرقی»، یەک لە خۆشنووسانی ناوداری ئەم دواییانەیە کە هێندێک نووسراوەی نایابی لێ بەجێ‌ماوە. ئەڵبەت ئەم مامۆستایە، بێجگە خەتاتی لە نیگارکێشی و شاعیری و نووسەریشدا، وا لە ڕیزی هونەرمەندان و ویژەوانانی خاوەن ناوی ئێرانەوە.

بابی شەرقی، پیتۆڵی پایەبەرز، میرزا عەبدولمەجید (مەجدی)یە، کە جیاواز باسیمان کرد. ئەمیش زەوقی یەکجار و لێهاتوویی سرشتی، لە باوکییەوە پێ گەیشتبوو؛ لە هەموو شێوە هونەر و زانستێکی جوانکاریدا، دەستێکی باڵای هەبوو. لە تەواوی شێوازەکانی خەتدا، وەکوو: نەسخ و نەستەعلیق و سوڵس و شکەستە و ڕوقاع، مامۆستای هەڵکەوتەی ئەم دواییانە دێتە ئەژمار. هەروەها بۆ وێنەکێشی، حەکاکی، ڕەسامی و گراویرسازی دەستنەخشینێکی تەواو بوو.

لە کار دیارەکانی ئەم مامۆستایە، کەتیبەی سەردەرگانەی کتێبخانەی میللی و مۆزەی ئێرانی باستانە. تەنانەت بەسەر دەرکی هێندێک لە قوتابخانە تازەکانیشەوە، شوێنی دەستی هونەرمەندی شەرقی هەیە؛ بەڵام لە کارە یەکجار بایەخدارەکانی، کەتیبەی سەر گڵکۆی خواجە حافیزی شیرازە کە بە خەتی سوڵس نووسیویە و بێ‌شک شاکارێکی گەورەی هونەری خۆشنووسییە.

«ملکُ‌الکلامی» سەرەتا لە سنەدا ئینشابەندی تایبەتی میری بوو. پاش سەرەتێک چوو بۆ تاران و ساڵانێکی زۆر لە نووسینگەی وەزارەتی داراییدا کاری دەکرد. ساڵی ١٣٠٧ ک. ه. )١٩٢٨ ز.) لەوێوە چووە

نووسینگەی سەرەکوەزیری و سەرەنجام ساڵی ١٣٢٨ (١٩٤٩)، لە سەر داخوازی خۆی وەنیشتە بوو.

«امیرُالکتاب» ماوەی خزمەتی، لەوپەری پاکی و بێگەردیدا بردەسەر. بۆخۆشی پیاوێکی ڕاست و دروست و جوامێر و خێرومەند بوو؛ بەڵام کەیفی بە ڕۆژگارەکە و بارودۆخی کۆمەڵگاکەی نەدەهات. لە زۆر شتان بە ڕەشبینییەوە دەیڕوانی و لەم دواییانەشدا تووشی تووڕەیی و تونەمەزاجی ببوو.

زۆربەی زۆری شیعرەکانی ڕەخنەیە و بەم بۆنەوە لە دیوانەکەیدا نەینووسیون؛ بەڵان بۆخۆی هەمووی لەبەر بوون و بۆ کەسێکی لێ دڵنیا بوایە، دەیخوێندنەوە. بیرێکی بێداد تیژی هەبوو؛ بە شێوەیەک کە زۆرتر شیعری ڕابردوانی لەبەر بوو؛ ئەگەر لە قسەیدا، بۆ بەڵگە هێنانەوە، پێویستی بزانیبا، یەک لە دووی یەک هەڵیدەدان. جارێک قەسیدەیەکی دوور و درێژی بخوێندایەتەوە، تەواوی دەچووە مێشکیەوە و تازە وەک لەسەر بەرد هەڵقەنرابێ، لێی نەدەسڕایەوە. لە زانستە وێژەییەکان و حیکمەت و بژیشکی کۆن و نوێ و مێژووی گەلان و ئایین و دەستە و بەستەیان و هەروەها گیاناسی و بارهێنانی گوڵدا، زانیارییەکی قووڵی دەسکەوتبوو.

**چەند پارچە شیعری مامۆستا شەرقی**:

به خواب اندرون دید صاحبدلی | چو وامانده بُد سخت در مشکلی
که بر وی عیان گشت ذات خدا | چو اهل جهان با کلاه و ردا
پس آنگه به دامانش زد هر دو دست | که ای از تو گشته همه نیست، هست
کُنم دامنت آنگه از کف رها | که سازی مرا عقده از کار وا
چو ابرام از حد طاقت گذشت | از آن خواب آشفته بیدار گشت
به دست اندرون دید دامان خویش | از این ماجرا گشت حالش پریش
بر عارفی رفت و خوابش بگفت | به تعبیر از این گونه از وی شنفت
که ای گشته از حال خود بی‌خبر | توی در جهان مصدر خیر و شر
به خوابت نمودند کاگه شوی | به راه خرد پویی ار رهروی
که از خود بخواه آنچه خواهی ز حق | که ما و توی نیست در این ورق
تو را همچو خویش آفریدیم ما | تو را از جهان برگزیدیم ما
توانائیت داده‌ایم آنچنان | که گر چُست بندی به کاری میان،
همه مشکلی بر تو آسان شود | خسک‌زار از تو گلستان شود

* * *

«شرقی» تو اگر دیده‌ور و راهروی | هان تا پی وسواس شیاطین نروی
موجود ز معدوم نیاید بیرون، | از نیست نیامدی که معدوم شوی

ای آنکه دلت به عشق و مستی است گرو — جز بر پی آنچه عقل گفته است مرو
در نزد خرد مستی و عشق است جنون — ای عاشق بیچاره برو نادان شو

زا و مەرگی شەرقی، سالانی ١٣٠٢ک. م. (١٨٨٣ ز.) لە شاری سنە و سێهەمی مانگی زیحەجەی ١٣٦٨ (١٩٨٩) لە تاران ڕوویداوە.

ئەم شیعرەش هی شادڕەوان عەلینەقی هووشیارە؛ بۆشینی شەرقی و مێژووی کۆچی دوایی ئەو دایناوە:

ای دریغا که اوستاد هنر — رخت بر بست از این سرا ناگاه
«حاج عبدالحمید شرقی» رفت — زین جهان خراب، وا أسَفاه
«میر کُتّاب بوسعید» که بود — خود به ملک سُخنسرایی، شاه
خَلَّدَ الله روحهُ فی الخلد — جَعَل الله جَنَّةً مثْواه
به وی الهام شد چو دعوت حق — بانگ زد: لا اله الّا الله
ارجعی ار به جان و دل لبیک — گفت و زد در جوار حق خرگاه
گفت: «هشیار» در چهارم مهر — که به ذیحجه بود سوم ماه
نیمەی شب به سال خورشیدی — «مات عبدالحمید، طابَ ثراه»[1]

گۆڤاری *اطلاعات ماهیانە*، س ١٣٢٨ ک. ھ . ل٢٤ و ٢٥ و ٣٦. گۆڤاری *ماد*، چ تاران.

## یۆنس دڵدار

کوڕی مەلا ڕەئووف، کوڕی مەلا مەحموود، کوڕی مەلا سەعدی «خادمُ‌السَّجادە»، ساڵی ١٣٣٧ ک. م. لە شاری کۆیە هاتە دنیا. هەر لەو سەروبەندانەدا باوکی بوو بە سەرۆکی ژمێرکۆی شاری ڕانیە و بە خاوخێزانەوە، چوون بۆ ئەو شارە و ماوەیەک لەوی ژیان. یۆنس لە تەمەنی دەساڵاندا لە ڕانیە خوێندنی دەسپێکرد و پاشان کە بەماڵەوە گەڕانەوە کۆیە، خوێندنی سەرەتایی لەوێ دوایی هێنا. ساڵی ١٣٥٤ بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەی چووە هەولێر و لە ساڵی ١٣٥٩دا پۆلی ناوەندی تەواو کرد و توانی بچێتە زانستگای بەغدا. ساڵی ١٣٦٥ لە ڕشتەی حوقوقی ئەو زانستگایە دەرچوو؛ کەچی سێ ساڵ لەودوا، لە تافی لاویدا ئەجەلی بێوادە سەری لێدا و بە نامرادی سەری‌نایەوە.

دڵدار لاوێکی هێژا، خاوەن زەوق، وریا، ئازا و نیشتمان‌دۆست بوو. هەر بە منداڵی حەزی لە شیعری کوردی دەکرد و هەرکوێ شیعرێکی شاعیرانی کوردی دەسکەوتایە، دەنووسییەوە و لەبەری دەکرد.

---

١. بە حیسابی ئەبجەد بەرامبەرە بە ١٣٢٨.

بەتایبەت وازێکی زۆری لە شیعری وەفایی، پیرەمێرد، مستەفابەگ، حاجی قادر، بێکەس و زیوەر بوو. هەروەها مێژووی کوردی زۆر دەخوێندەوە و نووسراوەکانی ئەمین‌زەکی بەگ و حوزنی موکوریانی و جەلال نووری، لە دەستی دانەدەکەوت. بە داخەوە مەرگی بێ‌وادە نەیهێشت بەو شێوە ئاواتی بوو، بە گەل و نیشتمانەکەی خزمەت بکا. ئەگەرچی هەر لەو مەودا کورتەی تەمەنیدا، چەند بەرهەمی بایەخداری داناوە کە هێندێکیان بریتین لە:

١. *فی طریقی الی معرفةُالحقایق*

٢. وتارێک لەمەڕ عومەر خەییامەوە

٣. *زمانی کوردی و ئەدەبیات*

٤. *اقتصادنا الوطنی*

٥. وتوویژەکانی یۆنس ڕەئووف دڵدار

شیعری دڵدار بەشێکی ئەویناری، بەشێکی نیشتمانی و پاژێکیشی ستران و گۆرانییە. ئەوا چەند نموونەی:

ئەی بادی شەماڵ! ئەی بادی شەماڵ! — پۆستەی هەوایی، دڵەی پڕ زوخاڵ
دەستم دامێنت، پەیک موژدەبەر — ئەگەر هات و ڕێت کەوتە کۆی دڵبەر
وەک عارەب دەخیل کە چوویتە ئەولا — مەوەستە تاکوو خیوەتی لەیلا
مەوەستە تاکوو لای شۆخێ کەوا — تیری نیم‌نیگای لە دڵدا ڕوا
پێ‌بڵێ گیانە لەم ڕێگە و بانە — لەم چەم و بێشە و هەرد و کێوانە
شێتێکی شەیدا و ڕووت و قووتم دی — فرمێسکی ئاڵی وەک یاقووتم دی
ڕووی لە خوێن خاڵی، زەعفەرانم دی — چاوی لێڵ و وێڵ پڕگریانم دی
بڵێ هەیکەلی وەک ئیسقانم دی — قەدی چەماوی وەک کەوانم دی
بڵێ خەیاڵی بەژن و باڵاکەت — تیشکی ڕووناکی شەوقی لاڵاکەت
نێرگسی شەهلای چاوی خومارت — خەرمانەی زولفی ماهی ڕوخسارت
فریشتەئاسا ساتێ هەزار جار — خۆ نیشان ئەدا، خۆی ئەدا حەشار
بڵێ ئێستەکەش ئەو ماڵوێرانە — ئەو کەژ مەسکەنەی وێڵی شارانە
هەر بە ئومێدی جەژنی ویساڵە — نازانێ تۆ نیت وێنەی خەیاڵە
جار ـ جاریش لە دوای ناڵەی دڵەی زار — فرمێسک ئەڕژێنێ وەک هەوری بەهار

* * *

ئەی ڕەقیب! هەر ماوە قەومی کورد زوبان — نایڕمێنی ڕانەیی تۆیی زەمان

ئێمە ڕۆڵـەی ڕەنگـی سـوور و شۆڕشـین سـەیری کـە خوێناوییـە ڕابوردومـان
کەس نەڵێ کورد مردووە، کـورد زینـدووە زینـدووە هـیچ نانـەوێ ئاڵاکـەمان
چەنـد هـەزار لاوانی کـوردی نەڕەشـێر بـوون بـە قوربـانی هـەموویان، نێـژران
لاوی ئێـستاش حـازر و ئامادەنـە جانفیدانـە، جانفیدانـە، جانفیـدان
لاوی کورد هەڵسانە سەر پـێ وەک دلێـر سا بە خوێن نەقشی ئەکـەن تـاجی ژیـان
کەس نەڵێ کورد مردووە، کـورد زینـدووە زینـدووە قـەت نانـەوێ ئاڵاکـەمان

## قەل و ڕێوی

وەرگیراو لە شیعرێکی لافونتینی فەڕانسی

ڕۆژێ لـە ڕۆژانـا قـەلێ ڕاوەسـتابوو لەسـەر چـڵێ
سـەلکێ پـەنیری لـە دەنـووک ویستی کە بیخـوا و لـێهەڵـێ
ڕێـوی بـە لایـدا تێپـەڕی چاوی بە قەل کـەوت و مەڵـێ
ویـستی بـە فێـڵێ لـێ سـەنێ دەسـیپێکرد پـێ هەڵبـڵێ
وتی ئـەی بولبـولی زەمـان ئەی نەغمەخـوانی سـەر تەڵـێ
بیـستوومە مـن ناوبـانگی تـۆ تـۆ خـوا گـوڕانیم بـۆ بـڵێ
قـەل وەخـتی زاری داچـڕان پـەنێری کەوتـە بـن‌تەڵـێ
ڕێـوی پـەنیری قۆزتـەوە بەلام لە پـێش ئـەوەی هەڵـێ،
وتی ئـەوجا بەسـە نـەفام گوێت لێبێ ڕێـوی بـۆت بـڵێ
وەختـێ شـتێکت گرتـە دەم کـەر مەبـە، گـۆرانی مەڵـێ
ئەمـەیش کەرانـە بـێ کـەوا تـەفرە دراوی تـۆ چەڵـێ

## کوردستان

کوردستانی خۆش! نیشتمانی جوان تـۆ قیبلـەگاهی مـنی بـێگومـان
چـاوم پـشکۆتووی شـاخەکانتە فێـری ژیـانی باخەکانتـە
دەنگـی شمـشاڵی شـوانەکانت زریـق و بـاقی جوانـەکانت
قاسـپەی کـەوانی قـەد کێوەکانـت خـوڕەی ئاوەکـەی نـشێوەکانت
ئەمانـە هـەموو گوێیـان کردمـەوە هەوێنی شـیعری دڵـیان گرتمـەوە
نەونـەمامێ بـووم لـەم خاکـە ڕوام بـە خۆشەویـستی ولات ئـاودرام
بەڵێ کوردستان! تۆ منـت خولـقان تۆ منت خولقان، پێت بەخشیم ژیان
خۆشـی ژیـانم خۆشـی ژینتـە ئێـشی ژیـنی مـن ڕۆژی شـینتە

چونکە کوردستان، نیشتمانی جوان! تــۆ قیبلــەگاهی دڵــی بــێ‌گومــان

* * *

زەدەی تــیری نیگــاهی فیتنەپــەردازی نیگــارێکم
گــراوی داوی زوڵــفی موشــکباری گوڵــعوزارێکم
ئەوەی نەیدیبێ ئێــشی دڵ وە یــا ئــازاری دڵــداری
چوزانێ مــن لــە ئێــشانی چ ســووتاو و فیگــارێکم؟
لە دەشتی نائومێدیدا بە دەم بایی قەدەر هــەروەک
پەلاشێ وام کە هەر ساتە لــە گۆشــە یــا کــەنارێکم
بە ڕۆژ ترساو و تاساوی زڕەی کاســەی شــەوی پێــشووم
بە شەو سەرخۆش و مەستی جامی قەهری ڕۆژگــارێکم
سەر و مایەی جوانی خۆم لە ڕێگەی ڕازی ئەو دانــا
لە دەرگانەی وەفــای هێــشتا هــەژار و لێوبــەبارێکم
ئەبێ چۆن پشت بە دڵداریم ببەستم تاکوو ئێستێکە
گەلێ دوورین لە یەکتر ئەو لە بارێ مــن لــەبــارێکم

**نیشتمان ئێشی دەوێ**

دڵ بە دووی ئەفسانە کەوت و وای ئەزانی وا ئــەبێ
ئێشی دونیا ڕەنجی پێ ناوێ بە خۆی کۆتــا ئــەبێ
نەیــدەزانی ئــەو بــە ئــارەق داری ئومێــد ئــاو بــدا
گەر بە خوێن پەینی بکا ئەوجا ئەسەر پەیدا ئــەبێ
لەفزی «نابێ» نابێ بیــزانی کــە لاوی کــوردی تــۆ
هەر بە کۆشش دێتە بەر، باغی ئەمەل ئیحیا ئــەبێ
تــالیع و ئیقبالــە وەهمــی پایەبەنــدی بــێ‌هونــەر
عەزمی مەردانت هەبێ هەرچیت نیاز بــێ وا ئــەبێ
ئەی‌برا! لادە لــە فیکــری کــۆن و زوو ســا ڕاپــەڕە
کارەکەت جارێک بخە، ڕەنجت هەبێ خۆی چــا ئــەبێ
مردنــە ژینــت بــە بێکــاری لــە ســستی لابــدە
هەر بە ڕەنجی لاوی وەک تۆ نیشتمان ئــاوا ئــەبێ

*دیوانی دڵدار*، چ هەولێر، ١٩٧١ز.

## میرزا قادری تەوێڵێ

کــوڕی موحەممــەد، کــوڕی یۆســف، کــوڕی وەســتا موحەممــەد، خەڵــکی گونــدی تەوێــڵێ، مرۆیــەکی تێگەیشتووی خاوەن زەوقی شیعر بووە کە بە کوردی هەورامی و فارسی شیعری گوتووە.

لە کتێبی «*پیرشالیار*»دا باســی کــراوە و تاقــە شــیعرێکی دانــدراوە کــە ســاڵــی ١٣١٩ داینــاوە و خەڵــکی ڕاسپاردووە لە بیری تفاقی زستان بۆ خۆیان و ئاڵف بۆ مەڕ و ماڵاتیاندا بن، زستانێکی تووش لە پێشە؛ نەکا لە



تۆفی سەرما و سۆڵەدا بکەونە فەرتەنەوە. ئەوا چەند بەیت لەو شیعرە:

تاریخ جە هەزار، سێسەد، بیستونۆ ئەوزاع ئەمساڵ جە لات مەعلووم بۆ
هەرکەس ماڵدارەن با ڕزقش جەم بۆ نەکای جە وەهار، ئەوزاعش کەم بۆ
ڕەوغەن و گەنم، برنجی شاران ئامادە کەردێ بێ حەد و پایان
بێدەوڵەت! دوو دەس بدە وە سەردا پەلاس وە قایم بکە وەبەردا
بە بێ تۆز و گەرد بە ڕووی هەواوە شیپەرێ «شاهۆ» جە پشت «پاوە»

زا و مەرگی میرزا سالانی ١٢٩١ ک. م. و ١٣٦٩ ڕوویداوە.

*پیرشالیار*، ل ٦١.

## مەولانا سادقی نیەری

مەولانا موحەممەد سادقی مینبەری نیەری، کە ساڵی ١٢٨٨ ک. م. لە گوندی «نیەر»ی ناوچەی ژاوەرۆ هاتۆتە دنیا، شەرعزانێکی پایەبەرزی شارەزای زانستە ئایینییەکان، بەتایبەت لە ئوسوولی فیقهـ و هەیئەتی کۆندا، مامۆستایەکی تەواو بوو؛ ژیانی لەگەڵ دەرس‌گوتنەوە و فتوادان و پارساییدا بردەسەر و لەوپەڕی پاکی و پاکداوێنی و دوورەپەرێزیدا ژیا. تێکەڵی دەسەلاتداران نەدەبوو؛ بەلام لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا ئامووشۆی دەکرد و بۆ ڕێنوێنی و ڕاسپاردنیان بە چاکە و پرینگاندنەوەیان لە خراپە، هەموو جۆرێک تێدەکۆشا و تا ئەو ڕۆژەش بەسەر ئەو دنیایەوە بوو، خەڵک، لە هەموو چینێ، ڕێز و حورمەتێکی تایبەتیان بۆ دادەنا.

مامۆستا ساڵی ١٣٦٩ ک. م. لە شاری سنە گیانی پاکی بە خودای تاک ئەسپارد و لە زیارەتانی «پیرغەریب»دا ئەسپەردەیان کرد.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ موحەممەد تاهیری هەولێری

کوڕی شێخ عەبدولقادر، زانایەکی سۆفیمەشرەب و دینداری خەڵکی هەولێر بووە کە خوێندنی لە «رواقُ‌الاکرادی» زانستگای ئەزهەری میسردا تەواو کردووە.

**لە کتێبەکانی**: نامیلکەیەکە بە ناوی «*تحفةُالعباد فی حقوق الزَّوجین و الوالدین و الاولاد*» کە ساڵی ١٣٤٧ ک. م. هەر لە ژیانی خۆیدا، چاپ کراوە.

شێخ قادری بابیشی پیاوێکی هێژا بووە.

پێشەکی *تحفةُالعباد*.

## پیرەمێرد

حاجی تەوفیق‌بەگ، ناسراو بە «پیرەمێرد»، کوڕی موحە ممەد ئاغا، کوڕی هەمزاغای مەسرەف، ساڵی ١٢٨٥ ک. م. لە سلێمانی هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکرد. پاش ماوەیەک لە شاری بانە و چەند شوێنێکی‌تر، شوێنی دەرس‌ودەورەکەی گرت و دوایی گەڕاوە سلێمانی. ساڵی ١٣٠١ لە سەرژمێری ئەو شارەدا بەشداری کرد و چوار ساڵ لەودوا، کرا بە سەرۆکی دادگای شارباژێڕ. لە ساڵی ١٣١٤دا بوو بە جێگری دادستانی شاری کەربەلا و ١٣١٧، هاوڕێ لەگەڵ شێخ سەعیدی حەفید ـ بابی شێخ مەحمووی نەمر ـ چوو بۆ ئەستەمبووڵ و ساڵی دوایی، هەر لەوێوە و پێکەوە چوون بۆ حەج. لە گەڕانەوەدا، پیرەمێرد گەڕاوە ئەستەمبووڵ و دوای ساڵێک چووە مەدرەسەی حوقۆق و لەو زانکۆیە لیسانسی وەرگرت. ساڵی ١٣٢٤ ک. م. بوو بە بریکاری داد و هەر لەو سەروبەندانەدا، بۆ چەند گۆڤار و ڕۆژنامەی ئەستەمبووڵ، بە ترکی و فارسی، وتاری دەنووسی. زیاد لەوە بۆ دوو ڕۆژنامە لە تارانیش، بە ناوی «*شفق سُرخ*» و «*فرهنگ*» دەینووسی و بە ناسراوێکی هەمەدانیدا کە لە ئەستەمبوول دوکانی قەڵەم و کاغەز فرۆشی و بلاڤۆکە ئێرانییەکانی هەبوو، بە واژۆی «سلیمانیّە توفیق»، یان «س. ت.»وە، بۆیانی بەڕێ دەکرد.

پیرەمێرد ساڵی ١٣٢٨ ک. م. کرا بە جێگری حاکمی «جۆڵەمێرگ» و ١٣٣٧ بوو بە فەرمانداری «ئاماسییە» و سەرەنجام ساڵی ١٣٤٤ گەڕاوە زێدی خۆی و دوای ساڵێک سەرپەرشتی ڕۆژنامەی «*ژیان*»ی گرتە ئەستۆ؛ کە حوسەین نازم، شارەداری سلێمانی خاوەنی بوو. ساڵی ١٣٥١ حوسەین نازم عەمری خوای کرد و لەو کاتەوە تا ساڵی ١٣٥٦، پیرەمێرد بە تاقی تەنیا ئەو ڕۆژنامەیەی گەڕاند. لەو ساڵەدا بۆخۆی ڕۆژنامەی «ژین»ی دانا و ماشینێکی چاپیشی بۆ باشتر بەڕێوەچوونی کارەکەی ساند. ژین تا دوا کاتی ژیانی پیرەمێرد، بە بێ هێچ گت و وەستانێک دەردەچوو.

پیرەمێرد لەگەڵ زانیاری و ڕۆژنامەوانی و هەموو لێهاتووییەکیدا، شاعیرێکی بەرزیش بووە کە خەڵکی خۆش‌ویستووە و سەری لەڕێی نیشتمانەکەیدا داناوە. دیوانەکەی سەرانسەر شیعری وەتەنی، کۆمەڵگایی، ڕامیاری و جاروبار ئەویندارانە و گاڵتەیە. ئەو بێجگە سۆرانی، کوردی گۆرانیشی زانیوە و شارەزای فارسی و عەرەبی و ترکیش بووە و جارـ جار بە فارسی و ترکیش شیعری گوتووە.

کۆچی یەکجاری پیرەمێرد، ساڵی ١٣٦٩ ک. م. لە شاری سلێمانیدا ڕووی‌داوە و لە زیارەتانی «گردی مامە یارە»دا نێژراوە.

دیوانی پیرەمێرد ساڵی ١٣٨٧، بە پێداچوونەوەی موحەممەد ڕەسووڵ هاوار، لە بەغدا چاپ کراوە.

**چەند شیعری پیرەمێرد** :

**دیاری**

گیانە وەنەوشە و چنوور لەگەڵ گوڵ    سەودای دیدەنی تۆیان کەوتە دڵ

چنـــوور لــە کێــوان، وەنەوشــە لــە چــەم
گوڵ لە گوڵستان یەکیان گرت سـەرجەم
هاتنـــە لام وتیـــان: تـــۆ ڕابـــەرمان بـــە
ئەمـەمان بـۆ بکـە و تـاجی سـەرمان بـە
ئـــەوا هەرســـێکم بەســـتن بـــە دەســـتە
هاتنـــە خزمـــەتت بـــە دەســـتی بەســـتە
هــەر یــەک بــە ڕەنگــێ مــەرامی پێتــە
بـــۆ نیـــازی خـــۆی خـــاکی بەرپێتـــە
چنـــوور بـــۆ زوڵـــفت لـــوول و پەشـــێوە
وەنەوشـــە ملکـــەچ خاڵـــی لای لێـــوە
گـــوڵ کـــە نـــازکی گۆنـــای تـــۆی دیـــوە
چەقڵی خـۆی لـە ژێـر پێـی هەڵـچەقیوە
تـــۆ پایەبـــەرزی شـــای شـــیرین‌ئەنـــدام
بـــا لـــە ســـایەتا بگـــەن بـــە مـــەرام

**من و ئەستێرەکان**

ئەستێرە بـەرزەکان ئەدرەوشـێنەوە بـە شـەو
وەک من بە داخەوەن، نە سرەوتیان هەیە و نە خـەو
چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێـداری یـەکترین
وەک سەر سەرین، شەوێ سەرناکەینە سەر سەرین
من خوار و ژوور لەدەس‌چووەکەی بێوڵەتم ئـەوان
وەک خێڵی خوار و ژوور کـەری کـورد، وێـڵی ئاسمـان
شـەو شـەونمی ئەوانـە چەمـەن ئـاو ئەخواتـەوە
ڕۆژ هەڵـمی ئـاوی چـاوی منـە سـەریەخاتەوە
دوێ‌شەو بـەری‌بـەیان بـوو ئـەگریان بەسـەر منـا
منیان کەساس ئـەبینی لـە نـاو دۆسـت و دوژمنـا
دڵسۆزی وام نەدیبوو، کە بۆم بگری وەک خەشیم
فرمێـسکەکەی ئـەوان بـوو بـە ئـاونگی تیگـەییم
بام ڕاسپارد بڵێ کە خەفەت بۆچ ئـەخۆن ئـەوان؟
وەک ئێمـە نـین نزیکتـری لای بارەگـای خـوان
ڕاسپێری هاتـەوە کـە بـڵێ خەڵـکی سـەرزەمین
نابـێ لـە دەسـتی کردەوەتـان بـێ‌خەفـەت بـژین
ئاهـــ و نـــزای کـــوردی شمـــاڵ گەییـــە ئاسمـــان
بـەو دووکـەڵـی هەناسـەیە ئـاو دێ لـە دیـدەمان

* * *

بـــۆ خزمـــەتی یـــار، بـــۆ خزمـــەتی یـــار
ئەمـــشەو ڕێکـــەوت بـــۆ خزمـــەتی یـــار
نە ڕێی حەسەس بوو نـە بـەد نـە ئـەغیار
تـــەنها ســـەعاتێک تـــەنها مـــن و یـــار
شـــەو خەرقـــەی نیلـــی قـــەترانی پۆشـــا
کـــەڵەشـــێر بێـــدەنگ نەدەخرۆشـــا
مورغی عەرش لە جێی خۆی هەڵنیـشتبوو
دیـــاربوو مانـــدوێتی ڕۆژی چێـــشتبوو
کاکێـــشان بـــاری کـــەری کـــەوتبوو
کای ڕەشـکەی لـەسـەر ڕێ هەڵڕشـتبوو
گـــای حەوتەوانـــە کـــای زۆر خواردبـــوو
هەوسـاری بەدەسـت قوتـب سـپاردبوو
ئەو شەوە لەیلا و مـەجنوون یـەک‌کـەوتن
بـەڵام لـە خۆشـیا هـیچ نەئەسـرەوتن
ئاواتـــەخوازی خەڵـــک هـــاتبووە دی
لـــە ڕێـــی ئـــەفلاکا جووڵـــەت نەئـــەدی
هەسـتام خـۆم گـورج کـرد، ئـازا، شـێرانە
نـەمئـەوت هیچکـەس لـە لام ئینـسانە

خەرقەی شەوگەردیم کێشا بەسەردا — چاکی داوێنم کرد بە کەمەردا
ڕۆیم تا گەییمە بەر دەرگاکەی لەیل — لەوێ بوبوومە قەیسەکەی دوجەیل
چوومە ژوور سەری لە نیوەشەودا — ئێشکچی کچان هەموو لە خەودا
لەسەر خۆ پێمنا، چوومە سەرینی — ماچم کرد خاڵی لێوی شیرینی
چاوی هەڵبڕی سەوڵی خەرامان — یاخەی کردەوە سەر تا بە دامان
وتی: کام بێشەرم لە نیوەشەودا؟ — ڕاستی کردمەوە لە شیرین خەودا
بەرقی ڕوخسارم بدات لە جەستەی — هەڵیقرچێنێ ئەندامی خەستەی
وتم: ئەی شەمعی ڕووی نازەنینی — پەروانەکەت هات تا بیسووتینی
بە ئومێدی سەر نەهاتمە ئێرە — من قوربانی تۆم بمکوژە لێرە
من شۆری عەشقت بێترسی کردووم — هەرچەند کە زیندوم لە ڕیزی مردووم
بەڵام چاوی تۆ کەوا بیمارە — باش نییە لە لای ئەو ئەم کوشتارە

* * *

ڕۆژی تازە، ساڵی تازەی ئێمە هات — ڕۆژهەڵات ڕۆژی هەڵات، سەرما هەڵات
بای بەهار هات خاکی زیندوو کردەوە — بۆیە نێرگس چاوی مەستی کردەوە
نەوجوانی هات و پیری بردەوە — تیشکی ڕۆژ دەرکەوت تەمی لابردەوە
هەردە سەوز و مۆرە وێنەی بەرگی بووک — شایی دەنوێنێ چراخانی گڵووک
شەونمی ناو لالە بادەی بولبولە — بەو مەیە سەرخۆشە وا شەیدای گوڵە
چونکە خوشئاوازە هەم ئاواتەخواز — زۆر بە سۆزە ناڵەکەی وەک سۆز و ساز
هاتە جونبوش ئاو و سەوزە، باخ و دەشت — دەوری کانی بوو بە گوڵزاری بەهەشت
ئەو بەهەشتە خۆشە جێی بەزمی جەمە — دەم بە دەم جێی یەکدەگیری هەمدەمە
بورجی بەرخە ڕۆژ سەرئەفرازی ئەکا — بەرخی ئێمەش بۆیە وا بازی ئەکا

* * *

دڵ بریندار بێ نەوەک ناسۆری تیری تانە بێ
سینە چاکی چاکە بۆ تیری موژەی نیشانە بێ
عەشق کە کەوتە کەللەوە، هەر ڕێیە بگرێ ڕێی ئەوە
یەکسیاقە حەقپەرەستی، کەعبە یا بوتخانە بێ
خواپەرەستی باتنێکی پاک و بێگەردی ئەوێ
سوبحە تەوقی زاهیدە، سەدجار ئەگەر سەددانە بێ

پێکەنینی دولبەران میقداری عسمەت کەم ئەکا
لێوی غونچە هەر ئەوندە نازکە تا وا نەیێ
خاڵەکانت دانەدانەن، چاوەکەم چاوی منیش
تا بڵێن چاو لەو ئەکا فرمێسکەکەی با دانە بێ
خوا ڕەقیب ئاوارەکا ساتێک لە پێش چاوم نەبێ
خۆشە لام ئەو تا نەبێ، تاکەی لە چاوما تانە بێ

**سکاڵا**

خوایە! ئەم دڵەم هێزێکی بەرێ — کە غەم لە ناو خۆی بکاتە دەرێ
من خۆم نازانم چی بۆ من چاکە؟ — تۆ بە مەیلی خۆت دڵم ئاواکە
پایەی تۆ ناسین ئەگەر دەرکەوێ — ئیتر کێ دونیا و دیناری ئەوێ؟
من کە دێوانەی تۆ بم بە تەنیا — شەقێک هەڵئەدەم لە هەردوو دونیا
دڵم هەمیشە یادی تۆ ئەکا — گیان لە ڕێی تۆدا جست و جۆ دەکا
بەهەشت مەدح ئەکەن بە ناو و داوێ — من لیقای تۆم بێ بەهەشتم ناوێ
عاشق کە بە ڕاست دەستی لە گیان شت — پەکی سەیران و گەڕانی خۆی خست
دیارە کە یاری ئەو وەفایە دی — کامی ویسالی بۆ دێنیتە دی
خوایە! ئەیزانی کە من تۆم ئەوێ — مەعشووق چەرایەی بە تۆ دەکەوێ
خوایە! نامەوێ تاعەتم زۆر بێ — نەوەکا نەفسم بەوە غللۆر بێ
خۆم بە گوناکار ئەدەمە قەڵەم — تۆ خۆت فەرمووتە حەز لە عەفو ئەکەم

**نەورۆز**

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە — جەژنێکی کۆنی کوردە بە خوشی و بە هاتەوە
چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێپەست بوو تاکوو پار — هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار
ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بوڵەندی کورد — موژدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیک ئەبرد
نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە — لاوان بە عەشق ئەچوون بە بەرەو پیری مەرگەوە
وا ڕۆژهەڵات لە بەندەنی بەرزی وڵاتەوە — خوێنی شەهیدە ڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە
تا ئێستە ڕووی نەداوە لە تاریخی میللەتا — قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا
پێی ناوێ بو شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین — نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین

**بەرهەمە چاپکراوەکانی پیرەمێرد:**

١. شانۆنامەی *مەم و زین*
٢. *دوازدەسوارەی مەریوان*
٣. دیوانی شیعر
٤. *کەمانچەژەن*، وەرگێڕاوە لە دوو بەرگدا
٥. *گاڵتە و گەپ*
٦. پەیوەست و پەراوێز بۆ *دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی*
٧. *پەندی پێشینان*
٨. *شەریف هەمەوەند*
٩. مەحموود *ئاغای شێوەکەڵ*

*دیوانی پیرەمێرد*، چ بەغدا، س ١٩٧٠ ز.
*مێژووی ئەدەبی کوردی*، چ بەغدا، ل٤١٨.

## مەلا موحەممەدی مودەڕڕیس گورجی

حاجی مەلا موحەممەدی مودەڕیس گورجی، کوڕی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، مامۆستایەکی بێنیاز و بەرزەمژ و پارسا بوو، بە سەر و سیمایەکی ڕۆشن و ڕووی خۆش و دڵی گەورە و دوور لە ڕەشبینی و ڕق و قینەوە. وەکوو خەڵکی هەژار دەژیا و بێزی لە زەرق و بەرقی دنیا دەهاتەوە. جل و بەرگێکی هەرزانبایی لەبەر دەکرد و خواردنی هەمیشە فەقیرانە بوو. لەگەڵ کەمدەست و کەمدەسەڵاتاندا، زۆر تێکەڵ بوو؛ ماڵیان دەچوو؛ سەر سفرەیان دادەنیشت. بەڵام خۆی لە دەوڵەمەندان و دەسچوان دەپاراست و ئاموشۆی نەدەکردن.

مەلا موحەممەد هەر لە جێگاکەی باوکی لە مزگەوتی «مەلا جەلال»ی سنەدا دەرسی دەگوت و کاتێ دەرس‌گوتنەوەی دەسپێدەکرد و فەقێیان بە دەوریدا ئاڵقەیان دەبەست، پێی خۆش بوو ئەوی دەیزانێ لە دانیشتنێکدا، هەموو فێری ببن. زۆر دۆستانە لەگەڵ شاگردەکانیدا دەجووڵایەوە و لووتبەرزی و خۆ بەزل‌زانینی بەلادا نەچووبوو. ئەگەرچی لە مەنتیق و حیکمەت و فیقهـ و ئوسوولدا مامۆستایەکی هەڵکەوتە بوو، هەموو کاتێک لە نەزانینی خۆی گلەی دەکرد.

ئەمن دەوری دوو ساڵێک لە خزمەتی ئەو زاتە خوێندم و لە پارێزکاری و دوورەپەرێزی و نەوس‌کوژیدا، کەموێنە هاتە پێش چاوم.

مامۆستا سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی و لە مریدانی شێخ عومەری زیائەدین بوو. خوێندنیشی لە «بیارە»، لای مامۆستای ناوداری ئەوێ، مەلا قادری کانی‌کەوەییەوە تەواو کردبوو.

مەلا موحەممەدی گورجی سەرەنجام ساڵی ١٣٦٩ ک. م. لە تەمەنی حەفتا و چەند ساڵاندا دنیای بەجێهێشت.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## زەبیحی جەواهیری

میرزا ئیسماعیل، کەسناو «افتخار دفتر» و نازناو «ذبیح»، کوڕی ئاغە موحەممەد سەلیمی جەواهیر شناس، کوڕی ئاغە مەولان، کوڕی ئەوڕەحمان‌بەگ، لە بنەماڵەی کەیها ساڵەحی عوسمانییە کە پیاوێکی زانا و شاعیر و شیعرناس بووە و بەتایبەت مێژووی باش زانیوە. ساڵانێکی زۆر لە دەزگای حاکمانی کوردستاندا کاری کردووە و ساڵانی دوایی ژیانی، لەبەر پیری و زورهانی وەنیشتە بووە.

زەبیح شوێنکەوتووی تەریقەتی نەقشبەندی و لە مریدانی شێخ حوسامەدین عەلی بووە کە لەم قەسیدەدا بەم شێوە باسی مورشیدەکەی و مەشرەبی سۆفیگەری دەکا:

ای دل اندر هوای درویشان — سر و جان کن فدای درویشان
صد شرف بر شهنشهی دارد — خادمی در سرای درویشان
خنک آن شاه کو کمر بسته، — چاکرانه برای درویشان
محرمان حریم لاهوتند — ساکنان سرای درویشان
منزلی نیست در جهان حق را — جز دل با صفای درویشان[1]
هر دم از خوان غیب مائده‌ای — می‌رسد از برای درویشان
هست پاک از غبار کبر و ریا — دامن کبریای درویشان
نیک‌بخت آن که کرد در گردن — طوق مهر و وفای درویشان
سر و جانم فدای آن که بود — سر و جانش فدای درویشان
نظر لطفم از «حسام‌الدین» — شد نصیب از خدای درویشان
آن وجود منزه از هر نقص — هادی و رهنمای درویشان
ذات پاکش بود به روز جزا — رهبر و پیشوای درویشان
در دو عالم به کس نیم محتاج — غنیم از غنای درویشان
جز به ذاتی که عارف است به حق — جز به فضل خدای درویشان
بلکه روزی رسد «ذبیح» شود — رستگار از دعای درویشان

---

[1] ئاماژەیە بە ئایەتی «قلبُ المومنِ عَرشُ الرَّحمن».

زا و مــەرگی زەبــیح ســاڵانی١٢٥٢ ک. ھ. )١٨٧٣ ز.) و چــوارەمی مــانگی جــۆزەردانی ١٣٢٦ (١٩٤٧) لە شاری سنە ڕووی‌داوە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## ئەسیری کەرکووکی

شێخ عەبدولخالیقی «اثیری»، کوڕی شێخ حوسەین، مرۆیەکی دیندار و دەروێش‌ئاسا و زانــا و وێــژەوان بــووە کە بە کوردی و عەرەبی و فارسی شیعری گوتووە و زیاتری شــیعرەکانی باســی خۆشەویــستی نیــشتمان و بەخۆدا هاتنی کوردانە و زۆرێک گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی ـ وەک هاوار ـ هۆنراوەکانیان چاپ کردووە.

ئەسیری ساڵی ١٣٠٨ ک. م. هاتۆتە دنیا و ١٣٧٠ لە دنیا چووە.

**ئەوا شیعرێکی**:

بێرە کوردستان عەزیزم گەر تۆ ســەیرانت ئــەوێ — بتبەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کوێــستانت ئــەوێ
بتبەمە پای بیستوون و تاقی ســەرپێڵ و زەھــاو — پێت نشان دەم سەد ھەزار ئاساری ساسانت ئەوێ
ئاوی ساف و ڕۆشەنی داوێنی چــەشمانی چیــا — لێ بنوشە دەم‌بەدەم گەر ئــاوی حــەیوانت ئــەوێ
لاوی کوردی من! لە بەرکە شاڵــی زاخــۆ و ئامیــدی — گەر تۆ سەد چاتر لە ڕەنگی شاڵی کرمانــت ئــەوێ
ھەڵسە گەشتی چیمەن و گوڵزاری کوردستان بکــە — گەر لەبۆ دەردی دەروونت داو و دەرمانــت ئــەوێ
ڕۆح و ماڵت سەرفی ڕێگەی میللەتت کە، ڕۆحەکەم! — گەر لە خوا لوتفی عەمیم و جــوود و ئیحــسانت ئــەوێ
ئەی «ئەسیری» ھێندە عەشقی میللــەتی کــوردت ھەیــە — بیشمری لام وایە قەبری «گردی سەیوانت» ئــەوێ

*گوڵدەستەی شوعەرای ھاوعەسرم*، ل٨. *یادی مەردان*، ل٥٥.

## عارفی عەرشی

کوڕی حاجی شێخ عەبدولحەمیدی مودەڕڕیس (عیرفان)، مرۆیەکی ھێژا، قەڵەم جــوان و خــاوەن زەوق بووە کە ساڵانێکی زۆر خزمەتی فەرھەنگی کردووە و سەرەتای پایزی ساڵــی ١٣٣٠ ک. ھ. (١٩٥١ ز.)، لە شاری «ھەمەدان»، دنیای بەجێ‌ھێشتووە. لە شیعرەکانی:

زمانــه یافــت جمــال و جمــال یافــت کمــال — زھــی جمــال زمانــه، خَھــی کمــال جمــال
مــزیّن اســت زمــین و منــوّر اســت فــضا — معطّــر اســت صــبا و مُعنبــر اســت شــمال
ز شادی آمده در وجـد خـشک زاھـد شـھر — ز خرمــی بــه نــشاط آمــده دل ابــدال
گرفتــه جــای ھیــاھوی مردمــان اینــک — نوای چنـگ و صـدای ربـاب و نالـه‌ی نـال
بیا به طرف گلستان ببین چـه غوغـایی اسـت — که باغ و راغ به وجد آمد و سھول و جبـال

| | |
|---|---|
| بـه بوسـتان بنگـر نیکـوان سـیمین تـن | بـه لالـه‌زار نگـر دلبـران مـشکین خـال |
| نوای مرغ و صدای سرود و نغمه‌ی چنگ | خروش بربط و بانگ جلاجل و خلخال |
| ز بس که با هم آمیخته‌ست نیست عجب | اگر سپهر به رقص آید و زمانه به حال |
| کـه شـد بهـار نـو و نوبـت امیـد آمـد | گذشت شام فراق و رسید صبح وصال |
| برفت صولت سرمای بهمن و اسفند | فـرا رسـید ز ره فـرودین خـوش‌اقبـال |

ڕۆژنامەی *خۆرنشین*، ژ ١١ و ١٢، ڕێبەندانی ساڵی ١٣٣٠ ک. ﻫ.

## ڕەشید یاسەمی

غوڵامڕەزاخانی ڕەشید سوڵتان، ناسراو بە ڕەشید یاسەمی، شاعیر و مێژووزان و مامۆستای زانستگای تاران، ساڵی ١٣١٤ ک. م. (١٨٩٥ ز.) لە کرماشان هاتە دنیا. بنەماڵەیان لە خێڵی گۆرانی کرماشانن کە ناوەندیان شارۆچکەی «گەهوارە»یە.

باوکی غوڵامڕەزا خان، موحەممەد وەلی خانی میرپەنجە کە لەگەڵ ئەوەدا شۆڕەسوار و تیرەناز بووە، شیعری گوتووە، نیگارڤانی کردووە، خەتی جوان نووسیوە و تەنانەت لە زبان و وێژەیشدا سەری دەرچووە. میرپەنج لە وەباکەی ساڵی ١٣٢٢ ک. م. تێداچووە.

باپیری دایکیشی، موحەممەد باقر میرزای خوسرەوی، نووسەری داستانی بەناوبانگی «شمس و طغرا»، شاعیرێکی توانا بووە و ڕەشید سوڵتان، زەوقی شاعیری لە دوو سەرەوە پێ گەیشتووە.

غوڵامڕەزا دەورانی منداڵی و تازەلاوی، بە بەرگی کوردییەوە، لە پاڵداوێنی دالاهۆدا، خەریکی سەیران و سوارکاری و ڕاو و تیرهاوێژی بووە و لە سروشتی جوان و هەوای خاوێنی ئەو ناوچەیە، دەرسی پاکی و یەکڕەنگی وەرگرتووە.

ڕەشید یاسەمی خوێندنی سەرەتایی لە کرماشان دەسپێکردووە و پاشان چۆتە تاران و دوای تەواو کردنی پۆلی ناوەندی، لە مەدرەسەی «سەن‌لوویی»دا ناوی نووسیوە و لەوێ زبان و وێژەی فەڕانسی خوێندووە.

مامۆستای ئەدەبییاتی فارسی ئەو قوتابخانەیە، شاعیری ناودار نیزام وەفا بووە. ئەو شیعرەکانی خۆی بۆ قوتابییان خوێندۆتەوە و لێیانی داوا کردووە کامەیان زەوقی شعری هەیە، با شەرم نەکا، شیعری بێنێ بیخوێنێتەوە و خۆی تاقی بکاتەوە. ئەوە بۆتە هۆی پشکووتنی هەستی شاعیرانەی ڕەشید یاسەمی و وردە‌ـوردە شیعری داناوە و شاعیر و نووسەرە لاوەکانی ناسیوە و لە کۆڕی ئەدەبیی زانکۆدا، کەسانی وەک بەهار «ملکُ‌الشُّعرا»، ئیقباڵی ئاشتیانی و سەعیدی نەفیسی چاوپێکەوتووە و لە نووسینی گۆڤاری زانکۆدا بەشداری کردووە.

دوای کوودەتای پەهلەوی لە ڕەشەمەی ١٢٩٩ ک. ﻫ. )١٩٢١ ز.)، کاتێ کە دەشتی ڕۆژنامەی «شفق

سُرخ»ی دانا، ڕەشید یاسەمی -کە لە کرماشاندا ببووە ئاشنای ـ زنجیرە نامیلکەیەکی ڕەخنەگرانەی بە ناوی «انتقادات ادبی» تێدا نووسی، کە بوو بە هۆی ناودەرکردنی. دوای ئەوە، لە زۆرێک ڕۆژنامە و گۆڤاری ئەوسەردەمە وەک: «نوبهار»، «آینده»، «ارمغان»، «تعلیم و تربیت» و «مهر»دا، شیعر و گوتاری ویژەیی، مێژوویی، فەلسەفی و ڕەخنەیی نووسی.

ژیانی ئەدەبی ڕەشید یاسەمی لە ماوەی پازدەساڵی نێوان ١٣٠٥ تا ١٣٢٠ ک. ه. (١٩٢٦-١٩٤١ ز.)، یەکجار پڕبایەخ و بە بەرهەم بوو. لەو ماوەدا زۆرێکیش کتێبی نووسی کە هێندێکیان بریتین لە:

١. *تتبع در آثار و احوال سلمان ساوجی*

٢. *تتبع در احوال ابن‌یمین*

٣. *تاریخ ملل و نحل*

٤. *تاریخ مختصر ایران*

٥. *تاریخ ادبیات معاصر*

٦. *کُرد و پیوستگی نژادی و تاریخی او*

٧. *وەرگێڕانی مێژووی «ایران در زمان ساسانیان»*، نووسینی کریستن سن دانمارکی

٨. *وەرگێڕانی بەرگی چوارەمی «تاریخ ادبیات ایران»*، نووسینی ئیدوارد براون

٩. *وەرگێڕانی «آیین دوست‌یابی»*، نووسینی کارنگی

١٠. *وەرگێڕانی «تاریخ چنگیز»*

١١. *وەرگێڕانی «تاریخ نادرشاه»*، مینورسکی

١٢. *پێداچوونەوە و لەچاپدانی «دیوان محمد باقر خسروی»*

مامۆستا ڕەشید یاسەمی شارەزای زبانی فەڕانسە بوو؛ عەرەبی و ئینگلیسیشی دەزانی. زمانی باستانی پەهلەوی لە هرتسفیلدی ئاڵمانیوە فێر ببوو؛ چەند نامیلکەی لەو زمانەوە کردبووە فارسی. فەلسەفەشی باش دەزانی و ماوەیەکی درێژخایەن لای میرزا تاهیری تونکابونیوە خوێندبووی. ساڵی ١٣١٣ (١٩٣٤) بوو بە مامۆستای زانستگای تاران و مێژووی ئێرانی پاش ئیسلامی دەرس‌گوتەوە.

ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥ ز.) بۆ تۆژینەوەیەکی زۆرتری ویژەیی، چوو بۆ فەڕانسە و دوو ساڵ مایەوە. لەو ماوەدا تووشی نەخۆشی گوشاری خوێن هاتبوو، دەرمانی دەخوارد. لە مانگی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٢٧ (١٩٤٩ ز.)دا، وەک بڕیار بوو، لە تەلاری زانکۆی ئەدەبیاتی زانستگای تاران، لە بابەت کارتێکردنی بیر و بڕوای حافیز بەسەر مێشکی گوتەی ئاڵمانیدا گوتاری دەدا. خەڵکێکی زۆر دانیشتبوون و ئەمیش زۆر بە هەست و تینەوە قسەی دەکرد. لەپڕ زبانی گرتی و هاتە لادا. لەبەر هەیەجان و گوشاری زۆر، شەپلە لێی‌دابوو، لایەکی لەشی لەمس کردبوو. گەیاندیانە نەخۆشخانە و زۆرێک لەگەڵی حەولیان دا، سوودێکی نەبوو. پاش مانگێک

بردیان بۆ فەڕانسە و دووو ساڵان لە شاری نیس لە نەخۆشخانەیەکیان ڕاگرت، دیسان فەرقێکی نەکرد و هێنایانەوە تاران و سەرەنجام لە بەیانی چوارشەمبەی ١٨ گوڵانی ساڵی ١٣٣٠ ک. هـ. )١٩٥١ ز.)، بە یەکجاری چاوی لێک نا و دنیای بەجێ‌هێشت.

ڕەشید یاسەمی مرۆیەکی میهرەبان، بەئەدەب، وردبین، دەمپاراو، قەڵەم سوار و زۆر وریا بوو. وەکوو ئەندامێکی سەرەکی کۆڕی زانیاری ئێران، لە مامۆستایانی بێ‌قسەی زبان و وێژەی فارسی و هەروەها مێژوو ئەهاتە ئەژمار. لە شیعریشدا پایەبەرز بوو. نەخوازە قەسیدەی، شێوازێکی تایبەتی هەبوو؛ تێکەڵێک لە دوو سەبکی خوراسانی و عیراقی.

**چەند شیعری مامۆستا ڕەشید یاسەمی**:

آوخ که دوست رشته‌ی الفت گُسست و رفت — زنجیر عمر را به امیدی ببست و رفت
چون طایر شباب هراسان و زود سیر — بر شاخسار عمر زمانی نشست و رفت
آن شیشه‌ی امید که دل بود نام او — سنگین دلی ربود و فکندش ز دست و رفت
او جان عشق بود و چو دریافت فرصتی — از تنگنای صحبت یاران بجست و رفت
تابی به زلف داد و دل از من گرفت و برد — دوری به چشم داد، مرا مست کرد و رفت
صیاد بود لیک ندانست رسم صید — دشتی شکار دید، یکایک بخست و رفت
رسمی عجب گذاشت در آیین صفدری — آن صف‌شکن که خاطر یاران شکست و رفت
مرغی حقیر یافت دریغ آمدش به دام — صیدی ضعیف دید، بینداخت شست و رفت
گفتم: روا مدار که نالد ز غم «رشید» — گفتا: بنال، ناله تو را بهتر است و رفت

* * *

پرواز کرد عمر و از او آشیانه ماند — مشت پری ز نعمت هستی نشانه ماند
از سوز و ساز دل اثری آشکار نیست — جز دود آه ما که به دیوار خانه ماند
عمری فسانه‌ها دل ما در فسون گرفت — افسانه جو به خواب شد و زو فسانه ماند
از دام و دانه بیم و امیدی نصیب بود — بیم و امید طی شد و زو دام و دانه ماند
گر شعر سوزناك سرایم عجب مدار — شمع نشاط مُرد و از او این زبانه ماند
در ملك عشق لایق تاج نوازش است — این سر که جاودانه بر آن آستانه ماند
گر نیست باورت که به مستی چه دیده‌ام — زان باده نوش کن که به جام شبانه ماند
دانی که چیست شرح سفرنامه‌های عمر — این با کرانه طی شد و آن با کرانه ماند
آن را که عشق پیشه بود عمر باقی است — رفتیم و مهر هستی ما بر زمانه ماند
چون عشق جاودانه بماند مرا چه غم — گر این تن «رشید» دمی ماند یا نماند

هــر روز کافتــاب ســر از کــوه بــر زنــد | اوّل شعاع خـویش بـر ایـن چشم تـر زنـد
در انتظـــار دیـــدن رویـــش نشـــسته‌ام | زآن پیـشتر کـه مـرغ سـحر بـال و پـر زنـد
فــراش خــواب را، ز شــب دوش گفتــه‌ام | تـا خیمــه‌ی نـزول بـه جـای دگـر زنـد
هـر انـدهی کـه شـب بـه سـرم لـشکر آورد | چـون نـور مهـر بینـد کـوس سـفر زنـد
بــسیار جُــسته‌ام بــه جهــان و ندیــده‌ام | خوشـتر ز سـاعتی کـه در او مهـر سـرزند
ای خـرم آن دمـی کـه در او جـیش آفتـاب | بــر بازمانــدگان ســپاه ســحر زنــد
کُحـل سـیاه شـب بزدایـد بـه آب نـور | و آنگاه در دو چشم جهان کحـل زرّ زنـد
ناگــاه تیــغ مهــر درخــشان و بــی‌قــرار | از خــاوران برآیــد و بــر بــاختر زنــد
کــوه پــلاس‌پــوش ز تــشریف آفتــاب | چنـدین هـزار دامـن زرّبـر کمـر زنـد
هـر سـنگ را کـه بینـی از کیمیـای شـمس | صـد طعنـه بـر فـروغ و جمـال قمـر زنـد
در ابــر نــور او چــو فتــد گوئیــا کــسی | در تــوده‌هــای پنبــه بــه عَمْــدا اثــر زنــد
خـونین شـود سـحاب کـه فـصّاد آفتـاب | از صــدهزار جــای بــر او نیــشتر زنــد
گوید فلـک بـه مـاه کـه دیگـر مـزن تـو تیغ | بگــذار تــا کــه او زنــد، او خــوبتر زنــد
دانـی چکـاوک از چـه خروشـد بـه بامـداد | این بانگ عبرتی است که بر بی‌بصر زنـد
کاین مهر چرخ، آیـت مهـر اسـت و مردمـی | کاینسان شعاع خویش به هر بـوم و بـر زنـد
نزدیـک او تفـاوت پـست و بلنـد نیـست | هـم در مغـاک تابـد و هـم در کمـر زنـد
گــر غــار تیــره‌دل بپــذیرد شــعاع مهــر | خـود را زیـان نـدارد و او را نـه ضـرّ زنـد
آن کو چو مهر، مهـر جهـانی بـه دل گرفت | هرچنـد ذرّه باشـد، پهلـو بـه خـور زنـد
زیـن کیمیـای مهـر هـر آن کـو زنـد بـه دل | خـاکی دلـش چـو زر شـود امـا اگـر زنـد
گـر ایـن هنـر نـدارد بیچـاره جـاهلی اسـت | بیچــاره‌ای کــه لاف ز فــضل و هنــر زنــد

* * *

سالی دگر گذشت وامیـدی دگـر گذشـت | آوخ که تـا شـدیم خبـر بـی‌خبـر گذشـت
تقـویم مانـد چـون قفـسی خـالی از هـزار | عمر از میانه همچو هـزاری بـه پـر گذشـت
لفظی به جای مانـد و ز معنـی نـشانه نیـست | دودی به چشم رفت و فروغ شرر گذشـت
هــر روز بــی‌قرارتــر از روز پــیش بــود | هـر مـاه از مـه دگـر آشـفته‌تـر گذشـت
نادیــده فــرودین مــه اردیبهــشت شــد | خـرداد و تیـر، تیرصـفت از نظـر گذشـت
مـرداد رفـت و دولـت شـهریوری و مهـر | آبان به یک دو موج چو آبی ز سر گذشت
آذر چـو بـرق آذر و دی همچـو بـاد دی | بهمن سپندوار بـرون جـست و درگذشـت

گویند عید می‌رسد و نوبهار عیش / فصل شتا و لشکر بیدادگر گذشت
شادم که آن بیاید و این شد ولی چه سود / کان بی‌نتیجه بگذرد، این بی‌ثمر گذشت
بار دگر زمین شتابان و بی‌قرار / دوری به گرد چشمه‌ی خورشید برگذشت
آنی دگر ز مدت عمر جهان برفت / روزی دگر ز دور حیات بشر گذشت
ما و تو نیستیم ولی روشنان چرخ / یک روز بنگرند که دور قمر گذشت
از خاندان شمس پراکنده شد بساط / عزت ز مه گذشت و جلالت ز خور گذشت
خاموش گشت زهره و بشکست پشت تیر / ایام مشتری چو نسیم سحر گذشت
مریخ سرخ‌روی ز غم گشت زرد رخ / کیوان ز حلقه‌ی زر و طوق کمر گذشت
نپتون یتیم‌وار اورانوس را ببرد / از خاندان شمس و ز ارث پدر گذشت
خورشید را حرارت کانون فرو نشست / زان جذب و دفع و کشمش و کرّ و فرّ گذشت
گر دیده‌ی گشاده بود اندر این زمان / مر خاک را ببیند فرجام و سرگذشت
بیند که کوهسار به دریا دراوفتاد / دریا ز جا برآمد و بر بوم و بر گذشت
دریای باختر به سوی خاوران کشید / کهسار خاوران به در باختر گذشت
جان زمین به قهقه خندد به عمر خویش / گوید: که دور فتنه چه خوش مختصر گذشت
هر فتنه‌ای که بود در این کهنه دلق بود / منت خدای را که زمان بی‌خطر گذشت
بگسست قید صورت و شکل و طلسم جسم / ایام سود آمد و وقت ضرر گذشت
اکنون زمان راحت و آزادی است و ناز / بر رغم آن زمان که به رنج سفر گذشت
ناگه ز غیب بانگ زند هاتفی بر او: / کای جان گمان مبر که همه خیر و شر گذشت
باقی است کار، گرچه نمانده است جای کار / برجاست معنی ارچه به ظاهر صور گذشت
چون تو مهندسی، چه غم ار خانه شد خراب / چون تو مؤثری چه زیان گر اثر گذشت
برخیز و زین مواد یکی کاخ نو برآر / فرمان چنین ز ملک قضا و قدر گذشت
این کارخانه هیچ نیاساید از عمل / باقی است کار، گرچه بسی کارگر گذشت
هر ذره‌ای که بینی از اجزای کاینات / هم رنجبر بیامد و هم رنجبر گذشت
ای دل دژم مباش که تقویم گویدت: / سال دگر ز عمر چو لمح بصر گذشت
فرصت شمار باقی ایام و کار کن / فرصت دگر به دست نیاید اگر گذشت
روزی اگر به خیر گذاری هزار بار / بهتر ز سالهاست که در خواب و خور گذشت

گۆڤاری *اطلاعات ماهانه*، ژ ٣٩، جۆزەردانی ١٣٣٠ ک. ه. ل١. *شعرای مُعاصر*، ل١٣٤.

## فیکری سەلمانی

میرزا عەبدوڵڵای فیکری ـکە بە بۆنەی پیشەیەوە نازنـاوی «سَـلمانی» هەڵـبژاردبوو ـ شـاعیرێکی خـاوەن زەوق، کتێبخوێن و خەتخۆش بوو کە زۆرتر کاتی وچانی خۆی لەگەڵ زانایان و ویژەواناندا دادەنیشت. ئەم غەزەلە هی ئەوە:

| | |
|---|---|
| بـه قتـل عاشـق مـسكين شـتاب بايـد كـرد | اسـاس هـستی مـا را خـراب بايـد كـرد |
| به قول ساغر و فتـوای چنـگ و نالـه‌ی نـی | عـلاج غـصه بـه جـام شـراب بايـد كـرد |
| بـه عاشـقان مكنيـد ايـن قـدر جفـا، يـاران | حـذر ز پرسـش روز حـساب بايـد كـرد |
| به رأی قاضـی مـا مـی بـود حـرام، و ليـک | به خون خلق دو دست خضاب بايـد كـرد |
| ببند لـب تـو از ايـن قيـل و قـال ای واعـظ! | حيـا ز صـاحب امالكتـاب بايـد كـرد |
| رسـيد توبـت تجديـد و رای و حيـرانم | از ايـن گـروه كـه را انتخـاب بايـد كـرد؟ |
| برای چاره‌ی اين هرج و حق كشی و ستم | عـلاج نيست جـز ايـن انقـلاب بايـد كـرد |
| مشو تو غافـل از احـوال خـويش «سـلمانی» | پـی وصـول مقاصـد شـتاب بايـد كـرد |

یاداشتەکانی نووسەر.

## جەلادەت بەدرخان

کوڕی ئەمینعالی پاشا، لە بنەماڵەی بەدرخانیان[1]، ساڵی ١٨٩٧ ز. لە شـاری ئەسـتەمبووڵ هاتـە دنیـا و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەو شارەدا تەواو کرد.

پاش زۆرگرتنی مستەفا کەمال (ئاتاتورک) ـ وەک باقی کەسانی نیشتماندۆستی بەدرخانیانـ چوو بۆ میسر و لەوێشەوە گەیشتە ئاڵمان و پاش فێربوونی زبانی ئاڵمانی، چووە زانستگا و لیسانسی حوقۆقی وەرگرت.

لەگەڵ ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران لە تورکیای عوسمانیدا، جـەلادەت هـاوڕێی دوکتـور کـامرانی برای، لە ئورووپاوە گەڕانەوە بۆ کوردستانی باکوور و کەوتنە ڕێکخستنی هێزە کوردەکان بـۆ بەرهەڵـستی دەوڵەتی زۆربێژی ترک. بەڵام ساڵی ١٩٣٠ ز. کە ئەم خەباتەش سەرکوت کرا، جارێکیتر هـەڵاتن و بـە کێواندا لە سنووری سووریا پەڕینەوە و بوونە پەنابەری ئەو دەوڵەتە.

جەلادەت بەدرخان لە سووریەدا مایەوە و لەگەڵ دەسکورتی و هەژاریـدا سـاچاندی و هـەموو کـات و ژیانی خۆی بۆ خزمەت بـە میللـەتی کـورد و زبـانی کـوردی بـەخت کـرد. لـە کـارە بایەخـدارەکانی، بڵاوکردنەوەی دوو گۆڤاری«*هاوار*» و «*ڕووناهی*» و هەروەها چەند فەرهەنگی کوردی و کوردی ــفەڕانـسی

---

١. بۆ ناسینی ئەو بنەماڵە، بڕوانە بۆ بەشی دووهەمی ئەم کتێبە.

بوون کە هێندێکیان چاپ کراون. کتێبی‌تری «*القضیّةالکُردیّه*»، بە زبانی عەرەبی و فەڕانسییە کـە ساڵـی ١٩٣٠ ز. لە ژێر ناوی «دوکتور بلەچ شێرکۆ»وە، لە قاهیرە چاپ کرا.

جەلادەت بەدرخان ساڵی ١٣٧١ ک. م. لە دمشق کۆچی یەکجاری کرد و لە خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەندی ئەو شارە ناشتیان.

مێژوو، دوکتور کەمال مەزهەر. *روزنامەنگاری در کردستان*، ل٦٤-٦٦.

## مەلا عەبدوڵڵای موفتی تووتنچی

کوڕی مەلا کەریمی پێنجوێنی، نازناو «موفتی»، شاعیرێکی ئاگا و خاوەن زەوق بووە کە تووتنی فرۆشتووە و بە کار کردن و ئارەق ڕشتن ژیانی بەڕێوە بردووە. ئەم پێنجخشتەکییە شیعری ئەوە:

مەردانە لە دەس وەحشەت و نـادانی هـەلاتم 	حاشا لە هەموو نیعمەت و خۆرشـت و بـەراتم

هەستان لە خەوی غەفڵەتە ئەسبابی نـەجاتم 	نایدەم بـە فەلـەک زەمزەمـە و شـۆری ولاتم

قوربـانی ئەکـەم ڕۆح و سـەر و مـاڵ و حـەیاتم

ڕێ ڕاستییە بێ‌شک لە هەموو عـەقڵ ڕەهـا بـوون 	گەر تێکی نەدا هوش و خەیاڵم دەسـی گـەردوون

چـیم داوە لـە فـێڵ و تەڵـەکەی واعیـز و ئـاخون 	شێخ نیم کە بە تەزویر و ڕیـا و بـازی و ئەفسـوون

وەک ئاش بـە دانـەی ئـەم و ئـەو لا بـێ نـشاتم

پێم خۆشە سەپانێک دەر و دەشت و ئـەرز کـێڵ 	نەک بم بە دوعانووس و بڕۆم ڕوو کەمە نـاو خـێڵ

یا خۆ بە خەڵیفەیکی مل‌ئەسـتووری ڕەدیـن بـێڵ 	یـا کۆلکەمـەلایێ بـە عـەبا و مێـزەری پـڕفێڵ

دەریۆزەیی ئیحسان کەم و سـەر فیتـر و زەکـاتم

تێ هەڵدە لە ژیـنی تەمەڵـی و حیـزی و سستی 	یـا نـانی کەسـیفی بەتـەمای خزمـەتی پەسـتی

وریـام بـە دڵ و دوژمـنی بێهۆشـی و مەسـتی 	دوورم لـە مـەعاش خـۆری و بێگانـە پەرسـتی

ئیـسباتی ئـەکا ژیـنم و عـاداتی حـەیاتم

لەعنەت لە کەسێ بێ بـە وەتـەن خـاین و ناپـاک 	ڕۆحێکی نەیێ بـەرز و دڵـێکی گـەش و ڕوونـاک

حق‌بێـژم و حـەق‌نووسـم و بـێ‌ترسـم و چـالاک 	کـوردێکی دلێـرم لـە هـەموو مەعرەکـە بـێ‌بـاک

ڕۆڵـەیکی وەفـادارم و پڕعـەزم و سـەباتم

بێ‌دەنگ و سەدا دڵ لە کولا نایێ بە سـەدجـۆش 	وا حاڵـیە دوژمـەن کـە وڕ و گێـژم و بـێ‌هـۆش

با پێ‌بکـەنێ پـێم، بـژی ئێـستە بـە دڵـی خـۆش 	وەک شێری ژیان، جارێ کە من ماتم و خـامۆش

سەیـادی کـەمین چـاوەڕێیی ڕۆیـشتن و هـاتم

«موفتی» وەکوو خەڵقی مەبە تالب بـە زەر و زیـو 	بێهـوودە مـەسووڕێ لـە بیابـان و چـەم و شـیو

ناحەز وەکوو دابەستەزکی پڕ لە بەز و پیو        مـن نیمـە تەمـەع، نیمـە ڕیـا و مەغـڵەتە و ڕیـو
ئـازادی و سەربەسـتییە دڵـخواز و ئـاواتم

زا و مەرگی مەلا عەولا ساڵانی ١٣١٢ و ١٣٧٢ ک. م. ڕوویداوە.

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل٣٩.

## عەونی سیورکی

موحەممەد عەلی عەونی، کوڕی حاجی عەبدولقادر[1]، ساڵی ١٣١٦ ک. م. لە شاری «سیورک»ی سەر بە دیاربەکر هاتە دنیا و کە پێگەییشت لە قوتابخانەکانی باکووری کوردستاندا خوێنـدی و پاشـان چـوو بـۆ میسر و لە زانستگای ئەزهەری قاهیرەدا خوێندنی تەواو کرد و هەر لەوێ نیشتەجێ بوو.

عەونی زیاد لە کوردی و عەرەبی، فارسی و ترکی و فەڕانسیشی چاک دەزانی و نووسـەرێکی باشـیش بوو. دوای ماوەیەک لە وەزارەتی دەرباری میسردا بە ناوی وەرگێڕ دامـەزرا و هاوکـات، بـۆ هێنـدێک لـە گۆڤار و ڕۆژنامەکان وتاری دەنووسی.

موحەممەد عەلی عەونی بۆ یەکەم جار هێندێ پەراوێز و هەروەها پێشەکی بۆ شەرەفنامەی بدلیـسی دانا و ساڵی ١٣٥٠ ک. م. لە چاپخانەی کوردستانی فەرەجوڵا زەکی لە قاهیرەدا چاپی کرد. دواجاریش هەموو شەرەفنامەی لە فارسییەوە کردە عەرەبی؛ بەڵام پاش مەرگی خۆی، لە ساڵی ١٩٥٨ ز. چاپ کرا.

دیسان لە کارەکانی، وەرگێڕانی سێ کتێبی ڕەحمەتی ئەمین زەکیبەگ، لە کوردییەوە بۆ سەر زبانی عەرەبی و لەچاپدانیانە، بە ناوی: «*خلاصةالکرد و الکردستان*»، «*تاریخ الدول و الامارات الکُردیّه*» و «*مشاهیر الکُرد*». بێجگە ئەمانە بەرهەمی تریشی لەمەڕ کورد و کوردستانەوە هەن کە هێشتا چاپ نەکراون.

عەونی ساڵی ١٣٧٢ ک. م. لە قاهیرەدا کۆچی یەکجاری کرد و لـە پـەنا گـڵکۆی عـارف و شـاعیری بەناوبانگی میسری، «عُمر ابنُالفارِض»دا ناشتیان.

*الاعلام*، ب٧، ل١٩٨، *لغتنامه*، ل٤٣٦. پێشەکی هەژار بۆ *شەرەفنامە*، ل ٥٢ و ٥٣.

## سەید ئەحمەدی خانەقا

کوڕی سەید حەسەن، کوڕی سەید ئەحمەدی سەرداری کەرکووکی[2]، ساڵی ١٢٩٠ ک. م. هاتۆتە دنیا و لە پیاوە ناسراوەکانی بنەماڵەی بەرزنجییە کە وەک باپیری، لە شـاری کـەرکووک سەرپەرشـتی خانـەقا

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٦١١.

٢. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٣٦٢.

بووە، تەکیەداری و ئیرشادی کردووە و دەستی هەژارانی گرتووە و کەمدەستانی یاریداوە؛ بۆ خزمەت بە خوێندەواران و زانایان، مەشهوور بووە و دەرکی ماڵ و خانەقای قەت دانەخراوە و میوانان و ڕێبواران و داماوان، ڕوویان تێکردووە و لە پەنایدا حەساونەتەوە.

ئەم پیاوە خێرومەندە، عومری بە پاکی و ئاکارچاکی تێپەڕ کرد و سەرەنجام ساڵی ١٣٧٢ ک. م. (١٩٥٢ ز.)، دەستی لە ژیان بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا.

*مێژووی ئەدەبی کوردی*، ل٥٤٤.

## فایق زیوەر

کوڕی موحەممەد ئەفەندی، شاعیرێکی خەڵکی سلێمانییە کە ساڵی ١٣٣١ ک. م. لەدایکبووە و ١٣٧٢ لە دنیا چووە. ئەم غەزەلە هی ئەوە:

داغی حەسرەت نەقشی گرت ئەمساڵ لە تەختی سینەما — بۆ ئەوانە ڕائەکەن سەربەست ئەچن بۆ سینەما
کێ ئەڵێ حەربە و گرانی، زۆر پەریشانە جیهان — تۆ بچۆرە سینما وا تێئەگەن برسی نەما
کوڕ لە باوک، کچ لە دایک شەرمیان لا خستووە — سینما کارێکی وای کرد هیچ مناڵ ترسی نەما
بۆ تەماشا زۆر کوڕ و کچ بوونە هاوڕێ باوک و — هیچ غەمی باوکیان نییە وا دیرهەم و فلسی
یەکبەیەک کوشتن ئەکەن تا زوو بچن بۆ — با هەزار جار بانگ بکەن خۆ لۆجە و کورسی
عیلم و فەننی ئورووپا فێر بوون کە سەیری وێنەیێ — ئاگری حەسرەت ئەمێنێ هەر لە لەوحی
پێم بڵێن تا ئێستە چی فێربوون منیش دێم جار بە جار — تا نەڵێن پێم پاشملە «زیوەر» ئەوا شانسی نەما

*یادی ئەدیبان* و یەک- دوو شوێنیتر.

## موحەممەد کوردعەلی

موحەممەد بەگ، کوڕی عەبدوڕڕەززاق، کوڕی موحەممەد، مەشهوور بە «کوردعەلی»، دانەر و سەرۆکی کۆڕی زانیاری عەرەبی لە دمشق و خاوەن گۆڤاری بەناوبانگی «*المُقتَبس*» و یەکێ لە زانایان و نووسەرانی گەورەی دنیای عەرەب لە چەرخی بیستەمدایە کە ساڵی ١٨٧٦ ز. لە شام هاتە دنیا.

بابی موحەممەد، کوردی سلێمانی بووە و سەرەتا خەیاتی کردووە. دواجار ڕووی کردۆتە بازرگانی و دەسمایەیەکی باشی دەستخستووە و بۆ شام چووە. هێندێک لەودوا لە گوندێک بە ناوی «جسرین»، سەربە ناوچەی «غووتە»ی دمشق، مەزرایەکی کڕیوە و کشتوکاڵی دەسپێکردووە. موحەممەد لەو گوندە هاتۆتە دنیا و بە منداڵی «فەرید»یان پێ گوتووە؛ بەڵام دوایی بە ناوی موحەممەد کوردعەلی ناوی دەرکرد.

شەش ساڵان ناردیانە قوتابخانە و هەر بە منداڵی سواری و مەلە فێر بوو. دە ساڵان (ساڵی ١٣٠٤ ک.

م.) چووە پۆلی دواناوەندی و لەو کاتەوە وازێکی زۆری لە خوێندنەوە پەیدا کرد و هەرکوێ کتێبێکی چاو پێ دەکەوت، دەبوو بیخوێنێتەوە. سێزدە سالان هیچ ڕۆژنامە و گۆڤارێک بە دەستیەوە دەرنەدەچوو. لەو سالانەوە خوێندنی ترکی و فەڕانسیشی لە بەرنامەی خۆی زیاد کرد. شازدەسالان بۆ چەند ڕۆژنامە وتاری دەنووسی و بەو نیازە کە زانیارییەکی زۆرتری دەسکەوێ، لە کۆڕی دەرسی مامۆستایانی وەک: شێخ سەلیمی بوخاری، شێخ موحەممەدی موبارەک و شێخ تاهیری جەزایری، بەهرەی دەبرد. هەروەها کۆڵینەوە لە فەرهەنگی کۆن و نوێی عەرەبی درێژە پێدا؛ وا کە هێشتا هەژدە سالی تەواو نەکردبوو، لە عەرەبییەتدا زانایەکی تەواو بوو. هاوکات فەڕانسەکەشی لە مەدرەسەی عازارییەدا گەیاندە ڕادەیەکی باش. سالی ١٣١٠ ک. م. کە دەبیرستانی تەواو کرد، کەوتە خۆی بۆ چالاکییەکی زیاتر لە بوارە کۆمەلایەتییەکاندا و بە سێ زمانی عەرەبی و فەڕانسی و ترکی، نووسین و وەرگێڕانی دەسپێکرد. ٢٢ سالی بوو، بۆ یەکەم بلاڤۆکی دمشق بە ناوی «*شام*» دەینووسی و ئەو هاوکارییە، سێ سال بەردەوام بوو. لەو ماوەدا دەستی لە دەرس و خوێندن بەرنەدا و زۆرێک لە شیعرەکانی موتەنەببی و مەقاماتی حەریری لەبەرکرد. هەروەها وتاری بۆ چەند ڕۆژنامەی بەناوبانگی میسر، وەکوو «*المُقتَطَف*» دەنووسی.

سالی ١٣٢٠ ک. م. لێبڕا بڕوا بۆ فەڕانسە. پێشەکی چووە میسر و هێندێک لە قاهیرەدا مایەوە. لەوێ کۆمەڵێک لە دۆستانی، یەکیان سەید موحەممەد ڕەشید، بەرپرسی گۆڤاری «*المَنار*»، داوایان لێ کرد بمێنێتەوە. ئەویش بە قسەیانی کرد و لە بلاڤۆکی«*الرّائدُالمصری*»دا، کە سەرپەرشتی «نوقوولاشەححادە» بوو، چەند نامیلکەیەکی بلاو کردەوە و بەم بۆنەوە بەختی ئاشنا بوون لەگەڵ کەڵەپیاوانی میسری، ڕووی‌تێکرد. لە حەوتوودا دوو جاران گوێی لە تەفسیری عەللامەی پایەبەرز و چاکەخوازی بەناوبانگ، شێخ موحەممەدی عەبدوهـ دەبوو؛ کە لە ڕەواقی عەبباسی ئەزهەردا دەرسی دەگوتەوە. هەر لەوێ نووسەران و زانایانی ناوداری وەک: قاسم ئەمین، فەتحی زوغلوول، ئیبراهیم یازیجی، یەعقووب سەڕڕووف، حافیز ئیبراهیم، ئەحمەد زەکی، ئەحمەد تەیموور، خەلیل موتران، جورجی زەیدان و عەبدولعەزیز فەهمی ناسی و لە خزمەتی شێخ موحەممەدی عەبدوهدا ئەوپەڕی بەهرەی برد.

پاش دوو مانگ، لەبەر داکەوتنی وەبا لە میسردا، گەڕاوە دمشق؛ بەلام لەوێ هێندێک بەرهەڵستی بوونەوە و حاکمیان لێ دڕدۆنگ کرد؛ تا ئەو ڕادە ناچار ماوەیەک خۆی شاردەوە و لە دەرفەتێکدا، (سالی ١٣٢٤ ک. م.) دیسان گەڕاوە بۆ میسر.

لە میسر، لەگەڵ ڕۆژنامەیەک بە ناوی «*الظاهر*»دا، کاری دەسپێکرد و دوای چەندێک بوو بە سەرپەرشتی نووسەرانی ڕۆژنامەکە. هەر لەو سەروبەندانەشدا گۆڤاری بەناوبانگی «*المُقْتَبس*»ی بلاو کردەوە و هەموو شێوە نوێکاری، لە باری کاکڵ و توێکڵەوە، کە ڕۆژاواییان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانیاندا بەکاریان دێنا، هێنایە نێو گۆڤارەکەیەوە. تێیدا باسی شارستانییەت و فەرهەنگ (کولتوور) و دەسکەوتە زانستییەکان و

داهینان و هەروەها گرفتە ئابووری و کۆمەلایەتییەکانی دەکرد؛ بە تێکۆشانێکی زانایانە، دەقی کتێبە کۆنەکانی دەدۆزییەوە و لەو گۆڤارەدا دەیناساندن. زنجیرە ژمارەکانی «المُقْتَبس»، ئەوڕۆش لە بایەخدارترین گەنجینەکانی زبان و وشە و ویژە و شیعر و زانست و میژوی عەرەبە کە لە ٩ بەرگ و سەرجەم ٦٥٠٠ لاپەڕەدا، چەند جاران لە چاپ دراوەتەوە.

موحەممەد کوردعەلی تا ساڵی ١٣٢٧ ک. م. لە میسردا مایەوە. ئەوجار گەڕاوە شام و لە دمەشقدا، بە یارمەتی برای زانای (مامۆستا ئەحمەد کوردعەلی)، «المُقْتبس»ی بڵاو کردەوە؛ ئەمجار بە شێوەی ڕۆژنامە و تێدا شیعر و بەرهەمی شاعیران و ویژەوانانی ناوداری شام و لوبنان و عیراقیشی، وەکوو: ڕەسسافی و زەهاوی، لە پاڵ میسرییەکاندا هێنا. بەڵام ڕاستبێژی و ڕەخنەگرتنی بە ڕاشکاوی کوردعەلی، بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمانلی قووت نەدەچوو؛ کەوتنە هەڕەشە لێ کردنی و ئەویش چاری لە هەڵاتندا دیتەوە؛ خۆی گەیاندە لوبنان و لەوێشەوە بە بەحردا، تا فەڕانسە نەوەستا. ئەو کاتە (ساڵی ١٣٢٨ ک. م.) کوردعەلی ٣٤ ساڵی بوو. سەردەمێک لە پاریس مایەوە و ئەوجار چووە ئەستەمبووڵ و لەوێشەوە گەڕاوە دمشق؛ بە ئاوات و بەرنامەی زۆرەوە بۆ ئازادی و ئابادی ئەو وڵاتە. بەڵام هەر گەیشتە بەرەوە، دیسان هەڕەشە و گوڕەشە دەستیپێکردەوە. کوردعەلی کە زانی ئەو بارودۆخەی ئاوا بۆ هەڵناسووڕێ، وای بە باش زانی دەست لە سیاسەت هەڵگرێ و خەریکی کاری زانستی و ئەدەبی بێ؛ بەتایبەت لێبڕا بە شێوەی ڕۆژاواییان، کتێبێک لەمەڕ شام و شارستانییەتی کۆن و نوێیوە بنووسێ. بۆ ئەو کارە و بەنیازی کڕوکاشێکی زانستی، بە کتێبخانە گەورەکانی ڕۆژاوادا گەڕا و دوای جارێک و دوان چوونە ئەستەمبووڵ، کتێبخانەی سەڵتەنەتی ئەوێ و تەنانەت کتێبە دەسنووسەکانیشی چاوپێکەوت.

ساڵی ١٣٣٧ ک. م. کە دمشق کەوتە دەستی هێزە یەکگرتووەکان، گەڕاوە بۆ ئەوێ و بەنیاز بوو جارێکیتر «المُقتَبس» بڵاو بکاتەوە؛ بەڵام حاکمی چەکداریی دمشق، ئەوەی پەسند نەکرد و سەرپەرشتی دیوانی مەعارفی پێ ئەسپارد. کوردعەلی بەو ئاواتەوە کە بتوانێ خزمەتێک بکا و بۆ فەرهەنگ و شارستانییەتی کۆمەڵگاکە هەنگاوێ هەڵگرێ، چاکی داوێنی لێ کرد بە کەمەردا و بنیاتی کۆڕی زانستی دمشقی دانا. ئەو کۆڕە ــکە کوردعەلی بۆخۆی سەرۆکی بووــ تۆژینەوە لە وشە و زبان و هەموو میراتێکی کولتووری عەرەبی گرتە ئەستۆ.

موحەممەد کوردعەلی دووجار، ساڵانی ١٣٣٩ و ١٣٤٧ ک. م. بوو بە وەزیر؛ لەو ماوەدا بۆ زۆربەی وڵاتە ئورووپاییەکان ڕۆی و لە کۆبۆنەوە و وتوویژ و وتاردانی جۆراوجۆردا ــکە بۆیان دادەناــ بەشداری دەکرد. ساڵی ١٣٤٣، کاتێ کە وەزیری زانستی باڵا بوو، زانکۆی ئایینی دامەزراند. لە تەمەنی ٥٠ ساڵاندا، لە زانستگای دمشقیش دەرسی دەگوتەوە و هاوکات «مجمع لُغوی» میسر وەکوو ئەندام هەڵیبژارد و هەموو پاییزێک لە دانیشتنەکانیاندا بەشداری دەکرد. ساڵی ١٩٢٨ ز. بوو بە نوێنەر و ئەندامی ڕۆژهەڵاتناسانی

زانستگای ئەکسفوردی بریتانیا.

ئەم مامۆستا گەورەیە، لە سەرینەی ئەو هەموو کارانە، ئەگەر دەرفەتێکی دەسکەوتایە، ئەوجار قەڵـەمی نەدەوەستا و خەریکی نووسین دەبوو. بەڵام کە تەمەنی چووە سەر، کاری زۆر، ماندووی دەکرد و سۆمای چاویشی هاتبووە کزی. سەرەنجام لە ڕۆژی دووهەمی نیسانی ساڵی ١٩٥٣ ز. (١٣٧٢ ک. م.)، ئەو دڵـە گەورەیەی لە جووڵە کەوت و دنیای زانست و زانایانی داخدار کرد.

نوسراوەکانی مامۆستا کوردعەلی:

١. *خطط الشّام*، ٦ بەرگ، چاپی دمشق، ١٩٢٥، ١٩٢٨ز.

٢. *تاریخ الحضارة*، ٢ بەرگ، (وەرگێڕاو لە فەڕانسیوە) چاپی میسر، ١٩٠٨، ١٩٤٦ز.

٣. *غرائب الغرب*، ٢ بەرگ، چاپی میسر، ١٩٢٠ ز.

٤. *الاسلام و الحضارة العربیّة*، ٢ بەرگ، چاپی میسر، ١٩٣٤ ز.

٥. *امَراءُ البیان*، ٢ بەرگ، چاپی میسر، ١٩٣٧ ز.

٦. *دمشق مدینة السّحر و الشّعر*، چاپی میسر، ١٩٤٤ ز.

٧. *أقوالنا و أفعالنا*، چاپی میسر، ١٩٤٦ ز.

٨ *غُوطَةُ دَمشق*، چاپی دمشق، ١٩٤٩ ز.

٩. *المذکرات*، ٤ بەرگ، چاپی دمشق، ١٩٤٨، ١٩٥٠ ز.

١٠. *کُنوزُ الاجْداد*، چاپی دمشق، ١٩٥٠ ز.

١١. *القدیم و الحدیث*، چاپی میسر، ١٩٣٥ ز.

١٢. *سیرةُ احمد بن طولون*، چاپی دمشق، ١٩٣٩ ز.

١٣. *رسائل البلغاء*، چاپی میسر، ١٩٠٧ ز.

١٤. *الفضیلة و الرَّذیلة*، چاپی میسر، ١٩٠٧ ز.

١٥. *المُجْرِم البریء*، ٤ بەرگ، چاپی میسر، ١٩٠٧ ز.

١٦. *الأشرِبَة*، چاپی دمشق، ١٩٤٧ ز.

١٧. *تاریخ حُکماء الاسلام*، چاپی دمشق، ١٩٤٦ ز.

١٨. *المُستجادُ من فَعَلات ألأجواد*، چاپی دمشق، ١٩٤٦ ز.

١٩. *البیزرة*، چاپی دمشق، ١٩٣٥ ز.

٢٠. *البعثةُ العلمیة الی دارالخلافة*، چاپی بەیرووت، ١٩١٦ ز.

٢١. *غابرُ الأندَلُسِ و حاضرها*

موحەممەد کُردعلی *(حیاته و آثاره)*، دمشق، ١٩٥٥ ز. *الاعـلام*،

ب٧، ل٧٣. *الاداب العربّيه فی القرن التاسع العشر*، بەشــی ١ و٢.

## شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی

دوا ئاڵقەی زنجیرە پیرانی نەقشبەندی لە بنەماڵەی عوسمانی، شێخ عەلائــەدینی کــوڕی شــێخ عومــەر زیائەدینە کە ساڵی ١٢٨١ ک. م. لە گونــدی «تەوێــڵێ» کوردســتان هاتــە دنیــا و خوێنــدنی لای شــێخ موحەممەدی قەرەداغییەوە دەسپێکرد و هاوکات چووە ناو کۆڕی مریــدانی بــابی پایەبەرزیــەوە و خــۆی لەگەڵ ڕیازەت کێشان و شەونخوونیدا ڕاهێنا و ئیجازەی ئیرشادی وەرگرت.

کە شێخ عومەر لە ساڵی ١٣١٨دا کۆچی دوایی کرد و شــێخ نەجمــەدینی بــرای لــە «بیــارێ»دا جێــی گرتەوە، شێخ عەلادین چیتر لەوێ دانەنیشت و ڕووی لــە ڕۆژهــەلات کــرد و لــە گونــدی «دووڕۆ»ی لای مەریواندا، تەکیە و خانەقایەکی کردەوە و لە پەنایدا مەدرەسەیەکی دینی دامەزراند و لە داهــاتی خانــەقا، قوتابخانەکەشی دەگەڕاند.

ساڵی ١٣٣٧ ک. م. شێخ نەجمەدین عەمری خوای کرد و شێخ عەلادین گەڕاوە بیارە و لــە خانــەقای باب و باپیرانیدا، ئیرشادی دەسپێکردەوە و قوتابخانەکەشی لە نۆ ئاوەدان کردەوە.

شێخ عەلائەدین، پێڕای ئیرشاد و سەیر و سولووک، کتێبانی بژیــشکی و گیاناســی و دەرمــان‌ســازی و ڕەوان‌ناسیشی دەخوێندەوە و لەم بارەوە زانیارییەکی باشی پەیدا کردبــوو؛ بــە شــێوەیەک هــەموو جــۆرە نەخۆشانی لەش و ڕەوان ڕوویان لێ دەنا.

شێخ سەرەنجام ساڵی ١٣٧٧ ک. م. بەرامبەر بە نەورۆزی ١٣٣٣ هەتاوی (١٩٥٥ ز.)، چــاوی لــە دنیــا پۆشی و بادەی مەرگی نۆشی.

یاداشتەکانی نووسەر.

## حەیدەریی مەهابادی

میرزا عەلی بەگی حەیدەری، کەسناو «سالار سەعید»، کوڕی ئەحمەدبەگی «وکیلُ‌الرُّعایا»[١]، ساڵــی ١٢٩٠ ک. م. لە گوندی «ڕەحیم‌ئاباد»ی لای مەهاباد هاتە دنیا.

باب و کاڵــی مــیرزا عــەلی لــە ســاوجبولاغی موکریــدا حوکوومــەتیان کــردووە. بــابی لــە ســەردەمی ناسەردین‌شای قاجارڕدا، لە سەردارانی لەشکری شەڕی هەرات و بووشیهر بووە و کاتێ کــە لــە شــیرازەوە گەڕاوەتەوە زێدی خۆی، یەک لە شاعیران و وێژەوانانی ناسراوی، بە ناوی بەهاری شیروانی، لــە تارانــەوە

١. ئەحمەد بەگ؛ کوڕی ئیبراهیم بەگ، کوڕی ڕۆسەم بەگ، کوڕی سەیفەدین، لە بنەماڵەی بابامیرین.

لەگەڵ خۆی هێناوە و بڕیاری داوە لە سەرینەی جل و بەرگ و خواردن و ماڵ و هەموو پێداویستییەک، ساڵی ٣٦٠ تومانی بداتێ، بەو مەرجە دەرس بە منداڵەکانی[1] بێژێتەوە.

حەیدەری لە لای شیروانییەوە زبان و وێژەی فارس و عەرەبی خوێند و شیعری ناسی. بیست ساڵان چووە نێو کاری حوکمەتییەوە و ماوەیەکیش لە سابلاغ (مەهاباد) جێگری حاکم بوو. پاشان چەند دەورە وەکوو نوێنەری ئەوێ، چووە پارلەمان (مەجلیسی شووڕای میللی) و سەرەنجام ساڵی ١٣٧٣ک. م. بەرگی حوکمەتی و شان و شکۆی نوێنەرایەتی دانا و کەوتە بەر ڕوحم و بەزەیی خودا.

**چەند غەزەلی کوردی و فارسی حەیدەری:**

خەستە و بیماری تۆم ئەی ڕۆحی شیرینم وەرە
چاوەڕێ دیداری تۆم، ئەی یاری دێرینم وەرە

ڕۆحەکەم پەرژینە بۆ حیفزی گوڵی باغی ڕوخت
ئەی گوڵی گوڵزارەکەی نەوباغ و پەرژینم وەرە

دەردی عیشقی تۆ نەخۆشی خستوم هاتوومە مەرگ
نەک ئەجەڵ موهڵەت نەدا با تاوێ بتبینم وەرە

دڵ برینـدارم بە تیری نازی چاوی بازی تۆ
بۆ تەماشای زەخمی دڵ، بۆ سەیری ناڵینم وەرە

بەڵکە ئەمجارەیش شەفام بێ من لە دەردی سەختی هیجر
بۆ مودوا ئەی تەبیبم! تاکوو باڵینم وەرە

من لە دونیادا بە تەنها تاڵبی ماچێکی تۆم
تاڵبی ماچین، نگاری چین و ماچینم وەرە

من نەهاتیم بوو، نەهاتی تا ژیام بۆ دیتنم
بارێ وەختی مەرگ و وەختی دەفن و تەقلینم

غەیری «شمس‌الدین» نەماوە ئارەزووی دینی کەسم
«حەیدەری» بۆیێ دەڵێ: ئەی شەمسەکەی دینم وەرە

* * *

غم دوری خورم و غُصەی هجران تا کی؟
جور گردون کشم و محنت دوران تا کی؟

غیر سرگشتگیم نیست نصیبی از عشق
در ره عشق سراسیمه و حیران تا کی؟

خانەی صبر دل از دست فراق است خراب
دل بی‌صبر در این خانەی ویران تا کی؟

حال عشاق پریشان ز غم دوری توست
حال این جمع چو زلف تو پریشان تا کی؟

درد عشقت همه دانند ندارد درمان
پس امید من پردرد به درمان تا کی؟

عاشق روی تو از کعبه و بتخانه گریخت
چند از کفر سخن، قصه ز ایمان تا کی؟

ما اسیریم و جهان محبس و نعمت زنجیر
یارب این سلسله در پای اسیران تا کی؟

«حیدری» آن بت سنگین‌دل بی‌مهر و وفا
تا کی از جور و جفا نیست پشیمان، تا کی؟

* * *

جان به کف تا ننهد دوست به جانان نرسد
کس به جانان نرسد تا به لبش جان نرسد

---

١. ئەو کوڕەکەی، عەبدوڵڵا بەگی میسباحدیوان (ئەدەب)ە کە پێشتر باسیمان کرد.

تا که در مصر محبت نشود خوار و اسیر — به عزیزی و شهی، یوسف کنعان نرسد
یک شبی نیست به کوی تو که از جور — تا سحر نالەی عشاق به کیوان نرسد
دل که در عشق چو پروانه پر و بالش — باز ترسم که به آن شمع شبستان نرسد
هر شبی را و غمی را به جهان پایانی است — جز شب هجر و غم ما که به پایان نرسد
نیست در وعدەی خوبان چو وفا هیچ، دلا — جهد کن کار تو با یار به پایان نرسد
ساقی ساده و این باده چو باشد بگذار — قسمت «حیدری» از کوثر و غلمان نرسد

* * *

نگار تا ز سر زلف رو به ما آورد — به سجده رفت دل و شکر حق به جا آورد
بتی که از دهنش بوی شیر می‌آید — ندانم این همه ناز آخر از کجا آورد
ز بهر صید سر زلف حلقه کرد و بسی — به دام خویش دل رند و پارسا آورد
چو هست موی تو مشکین و بوی مشک‌افشان — خطاست باد اگر بویی از ختا آورد
سپید شد سرم از دست هجر زلف سیاه — بتا به موی تو هجرم به سر بلا آورد
مریض درد فراقیم وصل چارەی ماست — طبیب بهر علاجم چرا دوا آورد؟
چو غنچه پیرهن از شوق «حیدری» زده چاک — نسیم صبح مگر بوی آشنا آورد

*سخنوران نامی معاصر*، ل٩١، گۆڤاری *ئەرمەغان*. *مێژووی ئەدەبی کوردی*، ل٤٠١، لە باسی میسباحدیوان (ئەدەب)دا.

## شێخ ئەحمەدی موختار

شێخ ئەحمەدی موختار ئەفەندی هەولێری، کوڕی شێخ عەبدوڵلا، کوڕی شێخ ئەحمەد، ساڵی ١٣٠٤ ک. م. لە سلێمانی هاتە دنیا و لە ژێر چاوەدێری بابیدا ـکە پیاوێکی هێژا بووـ ڕاهات و خوێندنی سەرەتایی دەسپێکرد. پاشان کەوتە گەڕان و تا وەرگرتنی ئیجازە، زۆرێک قوتابخانەی بینی و لە خزمەتی مامۆستایانێکی ناودار بەهرەی برد.

شێخ ئەحمەد ئەوجار ماوەیەک لە ناوچەی قەرەداغ و کەمێکیش لە «قەتیف»ی لای بەسرە، بوو بە حاکمی شەرع. دوو ساڵ پاش ئەوە چووە بەغدا و لە مەدرەسەی دادوەری شەرعیدا خوێندی و بڕوانامەی فەرمی وەرگرت. ئەوجار سەرەتا لە شارباژێڕ و پاشان لە شوێنانی‌تر وەکوو: نوسەیبین و وان و دهۆک و هەولێر و سلێمانی دادوەری کرد. دوایین شوێنێ کە ئەو مامۆستایە کاری لێ کردووە، مەحکەمەی لێکدانەوەی شەرعی لە بەغدا بووە.

شێخ ئەحمەد زانایەکی ئاگا و لە دادوەریدا زۆر وریا و هەروەها درووستکار و دیندار و داوێن‌پاک بووە

کە ساڵی ١٣٧٣ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

*تاریخ المشاهیر الالویة العراقیّه*، بەشی ١، ل ١٥٠.

## شەفیعی بۆکانی

مەلا عیسامەدین، کوڕی مەلا موحەممەدی شەفیع، لە زانایان و مامۆستایانی ناودارە کە ساڵی ١٣٠٠ ک. م. لە گوندی «ئەنبار»ی سەر بە بۆکان لەدایک بووە و ١٣٧٤، لە شاری بۆکان لە دنیا چووە.

ئەو مامۆستایە پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، جەختی لەسەر بارهێنانی فەقێیان کردووە و لە هەموو بارێکەوە مامۆستایەکی هێژا بووە. یەکجار بەلاغە و ئەدەبیاتی حەزپێکردووە و لەم بابەتانەوە نووسراوەشی هەیە و جاروبار شیعریشی داناوە.

**چەند نموونە لە شیعری کوردی و فارسی شەفیع**:

لە عیقدی ئەو برۆیەم لێ یەقین بوو نەقزی پەیمانت
بە غەمزە کەوتە غەممازی ئیشارەی چاوی فەتتانت
بە سوغرای ئەو دەمە و کوبرایی چاوت مەتڵەبێکم بوو
بە سەد دەور و تەسەلسول هاتە پێش زوڵفی پەرێشانت
لە وەسڵ و فەسڵی من ئیجاز و ئیتنابت مورەتتەب کرد
لەف‌ونەشرت موشەووەش بێ ئەدی کوا مەیلی جارانت
بە دەوری قوتبی دەم، خەتتی عیزارت دایرەی کێشا
ئوفوق بۆتە موعەددل، پێم غەریبە هەیئەتی جوانت
لە شەرحی ڕەوزەیی ڕووت دیومە بۆ توحفەی مەلا چاکە
لەسەر ئەنواری ڕوخسارت کومەسرایی زەنەخدانت
شەهیدی عەشقم و جایز نییە نوێژم لەسەر بکرێ
لە میحرابی برۆتدا بۆ بە سەف وێستاوە موژگانت؟

* * *

ڕۆح وا لەسەری لێومە بۆ ماچی دەمی تۆ — ناڵێم ئەوە سەودایە، کەمی من، کەرەمی تۆ
باڵات وەکوو ئالایە لە ژێر پەرچەمی زولفت — کێ بێ کە بە پێ خوەی نەیەتە ژێر عەلەمی

* * *

من کە شەیدایی عشقی تۆم مەستم — چی دەڵێ دوژمنم، چ دەربەستم
لێوی لەعلت جنێوی دابوو بە من — قینی بەنیادەمە، منیش گەستم

هــر تــازه ورق کــه سـبز گــشته — بــر وی خــط قــدرتش نوشـــته
کــین نقـش ببـین و نقـشگر جـوی — «ســبحانهُ لا شــریك لــه» گـــوی
حیـــران شـــده عقـــل در صـــفاتش — تـا خـود چـه رسـد بـه کُنه ذاتـش
جنـــت ثمـــری ز بـــاغ مهـــرش — دوزخ شـــــرری ز داغ قهـــــرش

* * *

خطـا کـرد آن مـرد شـیرین‌بیـان — سخن گفت در وصف شیرین لبان
کـه لیلـی قـد و قـامتش راسـت بـود — زلیخـا مـه بـی‌کـم و کاسـت بـود
خـــدایا ســـتایش ســـزاوار توســـت — کـه ایـن نقـش زیبـا ز کـردار توسـت
تـــو رخـــسار آنهـــا برافروختـــی — بدیـــشان چنـــان شـــیوه آمـــوختی
ز پرگـــار صُـــنعت فلـــك جـــدولی — ز انـــوار قدســـت قمـــر مـــشعلی
چـو خـواهی بـه افتـاده عـزّت دهـی — بـه فـرق خـسی تـاج گـل مـی‌نهـی
بـــه چوگـــان تأدیـــب، ای لایـــزال! — سـر سرکــشان را دهـی گوشـمال
وگر دست قهـرت فروهـشت چنـگ — شهنشه ز چوپان خورد چوب و سنگ
ز تختـی کـه بـر چـرخ مـی‌داد بـوس — ســـرازیر شـــد امپراتـــور روس

* * *

دوش در بـــاغ بـــزم و غلغلـــه بـــود — چمـن آشـوب و پـر ز ولولـه بـود
مــــاهرویی نشـــسته در ســـنبل — آفتـــابی میـــان ســـنبله بـــود
شـــکن زلـــف و پرتـــو رویـــش — شـب تاریـك پـر ز مـشعله بـود
گرد چشمش کـشیده حلقـه‌ی زلـف — مـست بـود و سـزاش سلـسله بـود
برقـــع افکنـــده در برابـــر خـــور — قمـــر آنگـــاه در مقابلـــه بـــود
خنده می‌زد زمین کـه ماه من است — فلـك از مـاه خـویش در گلـه بـود
کاروانهـــای دل بـــه دنبـــالش — دل مـــن پیـــشوای قافلـــه بـــود

چەند جونگی دەسنووس و یاداشتی نووسەر.

## دەهشەتی سەقزی

شێخ جەلالی نەقشبەندی، نازناو «دەهشەت»،کوڕی حاجی شێخ موحەممەد عارفی سەقزی، ساڵی ١٢٦٥ ک. م. هاتۆتە دنیا و دوای تەواوکردنی دەرس و دەوری ئایینی، لای باوکییەوە تەریقەتی وەرگرتووە و سەیر و سولووکی کردووە و دوای ئەو، لە جێگەیدا دانیشتووە.



شێخ جەلال زەوقی شیعریشی هەبووە و بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە کە هێندێک لەو شیعرانە، لەم‌لا و لەولا ماونەتەوە. هەروەها چەند نامیلکەی نووسیوە کە زۆربەیان ئامۆژگاری و باسی داب و دەستووری تەریقەتە.

شێخ جەلال زیاتر لە ١٠٠ساڵ ژیاوە و سەرەنجام ساڵی ١٣٧٤ ک. م. (١٩٥٤ ز.) لە سەقز بەشی لە دنیا براوە.

ئەم چەند بەیتە بەشێکی هۆنراوەیەکە دەهشەت لە ساڵی ١٣٤٧ ک. م. لە مەڕ بڕوای ئیسلامیوە هۆنیویەتەوە:

| | |
|---|---|
| بە «بسْم‌الله الرَّحمن الرَّحیم» | ئەمەوێ تەوفێق لە خوای کەریم |
| سەڵوات و سەلام بێ‌حەدد و حیساب | لەسەر موحەممەد هەم ئال و ئەسحاب |
| «اَلْحَمدُ لِلّه رَب العالمین» | هدایەتی داین بۆ دینی موبین |
| بۆ نەزم کردن ئەم عەقیدەیە | ئەم موختەسەری زۆر موفیەدیە |
| لە پاشان لازم لە سەرگشت کەسە | ئەمە بزانێ بۆ دینی بەسە |

لە کۆتاییشدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| نەزمم کرد، نووسیم ئەم موختەسەرە | لە حەوت ساعەتا من لە سەردەرە |
| ڕۆژی پەنجشەنبە پانزدەی سەفەر | وەخت ساعیقە و مەجیئی مەتەر |
| ساڵی تاریخی هەزار و سێسەد | چل و حەوت لە پاش هیجرەتی |
| بۆ ئەرجومەندی سەعادەتمەزید | ڕۆح شیرینم کاک احمد سعید |
| بەڵکوو جارجارێ لە جەزای چاکی | دوعایەکی خەیر بکا بۆ کاکی |
| غەریقی بەحری پڕ خەوف و مەلال | ئومێدەواری ڕەحمی حەق، «جەلال» |

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ عەبدوڵای نێزڵ

حاجی شێخ عەبدوڵڵا، کوڕی حاجی شێخ ئەحمەد شەمسەدین، کوڕی قوتبی عارفان، شێخ عوسمان سیراجەدین (د)، عارفێکی ئاگا و زانایەکی هێژا بوو کە لە گوندی «نێزڵ» لە ناوچەی «کەلاتەرزان»ی لای شاری سنە، ساڵانێکی زۆر، لەسەر دابی باب و باپیری، ئیرشادی خوازیارانی تەریقەتی کرد و ساڵی ١٣٧٥ ک. م. (١٩٥٥ ز.) دنیای بەجێ‌هێشت.

ئەو ڕەوانشادە زەوقی شیعریشی هەبووە و نازناوی «عەبدی» بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ئەم چەند بەیتە، بەشێکی شینێکە بۆ مەرگی کوڕێکی کە زاهیدی ناو بووە، گوتوویە:

یـــاران! زاریمـــەن، یـــاران! زاریمـــەن
یــــــاوەران! وادەی دڵئەفگاریمـــــەن
بانـــگ و واوەیـــلای هیجرانباریمـــەن
هەســـارەی ئیقبـــاڵ ڕوو نـــە تاریمـــەن
تـــــالع نافـــــەرجام مەینەتباریمـــــەن
جــە حـــەیات تەڵـــخ وێم بێزاریمـــەن
هەورەکەی دەروون پەردەدا جـە خـەم
قــەزا ڕاحـــەتیم کـــەرد وە تـــار و تـــەم
باران حەسرەت نە سـەرچەمەی چـەم
گوڵ بەستەن نە دڵ، سەیلاو کەرد نە چەم
جەردەی بەدبەختیم سەرەڕێی شـادیم
غـارەت کـەرد شـیرین مـەتای فـەرهادیم
گێجـــەلوول تـــۆز چـــەرخ کەجـــڕەفتار
شـــەهد شـــەوق دڵ کـــەرد وە زەهرمـــار
فـەوت بـێوادەی فەرزەنـدم: «زاهیـد»
یاونـــــان ئــــــاه و ناڵـــــەم وە ناهیـــــد
حەداد حەسـرەت دەس وە بـاڵا بـەرد
شیشەی سـەبووریم چـەکوشـکاری کـەرد
کۆچ خێرت بۆ های پەی چێش کەردی
جەســـەی نـــەفتینم وە نـــار ئەســـپەردی
غەمخواران! هانا تـەن بی وە قەقنـەس
زام نەسـرفتەم، «زاهیـد» شـی نـە دەس
قـــەزا درەو کـــەرد کـــشت جـــوانیش
بـــای ئەجـــەڵ ڕێـــزا وەڵـــگ خـــەزانیش
قابز دەسئاوەرد، خونچـەش کەنـدەوە
بـــار خـــەم پـــەرێ بـــابۆش مەنـــدەوە
«عەبدی» مەندەی گـیج دەریـای مـەهجووری
مـــەر هـــەر خوداوەنـــد بـــدۆ ســـەبووری

* * *

فەڵـــەک پـــەیکانێ شـــانا وە جـــەرگم
جـــە دوود دەروون ســـیا بی بـــەرگم
خـاپوور کـەرد بینـای قـەڵای ئومیـدم
هیچ نـەبی و تـەنگ سـککەی سـفیدم

یاداشتەکانی نووسەر. *ڕۆژمێری چیا*، س ١٣٦٥ و ١٣٦٦ ک. ه.

## ئەمینی بە تحایی

میرزا موحەممەد ئەمینی بەتحایی، کوڕی خەلیفە عەبـدولقادر، نازنـاو «امـین»، پیـاوێکی دینـدار، هێـژا، سەروزمان خوش و خاوەن زەوق بوو کە بە کوردی و فارسی شیعری دەگوت و شـیعرەکانی جێکـەوتوو وجوان بوون.

ئەمین لە گوندەکانی سەر بە سنە و لە دواییـشدا لـە شـاری سـنە، دەرسـی بـە منـدالانی قوتابخانـە دەگوتەوە و لە مامۆستایانی هەرەباش و دڵسۆز ئەهاتە ئەژمار. تێدەکۆشا شاگردەکانی بیروبـڕوایان پتـەو بێ و تەنانەت بەرماڵی پێ دێنانە مەدرەسە و بۆخۆی بەرنوێژی دەکردن.

زا و مەرگی ئەمین لە ساڵانی ١٢٩٢ ک. م. (١٩١٣ ز.) و ١٣٧٥ (١٩٥٥) لە شاری سنە بووە.

**ئەمەش دوو نموونە لە شیعرەکانی:**

شەماڵ! چەنـدێوەن نامـان بـۆی شـنۆت
لە دەس چوو قووەی شـامە پـەری بـۆت
زایقـــەم تاڵـــەن پـــەی دڵـــنەوازیت
تـــەوان دڵ بـــڕیان پـــەی پێـــشوازیت
حـــەکیم ئامانـــەن! حیکمـــەت بنمانـــە
عالـــــەم ئینتـــــزار دەوای لوقمانـــــە
جەمەن جە چەمەن گـوڵان پـەی ئامـات
چنوور چون دەروێش وێسان پەی خەڵات
سـەفکێـشان چنـار چمـان سـەربازەن
بـێسـەردار سـپا هـەموو بـێنـازەن
شـــکۆفە حـــازر پـــەرێ قوربانیـــت
گـــوڵزەرد نـــازر پـــەی زەڕئەفـــشانیت
شـــەوبۆ قـــەراوڵ شـــەو بێداریتـــەن
گـــوڵگـــوڵاو ڕەفیـــق ڕۆژگوزاریتـــەن
بـــــەڕەزا ڕازی بـــــە ڕەزای دەروون
پەی پابۆسی پات خەم بییەن چون نـوون
زەنبـــەق یاســـاوڵ خیابـــان تـــۆن
سۆسـەن جاڕووکـەش دەر و بـان تـۆن
تـــەمام ئینتـــزار تەشـــریف فەرماتـــەن
پـــەرێ ئامانـــت دۆســـانت ماتـــەن
تاقـــەی کـــشمیری فـــەرش زەمینـــەن
فەرش سەر چەمەن جـە دیبـای چینـەن
شەماڵ! ئامانەن وە تـەعجیل وە جـەخت
بارکـەرە وە نـەخت، فـەرماوە وە تـەخت
دەوا بنمانـــــــە پـــــــەرێ دەردەدار
وێنـــەی مانـــگ نـــەو بنمانـــە ڕوخـــسار
بەڵـــکەم غونچـــەی گـــوڵ بـــشکۆفێتەوە
«ئــەمین»! بـێسـەدا، شـەمـاڵ تێتـەوە

* * *

بــرای غــارت بوســه اگــر زنــم شــبخون
طلایه‌دار دو زلف تو کی گـذارد و چـون؟
بـرای دیـدن رویـت عجـب نباشـد اگـر
دلـم ز روزنـه‌ی دیـده سر کـشد بیـرون
چه دیده، دیده که سیل سرشـک در دیـده
چنان بگردد گویی کـه مـوجی از جیحـون
کــسی نپرســد حــالم ز فرقــت خالــت
کسی چـه دانـد حـال طپیـدن انـدر خـون؟
تــو تــازه کــردی بــازار عــشق را ور نــه
هـزار سـال گذشـت از حکایـت مجنـون
کمین گرفت «امین» تـا ز غـم امین گـردد
ولی ز عشق تـو افتـاده اسـت سـخت زبـون

یاداشتەکانی نووسەر.

## غیرەتی کرماشانی

سەید عەبدولکەریم ی غیرەت، کوڕی سەید عەباس، کوڕی سەید ڕەزا، لـە سـەیدە حەسـەنییەکانە کـە وەک دەڵێن، بنچینەیان دەگاتـەوە بـە عەبدوڵـڵای «محـض»، کـوڕی حەسـەنی «مُثنـی»، کـوڕی ئیمـام حەسەنی موجتەبا (د).

عەبدولکەریم لە ١١ی سەرماوەزی ساڵی ١٢٥٧ ک. ه . (١٨٧٨ ز.) هاتۆتە دنیا و خوێندنی سەرەتایی

له شاری هەمدان دەسپێکردووە و کە بابی گەڕاوەتەوە بۆ کرماشان، لەوێ چۆتە قوتابخانەی مەلا عەلی کەززازی و دواییش هەر لە قوتابخانە ئایینییەکاندا خوێندوویە و ماوەیەکیش لای حاجی میرزا بابای خەتات، مەشقی کردووە زبان و وێژەی خوێندووە.

غیرەت سەردەمی خوێندن، لاوێکی وریا، زیرەک و یەکجار تینووی زانین بوو، لە بواری هونەریشەوە، لێهاتووییەکی باشی لە خۆیەوە دەنواند؛ شیعری چاکی دەگوت، جوانی دەنووسی، لە مووسیقا سەری دەردەکرد و دەنگیشی خۆش بوو. حەڤدەسالان لە کۆڕە وێژەییەکانی ئەو چاخەدا بەشداری دەکرد و شیعری خۆی دەخوێندەوە. هەروەها وەرزشکارێکی ناسراوی کرماشان بوو.

ئەم لاوە هەڵکەوتە بیست سالان چووە ناو جەرگەی مریدانی قەلەندەری بەناوبانگ، سەید موحەممەد ساڵەحی حەیرانعەلی شانیعمەتوڵلاییەوە و هاوکات لەگەڵ مەشرووتەخوازاندا هاوکاری کرد و لە چەند ڕۆژنامەی ئەو کاتەی کرماشان، وەکوو: «*بیستوون*» و «*غرب ایران*»دا وتاری نووسی و لەو خەباتە کۆمەڵایەتییەی میللەتی ئێراندا، بەشداری کرد.

دوای کوودەتای ١٢٩٩ ک. هـ. )١٩٢٠ ز.)، زۆرێک گۆڤار و ڕۆژنامەی شاری کرماشان بریتی لە: «اُخوَّت»، «بیستون»، «رهبَر»، «کرمانشاه» و «کوکب غرب»، شیعری غیرەتیان چاپ دەکرد و ناوی غیرەت، ناسراوی هەموان بوو. ساڵی ١٣٣٨ (١٩٥٩)، کوڕی هێژای، سەید موحەممەد سەعیدی غیرەت، دیوانەکەی، هاوڕێ لەگەڵ ئەوی لەبارەیەوە نووسیویانە، بە ناوی «کُلیّات غیرت»، لە تاران، لەچاپیدا.

سەید عەبدولکەریمی غیرەت کە پیشەی بازرگانی پارچە بوو، ساڵی ١٣٢٨ ک. هـ. )١٩٤٩ ز.) بە ماڵەوە گواستیەوە بۆ تاران و تا کۆتایی ژیانی (١٣ی جۆزەردانی ١٣٣٥، بەرامبەر بە ٢٣ شەوالی ١٣٧٥) لەوێ بوو.

**چەند شیعری غیرەت:**

من دوست به جز این دل درویش ندارم — دشمن اگرم هست به جز خویش ندارم
خود هیچم و با هیچ کسم کار نباشد — اندیشه‌ای از سعی کم و بیش ندارم
هرچند طلب می‌نکنم نوشی ازاین دهر — یک دم به جهان بی‌اَلَم نیش ندارم
بگذشته جهان از من و من هم گذرانم — زین پس خطر حادثه در پیش ندارم
در دل بوَدم کیش، نیم اهل تظاهر — بدخواه کسی نیستم، این کیش ندارم
معشوق من آن بود که عمری گذراندم — اکنون دگر اندوه کم و بیش ندارم
چون نیست مرا آنچه که دزدش به کمین است — از رهزن این قافله تشویش ندارم
گفتی که نپرسد دگرم «غیرت» از احوال — قربان سرت! عادت تفتیش ندارم

* * *

هر که اندر لوح خاطر مهر جانانی ندارد
زنده نتوان گفتنش زیرا به تن جانی ندارد

عشق بر هر درد بی‌درمان بود درمان و لیکن
خویشتن دردی است بی‌درمان که درمانی ندارد

عشق از اول در گل آدم مخمر بود، ورنه
غیر آدم زان امانت عهد و پیمانی ندارد

روز چون روشن شود، پروانه را شوقی نماند
جز بهاران بلبل از عشق گل افغانی ندارد

شاهد گلچهر من از دیده چون غیبت نماید
این دل شوریده دیگر فکر سامانی ندارد

عقل دوراندیش، منعم می‌کند از عشق خوبان
جز نظر در عافیت در دست بُرهانی ندارد

ره به کوی دوست نزدیک است، می‌گویند اما
آنکه پیموده است می‌داند که پایانی ندارد

شیخ را گفتم که تا کی بی‌خبر از عشق مانی
گفت بگذر زین سخن کز بهر من نانی ندارد

آرزوی وصل را در دل نهفتم گرچه چندی
دیگر این دل بیش از اینها تاب چندانی ندارد

نزد ارباب سخن شایسته آمد نام «غیرت»
گرچه نزد مردم بازار عنوانی ندارد

* * *

گر علم لَدُنّی همه در بر داری
با این چه کنی که نفس کافر داری

سر را به زمین چو می‌نهی بهر نماز
آن را به زمین بنه که در سر داری

* * *

حاجی! حرم کعبه تمنا کردی
رفتی و هزار عیب پیدا کردی

مانند زر قلب زدندت به محک
خود را به حجر زدی و رسوا کردی

* * *

با علم اگر عمل برابر گردد
نام دو جهان هر دو میسر گردد

مغرور به خود مشو که خواندی ورقی
زآن روز حذر کن که ورق برگردد

کُلیّات غیرت، چ تاران، ١٣٣٨ ک. ه.

## بێخود

مەلا مەحموود، نازناو «بێخود»، کوڕی حاجی مەلا موحەممەد ئەمینی موفتی، کوڕی حاجی مەلا ئەحمەدی موفتی، مەشهوور بە «چاومار»، کوڕی مەلا مەحموودی پیرحەسەنی، کوڕی مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی، ساڵی ١٢٩٦ ک. م.[١] لە شاری سلێمانی هاتە دنیا و لای مامۆستایانی ناسراوی ئەو سەردەمە،

١. ئەم ئایەتە پیرۆزە، بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ساڵی لەدایکبوونی؛ بەو مەرجە دوو «اً»ی تێدا لە بەرچاو نەگیرێ: «عسی أن یبْعَثَکَ ربُّکَ مَقاماً مَحْمُوداً».

خوێندنی تەواو کرد و ساڵی ١٣٢٠، کرایە حاکمی هەڵەبجە. لەوێ، بە خێری خۆی و پێڕای کارەکەی، لەگەڵ زانایانی وەک: ڕەفیق حیلمی و زیوەر، ماوەیەکی درێژخایەن، مندالانیان ڕاهێناوە.

مەلا مەحموود تا کاکی (مەلا عەبدولعەزیزی موفتی سلێمانی) لەسەر دنیا بوو، لە هەڵەبجە ژیا و کە ئەو کۆچی یەکجاری کرد، گەڕاوە سلێمانی و تا کۆتایی ژیان (ساڵی ١٣٧٦ ک. م.) موفتی ئەو شارە بوو.

بێخود مرۆیەکی دیندار، پاک، دەهندە و بەرزەمژ، خاوەن زانیارییەکی باشی ئایینی و ئەدەبی و شوێنگرتووی تەریقەتی نەقشبەندی و مریدی پارسای گۆشەگیر، شێخ نەجمەدین کەوکەبی عوسمانی بووە. پێغەمبەری مەزنی (د) یەکجار خۆشویستووە و زۆربەی شیعرەکانی بە بالای ئەودا گوتووە.

دیوانی بێخود، ساڵی ١٩٧٠ ز. لە چاپخانەی «سلمان‌الاعظمی» لە شاری بەغدا، چاپ کراوە.

**چەند شیعری بێخود**:

دڵم مەفتوونی چاوی دڵبەرێکی نوکتەپەردازە
که مەحزی حوسنی، عەینی شۆخییە، سەرچاوەیی نازە
لە باغی نازکێدا موعتەدل سەروێکی عەنبەر بۆ
لە دیوانی چەمەنزاری دلا، فەردێکی مومتازە
بە زۆری حوسنی خوەی ئیقلیمی ئەرز و ئاسمانی گرت
لەسەر تەختی زەمین، شاهی زەمان، ماهی فەلەک‌تازە
سوەیدای پەرچەمی وەک فەجری کازب زولمەت ئەفشانە
بەیازی گەردەنی وەک سوبحی سادق پەرتەوئەندازە
حەریمی چاو و بەیتی ڕوومەت و تاقی خەمی ئەبرووی
مەتافی نازە، کەعبەی ئیمتیازە، قیبلەیی ڕازە
لە بازاڕی مەحەببەتدا هەزار و لەومەم بکەن خەڵکی
ئەڵێم: ئەم یووسوفە، پێغەمبەرێکی ساحیب ئیعجازە
دەخیلت بم بڵێ دوورڕاجی دڵ خۆی دەرنەخا «بێخود»
کە ئەم کەرکووکە جێ‌ڕاوی شەهین و واشە و بازە

**دڵی من**

لەو ڕۆژەوە ڕۆویشتووە، تۆراوە دڵی من
هەرچەند ئەگەڕێم بێ‌سەروشوێن ماوە دڵی من
ئاخۆ بە چ شاخێکەوە گیرساوە دڵی من؟
یاخو بە چڵاخێکەوە سووتاوە دڵی من؟
ئەو هەمدەمی غەمخوار و نەدیمی منە یارەب
کەوتووتە چە بەحرێکەوە خنکاوە دڵی من؟
مەجنوونی دو گیسوویی چ لەیلایەکە ئاخۆ؟
یا وامیقی جادویی چ عەزرایە کە ئاخۆ؟

دێوانــەیی ئــاهویی چ ســەحرایەکە ئــاخۆ؟
کام چیهرەپەری دیوە کە ترساوە دڵـی مـن؟

ئەتلێتەوە گاهێ بـە خەیاڵـی خـەت و خاڵـی
ئەخولێتەوە گاهێ بە چرای شەوقی جەماڵـی

نازانی ئەگەر چۆنە بـە دەس دەردەوە حاڵـی
وەک پووش و پڵاشێکە بە دەم باوە دڵی مـن

لەو چـۆڵ و بیابانـە ئـەبێ یـاوەری کـێ بـێ؟
یا بەو کەژ و کێوانەوە سەوداسـەری کـێ بـێ

یا لەتلەت وئەفگاری موژەی خەنجەری کێ بـێ؟
چون ماوە کە کوژراوە لە سـەدلاوە دڵـی مـن

بۆچی نەڕژێ سەیلی سروشکم وەکـوو بـاران
بۆچی وەکوو یەعقووب نەبمـە شـوهرەیی شـاران

لــەو یۆســفە پرســیومە لــە بێگانــە و یــاران
هــەرگیز نیــە ســۆراخی لــە هــیچ لاوە دڵــی مــن

چی بکەم چی بڵێم بۆ دڵەکەم؟ کارییە دەردم
شاهیدی مـنن مـووی سـپی و چیهرەیـی زەردم

خۆڕایی نییە ناڵەیی گـەرم و دەمـی سـەردم
هەڵــبەت بــە بەلایێکــەوە ئــالاوە دڵــی مــن

بۆ خوەی بگریم یـا نەفەسـی پـەردە دڕاوی؟
یا بـۆ جگـەری کـون‌ــکـون و سـەدپارە کـراوی؟

چی کردووە یا ڕەب کە خـەو و خـواردن و ئـاوی؟
دائیم خـەم و بێـداری و خوێنـاوە دڵـی مـن

ئەو سینە لە غەش خاڵییە ئەو بێڕق و کینـە
ئەو خادمی شەرعی نەبەوی و میللەت و دینـە

مەعلوومە چوو بۆ خزمـەتی سـالاری مەدینـە
وامزانی کــە فــەوتاوە، نەفــەوتاوە دڵــی مــن

قوربانی کەسێ بم کە بە قوربـانی نـەبی بـێ
وەک بەندە سەگی دەرگەهی شاهی عـەرەبی بـێ

شاهی عـەرەبی یـەعنی قورەیـشی نەسـەبی بـێ
جەرگی بە دو ئەبرووی ئەوە جنراوە دڵی مـن

زاتێکی وەهای گرتووە ڕۆحـم بـە فـدای ئـەو
شاهان شەو و ڕۆژ دێنە قەدەمبۆسـی گـەدای ئـەو

«بیخود»! مەبە ئیتر بە ئومێد و بە تەمای ئـەو
نایێتــەوە لات وا ســەری دانــاوە دڵــی مــن

## نەشئەی چەمەن

دیسان نەشەی چەمەن لە بەهەشتی بـەرین ئـەکا
گوڵغونچە هەم لە لێوی دەمی حـۆری عـین ئـەکا

ئــاخۆ چ مەوسمێکــە کــە ســەحرا و شــاخ و داخ
زەنگار و زەرد و سوور و سپی و سەوز و شین ئەکا

بــەربووکی نەوبــەهارە بــە ئــەنواعی ڕەنــگ و بــۆ
ئارایــشی کچــانی گــڵۆکی زەمــین ئــەکا

ناگاتـە سـەروی قامـەتی ئـەو شـۆخە ئـاهی مـن
ئەو جیلوەیی سەبا بە قـەدی یاسـەمین ئـەکا

بـۆ دەفعـی ژانـەسـەر ڕەشـەڕێحانە یـەک چـڵی
کاری هەزار سەندەڵ و سەد موشکی چـین ئـەکا

ڕۆح بـۆ نـەکا فیـدای سـەفا بولبولـی فگـار
هەر تاقە سروەیێکی دەوای سەد بـرین دەکـا

بولبول خەریکە تەوقی سەری هەڵکەنێ بە چنـگ
گوڵچین کە دێتە باغ و تەمای گوڵچنین ئەکا

زاهد کە سەیری پەرچـەمی سـونبول ئـەکا ئەڵـێ
ئــەم ڕشــتە بــادراوە لــە «حَبْلُ‌ٱلْمَتِين» ئــەکا

هەر فەجری کازیبە کە ئەشـوبهێ بـە زولفـی یـار
هەر سوبحی سادیقە لە بەیازی جـەبین ئـەکا

هەر لالەیە بـە ڕەنگـی شـەفەق سـوور ئەچێتـەوە
هەر ژاڵەیە لە ئەنجومـەنی چـەرخی بـەرین ئـەکا

هەر بەردی جۆبارە سپی و سافە وەک سەدەف
هەر شەونمە لە دانەیی دوڕڕی سەمین ئەکا

هەر یاکەریمی قومرییە تەئسیر ئەکا لە دڵ
هەر زیکری عەندەلیبە لەناڵەی حەزین ئەکا

هەر تەیر و تورە وەک من ئەخوێنن لە خۆشیا
هەر باخەوانە ئارەزووی هەڵپەڕین ئەکا

ئەی باخەوان! مەزانە کە زستان گەڕایەوە
موژدەم بەڕێ کە بۆ چلە ئەم بەفرە شین ئەکا

ئەم شادی و سوروورە لە شەوقی بەهارە یا
عەشقی گوڵێ کە عەفوی هەموو موزنبین ئەکا

زاتێکی وا بە ڕەحمە لە ڕۆژی شەفاعەتا
هەرچی جەهەننەمی هەیە جەننەتنشین ئەکا

ڕۆح فەرشی ڕێ کەسێکە کە مەجمۆعی کاینات
بۆ پێ موبارەکی لە پەڕەی دڵ سەرین ئەکا

پەیغەمبەرێ کە لەیرەوە تا عەرشی ئیزەدی
تەییی ئەوەندە ڕێگە بە یەکدەم یەقین ئەکا

خورشیدی مەحز ئەگەر نییە یاران لە ئایەتا
ناوی شەریفی بۆچی خودا «ی» و «س» ئەکا

قوربانی ئەو خودایە کە تفلێکی بێپەدەر
ساحیب سپا و ڕایەت و تەخت و نگین ئەکا

ئیحیای مەسیح ئەگەر نەفەسێ بۆ جەنابی ئەم
تا ڕۆژی «یوم ینفخُ» ئیحیای دین ئەکا

چون خەتمی نەعتی ئەو بە من ئەکرێ کەوا خوا
هەر بەو ڕەسووڵە خەتمی هەموو مورسەلین ئەکا

«بێخود» لە فەیزی نەعتی «علیەالسّلام»ەوە
هەرکەس کەلامی تۆ ببیێ ئافەرین ئەکا

* * *

ای مهر چهرەات سحرآرای کاینات
زلف تو آب دادە بە یلدای کاینات

از چشم نیم مست تو ای گلشن مراد
شد باز چشم نرگس شهلای کاینات

وز انعکاس لعل تو ای گوهر یتیم
مرجان شدە است لالەی حمرای کاینات

خال تو حسرت حجرالاسود وجود
روی تو رشك کعبەی عُلیای کاینات

ای سینەی تو مخزن اسرار ایزدی
وی گفتەی تو گوهر یکتای کاینات

کوی تو معبد همە کرّوبیان قدس
محراب درگە تو مصلای کاینات

گرد رە تو صیقل آیینەی دو کون
خاك در تو ناصیە پیرای کاینات

یك ذرە از ضیای تو خورشید آسمان
یك قطرە از سخای تو دریای کاینات

ای نرگس تو ساغر صهبای کاینات
وی گردن تو مایەی مینای کاینات

در عرصەی سمند تو ای شهسوار دین
آمد بە تنگ فُسحت پیدای کاینات

آن یوسفی، کە دید تو را چون بە خواب ناز
جان باخت در رە تو زلیخای کاینات

آن موسیی، کە در شب معراج بوسە زد
پای تو را رخ و ید بیضای کاینات

آنی کە نە سپهر بە چوگان رفعتت
افتادە همچو گوی بە صحرای کاینات

من کیستم؟ چەام؟ کە بە نعت تو دم زنم
لال است در نعوت تو گویای کاینات

از چـار یـار پـاک تـو ای زبـدەی قـریش شـد پایـدار چـار زوایـای کاینـات
یـارب بـه حـق احمـد مختـار و آل او یـارب بـه امّهـات و بـه آبـای کاینـات
یـارب بـه حـق عـزت سـبطین مـصطفی یـارب بـه اشـک دیـدەی زهـرای کاینـات
«بیخـود» ز کیـد اهـرمن وغـول آرزو گـم کـرده ره بـه دشـت تماشـای کاینـات
امـروز اگـر مـدد نکنـد خـضر رحمتـت فَردا نه من، نه انس، نـه جـن، وای کاینـات

*دیوانی بێخود*، چاپی بەغدا، ١٩٧٠ ز.

## مەعرووفی سلێمانی

ناسراو بە «میرزا مارف»، کوڕی مەلا ئەحمەد، ساڵی ١٣١٣ ک. م. هاتۆتە دنیا و خوێنـدنی لـە سـلێمانی تەواو کردووە و پاشان لە مەزرینگەی داراییدا دامەزراوە.

میرزا مارف پیاوێکی هێژا، ویژەوان، فەلسەفەزان و شاعیر بووە و ساڵی ١٣٧٦ ک. م. لە دنیا دەرچووە. ئەم غەزەلە هی ئەوە:

وەکوو تاوس چییە ئەمڕۆ بە نازەو خـوەت ئەنەخـشێنی
پەنا بەخوا بە چاوتـا دیـارە دیـسان دڵ ئەلـەرزێنی
نەکەی بەرد هەڵگری بۆ شیشەیی دڵشێتەکە! خـۆ دڵ
لە تۆ زیاتر کەسێکی تیا نییە بـۆ تێکـی ئەشـکێنی
لە لای خۆتە وەکوو ئاوێنـە بـێ گـەردە تەماشـاکە!
بە دایم خۆتی تیا بنوێنـە ئەیکـە بـۆچی ئەشـکێنی
لە تووڕە بوونی دوێنێ تۆ نەترسـا دڵ کـە ئـەیزانی
ئەمانـە گاڵـتەیە بـینی کـە لێـوی لـێ ئـەقرچێنی
هەزار جەور و جەفام دەر حەق بکەی من هەر ئەڵێم خوایا
منالە، دڵڕەقە، خوەی چا ئەبێ تۆ لێمـی نەسـتێنی
دەزانی من بە سەودای تۆوە عومرم بردە سەر، تـازە
بە دەر کردن لە ئەم قاپی مورادەم چۆن ئەترسـێنی
گەیشتمە بەردەمی دەرگانەکەت، کەعبەی تـەوافی دڵ
لە لام یەکسانە ڕووت داپۆشی یا خۆ بۆمی بنـوێنی
ئەوا کەوتوومە بەندی پەرچەمی ئەو شۆخە من «مـارف»
خەیاڵی خاوە تۆ بتوانی لـەم بەنـدەم کـە دەربـێنی

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل٤١. *یادی ئەدیبان*، ل٤٢.

## ئاغا عینایەت

کوڕی ئاغا هیدایەت، کوڕی مەلا نیشاتە کە لە خانانی جوانڕۆ نزیک بووە و گەورەی خێڵ ڕاوێژی دەگەڵ کردووە. لە سەردەمی دەسەڵاتداری و بڕۆ- بڕۆی ڕەزاشای پەهلەویدا، ئەویشیان لەگەڵ سەرۆک‌هۆزان گرتووە و دەساڵیان لە گرتووخانەی ئەسفەهان خستووە و ساڵی ١٣٢٠ ک . هـ. )١٩٤١ ز.) بەریان‌داوە.

ئاغا عینایەت مرۆیەکی ژیر، بەوەج و هەروەها شاعیر و ویژەوان بووە و ساڵی ١٣٧٦ ک. م. (١٩٥٦ ز.)، لە تەمەنی حەفتا ساڵان، لە گوندی «کەڵێ» لای جوانڕۆدا لە دنیا چووە.

ئەوا پارچەهەڵبەستێکی ئەو خوا لێ خۆشبووە کە لە وەرامی موحەممەد بەگی ڕۆسەمیی جوانڕۆییدا نووسیویە:

دۆسەکەی گیانی، ڕوستەمی‌نەژاد! نامەی شەریفت خەمان داد وە باد
ئەشعار مەربووت مەعدەن شوعوور سەیقەلی شەففاف بە وێنە بلوور
موناجات خاس دڵ پەسەندیدە وانام و ساوام وە هەر دو دیدە
ئەشعار وەش‌ئاهەنگ شیرینت وەندم جە دوڕئەفشانیت من حەیران مەندم
ئەشعارت جە لام وێنەی شەکەرەن من جە واتەی وێم قەلبم پەکەرەن
حەیفەن قاتی بۆ ئەو شیرین وەی تەڵخ ئەو ئاو سافەن ئێد لەجەن هەم بەڵخ
ئەو دانەی گەوهەر، ئێد سەنگ خاران ئەو پارچەی حەریر، ئێد کۆنەی شاران
ئیسە ئەساسەی تەحریرم نییەن پەی سەبتش ئایر نە قەلبم شیەن
نگاش مەدارۆ تا دەرجش کەرۆن هەروەخت وەسیلەش وەدەس باوەرۆن
قاتی- پاتی بۆ خاس چەنی خراو تا بۆ وە شەربەت شەکەر چەنی ئاو
یادگارییەن پەی کەسێ مانۆ شایەد دوعایێ پەیمان بکیانۆ

**شیعرێکی فارسی ئاغا عینایەت**:

خداوندا! چه باید کرد، شد عمری گرفتارم به زندان بلا محکوم مأمورین غدارم
نه انصافی ز مأمورین، نه رحمی از توام شامل گناهم چیست، تا کی روز و ماه و سال بشمارم؟
رجال ملك، نابینا ز تشخیص کس و ناکس من بیچاره پندارند گرگ آدمی خوارم
بسی بگذشت سال و ماه و من محبوس و مأیوسم کسی ننمود رحمی بر تن رنجور و بیمارم
در رحمت گشایش کُن خدا، آگاه هر حالی که آنان کور و نابینا، توی بینا و ستّارم
ز هجران کسان خود به سان دیگ می‌جوشم ز تنهایی سر شب تا سحر نالان و بیدارم

به جان مشتاق مرگم تا رهم زین رنج بی‌پایان | ز بس ماندم تـه زنـدان، ز جان خـویش بیـزارم
شـکایتها بـه دل دارم از ایـن حکـام خـون‌آشـام | کـه پندارنـد چـون آنـانم و فـردی تبـه‌کـارم
«عنایـت» را جگرخـون اسـت زیـن اوضـاع آشـفته | مگر با لطف خـود کـاری کنـد خـلاق دادارم

*حدیقەی سُلطانی*، ل ٢١. یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ سەعیدی نۆرسی

عەللامەی پایەبەرز، سەعیدی نۆرسی، مەشـهوور بـە «بـدیعُ الزّمـان»، ساڵـی ١٢٩٣ ک. م. لـە گونـدێکی ناوچەی «هێرات»ی سەر بە بدلیس هاتە دنیا و بە هـۆی بـیری تیـژ و زیرەکـی و لێهـاتوویی زۆرەوە، لـە ماوەیەکی کەمدا خوێندنی زانستی و ئایینی دوایی‌هێنا و لە زۆرێک زانستی ئـەو سـەردەمە، بـەتایبـەت مێژوو، جوگرافی، بیرکاری و فەلسەفەدا شارەزایی پەیدا کرد و وردە ـ وردە چەند زمان فێر بوو.

سەعید هەر لە هەرەتی لاوەتی و کاتی هەرزەکارییەوە، تێکۆشان بـۆ ئاگـادار کردنـەوە و تێگەیانـدنی هاوزمانانی دەسپێکردبوو. کە پێگەییشت، دەیان کتێب و نامیلکەی، بە عەرەبی و ترکی و کـوردی، لـەم بارەوە نووسیبوو؛ کە گوتاری «نوور»، یەک لەوانەیە.

شێخ سەعید سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی بوو. بەم بۆنەوە، خەڵکێکیٚ زۆر ببوونە مریدی و سەریان نـابووە رێی داخوازە خێرخوازانەکانی. ئەم مامۆستا ئازادیخوازە خـەریک بـوو لـە شـاری «وان»دا، زانکۆیـەکی گـەورە دامەزرێنیٚ کە زبانی کوردی تێیدا بگوترێتەوە. تەنانەت دەوڵەتی عوسمانیشی بۆ ئەو کارە ساز کردبـوو؛ بـەڵام قەومانی شەڕی جیهانی، بارودۆخەکەی گۆڕا وکارەکەی لیٚ تێکدا. ئەمجار پارچە ـ پارچە بوونەوەی دەوڵەتی عوسمانی و زۆرگرتنی دژمنی قەسایقەسی کورد، مستەفا کەمال (ئاتاتورک)، لـە کوردسـتانی ژێردەسـەڵاتی ترکدا، تەواو بڕستی لیٚ بڕی. جار لە دووی جار و هەر جاریٚ بە شێوەیەک، بانگیان دەکردە بێدادگای خۆیانەوە و شەڕیان پیٚ دەفرۆشت. جارێک بە بیانووی جیایی‌خوازی و بشێوە نانەوە و کەڕەتیٚ لەسەر بانگەواز کردن بـۆ دین ، تەرەیان دەکرد و لە بەندیان دەخست و سەرەنجام لە ٢٧ی ڕەمـەزانی ١٣٧٩ ک. م. لـە تەمـەنی ٨٦ ساڵان، لە زیندانی شاری ئورفەدا، دەستی لە ژیان بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا.

چەند گۆڤاری کوردی.

## میهری

مەلا موحەممەد، ناسراو بە «مهری» و کەسناو «برهان‌الاسلام»، کوڕی عەللامـە مـەلا عەبدوڵـڵای مـوفتی، ساڵی ١٣٠٦ ک. م. لە گوندی «دشە»ی لای پـاوە هاتـە دنیـا و هێنـدێک پـاش لـەدایکبـوونی، بـابی پایەبەرزی بە ماڵەوە چوو بۆ سنە و موحەممەد لەو شارە خوێندنی دەسپێکرد و ١٩ ساڵان بوو، بە بۆنـەی

لێهاتوویی لە ڕادەبەدەر و بیری تیژ و تێکۆشانی زۆرەوە، توانی ئیجازە وەرگرێ و بە شوێننیدا لە قوتابخانەیەکی شاری سنە، بوو بە مامۆستا. بەڵام ئەو دڵی بەوە دانەدەمەزرا و زۆر بەئاوات بوو دنیا باشتر بناسێ، وڵاتانی تر ببینێ و ئەگەر دەست بدا، لە قوتابخانە گەورەکاندا بخوێنێ. چەند جار ئەم مرازەی خۆی دەگەڵ بابی باس کرد و هەموو جارێ بەرپەرچی داخوازەکەی درایەوە. سەرەنجام شەوەناوێک، بێ پرسی باوکی، لە شار دەرکەوت و ڕووی لە ڕۆژاوا نا و چوو بۆ عیراق.

میهری ماوەیەک بە شارەکانی عیراقدا گەڕا و قوتابخانەیەکی زۆری بینی و خزمەتی چەند مامۆستای گەورە گەییشت. پاشان گەیشتە ئەستەمبووڵ و لە مەدرەسەی پسپۆڕی تەفسیر و حەدیسدا، بە ناوی «*مدرسة المتخصصین*»، پاش تاقی کردنەوە، وەرگیرا و بە یەکەم دەرچوو و بڕوانامەی پسپۆڕی ئەوێ وەرگرت. کورتەیەک لەودوا هەر لەو مەدرەسە وەکوو مامۆستا وەرگیرا و تا هەڵوەشانی عوسمانی، تێیدا دەرسی گوتەوە. بەشوێن ئەوەدا و لەگەڵ دامەزرانی دەوڵەتی تورکیا، بوو بە بریکاری وەزارەتی داد و هاوکات لە ئەزموونی زانکۆی حوقۆقدا بەشداری کرد و وەرگیرا و بە سێ ساڵ ئەوەشی تەواو کرد.

میهری هاوکات لەگەڵ بریکاری فەرمی لە وەزارەتی داد، لە زانستگایەکی ئەستەمبووڵدا دەرسی زبان و وێژەی عەرەبی گوتۆتەوە و هەروەها چەند کتێبی بە عەرەبی و ترکی و فارسی نووسیوە.

میهری لە شیعر و پەخشانی کوردی و عەرەبیدا زۆر بەدەستەڵات بووە و پەخشانی فارسی و ترکیشی باش نووسیوە؛ جاروبارەش بە فارسی شیعری گوتووە. بەڵام بەداخەوە کە هەر ئەوەندە لە وڵاتی ترکان دامەزرا، چیدی ئاوڕی لە زێدی خۆی نەدایەوە و قەت بەرەو کوردستان نەگەڕایەوە. تا لە دنیا مابوو، جار ـ جار نامەی بۆ خزم و کەسانی دەنووسی؛ بەڵام کە لە دنیا دەرچوو، کەس خەبەرێکی لە منداڵانی نەزانی و شوێنی ئەو مامۆستا بلیمەتە لە کوردەواریدا کوژایەوە و کەس نەیزانی ئەو نووسراوە بایەخدارانەی چی بەسەر هات.

کۆچی یەکجاری میهری، ساڵی ١٣٧٦ ک. م. (بەهاری ١٩٥٧ ز.)، لە وڵاتی غەریبدا ڕوویداوە.

ئەم قەسیدەیە میهری بە بۆنەی میللی بوونەوەی نەوتی ئێران لە ساڵی ١٣٣١ ک. هـ. )١٩٥٢ ز)دا، بۆ ئایەتوڵڵا کاشانی ناردووە.

قائِدَ العَنقاء! فی أنحاء حَی — عَنّ عَنّی «آیةُالله» وَ حَیّ
آیةَ الله الَّذی قَدْ أشْرَقَتْ — مِنْ سَنا أفکاره آراءُ «ری»
عالِمٌ قَدْ نالَ إرْثَ الأنبیا — «آبدان» بَدْرُهُ وَ النَّفْتُ فَیّ
سَیْفُهُ التَّسْبیحُ فی حَلّ الأمُور — لا یُبالی بلَعلَّ أوْ بَکَیْ
وَ إذا ألقی عَصا تَدبیره — فَهو ثُعْبان للَقف کلّ حَیّ
وَ مَتی قال بـ«کاشان» وَ «قُمْ»: — قُمْ بإذْن الله فَالْمَیْتُ کَحَیّ
ذوفُقار عَزْمُهُ، و خَصْمُهُ — مَرْحَبٌ، عَمْروٌ و کعْبٌ وَ حُیَیْ

| | |
|---|---|
| فکْـــرُهُ ذکْـــر و تَـــذْکارٌ لَنـــا | میـــرُ جوعـــان و للعطـــشان ریّ |
| رأسُـهُ عنْـدَ الـسُّجُود فـی الثّـری | وَلَـــهُ فَـــوْقَ رُؤوس النـــاس فـــی |
| فألّیـــــــه بفتْیــــــان انتمـــــــوا | لـــ «علـــیٍّ» و «معـــاذ» و «لُـــؤی» |
| و نَمَـوا فـی رَوْضَـة القُـرْآن و الْـــ | ـعلم مـنْ فَـضْل ابـی و مـنْ «أبَـیّ» |
| إنْ نـــأتْ عَنّـــی بـــلادی اَوْ أنَـــتْ | فَأنـا «ذُوالـرُّمّـة» وَ الْـ«إیـرانُ»، «مَـیّ» |
| انَّ «مهـــــری» شَـــیخ ســـیّاراته | وَ مَـدارُ سَـیْرهمْ فـی ملـک «کَـی» |

وەک دەگێڕنەوە، میهری، کاتێ کە لاو بووە و فەقێ موحەممـەدیان پـێ گوتـووە، لـە وەرزشـی بـاوی فەقێیان (سێباز)دا، گرۆی لە هەموو بردۆتەوە و کـەس تـۆزی نەشـکاندووە. لـەم بـارەوە حیکایـەتی وام بیستووە کە چەند کەسیش شایەتییان لەسەرداوە، بەڕاستی سەرسووڕێنەرە و زۆرتر لـە فـڕین دەکـا و وا بازیداوە، پاڵەوانانی جیهانیی ئەوڕۆشی پێ نەگا.

یاداشتەکانی نووسەر.

## جەوهەری

میرزا موحەممەد، ناسراو بە «سەعید دیوان» و نازناو «جەوهەری»[١]، کـوڕی مـیرزا حەسـەنی سـندووقدار، کوڕی ئاغا ئیبراهیم، کوڕی ئاغا موحەممەد سەلیمی جەواهیری، کوڕی ئاغا مەولان، کوڕی ئـەوڕەحمان بەگ، کوڕی غەفار بەگ، کوڕی عەبدوڵڵا سوڵتان، کوڕی حاجی یەعقووب بەگ، کـوڕی کـەیها ساڵـەح، ساڵی ١٢٥٩ ک. هـ. )١٨٨٠ ز.) لە سنە هاتە دنیا. بەو بۆنەوە بـابی گەوهـەرناس و جـەواهیرفرۆش بـوو، «جەوهەری»یان پێ گوت و ئێستاش ئەو بنەماڵە، هەر بەو ناوەوە ناویان لێ دەبەن.

جەوهەری خوێندنی ئایینی و ئەدەبی لە سنەدا دەسپێکرد و کۆتایی پێ هێنا و مرۆیەکی ئاگا لە فیقهـ و تەفسیر و مێژوودا بوو؛ بەڵام زبان و وێژەی فارسی باشتر دەزانی. لـە شـیعریش سـەری دەردەچـوو و قەسیدەی چاکی دەگوت. ساڵانێکی زۆر لە مەزرینگەی ئامار و سەبتدا کاری دەکرد و دوایی وەنیشە کرا و پاش ئەوە زۆربەی کات و ساتی، بە هاونشینی زانایان و هێژایان ڕابوارد. ئەهلی تەریقەتی نەقشبەندی و لە مریدانی شێخی پایەبەرز، حوسامەدین عەلی ئەهاتە ئەژمار. سەرەنجام ١١ی پووشپەڕی ١٣٣٦ (١٩٥٧ ز.)، بەرامبەر بە ١٣٧٦ک. م. ڕووی کردە بارەگای خودا و لە زیارەتانی بنەماڵەییان لە «شێخان»دا نێژرا.

**چەند شیعری کوردی و فارسی جەوهەری**:

| | |
|---|---|
| سەیلی ئەشکم وا کە دەیبـینی دەمـادەم جارییـە | لەتلەتی جەرگە بـە چاومـا دێ کـەوا گوڵـنارییە |

١. ماوەیەک نازناوی «حەسرەت» بووە.

عاقڵم ئەمما لە بۆ عەشقی وەتەن مەجنوون‌سیفەت
وا مەزانن ئاهـ و ناڵەی مـن درۆیـە و بـێ‌جیهـەت
گا بە دەستی پاسەوانان سەر لە خوار و پێ لە بەند
شـێویا ڕەفـتم لـە ڕەفتـاری کـەچی ئێـڕانیان
ئەم خەرابی وەزعە لای من خۆ قوسووری میللەتە
کـورد بێچـارە و زەبوونـە وا لـە نێـوی میللـەتان
«جەوهەری» بیستوومە دیکتاتۆر گـۆڕی گـوم‌بـووە

ڕۆژ دەناڵـم، شـەو پەشـێوم، کـار و بـارم زارییـە
ئەی موسڵمانان مەکەن مەنعم کە دەردم کارییـە
گاه دەسبەندم بـە دەسـتی ئەفـسەری ژاندارییـە
ئێستە ڕەفتـارم ئەسـیری دەسـتی بەدڕەفتارییـە
عاریە میللەت لە فیکـر و کـاری هـەر بـێ‌عارییـە
چونکە ڕەویـەی دەوڵـەتان تـەبعیز و کوردئازاریـە
گەر درۆ بێ چارەمـان ئـەم جـارە هـەر ناچارییـە

**زاراوەکانی شەترەنج بە کوردی:**

نـە هەرکـە پیـادە بێتـە مەیـدان لاتـە
گەر ئەسپی نەما حەریف و لێتی کش کرد

نەک شایچ کە وەزیـر و فیـڵی بـڕیا ماتـە
خۆت لادە بە ڕوخ بگرە، جـڵەو ئـەو شـاتە

**لە قەسیدەیەکی فارسی:**

این چه شور است و فغان در گوشه‌ی صحرای دل
گـشته بـی‌دلبـر دلـم سرگـشته چـون زلـف نگـار
آن غــزال شــیرگیر از بهــر آهــوی دلــم
دل ندانــد غیــر کــوی دوســت مــأوای دگــر
بــا همــه بیچــارگی نــارد بــه عــالم ســر فــرود
تــا کــی ای غافــل ز نــادانی بــه مــأوای کــسان
دل بــه صــاحبدل ده ای غافــل اگــر صــاحبدلی
گــوهر مقــصود ار خــواهی اگــر آری بــه کــف
گــر شــوی بــا ناخــدا همداســتان در ایــن بحــار
دســت زن در دامــن صــدر جهــان، کهــف امــان
آن که چون در بحر فکرت در شـود آرد بـه کـف
آن که از کثرت به وحدت چـون نمایـد یـک نظـر
خاک کـویش را کـه باشـد سُرمه‌ی چـشم قلـوب
«شــکر لله ذوجنــاحین اســت و ســالار اجــل
ای جــوان بختــی کــه پیــر دهــر دیگــر نــاورد
چـون منـی را گـر تـو بپـذیری نباشـد نقـص تـو
«جـوهری» را گـر زر و دولـت نباشـد، گـو مبـاد

می‌رسد هـر دم بـه گـردون نالـه و غوغـای دل
زان نباشـد جـز بـه چـین پـرچمش مـأوای دل
مـی‌نهـد هـر لحظـه دام عـشق انـدر پـای دل
ورنـه جُستی راهـی انـدر صحنه‌ی پهنـای دل
ای بــسا داد و فغــان از عــزّ و اســتغنای دل
ناکــسان را ره دهــی در منــزل والای دل
ورنـه سـرگردان شـوی یکبـاره در بیـدای دل
غوطـه‌زن مردانـه در ژرفـای ایـن دریـای دل
از خــدا یــابی اَمــان از مــوج محنــت‌زای دل
«شــه حــسام‌الــدین» یگانــه مرشــد والای دل
بــی‌تعــب یکــدم هــزاران لؤلــؤ لالای دل
وحدت انـدر کثـرتش گـردد عیـان از رای دل
گاهی انـدر دیـده‌کـش تـا بـشکفد گلهـای دل
بـر قــدش بــادا مبــارک خلعــت زیبــای دل
چون تو پوری مقتـدر در عرصـه‌ی احیـای دل،
در کمالــت مــی‌فزایــد خــالق یکتــای دل
گــوهر معنــی اسـت او را نقـد روح‌افـزای دل

**چوارینە**:

ای خفتـه بـه عـیش و نـوش سـر بـر بـستر    وز نــوع تــو صــدهزار بــر خــشتش ســر
از حالــت زیــر دســت خــود یــاد آور    زان پـیش کـه بـسترت شـود زیـر و زَبَـر

* * *

گـر تلـخ و اگـر خـوش گـذارنی، گـذرد    هرچنـد کنـی تـو سـختجـانی گـذرد
جـان مـی کنـی وزکنـدن جـان نرهـی    بگــذر ز جهــان، جهــان فــانی گــذرد

* * *

ای خواجه اگر دمـی تـو را فرصـت هـست    بـا عجـز و نیـاز سـوی حـق بگـشا دسـت
کـامروز دو دسـت ار بـه دعـا بـرداری    فـردا نـشود بـه نـزد حـق دسـت تـو پـست

یاداشتەکانی نووسەر.

## ئاغە ڕەشە

سەید موحەممەد ڕەشیدی قورەیشی، ناسراو بە «ئاغە ڕەشە»، کوڕی سەید فەتحوڵا و لە پشتی باوەشێخ ئەحمەدی باینچۆ، ساڵی ١٢٥٩ ک. ھ. (١٨٨٠ ز.)، لە گوندی «کەوڵە»ی سەر بە دیواندەرە، لە باکووری شاری سنە هاتە دنیا و کە پێگەییشت، بۆ خوێندن لە زێدی خۆی دەرکەوت و لە قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، خزمەتی زۆرێک لە مامۆستایانی ئەو کاتە گەییشت و ئیجازەی وەرگرت و گەڕاوە کەوڵە.

سەید موحەممەد ڕەشید پیاوێکی دیندار، ئاگا، ئازا، ڕاستبێژ و بێ ڕووبینی بوو. نانی مەلایەتی نەدەخوارد و بە کشتوکاڵ لەسەر پارچە زەمینێک کە هەیبوو، دەژیا. ئەگەر بۆ داوەری ئەکەوتە نێوان دوو کەس یان دوو لایەنەوە، دۆست و دژمنی نەدەناسی و ئەوی بە ڕاست دەزانی، ڕادەگەیاند. هەر بەم بۆنەوە، هەموو بڕوایان پێ دەکرد و ماڵی وردە-وردە ببووە شوێنی هانای ناحەقیلێکراوان و جێی چاری کێشە و داوەری نێوان خەڵک و پەنای لێقەوماوان.

لە سەردەمی خانخانی و بشێوەی کوردستاندا، دەرکی ماڵی دانەدەخست و زۆر هەڵکەوتووە پەنایان پێ بردووە و بەڵایان لەسەر کەوتووە. بە هۆی ڕێز و وەجێک لە نێوان هەموو چینێکدا پەیدای کردبوو، زۆر جاران ناوبژی کردنی لە نێوان عەشایری ناوچەکەدا، ئاوری دامرکاندووە و پێشی بە شەڕ و خوێنڕشتن گرتووە. هەروەها چەکدار و خاوەن دەستەڵاتی دەوڵەتیش لەبەر ئەو، کەمتر دەستدرێژی و بەدفەڕییان کردووە و ئامۆژگارییان لە گوێ گرتووە.

ئاغەڕەشە سەرەنجام زستانی ساڵی ١٣٤٢ ک. ھ. (١٩٦٤ ز.)، پاش عومرێک خزمەتی بێ چاوەڕوانی،



دەستی لە ژیان بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا.

یاداشتەکانی نووسەر.

## گۆران

گەورەترین بنیاتنەری شیعری نوێی کوردی، عەبدوڵڵا بەگی گۆران، کوڕی سلێمان بەگ، کوڕی عەبدوڵڵا بەگ[١]، ساڵی ١٩٠٤ ز. بەرامبەر بە ١٣٢٢ ک. م. لە شاری هەڵەبجە هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکرد. شەش‌ساڵان بوو (ساڵی ١٣٣٨ک. م.)، باوکی سەری یەکجاری نایەوە و بە شوێن ئەوەدا بە کەس و کارەوە، چوون بۆ هەورامان. ساڵی ١٣٤٠ چووە کەرکووک و لە مەدرەسەی «علمیّە»دا ناوی نووسی؛ بەڵام پاش چەند مانگ ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی. ساڵی ١٣٥٧ لە مەزرینگەیەکی دەوڵەتیدا دامەزرا و پێڕای ئەوە سەری نایە سەر زمان خوێندن و شیعر گوتن و لەو سەردەمەدا کە عەرەبی و ئینگلیسی و فارسی فێر دەبوو، بە شیعرە کوردییەکانیەوە، بەرگێکی گرینگ و بایەخداری لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا نەخشاند.

ساڵی ١٩٥٨ پاش چەند ساڵ لە زیندان پرتووکان و جەزرەبەی جۆراوجۆر کێشان، بە ڕووخانی ڕژیمی پاتشایی و سەرهەڵدانی جومهووری، بوو بە مامۆستای زمان و وێژەی کوردی لە زانستگای بەغدا؛ بەڵام ئەو ماوە زۆری نەخایاند و ئەجەلی بێ وادە، یەکجار زوو ئاوڕی لێ دایەوە و لەشی ئازریوی، نەخۆشی شێرپەنجەشی لێ بوو بە میوان و ئەو گەنجینە بێ‌وێنەی شیعر و وێژەی کوردییەی لە ٢١ی دوایین مانگی ساڵی ١٩٦٢ ز. (١٣٨٢ ک. م.) لێ ساندین.

گۆران سەرەتا ـ وەک باقی شاعیرەکان ـ خۆی بەستبووە کێش و سەروای عەرووزیەوە و لەم مەیدانەدا قەڵەمی جوان دەگەڕا و بێ شک ئەو شیعرانەی بۆ دڵی خۆی گوتوونی و هی ئەم سەردەمەن، لە بەرزترین شیعرەکانی ئەو دەورانە دێنە ئەژمار:

بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە ... لە باغچەی بەهار گوڵم چنیوە
شەونمی درەخت لە ڕووم پژاوە ... لە زەردەی زۆر کەل سەرنجم داوە
پەلکەزێڕینەی پاش بارانی زۆر ... چەماوەتەوە بەرامبەر بە خۆر
هەتاوی نەورۆز، مانگی جۆ درەو ... زۆر هاتوون و چوون، بە ڕۆژ و بە شەو
خوڕەی قەڵبەزی کەفزێوینی چەم ... لە هەزار چەشنە پرشنگی ناوتەم
میوەی گەیشتی زەرد و سووری باخ ... جریوە و جووکەی دارستانی شاخ

---

١. باب و باپیری گۆران، نووسەر و شاعیر بووگن و زمانی فارسییان باش زانیوە.

لە گەڵووی شمشاڵ، لە تەلی کەمان
گەلێ هەڵساوە ئاوازەی جوان،

ئەمانە هەموو جوانن، شیرینن
ڕۆشن کەرەوەی شەقامی ژینن

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز
بێڕووناکییە بێ بزەی ئازیز

بێئاوازەیە، دەنگە نەرمەکەی
با نەیدا لە گوێم، تێر نەڵێم ئۆخەی!

کام ئەستێرەی گەش، کام گوڵی کێوی،
ئاڵە وەک کولمی، گۆی مەمکی، لێوی؟

کام ڕەشی ئەگا بە ڕەشی چاوی؟
برژانگی، بڕۆی، ئەگریجەی خاوی؟

کام بەرزی جوانە وەک بەرزی باڵای؟
کام تیشک ئەگاتە تیشکی نێونگای؟

کام تاسە، کام مەیل، کام چاوەنواڕی؟
تەلیسمایەوە وەک هی دڵداری

بەڵام گۆران، گۆڕانکارییەکی لە کاکڵ و بەتایبەت توێکڵی شیعری کوردیدا بەدەستەوە بوو. ئەڵبەت پێشەنگی ئەم ڕێگایە ـ وەک مامۆستا بۆخۆی دەڵێ ـ لە ڕاستیدا شاعیری هاوچەرخی، شێخ نووری شێخ ساڵەح بوو؛ کە ئەویش چێژ و شێوازەکەی لە شاعیرانی نوێخوازی ترکەوە وەرگرت و چەند شیعریشی لەسەر ئەو بیچمە دانا؛ بەڵام پاشان درێژەی بە کارەکەی نەدا. ئەو ئاڵایە ئەمجار مامۆستا گۆران هەڵیگرد و بە شێوەیەکی تایبەتی، هەستی شاعیرانەی خۆی، لەگەڵ سروشتی شیعری کوردی و زمانێکی پاراودا و تێکەڵ کرد و زبان و وێژەی کوردی پێ ڕازاندەوە:

**ئاواتی دووری**

ئەی چاو! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەری پەڕت
کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دڵبەرت؟
کوانێ دوو چاوی مەست؟ کوانێ؟
کوانێ برۆی پەیوەست؟ کوانێ؟
کوانێ زوڵفی ڕەش؟
کولمی ئاڵ و گەش؟
کوا هەیکەلی جەمال؟
کوا حوسنی بێ میسال؟

□

ئەی گوێ! زەلیلی چاوم و بەر تۆ پەنا ئەبەم
دەنگێ لە یاری دوورەوە، چی بکەم لە زیڵ و بەم؟
با بێ
خەندەی پڕ ئاهەنگ بێ

نەغمەی نازی شۆخ و شەنگ بێ

زڕەی بازن بێ

بەرەولای من بێ

هاڕەی هەیاسەکەی

ورشەی کراسەکەی ...

□

ئەی خاتیراتی عومری گوزەشتەم! دەخیلی تۆم!

خنکاوی بەحری دووری نەکەی عومری ڕەنجەڕۆم!

جیلوەت لە چاوم ون نەبێ!

هەرگیز لای تۆ نووستن نەبێ!

چەشنی ئاوێنە، دائیم بنوێنە!

عەشقی قەدیمی یار، تا وەختی ئیحتیزار

سەرجەمی شیعرەکانی مامۆستا زۆر جاران لە چاپ دراوەتەوە؛ تا خۆی مابوو، بێجگە ئەوەی زۆرێک شیعری بە درێژایی ٣٠ ساڵ ژیانی ئەدەبی، لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی باشوور و ڕۆژهەلاتی کوردستاندا چاپ دەکران، دوو دەفتەری «*بەهەشت و یادگار*» و «*فرمێسک و هونەر*»، ١٩٥٠ ز. لە بەغدا و قەسیدەیەکی درێـژی بـە نـاوی «*پەیامی کورد بۆ میهرەجانی چوارەمی گەنجان و قوتابییان لە بوخاریست*»، ١٩٥٤ ز. لە سلێمانی لە چـاپ دران. پاش خۆیشی، بەتایبەت مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم، ئەوپەڕی دڵسۆزی و تێکۆشانی نواند بـۆ پاراسـتن و چاپ کردنیان و ئێستا کتێبخانەی کورد خاوەنی «*سەرجەمی بەرهەمی گۆران*»ە.

**چەند شیعری کلاسیک و نوێی گۆران**:

**هەڵبەستی دەروون**

هەرچەن ئەکەم، ئەو خەیاڵـەی پـێ مەسـتم، بـۆم ناخرێتـە نـاو چوارچێـوەی هەڵبەسـتم

لێکدانـــەوەی دەروون، قـــسەی زمـــانم بـــۆچی وەهـــا دوورن لەیـــەک، نـــازانم؟!

ئەمویـــست دەروون بکرایـــەوە وەک تۆمـــار دەرکەوتایـــە دونیـــای جـــوانتر لـــە بـــەهار

دەرکەوتایـــە ئـــاوات، هیـــوا، خـــەو بیـــنین پرشـنگدارتـر لـە ئەسـتێرەی قوبـەی ژیـن

دەرکەوتایـــە مانـــای مـــەنگی دەریـــایی کـــە نەرمـــەبا لـــە ڕووی ئـــەدا ئەســـپایی

دەرکەوتایـــە ئـــەو دونیایـــە کـــە شـــیعری بێفرمێـسکە و زۆرتـر لـە فرمێـسک ئـەگری

زەردەخەنـــەی بـــێئاوێنـــەی دەم و چـــاو تیـــشکێک ئـــەدا ڕوونـــاکترە لـــە هـــەتاو

بـەلام ئەفـسووس! کـە ئـەو شـیعرە جوانانـە باڵـــدارێکن جـــێناهێـــڵن هێلانـــە

لـــە نـــاوەوە ئـــەجریوێنن، ئـــەخوێنن      هـــەرگیز قەڵـــەم بـــە کاغـــەزا نـــاهێنن!

**لە زیندانا، ١٤ی تەمووز**

دەنگێکی دوور،

دوور ... ئێجگار دوور ...

بە ئاستەمێک ئەگاتە ژوور!

ئەی دەنگی دوور! بە ئاستەمێک ئەگەیتە ژوور!

ئاخۆ سپیت؟ یان ڕەش؟ یان سوور؟

وەرە پێشتر!

چۆن ئاو ئەڕژێتە ناو ئاگر،

لە ڕێی گوێوە بڕژێرە گیان!

زیندانم پڕ کە لە کۆڵدان!

زنجیری پێ!

کپ بە تاوێ! وەک لۆکەی گوێ.

هەوای شڵەقاوی زیندان!

بنوو! وەک بەرمەمکان ئەنوێ.

با دەستڕێژی ئەم دەنگەی دەر، کێلکی[1] مانای گوێم بپێکێ.

بەڵکوو گڕەی تینووتی سەر، وەک تۆپ ناڵەی بێ و بتەقێ.

□

لە لێشاوی غەڵبەغەڵبا

بانگێکی دا لە گوێچکەم با:

«... ڕژیمی جمهووری بژی...»!

خەو ئەبینم؟ جمهووری چی؟!

ـ نە، خەو نییە؛ شایلۆغانی جمهوورییە، ئەم دەنگ و مژدەی دوورییە!

سا لەشی زیندانی! مردوو! بێرە سەما!

ئەی لە بستێ گۆڕا زیندوو! مردن نەما.

١. لە دیوانەکەیدا، «گوللەی مانای گوێم بپێکی» نووسراوە!

**جوانی لادێ**

ئێوارەیــــە وا هەڵگرەســــا گـــۆزەیی تــــازە
بەر دەرگەکەتان قیبلەیی ڕووی ئـەهلی نیـازە
ڕێی کـانیقوبـان مونتـەزیری جلـوەیی نـازە
ئێوارەیــە وا هــەڵگرەسـا گــۆزەیی تــازە
سەرجادە موعەتتەر کە بە بۆی خونچە و مێخـەک
هاڕەی کەمەرە و پلپـلە و گـوارەو و کرمـەک
بەو لەنجەیـەوە بەسـتە بلێـت وڕشـەیی خامـەک
ئێوارەیــــە وا هەڵگرەســــا گــــۆزەیی تــــازە
چەن جوانی بەرەو مەغریب ئەچی زەردە ئەدا لێت؟
ڕۆژی دەمی کەل حازرە بـۆ پێـشکەشی بـەرپێت
پرشنگی خشڵ ئەبلەق ئـەکا دەور و بـەری ڕێـت
ئێوارەیــــە وا هەڵگرەســــا گــــۆزەیی تــــازە
ئێوارەیـە وا دەرکـەوە سـا جوانـە کچـی دێ!
سووتاوی جوانیتن هـەموو کـێ کـوڕی کـێ بی؟
ئەیویردی قسە و بەستەیی گشت کوڕگەلی سەر ڕێ
ئێوارەیــــە وا هەڵگرەســــا گــــۆزایی تــــازە
وەختێ کە ئەکەی چەشنی نەسیم لەنجە بەرەو ماڵ
شەڕیانە شەماڵ پەنجە لەسەر ڕەنگی ڕەش و ئـاڵ
ئەگریجەیی تەڕ پەخشە لەسەر کوڵم و خەتوخـاڵ
ئێوارەیــــە وا هەڵگرەســــا گــــۆزەیی تــــازە

**ئەڕۆی ئۆغر**

کلاولار، گورجی کەوڕەفتار، نەزەرناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
لە تیری ئاهی ناکامیم حەزەر ناکـەی ئـەڕۆی ئـۆغر؟
بە دووتا ئەشکی حەسرەت خوێن ئەبارێنێ بەسەر دەشـتا
تەماشای لالـەزاری ڕاگـوزەر ناکـەی ئـەڕۆی ئـۆغر؟
لە لای خەڵقی گەدایە گەردی ژێر پـێ مولـکی دڵـداری
بە سایەت وەک هوما تاجم لەسەر ناکـەی ئـەڕۆی ئـۆغر؟
بەلەرزە و زەلزەلەی ئەو پـلپلانەی دەوری پۆشـینت
بینای هەستم هەموو زیر و زەبەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
ئەوا واعیز ئەڵێ لادە لە قیبلەی عەشق و جـوانی ڕوو
سەماعی وەعزی سەرتاپا زەرەر ناکەی ئەڕۆی ئـۆغر؟
فریشتەی یا پەری یا حۆری ئەی شۆخی مەلەکشـێوە
بە عیشوە و خۆ لە هاوجنسی بەشەر ناکەی ئەڕۆی ئـۆغر؟
بە تای دووری غەزەڵ ئـەچنم لـە حەسـرەت ڕشـتەیی گیـسووت
مەتای عومری درێژ کردووم لەبەر ناکـەی ئـەڕۆی ئـۆغر؟
ئەڕۆی ئۆغر؟ ئەڕۆی ئۆغر؟ نەزەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
جەیام، عەقڵم، دڵ و دینم هـەدەر ناکـەی ئـەڕۆی ئـۆغر؟



**دەروێش عەبدوڵڵا**

بە ڕەنگی زەرد و شێوەی دەستوشمشاڵی کزا دەروێش!
حەزم کرد بەستەیەک ببیەم سەراسەر حوزن و مانەم بێ
لە سیماتا بەدیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش
وەها دیارە کە بەختت ئاشیانی بولبولی خەم بێ

□

بەڵێ دیارە لە ناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتکار
وەکوو عەکسی قەمەر وایە، لە ناو حەوزێکی لیخندا
بەڵام تەختی ڕوفاهـ و تاجی حورمەت میللەتی هوشیار
بە ئوستادی ئەدا وەک تۆ لە ناو شمشاڵی کون ـ کوندا

□

سەحەر بێنێتە گریان و قسە سیحری پەری نەغمە
برای دەروێش! ئەزانم بۆ مەعیشەت وێڵ و ئاوارەی
بە زەهری ناعیلاجیتە لە ناکەس ویستنی لوقمە
بە مردنتە کە گوێی ناشی ئەخنکێنێ خرۆشی نەی

□

بەڵام چی بکەین لەگەڵ بەختی ڕەشی بەعزێ زەکای گەورە
وەکوو تۆوی گوڵی دەم با، لە سەر بەردێکی ڕەق ئەڕوێن
ئەگەر خیلقەت نەسیبی عومری تۆی مەحکوومی ئەم دەورە
نەکردایە، خوا عالم لە کام عەرشت ئەسوو داوێن

□

نە حەرفی مەکتەبێکت خوێند، نە ئوستادێ پەلی گرتی
سیرف بەرزی زەکا ئەم سنعەتەی فێر کرد بە شمشاڵت
هەموو وەزنێکی گۆرانی، لە توولانی هەتا کورتی
بە سەرپەنجەی هونەر کردت بە دیلی کۆششی زاڵت

□

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقای خرۆشی ڕۆحی بێگانە
میزاجی کوردەواریم تێکچووە، دەروێش عەبدوڵڵا!

دەخیلت بم! دەسا بەو لاوک و ئایئای و حەیرانە

شەپۆلی زەوقی میللی، پڕ دەروونی مات و چۆڵم کە!

لە بیتهۆڤن گەلێ زیاتر بە ڕۆحم ئاشنای وەڵڵا

دە ئەی دەروێش! سکالایەک لەگەڵ ڕۆحی کلۆڵم کە!

*سەرچەمی بەرهەمی گۆران*، چاپی سلێمانی، ڕۆژنامەی *کوردستان*، چاپی تاران.

## شێخ نووری سلێمانی

شێخ نووری کوڕی شێخ ساڵەح، کوڕی شێخ غەنی، شاعیرێکی خۆش زەوق و نوێخوازی کوردە کە وەک لە باسی مامۆستا گۆراندا گوتمان، یەکەم جار ئەم شێوازی شیعری نوێی هاوردە نێو زمانی کوردییەوە.

زا و مەرگی شێخ نووری سالانی ١٣١٥ لە سلێمانی و ١٣٧٨ ک. م. ڕووی‌داوە.

**غەزەلێکی نووری**:

پەشێوی پەرچەمی شـۆخێکی بـێ‌پـەروا و بـێ‌بـاکم
موحەققەقمە کە مردم بێ‌گونەهــ «لا یُسأل» و پـاکم

بـزانم ڕۆحــی شــیرینم بــە قوربانــت ئەکــەم، گیانــا!
لە ساڵێکدا ئەگەر بـۆ فاتحایێـک بیتــە ســەر خــاکم

سەرم وەک توپی فوتباڵ وا لە مەیدانی شـەقا ئەمـڕۆ
ئەسیری دەست و بردی قەڵـعەداری چوسـت و چـالاکم

کە میحرابی برۆی تۆم دی ئیتـر لـەو وەختــەوە دائـیم
خەریکی ئاموشۆی مزگەوت و ونـوێژ و ویـرد و میـسواکم

قسە و تەعنەی ڕەقیبی سەگ‌سیفەت قەت مەگرەرە گوێ خۆت
بــە لێــدان و جنێویــشت ڕەزام عەبــدێکی وا چــاکم

لە ئامشۆ و ڕەفتی کۆی تۆ من ئەگەر دەس هەڵـگرم،کوێر بم
لەبەر پێتا ئەمین بــە تـا قیامــەت خــاک و خاشــاکم

دڵ و دینم نساری خاکی بــەر پــێ تــۆ ئەکــەم بـیللا
تەنەززوڵ گەر بفەرمووی بیتــە لام و بمکەیــە حــاکم

لەمەڕ شەهادەتی شێخ مەحموودی مەلیکەوە گوتوویە:

چە نووکی خەنجەرێ بوو وا بڕی ڕیشەی دڵ و گیانم
چە تینی ئاگرێ بو وا بــە جــارێ جــەرگی ســووتانم

لە سەرچاوەی تەقیوی دڵمەوە خوێناوی ئاڵ و گەش
بــە نــاو شــەریانەکانا دێتــە ســەرچاوەی دوچــاوانم
لەگەڵ دوودی هەناسەم تێکەڵاوی یەک ئەبێ ئەوسـا
ئەبێتـە دانـەیی فرمێـسکی خـوێن، ئەڕژێتـە دامـانم
تومەز شیری خەفەت بەنـدی جگـەرمی وا کونـاودەرکرد
گەیاندوویــە بــە یــەکتر تانجــەڕۆ و زەڵــمی دواوانم
ئەپاڵێوێ پەڕەی دڵ نمنمەی خوێناوی لـێڵ و وێـڵ
ئەڕێژێنی موژەی چاو قەترەـ قەترە ئەشـکی گریـانم
وەرن سەیری تەبێعەت کەن لە هەوری ئاهـ و خوێنی دڵ
کە چۆن تاوێکی هێنا باریە سـەر مەزرەعـەی ژیـانم
پەژاری غـەم سـەری هێنایـە دەر بـەم تـاو و بارانـە
وەری پۆپکەی هەموو عەیش و نیشاتی سـەرچنارانم
ئەمەڵ نێژرا لە ناو خاکدا، ئەلەم گۆپکە و چـرۆی دەرکـرد
بــە جــارێ هەڵــکرووزا ســەبزەزاری نــاو بــەهارانم
بە کۆچی تۆوە بۆ مەحبووبی حەق «محمود»ی ڕەببـانی!
وەکـوو غەزنـە بـە چۆڵـی مایـەوە شـاری سـلێمانم

بە داخەوە لە شیعری بە شێوازی نوێی شێخ نووری، هیچم دەس نەکەوت لێرەدا بینووسم.

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل ٤٢ و ٤٣.

*دەقەکانی ئەدەبی کوردی*، بەغدا، ل١٠٥ و ١٠٦.

## مەهدی فەرەهپوور

کوڕی موحەممەد ئاغای قەنادی سنەیی، ناسراو بە «صدیق دفتر»، لە هەشتەمی زیقەعدەی ساڵـی ١٢٩٧ ک. م. (١٨٧٩ ز.) هاتە دنیا. بابی دووکانی شیرینیپێژی هەبوو؛ مەهدیش کە کوڕی گەورە بوو، هەر بـە منداڵی، خواناخوا بەردەستی باوکی پێ بڕا؛ بەڵام ئەو چاوی لە دووی ئەو هاوماڵانـەی بـوو کـە کتێـب و دەفتەریان لە ژێر باخەڵدا، بۆ قوتابخانە دەچن. ئاواتی دەخوازی ئەویش خوێندن و نووسینەوە فێـر بـێ. سەرەنجام بابی ڕەزای دا بخوێنێ و بەم جۆرە هێندێک لە مەکتەبخانە و پاشان لە مەدرەسەی ئالیانـسی شاری سنەدا خوێندنی دەسپێکرد و بە هۆی زیرەکی و لێهاتوویی لە ڕادە بەدەر و تێکۆشانی زۆرەوە، لـە ماوەیەکی کەمدا پێشڕەوتێکی باشی کرد؛ زمانی فەڕانسە چاک فێر بـوو، عـەرەبی و فارسییەکەشـی لـە

هاتوچۆی قوتابخانەکاندا پێگەیاند و تەنانەت هێندێک لە ترکیش سەری دەرکرد.

مەهدی فەرەهپوور ئەمجار لە مەزرینگەی کارگێڕی کوردستاندا دامەزرا و دوای ماوەیەک چووە هەمەدان و لە ئیدارەی ماڵی ئەوێدا کرایە چاوەدێر. لەم سەروبەندانەدا ئاوری یەکەم شەڕی جیهانی بڵێسەی ساند و گڕی گەیشتە ئێران و ئەمیش چووە جەرگەی ئازادیخوازانەوە.

کاتێ کە «نظام‌السلطنەی مافی» هاوڕێ لەگەڵ ٦٠ کەس لە نوێنەرانی ئازادیخوازی تاراندا، بەرەو شاری قوم بۆوە و ڕووسەکان -کە دژمنی قەسایقەسیان بوون- کەوتنە شوێنیان و ئەوانیش کە بەمەیان زانی، بوونە دوو بەشەوە، بەشێکیان چوون بۆ ئەسفەهان و تاقمێک لە ڕێی گوڵپایگانەوە گەیشتنە برووجرد و گەورەی عەشایری لوڕیان ڕەگەڵ کەوتن و چوون بۆ کرماشان، فەرەهپووریش لەیەل ئازادیخوازانی «کُمیتەی مُقاومت ملّی»دا ڕۆی بۆ ئەو شارە و حوکمەتی کۆچەرانیان دامەزراند. لەوێ میرزا موحەممەد عەلی خانی فەرزین بوو بە وەزیری دارایی و فەرەهپووریش کرایە جێگری.

هەر لەو ڕۆژانەدا، سەرۆکی ئوردووی عوسمانی، لە ماژۆر حەبیبولاخانی شەیبانی (سەرۆکی ژاندارمیری) دەخوازێ وەرگێڕێکی جێ متمانەی زمانی ترکی بۆ پەیدا بکا. ئەویش فەرەهپووری پێ دەناسێنێ. فەرەهپوور لە ماوەیەکی کەمدا، لە لای عوسمانییەکانەوە وەج و ڕێزێکی زۆری پەیدا کرد و کەسناوی «صدیق دفتر افندی» پێ درا.

فەرەهپوور لە شەڕی دژی ڕووسان لە کرماشان و هەمەداندا، زۆر دلێرانە چووە مەیدان و مەداڵی ئازایەتی وەرگرت. ئەو لەو کاتەدا مامۆستای قوتابخانە بوو؛ دوو وانەی جوگرافی و مێژووی دەرس دەگوتەوە و تا ئەو ڕادە تێدا سەرکەوتوو بوو کە نووسراوەکانی لەم دوو زانستەدا، بوو بە کتێبی دەرسی قوتابییان و بەو بۆنەوە نیشانەی پلەکی ۳ی زانستی پێ درا.

ماوەیەکیش لە ژاندارمیری خزمەتی کرد و باشی تێدا سەرکەوت؛ بەڵام دیسان گەڕاوە سەر کاری مامۆستاییەکەی. سەفەرێکیش هاوڕێ لەگەڵ ئازادیخوازان چووە بەغدا و دوای هێندێک گەڕاوە. ئەو هاوکات، ڕۆژنامەی «*رستخیز*»ی لە کرماشان دامەزراند و لەو شارە نیشتەجێ بوو.

دوای شۆڕشی ئوکتوبری ڕووسیا و داکوژانی شەڕی جیهانی، لەگەڵ میرزا کازمی مەلیکزادەدا، ۲۰ ژمارە لە ڕۆژنامەی «*غرب ایران*»ی دەرخست و پاشان بە هاوقۆڵی ئەبولقاسمی لاهووتی، ڕۆژنامەی «*بیستون*»ی بڵاو کردەوە و زۆری پێ نەچوو هەموو ئەرکی کەوتە سەر شانی خۆی و دەوری ۳۰ ساڵ ئەو ڕۆژنامە بێ وچان دەرهات.

بەناوبانگترین بەرهەمی مێژوویی و جوگرافیایی فەرەهپوور، ئەو زنجیرە نامیلکانەیە ناوی «*از الوند تا مدائن*»ی لێ ناوە و لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی «*بیستون*»دا چاپ کراوە. بەرهەمەکانی تری، «*جُغرافیا برای ارتش*»، » «*تاریخ پرچم ایران*» و «*عناصر اربعه*»یە.

لە پێشەکی *«تاریخ پرچم ایران»* دا دەڵێ:

هـر ملتـی بـه پـرچم خـود دارد افتخـار　　هـر پرچمـی بـه ملـت خـود هـست پایـدار
نقـش و نگـار پـرچم و الـوان پـردەاش　　باشـد گـواه قـدرت میـدان کـارزار
هـر ملـت غیـور نگهبـان پـرچم اسـت　　هر قوم زنده پـرچم خـود راسـت جـاننثار

فەرەهپوور ساڵی ١٣١٧ ک. هـ. (١٩٣٨ ز.)، پاش ئەو هەموو خزمەتە، لە لایەن دادگای چەکدارییەوە، بە تۆمەتی سیاسی، لە کار وەلا نرا و ماوەیەکی زۆر لە زینـدان خـرا[1] و سـەرەنجام ساڵـی ١٣٧٨ ک. م. (١٩٥٩ ز.)، پاش ٨٠ ساڵ، سەری یەکجاری نایەوە.

**لە شیعرەکانی**:

جهـان اسـت شـادان ز پنـدار نیـک　　ز پنـدار نیـک اسـت گفتـار نیـک
چـو پنـدار و گفتـار تـو نیـک شـد　　نیایـد ز تـو غیـر کـردار نیـک

پەراوێزی *کلّیات غیرت کرمانشاهی*، ل ٢٣٨ و ٢٣٩. *تذکرەی شُعرای کرمانشاه*، ل٩٣. ڕۆژنامەی *کوردستان*، چاپی تـاران.

## شێخ سەلام

کوڕی شێخ ئەحمەد، لە شێخانی «عازبان»ی لای هەڵەبجەیە کە ساڵـی ١٣١٠ ک. م. لـەدایـک بـووە و دواجار لە شاری سلێمانی دانیشتووە.

شێخ سەلام شـاعیرێکی خـۆش زمـان و هێژایـە کـە چەنـد زمـانی زانیـوە، زۆری سـەفەر کـردووە و ئەزموونێکی باشی لـە ژیـان دەسـکەوتووە و سـەرەنجام ساڵـی ١٣٧٩ ک. م. لـە دنیـا دەرچـووە. ئـەم مامۆستایە بێجگە لە دیوانی شیعر، چەند داستانی بە پەخشانی کوردی نووسیوە کە هێنـدێکیان بـریتین لە: «*شاری و لادێیی*»، «*قەسابخانە*»، «*جوولەکەی کۆڵگیر*» و ...

**چەند شیعری شێخ سەلام**:

مەجنوون! بە یادت، مەجنوون! بـە یـادت　　بـە یـاد دڵـەی شـەیدای ناشـادت
ڕووم نیـا وەڕووی بیابانـەوە　　بـە ئاهـ و ناڵـەی بـێسـامانەوە
وێـڵ ـ وێـڵ خـول ئـەخۆم بـە دیارانـدا　　بـە دەشـت و چـۆڵ و کووچـەی شـاراندا
سـەرم شـێواوە، گرانـە دەردم　　وەک «مەعدووم» شێوا قافیەکـەی فـەردم
لـە جیـاتی شـنۆ و سـروەکەی شـەماڵ　　ئەیـدا بـە ڕوومـا لم و خـاک و خـۆڵ[!]

---

١. عەجایب! و

ماوای تۆم بینی هەردەکەی دوجەیل — گوزەرگای خێڵی باوانەکەی لەیل
زۆر قەد و باڵای عەرعەر تەرزم دی — خاوەن لەنجەولار، گەردەنبەرزم دی
زۆر لێوی ئاڵ و چاوی کاڵم دی — ڕوومەتی ناسک، خەت و خاڵم دی
نەمدی وەک لەیلێ عاشق شەیداکون — منیش وەکوو تۆ شێت و ڕسواکون
من زوو بەتیری گۆنا گوڵڕەنگێ — شۆخێ، نازارێ، شەنگێ، قەشەنگێ
حۆری لەقاپێ، بە لەنجە و لاری — ئاسکۆڵەی خەتا، لە ڕێی کۆساری
سەرو کلاوەزەڕ بە پشتە سەرە — لوولەی مێخەکبەند، هارەی کەمەرە
کوردێ، خاڵوردێ، باڵاشمشاڵێ — مشکی، سرکەیێ، سەر و دەسماڵێ
ڕۆژەکەی ئەلەست دڵمی پێکاوە — عەشقی ئەم و ئەو خەیاڵی خاوە
خۆزگە ئاواتی من ئەهاتە دی — مەجنوون! تۆ لەیلای کوردانت ئەدی

* * *

دڵە کوورەی غەم، کۆمەڵی زووخاو — سادەی خرۆشێ
موشەدمەکەی هەناسەی پڕتاو — دەخیلە جۆشێ
گۆمی خوێنینێ چەمی گریانم — هانا خوێناوێ
بناوانەکەی جۆگەی چاوانم — ئاوێ، لافاوێ
سادەی با بڕوا بزیسکەت بە تاو — شەماڵەی ئاگر
بۆ جەرگ و دڵ و ناوزک و هەناو — یەک گڵپە، یەک گڕ
سەربکا پێچ پێچ دووکەڵ لە دەروون — وەکوو هەوری تار
تاریک و نووتەک ڕووی سەما و گەردوون — چەرخی کردگار
بدا بە یەکدا هەورەکەی بەهار — سەرشاخ وە سەر شاخ
ڕووبەڕووی چیا و هەردە و کۆهسار — ئێلاخ وە ئێلاخ
پیرەمەگروون و گوێژە و زمناکۆ — بیزڵە و بەمو
پەیکۆڵی زەردە، کاژاو، داڵەهۆ — شەندنە ڕووی شاهۆ
گشتی دابگرە، سەراسەر بەتەم — وەکوو دڵ بە غەم
باران بڕێژە بە تاو و خوڕەم — فرمێسکەکەی چەم
تەپونم داکە بە شارەزووردا — نەک بە ڕەهێڵە
هەواری «شەم» بوو لە خوار و ژووردا — ڕێبازی خێڵە
کەی ڕژا باران بە کورستاندا؟ — گوڵگوڵی خوێنین

هەناسەی منە لە بەربەیاندا دەمی گریە و شین

ئەم شیعرەشی لە شینی شاعیری بەناوبانگ، ئەحمەد بەگ (حەمدی ساحیبقەران)دا گوتووە:

بلێسەی گڕی دەروونی پڕکوڵ بۆچ ناسووتێنێ پەڕەی ڕەشی دڵ؟
هەر هەڵئەقرچێ، بۆچ نەبوو بە ئاو؟ بۆ نەتکا تک تک، بۆ گلێنەی چاو؟
دوو گۆمی خوێنە هەر دوو جێگەی چاو سووتا و هەڵقرچا، دڵ نابێ بە ئاو
بۆ شیوەن دڵم کانگە و ئەساسە کۆستی کەوتووە، بازاڕ کەساسە
بۆ شیوەن بەرزە نەوئاوازەکەت شادی دەس نادا لە دەروازەکەت
بە کوڵ گەرمی تۆ هەناسە سەردم منیش کۆمەڵی زووخاو و دەردم
زایەڵەم بەرزە وەک بولبول بۆ گوڵ داماوی کزە و قرچەی جەرگ و دڵ
لە زایەڵەی دڵ دەم وا دریاوە وەجاغی «کوردی» و «سالم» بڕیاوە
خاوەنی دیوان، شعری جوانم ڕۆ! شاعری بەرزی کوردستانم ڕۆ!
میرم! تۆ دیلی ژێر خاک و سەنگی وێڵ‌وێڵ خول ئەخۆم، من بە دڵتەنگی
میرم! هاودەمت لوتفی ڕەحمانی مام بە کەساسی لە سلێمانی
دڵ بۆ تاریخی، پەردەی خۆی دڕی: «ڕۆحی شیرینی شاعر» هەڵفڕی

ئەگەر شیعرەکە بە ڕێنووسی پێشوو بنووسین، لە بەیتی دواییندا، ڕستەی «ڕۆح شرین شاعر» بە حیسابی ئەبجەد ئەبێتە ١٣٥٥، ساڵی کۆچی دوایی ئەحمەد بەگ.

یەکێکی‌تر لە کارەکانی شێخ سەلام، وەرگێڕانی چوارینەکانی خەییامە بە کوردی، لە سەر کێشی بیست بڕگەییەوە. ئەوا دوو نموونەی:

ئەم گۆزە وەک من عاشقێ بوو زار بە تاڵی زولفی یارێ گروفتار
ئەو دەستە ئێستە تەوقی ملیەتی دەستێ بوو کام دەست؟ دەستی ملی یار

* * *

دەسمایەی عومرم لە دەستم دەرچوو بە پەنجەی ئەجەل جگەر کون‌کون بوو
ناگەڕێتەوە کەسێ لەو دنیا تا لێی بپرسین ئەحواڵی مردوو

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل ٤٥٠. ڕۆژنامەی *کوردستان*، چاپی تاران و یەک‌دوو شوێنی‌تر.

## شێخ عومەر وەجدی

کوڕی شێخ عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی سەبری ماردینی، لە زانایان و مامۆستایانی ناودارە کە ساڵی ١٣٥١

ک. م. سەرپەرشتی«رواق‌الاکراد»ی زانستگای ئەزهەری کردووە و تا کوتایی ژیانی، واتا هەشتاکانی چەرخی چاردەی کۆچی ـ مانگی، ئەو کورسییەی هەبووە.

عومەر وەجدی بۆ چاپی «*شَرفنامەی بدلیسی*»، یارمەتی موحەممەد عەلی عەونی داوە و هەروەها بەشی کوردی ڕادیۆ قاهیرەی بەڕێوەبردووە.

لەم مامۆستایە هێندێک کتێب و نامیلکەش ماوەتەوە.

پێشەکی *شەرەفنامە*، وەرگێڕانی هەژار.

## ڕەفیق حیلمی

کوڕی ساڵەح ئەفەندی، خەڵکی سلێمانی، لە وێژەوانان و شاعیرانی ناودارە کە بە کوردی و عەرەبی و فارسی، شیعر و پەخشانی داناوە؛ وەکوو زنجیرە یاداشتێک دەوری ٦٥٠ لاپەڕە و کتێبێ لەمەڕ شیعر و ئەدەبی کوردییەوە؛ کە هەکیان لە بەغدا چاپ کراون.

ڕەفیق حیلمی لە مەزرینگەی مەعاریفی شاری بەغدادا چاوەدێر بووە و ساڵی ١٣٨٠ ک. م. لە دنیا چووە.

**ئەم شیعرە هی ئەوە**:

هیممەتی ئەربابی عیرفان بیستوون ئیحیا ئەکا
ئەو کەسەی دڵسۆزی میللەت بێ وەتەن ئاوا ئەکا

نووری عیلم و مەعریفەت وا شەرق و غەربی گرتووە
قەومی ئێمە تازە تەعلیمی خەت و ئیملا ئەکا

بەسیە فیکری بێ سەمەر ئەمڕۆکە عەسری غیرەتە
خاکی کوردستان لە ئێمە هیممەتێ داوا ئەکا

ئێستە بێ عیلم و هونەر، ژینی بەشەر مومکن نییە
چون لە فەننی عەسری حازر کوردی ئێستسنا ئەکا؟

ئورووپا کەشفی زبانی چۆلەکە و مەیموونی کرد
تازە کوردستانی ئێمە باسی ئەلف و با ئەکا

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل٥٥. *یادی شەهیدان و ئەدەبیاتی کوردستان*، ب١، ل٣٢.

## عەلی سەیدۆ

باب و کاڵی خەڵکی دەشتی گۆرانی لای دیاربەکرن. ساڵی ١٢٩٨ ک. م. (١٨٨٠ ز.)، باوکی هاوڕێ چەکدارانی عوسمانی، ئەڕواتە ئوردون و عەلی ساڵی ١٣٢٧، لە شاری «عەممان»ی پاتەخت، لەدایکدەبێ و هەر لەوێ، لە نێوان ساڵانی ١٣٣٤ تا ١٣٤٣، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی دوایی دێنێ و ئەوجار ئەگاتە «بەیرووت» و لە فێرگەی ئەمریکاییاندا ئەبێتە قوتابی و ساڵی ١٣٤٧ ک. م. بڕوانامەکەی وەردەگرێ. ئەوجار دەگەڕێتەوە بۆ عەممان و لە مەدرەسەیەکی ناوەندیدا ئەبێتە مامۆستای زمانی ئینگلیسی و پاشان ماوەی ٥ ساڵ چاودێری قوتابخانە ناوەندییەکانی شارانی عەممان و «کرک» و «سلط»

و «اربد» دەکا. چەند ساڵیش لە وەزارەتی کار و چەند شوێنیتر، ئەبێتــە ئینــشابەند. ســەردەمێکیش لــە باڵــوێزخانەکانی ئــوردون لــە وڵاتــانی ســوعوودی و یەمــەن و ســووریادا کــار دەکــا و دوایــین کــاری، وەزیرموختاری بووە.

سەیدۆ لە تەمەنی ٢٧ ساڵاندا وازی ئەچێتە سەر فێر بوونی زمانی دایکی خۆی و بۆ ئەم مەبەســتە لــە چەند پیرەپیاوی دیاربەکری یارمەتی دەگرێ و وردە ـ وردە ئەکەوێتە خوێندنەوەی دوو گۆڤاری «*هاوار*» و «*ڕووناهی*».

ساڵی ١٣٥١ ک. م. بۆ دیدارێکی کوردستانی باشوور، لە عەممان دەردەکەوێ و مووســڵ و ئامێــدی و هەولێر و شەقڵاوا و ڕواندز و کۆیە و سلێمانی و کەرکووک دەبینێ و پای قسە و گفتوگۆی خەڵکی ئــەو شارانە دادەنیشێ. ساڵی ١٣٥٩ ک. م. بەرهەمی ئەو سەفەرەی خۆی لە کتێبێکدا بە ناوی : «*مِـن عَمّـان الی العمادّیَة او جولَة فی کُردستان الجنـوبیّة*» بڵاو دەکاتەوە. بەرهەمیتر: فەرهەنگێکی عەرەبی ـ کــوردی و زۆرێک نامیلکەیە کە لە گۆڤارەکانی ئەو کاتەدا چاپ کــراون؛ وەکــوو: «*لــور و لورســتان*»، «*زەردەشــت و ئایینی زەردەشتی*»، «*زبان و ئەدەبی کوردی*»، «*کورد پێش ئیسلام*» و ...

عەلی سەیدۆ هەروەها کتێبێکی لەمەڕ بالوێزخانە و قانوونی تایبەت بە ئەو شوێنانەوە، بە زمانی عەرەبی نووسیوە.

مێژوو، کەمال مەزهەر، ل١٩٢–١٩٨.

## شەکیبی کوردستانی

میرزا فەزلوڵا، نازناو «شەکیبی»، شاعیرێکی خۆشزەوق و هێژای شاری سنەیە کە هەر لە زێــدی خۆیــدا خوێندن و خۆشنووسی دەسپێکرد و پاشان چوو بۆ هەمەدان و لەوێ چــووە شــوێن فێــر بــوونی زانــستە نوێیەکان، بەتایبەت ئینگلیسی و ئەوجار کە لە خۆیەوە لێهاتوویی نیــشاندا و خــەتی جــوان و نووســینی باش بوو، «بهاءُالمُلک» قەرەگوزلووی هەمەدانی لە دەزگای خۆیدا جێی کردەوە و پاش کورتە ماوەیــەک، بێجگە ئینشابەندی و کار وبــاری نووســینگە، کردیــە پێــشکاری خــۆی و ٣٠ ســاڵانی لەگــەڵ ڕابــوارد و ڕاوێژکاری بوو.

شەکیبی لە کۆتایی مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٤٠ ک. هـ. )١٣٨٠ ک. م. ١٩٦١ ز.) کۆچی یەکجاری کردووە.

**شیعری ئەوە**:

| | |
|---|---|
| گرچه دورم ز بَر یار، رخش در نظـر اسـت | وین عجب یار هم از سوز دلم بـاخبر اسـت |
| گـرچـه گفتنـد مـرو پـای منـه در ره عـشق | که به هر گام در این بادیه چنـدین خطـر اسـت |

پنــد ناصــح نــشنیدیم و بــرفتیم، کنــون — در شب و روز مرا خون جگر ماحضر است
سرگذشــت مــن و دلــدار جفاپیــشهی مــن — داستانی است که از قصهی مجنون بتر است
حالیــا فرقــت او جــان و تــنم مــی کاهــد — سرّ این نکته مجویید که رمزی دگـر اسـت

له چەند جونگی دەسنووس.

## مەولانا مەحموودی موفتی

کوڕی عەللامە مەلا عەبدوڵڵای موفتی، کوڕی مەلا مەحموودی دشەیی، کە ساڵی ١٣١٦ ک. م. هاتۆتـە دنیا، یەک لە مەلایانی ناودار و مامۆستایانی شارەزا و پایەبەرزی کوردستانە کە هەموو زانستە دینییەکانی چاک دەزانی و بەتایبەت لە فیقهـ و ئوسوول و فەلسەفەدا شارەزای تـەواو بـوو؛ زانایـەک خـاوەن بـیری یەکجار تیژ، هزری زۆر ورد و زمانی پاراو، کە قسەی هەموو بە بەڵگە و سەلماو بوون.

دوای کۆچی دوایی بابی پایەبەرزی، بوو بە موفتی و داوەری شەرعی کوردستان و هاوکات زۆر سـاڵان لە مەدرەسەی «دارُالاحسان»ی سـنەدا دەرسـی گوتـەوە و هەمیـشە چینێـک فـەقێ و موسـتەعیدی هەڵکەوتوو لە کۆڕی دەرسیدا بەهرەیان دەبرد.

خوا لێ خۆشبوو موفتی هەموو چینێکی خەڵک زۆر خۆشیان‌دەویست و قەدریان دەگرت و قسەی بـۆ هەموو کەس لەسەر سەران بوو. هۆی ئەوەش لە بوێری و پاکی و ڕاستبێژییەکەیدا دەردەکـەوت. قـەت قسەی زۆری لە کەس وەرنەگرت و قەڵەمی لە ڕێی چەوتدا نەگەڕا. ئەگەر قسە یان کارێکی بـە ڕاسـت و دروست بزانیبا، لە شایش کۆی نەدەکردەوە. دەسەڵاتدارانیش کە ئەوەیان دەزانی، ڕێزێکی تایبەتیان لێ دەنا و ئامۆژگاری و جاروبار فەرمانیشیان بەجێ‌دێنا.

لەم دواییانەدا بەرامبەر بە داخوازی زانستگای تاران، بۆ دەرس‌گوتنـەوە لـە ساڵـی دوایـینی دادوەری، چووە ئەوشارە؛ بەڵام ساڵێ زیاتری نەخایاند و لە وچانی هاوینـانی ئـەو ساڵـە (خـەرمانانی ١٣٣٩ ک. ه. ١٣٨٠ ک. م. ١٩٦٠ ز.) لەپڕ دڵی لە جووڵە کەوت و دنیای بێ‌بەقای بەجێ‌هێشت.

چەند نامیلکە و نووسراوەی لەو مامۆستایەوە بەجێ‌ماوە؛ کە بەداخەوە تا ئێستا هیچیان چاپ نەکراوە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## بەدیع‌مودیری

میرزا عەبدولباقی بەدیع‌مودیری، کوڕی حاجی موحەممەد، کوڕی موحەممەد ساڵەحی سـنەیی، ساڵـی ١٢٩٨ ک. م. لە بنەماڵەیەکی بازرگان هاتە دنیا؛ بەڵام ئەم کە پێگەییشت، ڕێی خوێنـدنی گـرت و وانـە سەرەتاییەکانی لـە مەکتـەب و قوتابخانـەکانی سـنەدا خوێنـد و ساڵـی ١٣٢٠، ماوەیـەک لـە عـیراق و



سەرەتێک لە شام خوێندی و دواجار لە میسر، لە «رواق‌الاکراد»ی زانستگای ئەزهەردا، خزمەتی مامۆستایانی وەک شێخ ئەبولوەفای کوردی گەیشت. پاشان لە ڕێ بەغداوە گەڕاوە بۆ سنە و سەرەتێک سەودای کرد؛ بەڵام پێی نەکرا و دەستی لێ کێشا و چوو بۆ ئەستەمبووڵ و ترکییەکی باش فێر بوو. ئەوجار گەڕاوە بەغدا و لە «دارالمُعَلّمین»دا ناوی نووسی. کە خوێندنی ئەوێی تەواو کرد و بڕوانامەکەیانی وەرگرت، ناردیانە شاری بەسرە و لە قوتابخانەی «تَحسین‌سیرَت»ی ئەوێدا، بوو بە مامۆستای جوگرافی و مێژوو.

لە سەرەتای یەکەم شەڕی جیهانی (ساڵی ١٣٣٢ ک. م.)دا، گەڕاوە ئێران و ماوەیەک لە کرماشان و پاشان لە سنە و سەقز و هەمدان، لە ئیدارەی مەعاریف وەکوو مامۆستا خزمەتی کرد و سەرەنجام ساڵی ١٣٨٠ ک. م. (١٩٦٠ ز.) لە شاری سنەدا، سەری یەکجاری نایەوە.

ئەو خوا لێ خۆشبووە مرۆیەکی هێژا، میهرەبان، خۆش سەروزمان، دیندار، سەربە تەریقەتی نەقشبەندی و مریدی شێخ شوکروڵای سنەیی بوو. لە جوگرافی و مێژوودا زانیارییەکی بەربڵاوی دەسکەوتبوو؛ زبانی عەرەبی و ترکی باش دەزانی؛ زۆری دەخوێندەوە و هەروەها لە باری هونەرییەوە، شیعری چاکی دەگوت و نەققاشی جوانی دەکێشا.

**لە کتێبەکانی**:

١. هۆنراوەی «*بدایع بدیع*»، کە بە شێوەی مەسنەوییە و بەشێکی تایبەت بە پێشەوایانی دینەکانە
٢. «*سرگذشت، مولودنامه و معراج‌نامه‌ی حضرت رسول اکرم*» (د)، کە چاپ کراوە
٣. «*تاریخ شهریاران*»
٤. «*تاریخ مفصل رجال عالم باستانی*»، کە بە پەخشانی فارسییە و چاپ نەکراوە

شیعرێک لە ژینامەکەی پێغەمبەر (د):

شکل حضرت را شمایل گفته‌اند — خوی نیکش را خصایل گفته‌اند
بود او را بهترین حُسن جمال — خُلق و خویش بود در حد کمال
شیوه‌اش دلکش رخش سرخ و سفید — هوش و ادراک و ذکا در آن پدید
چهره‌اش چون بدر و موهایش سیاه — دیدگان جذاب و رخشان در نگاه
هر دو ابرویش کمی پیوسته بود — گونه‌هایش اندکی برجسته بود
بینیش نازک، جبین پهن و لطیف — دیدگان نرگس‌آسایش ظریف
همچو لؤلؤ بود دندانهای او — جلوه‌ای خوش داشت وقت گفتگو
موی ریش و شاربش را می‌گرفت — آنقدر کز مو نگردد لب نهفت
قامتش زیبا، نه بالا و نه پست — هم به بالایش مناسب پا و دست

| | |
|---|---|
| بـــود حُـــسن از پـــای تـــا ســـر پیکـــرش | خــــالی از هـــــر غیـــــب ذات انــــورش |
| بـــا وقـــار و بـــا ادب مـــی‌رفـــت راه | داشـــت دایـــم پـــیش پـــای خـــود نگـــاه |
| بـــود خوشـــرو بـــا انـــاث و بـــا ذکـــور | صــــاحب اندیـــشه، بـــا رأی و فکـــور |
| نعـــت آن حـــضرت نیایـــد در قلـــم | هــر چــه بنویــسم ز وصــفش هــست کــم |
| پـــس ســـخن را بـــا درود و بـــا ســـلام | بـــر خـــود و آلـــش نمـــایم اختتـــام |

*بدایع بدیع.*

## حیرەت سەجادی

سەید موحەممـەد بـاقری حـیرەتسـەجادی، ناسـراو بـە «رُکـنُ‌الاسـلام» و نازنـاو «حـیرەت»، کـوڕی سـەید موحەممەدی کەلجینی، کوڕی سەید سەعدەدین، کوڕی سەید مەجید، کوڕی سـەید ئەحمـەد، ساڵـی ۱۲۹۷ ک. م. لە شاری سنە هاتە دنیـا و دوای پێگەیـشتن و خوێنـدنێکی سـەرەتایی، لـە قوتابخانـە دینییەکانـدا بـە تێکۆشانێکی بەردەوام، سەرف و نەحو و مەنتیق و بەلاغە و حیکمەت، تا فیقهـ و ئوسوول و تەفسیر و حـەدیس و سیرەی بەباشی خوێند. ئەوجار لێ‌بڕا بۆ شارەزاییەکی زیاتر لە دنیای پان و بەرینی ئەدەبیاتدا حەولێکی زیاتر بدا و بۆ ئەم مەبەستە، خزمەتی زۆرێک لە مامۆستایانی زمان و وێژە و شیعر گەییشت و زۆر دیوانی شاعیرانی عەرەب و فارسی شی کردەوە و لە بەرهەمی ئەو ماندوو بوونە و زەوق و لێهاتوویی خۆیەوە، بە ئاواتەکەی گەیـشت و لـەم بارەوە لە هەموان سەرکەوت. هەروەها بۆخۆشی شیعری هۆنییەوە و لەم بوارەشدا باش سەرکەوت.

حیرەت، دوای خوێندن، لە ساڵی ۱۳۲۸ ک. م. بەم‌لاوە، خزمەت بـە کۆمەڵـگاکەی دەسـپێکرد و بـۆ پەرەگرتنی زانست و زانیاری، حەولێکی یەکجاری دا و هەنگاوی باشی هەڵگرت. لە سەرەتای دامەزرانی سازمانی مەعاریف لە شاری سنەدا، بۆخۆی سەرپەرشتی کرد و پاشانیش تا کاتی وەنیشتە بوون، لە پۆلی دواناوەندیدا دەرسی گوتەوە.

شادڕەوان حیرەت سەجادی مرۆیەکی ئاکار بەرز و لەسەرخۆ و خاوەن ڕێز و زانایەکی وێژەوان و شاعیر و نووسەرێکی قەڵەم جوان و ڕەوان بوو؛ بە بیرێکی تیژ و زانیارییەکی بـەربلاوەوە لـە ئـەدەب و مێـژوودا. پاش وەنیشتە بوونیش بەشێک لە کاتی خـۆی خـەریکی خوێندنـەوەی فیقهـ و حـەدیس و تەفـسیر و ئەدەبیات و مێژوو دەبوو؛ بەشێکیشی دانابوو بۆ وەرامـی قوتابیـان و خوێنـدەواران، لـە هـەموو چینێـک. ئەگەرچی ژیانی بە دوورەپەرێزی و گۆشەنشینی گرتبوە پێش، بەو حاڵەش ماڵی هەمیشە کۆڕی زانایـان و وێژەوانان و کەلاسی دەرس و فێربوون بوو.

ئەم مامۆستا پایەبـەرزە سـەرەنجام ساڵـی ۱۳۸۲ ک. م. گیـانی پـاکی بـە خـودای تـاک ئەسـپارد و تەرمەکەیان لە زیارەتانی «شێخان»ی سنەدا ئەسپەردە کرد.

**غەزەلێکی حیرەت:**

چـو عاشـقان بـه سـر زلـف یـار پیوسـتند ز هـر چـه در همـه آفـاق بـود بگسـستند
مگر که شاخەی طوباست قامت تـو کـه خلق بـه منتهـای امیـد از تـو طرفـه بربـستند
مگـر چـو سـرو بـه پـا خاستی و افکنـدی ز رخ نقـاب کـه خورشـید و مـاه بنشـستند
هـزار مـردم هـشیار را دهـد مـستی نـسیم کـوی کـسانی کـه از رُخـت مـستند
ز غیر چشم و دل پر ز اشک و شعله چو شمع ز هـر چـه یـاد کنـی عاشـقان تهـی دسـتند
خـدای را مـشنو آنچـه حاسـدان گفتنـد که تهمتی است کـه بـر جـان نـاتوان بـستند
جـز از جمـال تـو بایـد کـه دیـده بردوزنـد کـسان کـه در طلـب دیـدن بهشتـستند
بـه بوسـەای ننوازنـدم از کـرم، گـویی طریـق خـواجگی و بنـدگی ندانـستند
بـه هـر چـه یـار کنـد عاشـقند، آنـان کـو بـه سـان «حیـرت» درس وفـا نبشتَـستَند

**چوارینه**

گـر بـسته ره لطـف تـو را معـصیتم ور نیـست شـفیع معـصیت معـذرتم
تـا در غـم مـن شـاد نخنـدد ابلـیس یـارب بـه کـرم قبـول کـن مـسألتم

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من.*

## ناسری ئازادپوور

جـوامێرێکی جوانەمـەرگ بـوو کـە هـەموو تەمـەنی کـەم و کـورت، بـەڵام پڕبایـەخی، بـە خزمـەت و سەربەرزییەوە تێپەڕ کرد و لە ناکاو ڕەشەبای مەرگ، داری پیرۆزی ژیانی لە بن هێنا و برد.

شادڕەوان ناسری ئازادپوور بیرمەندێکی پارسا و دڵپاک و ئاکارچاک و هەروەها خەت جوان و قەڵەم ڕەوان و وێنەکێشێکی دەس‌نەخشین و لە شیعر و وێژەوانیدا خاوەن زەوق و لێهاتوو بوو. کاتی خوێنـدن، قوتابییـەکی هەڵکەوتوو ئەهاتە ئەژمار و خوێندنی زانستگای لە باشترین ڕادەدا و بە بانترین نمرەوە تەواو کرد.

ناسـر دوای خوێنـدن، لەسـەرینەی کـار لـە وەزارەتی داد و دادوەری کـردن، خزمـەتی فەرهـەنگیی (کولتـووری) هەڵـبژارد و پێـڕای سەرپەرشـتی ئیـدارەی پـەروەردە و بـە شـوێنیدا ئـەوقافی سـنە، دەرسیشی‌گوتەوە. خزمەت بە خەڵک و بێ‌مبالاتی بە دنیا و وەستانەوە لە بەرامبەر سەرزلان و زۆربێژان، لە تایبەتمەندییەکانی ئەو لاوە بوو؛ هەر ئەوەش ببووە هۆی خۆشەویستییەکی یەکجاری لە ناو خەڵکدا.

لە ئاکامی حەول و تێکۆشـانی ئـەودا، زۆرێـک مزگـەوت و مەدرەسـە و حـەمام، لـە سـنە و دێهـاتی دەوروبەریدا کرایەوە؛ وەکوو مزگەوتی سەید مـستەفا، فـاروقی، مـەلا لوتفـوڵا، شێخولیـسلام، مزگـەوتی ئەوێهەنگ، حەمامی هـانیس، مەدرەسـەی مەولـەوی کـورد و... هـەروەها لـە دامـەزرانی مەدرەسـەی

عولوومی دینی کوردستاندا دەورێکی بەرچاوی هەبوو.

ساڵی ١٣٣٨ ک. ه. )١٩٥٩ ز.) لە لایەن مەردمی شاری سنەوە کرایە شارەدار؛ بەڵام نەیکرد.

**لە بەرهەمەکانی**:

١. ڕۆژنامەی *زاگرۆس*

٢. پەراوێز و چاپی «*تاریخ اردلان*»، نووسراوەی مەستوورەی اردلان

٣. کۆ کردنەوەی سەرجەمێک فولکلۆر و قسەی نەستەقی کوردی و چەند کاریتر کە بە داخەوە مەرگی بێ وادە، چیتر مۆڵەتی نەدا و لە شەوی پێنجشەمبە، سێهەمی گەلاڕێزانی ساڵی ١٣٤١ ک. ه . (١٩٦٣ ز.)، دوای حەوتوویەک نەخۆشی، لە تەمەنی ٤٢ ساڵاندا، لێی ساندین.

ساڵی لەدایک بوونی ناسر، ١٢٩٩ ک. ه . بووە.

یاداشتەکانی نووسەر. *یادنامەی ناصر آزادپور*، نووسراوی عەباس ئازادپوور.

## مەلا موحەممەدی چڕستانی

کوڕی مەلا ڕەحیم، ساڵی ١٣١٢ ک. م. لە گوندی «ئابلاخ»ی لای سلێمانی هاتە دنیا و پاش پێگەیشتن، لای بابییەوە خوێندنێکی سەرەتایی دەسپێکرد و ئەوجار لە قوتابخانەکانی سلێمانی و هەولێر و کۆیە، شوێنی خوێندنەکەی گرت. سەردەمی یەکەم شەڕی دنیاگر، لە پشدەر و ئەوجار ڕانیە دەژیا و بومباردمانی فرۆکە بریتانییەکان،ماڵەکەی لە ڕانیە کاول کرد و ناعیلاج چووە سلێمانی و تا دواکاتی ژیانی (١٣٨٢ ک. م.) لەو شارە مایەوە و خزمەتی کرد.

مەلا موحەممەد مرۆیەکی هێژا و زیرەک و خۆشزەوق بووە و ئەدەبیاتی کوردی و فارسی و عەرەبی باش زانیوە.

پەراوێزی پێشەکی *دیوانی نالی*، چاپی تاران، ١٣٦٤ ک. ه. ل٧ و ٨.

## مەلا سەعیدی کابان

مامۆستایەکی زانا بووە کە ساڵانێکی زۆر لە قوتابخانەی مەحموودییەی شاری سلێمانیدا دەرسیگوتووە و ساڵی ١٣٤٧ ک. م. لە سەر ڕێزمانی کوردی، کتێبێکی نووسیوە و چەند کتێبی تریشی داناوە.

زا ومەرگی مەلا سەعید ساڵانی ١٢٨٦ و ١٣٨٣ ک. م. ڕوویداوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## ناسرنیزامی موستەوفی

میرزا نیعمەتوڵلا، کەسناو «ناصرنظام»، کوڕی میرزا عینایەتوڵلای موستەوفی کوردستانی، پیاوێکی

خاوەن ڕێز و ئاکار باش بوو، لە بنەماڵەیەکی بە وەج و ناوازە، خاوەن هێژاییەکی تەواو و لە وێژەی فارسی و ئایین و مێژوودا زانا و خەتخۆش، کە هەم نەسخ و هەم نەستەعلیقی جوان دەنووسی و جاروبارەش بە بۆنەی ڕووداوێکەوە شیعری دەگوت. ئەم شیعرەی بەشێکی شینnامەیەکە:

| | |
|---|---|
| باز از جفای آسمان، افتاد شوری در جهان | رفت از زمین تا آسمان فریاد هر خُرد و |
| دردا ز دور دهر دون، کز جور آن خلقی زبون | وز دیده جاری سیل خون، همراه با آه و |
| گویی قیامت شد عیان، وز هول رستاخیز آن | مرد و زن و پیر و جوان گشتند حیران |
| افسوس کان کان هنر، وان زاهد نیکو سیر | وان عالم با هنگ و فر از دیده‌ی ما شد نهان |
| با یاد حق زین رهگذر، بر بست بار این نو سفر | ناخورده از دنیا ثمر، پوشیده چشم از خان و مان |
| آن مقتدای اهل دل، چون بود با حق متصل | شد از علایق منفصل، فردوس را کرد آشیان |
| او رفت و شد از ما جدا، واسود در دار بقا | ما راست صدرنج و عنا از دوری وی جاودان |

کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو ناسرنیزام، دەوری ساڵی ١٣٨٢ ک. م. ڕوویداوە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## مەلا موحەممەدی قزڵجی

مەلا موحەممەدی تورجانی زادە، کوڕی مەلا حوسەین، کوڕی عەللامە مەلا عەلی قزڵجی تورجانی، ساڵی ١٣١٣ ک. م. لە شارەدێی «تورجان» هاتە دنیا و دوای پێگەیشتن، خوێندنی دەسپێکرد و زۆرێ قوتابخانەی کوردەواری بینی و پاشان چوو بۆ میسر و لەوێش ماوەیەک لە خزمەتی مامۆستایانی قاهیرە بەهرەی برد و ئەوجار گەڕاوە عیراق و ساڵی ١٣٣١ ک. م. لە بەغدا گیرساوە و هیندەی پێ نەچوو ناو و ناوبانگی داکەوت و لە مەدرەسەی «اعظمیّه»دا، بۆ دەرس‌گوتنەوە و وتاردان، دامەزرا.

مەلا موحەممەد لە مامۆستایانی گەورەی زانستە دینییەکان و فەلسەفەی ئیسلامی بووە. زۆرێک کتێبی نووسیوە کە هێندێکیان بریتین لە: «*مساجد السُّلیمانیّه*»، شەرحێک بۆ «*ربع مجَیَّب*» و ڕشتە پەراوێزێک بەسەر «*لباب الاشارات*»ی ئیمام فەخری ڕازیدا. بێجگە ئەوە لە گۆڤارە ناسراوەکانی عیراقدا، زنجیرەیەک وتاری بایەخداری دەنووسی.

مامۆستا بە کوردی و عەرەبی شیعریشی دەگوت. ئەم چەند بەیتە بەشێکی پارچە هەڵبەستێکە؛ بە داخەوە هەمووی دەس نەکەوت:

| | | |
|---|---|---|
| قەستەم بە سوورەی والتینێ | لە ئەلف و بێ تا چەغمینێ | ئەیدەم بە هەای پێکەنینێ |
| قەستەم بە سوورەی والفجرێ | چاو دەیبینێ و دڵ بۆی دەگرێ | ................................ |
| بەسەر قەبرمدا هات ڕابوارد | وە بیرم کەوت یاری قەدیم | «یَحْیَی العظامَ وَ هی رمیم» |



ئەم مامۆستایە ساڵی ١٣٨٣ ک. م.[١] لە بەغدا دنیای بەجێهێشتووە و لە زیارەتانی ئەعزەمییەی ئەوشارەیان ناشتووە.

یاداشتەکانی نووسەر. *عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل٥٢٢.

## ئەنوەری مائی

کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی مەلا ڕەحمانی ئاڵەکی مائی، لە بنەماڵەیەکی ناسراو، ساڵی ١٣٣٢ ک. م. لە گوندی «مائی»، لای دیاربەکر هاتە دنیا و خوێندنی لە مزگەوتانی بامەڕنی و دهۆک و زاخۆ و دیاربەکر و هەولێردا تەواو کرد و ساڵی ١٣٥٥ لە مەدرەسەی «قوبان»ی ناوچەی بادینان، چووە خزمەتی عەللامە شوکری ئەفەندی، موفتی و مامۆستای ئامێدی و دوای ماوەیەک خوێندن، ئیجازەی لێ وەرگرت.

ئەنوەری مائی لە سەرەتای لاوی و بەشداری لە زەوقی ئەو سەردەمەیدا، شیعری گوتووە و نازناوی «لاوی چیا» بووە. گرنگ‌ترین بەرهەمی، کتێبێکی عەرەبییە بە ناوی «*الاکراد فی بهدینان*» کە ساڵی ١٣٨١ لە چاپی داوە.

ئەنوەر ساڵی ١٣٨٣ ک. م. ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە.

*مێژوو*، د. کەمال مەزهەر، ل١٧٩-١٨٢. *الاکراد فی بهدینان*، انور مائی.

## گوویای کرماشانی

غوڵامعەلی گوویا، کوڕی غوڵامحوسەین، ساڵی ١٣٢١ ک. م. بەرامبەر بە ١٢٨٢ ک. ھ. )١٩٠٣ ز.) لە کرماشان هاتە دنیا و خوێندنی دواناوەندی لەوێ تەواو کرد و پاشان چوو بۆ تاران و لە یانەی زانستی باڵادا، لیسانسی وەرگرت. ساڵی ١٣٠٤ (١٩٢٥ ز.) چووە نێو وەزارەتی پەروەردە و ساڵانێکی زۆر لە کرماشان و سنە دەرسی گوتەوە و لە چەند شاریتر، وەکوو چاوەدێر و سەرپەرشت، کاری کرد و سەرەنجام ساڵی١٣٨٣ ک. م. سەری یەکجاری نایەوە و لە شاری قوم ناشتیان.

شادڕەوان گوویا مرۆیەکی دیندار، دەروێش، ئەهلی تەریقەت و بەڕاستی خزمەتگوزاری فەرهەنگ (کولتوور) بووە و ئەدەبیاتی باش زانیوە و شیعریشی گوتووە. لە سەرەتادا نازناوی «زوجاجی» و پاشان «گویا»ی بۆ خۆی داناوە.

**غەزەلێکی گوویا**:

به بزم، چون بت من جام می به دست بگیرد　　　اساس توبه عجب نیست گر شکست بگیرد

---

[١] لە کتێبی «*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*» دا، زا و مەرگی مامۆستا، ١٣١٠ و ١٣٨٠ ک. م. نووسراوە.

به دست عشق اثر نیست باده را مگـر آن دم
که جامی از صنمی شوخ و مـی‌پرسـت بگیـرد

چنان به تیر نگه کشت چابکم که دو صد جـان
اگر کـه بـود، سـزا بـود نـاز شـست بگیـرد

گرفت تاب و توانم به نیم غمزه و ای کاش
ز من بـه نـیم دگـر جـانی ار کـه هـست بگیـرد

بلای جان تو شد هـوش ناتمـام تـو «گویـا»
بهل بـه غمـزه‌اش آن چـشم نیمـه‌مـست بگیـرد

*تذکره‌ی شعرای کرمانشاه*، ل١٠٦.

## حافیدی قزڵجی

موحەممەد سەعیدی حافیدی، کوڕی مەلا ڕەحیم، کوڕی مەلا موحەممەد حەسەن، کوڕی عەللامە مەلا عەلی قزڵجی تورجانی، ڕۆژی ١٠ی مانگی ڕەبیعول ئەوەڵی ساڵی ١٣٢٢ ک. م. لـە بۆکـان هاتـە دنیـا. سەرەتا خوێندنی لای بابیەوە دەسپێکرد و ئەوجار چوو بۆ سەقز و ماوەیەکیش لەوێ خەریکی خوێنـدن بوو. ساڵی ١٣١١ ک. هـ. )١٩٣٢ ز.) گەیشتە سلێمانی و دەوری دوو سالیش لەو شارە خوێندی. بەشوێن ئەوەدا گەڕاوە بۆ مەهاباد و تا ساڵی ١٣١٦، لە خزمەتی مەلا ئەحمەدی تورجانی‌زادەدا ـکە ئامۆزای بـابی بووـ درێژەی بە خوێندن دا. سەرەتاکانی ساڵی ١٣١٧ ک. هـ. )١٩٣٨ ز.) بوو بە کارگێـڕی وەزارەتی داد و پاش کاری جۆراوجۆر لە چەند شاری وڵاتدا، سەرەنجام بوو بـە جێگـری دادسـتان لـە کرماشـان و تـا کۆتایی ژیان (١٣٤٢ ک. هـ. ١٩٦٣ ز.) لەو شارەدا مایەوە و لەوێش عەمری خوای کرد.

ڕەوانشاد حافیدی دۆستێکی ڕاست و بەوەفا بوو. بێجگە شارەزایی لە زانستە دینییەکاندا، تا ڕادەیـەک لەگەڵ زانیاری نوێشدا ڕاهاتبوو؛ زبانی ئینگلیسی و ترکی دەزانی و پێـڕای کـار، لیسانـسی خواناسیـشی وەرگرت. زەینێکی تیژ و زانینێکی بەربڵاوی هەبوو. بە کوردی و عـەرەبی و فارسـی شـیعری گوتـووە و شیعرە کوردییـەکانی جـوانن. مووسـیقای دەزانی و دەنگیـشی خـۆش بـوو. ئەمـەش نموونەیـەک لـە شیعرەکانی:

چییـــە دونیـــا؟ هـــەموو دەرد و بەڵایـــە
لـــە هـــەر لاوە شـــەڕ و هەڵـــڵا و هەرایـــە

وە بـــیری نایـــێ ئاغـــا حاڵـــی نۆکـــەر
ڕفێقـــیش بـــۆ ڕەفیقـــی بـــێ‌وەفایـــە

نییـــە خزمایـــەتی، دۆســـتی نـــەماوە
جەفا و زەحمەت لـە دۆسـت بـۆ ئاشـنایە

بە قین باوک لە کوڕ، کچ دوژمـنی دایـک
بـــرا تینـــوو بـــە خوێنخـــۆری برایـــە

لە عەیش و کەیفی شەو تـا ڕۆژە ئەشـراف
گـــەدا برســـی و بـــە ئـــاواتی کەوایـــە

لـــە ڕایـــەت مالیـــک و ئاغـــا بەقینـــە
بـــە کارگـــەر، کـــاردەر بـــێ‌ئیعتینایـــە

بەدەس جەور و جـەفای ئـەرباب، دهـاتی
بـە شـارا خـول ئـەخوا، ئێـژی گەدایـە

دوکانـداریش لـە دەسـتی کاربەدەسـتان
لـــە شـــاران دەرکـــراو و هەڵـــوەدایە

شەڕی دەروێش و سۆفیش قورسە ئـەمما
ھەموو شـەڕیان لـەسـەر لێفـەی مەلایـە

ژن و شووش لەم قـڕە بـێ‌بـەش نـەماون
بەرەڵـــڵایی ژنـــان عـــەینی حەیایـــە

لە ھەر لا زەلزەلە و سـەیل و خەسـارەت
کولــە و ئافــاتی ئــەرزی یــا ســـەمایە

ئەمانـە پـاک لەبـەر بـێ‌دیـنی و جـەھل
نەتیجـــەی ئیـــشی زشـــت و ناڕەوایـــە

عەلاجمان یەکیەتی و ڕاستی و دروسـتی
ڕەوشـــــتی چـــــاکی «فَخْــرُ الانبیایـــە»

یاداشتەکانی نووسەر.

## موحەممەد ڕەشیدی خالیدی

مەلا موحەممەد ڕەشیدی خالیدی، کوڕی عەللامە مەلا عەبدوڵلای مـوفتی دشـی[1] و بـرای حـەق‌ودای مەلا مەحموودی موفتی کوردستان[2]، ساڵی ١٣٢٣ ک. م. لە شاری سنە ھاتە دنیا و ھـەر لـەو شـارەش خوێندنی تەواو کرد.

ساڵی ١٣٥١ ک. م. بە نیازی خزمەت گەیشتنی قوتبی عارفان، شێخ عەلی حوسامەدینی گڵکۆ پیرۆز، لە سنە دەرکەوت و ڕووی لە کوردستانی باشوور نا. لەوێ پاش دیـداری شـێخ و چوونـە نـاو تەریقـەتی نەقشبەندیوە، ماوەیەک لە خانەقای تەوێڵێ خەریکی سەیر و سولووک دەبێ و پاشان بۆ دیـتنی ولاتـانی عەرەب و زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان، لە ڕێی سلێمانی و کەرکووکەوە، ئەگاتە بەغدا و کەربەلا و نەجەف و لە ھەرکام لەم شارانە، چەند ڕۆژ لائەدا و لەگەڵ زیارەتدا، زانایان و مامۆستایانیان دەبینێ. ئـەوجار بـەرەو شام و ئوردون دەچێ و سەرەتێک بە حەلەب و دمشق و قودس و عەممان و چەند شاری تردا دەگەڕێ. ئەنجا کە کاتی حەج دەگا، ئەچێتە حیجاز و دوای بەجێ‌ھێنانی حەج و زیارەتی مەدینەی پیرۆز و بـاقی شوێنە ممبارەکەکان، دەگەڕێتەوە بۆ لوبنان. لەوێ دوای ئاشنا بوون لەگەڵ چەنـد کـەس لـە مـەلایانی بەیرووت، لە مزگەوتێکی ئەو شارە بەناوی «جامع الخضر»دا دەبێتە بەرنوێژ و تازە لەوێ دەمێنێتەوە. بـەڵام ساڵێ چەند جار بۆ سووریاش دەچێ و لـەگـەڵ عارفـان و زانایـانی ئەوێـشدا ئاشـنایەتی و دۆسـتایەتی دادەمەزرێنێ.

بۆخۆی زۆر جاران بە ڕێزەوە باسی کەڵەپیاوانی ئەو سەردەمەی سووریای دەکرد و تەنانەت ناوی چەند کەسێکیانی کە دەبرد، فرمێسک بە چاویدا ئەھاتە خوار. شیاوی باسە یەک لەو مامۆستایانە، بە ناوی شێخ شەریف یەعقووبی، دوای ناسینی مەلا موحەممەد ڕەشید و زانـینی ڕادەی پارسـایی و بـەرزی ئاکـاری،

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٦١٣.

٢. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٨٠٦.

کچەکەی خۆی لێ مارە دەکا.

موحەممەد ڕەشید دوای ژن خواستن و نیشتەجێ بوون لە لوبنان، هەموو ساڵێک بۆ کاکی (مەلا مەحموودی موفتی) و کەس و کاری تری لە شاری سنە، نامەی دەنووسی. نامەکانی ئەم دواییانەی، ڕەنگ و ڕوویەکی جیاوازی پەیدا کردبوو؛ دەری‌دەخست کە دڵ و دەروونی نووسەرەکەی تا چ ئاستێکی بەرزی عیرفانی گەیشتووە و زانست و زانیاری خاوەن ئەو قەڵەمە تا چ ڕادەیەک بەرز بۆتەوە.

مەلا موحەممەد ڕەشید چەند جار بۆ میسر و مەراکیش ڕۆی و دوو جاری‌تر سەفەری حەجی کرد. ساڵی ١٣٧٠ ک. م. بۆ دیداری کاکی (مەلا موحەممەدی بورهان)[١] چووە ئەستەمبووڵ. زستانی ١٣٧٥ یەکەم جار گەڕاوە بۆ سنە و ماوەیەک مایەوە و چاوی بە خزم و کەسانی کەوت. ساڵی ١٣٨٣، جارێکی‌تر بە ژن و منداڵەوە، هاتەوە بۆ سنە و ئەمجار لەبەر ئەوە کاکی کۆچی دوایی کردبوو، بوو بە میوانی ئێمە و ئەمن توانیم جوانتر کەسایەتی بەرز و پاکی و پارێزکاری ئەو کەڵەپیاوە ببینم. عارفێک بوو دڵ‌ئاگا و خۆش سەروزمان و گفت جوان. کاتێ قسەی دەسپێدەکرد، گڕ و تینێکی تایبەت دایدەگرت و زۆربەی قسەکانی تەفسیری قورئان و زانیاری ئایینی بوو. ئەگەرچی بە بەرنامە قورئانی لەبەر نەکردبوو، بەڵام بەو بیرە تیژەوە هەیبوو، هێندەی خوێندبۆووە، هەمووی لە سینەیدا بوو. شەوان زوو دەنووست و بێ شەوبگار، نیوەشەوان بۆ شەونوێژ هەڵدەستاوە و تا درنگێک نوێژ و قورئانی دەخوێند. پێش تاوهەڵاتیش دیسان بۆ نوێژی بەیانی لە خەو ڕادەبوو. ئەمجار تا خۆر دەکەوت، لە سەر بەرماڵەکەی نوێژ و ڕازونیازی دەکرد و بە دەنگێکی نەرم و خۆش قورئانی دەخوێند و فرمێسکی دادەخست. بەڕاستی پیاوێکی پیرۆز بوو. لە بەخشیندا، ڕادەی ڕانەدەگرت و زۆر جار ئەگەر هەژارێکی ئەبینی، تەنانەت بەرگ و پێڵاوەکەشی پێ دەبەخشی و بە پێخواسی ئەهاتەوە ماڵ.

بنەماڵەی پێغەمبەری یەکجار خۆش دەویست. لەگەڵ شیعری حافیزدا سەیر ببووە دۆست و هەمووی لەبەر کردبوو. تەنانەت دەیگوت لە دیوانەکەی دەکرێ سەبارەت بە داهاتووش زانیاریمان دەسکەوێ و لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە بەڕاستی زمانی غەیبە.

مەلا موحەممەد ڕەشید بەهۆی زانینی عیلمی حرووف و ئەعداد و بە یارمەتی دڵی ئاگا و چاوی بینای، جاروبار لە ڕووداوانی داهاتوو خەبەری دەدا. زۆری لوتف لەگەڵ من هەبوو؛ پێی خۆش بوو دانیشم و لێی فێر ببم؛ بەڵام من ئەو کاتە سەرقاڵی دەرس‌گوتنەوە و مەدرەسە بووم و لە لایەکی تریشەوە وازێکی وام لەو جۆرە زانستانە نەبوو.

سەید موحەممەدی عەرەبی ئیدریسی حەسەنی، حەدیس زان و مەرجەعی فتوای لوبنان، لە لاپەڕەی

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٧٨٧.

٨٧ی کتێبی «*اتحاف ذوی العنایه*»دا ـکە سەبارەت بە زانایان و عارفانی شام و لوبنانە ــ لەمەڕ مەلا موحەممەد ڕەشیدەوە وای نووسیوە:

«و منهمُ أُستاذُ البركَة الصّالحُ الصُّوفی الشَّیخُ محمد رشید مُفتی‌زاده خطیب و إمام و مدرّس بمسجد الخضر عَلیه‌السّلام، تعرَّفْتُ به فی بیروتَ عندَ نُزوله و سُكْناهُ بها، فَأَلْفَیْتُهُ صاحبَ أحوال معَ كرمٍ و افضال؛ یتكلّم بإشارات صوفیَّة و یفَسّر كثیراً من الایات القُرآنیّة مِن طَریق الإشارات الصُّوفیة، و یَستنبِطُ مِنْها أخباراً كَونیَّةً، أدامَهُالله و نفعَ بِه».

ناميلكەیەکی بە زمانی عەرەبی لە بەیرووتەوە بۆم ناردبوو، بریتی لە ڕاڤەیەکی دوور و درێژ سەبارەت بە دنیا و سەرەتای وەدیهاتنی بوونەوەران و هاتنە سەر زەوی بابەدەم تا وەدیهاتنی خاتەم (د) و وەک نووسیبووی بەشێک لە کتێبێکی گەورەیە لە بارەی ڕاز و ڕەمزی ئافراندنی جیهانەوە کە بۆخۆی نووسیویە.

ئەم عارفە زانا و مامۆستا گەورەیە سەرەنجام لە نێوانی ساڵی ١٣٨٤ ک. م. لە بەیرووت جیهانی بەرچاوتەنگی بەرەڵدا کرد و خێوەتی سەربەرزی خۆی لە بارەگای خودای دڵاوادا بەرپا کرد. بەرامبەر بە ڕاسپێری خۆی، تەرمەکەیان لە بەیرووتەوە بردە دمشق و لە زیارەتانی «بابُ‌الصّغیر»، لە پەنای شێخ شەریفی خەزووری ناشتیان.

ئەمن بەو بۆنەوە ئیرادەتم پێ هەبوو، لە شینیدا، قەسیدەیەکی عەرەبیم دانا و بۆ کوڕی بەڕێزی، کاک عەبدوڵڵای خالیدی، بۆ بەیرووتم نارد؛ کە ئەوا بەشێکی:

ماهــذه الــدُّنیا بــدار قــرار ... لا فــی هُنــاكَ مــآربُ و أمــانی

لَــیْس الزَّمــان مُواخیــاً و مــوازراً ... شــیم الزَّمــان خُـصُومَــةُ الإنـسان

مــنْ بــات فیهــا ظــافراً او خائبــاً ... أردتــهُ یومــاً حَــربَــة الحـدثان

طُــوبی لمَــن لــمْ یبغ فیهــا غَیْـرَ مــا ... أوْحــی بــه الــرَّحمن فــی الْفرقــان

طُــوبی لحُــرّ طَلَّــق الــدُّنیا و لــمْ ... یهْـــتَمَّ بالمـــال وَ لا الْعُنــــوان

طُــوبی لــصُوفیٍّ تقــیٍّ زاهــد ... لَــمْ تُلْهــه أنْعــمُ دار فــان

إنَّ «الرَّشــید مُحمَّــداً» أودی وَ أصــ ... ــبحَ ضَـیْف كـوثر سـیّد العـدنان

مــولیً لــهُ فــی النّــاس ذكــر سـائر ... بــصفاء آراء و حُــسن بیــان

یعــزی لقــوم ســادة «كــردیّــة» ... بیــت العلــوم و مَعْــدن الْعرفــان

الحــائزین ذری الــشّرافــة و العُلــی ... و الفــائزین بنعْمَــة الرِّضْــوان

نــالُوا الــسّیادةَ و الرّیــاســةَ و الإمــا ... مَــةَ فــی اتّبــاع شـریعَــة الـرَّحمن

نَسَب لَهُمْ كالشَّمس معْ حَسَب هُمــا ... مُــتلأْ لئــان كلاهُمــا ســیّان

مـنْ مَعْـشَر الإفتـاء قَـدْ ورثـوا الکَـرا مَـــةَ کـــابراً عَـــنْ کـــابر ذی‌شـــان

* * *

یا عـالیَ الخُطُـوات فـی سُبُل الهـدی یـــا ذاکـــراً فـــی الـــسرّ و الإعـــلان

یـا محـسناً قَـدْ فـاقَ مَعْـنَ الزّایـدَه فـــی عَـــصْرنا بـــالجود و الإحْـــسان

یا کعبـةَ المعـروف، یـا مُحیـی النَّـدی یـــا منبـــعَ الإیقـــان و الإیمـــان

یـا مَـنْ لَـهُ خُلُـقٌ جَمیـلٌ عَرْفُـهُ فـــی طیبـــه کَـــشقایق النُّعمـــان

فـی عـصْرنا إنْ کـان رکـنٌ ثابـتٌ لمُهَـــذَّب الأَخْـــلاق، أنْـــتَ الْبـــانی

قَـدْ کُنْـت مُنْقطـع الْقـرین عَدیمَـهُ ذارقَّـــــة مـــنْ خَـــشْیة الـــرَّحمن

قَـدْ کُنْـتَ قوّامـاً خَـشُوعاً خاضـعاً بَکّـــاءَ حـــینَ تـــلاوَة القُـــرْآن

کانَـتْ عُیُونُـکَ دائمـاً مُبْلـولَـةً مـنْ خـوف نیـران و شَـوْق جنـان

طـوبی لقـوم مـوتهم کَحَیـاتهمْ ولـــک الممـــاتُ الآن عُمْرٌثـــان

قَدْ غبْت عَنْ وطـن سنینَ وَ قَـدْ ثوَیـ ـــتَ بـــأرض شـــام أوثَـــری لُبنـــان

والله کُنْـتَ مُقـیم مُهْجَتنـا، کمـا شـــاهَدْت حـــینَ زیـــارة الأوطـــان

واهـاً لفَقْـدکَ یـا عزیـزُ فَمـصْرُنا مـــنْ نَعـــی یُوسُـــفَ بَلْـــدةُ الأَحـــزان

حَمَلُوک منْ بیروت نَحْود مَشْقَ والـ ـــأحبابُ حَوْلَـکَ فـی بُکـیً وَ حنـان

مُتأسّـفین، مُـشَیّعین، تفـیضُ اَعْـ ـــیُنُهم جَـــویً وَنَـــوی بـــدَمع قـــان

* * *

منّـی الـسَّلامُ لمـن ثَـوی دارَالـسّلا م قریـــرَ عـــین مُـــسْتَنیرَ جَنـــان

منّـی إلیـه تَحیَّـةٌ مـشفُوعةٌ بزفیـــر وَجْـــد الْقَلْـــب ذی الْهَیَمـــان

وَ سَـحائبُ الرّضـوان تَـسقی رمْـسَهُ مـــنْ کـــلّ مُـــزْن هاطـــل هَتّـــان

أدعـو و أسـألُ مـن إلهـی اَنْ یَحُــ ــــفَّ ذویـــه بالتَّـــسلیم و الـــسّلْوان

* * *

أرَّخْـت رحْلَتَـهُ ببیـت ملهـم هجْـــریـــة یُغنیـــک عَـــنْ تبیـــان

«أمسی الرَّشیدُ بجهد دیـن المُـصطفی مَلَکـــاً یحـــومُ الیَـــوْم حَـــوْل جنـــان»

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من. اتحاف ذوی‌العنایه*، چاپی بەیرووت، ل٨٧.

## حەبیبوڵڵای نەعلەینی

سەید حەبیبوڵلا مرۆیەکی ڕێزدار، دڵپاک، خەڵکخۆشەویست و دیندار بوو کە ساڵی ١٣٠٢ ک. م.

هاتبووە دنیا و لە گوندێکی لای ڕوانسەر، بە ناوی «خەراجیان»دا دەژیا و ژیـانی بـە کـشتوکـاڵ بـەڕێوە دەچوو. ڕێبەندانی ساڵی ١٣١٠ ک. هـ. )١٩٣٢ ز.) کە ڕەزا شای پەهلەوی، زۆرێک لە گـەورە عەشـایر و خەڵکی ناوداری کوردی لە ڕۆژهەڵاتدا گرت، ئەمیش گیرا و ماوەی ١٠ ساڵان (تا خەرمانانی ١٣٢٠) لـە زیندانی ئەسفەهان توندکرا. دوای ئازاد بوون، گەڕاوە زێدی خـۆی و تـا کۆتـایی ژیـانی (١٣٨٤ ک. م.)، خەریکی بەڕێوەبردنی کاروباری گوند و خەڵکەکەی بوو.

خوا لێ خۆشبوو نەعلەینی، بێجگە دەسـت و تفـەنگ و سـواری، کتێـبخـوێن شیعردۆسـتیش بـوو. بەتایبەت خەمسەی نیزامی هەر لە دەستی دانەدەکەوت. جارـ جاریش خۆی شیعری دەگوت.

ئەوا شیعرێکی، کە باسی تاڵی ژیان و کۆسپی زیندان دەکا:

یـــاران، عـــەزیزان! دەردم کارییـــەن — زوخـاو دەروون چـون سـەیل جارییـەن
مەحبووس و زەلیـل، بـێتەقـسیر وێمـان — ڕای نـەجات تاریـک، بـێتـەدبیر وێمـان
دوور کەفتـەی وەتـەن غـەریب، بێچـارە — سـەرعی خـاتر تـەنگ سیاسـتارە
تۆخـودا یـاران، ڕەفێقـان چـۆڵ! — یاد کەن غەریبان خەستەی خەم وە کۆڵ
هەرسـاتێ هـەوای ئـازادی هـەردان — گەشت و سـەییادی و گوزەرگـای زەردان
چـەنی ڕەفێقـان جوویـا پـەی نـەچیر — بێخەم مەسـت شـەوق وە سـۆز دڵـگیر
جەرگـەی کـەڵڕمـان، ناڵـەی ماردمـان — سەدای هەی دەسوەش دەروون بێخـەمان
نەسـیم بـۆی عـەتر چنـوور و شـەوبۆ — گـشت بی وە خـەیاڵ، وەی وە یانـەم ڕۆ
مـەیۆ وە یـادم چـون خـاو شـەوان — نەفـەس قـەتع مـەبۆ، لاڵ مـەبۆ زوان
دیـسان گرفتـار چـەرخ گـەردوونیم — وەگیـان یـاران تـەمام زەبـوونیم
جەی قەفەس تەنگ حەبس ئەسـفەهـان — ڕیـشەی شـادیمان جـە بـیخ هۆرکنیـان
ئەگـەر بـەیان کـەم هەزاریـەک دەردم — مـەبۆ وە سـەربار هەناسـەی سـەردم
بـاز هـەم پـەنامان وە زات حـەقـەن — وە لوتـف بێچـوون فـەرد موتـڵەقەن
کەرەم بـێشـومار، مـەر وە لوتـف وێـش — وە فەزڵ و ڕەحمـەت، وەرنـە چـارەیێش
یە «حبیب» واتـەن وەی گـشت دەردەوە — دڵ وە هەناسـەی سـیای سـەردەوە

*حدیقەی سُلطانی*، ل٨٨. یاداشتەکانی نووسەر.

## نەجمەدین مەلا

کوڕی مەلا غەفوور، کوڕی مەلا ئیبرایم، ساڵی ١٣١١ ک. م. لە سلێمانی هاتە دنیا و لای بابی و حـاجی شێخ مستەفای قازی خوێندی و بەشوێنیدا، ماوەیەکی کەم لە کارێکی دەوڵەتیدا دامەزرا.

نەجمەدین مەلا پیاوێکی ئاگا و سەر لە ناو کتێبان بوو. ماوەی چل ساڵان کتێبخانەیەکی کە خۆی دایناو و «کەشتی نۆح»ی پێ دەگوت، بەڕێوە برد. ساڵی ١٣٤٧ بە هاوقۆڵی مامۆستای هێژای کورد، حوسەین حوزنی موکوریانی، گۆڤاری«*زاری کرمانجی*» بڵاو کردەوە.

مامۆستا بابەتی زۆری سەبارەت بە کورد و کوردستان کۆ کردبۆوە و هێندێکیانی لە ڕۆژنامەی «ژین»دا چاپ دەکرد. هەر لەو ڕۆژنامەیەدا لە شوێنێکی تایبەتی بۆ منداڵانی دەنووسی.

لەم مامۆستایە زۆر کتێب و نامیلکە بەجێ ماوە کە تا ئێستا هیچیان چاپ نەکراوە.

کۆچی یەکجاری نەجمەدین مەلا، ساڵی ١٣٨٤ ک. م. ڕووی‌داوە.

*روزنامەنگاری در کردستان*، ترجمە احمد شریفی، چاپ ١٣٥٧ ک. ه. ل٦١ و ٦٢.

## نافیع یونس

ساڵی ١٣٤٧ ک. م. لە هەولێر هاتە دنیا و ساڵی ١٣٦٩ خوێندنی لە ڕشتەی حوقوقی زانستگای بەغدا، تەواو کرد و لە ڕاستیدا لەوە بەولاوە، هەموو ژیانی لەڕێی خەبات بۆ گەلەکەی دانا.

نافیع کاتی خوێندنی لە زانستگادا (ساڵانی ١٣٦٥ و ١٣٦٦)، چووە نێو کۆڕی خەباتکارانەوە و یەکێ لە ئەندامانی کارای ئەو کۆڕە بوو، کە ڕێکخراوەی «شۆڕش»یان پێ دەگوت. ساڵی ١٣٦٩ ک. م. گیرا و ماوەی دەساڵان لە زیندانی ناوەندی بەغدا، توند کرا.

لە ڕاپەڕینی تەمووزی ١٣٧٩دا، لەگەڵ تاقمێک لە هاوبیرانیدا، ڕۆژنامەی «*ئازادی*» دانا؛ کە بە کوردی و سەرەتا لە کەرکووک دەردەچوو. پاش ماوەیەک بردیانە بەغدا؛ بەڵام نافیع دیسان گیرا و ئەم جارە لە زیندان، ساڵی ١٣٨٤ ک. م. سەری یەکجاری ناوە.

*روزنامەنگاری در کردستان*، ترجمە احمد شریفی، چاپ ١٣٥٧ ک. ه. ل٧٠.

## قانیع

شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ قادری کەلووس، کوڕی شێخ سەعید، کوڕی شێخ موحەممەدی دۆڵاش، لە سەیدەکانی کابولی ـ کە لقێکی کۆنەپۆشین ـ ساڵی ١٣١٨ ک. م. لە گوندی «ڕێشین»ی شارەزوور هاتە دنیا. لە چلەیدا بابی عەمری خوای کرد و چوارساڵان دایکی بەجێی هێشت و لەوە بەولا، خوا لێ خۆشبوو سەید حوسەینی چۆڕی، گەورەی کرد و پێی خوێند.

موحەممەد لە تەمەنی ١٢ ساڵاندا چوو بۆ خوێندن و دوای ماوەیەک گەڕان بە شارانی سلێمانی و سنە و سەقز و کۆی و کەرکووکدا، سەرەنجام گەڕاوە بۆ سلێمانی و سەردەمێک لە خزمەتی عەللامە ئیبنوقەرەداغی بەهرەی برد؛ ئەگەرچی کەم و کووڕی و گیر و گرفتی ژیان، چیدی نەیهێشت بخوێنێ و

دەرسەکەی تەواو بکا ؛ بەڵام هەر لەو کاتەوە کە لە سنە دەیخوێند، بە هۆی زەوق و لێهاتوویی سرشتیوە، شیعر گوتنی دەسپێکرد. ئەڵبەت باب و باپیر و تەنانەت دایکیشی لە بواری شیعردا سەریان دەرچووە و کوڕەکانیشی («خنجەر» و «کوتەک» و «وریا»)، لەم بارەوە بێ دەسەڵات نین.

قانیع بۆخۆی بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە و زۆربەی شیعرەکانی گلە و گازندەیە لە بارو دۆخی کۆمەڵگا و ژیانی بێ سەروبەری خۆی. پیاوێکی خاوەن زەوق، وێژەوان، زانا، ئاگا و تێگەیشتوو، کەچی سەرانسەری ژیانی بە هەژاری و نەداری و دەربەدەری ڕابواردووە؛ لەبەر ئەوە ویستوویە سەری بەرز بگرێ و دەستی خوازەڵووکی بۆ کەس دانەکێشێ، هەموو کارێ، لە نووسەری و مەکتەبداری و مامۆستاییەوە تا باخەوانی و کشت و کاڵ و چەرچیگەری و ئاشەوانی و هێزم فرۆشی و تەنانەت کرێکاری کردووە؛ بەڵام بەو بۆنەوە قەت زمانی بەلادا نەخستووە و سەری بۆ قسەی زۆر و ناحیساب دانەنەواندووە و هێندێکیش قسەی تاڵ و ڕەق بووە، لە هیچ کارێکدا ئاخری نەهاوردۆتەوە و هەر کارێکی دەسپێکردووە، پاش ماوەیەک بەجێی‌هێشتووە.

ئەوانەی لە نزیکەوە قانیعیان دیوە و لەگەڵیدا ژیاون، زۆر لە قسەخۆشی و گاڵتەکردنی بە هەموو شتێک و تیز تێگرتن و تەشەر دانی، بەتایبەت لە دەسەڵاتداران، دەگێڕنەوە. ئەگەر قسەیەکی بۆ هاتبێ کە لووتبەرزێکی پێ سووک بکا، گوێی نەداوە ئەو قسە چەندە ئاو هەڵدەگرێ و چەندی خراپ لێ هەڵدەستێ. دیارە ئەم تایبەتمەندییەش هۆیەکی سەرەکییە بۆ ئەو هەموو چەرمەسەرەی بە سەریدا هاتووە.

لە شیعرەکانی مامۆستا قانیع، تا ئێستا پێنج دەفتەری چاپ کراون؛ کە بریتین لە:

١. *گوڵاڵەی مەریوان*

٢. *باخچەی کوردستان*

٣. *چوارباخی پێنجوێن*

٤. *شاخی هەورامان*

٥. *دەشتی گەرمیان*

شیاوی باسە هەموو ئەم شیعرانە کوردین و شیعرە فارسییەکانی هێشتا چاپ نەکراون.

قانیع ساڵی ١٣٨٥ ک. م. لە گوندی «لەنگەدێ»، لای پێنجوێن، سەری یەکجاری ناوە و لە ئەرک و مەینەتی دنیا حەساوە.

**چەند نموونە لە شیعرەکانی:**

کە دولبەر بادەنۆشی کا، ئەبێ من خزمەتی مێو کەم

بە شەو ئاودێری باخات و بە ڕۆژ دەفعی چڵوچێو کەم

ئەوندە یاس و بێزارم لە چەرخ و ئەهلی ئـەم چەرخـە
ئەبێ تەقلیدی مەجنوون و خەیاڵـی ژیـنی سـەرکێو کـەم
چ ڕۆژێکــە خــوا! ئەمــڕۆ کــە هــاواری بریـنــداریم
نەوێرم بانگی بۆ هەڵدەم بە بۆڵەبۆڵـی ژێـر لێـو کـەم
موقەددەر باڵی توند بەستم دەری کردم لە نـاو یـاران
مەگەر ئەمجا بە ناچاری ڕەفیقی جـننی و دێـو کـەم
کە باخی ئارەزووم ئەمڕۆ نەبێ، زاهید! لـە مەحــشەردا
ئیتر بۆچ ئارەزووی باخی هەنار و قەیسی و سێو کەم؟
خەیاڵم وابـوو گۆچـانی نەسـیحەت هەڵـگرم بـۆ ڕان
وەکوو مووسا لە دەشتی ئەقدەسا شـوانانە هـەر عێـو کـەم
شوعەیبێکم نەدی شــەرتی شــوانیم بـۆ بـەجێبێنــێ
ئیتر بۆچ خزمەتی ڕانی بە بێ سوود و بە بــێ خێـو کـەم؟
چ خۆشە «قانع»ی ئەمڕۆ لە دەشتی وەحدەتا وەک تۆ
بە هیوای جەژنی سەربەستی لە خـوێنی جـەرگ پارشـێو کـەم

* * *

ئەی لە کونهی زاتی پاکت کوێر و نابینا منم
وەی لە بازاڕی سیفاتت بێسەر و سەودا منم
گەر خوداناسی وەها بێ پێشەواکان کردیـان
قوڕ بەسەر خۆم لەم زەمانە هەرزەو و ڕسوا مـنم
هەرکەسێ بۆخۆی تەریقی حەقشناسی گرتە پـێش
کەس نەناس و بەشبڕاو و سەرکز و شەیدا مـنم
«لـیْس للانـسان الّـا مـا سـعی» نەمگرتــە گــوێ
بۆیە ئیستە موســتەحەققی ئـاگری عوقبـا مـنم
ئاگری هەوڵم بە جۆش و هەڵمەتی حرسم گران
دائیما غەرقی خەیاڵـی پـووچ و بـێمـەعنا مـنم
واعیزێ گەر خەیری خۆی وەعزم بدا من پێی دەڵێم
ژاوەژاوت لابە واعیـز، مـوفتی و مـەللا مـنم
موژدە بـێ «قـانع» کـەوا ڕەحمـی خـوا بـۆ عاسییە
جا کەوابوو موستەحەققی ڕەحمەتی عولیا مـنم

قانیع دەوری ساڵی ١٣٤٢، لەگـەڵ «وریـا»ی کوڕیـدا گـیرا و بردنیانـە زینـدانی قەسـر لـە تـاران و هەرکامیان لە قەورەقووڵەیەکدا جیا لە یەک. ئەم شیعرەی لە کاتێکدا نەخۆش کەوتووە و لە کوڕەکەشی هیچ خەبەرێکی نەزانیوە، داناوە:

ئـاخرین ماڵــی ژیـانم کــونجی بەندیخانـەیـە
ئەم کەلەبچە، مەرهەمی زامی دڵـی دێوانەیـە
زۆر دەمێکە چاوڕوانی، زرزڕی زەنجیر ئەکـەم
سەیری ئەم زنجیرەکەن! وەک زیوەری شاهانەیە
بووکی ئازادیم ئەوێ و خوێنم خەنەس بۆ دەست و پـێ
حەڵقەحەڵقەی پێـوەنم وەک پلپـڵە و لەرزانەیـە



گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بە دیلی لاڵ ئەبم
بیری ئازادیم لە زینداندا فراوانتر ئەبێ
گرتن و لێدان و کوشتن عاملی ئازادییە
چاوڕوانی شۆڕشێکم، عالەمێ ڕزگار بکا
گەر بە ئازادی نەژیم، مردن خەڵاتە بۆ لەشم
«قانع»م ئەمڕۆ لە زیندانا، بە ئازادی ئەژیم

باش بزانێ، کونجی زیندانم قوتابیخانەیە
قوڕ بەسەر ئەو دوژمنە هیوای بە بەندیخانەیە
تۆپ و شەستیر و کەلەبچە، لام وەکوو ئەفسانەیە
میللەتم بۆ ئەو مەبەستە، کردەوەی شێرانەیە
نۆکەری و سەردانەواندن، کاری نامەردانەیە
سەد هەزار لەعنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە

**تێهەڵکێشی دوو غەزەلی فارسی و عەرەبی حافیز، بە تیزەوە:**

ئەگەر شەو بێتە سەر جێگەم کەوا تاقەی کراس خارا
«بە خال هندوش بخشم سمرقند و بخارا را»
وتم پێ: کوێ بە دڵ تۆیە؟ بە عیشوە پێ کەنی و فەرمووی
«کنار آب رکن‌آباد و گل‌گشت مصلی را»
سەر و زولف و برۆ، چاو و خەت و خاڵ و لەبی لەعلت
«چنان بردند صبر از دل، کە ترکان خوان یغما را»
نە تەنها من لە ڕەمزی تاقی میحرابی برۆت ناگەم
«کە کس نگشود و نگشاید بە حکمت این معما را»
سلامم کرد لە یاری خۆم، وتی: هەی ناعَلَیْک، ئەبلەهـ!
«جواب تلخ می‌زیبد لب لعل شکرخا را»
کە حوسنی یۆسفم بینی، سەعاتەن بۆم موحەققەق بوو
«کە عشق از پردەی عصمت برون آرد زلیخا را»
بە میسلی شەکر و چا بێ‌یەک سەفایان لێ نەبینراوە
«جوانان سعادتمند (و) پند پیر دانا را»
ڕەواجی دەفتەرت «قانع» ئەبێ مونکیر چلۆن بیبا
«کە بر نظم تو افشاند فلک عقد ثریا را»

* * *

تۆخوا زولف خەناوی زەمانی وەسڵت کامە
«إنّی رأیت دهْراً من هجرك القیامە»
ئیزهاری عیشقبازی تاکەی بکەم بە بێ‌سوود؟
«لَیْسَت دُمُوعُ عَیْنی هذی لَنا العلامە»؟
من ئیمتحانی بەختم ئەکەم وەلێ ئەزانم
«مَنْ جَرَّبَ المُجرَّب حَلَّتْ بە النَّدامە»
ئەی دڵ! لە یاری بێ‌مەیل، بێ‌مەیل بە، چونکە ڕاسە
«فی بسعدها عَذابٌ، فی قُرْبها السَّلامە»
سۆفی ئەڵێ بە بێ‌ڕەنج وساڵی دولبەرم هەس
«واللە ما رأیْنا حبّاً بلا مَلامَە»
دوێنێ لە بەختی من یار چارشێوی شەرمی لادا
«کالشمس فی ضُحیها تبدو منَ الغمامە»
«قانع» لە شەوقی چاوی عاشق بە جامی مەی بوو
«حَتی یذوق منەُ کأساً منَ الکرامە»

دیوانەکانی قانیع. چێشتی مجێور، چاپی دووەم، ل٩٦-١٠٠ و ١٦٥-١٦٦. *زایەڵەی زرێوار*، ئامادەکردنی ئەحمەدی نەزیری.

## خوەرشی نما داواشی

کچی داواشی موحەممەد و خوشکی میرزا ئەحمەد موحەممەدی داواشی، خاتوونێکی ئاگا و پارسا، سەر

به تەریقەتی قادرییە کە ئەمیش وەکوو براکەی، بۆ شیعر گوتن و لەسەربیر بوون دەستێکی باڵای هەبووە و ساڵی ۱۳۸۵ ک. م. دوای ٦٥ ساڵ، ماڵاوایی دنیای کردووە.

خوەرشی نما ئەم شیعرەی بە باڵای مورشیدەکەیدا (سەید سەفائەدینی بەرزنجی هاشمی) گوتووە:

یە خوەرشید واتەن، دایم غەمینەن     غەمین دووری«صفاءالدین»ەن
یا خودا مەرگی نەوێنم وە چاو     نەیژنەفم وە گۆش نەیوێنم وە خاو
جادار عەزیز پیر ئیرشاد بۆ     وەکێڵ زیندەی غەوس بەغداد بۆ
ناڵەی مەستانەی تەکیەش هەر بەرز بۆ     پەناگای دەروێش ئەبداڵ مەرز بۆ
مەیخانەی مەعنیش هەر بەرقەرار بۆ     با خەبەر جە ئەمر لەیل و نەهار بۆ
جە لای سینەی سەرد گوناباران بۆ     ئوستاد سەرمەست ڕۆزگاران بۆ
زەنجیر لوتفش نیان وە گەردەن     ئەهلی و ڕامم کەرد تا وە ڕۆی مەردەن
بەڵکەم جە ئەلتاف وێنەی ئەو شایێ     ڕابیعەی دەوران، گوم کەردە ڕایێ
بگنۆ وەسەر ڕای تاعەتکاریدا     بەر بەیۆ جە حوکم سەنگەساریدا
بواچۆ سەرمەست بادەی شاکریم     کەلب ئاسانەی عەبدولقادریم

*حدیقەی سُلطانی*، ل۲٤٧. یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا سادقی نگڵی

مەلا موحەممەد سادقی ئەحمەدزادە، کوڕی ئەحمەد، کوڕی حوسەین، سەرەتای پاییزی ساڵی ۱۲۸۰ ک. هـ. )۱۹۰۱ ز.) لە گوندی «نگڵ» هاتە دنیا و وەک باوکی ـکە جووتیار بوو ـ ئەمیش بە کشت و کاڵ و باخەوانییەوە بارهات؛ بەڵام دوایی بە هۆی لێهاتوویی سرشتی و وازی لە خوێندن و زانین، ئەم شوێنەی گرت و بووە فەقێ و ماوەیەک لە زێدەکەی خۆی، لای مەلا قوتبەدین و هێندێک لە «ئەوێهەنگ» لە خزمەتی مەلا موحەممەد سادقی مودەڕڕیس و سەرەتێکیش لە مەریوان خوێندی و ساڵی ۱۳۱۹ ک. هـ. ئیجازەی وەرگرت و چەند ساڵێک لە «نێزڵ» و «کەلاتێ» و چەند گوندی‌تری ناوچەی «کەلاتەرزان»، مەلایەتی و بەرنوێژی کرد. پاشان گەڕاوە نگڵ و تا دوا کاتی ژیانی (۱۳٤٥ ک. هـ. ۱۳۸۵ ک. م.)، لەوێ پیرای کشت و کاڵ و باخەوانی، خزمەتی ئایینیشی درێژە پێ دا.

مەلا سادق مرۆیەکی چاکەخواز، میهرەبان و بێ‌نیاز بوو. بەڕەنجی شانی خۆی دەژیا و چاوەڕوانی کەرەمی کەس نەبوو. زیاتر لە دە ساڵی دوایی ژیانی، لەبەر نەخۆشی و دەستەنگی، بەوپەڕی دژواری و سەخڵەتەوە تێپەڕ کرد.

بە زاری کرمانجی باشوور (سۆرانی)، شیعری دەگوت و نازناوی «سادق» و ماوەیەکیش «بێ‌دەس» بوو.

نیشتمانەکەی یەکجار خۆشدەویست و لە دەستی ڕژێمی شایی زاڵەی دەهات و زۆر جاران لە شیعریدا، لە باری نالەباری کۆمەڵگاکەی نالاندوویە.

**چەن نموونە لە شیعرەکانی**:

زارعی زەحمەتکەشم بۆ نەفعی عامە کار ئەکەم ... گیانی خۆم سەرفی فەلاحەت بۆ گوڵی بێخار ئەکەم

گەر فەلەک بیلێ بە دڵ خدمەتگوزاری مەردمم ... ماڵ و هەستیم سەربەسەر بۆ قەومی خۆم ئیسار ئەکەم

گەر خودام یار بێ بە زۆری قۆڵ و بازوو زووبەزوو ... باغچەی خۆم وەک جینانی «تحتهاالأنهار» ئەکەم

نان بێمەینەت حەرامە و نەنگە، ناخۆم نانی وا ... خۆم بە تێکۆشین و زەحمەت دوور لە نەنگ و عار ئەکەم

ڕەنج ئەدەم، گەنجم زەمین و زارە، یاری خۆشەویست! ... تا کە بتوانم ئەکوشم، خاکی خۆم گوڵزار ئەکەم

شیری مەردیم دەرئەهێنم من لە کێلان عاقیبەت ... قەتعی دەستی غارەتی غارەتگەری غەددار ئەکەم

بادی عەزم و هیممەتی بازووم کە بجمێ و بێتە جۆش ... دوژمنی ئەم خاکە وەک خاشاک تار و مار ئەکەم

عاشقێکم «سادق» ئەی خاکی وەتەن! بۆیێ وەها ... ڕەنج ئەکێشم خۆم بە قوربانی ڕەزای دڵدارئەکەم

* * *

هەرچی تێکۆشیم لە ئەوجی عیززەتا بگرم قەرار ... بەند بەدبەختی دەس و پێی بەستم وهانیمیە خوار

شەو بە بێ ناڵە نەخەوتم، ڕۆژێ بێڕۆڕۆ نەبووم ... ناسلامەت تەن یەکێ بوو میحنەت و دەردم هەزار

ئیختیارێکم نەبوو لەم عومرەدا، «یا لَلأسَف» ... خۆ بە دەستی خومەم نەبوو تاکوو بکەم خۆم بەختیار

کوشتمی بێچارەگی داماوەکانی قەومەکەم ... تۆ خودا تاکەی ببێ ئەم زوڵم و زۆرە پایدار

بەس هەراسانەم لە ئەم ژینە، چییە چارەم ڕەفیق!؟ ... خوشە مردن نەک ژیانی ڕەنجەڕۆیی و ناگەوار

من پەژارەم دەردی بێدەرمانی تەنها خۆم نییە ... لەیرەدا زۆرن وەکوو «سادق» گرفتار و هەژار

**ڕەعنا بۆ ناوڕان ئەچێ**

ئەم دێ ئێمە هەمانە لە باغی جینان ئەچێ ... ئەو ڕێ لێی جوێ ئەبێتەو بۆ ڕەوزەی ڕیزوان ئەچێ

ئەمڕۆ ڕۆژی ڕووناکە لە جەژنی قوربان ئەچێ ... ئەو سۆنە ڕەوتە ڕابورد لە مانگی تابان ئەچێ

مژدە بە عاشقانە ڕەعنا بۆ ناو ڕان ئەچێ

بەهارە بێمەدارا بلبل بە سۆز ئەخوێنێ ... گوڵبەرگی باشی پۆشی هاتووە کە خۆی بنوێنێ

نەرگس نیگای نیگارین خونچە بە پێکەنینێ ... زەوی بە ئینتیزارە ئاسمان ڕەحمەت ئەڕژێنێ

مژدە بە عاشقانە ڕەعنا بۆ ناو ڕان ئەچێ

عیشق ئیدیعای سەڵتەنەت ئەرز و سەماوات ئەکا ... مەجنوون کە عاقڵی خۆی بە شاهید ئیسبات ئەکا

سانی سپای موشتاقان هەمووی بەخێرهات ئەکا ... خوورشید خوەی ئەشارێتەو وەک ئەستێرە مات ئەکا

عەتر و عەبیر هەرزانە ڕەعنا بۆ ناو ڕان ئەچێ

بڕوانــە ســەروی بــاڵای بــەرزی چنــاری چــەمی　　موشکی تاتاری زولف و توڕڕەی سیای پەرچــەمی
ڕوخــساری تابــداری چــاوی چــرای عاڵــەمی　　ئوغری بەخێر بــێ یــاخوا ئــەمجا بــە خاترجــەمی
چەن جوانە ئەم عینوانە ڕەعنا بــۆ نــاو ڕان ئــەچێ
تەماشــا تــەرزی تــەیران شــیرینی وەک شــابازی　　لارە و لەنجە و نەزاکەت نازاری و خــەمزە و نــازی
گیان کەن بە گیان‌نیساری دڵ بــەن بــە ڕێــزەی ڕازی　　«سادق» سەر ببڕن لە جێی گا و گــەردوون و ئیعــزازی
سەیرانی هەشت‌بەهەشتە ڕەعنا بۆ ناو ڕان ئــەچێ

*گوڵزاری نەوگوڵ*، دیوانی مەلا موحەممەد سادقی نگڵی. یاداشتەکانی نووسەر.

## وەجدی جەواهیری

موحەممەد عەلی جەواهیری، نازناو «وەجدی»، شاعیرێکی خەڵکی شاری سنەیە کە دەوری ساڵی ١٣٨٧ ک. م. کۆچی یــەکجاری کــردووە. ئــەم بــرای شــاعیرێکی تــری کوردســتان، بــە نــاوی موحەممــەدی جەوهەری، ناسراو بە «سەعید دیوان»ە کە پێشتر، لە شوێنی خۆیدا باسیمان کرد.

وەجدی ساڵی ١٣٤٣ ک. ھ. )١٩٦٤ ز.)، سەرجەمێک لە شیعرەکانی چاپ کرد کە ئەوا غەزەلێکی:

خــواهم از ایــن دیــار بــه ناگــه ســفر کـنم　　بــاری محبــت وطــن از دل بــه در کــنم
جز شرّ ندیــده‌ام مــن از ایــن بــوم و مــی‌روم　　جــایی کــه خیــر بیــنم و هــم دفــع شــر کــنم
عمری است رنج می کشم اندر وطن چــه ســود　　تــا چنــد کــار بــی‌هــدف و بــی‌ثمــر کــنم؟
کنجـــی گـــزینم و نکـــنم اختیـــار رنـــج　　گر گنج نیــز هــست مــن از آن حــذر کــنم
تــاکی کــنم تملــق بــی‌جــا بــه ایــن و آن؟　　خود را حقیر و پست چو خاک گذر کــنم
بهــر تــلاش رزق بــه هــر نــاکس و کــسی　　بـــا چـــشم انتظـــار معونـــت نظـــر کـــنم
تا کی کــشم ملامــت و منّــت بــرم ز خلــق؟　　بهتر که کــسب قــوت ز خــون جگــر کــنم
دیگر بس است ضــعف و زبــونی در ایــن دیــار　　ز اینجا روم به جــای دگــر کــسب فــرّ کــنم
چــون کارهــا بــه حکــم قــضا و قــدر بــود　　مــن خــویش را مطیــع قــضا و قــدر کــنم
«وجــدی» امیــد هــست بــه توفیــق کردگــار　　ایــن شــام را بــه صــبح ســعادت ســحر کــنم

یاداشتەکانی نووسەر.

## حاجی ڕەحمان‌ئاغا موهتەدی

کوڕی حاجی بایزاغا، لە بنەماڵەی بەناوبانگی ئێلخانی و کەڵەپیاوانی دین و زانست و خاوەن ڕێز و جێگــە و پێگەی بەرزی بنەماڵەییە کە لە گوندێکی لای بۆکان هاتە دنیــا و ساڵــی ١٣٤٦ ک. ھ. )١٣٨٧ ک. م.

١٩٦٧ز.)، لە تەمەنی ٦٥ ساڵان، بە نەخۆشی شێرپەنجە، لە بۆکان، دنیای بەجێ‌هێشت.

بابیشی پیاوێکی هێژا بووە؛ بەتایبەت لە سیرە و مێژوو باش سەری دەرچووە. سەری بە قوتبی عارفان شێخ حوسامەدینی نەقشبەندی سپاردووە و بۆ ڕێزنان لە زانایان و فەقێیان و یارمەتی‌دانی هەژاران، ئەوی لە دەستی هاتبێ نوکوولی نەکردووە.

حاجی ڕەحمان‌ئاغاش هەر لەسەر ئەو ڕێ‌وشوێنە ڕۆی و ماڵی هەمیشە کۆڕی زانایان و وێژەوانان بوو. بۆخۆی لە تەفسیر و سیرە و مێژووی ئیسلامی و وێژەدا شارەزاییەکی باشی هەبوو؛ لە باقی زانستە ئیسلامییەکانیش سەری دەردەچوو. پیاوێکی پیاوانە بوو؛ هەموو ژیانی بە جوامێری و سەربەرزی ژیا. ئەوی بە ڕاستی بزانیبا، بە بێ مەرایی دەریدەبڕی و هەرگیز بۆ کەس، زمانی بەلادا نەدەخست.

شیاوی باسە حاجی ڕەحمان ئاغا ئەگەرچی ئاغا و خاوەن زەوی و ماڵ و سامانێکی بێ حەساو بوو، بە هۆی ئاکار و کەسایەتی بەرزی، خەڵک زۆریان خۆش دەویست و هەروەها لە دۆستان و یارانی پێشەوا قازی موحەممەد ئەهاتە ئەژمار و کە کۆماری مەهاباد دامەزرا، قازی کردیە وەزیری فەرهەنگ و مەعاریف.

لەم دواییانەدا چوو بۆ تاران و لە زانکۆی خوانانسیدا بوو بە مامۆستای فیقهـ و ئوسوولی شافیعی. بە نووسین و وەرگێڕان، چەند کتێبی هەبوو کە بەنیاز بوو چاپیان بکا؛ بەڵام ئەجەلی ناوەخەت دەرفەتی نەدا.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ نیزامی غیاسی

کوڕی شێخ حوسەین، کوڕی عارفی بەناوبانگ حاجی شێخ حەمە باقری غیاسی، پارسایەک بوو دوورەپەرێز و عارفێکی خاوەن ڕێز کە هەموو عومری بە عیبادەت و خوێندن و دەرس‌گوتنەوە تێپەڕ کرد. لە سەرەتای لاوی و تەمەنی هەرزەکاریدا، پشتی لە دنیا کرد و کەوتە شوێن زانست و خواپەرستی و پاش خوێندنێکی سەرف و نەحو و مەنتیق و فیقهـ و کەلام و ئوسوول، هەموو توانی خۆی بۆ لەبەرکردنی حەدیسە پیرۆزەکان تەرخان کرد و ساڵانێکی زۆر، شەو و ڕۆژی بۆ ئەو کارە گرنگە دانا و تا ڕادەیەک تێیدا سەرکەوت کە دەقی «*صحیح بُخاری*» هاتە سینەی و بەشێکیشی بە بەڵگەوە، لە کێوە بۆ کێ هاتووە، لەبەر کرد. ئەڵبەت لەگەڵ ئەوەدا، کتێبانی‌تری حەدیسی هەر بە دەستەوە بوو. هەروەها شەرحی «*قسطلانی*» و شەرحەکانی دیکە و تەفسیر و فیقهـ و سیرە و ژینامەی عارفانیشی دەخوێند و هەرکوێ گرفتێکی تووش بهاتایە، لەوپەڕی خاکەساریدا دەیپرسی و هەرگیز پرسینی پێ عەیب و عار نەبوو. لە ڕاستیدا ئەو پیاوە بە هیچ شێوەیەک نەخۆشینی دەعیە و دەمار و لووتبەرزی زۆرێک لە زانایانی بە لادا نەچووبوو. تا کاتێ شێخ حەبیبوڵڵای کاشتەری ـ کە بەڕاستی لە حەدیسدا تاقانەی ڕۆژگاری خۆی بووـ مابوو، بەهرەی لێ دەبرد.



حاجی شێخ نیزامەدینی غیاسی لە حوجرەیەکی مزگەوتەکەی باپیریدا دەژیا. شوێنێکی تەسک و تەنگ بوو؛ بە دژوار چەند کەسی تێیدا دادەنیشتن. لە پەنایدا حوجرەیەکی تر هەبوو، جاروبار دوو فەقێ لێی ڕادەگرت و دەرسی پێ دەدان. ماڵ و سامانی هەر ئەوەندە بوو؛ قەت ژنی نەخواستبوو. بۆ خواردن جار ـ جار دەچووە ماڵی شێخ عەلای برای و پێکەوە نانێکیان دەخوارد؛ بەڵام زۆرتر بۆیان دێنا حوجرەوە. چای، بۆخۆی دەمی دەکرد. خەڵک لە هەموو چینێک دەچوونە خزمەتی. هێندێک بۆ قسە و باسی ئایینی و زانستی و تاقمێکیش بە نیازی زیارەت و دەسکەوتێک لە پیت و بەرەکەتی دەچوون. لەوپەڕی خاکەساری و میهرەبانیدا میوانانی وەردەگرت و بۆخۆی چای بۆ تێدەکردن. حوجرەکەی زۆر پاک و خاوێن و بە بەرماڵ پۆشرابوو.

شێخ نیزام سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی بوو. لە شەو و ڕۆژدا بەشێکی بە خەتم و زیکر و فیکرەوە تێپەڕ دەکرد. بەیانیان تا لای نیوەڕۆ، دەرکی حوجرەکەی داخرابوو؛ بەڵام دوای نیوەڕۆ هەموو کەسێک بۆی هەبوو بگاتە خزمەتی. لەم دەساڵی دواییەدا هیچکوێ نەدەچوو. زۆرتر خەریکی کاری خۆی بوو.

ئەم پیرە پارێزکارە، پاش ماوەیەک نەخۆشی، ساڵی ١٣٨٧ ک. م. دەستی لە ژیان بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا. خەڵکێکی زۆر لەوپەڕی ڕێزدا، لەسەر شانیان تا زیارەتانی «تەپ شێخ حەمە باقر» بەڕێیان کرد و لەوێ ناشتیان.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## عاشقی حوسامی

حاجی شێخ موحەممەدی حوسامی، نازناو «عاشق»، کوڕی شێخ سەعدولا، لە شێخانی بنەماڵەی مەردۆخی، دانیشتووی گوندی «دادانە»ی لای شاری سنەیە کە ساڵی ١٣١٢ ک. م. هاتۆتە دنیا.

عاشق، مرید و خەلیفەی قوتبی عارفان، شێخ عەلی حوسامەدین و پیاوێکی زانا و سۆفی ئەحواڵ و خاوەن زەوقی شیعری بووە کە ساڵی ١٣٨٧ لە دنیا چووە. قەسیدەیەکی لێوە بەجێ ماوە، پەسنی پێغەمبەری ئیسلامە (د)، لەسەر کێشی «موستەفعیلون فەعوولون» کە دوا ساڵی ژیانی هۆنیویەتەوە و هەر ئەو ساڵە زانای هێژا، مامۆستا ئەحمەدی حەواری نەسەب (ئەبووسەعید)، بە خەتێکی خۆش نووسیویەتەوە و چاپ کراوە. وەک خۆی لە بەیتێکیدا دەڵێ:

چرایێ حەق هەڵیکا بۆ عالەم ئەشێ وابێ ئەلف و هەشتاد و سێسەد حەفتە هەر ڕوشنتر بێ

ئەمەش چەند بەیت لەو قەسیدە:

سەڵوات و سلامی حەق لەسەر فەخری بەشەر بێ بە قەد عیلم و حلمی ئەو، کوللوو ئانێ با هەر بێ
«مُحَّمـد»ە لە زەمین، «مَحمـود»ە لە ئاسمان موختار ئیبن موختارە و موستەفای نێو موزەربێ

لە کۆتاییشدا دەڵێ:

بــێیــار و زۆر غــەمبارم ڕووزەرد و شەرمەســارم
کەس بێ‌کەس تۆی سەردارم! فەرموو با غەم ئاخر بـێ

عاشق تـۆم و دەناڵـم حەیفـە بـۆ فـەخری عالـەم
بە زوڵمی نـەفس و شـەیتان هاونـاوی دەربـەدەر بـێ

ڕەحمەت مەقروون بە تـەعزیم «سـلام‌الله‌الکـریم»
لەسەر شافیع مـوزنیبین، سـەوزەی بـاڵا عەرعـەر بـێ

یاداشتەکانی نووسەر.

## عیرفانی

سەرهەنگ غوڵام‌حوسەینی عیرفانی، کوڕی «نـصیرُالکُتّاب»، ساڵـی ١٢٧٠ ک. هـ. )١٨٩١ ز.) لـە شـاری سنە هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێندی و سەرف و نەحو و مەنتیق و بەیان و بەدیع و وێـژەی فارسـی بـاش فێر بوو؛ ئەدەبی عەرەبیشی هێندێک خوێند. ماوەیەکیش لەگەڵ دوو زبانی فەڕانسە و ڕووسیدا حەولیدا و لە هەرجووتیاندا شارەزاییەکی باشی پەیدا کرد.

عیرفانی لە باری هونەریشەوە دەسـتێکی بـاڵای پەیـدا کـرد؛ لـە کەنـەکـاری و نیگارکێـشی سـەری دەردەچوو، خەتی فارسی و عەرەبی یەکجار باش دەنووسی و جارو باریش شیعری دەگوت. شیعرەکانی لەوپەڕی جوانی و ڕەوانی و بێ‌گەردیدان.

غولام‌حوسەینی عیرفانی ماوەیەک لە وەزارەتی داد و سەردەمێک لە کابینەی حوکمەتی کوردسـتاندا کاری کرد و ساڵی ١٢٩٩ ک. هـ. (١٩٢٠ ز.) چووە نێـو خزمـەتی ئەرتەشـەوە و ساڵـی ١٣١٧ تـا پلـەی سەرهەنگی گەیشت. ئەو پێڕای کاری چەکداری، ساڵی ١٣١٥ بوو بە فەرمانداری گورگان و ١٣١٨ کرایـە فەرمانداری برووجرد. ساڵی ١٣٢٠ بە هۆی پاراستنی نیشتمان لە بەرامبەر هێزی هێرشبەری ڕووسـەوە، گیرا و چوار مانگ لە عیشق‌ئاباد زیندانی بوو. پاش ئازادی و گەڕانەوە بۆ ئێـران، بـە هـۆی بـێمبـالاتی و پێنەزانی میرانی ئەرتەش، لە ساڵی ١٣٢٤دا داوای کارکناری کرد و لەوەبەدواوە تا کۆتایی ژیانی (دەوری ساڵی ١٣٨٧ ک. م.)، بە کشت‌وکاڵەوە خەریک بوو.

**چەند شیعری عیرفانی**:

ابراز وفـا بـی‌شـمع، کـس دیـده ز پروانـه؟
پروانـه مـنم بـی تـو مـی‌سـوزم و پـروا، نـه

دیوانـه گـر آن باشـد کـز عقـل بـود نومیـد
نومیــد ز تــو بــدتر صــدبار ز دیوانــه

بیگانـه شـدم از خـویش بـا یـاد تـو پیوسـته
نومیـد ز تـو بیـزار از خـویش و ز بیگانـه

تجدیـد نظـر در گـل هـر سـال کنـد بلبـل
تجدیـد لقـای تـو افـسوس کـه مـا را، نـه

جانـا نتـوان دیگـر در هجـر بـه سـر بـردن
جانانه مرا دریـاب ایـن عرصـه مـرا جـا، نـه

دیوانه شده این دل زان لحظه کـه تـو رفتـی
مـر خانـه‌ی بـی صـاحب آبـادی آن را، نـه

پیمـان تـو «عرفـانی» هرچنـد بـود ثابـت
ترسـم شـکند روزی پیمـان تـو پیمانـه

**بۆ شینی «ناهید»ی هاوسەرەی:**

یـــار برتافـــت رخ ز یـــارانش
بهـــر تـــسلیم جـــان بـــه جانـــانش

زخـــم دل را بـــه مـــرگ تـــو ای دل
نبـــود غیـــر مـــرگ درمـــانش

پـــیش هـــرکس کـــه راز دل گفـــتم
بـــار غـــم شـــد هـــزار چنـــدانش

آن کـــه بایـــد بمیـــرد انـــدر هجـــر
چـــه تفـــاوت کنـــد ز زنـــدانش

دل چـو پابنـد روی و مـوی تـو شـد
نیـــست در بنـــد کفـــر و ایمـــانش

مـــن و دل را فـــدا کنـــد آخـــر
ســیل اشــکی کــه نیــست پایــانش

ســر بــه «ناهیــد» مــیرســد از فخــر
گــر رســد دســت مــن بــه دامــانش

در غمـــت جـــان ســـپرد «عرفـــانی»
چـــه کنـــد نیـــست بیـــشتر زانـــش

**چوارینە** :

مــن عکــس تــو را همیــشه در بــر گیــرم
وز تنگـــدلی بـــه دیـــدەی تـــر گیـــرم

ور دیــده شــود ســراب بــر ســر بــنهم
تــا عُمــر بــه ســر رســیده، از ســر گیــرم

* * *

اندر دو جهان به جز تو کس نیست مرا
برتـر ز رضـای تـو هـوس نیـست مـرا

خــواهم نفــسی ســپاس فــضلت گــویم
افـسوس در ایـن نفـس، نفـس نیـست مـرا

یاداشتەکانی نووسەر.

## ڕەزا ناسرموستەوفی

کوڕی نیعمەتوڵڵای ناسرنیزامی سنەیی، ساڵی ١٢٩٠ ک. هـ. )١٩١١ ز.) لە شاری سنە هاتە دنیا و پـاش تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی، لە وەزارەتی پەروەردە دامەزرا و تا ساڵی ١٣٤٢، کە وەنیشتە بوو ، لـە سنە و تاران خزمەتی کرد و سەرەنجام ساڵی ١٣٨٧ ک. م. دنیای بەجێهێشت.

ڕەزا موستەوفی مرۆیەکی زیرەک، خۆشخەت، ویژەوان و خـاوەن زەوقـی شـیعر بـوو. ئـەم غەزەلـە فارسییە هی ئەوە:

دل آسـوده نـداری، ز تـن آرام مجـوی
بخـت واقبـال در آینـەی اوهـام مجـوی

گردش گنبد خضرا چو بـه کـام مـا نیـست
تکیه بر وی مکن و هـیچ از او کـام مجـوی

بـه ازل هـر چـه مقـدر شـده مقـدور شـود
بـیمحابـا مـدد از نقطـەی ابهـام مجـوی

روح را شـــاد نگهـــدار، بـــه پنـــدار نکـــو
شادی از غم مطلب، پختگی از خام مجوی

عــشق در مکتــب عطــار بایــد آموخــت | بـر حـذر بـاش ز پیمانـه و از جـام مجـوی
روی در هم مکش از تلخی دەروزەی عُمر | کار خود کن، دگر آسایش از ایام مجوی
مشکلی در همـه احـوال گـرت پـیش آیـد | غیــر اســتاد خــرد از کــسی الهــام مجــوی
کمك از کس مَطَلب، تکیه به نفس خـود کُـن | اســتعانت بــه جــز از ایــزد دادار مجــوی
عـــزّت نفـــس نگهـــدار «رضـــا» تاهـــستی | وز ره روی و ریا نـان مخـور و نـام مجـوی

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ موحەممەد غەریبی بەرزنجی

شێخ موحەممەد غـەریبی حوسـەینی، کـوڕی شـێخ حوسـەین، کـوڕی شـێخ سـەمەد، کـوڕی سـەید موحەممەد، کوڕی سەید عومەر، کوڕی سەید نیزامی چنارەیی، لە بنەماڵەی ناسراوی زانست و عیرفـانی بەرزنجی، ساڵی ١٢٨٥ ک. هـ. )١٩٠٦ ز.) لە گوندی «چنارە»ی لای سلێمانی هاتە دنیا و خوێندنی هـەر لەوی دەسپێکرد و پاشان چووە سلێمانی و لە مەدرەسەی شێخ موحەممەدی خاڵدا بوو بە فـەقێ. دوای ئەو سەردەمە، گەیشتە خزمەتی شێخ مەحموودی نەمر و شێخ زۆری خۆش لێ هات و حاواندیەوە. هـەر لەو سەروبەندانەدا چووە نێو تەریقەتی نەقشبەندیوە و ماوەیەک بە سەیر و سولووکەوە خەریک بوو. دوایی لەسەر پەسندی شێخ مەحموود، ڕووی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات نا و سەرەتا لە دێـی «کـلاش باغـان»ی جوانڕۆدا دانیشت و دوای دوو مانگ، چووە گوندی «نیالاورە» لە ناوچەی سنجاوی و سالّـی ١٣٠٥ ک. هـ. لەوێ مزگەوت و تەکیەیەکی کردەوە و پێڕای درێژەدان بە سەیر و سولووک و خەریک بـوون بـە داب و دەستووری تەریقەتەوە، خەڵکیشی بەرەو ڕاستی و پاکی و دینداری و دروستکاری بانگێشت کـرد و بـەو بۆنەوە خۆی مرۆیەکی عارف و بێنیاز بوو، خەڵکەکە بە دڵ گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی بوون و تـاقمێکی زۆر چوونە ناو ڕیزی مریدان و مەنسووبانیەوە.

شێخ پاش چوار ساڵ مانەوە لەو گوندە، ڕووی کردە ئاوایی «ڕێژاو» و تا کۆتایی ژیـانی، لـەوێ مایـەوە و ئەرکی سەرشانی خۆی بە باشترین شێوە بەڕێوە برد و بە شێوازێکی بەرچاو، کاری کردە سەر حاڵوبـاڵ و ئاکاری ژن و پیاوی ئەو ناوچەیە.

شادڕەوان شێخ موحەممەد غەریب پیاوێکی بیرمەند و مورشیدێکی هێژا و پیرێکی پارسا و خاکەسـار و مەردمدۆست بوو. هەموو کەسێک ڕێزی لێ دەگرت و خۆشیدەویست. ئەو سەرەنجام پاش ٦٣ سـاڵ ژیان، ساڵی ١٣٨٨ ک. م. (١٣٤٨ ک. هـ.) کۆچی یەکجاری کرد و خوای گەورە، گیانی پاکی بـەرەولای خۆی برد. زیارەتی لە زیارەتانی «اصحابُ‌النّبی» لە ڕێژاودایە. ئێستاش خانەقاکەی لە ڕێـژاودا بەرقـەرارە و جێگری هێژای، شێخ موحەممەد فەرەحی حوسەینی، بۆ درێژەدان بەو ڕێوشوێنە تێدەکۆشێ.

ئەم چەند بەیتە بەشێ لە شینێکە مامۆستا سەید تاهیری هاشمی لە مەرگیدا دایناوە:

| | |
|---|---|
| نسل پاکان زبدەی ولد رسول | نجل نیکان، نخبەی آل بتول |
| پور حیدر، فخر اولاد حسین | پیر کامل، رأس اشیاخ عدول |
| عارف عامل، بهای شرع و دین | مرشد برحق، سراهل وصول |
| در حسب محسوب ز اصحاب کمال | در نسب معدود ز ارباب قبول |
| راسخ اندر شرع شاه فاستقم | متّبع اندر فروع و در اصول |
| ای دریغ آن قدوەی نیکوخصال | ای دریغ آن رهبر رحمت‌حصول |
| آن محمد کش غریب آمد لقب | شیخ دانا مرشد صاحب عقول |
| روح پاکش رفت زی مأوای صدق | بدر رویش یافت از دنیا اُفول |
| او ز روی یار باقی گشت شاد | ما ز جور دهر فانی بس ملول |
| «طاهرا» شرح غمش پایان‌پذیر | نیست گرخود بازگویی در فصول |
| باد اولاد کرامش در بقا | نیکنام و شادمان دور از خمول |

یاداشتەکانی نووسەر.

## ساڵەح قەفتان

لە نووسەرانی هێژای ئەم دواییانەی باشووری کوردستانە کە زۆر نامیلکەی لە گۆڤارە کوردی و عەرەبییەکاندا چاپ کراوە. دوایین بەرهەمی کتێبێکە بە ناوی «*مێژووی نەتەوەی کورد*» لە ٤٠٠ لاپەڕەدا، کە ساڵی ١٩٦٨ ز. لە بەغدا لە چاپ دراوە.

ساڵەح قەفتان خوێندنی لە زانکۆی ئەفسەری عوسمانیدا دوایی هێنا و ساڵی ١٩٦٨ ز. (١٣٨٩ ک. م.)، بەشی لە دنیا بڕا و لە زیارەتانی «گردی سەیوان»ی سلێمانیدا نێژرا.

مێژوو، دوکتور کەمال مەزهەر، ل١٧٥-١٧٨.

## مەلا ئاوارە

مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلا موحەممەد ئەمینی هەمەوەند، خەڵکی گوندی «شەڵماش»ی لای سەردەشت، ساڵی ١٣٥٣ ک. م. هاتە دنیا و لای باببیەوە خوێندنی دەسپێکرد و پاشان چووە نێو جەرگەی فەقێیان و لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی‌تر و لە قوتابخانەیەکەوە بۆ قوتابخانەیەکی‌تر، زۆر شوێن و ناوچەی کوردستان گەڕا و بە شێلگیرییەوە خوێندی و بوو بە مەلا.

ئاوارە مرۆیەکی هێژا، ئاگا، دیندار، خاوەن هەستی نەتەوایەتی و خەڵکدۆست بووە کە هەر لە کاتی



خوێندنەوە، بینینی نابەرامبەری و حاڵ و باڵی دڵتەزێنی بێدەستان و زۆربێژی و خەڵـک ڕووتاندنـەوەی دەسەڵاتداران، ئازاری دەدا و سەرەنجام لێبڕا بە هەموو گیانیەوە، بۆ نەهێشتنی ئەم کارەساتە تێکۆشـێ. بەم جۆرە چـوو نێـو حیـزبی دمـوکراتی کوردسـتانەوە و ساڵـی ١٣٨٧ ک. م. لەگـەڵ چەنـد ئەنـدامی کارای‌تری حیزبدا، گەڕاوە ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی موکوریان، بەتایبەت دێهاتی دەوروبەری سەردەشت و بانە و ئالان و چەند شوێنی‌تر، کەوتە گەڕان و دانیشتن لەگەڵ خەڵکی چەوساوە و تێگەیاندنیان لە هـۆی دواکەوتنیان و ئاشنا کردنیان لەگەڵ بەرنامەی حیزبدا.

خەڵکی ئاسایی کوردستان، ئاوارەیان زۆر خۆش‌دەویست. شیعرەکانی قسەی دڵیان بـوو؛ لـە زوڵـم و زۆری شا و دەربار و چەکدارانی خوێنمژ و کاربەدەستانی گەندەڵ‌کار و ئاغایانی بێبەزە، دەیناڵانـد. ئـەم شیعرانە لە سەر زاری خەڵکەوە، دەم بە دەم دەگەڕا و هەموو لەبەریان دەکرد.

ئاوارە ـکە بۆخۆی مەلا بوو ـ بە مامۆستایانی تری ڕادەگەیانـد کـە ئـەرکی سـەر شـانی ئێـوە بەتـەنیا دەرس‌گوتنەوە نییە. ئێمە میللەتێکی دواخـراو و چەوسـێنراوین. بەشـی ئێمـە لـە وڵاتی شاهەنـشاییدا، بێجگە ڕۆژڕەشی و ماڵوێرانی چیتر نییە. کێ دەبێ خەڵک وریا بکاتەوە و دژمنانی پێ بناسێنێ؟ ...

بزووتنەوەی ڕەنجبەرانی کورد ـکە سەرهەڵدانی مەلا ئاوارە و هاوڕێیانی یەک لەوانە بوو ـ خەریک بوو پەرەی دەساند و لادێ و شارانی دەگرتە بەر. ڕژیم کە بەمەی زانی و لە زمانی زۆر، زیاتریشی بە مێشکدا نەچووبوو، یەک لە دژخێمانی خۆی بە ناوی جنراڵ ئوەیسی نارده کوردستان کە بە یارمەتی سـاواک، لـە سێ مانگدا ئەو قاڵە ببڕێتەوە. زۆرێک گیران و لە زیندان توند کران. زۆرێکیش بێتـاوان کـوژران. مـەلا ئاوارەشیان بە فڕوفێڵ، لە گوندی «دیوالان»، لەگەڵ دوو لاوی هاوکاریدا گرت و بردنیانە جەڵدیان. لـەوێ لە دادگای سەحراییدا فەرمانی کوژرانیان دان و هەرسێکیان تیرباران کردن (ساڵی ١٣٨٨ ک. م.).

**چەند شیعری ئەو شەهیدە:**

**هاواری تووتنەوانێکی ناوچەی سەردەشت**

| | |
|---|---|
| تووتنـــــــــەوانێکی هـــــــــەژارم | بـــــێخـــــــانوو و زەوی و زارم |
| بـــێپـــووڵ و بـــاغ و بـــزن و مـــەڕ | دوورم لـە خێـر، نزیـک لـە شـەڕ |
| مناڵـــــــم ڕووت و برســـــــییە | ژیـــــــانم پـــــــر مەترســـــــییە |
| قـــــــــــــــەرزارم و دەردەدارم | شەرمەندەی خەڵـکی دێ و شـارم |
| ڕووم نییــە بچمــە نێــو خەڵــک | بـێبـەرگ و پـێڵاو، بـێ کەڵـک |
| خەڵـــکی پـــێ وایـــە تەمبەڵـــم | بـــێکەســـب و کـــار و چەپەڵـــم |
| بــــەڵام چبکــــەم، چارەڕەشـــــم | خـــەرمانم زۆرە و بـــــێبەشـــم |
| هــەرکات گوتیــان ســەری ساڵــە | وادەی جــووت و کــشت و کاڵــە، |

خۆم و خێزان، گەورە و بچووک ‌ ‌ ڕادەپەڕین وەکوو هەڵووک
هەڵدەبەزین لێرە و لەوێ ‌ ‌ بەڵکوو کارێکمان دەس کەوێ
یا قوڕەکاری و خشت بڕین ‌ ‌ یا جووتە و زەوی هەڵدڕین

* * *

وا بەهارە، دەرکەوت گوڵ ‌ ‌ جێگە خۆش دەکرێ بۆ شەتڵ
بە گاسن، پێمەڕە، بە پاچ ‌ ‌ بە چنگ و نینۆک و بە قاچ
ئەوجا توو شەتڵ پێ دەکرێ ‌ ‌ بە چیلکە و چاڵ سەری دەگرێ
دوو ڕۆژ جارێک ئاوی دەوێ ‌ ‌ تا شین دەبێ و دەردەکەوێ
بژاری چەند ناخۆش و وردە ‌ ‌ پیشەی کوڕ و کیژی کوردە
شەو و ڕۆژ خەو ناچێتە چاو ‌ ‌ کەنگێ بەرم دەکەوێ ئاو
زەویەکەم بۆرە، دێر بکەم ‌ ‌ نەوەک سیس ببن شەتڵەکەم
بە شۆ بڕین و وەرد و خەت ‌ ‌ کێلان دەگاتە پێنج کەڕەت
دێراو هەڵدان، خاکاو کردن ‌ ‌ گەورە کچ وەکۆوە کردن
ناخۆشە تووتن چەقاندن ‌ ‌ هەڵتروشکان، پشت چەماندن
لە ئاو داشتن سستی نەکەی! ‌ ‌ تا دەگۆڕێ وشکی نەکەی
نۆرەی پشک و بژاربڕە ‌ ‌ جەرگبڕە، بژار پڕە
وا نێوکوڵ کرا، ئاودرا ‌ ‌ لە دوورەوە بەرچاو کرا

* * *

کلاو کەرگەری، دەرکەوت ‌ ‌ ئەژنۆم شکا نێوکم کەوت
ڕەببی کوێر بێ و چاوی نووسێ ‌ ‌ بە زیادم لەسەر نەنووسێ
دەردی پێرارم نەگاتێ ‌ ‌ نە کەسریم بێ و نە چیم داتێ
تووتن‌نووس! بۆ خاتری خودا ‌ ‌ ڕۆحمێ بکە بە منی گەدا
مەیسووتێنە ڕەنجی ساڵم ‌ ‌ خاوەنی کوشیک منداڵم
ئەو زەویە ئی چڵپووت نییە ‌ ‌ مەینووسە ڕەوای حەق نییە
ئاغا! تۆ بی و پەروەردگار ‌ ‌ ڕوحمێ بکە بە منی هەژار
بڕوانە ڕوخساری زەردم ‌ ‌ کزەی دەروون ئاهی سەردم
بێ‌دەنگ بە ئەی گێژی نەفام! ‌ ‌ من کاری خۆم کردووە تەمام
تازە هەڵیوەشێنمەوە؟ ‌ ‌ بەشمری نایکوژێنمەوە

من کاربەدەستی دەوڵەتم
دوژمنی خاک و میللەتم

زۆری لەبەر پاڕامەوە
بێپووڵ جوابی نەدامەوە

نووسی بە چڵ پووتی تەواو
تەپڵە بەسەری دوابڕاو

بە فیزەوە سوار بوو ڕۆیی
بۆ من چی ما، ڕەنجەڕۆیی

ئەوجا بارین دەرد و بەڵا
بۆ تووتنەوانی بێسەڵا

بەلەرزوتا، بە دەردی چاو
سیس بووم وەک تووتنی بەر هەتاو

بێپووڵ و پارە، بێخەرمان
بێدوکتور و دەوا و دەرمان

کرم و مەڵەش، کولە و گەزۆ
لە تووتن تایین بوون وەکۆ

ئەویش وەک من سیس و داماو
چورچ و بێشفاف و ژاکاو

نەخۆش و هەژاریم بڕان
کارم زۆرە، دەردم گران

جوچکە، وەچە و سەرپساندن
بن پەل تەڕە، داشکاندن

چارداخ و بەند پێوە کردن
وەبەر تاودان و وشک کردن

تیلیس و شریت، حەمباڵی
خەسارنەکەی نیو مسقاڵێ

ئەوا داگیراو دانرا
پەتەی بارکردنی درا

خۆشی خوشی دڵم شادە
خاوەنی قەرز بەس خۆ بادە

تووتنەکەم زۆر جوان و ڕەندە
بۆنخۆش و باش و پەسەندە

ئەورۆ سبەی باری دەکەم
وارید بە ناوشاری دەکەم

«دوخانیە» چاکم لێ دەکڕێ
پووڵێکی باشم پێ دەبڕێ

هەر قەرزێکی بەسەرمەوە
دەیدەمەوە بە گەرمەوە

جلک و پیلاو دەسرە و کڵاو
برنج و ڕۆن بۆ چلاو پلاو

هەرچی پێویستە بۆ ماڵم
بۆ خۆم و ژن، بۆ منداڵم

هەمووی دەکڕم بە هەرزانی
لە چاو سالان بە مەجانی

قەرزدار نیم، نەختکڕم
چیدی ناڵێم، بەرگشڕم

* * *

حاجی قادر! عەلی قەساب!
چایی بێنن لەگەڵ کەباب

شەو لە ئوتیل، لەسەر فەنەر
دەخۆم و دەنووم بێخەتەر

بە ڕۆژ تا شەو بازاڕ پێوان
بە فیزەوە قەدەم لێدان

دەگەڕێم دووکان بە دووکان
سەودا دەکەم جلی بووکان

لە دەرزی تاکوو پەشمینە    هەرشتێ جوان و ڕەنگینە
نرخ و قیمەتی دەپرسم    تووتنم هەیە چاو نەترسم
منالیش تلیتلیانە    لە ماڵێ خۆشی خۆشیانە
باب لە شار دەگەڕێتەوە    هەموو شتێکمان بۆ دێتەوە
دە ڕۆژ بەم جۆرە ڕامبوارد    بە قەرز نان و چاییم خوارد
دڵ پڕ لە ئاهەنگ و خۆشم    ئەمڕۆ تووتنەکەم دەفرۆشم
ئاغای ڕەئیس وەدەر کەوت    ئوخەی نۆرەم وەبەر کەوت
دەفەردە تووتن ڕێزکراو    لەبەر شەوقی هەڵنایێ چاو
بۆ دیتن و چاولێکردن    هەمووی پەرت و بەڵاو کردن
سەر و بنی هەڵتەکاندن    نیوەیێکی لێ وەراندن
منیش لە جێی خۆ هەستاوم    بە بێزمان ڕاوەستاوم
لە ناکاو هاتەگوێم دەنگێ    دای لە جەرگم وەک خەدەنگی
گوتی: لێدەن بە واگوزار    ئەم ساڵ خراپترە لە پار
بە ڕوویکی ترش و تاڵەوە    گوتی: زوو بگەڕە ماڵەوە
دەپوتت کەسری لەسەرە    بیهێنە، بێ بێنەوبەرە
کە گوێم گرت لەم دەنگ و سەدا    ڕەق بووم لەوێ وەک موقەبا
پاش تاوێ تاسان، حەپەسان    بە دەنگێکی پڕ لە ترسان
هاتمە زمان، هاوارم کرد    لێم کۆوە بوون درشت و ورد
گوتم: هەی داد و هەی هاوار    هەی لە ڕێگەی پەروەردگار
ئاغای ڕەئیس! قەرزدارم    نەخۆشم، برسیم، هەژارم
هیچ نەبێ قەرزی ئەم ساڵم    قووتی خێزان و منداڵم
بمدەنێ با ئەربابەکەم    هەقی چای و کەبابەکەم
ڕازی بکەم بیدەمەوە    ڕێم ببێ بۆ شار بێمەوە
یا بمگرن یا بمکوژن    یا کەسریم لەسەر هەڵگرن
بمبەخشن لە ڕێگەی خودا    خەرجیم نییە بۆ دادگا
هەڵدەلەرزیم، هەڵدەچۆقام    نەڕاندنی بەسەرما، تۆقام
ئەی بێشەرمی پەردەدڕاو!    ئەی چڵمنی پیس و گلاو!
بێدەنگ نەبی بێئابڕوو    تێت هەڵدەدەم بە ئارەزوو

دا کوڕینـــه لێـــرەی دەرکـــەن نــەک لێـرە، شــاربەدەری کـەن

* * *

بـــەم چەشـــنە دەریانپەڕانـــدم بەرهـــــەمی ساڵـــیان فڕانـــدم
بـە دزی خـاوەن قـەرز و ئـەرباب بـێپووڵـی و قـاوەچی و کـەباب
ملـــم بـــۆ نـــا بــــە لارەوە دەرکـــەوتم لـــە نــاو شـــارەوە
بـــە چـــاوی پـــڕ گریانـــەوە بـــە دڵـــێکی زۆر بریانـــەوە
هاتمـــەوە نـــاو خـــاو و خێـــزان وەک بــــــارانی گـــــەلاڕێزان
فرمێـــــسکی ڕووتی و هـــــەژاری لــە چـاوی گــشتمان دەبـاری

* * *

دوژمــن تاکــەی بـدەم باجْــت؟ دەک وەگـەڕێ تـەخت و تاجْـت!
ئـەی وەرزێـڕان! ئـەی جـووتێران! ئــەی تووتنــەوانی مــاڵوێــران!
بـا بـە یـەک دڵ و یـەک زبـان بــا بـــە خـــەباتی شـــێلگیرمان
تـــا دوا پـــشوو هـــەوڵ بـــدەین شـــەق دەو ڕژیمـــە هەڵـــبدەین
یــەکگـرتن هـۆی سـەرکەوتنە خـــەبات ڕێگـــەی دەسکەوتنـــە
ئەگـەر یـەکبـین و یـەکبگـرین لەگـــەڵ یەکـــدا بـــژین، بمـــرین
زاڵ دەبــــین و ســــەردەکەوین بـــــەرز دەبــــین و نانــــەوین
هـــەوڵ و تـــەقالای بـــێوچـــان بـــێمانـــدویی و بـــێپـــشوودان
تاقەڕێگــــــــەی ئازادییــــــــە هێنــــــــەری ڕۆژی شـــــــادییە

**لایەلایەی دایکێکی دڵسۆز بۆ کۆرپە ساواکەی**

ڕۆڵــە کۆرپەکــەم ئــارامی گیــانم خونچەی گوڵزاری باخچەی ژیـانم
جگەرگۆشــەکەم بەرهــەمی ژیـنم ســەروەت و ماڵــم، ئـایین و دیـنم
هێــز و تــەوژمم، بینــایی چــاوانم هــاودەنگی بــەزمی ڕۆژ و شــەوانم
ڕۆڵە گیان مەگری، مـەگرە بەهانـە بنـــوو درەنگــە، بــەری بەیانــە

هەی لایـە لایـە کۆرپـەی سـاوایە
کوێر بێ ئەو چاوەی بە تۆ هەڵـنایە

هەرچەن تۆ دەگری جەرگم کەبابە من بۆ تۆ چۆنم تۆش بۆ مـن وا بـە
تۆ شاگوڵـی جـوان، مـن پاسـەوانم نــازت دەکێــشم هــەتا دەتــوانم



دایک ئەو کاتەی دڵــی دەســڕەوێ   کە کۆرپەی ساوای بێخەم وەرکــەوێ
یان بە بزەی لێو، بە خەندەی زاری   ئــاڵوگۆڕیــان کــا گریــان و زاری
هەی لایــە لایــە کۆرپــەی ســاوایە
قــەزات لــە گیــانم تاقانــەی دایــە
هــەتا ئێــستاکە منداڵـــی و وردی   خەڵف و نەمامی بێستانی کــوردی
شلکی، ناسـکی، نەتـداوە بـای بـاڵ   دەرت نەکردووە پەڕ و خەت و خاڵ
بێ زمان، بێبیر، بێ هۆش و تاقەت   خەمبارم ئەکەی بە گریە و زاقــەت
بەڵام بــە هێـوای دوارۆژم ســا دەی   نەکەی ڕۆڵە گیان ڕەنجم بە بادەی
هەی لایــە لایــە کۆرپــەی ســاوایە
دایەت ماندووە بــۆچ خــەوت نایــە؟
هیوام زۆر پێتە وەک باب و کاکـت   ببیــە ســەربازی نەتــەوە و خاکــت
بەخێوت ئەکەم بە گیــان و بــە دڵ   نەکەی بترسی و لە هیچ بکەی سڵ
زانا و خوێندەوار، چاو و دڵتێـر بی   ڕۆژی تەنگانــە پــڵنگ و شــێر بی
لاوێکی گورج و خاوەن هۆش و بیر   نەترسی لە بەند، لە کۆت و زەنجیر
هەی لایــە لایــە کۆرپــەی ســاوایە
کۆرپـــــەم دوارۆژ لاوی ئازایـــــە
کوڕم! تۆ کوردی، تۆ بێچووە شێری   نەتــەوەی کــاوەی ئــازا و دلێــری
باب و باپیرت، خزم و کــەس و کـار   زۆریــان کێـشاوە مەینــەت و ئــازار
بــۆ پارێزگــاری نــامووس و ماڵــیان   قەت ڕانەوەســتا دەس و گۆپاڵــیان
تۆش وەک ئەوان بە، نــەترس و نەبــەز   بازی کێوی بە، نەک کەوی قەفــەز
هەی لایــە لایــە کۆرپــەی ســاوایە
هیــوای دوارۆژم لــە دەس تۆدایــە

*دیوانی مەلا ئاوارە.*

## شێخ ئەحمەدی زیائەدینی

عارفی سەرفەراز و بێنیاز، حاجی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ موحەممەد سەلیم، کوڕی شــێخ ئەحمــەد، کوڕی شێخ عەبدولکەریم، کوڕی شێخ غەفار، کوڕی شێخ موحەممەد کــەریم، کــوڕی شــێخ مــەحموود، کوڕی عەللامە شێخ ئەحمەد، کوڕی حاجی شێخ مستەفا تەختەیی مەردۆخی، ساڵــی ١٣٢٠ ک. م. لــە

سـنه هاتـه دنیـا و خوێنـدنی بـاڵای لـە قوتابخانـەی بـابی پایەبەرزیـدا تـەواو کـرد و هـەر لـەوێش دەرس‌گوتنەوەی گرتە ئەستۆ. لەم چەند ساڵی دواییەشدا لە مەدرەسەی زانـستە دینییـەکانی سـنەش دەرسی دەگوتەوە.

شادڕەوان شێخ ئەحمەد مرۆیەکی پارسا و زانا، لەسەرخۆ، بێ دەمار و خاکەسار و هـەمیـشە لـە یـادی خودا بوو. لە دەسەڵاتداران خۆی دەپاراست و کاری بەسەر دنیا و دنیادارانەوە نەبوو. ئەگـەر لـە کۆڕێکـدا دادەنیشت، تا پرسیاریان لێ نەکردایە، قسەی نەدەکرد.

شێخ ئەحمەد سەرەنجام لـە ٢٧ی خـەرمانانی ساڵـی ١٣٤٩ (١٩٧٠ ز.)، بەرامبـەر بـە ١٣٩٠ ک. م. دەستی لە ژیان بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا.

یاداشتەکانی نووسەر.

## ڕەمزی سلێمانی

موحەممەد ڕەمزی ئەفەندی، کوڕی مەلا مەعرووف ئەفەندی قازی، لـە سـەیدەکانی پیرخـدران، ساڵـی ١٣٢١ ک. م. لە شاری سـلێمانی هاتـە دنیـا و پـاش کۆتـاییهـاتنی دەرس‌ودەور، لـە مەزرینگەیـەکی دەوڵەتیدا دامەزرا.

ڕەمزی وێژەوان بووە و بە کوردی سۆرانی شیعری گوتووە و شیعرەکانی زۆرتر باسی دڵسۆزی بۆ گـەل و نیشتمانەکەیە. ئەوا نموونەیەکی:

خەڵکی گەییشتە مەنزڵ و گشت ئێستە سەربەخۆن
هـەر کـوردە مایـەوە لـە هـەوارێکی چـاڵ و کـۆن

ئەسبابی یەک‌نەکەوتنە، پێش ناکەون لە کەس
باعیس بە یەک‌نەگرتنە، دواکەوتوو ڕەنجـەڕۆن

کوردینە ئەم نیفاقە لـە بـەینا هـەتاکوو کـەی؟
هەروا دەوام ئەکات و لەگەڵ یـەکتری دەهـۆن

تاکەی ئەوندە هۆگری چەوتی و خراپـە بـوون؟
تاکـــەی ئەونـــدە تاڵــیبی ناڕاســتی و درۆن؟

تاکەی وەکوو گەزندە قول و قـاچی یـەک گـەزین؟
تاکەی وەکوو دڕندە دڵ و جەرگی یـەک ئـەخۆن؟

تاکەی لە بەحری وشکی هەوادا پەلـەی مەلـە؟
تاکەی بە دەشتی ئـارەزوا بـێ‌دەلیـل ئـەڕۆن؟

تاکەی خەریکی کوشتن و فەوتانی یـەکتـرین؟
تاکەی بە واتەیێکی درۆی غەیرە دەسـخەڕۆن؟

خەڵـکی سـورای فـەن‌بـوە وا گەییـە ئاسمـان
ئێوەیش خەریکی یاری هەلووکێن و هەڵمەقۆن

گاهێ لـە ڕووی جەهالەتـەوە دەبنـە ئەجنـەبی
گاهێ لـە ڕووی نەزانییـەوە ئەبنـە فەرمەسـۆن

وا تێدەگەن بە بایـەکی زک ئەبنـە فەیلـسووف
یاخۆ بە شـەپقە کردنـە سـەر، ئەبنـە ئادیـسۆن

بۆ فتنەیی و بەدی نەبێ کـەی ئامـشۆی بەڕاسـت؟
بۆ باسی یەکتری نەبێ کەی فێـری گفتوگـۆن؟

هەر غەیبەتی ئەم و ئەوە هەر مەجلسێ ئـەچی
هەر کردنی شەن و کەوە هەر کۆمەڵێ کە کۆن

بۆ غەیرە بەستنی کەمەری نۆکـەری بـە گـەرم / بۆ دەوڵەمەند لەبەر چییە وا خوار و سـەرفرۆن؟
ڕیوی و مـەڕن لـە بـەردەمی بێگانـەدا کـەچی / وەک گورگی هار و شێری دڕی جەنگی خۆبـەخۆن
وەک پۆری باڵشکاو و کەوی دەستەمۆی مناڵ / هەرچەند ئەوەی شەهێن و بە هەڵمەت وەکـوو هەڵـۆن

ئەم شاعیرە، دەوری ساڵی ١٣٩٠ ک. م. لە دنیا چووە.

*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل٤٧. *یادی ئەدیبان*، ل٤٢.

## سەحرایی

عەباسی سەحرایی، کوڕی حەبیبـوڵا، ساڵـی ١٣١٤ ک. م. لـە هەرسـینی کرماشـان هاتـە دنیـا و دوای ماوەیەک خوێندن، سەرتا چووە خزمەتی چەکداری و پاشان لە وەزارەتی ناوخۆدا دامەزرا و هێندێک لـە نەهاوەند و دواجار لە شاری کرماشان و باقی شارەکانی ئەو پارێزگایەدا، وەکوو بەخشدار، تا ساڵـی ١٣٧٩ ک. م. کاری کرد و سەرەنجام ساڵی ١٣٩٠ لە شاری خامۆشان جێی گرتەوە.

سەحرایی شاعیریش بووە و ئەم غەزەلە هی ئەوە:

آزمودم هر فـرح را، هـست در پـی مـاتمی / وز پـی هـر شـادمانی عاقبـت آیـد غمـی
پـای تـا سـر سـوختم از آتـش هجـران تـو / گر نمی‌دادی برون سرچشمه‌ی چشمم نمی
یـا مکـن مجـروح دلهـای پریـشان از جفـا / یا بنه بر ریـش درویـشان ز رأفـت مرهمـی
درد بـی‌درمـان هجرانـت مـرا از پـا فکنـد / جان ز تنهایی به لب آمـد خـدا را همـدمی
حالــت افــسردهام یابــد حیــات جــاودان / گر گذارد بر سرم پا، چون تو فرّخ مقـدمی
درد دل را از تـو پنهـان کـی تـوانم داشـتن / زانکه دل را نیست غیر از تو به عالم محرمی
جز خیال روی تو، کو کـرده دلهـا را اسـیر / کی شنیده روبهـی را صـید سـازد ضـیغمی
آن که می‌گوید نباشد عالمی دیگر، کجاست؟ / من به هر آنی کنم طی بی‌حضورت عالمی
کرده جا عشقت به دل «صحرایی» اندر حیـرتم / چون محیطی جـا کنـد انـدر درون شـبنمی

*تذکره‌ی شُعرای کرمانشاه*، ل۷۸.

## موخلیس

ئەحمەدی ئامێدی (عیمادی)، نازناو «مُخلص»، کوڕی ئەمین، لە گوندی «بامەڕنی»، ناوچەی بادینان هاتـە دنیا. بابی ناڵبەند بوو؛ بەڵان ئەو هیچ دڵـی نـەدەچووە سـەر ئـەو کـارە و ڕووی کـردە خوێنـدن و پـاش وەرگرتنی وانە سەرەتاییەکان، چووە گوندی «مایی» و لەوێ ماوەیەکی زۆر لە خزمەتی دو وێژەوانی زانـا، شێخ تاهیر و شێخ تاها بەهرەی برد و وردەکارییەکانی شیعر و شاعیریش فێر بوو.

ئەحمەد موخلیس بۆ شیعر دانان، زەوق و لێهاتوویی‌یەکی بێدادی هەبوو. شیعرەکانی جوان و ڕەوان و بێ گیر و گرفتن. دیوانی شیعری ـکە زۆرتر کوردی کرمانجی (باکوور) و هێندێکیش بە فارسی و عەرەبییەـ لە چوار بەرگدایە؛ بریتی لە غەزەل، قەسیدە، سکالا، پەسن، ئامۆژگاری و شینگێڕی.

موخلیس لە ساڵی ١٣٧٧ ک. م. لە ئامێدیدا بووە و دەوری ٧٠ ساڵ ژیاوە و تا ساڵی ١٣٩٠ ماوە.

ئەوا نموونەیەک لە شیعری ئەو شاعیرە کە تێدا باسی کارەساتی ژیانی خۆی دەکا و ئەوەی کە بۆی نەلواوە ژنێک بە دڵخوازی خۆی بخوازێ:

طُفْتُ شرقاً ثُمَّ غَرباً، بل جنوباً و شمال ئەز بخۆ ژنکا دگەر هام دالمە هل‌بیت ئیک شەمال
چوومە زاخۆ، زاخ مەداخۆ بیلە یا خۆ پیرەمیر ئەو چیایێ بەفری لێ‌کەت چوو، لوی وەخت و مەجال
چووم دهۆکی، کەتمە شۆکی، ئاف لە جۆکا من نەهات بێ‌ژن و تۆلاز و کەچ، ئەز بووم لە کن وان ترش وتال
چوومە مووسڵ، ئێ چل و زل، «کلُ بالکُل» جێ نەبوو گوت تۆ کوردی، ئەم عەرب، نفرەت ژ من کر بێ فەسال
«قلت: إنی شاعر الأکراد أبطال العراق من یکن منکُنَّ زوجی، نالت العیش الزّلال»
وەختی وان ژێ گۆتیە من، من کر هەوار و دەستقوتان کوردی کوردی، ما نُریدُک، لا تُطِل هذا المَقال

*الأکراد فی بهدینان*، ل٢١٤ و ٢١٥.

## شێخ مستەفای قەرەداغی

کوڕی شێخ موحەممەد نەجیب، کوڕی شێخ لەتیف، کوڕی شێخ عەبدوڵڵا، لە پشتی شێخ لەتیفی کەبیر، ساڵی ١٣٠٣ ک. م. هاتە دنیا و لە قوتابخانەکەی باوبیدا خوێندنی دوایی پێ هێنا و ئیجازەی وەرگرت.

شێخ مستەفا تا باوکی مابوو، لای ئەوی چۆڵ نەکرد و لە بەردەستیدا، بەڕێوەبردنی قوتابخانە و فەقێیان و کاروباری شەرعی خەڵکی بەڕێوە دەبرد. پاش ئەویش بە تەنیا و لەوپەڕی تەکووزیدا ئەرکی زانستی و ئایینی خۆی دەسووڕاند.

قەرەداغی مامۆستایەکی شارەزا لە زانستە عەقڵی و نەقڵییەکاندا و مرۆیەکی جوامێر، خەڵک‌خۆشەویست، قسەزان، ئازا و پشتیوانی ڕاستی و دروستی بوو. قەت لەبەر زۆربێژان و ناحەقیکاران دانەدەهات و هەمیشە بە زمانێکی پاراو و بەبڕشت، لای هەژاران و زۆرلێکراوانی دەگرت.

مامۆستا هێندێک نووسراوەشی لێ بەجێ‌ماوە؛ کە تا ئێستا هیچی لە چاپ نەدراوە.

شێخ مستەفای قەرەداغی لە سالانی دواییدا کۆچی کرد بۆ سلێمانی و لە مزگەوتی شێخ ڕەحمانی عازبانیدا دەرس‌گوتنەوەی درێژە پێدا و سەرەنجام لە ساڵی ١٣٩٠ ک. م. دەستی لە ژیان بەردا.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل٥٦٨ و ٥٦٩.

## ئەبولوەفا موعتەمەدی

تاها ئەبولوەفا موعتەمەدی کوردستانی، کوڕی عەللامە حاجی شێخ موحەممەدی موعتەمەد، زانایەکی شاری سنەیە لە بنەماڵەی قوسەیرانی کانیمشکانییە، کە پشت بە پشت بۆ زانایی و پارسایی ناوبانگیان بووە.

تاها ساڵی ١٢٦٥ ک. هـ. (١٣٠٥ ک. م.) هاتە دنیا و خوێندنی سەرەتایی لای ئامۆزایەکی خۆیەوە، بە ناوی شێخ لوتفوڵا ـکە پیاوێکی چاک و پاک بووەـ دەسپێکرد و پاشان ماوەیەک لە لای بابیەوە و هێندێک لە خزمەتی مامی زانای، حاجی شێخ عەبدولحەمیدی عیرفانی خوێندی و سەرەنجام لە کۆڕی دەرسی عەللامە مەلا عەبدوڵڵای موفتی دشی بەهرەی برد و ئیجازەی وەرگرت. دوای خوێندن دامەزرا و ماوەی زیاتر لە ٣٠ ساڵان لە وەزارەتی دارایی، لە کوردستان و خوراسان و تاران خزمەتی کرد و ساڵی ١٣٢٨ ک. هـ. وەنیشتە بوو.

ئەبولوەفا زۆربەی زانستە دینییەکانی دەزانی و سەری لە زانستی نوێش دەردەچوو. هەم عەرەبی و هەم فارسی جوان و ڕەوان دەنووسی. نەخۆشی خۆڕانانی بە لادا نەچووبوو. خاکەسار و بێنیاز بوو.

دوای کارکناری ـکە دەرفەتێکی زیاتری دەسکەوت ـ چەند کتێبی نووسی؛ هێندێکیان بریتین لە:

١. «*اصول فقه شافعی*»، بە فارسی، چاپی تاران، ١٣٣٢ ک. هـ.

٢. «*ارث در اسلام و طریقەی حل مسائل آن*»، بە فارسی، چاپی تاران، ١٣٣٤ ک. هـ.

٣. «*کلمة فی الجمعة و تعطیلها*»، عەرەبی، چاپی تاران، ١٣٤٣ ک. هـ.

٤. نامیلکەیەکی عەرەبی لەمەر ئیجتیهاد لە ڕێبازی سوننەدا، چاپی تاران، ١٣٣٦

٥. «*خلق اعمال*»، باسێکی کەلامییە، بە فارسی

ئەو خوا لێ خۆشبووە سەرەنجام ساڵی ١٣٥٠ ک. هـ. (١٣٩١ ک. م.) لە تاران کۆچی یەکجاری کرد.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شاهۆ بیارەیی

مەلا حەسەنی قازی، نازناو «شاهۆ»، کوڕی مەلا قادری کانیکەوەیی، ساڵی ١٣٠٣ ک. م. لە بیارە هاتە دنیا و هەر لەوێش خوێندنی تەواو کرد. پێش قەومانی یەکەم شەڕی جیهانی، چووە بەغدا و لەوێوە گەیشتە ئەستەمبووڵ و دوای ماوەیەک مانەوە لەوێ و فێر بوونی زمان و وێژەی ترکی، هاتەوە سلێمانی. ساڵی ١٣٤٧ ک. م. بوو بە قازی هەڵەبجە و بەدوویدا لە چوارتا و بەغدا و کەرکووک و هەولێر و چەمچەماڵدا، هەرکام چەند ساڵێک داوەری کرد و ساڵی ١٣٧٤ وەنیشتە بوو. ئەوجار گەڕاوە هەڵەبجە و تا کۆتایی ژیان (١٣٩٢) لەوێ مایەوە.

مەلا حەسەن پیاوێکی هێژاو شاعیرکی وریا و خاوەن زەوق بووە. زیاد لە کوردی، عەرەبی و فارسی و



ترکیشی زانیوە. سەرەتا نازناوی «شایق»ی هەڵبژاردووە و دواجار کردوویەتە «شاهۆ». بەشێ لە شیعرەکانی بۆخۆی ساڵی ١٣٤٥ لەچاپیداوە و دیوانەکەی لە ساڵی ١٣٩٧، بە تێکۆشانی مامۆستا موحەممەد ئەمینی کاردۆخی چاپ کراوە.

**چەند شیعری شاهۆ**:

نەورۆزە، جەژنە، شاخ و چیا، کێو و دەشت و دەر
تارایی سەوزی دا بە سەرا، سەوزی کردە بەر

ڕازایەوە بە ڕەنگی گوڵان نیشتمانی کورد
بووژایەوە درەخت و چرۆی جوانی کەوتەدەر

خونچە بە بای نەسیمی بەیان کەوتە پێکەنین
سۆسەن گەشاوە، یاسەمەنیش تاجی نایە سەر

لالە و بەنەوشە، نەرگس و نەسرین و گوڵ زەمەق
هەر یەک بە نەشئەیێکەوە وا دێتە بەر نەزەر

شەوبۆ، چنوور و سوورەهەراڵە و کەما و لۆ
تازە لە ژێری بەفرەوە سەریان دەهێننە دەر

نەغمەی حەزینی بولبولی شەیدا لە عیشقی گوڵ
تەئسیر ئەکاتە ناو دڵی غەمبار و ناو جگەر

قاسپەی کەو و چریکەیی تەیر و تویووری کێو
خوشی ئەدەن هەموو بە دڵی ماتی پڕ کەسەر

* * *

ئەی یاری خۆشەویستی وەفاداری ڕاستڕەو
وەی جێ ئومێدی موخلیسی خەمباری تیرەشەو

وەختێ کە کارتی جەژنەکەتم دیت و خوێندمەوە
وەک نووستوێ کە ڕاشڵەژێ و ڕاچەنێ لە خەو

تیمسالی حاڵی قەومەکەمی میسلی سینما
هێنایە بەر نەزەرم و لەپڕ ڕاپەریم بە دەو

تۆزێ کە سەیری ئەو شریتەم کرد و تێگەییم
دەستم گەیاندە خامە وەکوو بەرقی تێژڕەو

نووسیم بە خوێنی دیدە لە سەفحەی سیاهی دڵ
ئەحواڵی کوردی قوڕبەسەر و بەختی شوومی ئەو

کورد ڕەنجەڕۆیە، گوڵبونی عەیشی خەزانی کرد
شانی لە ژێری باری خەما گشتی بوو جەدەو

* * *

باری گونام گرانە بە سەرشانی ڕێشەوە
ئەتلێمەوە هەمیشە لە تاوا بە ئێشەوە

نەفسم ئەوندە سەرکەشە سەرشێتی کردووم
تووشم بووە بە تووشی شەڕی گورگەمێشەوە

شەیتانە کوێرە نەگبەتەکەیش خۆ بە بێوچان
چیم بۆ خەرابە، ئەومە ئەکات هەر بە ڕیشەوە

بێجگە لەمانە کۆمەڵی خێڵی «یُوَسوِس»یش
چەک ئاودەرە، بە ژاری پڕ ئازار و ئێشەوە

هەڵمەت ئەهێننە سەر دڵی ڕێشم بە ڕۆژ و شەو
ئەویان بە تیر و شیر و ئەمیتر بە نێشەوە

دوژمن ئەوندە زۆر و منیش پیر و ناتەوان
بۆ جەنگی ئەم گورۆهە بە چی بچمە پێشەوە؟

* * *

تاتایی سەری زوڵفی ڕەشی پەرچەمی یارم
وەک تەوقی غەزەب چۆتە ملی قەلبی هەژارم

تابووری موژە دەس بەسەنان بۆ منی بێکەس
ئامادەیە وەک عەسکەری خوێنڕێژی تەتارم

شمشێری بڕۆی حازره بۆ گەردەنی عاشق
ئەو خاڵە بەسەر ڕوویەوە وا دیارییە «شایق»

وەک شێری عەلی چۆن بووە بۆ جەیشی کوفارم
بۆ مورغی دڵان دانەیە داناوە نیگارم

*دیوانی شاهۆ*، سلێمانی، ١٩٧٦ ز.

## عەلی کەمال باپیرئاغا

عەلی کەمال کوڕی باپیرئاغا یوزباشی، لە خێڵی ئیسمایل عەزیزی، ساڵی ١٣٠٥ ک. م. لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە خوێندوویە و پاشان لە مەزرینگەیەکی دەوڵەتیدا دامەزراوە. لە سەردەمی خوێندندا، ماوەیەک لە ئێران ژیاوە و تا تاران چووە و زبان و وێژەی فارسی فێر بووە.

عەلی کەمال خاوەن زەوق و لێهاتوویەکی باش بووە و شیعرەکانی زۆرتر ئەویندارانە و ڕەوان و بێ گرێن. لە بەرهەمەکانی، دەفتەرێکە بە ناوی «*گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*»، باسی چەند کەسێک لە شاعیرانی کوردستانی باشوور لە ٥٦ لاپەڕەدا کە ساڵی ١٣٥٨ ک. م. لە چاپخانەی ژیان لە سلێمانی چاپ کراوە.

مەرگی ئەم شاعیرە ساڵی ١٣٩٢ ک. م. ڕوویداوە.

**غەزەلێکی عەلی کەمال**:

پەلکەزێڕینە، پەلکەزێڕینە!
تۆ بی تۆ خودا پەلکەزێڕینە!

هەرچەن دیمەنت جوان و شیرینە
شێوەت بەڕاستی گەلێ ڕەنگینە

ئەمما پێم بڵێ: ئەو ڕەنگە زەردەت
وەک ئاڵتوون جوان و پاک و بێگەردەت،

جوان و لەتیفە یا ڕەنگی زەردم
یا پەلکەی زەردی گەردەن بێگەردم

گاهێ کرژ و لوول، گاهگاهێ خاوە
ڕەگی ڕۆحمە زەرکفت کراوە

ڕەنگە سوورەکەت کە وەک گوڵنارە
ئەڵێی شەوقی ڕووی یاری نازارە

توخوا ئەو جوانە یا لێوی نیگار؟
ئەو لێوە ئاڵەی سونعی کردگار

مردووی سەدساڵە حەی ئەکا دەرحاڵ
خەندەی شرینی ئازیزی چاوکاڵ

قامەتت کەوا خەمە و چەمیدە
وەک تاقی خەمی بڕۆی سەردیدە،

جوانە یا تاقی بڕۆی دڵدارم
میحرابی دڵەی پەشێو و زارم

دەخیلم تۆخوا پەلکەزێڕینە
لەمەولا ئیتر تۆ خۆت مەنوێنە

پێشەکی *گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم*، ل٤. چەند گۆڤاری کوردی.

## سەیفوڵا ئەڵایارخانی

کوڕی یەعقووب، خەڵکی گوندی «دوچقا»ی سەر بە ناوچەی «ئەڵایارخانی» کرماشان، شاعیرێکی ئاگا و

خاوەن زەوق بووە کە لە ئەستێرەناسیش سەری دەرچــووە و ساڵــی ١٣٩٢ ک. م. (١٣٦٧ ک. هـ. ١٩٨٨ ز.) کۆچی یەکجاری کردووە.

ئەم شیعرەی بۆ حاڵ و باڵی پیری خۆی گوتووە:

| | |
|---|---|
| دۆســــان! حــــاڵ وێم بــــواچم پێتــــان | هــەرکامتان مەنیــەن یــەســە هاوڕێتــان |
| وە مــــەرگتان قەســــەم دەروون پــــڕداخم | کەم‌کەم پیری هــات گرتــەن سەرشــاخم |
| ڕاســــە وە گوفتــــار خــــەیلێ جــــوانم | وە کــــردار پــــیر و هــــەم ناتــــەوانم |
| ســــەرتاپا مــــەعیووب زامــــم قــــەهارەن | عەیبیــــەل پــــیریم کــــول ئاشــــکارەن |
| قامەتم چون قەوس چەم و خــەم وەردەن | مــــەجرۆح و بیمــــار هــــەزاران دەردەن |
| مــەغزم لــە کاســەی کەللــەم نەمەنــەن | پــیری عــەقڵ و فــام وەدەســم ســەنەن |
| چــەم بیــەن دوربــین هــەوای تــەم و تــار | گاگــــــا مــــــەوینێ دوان وە چــــــوار |
| ســــەدای تەبــــڵەکەی گۆشــــم خەفتیــــە | چــــو ئاســــیاو بــــێدان ئــــاوی کەفتیــــە |
| لویت چــون ئــاوەزای کەڵــوەزان ســەخت | مەتکیێ تکـ‌تک لە وەخت و بــێ‌وەخــت |
| دەم بیــــەن وە نــــای ئاســــیاو خــــراوە | پەڵــــە مەشــــینێ وە هــــەردک لاوە |
| ئــەو گوفتــار خــاس، شــیرین شــەکەردار | تەڵــخ بیــەن وێنــەی ژار حەڵــق مــار |
| مامەڵەی پیری وەی تــەور پــێم کــەردەن | قافــڵەی جــوانیم وە تــاراج بــەردەن |

*حدیقەی سُلطانی*، ل٢٨٢-٢٨٤. یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا باقری بالک

زانای وریا، مەلا موحەممەد باقر، کوڕی حوسەین‌ئاغا، ساڵی ١٣١٦ ک. م. لە گوندی «نزار»، لە نیوان سنە و مەریوان و کامیاران هاتە دنیا[1] و پاش خوێندنی سەرەتایی لە زێــدی خۆیــدا، بــۆ فێربــوونی عــەرەبی و زانستە ئایینییەکان، چووە غوربەت و ماوەیەک لە ناوچەی «ژاوەرۆ» لای مەلا ئەسعەدی بۆرپەری و چەنــد مامۆستای تر و سەرەنجام لە سنە لە خزمەتی مەلا موحەممەدی مەولانای نۆدشی خوێندی و ئیجــازەی وەرگرت. ئەوجار گەیشتە گوندی «چۆڕ»ی مەریوان و تا ساڵی ١٣١٤ ک. م. لــەوێ مــەلایی و بــەرنوێژی کرد. دوای ئەوە چووە گوندێکی تر بەناوی «بالک» و تا کۆتــایی ژیــان (ســەرەتای زســتانی ١٣٥٠ ک. هـ. ١٣٩٢ ک. م.)، لەوێ ماوە.

---

١. مامۆستای پایەبەرز مەلا کەریمی مودەڕڕیس، زێدی مەلا باقری گوندی «هەنیمن» و ساڵی لەدایکبوونی ١٣٢٠ ک. م. نووسیوە؛ کە بەرامبەر بە گوتەی کەس‌وکاری، هێچیان لە ڕاست ناچن.

مەلا باقر بە بیری تیژ و لێهاتوویی تایبەتەوە، یەکجار مامۆستایەکی بەرز لەزەبر بوو؛ چاکی دەرس دەگوتەوە و لە کۆڕی پڕپیتی دەرسیدا، زۆرێک بەهرەیان برد. لە زانستە ئیسلامییەکان، بەتایبەت فیقهـ و کەلامدا هێندێک نووسراوەی هەیە و چەند هۆنراوەش بە نازناوی «غەریق»ەوە لێ بەجێ ماوە. ئەو خوا لێ خۆشبووە سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی و مریدی شێخ عەلادینی بیارە بوو.

یاداشتەکانی نووسەر.

## قەدریجان

شاعیرێکی ناوداری کوردستانی باکوورە کە لە سەرەتاکانی چەرخی بیستەمی زایینیدا هاتۆتە دنیا و کوردێکی زۆر نیشتمانپەروەر بووە. دوای شکانی بزوتنەوەکەی شێخ سەعیدی پیران (١٩٢٦ ز.)، بۆ شام کۆچی کردووە و ساڵی ١٩٧٢ ز. (١٣٩٣ ک. م.) لە شاری دمشقدا، ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە و هەر لەو شارەدا نێژراوە.

شیعری قەدریجان بە کوردی کرمانجی باکوورە و زۆرێکی لە گۆڤاری «*هاوار*» و «*ڕووناهی*»دا چاپ کراوە. ئەمەش یەکیان:

دۆستێ من، دژمنێ پوستێ من، بەگی ئاخرزەمان!

ئەو زەنبیلا توپێ هاتی، نەماداتێ ژ ئەزمان

بەنێ وێ ڕزیایە لناڤارێ قەتیایە، ئوکەت

کەت ناقا دەریا سۆر. دەریاسۆر ژێرا بوگۆڕ.

دەریا سۆر، ژتیر خاوەن و خودایێ بچووکڕا. بوکەفەن.

مووسا و موریدێن وی هەمی. بیپر و بێگەمی.

ژووری دەرباس بون.

ژ جەور جەفایێ لوەرخەلاس بوون.

نەمروودێ بچووک. مەبە ئاگر دترسینە.

ڤێ مەشکلاڤالا... ئەی کەڤنارێ ئێسالا!

باوریا دلێ مە، تاقەتا ملێمە، ژ ئیمانێ ئیبراهیم، بێترە. نە کێمترە.

ڤێ یانبران. ئەی پیخەمبەرێ دزان!

دوستێ من دژمنێ پۆستێ من. بەگی ئاخرزەمان!

ئەو زەنبیلا توپێ هاتی. نەما داتێ ژ ئەزمان

مەزناتی نە بپارە ئو مالە. نە ژی بگەرما کالە.

مەزناتی بجەوهەرێ ئینسانە، بعیلم و عیرفانە.
بەلێ ئەم خزانێ مالن. لێ زەنگینێ کەمالن. زەنگینێ ئیدئالن
ڕیاراستە، ڕیامە. ئەوە پیخەمبەریامە: زنجیر شکاندن، ئارمانج گهاندن.
بابیلوسکان بستان. دیرۆکاراستان. دبێژە، بێژە:
گۆوە مەدە ئەفسانەیێ دێوان. بشوندا نەمینە ژکارڤان.
کارڤانێ مەدەنییەت. گرووهێ بەشەرییەت.
خولاسە، پیشی و پاشیا فیلۆسۆفە. فیلۆسۆفیامە، ئەڤە.
دین، مەزهەب، ئیمان.... ببە ئینسان! ببە ئینسان!
دۆستێ من، دژمنێ پۆستێ من. بەگی ئاخرزەمان!
ئەو زەمبیلا توپێ هاتی. نەماداتێ ژ ئەزمان.

*مێژووی وێژەی کوردی*، پرۆفسۆر قەنات کوردۆ، چاپی ستوکهوڵم.

## مەلا ساڵەحی کۆزەپانکەیی[1]

مامۆستایەکی زانا، دیندار، پشتگری ڕاستی و دروستی و ڕەواجدەری شەریعەت بووە کە پاش تەواوکردنی دەرس‌ودەور و وەرگرتنی ئیجازە لە مەلا فەتاحی خەتێ، دەرسی‌گوتۆتەوە و تاقمێکی زۆر لە قوتابخانەیدا پێگەیشتوون.

مەلا ساڵەح هەر کاتێ دەستی‌داوە، خەریکی خوێندنەوە و نووسین بووە و لە شیعر و ئەدەبیاتیشدا سەری‌دەرچووە و جاروبارە شیعریشی گوتووە و ساڵی ١٣٩٣ ک. م. لە شاری هەولێر لە دنیا دەرچووە.

*عُلَماونا فی خدمةالعلمِ و الدّین*، ل ٢٤٤.

## دانشوەری سنەیی

میرزا ئیبراهیمی دانشوەر، پیاوێکی ئاگا، هێژا، پارسا و هەروەها خەت‌خۆشی خەڵکی شاری سنە بووە، کە دوای ٧٢ ساڵ ژیان، لە ڕۆژی شەمبە، ١١ی زیحەجەی ساڵی ١٣٩٣ ک. م. دوای بەجێ هێنانی حەج، لە مەککەی پیرۆزدا ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە و هەر لەوێ لە زیارەتانی «جنةُالماوی»دا نێژراوە.

حاجی ئیبرایم کارگێڕی دەوڵەت بوو؛ لە شارەوانی کاری مەزرینگەیی دەکرد و لەوپەڕی پاکی و دروستیدا لەگەڵ خەڵک دەجووڵایەوە. ئەگەر کاتێکی بۆ دەماوە، خەریکی خوێندنی کتێبان دەبوو.

١. **کۆزەپانکە** گوندێکی سەر بە هەولێر بووە.

کتێبێکی بەو خەتە جوانەی نووسیوە، بە ناوی «*ایمان و اسلام*» کە لە کۆتایی هـەر بەشـێکیدا، پاژێـک لـە بڕوانامەکەی مەولانای جامی هێناوە. ئەم کتێبە بە هیممەتی پیاوچاکێک بە ناوی کاک سدیقی وەزیری، ساڵی ١٣٩٢ ک. م. چاپ کرا.

یاداشتەکانی نووسەر.

## فەقێ ڕەشید

موحەممەدڕەشید هەمەوەندی، مەشهوور بە «فەقێ ڕەشید»، کوڕی ئەحمەد، کوڕی عـەزیز، لـە تایفـەی هەمەوەند، مرۆیەکی ئاگا، زانـا و ئـەدەبدۆسـت بـووە کـە لـە کـاتی خۆیـدا بـۆ هێنـدێک لـە بلاڤـۆکە کوردییەکان، وەکوو «*ژین*» گوتاری نووسیوە. بۆ نموونـە لـە ژمـارەی ١٢٨٣، ساڵـی ٣١ی ئـەو گۆڤـارەدا، نامیلکەیەکی لەمەڕ شاعیری هاوتایفەی (عەبدولقادیری هەمەوەندی)وە نووسیوە.

کۆچی دوایی فەقێ ڕەشید، ساڵی ١٣٩٤ ک. م. لە سلێمانی ڕوویداوە.

*کۆمەڵەی شیعری فەقێ قادر*، ل٤، چاپی ١٩٨٠ ز.

## کامبوزیا

ناوی ئەم بلیمەتەم لە ڕۆژنامەی «*اطلّاعات*»ی ژمـارە ١٤٥٣٦، هـی ڕۆژی ٢٧ی مـانگی ڕەزبـەری ساڵـی ١٣٥٣ ک. ه. )١٩٧٤ ز.) چاوپێکەوت؛ کە بە بۆنەی کۆچی دواییەوە، وتارێکی دوور و درێژی لە بـارەوە نووسیبوو. ئەوا کورتەیەک لەو وتارە:

«ئەمیر تەوەکولی کوردی زەعفەرانلوو، ناسراو بە کامبوزیا، وەرزێرێکی ئاسـایی کـە لـە قـەراخ بیـاوانی «لووت»ەوە، لەگەڵ تاقمێک لە گەورەترین زانایانی جیهاندا پێوەندی هەبوو، دنیای بەجێهێـشت (١٣٩٤ ک. م. ١٩٧٤ ز.) ئەو بە ڕۆژ، ئارەقی دەڕشت و دەشـتی وشـکاڕۆی دەکـردە مـەزرا و شـەوان دوامـین نووسراوانی لەمەڕ زەویناسی و جوگرافیای ئابووری ، کە بە فەڕانسی و ڕووسی نووسرابوون، دەخوێندەوە.

کامبوزیا ساڵی ١٢٨٣ ک. ه. )١٩٠٤ ز.) لە تـاران هاتـە دنیـا و دوای خوێنـدن دامـەزرا و سـێ سـاڵ (١٣٠٤-١٣٠٧)، بەرپرسی دارایی پارێزگای بەلووچستان بـوو. ساڵـی ١٣١٤ چـووە شـوێنێک لـە چـوار کیلۆمیتری شاری زاهیدان (ناوەندی ئەو پارێزگایە) بە ناوی «کەلاتەرەزاق»، کە دەشتێکی قاقـڕ بـوو. بـە زەحمەتێکی زۆر، ئەو شوێنەی کردە زەویوزارێکی خۆش و گەش. هەروەها لەوێ وردە‌ـوردە کتێبی کۆ کردەوە و کتێبخانەیەکی پێکهێنا، دەوری ٢٣هەزار بەرگ، لە هەموو جۆرە بابەتی زانستی، کتێبی نایابی دەسنووس، زانستنامە و...

زانایانی گەورەی زەویناسی و جوگرافیای ئابووری، کامبوزیایان دەناسی و لەگەڵیدا پێوەندییان هەبوو.

زۆرێکیان جار لە دووی جار، بۆ بینینی و بەهرە بردن لە گەنجینەی زانست و بۆچوونەکانی، ئەو ڕێگا دوور و سەخڵەتەیان بڕیوە و چوونەتە کلاتەرزاق.

کامبوزیا چەند زمانی زیندوو، وەکوو: عەرەبی، فەڕانسی و ڕووسی باش دەزانی و لە سەردەمی لاویدا، بە کاری وەرگێڕییەوە ڕایدەبوارد. ژیانێکی زۆر ئاسایی هەبوو. بە لای زەرق و بەرقدا نەدەچوو. بەرگێکی ساکاری دەبەر دەکرد و هەر بەو شێوە سادەوە دەچووە پێشوازی میوانانی، لە هەر چینێک بوایە. پیاوێکی میهرەبان، خۆش سەر و زمان، دژمنی تەمبەڵی و تەوەزەلی. بۆخۆی، ئەگەرچی پیر ببوو، لە کازێوەی بەیانەوە تا درنگانێک کاری دەکرد. هەموو ژیانی بۆ لاوان دەرس بوو. تێی دەگەیاندن کە زانست و تێگەییشتن، بە زانستگا چوونەوە نەبەسراوە. بە ویست و کۆشش، دەشتی کاکی بە کاکیش دەکرێتە باخ و بێستان.

ئەمیر تەوەکولی کورد، گەورەترین مایەی شانازی خۆی لە دانانی مەزرایەکدا دەزانی کە بژیوی چەند لادێیی هەژار دابین دەکا؛ نەک ئەو هەموو سەرکەوتنە زانستییە. ئەگەرچی لە زانایان و بیرمەندان زۆر ڕێزی دەنا.»

## ئایەتوڵڵا مەردۆخ

جەمالەدین موحەممەدی مەردۆخ، مەشهوور بە «آیت‌الله»، کوڕی شێخ عەبدولموئمین، کوڕی شێخ جەمالەدین، کوڕی شێخ عەبدولموئمین، کوڕی شێخ جەمالەدین، کوڕی شێخ عەبدولموئمینی یەکەم، کوڕی شێخ جەمالەدینی یەکەم، ساڵی ١٢٩٨ ک. م. هاتە دنیا.

وەک خۆی لە پێشەکی کتێبی «*جان‌نما*»دا دەڵی، تا تەمەنی ١٦ ساڵان ـکە بابی مابووـ سەری بە ئەسپ و تفنگ و ڕاو و کەژ و کێوەوە گەرم بووە و ئاوڕێکی لە خوێندن و فێربوون نەداوەتەوە. بەڵام مەرگی باوکی ڕایچڵەکاندووە و تێیگەیاندووە ئەگەر زوو بە زوو لەخۆی نەنەوێ، چیتر قەرەبووی ڕابوردووی بۆ ناکرێتەوە و ئەوی ڕۆیوە تازە ناگەڕێتەوە. لە ئاکامدا بڕیار دەدا بێجگە کتێب، هەموو شتێک وەلانێ و شەو و ڕۆژ بخوێنێتەوە و ساتێکیش نەسێتەوە. بەم جۆرە و بە هۆی زیرەکی لە ڕادەبەدەر و بیری یەکجار تیژ و لێهاتوویی سرشتیوە، لە ماوەیەکی کەمدا بەوپەڕی ئاواتی دەگا.

مەردۆخ پیاوێکی باڵابەرز، بەسەروسیما، گفت ڕەوان، قەڵەم جوان، قسەخۆش و دەم پاراو بوو. پەخشانی، بە فارسی و عەرەبی، بێ گرێ و ڕازاوە دەنووسی. لەبار و دڵبزوێن قسەی دەکرد و کەس لەگەڵی کیشەی پێ نەدەکرا.

ئایەتوڵڵا شارەزای زۆربەی زانستە ئیسلامییەکان بوو. لە هێندێکیشیاندا گەیشتبووە ڕادەی پسپۆڕی. چەند زانستی نائاسایی، وەکوو جەفر و عیلمی عەدەدیشی دەزانی. بە بێ ئەوی مامۆستای بووبێ، نیگارکێشێکی دەس‌نەخشین بوو. زەوقی شیعریشی هەبوو؛ بەڵام کەمتر شیعری دەگوت و هۆنراوەی کەمن.

عومری بە کێشەی ئایینی و زانستی، بەشداری لە چالاکی سیاسی و کۆمەڵگایی، خوێندن و نووسین تێپەڕ کرد. زۆرێک کتێب و نووسراوەی دانا کە زۆربەیانی بۆخۆی لە چاپ دا. هەر لە باسی دینی و مەزهەبییەوە تا کێشەی فەلسەفی و مەنتیقی و ئەمجار تا زبان و فەرهەنگ و مێژوو، لە هەموو بابەتێکەوە، کتێبی هەیە!

**ناوی بەشێک لە کتێبە چاپکراوەکانی**:

١ـ *فقه محمدی*، بە فارسی، بەرامبەر بە مەزهەبی ئمام شافیعی

٢ـ *رموز آفرینش*، بە فارسی

٣ـ *نداءُ الاتحاد فی مبحث الاجتهاد*، بە عەرەبی

٤ـ *منطق مردوخ*، بە فارسی

٥ـ *سرمایەی هدایت*، بە فارسی

٦ـ *ندای اتحاد*، بە فارسی

٧ـ *نسیم رستگاری*، بە فارسی

٨ـ *در جواب معترضین*، بە فارسی

٩ـ *جان‌نما*، بە فارسی

١٠ـ *جام جان و جین*، بە فارسی

١١ـ *خلاصةالاحکام*، شەرحی هۆنراوەی «کفایة الاسلام»

١٢ـ *چارەی بدبختی*، بە فارسی

١٣ـ *اصول مردوخ*، بە فارسی

١٤ـ *نحو مردوخ*، بە فارسی

١٥ـ *صرف مردوخ*، بە فارسی

١٦ـ *حساب مردوخ*، بە فارسی

١٧ـ *هدف‌نما*، بە فارسی

١٨ـ *نالەی «الاسلام»*، بە فارسی

١٩ـ *تاریخ مردوخ دربارەی کرد و کردستان* (لە دوو بەرگدا)، بە فارسی

٢٠ـ *فرهنگ مردوخ* (لە دوو بەرگدا)، بە فارسی

٢١ـ *شطرنج‌نامە*، بە فارسی

٢٢ـ *شەترەنج‌نامە*، بە کوردی

٢٣ـ *طب مردوخ*، بە فارسی

ئایەتوڵا مەردۆخ لە ڕەمەزانی ساڵی ١٣٩٥ ک. م. (هاوینی ١٣٥٤ ک. ه. ١٩٧٥ ز)، پاش دەورانێک

نەخۆشی، لە شاری سنەدا سەری یەکجاری ناوە و بەیانی ئەو ڕۆژە، خەڵکێکی زۆر بۆ بەڕێکردنی خرۆشابوون و بەرامبەر بە ڕاسپێری خۆی، تەرمەکەیان لە سەر دەست و شان، بردەوە گوندی «نەوەڕە» لە ڕۆژاوای شار و لە شوێنێ کە پێشتر دیاری کردبوو، ناشتیان.

دوکتور سەعید خانی کوردستانی (پیرۆز)[1] ـکە بێژگە بژیشکی لە زمان ویژەشدا دەستی هەبوو ـ کتێبێکی بە ناوی «نەزانی» بە شیعری گۆرانی هۆنیبووەوە. لە هەمەدانەوە بەرگێکی بۆ ئایەتوڵا دەنێرێ. ئەمیش لە جوابدا ئەم شیعرەی بۆ دەنێرێتەوە:

ئـــارام دڵـــەی پـــڕ جـــە خارەکـــەم — دەرمـــــان دەروون پڕئازارەکـــــەم
نامـــەی «نـــزانی»ت وە لای مـــن یـــاوا — بۆســـام و نـــەڕووی دوو دیـــدەم ســـاوا
یـــاوا وە ســـەردەم کوشـــتەکەی تـــیرت — مەڵهەم دا نـە زام خـەسـتەی زەنجـیرت
یاســـای دڵـــداریت وە جـــێ ئـــاوەردەن — بووچـــکنـــەوازیت پاوەجـــێ کـــەردەن
ویرەگـــەل شـــیرین شـــەکەر ڕێژەکـــەت — واژەگـــەل زەریـــف عەنبـــەر بێژەکـــەت
نـــە دڵـــێ ســـەددڵ فریفتـــەش مـــەبۆ — هـەزارێ چـون مـن وە شـیفتەش مـەبۆ
کولـــەی دڵـــەکەت جـــۆشئـــاوەردە بـــۆ — کـــزەی دوورییەکـــەت قـــسە کـــەردە بـــۆ
من خۆ کەم زووخاو چەپگـەردم وەردەن؟ — ئەم جار ئـەم کـزە سامانـساش کـەردەن
دیۆناتـــــەو دوودی کـــــوورەی دەروونم — کولناتـــەو زامـــان دڵـــەی پـــڕهوونم
مـــن جـــە دووری تـــۆ دڵـــم پـــڕ دەردەن — ویـــر و وەژارەم جـــە هـــەرد و بـــەردەن
هەرســـا دیم وە چـــەم نـــەوهاڵ بـــالات — کارِوبـــــام یـــــاوا وە لاڵ ئـــــالات
دیـــسان دیمـــەوە گۆنـــا زەردەکـــەت — بۆســـام دوڕدانـــەی قـــەتران وەردەکـــەت
ئانـــــە ڕۆژ جـــــەژن شـــــادمانیمەن — ئانـــە نـــەو وەهـــار زندەگانیمـــەن
وەرنـــە ئیـــسە مـــن هـــوون دڵ وەردە — گیـانم سـەنگینبـار تـەن خـەزانکـەردە
جەرگم وە مەودای دووریت بیـەن ڕێـش — بـێدرۆ ئـازیز «نـزانی»م پـەی چـێش
مـــن وە یـــاد تـــۆ هەمیـــشە شـــادم — ســـارا و ســـەرزەوی نمـــەیۆ یـــادم

## سوارە

بلیمەتی مەیدانی بەرفراوانی شیعر و پەخشانی کوردی، سوارەی ئێلخانیزادە، کوڕی ئەبووبەکرئاغا، کوڕی

---

١. یاداشتەکانی نووسەر.

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٦٩٧.

حاجی بایزاغا، لە بنەماڵەی ئاغاکانی بۆکان، ساڵی ١٣١٦ ک. ھ. )١٩٣٧ ز.)، ھاتە دنیا و ساڵی ١٣٥٤ (١٩٧٥) لە تافی لاوی و سەرەتای ژیانی ھونەریدا، گیانی نەسرەوتووی لەشی نەخۆشی بەجێھێشت.

سوارە خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی، لە بۆکان و سەقز و تەورێزدا تەواو کرد و بۆ خوێندنی باڵا، چووە تاران و لە زانستگای تاراندا ڕشتەی حوقوقی خوێند. ھەر لەو سەروبەندانەش، لە بەشی کوردی ڕادیۆدا دامەزرا و بەرنامەی ئەدەبیی بۆ نووسین. زنجیرە گوتاری «*تاپۆ و بوومەلێڵ*» کە ئێستا وەکوو کتێبێک چاپ کراوە، بەرھەمی ئەو سەردەمەیە.

سوارە زیاد لە کوردی، زمانی فارسی و ئینگلیسی و عەرەبیشی دەزانی؛ تەنانەت بە فارسی شیعری جوانیشی داناوە؛ بەڵان ناوی سوارە بۆ زمان و وێژەی کورد، بەتایبەت لە ڕۆژھەڵاتدا، ھاوتای نوێخوازی و نوێکارییە. ڕاستە مامۆستا گۆران پێش سوارە لەم بوارەدا ھەنگاوی ناوە و قەڵەمی سواوە، بەڵام وەک گوتمان، ئەو و شێخ نووری، ھەستی نوێخوازییان، لە ژێر کارتێکەری ئەدەبی تورکدا گووراوە؛ کەچی سوارە چاوی لە شاعیرە نوێخوازەکانی فارس، بەتایبەت نیمایووشیج بووە و بەم بۆنەوە دەتوانین وەک دوو ڕێبازی تا ڕادەیەکی بەرچاو جیاواز، ئەو دوو شاعیرە نوێخوازە و شیعرەکانیان چاو لێ بکەین. لە سەرینەی ئەو خاڵە گرنگە، دەبێ ئاماژە بە تام و بەرامەی تایبەتی شیعری سوارە بکەین کە بەرھەمی ھەستی بەڕاستی ناسک و دەسەڵاتی کەموێنەی بەسەر وشەی کوردی و زەینی زۆر بەبڕشتی ئەوە، کە لە شیعری کلاسیک و نوێیدا خۆ دەنوێنن.

تا ئێستا ھەموو ھەر باسی شیعری سوارە بوو؛ ئەو بلیمەتە پەخشانیشی یەکجار جوان و ڕەوان و دڵبزوێنە. زۆر بەداخەوە تەمەنی یەکجار کورتی سوارە، مەودای نەدا کە ئێستا کتێبخانەی کورد، خاوەنی زۆر نموونە لە پەخشان و شیعری کلاسیک و نوێ ئەو شاعیر و نووسەرە ھەڵکەوتە بێ؛ ئەگەرچی ئەو کەمەش بۆخۆی دنیایەکە:

### کچی بەیان

من ئەڵێم: پەپوولەیەک فڕی بە باڵی سەوز و سوورەوە.
من ئەڵێم: گوڵێ بە دەم شنەی شەماڵەوە، بزەی بزووت.
تۆ ئەڵێی: چبوو؟ پەپوولەیەک فڕی!
یا نە، سوورەگوڵ، زەردە کەوتە لێوی ناسکی!
من ئەڵێم: ھەتا ھەتایە دەوری جوانییە.
ئەمڕۆ گەر ھەتاو کەسیرەیە و نەماوە ئاگر و گڕی،
مێرگی ئاسمان بە سووتمانی ھەوری لۆکەیی نەزۆک،
پڕ لە خاڵ و قۆپەنە،



جەنگەڵێ کە جێژوانی پۆلە پۆڕی بارەیە،
جێگە مۆڵی کەمتیار و گورگ و ڕێوییە،
شوورەیی کە بۆتە داری چاکی بێ نەشە و شنە،
زەلکە گەر تەیاری تیر و قۆشەنە،
خۆشەویستەکەم!
لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە،
چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە.
لە حەنجەرەی زەمانەوە،
گوێم لە زەمزەمەی زولاڵی خێزە وردەکانی کانییە.
باسی شەو مەکە! نە شایەری شەوم.
باسی خەو مەکە لە لای هومێدی فێرە سەرڕەوم!
بەو دەمەت کە بۆنی سەد بەهاری لێوە دێ،
بۆنی دەشتی بەختیاری باوەشی چیای
بە دەستی با، بە گوڵ چناوی لێوە دێ،
بۆنی سەر سەکۆی بە کاگڵی بە ئاو پژاوی لێوە دێ،
پێم مەڵێ کە داکەوم!
پێم مەڵێ کە ئاڵی شەو،
چاوی بێخەوی چڕە.
پێم مەڵێ شەو کڕە؛ چیا چڕە.
پێم مەڵێ: کوا گەڕانەوەی ئەوەی کە چوون؟
مەگری بۆ خەساری بێ گەڕانەوە!
ڕێگەمان، دوور و سەخت و قاقڕە.
خۆشەویستەکەم!
ئێمە نوێنەری خەباتی ڕۆژهەلات،
ڕۆژهەلاتی سووری ئاگرین؛
فێر نەبووین بەزین و دابەزین.
ڕانەهاتووە،
چاوی قارەمانی کورد، بە شەونمی گرین.

خۆشەویستەکەم!
لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە،
چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە.
لە حەنجەرەی زەمانەوە،
گوێم لە زەمزەمەی زوڵاڵی خیزە وردەکانی کانییە.

## هەڵۆ

(وەرگیراو لە هەڵۆی پووشکین و خانلەری و هەژار)

پـــاییزە، دار و دەوەن بــــێ بەرگــــە
دڵپەشـــۆکاوی خەیاڵــــی مەرگـــــە

هــەر گــەڵایێ کــە لــە داریێ دەوەریێ
نووســـراوێکە بـــە نـــاخۆشخـــەوەریێ

تــاو هــەناوی نییــە، وا مــات و پەشــێو
لەشــــی زامـــاری ئەکێـــشێتە نـــشێو

ڕۆژپــەڕە، ســاردە، کــزەی بــای زریــان
کاتــە بــۆ ژیــنی لــەدەسچــوو گریــان

دڵــی پــڕ بــوو لــە پــەژارە و لــە دڵــۆ
ژیــنی خــۆی هاتــەوە بــیر پیرەهەڵــۆ

بــە قــسە خۆشــە مەترســی مــردن
تاڵــە ئــەو هەســتی بــە مــردن کــردن

کــاتی کــۆچکردنــە، وەخــتی ســەفەرە
داخەکــەم ســەختی نــەمانم لــەبــەرە

تــۆ بــڵێی ئــەو خــەوە هەســتانی بــێ؟!
یانــە ئــەو قافــڵە وەســتانی بــێ؟!

تــۆ بــڵێی پاشــی نــەمان ژینــێ بــێ
بــۆ لەشــی ســاردەوە بــوو، تینــێ بــێ

شـــارەزای ڕێگـــەیی مـــردن کێیـــە؟
چییــە ئــەو مەنزڵــە، کوێنــەی جێیــە؟

پاشـــەڕۆکێکی بکـــەم لـــەو باخـــە
تــاکوو بــاڵ و پــەڕی مــن پــەرداخــە

نابمــە ڕێبــواری کــەلی هــات و نــەهات
چارەکــەم بەشــکوو ئــەوا هــات و نــەهات

خۆی بە خۆی گوت کە: دەچم بۆ لای قــەل
کەیخودای پیری بــەبــیری گــەل و مــەل

* *

هەڵــفڕی ڕاوکــەری زاڵــی کــەژ و کێــو
لــە چیــای بــەرزەوە، ڕووی کــردە نــشێو

کەوتە ئــەو دەشــتە لــە ترســا تــەق و ڕەو
دەرپەڕی «کوڕکوڕ» و کــڕ مایــەوە «کــەو»

هاتــە لای قــەل بــە کــزی و بێــوازی!
قـــەل وتی: «مامـــە هەڵـــۆ ناســـازی»!

وتی: قــــاڵاوە ڕەشـــــەی پــــسپۆڕم
پـــیرم و پـــێ لـــە لچـــانی گـــۆڕم

بـــاخی ژیـــنم بـــە خـــەزان ژاکـــاوە
کـــاتی مەرگـــە و ئەجـــەلیش ناکـــاوە

تـــۆ بـــڵێ چۆنـــە کـــە تـــۆ هـــەر لاوی
زۆر بــە ســاڵ پــیری بــەڵام چــا مــاوی

قــەل وتی: باشــە کــە گــوێ ڕادێــری پەنــدی مــن پــاکی بــە دڵ بــسپێری
ئەو دەمــەی بـابی بەهەشـتی مـن مـرد، دوور لە تـۆ، دەرد و بـەڵای ئێـوەی بـرد،
پێـــیوتم: ڕۆڵـــە! هـــەوای زار و نـــزار، هەیــەتی دەرد و نەخۆشــی بــە هــەزار
دیـــق و زەردۆیـــی و ئـــاهۆ و وەرهـــەم بە گژەی بـای بـە قـەوەت دێـن بەرهـەم
گۆشتی کەو چەنـدە کـە تامـدارە بـە نـاو هــەنگ و هــاڵاوێ، دەهەنوێتــە هــەناو
کــــەرە تۆپێــــو و کــــەلالی گوێلــــک، هەڵمی دڵ ڕوون کـەرەوەی سـەرگوێلک
پێکــەوە چینــە بکــەین لــەو پەینــە بــۆی ســەنێر مەڵــهەمی بــیر و زەینــە
پــەین و پاڵــێ کــە لــە پاڵــی دێیــە، مەنزڵـــی نۆکـــەری خـــۆتی لێیـــە
وردبــەوە چەنــدە بــە مانــا قووڵــە! مەســـەلە و گفـــتی قـــەلی ماقووڵـــە
بیکــە سەرمەشــقی ژیــان ئــەو ئیــشە هــەر لــەســەر داری نــەوی هەڵنیــشە

* *

هاتـــەوە بـــیری هەڵـــۆ ڕابـــردووی پـــاکی بووژانـــەوە یـــادی مـــردووی
گـــوڵ کـــرا ڕاخـــەر و پایەنـــدازم چەنــدە ئــاژوا لەشــی کێــو و ئــاوازم
چەنـــد ڕوانیمـــە زەوی لـــەو بانـــە کێو و دەشت، لەو سـەرەوە چەنـد جوانـە
چــەن چکۆلــەن پەلــەوەر لــەو بــەرزە ئـاخ کـە چـەن خوێـڕیگرە ئـەم عـەرزە!
چەنـــدە ڕاوی کـــەو و کـــەوبارم کـــرد دوژمـــــنی تـــاقمی شمقـــارم کـــرد
حەوتــەوانان بــۆ مــەدالێ شــەڕی مــن چەندە شۆڕاوە، بـە خـوێن، شـاپەڕی مـن
کۆلکەزێڕینـــە وەکـــوو تـــاقی زەفـــەر ئاسمـان بـۆ مـنی بەسـت کـاتی سـەفەر
ئێـــستە وا مـــن ڕەبـــەن و دامـــاوم مــن هەڵــۆ چــاو لــە دەمــی قــاڵاوم!
ســـاکە ئـــەو کـــارە وەهـــا ســـاکارە، مەرگـــە میـــوانی گـــەدا و خونکـــارە،
وتی: وا ژیــنی درێــژ پێــشکەشی خــۆت! گۆشتی مردارەوە بوو هەر بەشـی خـۆت!
ژیـــنی کـــورت و بـــە هەڵـــۆیی مـــردن نــەک پــەنا بــۆ قــەلی ڕووڕەش بــردن
لای هەڵـــۆی بەرزەفـــڕی بـــەرزەمـــژی «چۆن بژی شەرتە، نەوەک چەندە بـژی»[١]

غەزەلێکی فارسی، بۆ پیرۆزبایی ساڵەهاتی هاتنە دنیای دۆستێک:

این باد خوش که میوزد از سوی جویبار آرد پیـــام مقـــدم آن ســـرو گلعـــذار
شـاید کـه فخـر بـر همـه روز خداکنـد ایـن روز بیـست و شـش ز مـه دوم بهـار

---

١. ئەم لەتەبەیتە هی کاک ئەحمەدی موفتیزادەیە.

روزی خجسته، مطلع خورشید روی تو — فرخنده ساعتی ز وجود تو یادگار
دامان مادرت چو بهار است گل‌نشان — آری بهار معجزه‌گر دارد این نگار
درمانده‌ام چه هدیه کنم بر تولدت — گل چون فرستمت که توی نفس لاله‌زار
درویش تنگدست به شاه دیار حسن — جز جان بی‌بها چه تواند کند نثار
اردیبهشت همچو بهشت است دلفریب — میلاد حور من چو در او گشت برقرار
گر قامت کشیده‌ی تو جلوه‌ای کند — سر خم کند به سجده سهی سرو جویبار
در موسم بهار نه از عشق روی گل — از یمن مقدم تو فتد شور در هزار
باد صبا که از دم عیسی سبق برد — یکدم گذشت از بر آن زلف مشکبار
ای لاله‌روی، غالیه‌موی بهاربوی — صدها بهار شاد بزی، باش پایدار

## غەریبی

(نموونەیەک لە پەخشانی سوارە. داستانێکی *تاپۆ و بوومەلێڵ*)

«شەویان شوورەیی کردبوو، بە قسەی پڕوپووچ. هەندێ کوتبوویان کە بەیانی ڕاوی قەل و مراوی خۆشە و هەندێک لایەنگری ڕاوەکەروێشک بوون.

سەری شەو، هەندێ لە ڕەشاییەکان، یا لە سەرمای ماڵەکەیان ڕایان‌کردبوو، یا لە بۆڵەی خێزانیان لەبەر نەکڕینی کەل‌وپەل و لێنەکردنی زمهەری زستان و کەوتوویی مناڵەکەیان، لە ماڵ تاراندبوونی و ڕوویان کردبووە دیوەخانی ئاغا، یا گزیر دەنگی‌دابوون بەیانی بەفری سەربانی ئاغا بماڵن و هاتبوون بڵێن وەروەرەیان نییە، یا بپاڕێنەوە کە بەیانی ئەچن بۆ شار و منداڵەکەیان ئەبەن بۆ دەرمانگا. بەڵام پاش ماوەیەک، دێ دامرکابوو. دەنگی لوورەی گورگ و وەڕەی سەگ، تێکەڵ بە هووشەی بای ساردی زستان ببوو، کە بەفری لە کۆڵانەکان ڕائەپێچا و ئەیکرد بە گەردەلوول و چاڵ و قووڵی تێک‌ئەکردەوە.

سەرما وەک گیانی مردووی سەرگەردان، خشکەی ئەکرد بۆ کەلێن و قوژبنی ناو ماڵەکانی ئاوایی؛ بەڵام لە دیوەخانی ئاغا، کڵپەی سۆپە بە قەڵاشکاوی وشک، لەشی پیاوی خاو ئەکردەوە و مزگێنی خەوێکی خۆشی پێوە بوو. بەڵام شەو درێژ و عەوداڵ و بەتاڵ.

ئاغا لە پەنا سۆپەی گەرم و گوڕ، دانیشتووە. دەست و پێوەندی هەندێ بەپێوە و هەندێ لەسەر ئەژنۆ دانیشتوون. شەویلکەش گاهێ بە شەوچەلە و گاهێ بە قسەی پڕوپووچ ئەبزوێ. بێدەنگی هی ئەو کەسانەیە کە خەمیان هەیە.

سەری‌شەو دیتم کابرایەک وەک سێبەری هەورێک کە بۆ ماوەیەکی کورت پەڵەیەکی بۆر بخاتە سەر زەوی و تیژ تێپەڕێ، هاتە ناو دیوەخان؛ بەڵام کەس نە ڕووی‌تێکرد و نە تەنانەت زانی کە کەی هات و

چەندە وێستا و چۆن چووە دەرەوە.

من لە کۆڕی دیوەخانا وەک پینەیەکی ناحەز لەسەر بەرگێکی تازە، وەها بووم. نە قەت تفەنگێکم لە کەوێک تەقاندبوو، نە هەرگیز ڕاوی کەروێشکم دیتبوو، نە قسەی خۆشی وەهام ئەزانی ئاغای پێ بهێنمە گەشە. تەنیا ئەوەندەم لە دەس ئەهات لە گۆشەیەکا دانیشم و گوێ بدەمە ئەو قسانە کە هەموویان بە لامەوە بێبایەخ بوون.

لە دیوەخان هاتمە دەر و لە پێشخانە نیوە تاریکەکەیدا بە شوێن جێگایەکا چاوم گێڕا، چاوێکی لێ گەرم بکەم؛ کەچی چاوم بە هەیکەلێکی پەڕپووت کەوت کە هەر دوو ئەژنۆی لە باوەش گرتووە و سەری بە سەر باسکیا شۆڕ بۆتەوە. چرای گڕسۆزی پێشخانە ئەوەندە ڕووناکی نەبوو کە بیناسمەوە. بەڵام کاتێ کە منیش وەک ئەو لە تەنیشت سۆبەی دامرکاوی پێشخانەکەدا دانیشتم و باش سەرنجم دا، زانیم ئەو کەسەیە وا سەری‌شەو هاتە دیوەخان و زوو گەڕاوە. لام سەیر بوو کە بۆچ نەچۆتەوە ناو خێزانەکەی خۆی. هەر لەو بیرانەدا بووم کە لێی پرسیم: وادیارە خەڵکی ئێرە نیت؟

لەو ماوەیەدا سەبیلەیەکی تێکردبوو؛ مژی یەکەمی لێ دابوو. لە ژێر نووری ئاوری سەبیلەکەیا، ڕواڵەتیم هاتە بەرچاو. لە پەیکەری خودایانی یۆنانی کۆن ئەچوو. دەموچاوێکی زبری بەچین و گنجی ورد و درشت داپۆشراو، سەرگۆنای کەمێک قوت، گوپی تێک‌قوپاو، چەنەی پان و هەندێک هەڵتۆقیو.

کوتم: نا، من ئێرەیی نیم. بەڵام تۆ چی؟ تۆش غەریبەی؟

مژێکی تری لە سەبیلەکەی دا و دووکەڵ وەک ئەژدیها ـ بە جینگڵ دان ـ بەرەو تاریکایی میچی هۆدەکە کشا.

ـ نە، من خەڵکی هیچ شوێنێک نیم. لە هەموو لایەک غەریبەم. تەنانەت لە ناو خێزانەکەی خۆشما غەریبەم. پیرۆز پێم ئەڵێ: تۆ دەستەوەستان و بێکارەی! هێشتا تێنەگەیشتووە چارەنووس یانی چی!

بیرم کردەوە ئەم چارەنووسە، ئەم ئاسمان تاوانبار کردنە، گاهێ چەندە سوکنایی ئەدا بە دڵی خەمبار.

پرسیم: پیرۆز خێزانتە؟

کوتی: بەڵێ، پیاو بێ ژن ناحەوێتەوە؛ ئەگەر هاوسەرێکیش پەیدا ئەکا، ئەمەیە ئاکامی. لای وایە من خوام! نەخۆشی و ساغی منداڵەکەمان بە دەس منە! خوا ئەزانێ کاتێ ئەو کۆرپە ساوایە، بەدەم تاوتێوە ئەناڵێنێ، من ئەبم بە برێشکەی سەر سێڵ. ئاخر ئەو بەستەزمانە تەمەنی دوو ساڵە و بەرگەی نەخۆشی ناگرێ.

پرسیم: دەی جا بۆ هەڵناسی و بچیەوە بۆ لای؟!

بە تاڵێکەوە کوتی: چیم لە دەس دێ؟ ئاغا کردوویەتە سەرم بەیانی باراشی بۆ بەرمە ئاش. زمهەری زستانی ئاغا تا لێ‌ئەکرێ و تەواو ئەبێ، دە ڕۆژی پێ دەچێ و من ئەبێ ئەو ماوەیە لە لای باراشەکان بمێنمەوە. هاتم بە ئاغا بڵێم کەسێکی‌تر بنێرێ، بەڵام دیتم لە هۆدەی گەرما کە باسی ڕاو و ڕابواردنە،



چۆن ئەتوانم باسی سەرما و نەخۆشی بکەم؟ بەڵێ، من غەریبم. لە هەموو لایەک. تەنانەت لە ئاوایییەکەی خۆشما؛ لە ناو خێزانەکەما و لە ناو بەرگە شڕەکانیشما!

قاقای کۆڕی دیواخان و لۆرەی گورگی بیابان و گژەی بای زستان بە یەکەوە بەرز بوونەوە و تێکەڵ بوون. سەرم سووڕا. ڕق و توانج و تووک، بە قووڵترین ناخی دڵما گەڕا. بەڵام ... بەڵام چیم لە دەس ئەهات؟ هەر وەک ئەو پیاوە چی لە دەس نەدەهات بۆ تیماری کۆرپەکەی.

هەستم کرد ئەوەندە بێهێزم، ئەوەندە هیوا بڕاوم کە هاکا بڕوا بە چارەنووس بە سەرما زاڵ بێ.

هەردوو ئەژنۆم گرتە باوەش. خەو لە چاوم تارا و خەم خۆی خزاندە ناو ناخی دڵمەوە. سەرم بەسەر ئەژنۆما شۆڕ کردەوە و چاوم نایە سەر یەک و وامزانی لەماڵی سارد و سڕی کابرا دانیشتووم.

کۆرپەیەکی نەخۆش لەشی شلک و بێهێزی لە ئاوری یاوا ئەسووتا. تەنانەت هێزی گریانیشی نەمابوو؛ بەڵام ئەینالاند و هەر ناڵەیەکی ئایەتێکی خوایی بوو کە نوێژی ترسی هەڵئەگرت. دایکی وەک ئاسکێ کە لە دەس ڕاوچی ڕای‌کردبێ، نیگای پڕ بوو لە ترس و دوودڵی. چاوێکی لە چەپەری شڕی ناو ماڵەکە بوو کە مێردەکەی لە دیوەخان بگەڕێتەوە و چاوەکەی تری، پاسەوانیی نەخۆشە بچووکە بێتاوانەکەی ئەکرد. هەر نیگایەکی توانجێک بوو بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد.

سەرم بەرز کردەوە؛ کابرا نەمابوو. هەر وەک بێخشپە هاتبوو، بێچرپەش ڕۆیشتبوو. ڕاستی ئەکرد، ئەو لە هەموو شوێنێک غەریب بوو. بەڵام بەو چەن قسەیە، منیشی کردبوو بە هاوسەفەری خۆی. سەفەری هەرێمی غەریبی.

هەستم کرد کۆڕی دیواخان بێدەنگە. خەوی بەربەیان لە هۆدەی گەرما کاری خۆی کردبوو. بەڵام من غەریب بووم. تەنانەت لە ناو بەرگەکانی خۆشما. ئەوبەیانەش کە خەریک بوو لە سنووری ئەو ڕۆژەوە دەرئەکەوت، غەریبی لێ ئەباری.

*خەوەبەردینە. تاپۆ و بوومەلێڵ*. یاداشتەکانی نووسەر.

## تەوفیق وەردی

موحەممەد تەوفیق وەردی، لە نووسەرانی ئاگا و هێژای کوردە کە گوتار و نووسراوەی زۆری لە ڕۆژنامە و گۆڤاراندا، بە کوردی و عەرەبی بڵاو کردۆتەوە و چەند کتێبی بایەخداری لەمەڕ زبان و وێژە و مێژووی کوردەوە لێ چاپ کراوە؛ کە هێندێکیان بریتین لە:

١. *چوونی بارزانیانی قارەمان بۆ یەکیەتی سۆفیەت*
٢. *خانزاد و لەشکەری*
٣. *دەرسێک لە جوغرافیای کوردستان*

٤. *سەرەتایێک لە مێژووی کورد*

٥. *شۆڕشێ چواردەی تەمووز*

٦. *فولکلۆری کوردی*

٧. *مامەیارەی قارەمان*

تەوفێق وەردی ساڵی ١٣٩٦ ک. م. کۆچی دوایی کردووە

**نموونەیەک لە شیعری**:

زڕەی زەنجیری ناو بەندیخانە — بۆ ئێمە لە جێی عوود و کەمانە

هەر حەڵقەییکی لەیەکخراوی — لە جێی مەداڵە و نیشانی شانە

خشتی بناغەی کۆشکی ئازادی — لە لەشی سووری فیداکارنە

نەقش و نیگاری دیوارەکانی — کفکفەی خوێنی گەشی ئەوانە

ئەگەر دوسەدجار من بدەن لە دار — ڕێگام هەر ڕێگەی تێکۆشەرانە

ئەگەر بمرم و زیندوو ببمەوە — ڕێگەی گرتوومە هەر ئەیگرمەوە

مێژوو، د.کەمال مەزهەر، ل ٢٣٠، دەق و پراوێز.

## سلێمانخانی کەمانگەر

کوڕی میرزا عەلیخان «شُجاعُ‌الممالک»، کوڕی حاجیئاغا مەحموودخان «نظامُ‌الممالک»، کوڕی بارامبەگ، لە بنەماڵەی ناسراوی کەمانگەرە کە ساڵی ١٣٢٦ ک. م. لە گوندی «ماراو»، لە باشووری کامیاران هاتە دنیا. هێشتا سێساڵان بوو بابی گواستیەوە «کۆرەدەرە» لە سێ فرسەقی باکووری ماراواو و پێش هەموو شتێ مزگەوت و مەدرەسەیەکی تێدا کردەوە و مامۆستایەکی بۆ دەرس‌گوتنەوە و بەرنوێژی، بۆ بانگ کرد و دوو حوجرەشی بۆ فەقێیان جوێ کردەوە.

زۆری پێ ناچێ چەند فەقێی هێژا بۆ خوێندن ڕووئەکەنە ئەوێ و سلێمانیش لەگەڵیان خوێندن دەسپێدەکا و بە هۆی هۆش و زیرەکی خۆی و چاوەدێری بابی ڕێزدارییەوە، زۆر زوو سەوادی دەکرێتەوە و بە وازێکی زۆرەوە، شان لە خوێندنەوە و فێر بوون شلئەکا.

بەو بۆنەوە کە «شجاع الممالک» لە بنەماڵەیەکی ناودار و بۆخۆشی مرۆیەکی جوامێر و میواندۆست بووە، لە هەموو چینێک بۆ کۆرەدەرە ڕۆیشتوون و میوانخانەیان هەمیشە میوانی زۆری لێکەوتووە و کەسانی زانا و وێژەوان و شیعرزانیشیان تێدا هەڵکەوتووە. سلێمان ڕۆژانی بە ڕاو و سواری و تیرهاوێژییەوە ڕابواردووە و شەوان لە خزمەتی میوانانی خوێندەواریاندا بەهرەی بردووە؛ وا کە لە تەمەنی بیستساڵاندا، لاوێکی لە هەموو بابەتێکەوە شیاو بارهاتووە.

سلێمان‌خان خاوەن بیرێکی تیژ بوو. کاتی تەنهایی، زۆرتر کتێبانی دەخوێندەوە. زۆر کەم‌قسە بوو؛ بەڵام ئەگەر ئەهاتە ئاخافتن، ڕەوان و گونجاو قسەی دەکرد. شیعر و پەخشانی فارسی جوان دەنووسی؛ ئەگەرچی کەمتر بە لای شیعردا دەچوو.

ساڵی ١٣١٧ ک. هـ. (١٩٣٨ ز.)، بە بۆنەی شێوانی بارودۆخی دێهات و زۆربێژی جەندرمە و ... دەستی لە گوندنشینی بەردا و چووە کرماشان و لە مەزرینگەی داراییدا دامەزرا و ماوەیەک لە کرند و پاوە و قەسری‌شیرین، بەرپرسی ئەو ئیدارە بوو.

سلێمانی بەهرامی کەمانگەر ئەگەرچی ماڵ و سامانێکی کۆ نەکردەوە و کاتێ کە لە دنیا چوو، کرانشینی دەکرد -وەک دابی بنەماڵەیانە- لە کرماشانیش ماڵی میوانی لێ نەدەبڕا. خوای لێ خۆش بێ، مرۆیەکی لەسەرخۆ، بەمشوور و دیندار بوو؛ نوێژ و ڕۆژووی نەدەفەوتا. دەسنوێژ گرتنی یەکجار بۆ خۆی دژوار دەکردەوە و دەگەیشتە ڕادەی وەسواس. جۆزەردانی ساڵی ١٣٥٦ ک. هـ. (١٣٩٧ ک. م. ١٩٧٧ ز.) لە کرماشان بە نەخۆشی شێرپەنجە، لە دنیا دەرچوو. تەرمەکەیان بە ڕێزێکی زۆرە بردەوە ماراو و لە زیارەتانی بنەماڵەیاندا ناشتیان.

**چەند شیعری«سلێمان»**:

لە شێواوی دەروون یەکسەر پەشێوە تەرزی گوفتارم
لەبەر ئەندووهی بێ‌سامان لە سامان ماوە ڕەفتارم

من و فیکری ویساڵی تۆ، ئەتۆ قەسدی فیراقی من
دەسا لەم جەمع و تەفریقە چ حاسڵ بێتە ڕێوارم؟

ئەگەرچی بولبولی گوڵزاری حوسنی تۆ هەزارانە
وەلێ گیانا لە نێواندا هەزار ئەر بێ منی زارم

لە بەزمی وەسڵدا دایم ڕەقیب مەدهۆشی دیدارە
لە کونجی میحنەت و غەمدا منیش مەنقووشی دیوارم

«معاذالله» لە نێشی خنجەری موژگان بناڵێنم
بە شەفقەت گەر بکا ئەو نەرگسەی بیمارە تیمارم

لە ئیقلیمی مەحەببەتدا کە تۆی سولتانی مەحبووبان
لە جەوری غەم خیلافی عەدڵە وا من بەرزە هاوارم

نگینی عیشقی تۆم ئەمڕۆ لە دەس دا وەک «سلێمان» من
ڕەقیبی دێو سفەت ئاخر لە پەی دابوو بە ئازارم

ئەم شیعرانەی سلێمان‌خان لەسەر داوای یەک لە خزمانی بە ناوی «فارس‌بەگ»، کە ماشۆقەکەی

«زەریفە»، لە گوندی «تەختەزەنگی»، جوانەمەرگ بووە، بە گۆرانی دایناوە:

هامـــسەران! فریـــاد، هامـــسەران! فریـــاد  فریـــادەن جـــە دەس چـــەرخ بـــێبنیـــاد
کـــێ جـــە جـــەور ئـــەو فارغـــەن وە شـــاد  کـــێ بـــۆ جـــە زوڵـــمش بمـــانۆ ئـــازاد
کـــێ چـــەنی دڵـــەی پـــڕ دەرد و غـــەمناک  وە تـــیر قـــەهرش نـــەڕێزا وە خـــاک
کێ بـۆ خەرقـەی دەرد ئـەوش نەپۆشـان  کێ بـۆ بـادەی مـەرگ ئـەوش نەنۆشـان
عالـــەم جـــە دەســـتش نـــاڵان و زارەن  مەئیوس جە حەیات، جە گیـان بێـزارەن
تیپـــێ زەنجـــیرەن وە قەیـــد خـــەمان  تیپـــێ غەریقـــەن نـــە بـــەحر حرمـــان
تیپـــێ ســـەرگەردان خودعـــەبازیـــشەن  تیپـــێ پەرێـــشان شـــێوەسازیـــشەن
تیپـــێ نـــە ماتـــەم هیجـــران یـــارەن  تیپـــێ نـــە شـــیوەن کـــۆچ دڵـــدارەن
تیپـــێ جـــە فـــیراق ئـــایر وە جـــەرگن  جـــــە نـــــامورادی ڕازی و مـــــەرگن
فەڵەک! چێش کەرۆن جـە بـێوەفاییـت  کام گـڵ وەسـەر کـەم جـە بەدئـەداییت
مـن کـە سـەرگەردان سـارا و دوجـەیلم  ســـــیاپۆش بـــــەرگ فـــــیراق لـــــەیلم
دڵ وە قرچـــەی ئـــێش زام ســـەختەوە  تەن گیرۆدەی دەس شـوومی بـەختـەوە
مـــــەرگ نـــــازاران وە ڕێم ئـــــاوەردی  گـــــڕەی نـــــایرەی دڵ تازەکـــــەردی
یـــەکێ جـــە ئـــەوان یـــاران هامـــدەم  «زەریف»ەن دیتان مەرگش دیم وە چـەم
زەخـم نەسـرفتەی دڵـەی پـڕ جـە دەرد  کۆچ بـێوادەی «زەریـف» تـازەش کـەرد
دریـغ ئـەو بـاڵا، ئـەو شـێوە، ئـەو ڕەنـگ  ئەو زوڵفان، ئەو خاڵ، شی وەژێـر سـەنگ
دریـــغ ئـــەو بـــەدەن ســـیم زەڕعـــەیار  توعمـــەی مـــۆران بـــۆ یـــا خـــوراک مـــار
سـەد حـەیفم پـەری نەرگـسان مەسـت  ئەفسوس پەی ئەو قۆڵ، ئەو بازوو، ئەو دەست
ئـــەو خـــدین ئـــاڵ، شـــەمع شـــوعلە بێـــز  ئـــەو لـــە بـــان لـــەعل، شـــەد شـــەکەرڕێز
ئـــەو عیقـــد عـــەقیق مـــورواری ئـــاگین  ئـەو سـاق ئـەو گـەردەن سـاف بلـۆرین
ئـــەو تـــەرز قامـــەت ســـەرو و ســـنەوبەر  ناگـــا بـــێخەبـــەر گـــۆڕ گرتـــەش نەبـــەر
نمـــەز کـــێ ســـەرخێل نەونـــەهاڵان بـــۆ  کـــێ وە پێـــشاهەنگ چـــەم غـــەزاڵان بـــۆ
کـــێ جیلـــوە بـــدۆ نـــە حەڵـــقەی ســـەما  چو ئەو تەور، ئەو تەرح، ئەو قەد، ئـەو بـاڵا
کێ جـە دمـای ئـەو، ئـەو تـەرلان تـەڕاڕ  نـــە کۆســـار تـــەن دڵ کـــەرۆ شـــکار
گـــــوڵان وەهـــــار جـــــە وەفـــــاداری  پەی مەرگش یەک یەک مەکـەرەن زاری
نەسرین پەی دیـدەش ئەسـرین مـەڕێزۆ  نـــە جـــەرگ خونچـــە هونـــاو مـــەخێزۆ
جە دمای ئـەو خـۆش شـیرین شـەمایل  مەســـلحەت ئێـــدەن بنیـــشم وە گـــڵ

فەڵەک جە «ماراو» زەخمی نە دڵ بەرد
نە «تەختەزەنگی» نمەک ڕێزش کەرد
هیچ‌کەس وە پەیمان فەڵەک شاد نەبۆ
کەس پشتگەرم وە چەرخ بێ‌بنیاد نەبۆ
دەک فەڵەک چون من بەختت وە قیر بۆ
تیر ئاهـ من نە جەرگت گیر بۆ

**غەزەلێکی فارسی**:

این چه دردی است حریفان که دل از وی خون شد
دامن عیش ز سیلاب غمش جیحون شد
کاخ امید فروریخت ز بیداد جفا
خیمه‌ی صبر ز باد ستمش وارون شد
تیر آه است که از بخت سیه شب انگیخت
به درون خسته جگر مشعله‌ی کانون شد
یا سواد رقم ناسخ پیمان نگار
مر مرا خط سیه‌روزی روزافزون شد
بوی حرمان مگر از نوفل کوشش بشنید
شیفته قیس خردباز سوی هامون شد
باز زال فلك افسانه‌ی یأس آمد، کز
خون فرهاد دلم جامه به تن گلگون شد
به دل چرخ کهن کین من از نو جا کرد
یا جوان یار مرا مهر ز سر بیرون شد
طالع شوم نگر کز اثراتش یك دم
این سه احوال پدید از حیل گردون شد
بیخ شادی من و عهد صنم، قلب رقیب
بگسست و بشکست و ز شعف مشحون شد
مرد از این غصه «سلیمان» و دریغا نشنید
پاسخی زان بت کان خو زچه دیگرگون شد؟

**چوارینە**:

دل آینه از بهر تماشای تو باشد
زان رو همه دم مظهر سیمای تو باشد
و ان خال سیه نیز که خوانند سویداش
داغی است که بنهاده ز سودای تو باشد

* * *

ساقی! هوس باده به سر شور افکند
وز رخ صنم ساده به دل نور افکند
برخیز و بط جام به کف نه زان پیش
کاین زاغ شب آن بیضه‌ی کافور افکند

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## میهی «بَدیعُ‌الزمانی»

هەڵکەوتەی گۆڕەپانی عیرفانی ڕاستەقانی، مامۆستای هێژای زبان و وێژەوانی، عەبدولحەمیدی «بدیع‌الزّمانی»، کەسناو «ئەبووعەبدوڵلا» و سەرناو «مەجدەدین»، ناوی «عەبدولحەمید»، یەک لە کەڵەپیاوانی هەڵکەوتەیە کە ساڵانی ساڵ خزمەتی فەرهەنگی و ئایینی کرد؛ بە تێکۆشانی بێ‌وچان، زۆر کتێبانی بایەخداری نووسی و زانایانی گەورەی بارهێنا.

لە سەرەتای خوێندنیدا ـکە زیرەکی و لێهاتووییەکی یەکجاری لە خۆیەوە نیشان داـ ناوی



«بديع‌الكُتّاب»یان لێ نا و پاشان «بديع‌الزّمان»، یان بە کورتی «بديع»یان پێ گوت. لە ساڵی ١٣٠٥ تا ١٣٢٤ ک. هـ. ناوی بنەماڵەیی، «مِهی فَرَّهی» بوو؛ لە شیعریشدا نازناوی «مِهی» دەنووسی. لەو ساڵە بەدواوە، نـاوی خۆی کردە «بديع الزّمانی».

بابی عەبدولمەجید، «مجدالممالک فرهی»، نازناو «مجدت»، کوڕی میرزا شوکروڵا «فَخرُالکُتّاب»، کـوڕی میرزا عەبدوڵلا خەتات، نازناو «عیرفان»، کوڕی میرزا جەعفەری خەتاتی سنەییيە.

بەدیع لە ڕۆژی پێنجەمی مانگی زیقەعدەی ساڵی ١٣٢٢ ک. م. (١٩٠٤ ز.) لە شاری سنە هاتە دنیـا. منداڵ بوو باوک و دایکی لێک جیا بوونەوە. باب چوو بۆ تاران و دایکیش مێـردی کـرد. بـەم شـێوە ئـەو منداڵە مەزبووتە، زۆر زوو تاڵ و سوێری ژیانی چێشت. بەکورتی، کە پێدەگا دەچێتە مەکتەب و سـەرەتا لە مەکتەبخانەی مەلا کەریمی جەناب (دەبیر) و پـاش ئـەوە لـە مەکتـەبی حـاجی بـاقر و ئـەوجار لـە مەدرەسەی «ئیتیحاد» و جا لە قوتابخانەی «ئەحمەدییە» خوێندوویە. ماوەیەکیش بۆ مەدرەسەی کلدانی «ئالیانس»ی سنە یان ناردووە و لەم دووی ئاخرەدا تا ڕادەیەک زبانی فەڕانسەش فێر بـووە. ئـەوجار ڕووی کردۆتە خوێندنی ئایینی و پاش فێربوونی وانە سەرەتاییەکان و گەشانەوەی هزری ورد و بیری تیژی، لە خزمەتی عارف و زانای پارسا، مەلا موحەممەدی مودەڕڕیس، کوڕی مەلا عارف، کوڕی عەللامـە مـەولانا ئەحمەدی نۆدشیدا، چەند کتێبی سەرف و نـەحو و مـەنتیق و فیقهــ و مـەعانی و بـەیان و تەفـسیری بەیزاوی خوێندووە. بە هاتنی شێخ حەبیبوڵلای کاشتەری بۆ سنە، چۆتە خزمەتی و خوێنـدنی کتێبـانی ویژە و زاراوەی حەدیس و تەفسیر و فەرائیز و «*شرح منهج*» و چەند بەش لە «*تُحفه*»ی شێخ ئیبنوحەجـەر و پاژگەلێکی «*اَغانی*» ئەبولفەرەجی ئەسفەهانی و «*وَفیاتُ‌الاعیان*»ی ئیبنوخەلیکان و «*مقامات*»ی حـەریری و «*مقامات*»ی هەمەدانی خوێندووە و لەبەرکردووە. بە شوێنیدا ماوەیەکیش لای فـەقیهی شـارەزا، مـەلا عەبدولعـەزیمی موجتەهیـد چـووە و چەنـد بـەش لـە «*تُحفـه*» و تەفـسیری «*روحُ‌المعـانی*» ئالووسـی و «*تَهذیبُ‌الکلام*» و «*جمعُ‌الجوامع*»ی خوێندووە.

بەدیع پاش دەرس‌ودەور، سەرەتێک لە دیوانی حوکمـەتی کوردسـتان کـار دەکـا و دوو ساڵـیش لـە ڕوانسەر دەبێتە مامۆستای منداڵانی عەباس‌خانی سەردار ڕەشیدی ئەردەڵانی. ساڵـی ١٣٠٨ (١٩٢٩ ز.) ئەچێتە وەزارەتی پەروەردە و ساڵی ١٣١٢ (١٩٣٣ ز.) ئەینێرنە کرماشان و لەو شـارە ئەبێتـە مامۆسـتای دواناوەندی مەدرەسەی چەکداری. ساڵی ١٣١٩ (١٩٤٠ ز.) ئەخرێتـە ناوەنـدی کارگێـڕی ئەرتـەش لـە تاران. ساڵێک لەودوا لە ئەرتەش ئەچێتە دەر و چەند ساڵـێک لـە بلاڤـۆکان دەنووسـێ و هـەروەها لـە باڵوێزخانەی دەوڵەتی سوعوودی لە تاران، کاری وەرگێڕان دەکا. سەرەتای ساڵی ١٣٢١ ک. هـ. )١٩٤٢) دیسان ئەگەڕێتەوە پەروەردە و لە چەنـد قوتابخانـەی وەک دارولفونـوون و ئەمیرکـەبیر و گەوهەرشـاد، ئەبێتە مامۆستا و سەرەنجام ساڵی ١٣٤٢ (١٩٦٣ ز.)، لەسەر داخوازی خۆی، کارکنار دەبێ. ئەڵـبەت لـە

ساڵی ١٣٣٥ بەولاوە، ئەبێتە مامۆستا لە زانستگای تاران و دوایـی لـە دەورەی دوکتـوری ئـەو زانـستگایە دەرس ئەیژێتەوە.

دێتە بیرم ئەو کاتەی منداڵێکی شەش-حەوت ساڵان بـووم، بـەدیع هـەموو ڕۆژێـک بـۆ خوێنـدن و وتوویژ، ئەهاتە لای بابم. ساڵێ-دوان لەودوا کە خوێندنم دەسپێکرد، ئـەو لـە حـوجرەی مزگـەوتێکی نزیک بە ماڵی ئێمە، قوتابخانەیەکی دانابوو؛ شەش-حـەوت منـداڵ لەسـەر داوای باوکانیـان، بـەیانیان ئەچوونە خزمەتی و ئەو دەرسی پێ دەگوتن. یەک لەوانە مـن بـووم. هەرچەنـد ئـەو دەرس و کەلاسـە، ساڵێک زیاتری نەکێشا و مامۆستا شوێنی کارێکیتری گرت؛ بەڵام هـەر لـەو مـاوە کورتـەدا، ئەگـەرچی منداڵیش بووم، تا ڕادەیەک بە پلەی بەرزی کەسایەتیم زانی. دواجار کە لە کرماشان و پاشان تاران بـوو، هەموو جارێک -کە بۆ ئەو شارانە دەچووم- خزمەتی دەگەیشتم و بەشی خۆم، لە کەسـایەتی و زانـستی بەرز و پڕپیتی بەهرەم دەبرد. بەڕاستی بلیمەتی دەورانی خۆی بوو؛ لە هەموو بارێکـەوە پـاک و خـاوێن؛ ئیمانێکی پتەو، پارسا و دوورەپەرێز، خێرخواز و میهرەبان، بەو هەموو هێژاییەوە، بێمبالات بە دنیا و نـاو و ناوبانگ، بەدوور لە خۆبینی و خۆنوێنی، بێزار لە مەقام و دەسەڵات، یەکجار بەئەمەگ.

مامۆستا کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو. هەر کتێبێکـی تـازەی دەسـەند، سـەرلەبەر دەیخوێنـدەوە و زۆرتر بەو خەتە جوانەی، پەراوێزی لێ دەنووسی. چەند نووسراوەی بایەخداریشی هەیـە کـە تـا بۆخـۆی هەبوو، بۆ چاپیان حەولێکی نەدا. هێندێکیان بریتین لە:

١. «*تصحیح مجمل التواریخ و القصص*»، کە لە گۆڤاری «*گوهَر*»دا چاپ کرا

٢.پەراوێز لە کتێبی «*التَّوسُّل الی التَّرسُّل*»

٣. حاشیە بۆ «*قاموس فیروزآبادی*»

٤. پاشکۆیەک بۆ مێژووی «*وَفَیاتُ الأعیان*»، قازی ئیبنوخەلیکان

٥. «*مخزنُ الادب*»

٦. «*نُخبُ الادب*»

٧. «*معیارالقریض*»، لە عەرووزدا، بە فارسی

٨. شەرحی قەسیدەی «*بانت سُعاد*»

٩. «*بدائع الفوائد*»

١٠. «*موائدالفوائد*»

١١. دیوانی شیعر، فارسی و عەرەبی

ئەو ڕەوانشادە سەرەتای ساڵی ١٣٥٦ ک. هـ. (١٩٧٧ ز.) نەخۆشکەوت و پاش چەنـد مانـگ، شـەوی هەینی، پێنجەمی خەزەڵوەر، گیانی پاکی بە خودای تـاک ئـەسـپارد. تـاقمێکی زۆر لـە شـاگردەکانی،

تەرمەکەیان بەوپەڕی ڕێزەوە بەڕێ کرد و لە زیارەتانی «بهشت زهرا»ی تاراندا ناشتیان.

شادەمێژووی کۆچی دوایی میهی، لە شادڕەوان جەلالی هومایی:

| | |
|---|---|
| چـون بـدیع ایـن زمـان عبدالحمیـد اوسـتاد | آن که در فن ادب بُد «صاحب» و «ابـن‌العمیـد» |
| در زبـان و شـعر تـازی پایـه‌دار و مایـه‌ور | با ذکای طبـع و حفـظ سـالم و قـول سـدید |
| زین جهان فـانی انـدر جنَّـت بـاقی شـتافت | با ضمیر پاک و قلب روشـن و روی سـپید، |
| سال فوت او «سنا» بر هجری شمسی نوشت | «خیمه بر ملک بقا زد زیـن جهـان عبدالحمیـد» |

مامۆستا ئەحمەدی مەهدەوی دامغانی ـ کـە وەک خـۆی دەڵـێ، مـاوەی ٣٠ ساڵـی بـەردەوام لـە خزمەتی بەهرەمەند بووە ـ لە یادنامەکەیدا وای نووسیوە:

«بدیع‌الزمانی از حسنات دهر و برکات عصر بود؛ در حد اعـلای شـرف و دینـداری و تقـوی و نجابـت و سلامت نفس و سماحَت ذات و ظرافت طبع و لطافت ذوق و عُلُوّ روح و سعه‌ی صـدر و صـفا و سـادگی و فروتنی و بردباری. بسیار دین‌باور و با اخلاص کامل به مبـانی و معتقـدات مـذهبی دل بـسته و پـای‌بنـد و بـه آداب و اخلاق اسلامی متأدّب و متخلق. از رفتار و گفتارش خشوع ایمان و خضوع بـه مـذهب و تعـشق بـه حضرت ختمی مرتبت صلی‌الله‌علیه‌وآله‌وسلم مشهود بود. در عمل مستحباتش ترک نمی‌شد؛ تا چه رسد بـه فرائض. از لحاظ اصول اعتقـادی تـابع امـام ابوالحـسن اشـعری و از لحـاظ فـروع پیـرو امـام محمـد شـافعی رضوان‌الله علیهما بود و خدا را به شهادت می‌گیرم که در محبـت اهـل بیـت صـلوات‌الله‌علـیهم‌اجمعـین نیـز صادق بود. آن چنان عواطف رقیق و احساسات لطیفی در قلب صافی و سینه‌ی بی‌کینه‌ی او جایداشت و بـه اصطلاح اشکش در آستین بود که هر وقت ـ خواه در حین افاده و تدریس و یا در هنگام مذاکره و محاضره ـ بـه آیـه‌ای از آیـات مبارکـات وعـده و وعیـد یـا روایتـی کـه حـاکی از سـیره‌ی مرضـیه‌ی رسـول اکـرم صلی‌الله‌علیه‌وسلم یا بزرگان دین و مشایخ متصوفه بود و یا حتی به شـعر لطیفـی مـی‌رسـید، اشـکش جـاری می‌شد. مرحوم بدیع‌الزمانی از آن رو که به طوری مرتب و درسـت و منطبـق بـا سـنت متّبـع و معهـود درس خوانده بود، در کلیه‌ی علوم اسلامی از فقه و تفسیر و حدیث و رجال و اصول فقه و کلام و فلسفه و عرفـان وارد و متفنن و در حدیث و خصوصاً «غریب‌الحدیث» متبحر بـود و در ادب عـرب و مباحـث آن عمومـاً از صرف و نحو و معانی و بیان و عروض استاد مسلم و در لغت و نقدالشعر و معرفـت غریـب‌الآثـار (از شـعر و حدیث) بی‌هیچ مبالغه وحید عصر و فرید زمان و از ائمه‌ی بلامنازع و بی‌همتای آن بـود. نـه فقـط در ایـران، بلکه در سرتاسر عالم وسیع اسلام کم‌نظیر و شاید بی‌بدیل بود. او از نظراء و اقران ادبا و استادانی چـون شـیخ محمد امین و شیخ محمود شنقیطی و سید بن علی مرصفی و شیخ احمـد محمـد شـاکر و عبـدالعزیز میمنـی راجکوتی و شیخ محمد رضا شبیبی و شیخ عبدالقادر مغربی و حسن حسنی عبدالوهاب و عبدالسلام هـارون و ادیب نیشابوری بزرگ (شیخ عبدالجواد متوفی به سال۱۳۰۴ش) رحمه‌الله علیهم اجمعین به شمار می‌رفت.

علاوه بر این فضایل، آن مرحوم خطی خوش داشت که نستعلیقش به پر طاووس و نسخش بر عارض عروس طعنه می‌زد.

این بنده قریب سی‌سال مستمراً ریزه‌خوار خوان علم و فضل آن بزرگوار بودم و وقتی که به سعادت درک محضر پربرکت ایشان نایل شدم، یک دوره سطح و ادبیات عرب را خوانده و مُغنی ابن‌هشام و مطوّل تفتازانی را در خدمت استادی مانند مرحوم شیخ محمد تقی ادیب نیشابوری کوچک (متوفی به سال ۱۳۹۶ق) تلمذ کرده بودم و از خرمن بزرگانی چون مرحوم مبرور علامه‌ی قزوینی قدس‌سره و مرحومان فاضل تونی و بهمنیار و تدین و فروزانفر رحمهم‌الله تعالی به قدر استعداد خود خوشه‌چینی کرده بودم؛ اما همین که به حضور استاد بدیع‌الزمانی رحمه‌الله علیه رسیدم، دیدم که گویا شاعر وصف‌الحال مرا سروده که:

آفاق را گر دیده‌ام مهر بُتان ورزیده‌ام	بسیار خوبان دیده‌ام، اما تو چیز دیگری

قطع‌نظر از مقام معلوم و مکان محمود او در علم و «ملائی»، از لحاظ انسانی مرحوم بدیع‌الزمانی در حد اعلای کمال نفسانی و فضیلت روحانی و ورع و وارستگی بود. با آنکه همواره گردآلود فقر بوود، هیچ‌گاه آبروی فقر و قناعت را نبرد؛ زیرا که همت والایش او را از اینکه به آب چشمه خورشید دامن تر کند، مستغنی و مترفع می‌داشت و با استغنا و قدرت، دردهای نهان را تحمل می‌فرمود و آهی نمی‌کشید. همه‌ی اهل نظر و اطلاع بر عربیت می‌دانند چه حق معنوی عظیمی از او ضایع شد با این حال ابداً نشنیدم که از کسی غیبت و عیبجویی و تنقیصی کند و یا بر مقام و منصب زودگذر و عناوین اداری و یا مال و منال کسی العیاذبالله حسد برد؛ بلکه همواره با آرامش و طمأنینه می‌فرمود: اللهمّ رضنی بما قسَمْت لی یا ارحَمَ الرّاحمین. اگر بگویم مرحوم بدیع‌الزمانی کاملاً به مقام رضا که به قولی نهایت مقامات و به قولی از مقامات نهایی سلوک است واصل شده بود، گزافه نباشد. همواره دل و زبانی شاکر و ذاکر داشت...»

دوکتور مەحموودی ئەنوار، مامۆستای زانستگای تاران و یەکێ‌تر لە شاگردەکانی، هەر لەو یادنامەدا دەڵێ:

نور شمع آفرینش اوستاد عبدالحمید	آن که وصف دانشش را پیر و برنا کرده‌اند
درّ یکتای زمان بودی و چون او کس ندید	تا که غواصان دانش، غوص دریا کرده‌اند
بد جهانی را حمید و عالمان را افتخار	در عزای مرگ او بنگر چه غوغا کرده‌اند
بد زمانی را بدیع و داشت جانی حق‌پرست	حق‌پرستان را بهشت عدن مأوی کرده‌اند
بر پرید از خاک تیره تا پر افلاکیان	زانکه او را جایگه بر عرش اعلی کرده‌اند

کاتی لە دنیا چوونی مامۆستا، ئەمنماڵم لە سنە بوو؛ داخم نەگەیشتمە ئەسپەردەکردنەکەی. بەڵام بۆ بیرئانینی لە حەوتەیدا کە زانستگای تاران و کەسان و شاگردانی دایاننابوو، خۆم گەیاند و بۆ بەیانییەکەی کە بڕیار بوو لە سەر گڵکۆی کۆ ببینەوە، ئەم شیعرەم دانا:

به ناگه خزان تاخت بر بوستان	نه از گل نشان ماند و نز باغبان

بپوشـــید رخـــت عـــزا شاخـــسار ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ فتــاد از نـــوا بلبـــل نغمـــه‌خـــوان
بـــه تـــاراج کـــالای رنگـــین بـــاغ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ وزان شـــد دژم بـــاد ســـرد خـــزان
بدانــسان کــه یغمــاگر مــرگ کنــد ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ درخـــــت ادب را ز بــــن ناگهـــان
نشـــستند در ســـوگ اربـــاب فـــضل ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ مهـــان ســـخن‌ســـنج شـــیوابیان
کـــه «اســـتاد عبدالحمیـــد مهـــی» ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ همـی رخـت بـر بـست زیـن خاکـدان
ادیبـــی محقـــق کـــه ماننـــد وی ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ دگـــر نـــاورد کهنـــه مـــام زمـــان
هنرمنـــد دانـــا، لبیـــب اریـــب ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ گـــزین معرفـــت‌پـــرور نکتـــه‌دان
بـه شـعر دری شـاعری چیـره‌دسـت ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ بـــه ســـرواد تـــازی «بـــدیع‌الزمـــان»
گـــزین پارســـا عابـــد حـــق‌پرســـت ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ مهـــــــین دانـــــــشومند والا روان
گریـــزان ز شـــهرت ولـــیکن گرفـــت ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ مـــر آوازه‌ی وی کـــران تـــا کـــران
نبـــودش انیـــسی جـــز از اهـــل فـــضل ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ نبـــودش بـــه غیـــر از کتـــب همزبـــان
دریغـــا کـــه بربـــود دســـت قـــضا ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ چنـــان نغـــز گنجینـــه‌ی شـــایگان
دریغـــا کـــه او مُـــرد و بـــا او برفـــت ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ فـــــراورده ســــــرمایه‌ی ســــالیان
دریغـــــا جهـــــانی ز علـــــم و ادب ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ دفـــین گـــشت زیـــر لحـــد جـــاودان
دریغـــا کـــه آن چهـــره‌ی تابنـــاک ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ بـــه یکبـــاره شـــد از نظرهـــا نهـــان
مـــرا بـــود اســـتاد و شایـــسته اســـت ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ بپـــالایم از دیـــــده خـــــون روان
خـــدایش بـــه رحمـــت بیـــامرزدا ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ قـــرین ســـازدش نعمـــت بـــی‌کـــران
بـــه اولاد و اخـــوان و یـــاران او ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ دهـد ذات حـق اَجـر و صـبر شـیان
چنـین اسـت سـال وفـات «مهـی»: ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ «بهـشت اسـت جـای بـدیع‌الزمـان»[1]

وەک گوتمان ناوی بنەماڵەیی مامۆستا عەبدولحەمید، سەرەتا «مهی فَرَّهـی» بوو. لـە شـیعری فارسـیدا نازناوی «مهی» دادەنا. پاشان ناوی کردە «بدیع‌الزَّمانی» و نازنـاوی شـیعری عەرەبیـشی «بـدیع» بـوو. لـەم چوارینەدا بەم چوار خاڵە ئاماژەی کردووە:

ایـــن بنـــده کـــه اربـــاب ادب را رهـــیم ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ خـــالص بـــه عیـــار چـــون زر دهـــدهیم
رخـــــشنده، دُر تـــــاج ادب فـــــرّهیم ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ کُـــردم، ز ســـنندجم، بـــدیعم، مهـــیم

ئەم قەسیدە عارەبییەی ساڵی ١٣١٧ ک. ھ. کە لە کرماشان بوو، لە سەردانی سنەدا، وەکوو دیارییەک هێنابووی بۆ شێخ حەبیبوڵڵای کاشتەری:

١. بە حیسابی ئەبجد ئەکاتە ١٣٩٧، ساڵی (کۆچی مانگی) لە دنیا چوونی مامۆستا.

نَفْسی تَتوقُ إلی دیار «سنندج» — حَیْثُ المطافُ بها و لَمّا یُحْجج
حَیْثُ الظِّباءُ العینُ فی عَرَصاتها — تَسبی العُقول بکلّ طَرْف أدْعج
حَیْثُ المها تَبْدو حواسر بالضُّحی — تُصْمی النُّهی بتَبَرُّج وَ تَغَنج
مَرَّت عَلَیَّ سنُونَ ستٌّ لَمْ اَزَلْ — أرْجُو إلیْها الْعوْدَ بَعْدَ المَخْرَج
لازِلْتُ أبْغی عَوْدَةً لمُدیدة — ولسوء حظّی لَمْ أَنَلْ ما أرْتجی
فَدَعوت ربّی ضارعاً مستصرخاً — فَأغاث ربِّی وَ هُوَ أکْرَمُ مَنْ رجی
یا قَلْبیَ العانی المعانی کُربَةً — منْ عُظْم هَمٍّ هائل لَمْ یُفْرج
أبْشرْ فَقَدْ حانَ التَّدانی و انْجلی — لَیْلی بصُبح واضح مُتَبَلِّج
أزف التَّرحُلُ نَحْوها فَتَقَشَّعی — یا لَیْلَتی عن وجْه فَجْر أبْلج
شَمّرْ و أزْمعْ رحْلَةً منْ غیرما — وَهْن و أوّب فی المسیر و أدلج
ارْکب علی اسم الله فی سیّارة — أجری و أسری منْ حصاف و أعوج
طرْف کریم لیس یدری ما الوَنی — مُتَدَحْرج مُتَرَجْرج متزَلِّج
علْق کَمثْل سکاب الّا أنَّهُ — باعتهُ أیدی الصّانعین ببهْرج
لَمْ تُمْنَ یوْماً بالنَّوی بلْ بالْهوی — و بقلبها النیرانُ ذات تأجُّج
لا تدرک النُّجبُ العتاق غبارها — وَ لَوَ انَّها فَوق الحرون و دعْلج
فاحملْ بها أهْلیکَ حَتّی تَنْتهی — لسنَنْدج فعلی ذراها عَرّج
وجُب الفیافی و الظِّراب و لا تعجْ — إلا علی ربع لرهطک مبهج
فانزل بها مُترنّماً متعزّلاً — و تَغَنَّ فی تلک المعاهد و اهزج
فاذا وصلت الی سنندجَ فالْتثم — تُربَ الهُدی و بشکُرْ ربِّک فَالْهج
أرْضٌ بهاالعُلماءُ یهدون الوری — لسُلوک دین الحقّ أقوم منهج
لاسیَّما سندی و أستاذی الَّذی — فضل الأفاضل عنْده کَنُموذَج
شَیْخی «حبیبالله» من بتلَمُّذی — لجانبه متیَقّنٌ أنّی نجی
نَسْل الکرام الصّالحین ذَوی التُّقی — و سُلالة الجحجاح زید الأبلج
أعزِزْ بمُنقطع القرین عدیمه — یُمْلی رفیع المتن غَیْر مُدبَّج
سَنَد الثِّقات وَ مَنْ یَظَلُّ مُمسّکاً — بصحیح مایرْویه کلُّ مُخَرِّج
رُکْن المکارم کعبة الفُقهاء وَ الْـ — ـفُضَلا و منْ بذُراهُ کُلُّ یَلْتَجی
تُلْفی الیراعَةَ حینَ تَلْمسُ کَفَّهُ — أنْدی منَ الْمزْن الْهتُون المُرهج
تَبْغی عُفاةُ الْعلْم نادیَ فَضْله — فَتَراهُ فی الإفْضال کابْن الحَشْرج

جَمعَ الفكـاهَـةَ و النَّبـاهَـةَ و التُّقـى — أكْـرِمْ بـه مـنْ مـازح مُتَحـرّج
يـا سـيّدى اعْـذرنى لـئنْ قـصَرْتُ فـى — مَـدْحيكُمُ و غَـدَوْتُ كـالْمُتَلَجْلج
أنّـى يتـيحُ لـىَ المـديحُ لحَـضْرة — قُـسّ لَـدَيْها ذُو لـسان مُـرْتج
قَـسَماً بمَـنْ أمَّ الطّوائـفُ بَيْتَـهُ — فَـوْقَ الـضّوامر أوْ بـبطْن الهَـوْدَج
إنَّ الفُـؤاد بحُـبكُمْ متمَـسّكُ — وَ بغَيْـر ذلـك مُهْجتـى لَـمْ تَـثْلج
يـا حَبّـذا زَمَـنٌ نَعُـبُّ لَـدَيْكُمُ — جُرَعـاً مـنَ الآداب كالْفـالوذَج
يـا طيـب يَـوْم فـى ذراكَ مُقَـصَّر — خـضل كَيَـوْم جنـان عَـدْن سَجْـسج
عنْـدى مجاجـاةُ اليـراعـة مـنْكُمُ — أغْلَـى وَ أثْمَـنُ مـنْ سـبيكة زبْـرج
يـا أيُّهـا المفْـضالُ دونَـكَ حُلَّـةً — أحَـدٌ عَلـى مَنْوالهـا لَـمْ يَنْـسج
باتَـتْ تُحبّرُهـا صَـناعُ قَريحتـى — فَغَـدَتْ كَمَوْشـيٍّ يَـروقُ مُـدَبَّج
خَلَبَـتْ عُقُـول اُولـى النُّهـى فكَأنَّهـا — فـى فعْلهـا ابْنَـةُ كَـرْمَـة لَـمْ تُمْـزَج
زُفَّـتْ اليـكَ كعـادَة لَمّـا تجـد — كُفْـواً سـواك لَهـا فَلَـمْ تَتَـزَوَّج
جُعلَـتْ مَعانيهـا قـلادَة جيـدها — وَ فَرائـدُ الألفـاظ مثـل الـدُّمُلج
مـا للْمـديح ولـى وَ لَـوْلا أنْـتُمُ — وَ حيـاتكُمْ أبَـداً بـه لَـمْ ألْهـج
فاقبَـلْ هُـديتَ هَـديَّـةً بَعَثَـتْ بهـا — أيْـدى «البـديع» النّـازح الـدّار الـشَّجى
مَـنْ لَـمْ يَـزَلْ يَهْـواكُمُ وَ لـأجْلكُمْ — يَفْـدى بمُهْجَتـه ديـارَ سَـنَنْدَج

هذه القصيدةُ هديَةٌ من العبد المسكين المستكين المرتجى، بديع الزمان مهى السّنندجى، الى سيّده و سنده، و أستاذه و ملاذه، الحبر البَحْر، و عَلّامة الدّهر، أبى مُسْلمٍ الشّيخ حبيب الله المدرّس الرّوحانىّ الكاشترى، لا زالتْ زُهر الأيام بوجوده مزهرة، و مساندُ التّدريس بجانبه مفتخرة، و المرجوُّ منْ مكارم حضرته، و المامُولُ من معالى سدَّته، أن يَتَقبَّلها بقبول حسن، و يجدّدَ به عَلَىَّ الأفْضالَ و المنن، و يَدْعُو لى بحُسْن الختام، و حُلُول دارالسَّلام، و صَلّىالله عَلى خيرْ خَلقه سيّدنا و مولانا أبى القاسم محمّد المصطفى، و عَلَى آله و أصحابه و اَزواجه و ذرّياته و اَهْل بَيْته و حَمَلَة علمه و مُحبّيه أجمعين، إلى يَوْمِ الدين و الحمد لله ربّ العالمين، و افقَ إنشاءُها يوم ١٣١٧/٤/١٤=٦ ج ١٣٥٧/١ بكرمانشاه.

غەزەلێکی فارسی لە بەدیع:

نهـادم تـاج عـزت بـر سـر امـروز — کـه خـود دیـدم جمـال دلبـر امـروز
بـه کـوی کـامرانی پـا نهـادم — کـه غـم بیـرون شـد از دل یکسر امـروز
شـبیخونی زدم بـر شـام هجـران — چـو بـر مـن تافـت مهـر خـاور امـروز
گـرفتم خطّـەی شـادی سراسـر — کـه یـارم گـشت یـار و یـاور امـروز

مـــرا بُـــد دفتـــر اقبـــال فرتـــوت
شـــدم شـــیرازه بهـــر دفتـــر امـــروز

گمـــانم نیـــست مـــرگم رو نمایـــد
کـــه دیـــدم عـــارض جـــان‌پـــرور امـــروز

مـــرا شـــد از وصـــال دوســـت حاصـــل
حیـــاتی تـــازه، عمـــری دیگـــر امـــروز

مـــرا ایـــن فُرصـــت نیکـــو ســـرانجام
فـــراهم شـــد ز لُطـــف داور امـــروز

«مهـــی» از پرتـــو لعـــل لـــب اوســـت
کـــه نظمـــش گـــشته رشـــك شـــكّر امـــروز

گۆڤاری زانکۆی زمان و وێژەی زانستگای تاران، س١٣٥٦ ک. ه. *یادنامه‌ی اُستاد بدیع‌الزّمانی*. یاداشتەکانی نووسەر.

## وەجیەی هاشمی

سەید وەجیەدین سەیدزادەی هاشمی، کوڕی سەید قیدار «سیّدالدّوله»، ساڵی ١٣٢٢ ک. م. لە گوندی «دەولەتاوا»ی ڕوانسەردا هاتە دنیا و مانگی ڕەبیعول‌ئەوەڵی ساڵی ١٣٩٩، بەرامبەر بە ڕێبەندانی ١٣٥٧ ک. ه. )١٩٧٩ ز.) لە دنیا دەرچوو.

سەید وەجیە مرۆیەکی هێژا و خاوەن زەوقی شیعر بووە و تا ڕادەیەک عەرەبی و فەڕانسیشی زانیوە.

**ئەم شیعرە هی ئەوە:**

فراق سرو بالایی دلم را همچو خون کـرده
روان گردیده از دیده، کنـارم لالـه‌گـون کـرده

چو بار دوش گردیـده است جـان مـن ز رنجـوری
غم هجـران یـارش آنچنـان زار و زبـون کـرده

ز شیرین دلبری، لیلی‌وش مجنون و شیدایم
که چون فرهاد صد خسرو شهید بیستون کـرده

به صحرای تجنّن هـر دلـی آواره مـی‌بینـی
دو چشم مست او، وی را گرفتار جنـون کـرده

یقینم سامری تمرین درس سحر و جـادو را
از آن چـشمان شـوخ دلفریـب پرفـسون کـرده

به دلبر گو: «وجیها» راستی درد و غـم هجـرش
مرا سیر از حیات خـویش و ایـن دنیـای دون کـرده

یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ حەبیبوڵڵای خواشت

سۆفیی بەوەفا و عارفی ئاشنا، شێخ حەبیبوڵڵا (حیسامی)، کوڕی موحەممەد بەگ، کوڕی عەبدوڵڵا بەگ، لە بەگزادەکانی گوندی «خواشت»ی سەر بە ناوچەی ژاوەرۆیە، کـە لەگـەڵ دوو تایفـەی بابـان و بووبـان دەبنەوە یەک ڕەچەڵەک. جا بەو بۆنەوە، ئەم بنەماڵە پێشتر خـان و بـەگ بوونـە؛ بـەڵام کـە ئیرشـادی شێخی پایەبەرز، عوسمان سیراجەدینی گڵکۆپیرۆزیان پێ گەیشتووە، بەگشتی چوونەتە نێـو تەریقـەتی نەقشبەندی و ڕیـزی مریـدانی ئـەو زاتـەوە و هێنـدێکیان بـە هـۆی شـێلگیری لـە سـەیر سـولووک و

ڕیازەتکێشانی زۆرەوە، دەرکی دەرگانەی عیرفانیان بەڕوودا کراوەتەوە.

یەک لەو کەسانە شێخ حەبیبوڵلایە کە هەر لە سەرەتای لاویوە گەیشتە خزمەتی قوتبی تەریقەت شێخ حوسامەدین عەلی و چووە ڕیزی ڕێڕەوانی خانەقایەوە و بە هۆی هێژایی و لێهاتوویی، لە ماوەیەکی کەمدا بوو بە هاودەم و ڕاوێژکاری جێ متمانەی و زۆری پێ نەچوو، سەرخەتمی و سەرپەرشتی کاروباری خانەقاشی پێ ئەسپارد و ئەگەر چاوپێکەوتنی دەسەڵاتدارێکی ئێران یان عیراق پێویست بوایە، نوێنەری شێخ بۆ وتوویژ، شێخ حەیبەڵا بوو. ئەویش هەمیشە لە ڕاسپێرییەکانیدا ـکە زۆرتر بۆ لابردنی گیر و گرفت لەسەر ڕێی مریدان بووـ سەرکەوتوو دەگەڕاوە. هەروەها لە لایەن شێخەوە ئیجازەی ئیرشادی وەرگرتبوو؛ بەم جۆرە، ڕاهێنانی ئەو کەسانە کە جاری یەکەمیان بوو دەچوونە خانەقا، لە ئۆدەی شێخ حەیبەڵا بوو. ماوەی سی ساڵی تەواو، مانگێک و دوانی لێ دەر، کە لەسەر ئیجازەی شێخ دەگەڕاوە خواشت و سەرێکی لە ژن و منداڵ و کەس و کاری دەدا، باقی سات و کاتی یان لە خزمەتی شێخ بوو یان شێخ بۆ شوێنێک و بەشوێن کارێکیدا ناردبوو.

ئەمن لە سەفەرێکدا کە هاوڕێ بابم لە هاوینەهەواری «کراویەدۆڵ»، شێخ حوسامەدینم زیارەت کرد، کاری بێوچان و ماندوویی نەناسانەی شێخ حەیبەلام چاو لێ بوو. دەمبینی کە تا چ ڕادەیەک تێدەکۆشێ خانەقا کەم و کورتییەکی نەبێ و ئەو خەڵکە زۆرە کە بە هیوایەکی زۆرەوە دێن، ڕازی بڕۆن. تەنانەت چاوەدێری ئاشپەزخانەی خانەقایشی دەکرد و نەیدەهێشت خواردنی کەسێک بفەوتێ. شیاوی باسە ئەرکی خانەقا لە شەو و ڕۆژێکدا، دەوری هەزار کەس بوو.

شێخ حەیبەڵا پاش کۆچی دوایی شێخ، ساڵی ١٣١٨ ک. هـ. )١٩٣٩ ز.)، گەڕاوە زێدی خۆی و لە نێو خزم و تایفەیدا، تا کۆتایی ژیان، بە ڕێز و حورمەتەوە ژیا. کاتی تەنیایی قورئانی دەخوێند و موراقیبەی دەکرد. بە شەونخوونی ڕاهاتبوو؛ پێش بانگی بەیانی دەچووە مزگەوت و زۆرتر بۆخۆی بانگی دەدا و بەرنوێژی دەکرد. لەگەڵ ئەوەش پیاوێکی خۆش سەروزمان و تێکەڵی خەڵک بوو. لەگەڵ گەورە و پچووک و دارا و هەژار و زانا و نەزاندا، دادەنیشت، گوێی لە قسەیان دەگرت و قسەی بۆیان دەکرد. دەچووە هەرکۆڕێ، سەری باسێکی دادەمەزراند؛ ئەگەر مامۆستایەک، زانایەک بوایە، لێی دەپرسی کە خۆی و باقی دانیشتوان بەهرەیەک ببەن؛ دەنا خۆی بە گەڕاندنەوەی داستانی ژیانی پێغەمبەران و گەورەپیاوان، کۆڕی گەرم دەکرد و تەنانەت جاروبار جەزبەیشی لە برێ گوێگران ئەهاورد و دوایش بە ئامۆژگارییەک، ڕێنوێنییەک کۆتایی بە قسەکانی دێنا.

شێخ حەبیبولا تا دوا ساڵەکانی ژیانی، ئەگەرچی لە نەوەدیشی تێپەڕاندبوو، باش مابوو. هەموو ڕۆژێ ساعەتێک و دوان پیاسەی دەکرد. هەموو ساڵێ دوو ـ سێ مانگ لە سنە دادەنیشت، خزم و دۆست و ئاشنا و هەروەها مریدانی بەسەردەکردەوە. لە دوایین سەفەریدا نەخۆش کەوت و پاش ماوەیەک، لە

٢٠ی نەورۆزی ١٣٥٨ ک. هـ. بەرامبەر بە ١١ی جیمادی ئەوەڵی ١٣٩٩ ک. م. (١٩٧٩ ز.)، ئەمری خوای بەجێهێنا و لە زیارەتانی «تەپ شێخ سەلام»دا نێژرا.

یاداشتەکانی نووسەر.

## بیداری کرماشانی

موحەممەد حوسەینی جەلیلی، نازناو «بیدار»، کوڕی ئایەتوڵا شێخ موحەممەد هادی کرماشانی، لە پشتی نادری زەنگەنە، ساڵی ١٢٩٨ ک. هـ. )١٩١٩ ز.)، لە کرماشان هاتە دنیا و کە پێگەییشت، وەک باقی هاوساڵانی لە ١٨ ساڵاندا، دیپلومی وەرگرت و پێڕای ئەوە، لە خزمەت باوکی و عەللامە سەرداری کابولیدا، دەرسی ئایینی و عەرەبی خوێند. ساڵی ١٣١٨ ک. هـ. چوو بۆ تاران و لە زانکۆی دین‌ناسیدا ناوی نووسی و کە لیسانسی وەرگرت (ساڵی ١٣٢٢)، گەڕاوە کرماشان. سەرەتا لە بانکێکدا دامەزرا و پاشان کە دیتی بۆی قووت ناچێ، بەجێیهێشت و چووە وەزارەتی پەروەرد و بوو بە مامۆستای دواناوەندی لە کرماشاندا و تا وەنیشتە بوو ئەو کارەی هەبوو.

بیدار هەر لە سەردەمی تازەلاوییەوە، زەوقی خواداوی شیعر، لە ناخیدا خۆی نواند و شیعرگوتنی دەسپێکرد. لە ڕاستیشدا غەزەلەکانی دڵگر و ڕەوان و جوانن و نیشاندەری هێز و دەسەڵاتی شاعیرە بۆ دەربڕینی هەست و بیری خۆی، بە زبانی شیعر.

بیدار بێجگە دیوانی شیعر، هێندێک نووسراوەشی هەیە؛ یەکیان کتێبێکە لە سەرف و نەحوی عەرەبیدا و یەکی‌تر، بە ناوی «اَبکارُالاَفکار».

**چەند غەزەلی ئەو شاعیرە**:

شب است و باز به خاطر هوای اوست مرا | چو جام خنده به لب گریه در گلوست مرا
دمید موی سپیدم به سر، جوانی رفت | هنوز مونس جان یاد موی اوست مرا
کنار چشمەی چشمم دمی به ناز خرام | هوای دیدن سرو کنار جوست مرا
تو خواه مهر به من ورز و خواه کین بنما | که مهر و کین تو اندر نظر نکوست مرا
مرا برانند به خواری ولی عیان بینم | کز آن نگاه نهانی به جستجوست مرا
فغان و درد که با غیر، نرم چون موم است | گلی که سنگدل و تند و فتنەخوست مرا
ز دشمنم نبود شکوه بر زبان «بیدار» | ز دست دوست بنالم که سوخت دوست مرا

* * *

ز تُرکتاز حوادث نه ذوق ماند و نه حالی | حدیث عشق تو گویی که خواب بود و خیالی
حساب سال و مه از من مپرس بی‌خبرم من | چو در دیار محبت نه ماه ماند و نه سالی



سـلام مـا بـه رفیقـان مگـر صـبا برسـاند
که سنگ حادثه نگذاشت بهر ما پـر و بـالی

نه فرصتی که بگویم ز وصـل دوست حـدیثی
نه حالتی که بگویم غزل بـه وصـف غزالـی

صباح وصل نکویان دهد پس از شب هجـران
شب فراق تـو تنهـا نداشـت صبح وصـالی

خـدنگ قـدّ مـن از بـار دوریـت بشکـسته
فدای چشم تـو، حسن تـو را مباد زوالـی

به شعر دلکش «بیـدار» زهـره دست فـشاند
بهوش باش که آویز گـوش سـحر حلالـی

* * *

هر که همچون صبحدم دارد هوای نیمشب
گـرد غـم از دل زدایـد بـا صـفای نیمـشب

گر وصال دوست خواهی یک زمان از کـف منـه
نالـههـای نیمـروز و گریـههـای نیمـشب

الفتـی دارم خــدایا بـا دل شــب واگــذار
نیمـهشـب را بهـر مـا، مـا را بـرای نیمـشب

طلعت دلدار در شب جلوه زانـرو مـی کنـد
تـا شـود بیگانـه از خـود، آشـنای نیمـشب

صد چو ملک نیمروزش هست در زیـر نگـین
آری آری پادشــه باشــد گــدای نیمــشب

مرغ حق از کاروان رفته همی گویـد سـخن
بیخبر در خواب غافل زیـن درای نیمـشب

محنت گفت و شنود مردمم «بیدار» کُـشت
آفـرین بـر خلـوت راحـتفـزای نیمـشب

*تـذکرەی شُـعرای کرمانـشاه*، چـاپ١٣٣٧ ک. ه. ل١٧.

*تذکرەی شُعرای معاصر ایران*، چاپ١٣٣٧ ک. ه. ج٢، ل٥٦.

## تەمکین

کەریمی کووهساری، نازناو «تەمکین»، کوڕی مـەحموود، ساڵـی ١٢٩٩ ک. ه. )١٩٢٠ ز.) لـە کرماشـان هاتە دنیا. بابی پیاوێکی کەمدەست بـوو؛ بـە ئـەسـتەم ژیانیـانی دەسـووڕاند. لـە سـەرینەی هـەژاری، شەش‌ساڵان بوو، دایکیشی سەری یەکجاری ناوە. بـەو بۆنـەوە کـەریمیان نـاردە شـاگردی و کرێکـاری، بەشکوو لای خەرجێک بگرێ و دیارە نەیتوانی وەکوو منداڵانی‌تر بچێتە قوتابخانە و بخوێنێ.

چاردەساڵان بوو بۆ یەکەم جار ڕووی‌کردە خوێندن. ساڵێک چوو بۆ مەکتبخانە و لەوێ فێری نووسـین و خوێندنەوە و خوێندنی قورئان بوو؛ چەند کتێبی وەکوو «*تَرَسُّل*» و «*نصاب الـصبیان*»یشی خوێند. ئەوجار بە وازێکی زۆرەوە لە مەدرەسە ناوی نووسی و لە کەلاسی سێهەمدا وەریانگرت. دوو ساڵیش لە مەدرەسە خوێندی؛ بەڵام دیسانەکە نەداری پێشی پێ گرت و دەرس و خوێندنی پێ تەفرە دا. هەر لەو ساڵانە بوو کە لە خۆیـدا زەوقـی شـیعردانانی بـەدی کـرد؛ نازنـاوی «غـەمگین»ی بۆخـۆی هەڵـبژارد و دەفتـەری شیعرەکانی، بە زۆر شیعری ڕازاوە، ڕازاندەوە. بەداخەوە لە دەورانی سـەربازیدا، هـەموو شـیعری تـا ئـەو سەردەمەی لێ ون بوون و دواییش هیچیانی دەس‌نەکەوتەوە.

غەمگین دوای خزمەتی سەربازی، لەسەر پێشنیاری غیرەتی کرماشانی، نازناوی خۆی کردە «تەمکین».

تەمکین ئەگەرچی سێ ساڵ زیاتر مەودای کەلاس چوونی دەس نەکەوت و قەت بۆی نەلوا بە ئارخەیانی دانیشێ و بخوێنێ، بەڵام وازی زۆری لە زمان و وێژە، بەتایبەت شیعر، هانی دەدا کە لە هەر دەرفەتێکدا شتێک لەمەڕ ئەدەبیات و شیعر و جوانکاری شاعیرانەوە فێر ببێ و بەم جۆرە وردە وردە زانیارییەکی باشی لەو بوارەدا دەسکەوت و توانی بە هۆی لێهاتوویی سرشتی و ئەو ماندوو بوونەوە، بە کوردی و فارسی، شیعری جوان بهۆنێتەوە و کۆڕە ئەدەبییەکانی ئەو سەردەمەی کرماشانی پێ بڕازێنێتەوە.

ساڵی ١٣٤٠ ک. ه. تەمکین و چەند شاعیر و وێژەوانیتری کرماشانی، کۆڕی وێژەیی «سُخن»یان دانا و بە شوێن ئەوەدا لە دوو کۆڕی «*دانشوران*» و «کرماشان»یشدا بوو بە ئەندام. ئەڵبەت ـ وەک دەگێڕنەوە ـ لە زۆر ساڵی پێش ئەوەدا، یانی ساڵی ١٣٢٨ ک. ه. تەمکین ئەندامی کۆڕی نووسەرانی شاری کرماشان بووە. بەپێی ئەوە دەبێ پەخشانیشی نووسیبێ؛ کە ئێمە لێ بێخەبەرین.

تەمکین ئەگەرچی شیعرەکانی زۆر جوان و دڵبزوێن بوون، بەڵام قەت بە شیعر نانی نەخوارد و تەنیا بۆ دڵی خۆی شیعری گوت. ساڵی ١٣٢٧ ک. ه. لە ئیدارەی پۆست دامەزرا و پاش سی ساڵان کار لەو مەزرینگە، وەنیشتە بوو.

تەمکین لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا وازی چووە سەر گیاناسی و بژیشکی شیناوەرد و تێشیدا زۆر سە-رکەوت؛ بەڵام بەداخەوە ئەجەل مۆڵەتی نەدا و ساڵی ١٣٥٧ ک. ه. )١٩٧٨ ز.) ڕووی لە شاری خامۆشان نا.

زۆربەی شیعری تەمکین پەسنی ئیمامان (د) و ئەویندارى و باسی ناکۆکی و گیروگرفتی کۆمەڵگا و هەروەها هێندێک ئامۆژگاری تازەلاوانە.

**ئەوا چەند نموونە لە شیعرەکانی**:

بولبول گولزار عیشقم، باڵ پەروازم نییە — تا وە سۆز دڵ بناڵم، کەس هەماوازم نییە
ڕەنجە لە خار فراقم، ڕاحەتیبەخشم کووە — ئارەزوودار وساڵم، یار تەننازم نییە
دەردەدارم ڕوو وەکوو بەم تا کە دەردم چارە کەن — ڕاز دڵ ئیفشا وە کی کەم چونکە هەمڕازم نییە
بردیە تا دڵ وەدەستم، عەقڵ و هووشم چی وەسەر — لەو چەوە مەخمووره مەستم، مەیل بەگمازم نییە
دەرد عیشقێ ها لە گیانم، تاقەت و سەبرم چییە — سووز دڵ دیری بەیانم، حاجەت سازم نییە
لەو ڕوخ گوڵگوونە دیری حەسرەت ماچێ دڵم — بەسک ڕوونەرمم خودایا، تاو ئیبرازم نییە
یا وە وەسڵی زندگی کەم، یا لە هجرانی مرم — غەیر یە چشت ترەک ئەنجام و ئاغازم نییە
شیعر کوردی هەر یەسە، ئەر خاسە «تەمکین» یا خراو — دی لەیە بیتر چە بووشم، سیحر و ئیعجازم نییە

بوی شیر از لب آن غنچه‌دهان می‌آید — شیر یعنی چه؟ کز و نکهت جان می‌آید
جلوه‌ی عارض او نطق مرا گویا کرد — در بر آینه طوطی به زبان می‌آید
پری از شرم جمال تو نهان گشته، بلی — ماه از دیدن خورشید نهان می‌آید
گرچه خط، گلشن رخسار تو را داد صفا — این بهاریست کز آن بوی خزان می‌آید
در خم طُرّه‌ی شبرنگ تو نالد دل من — زانکه شب، درد به بیمار گران می‌آید
شدم از غصه دوتا، از چه نیایی به برم — غالباً تیر در آغوش کمان می‌آید
مگر از زلف تو شد باد صبا نافه‌گشا — که چنین با نفس مُشک‌فشان می‌آید
دل به همدستی مژگان بَرَد آن چشم سیاه — زور شاهین همه از پنجه عیان می‌آید
تا گرفت از لب او کام، جوان شد «تمکین» — زانکه از آب بقا پیر جوان می‌آید

* * *

به بویت عاشق از خواب عدم چالاک برخیزد — ز شوق عارضت چون گل، گریبان‌چاک برخیزد
ز تیر غمزه‌ات صیدی که بر خاک هلاک افتد — ز جا هر دم به ذوق حلقه‌ی فتراک برخیزد
جنون کآمد، ز اسباب تعلق خانه پردازد — بلی آنجا که سیل آید خس و خاشاک برخیزد
خوش آن افتاده کز فیض سبک‌روحی در این گلشن — به جذب مهر همچون ذره بر افلاک برخیزد
کند روشن فروغ روی جانان خانه‌ی دل را — اگر زنگ خودی ز آیینه‌ی ادراک برخیزد
به بزم دختر بی‌عصمت رَز آن که بنشیند — اگر چه پاک باشد، عاقبت ناپاک برخیزد
میامیز ای پسر با ساده‌رویان، تا شوی ایمن — کز آنان فتنه همچون دختران تاک برخیزد
به داغ و درد عشقت چون که بگذشت از جهان «تمکین» — بدان کز تُربتش گلهای آتشناک برخیزد

* * *

از تاب غمت مرا جگر می‌سوزد — پا تا به سرم از این شرر می‌سوزد
ز آه دلم، اشک دیده سوزد، آری — آتش چو گرفت، خشک و تر می‌سوزد

*دیوان تمکین کرمانشاهی*، به کوشش فرشید یوسفی، انتشارات غرب، پاییز ١٣٦٩. یاداشت کاک ڕەئووفی موحەممەدی موقەدەم.

## هوشیاری سنه‌یی

عەلی‌نەقی دەبیرمەخسووس، نازناو «هُشیار»، کوڕی میرزا کازم، کوڕی ئاغا موحەممەد ڕەحیمی میعمارباشی کوردستانی، ساڵی ١٢٦٦ ک. هـ. )١٨٨٧ ز.) لە شاری سنە هاتە دنیا و لە مەکتەبخانەکانی ئەوێدا خوێندنی سەرەتایی دەسپێکرد. پاشان چووە قوتابخانە ئایینییەکانەوە و زبانی عەرەبی و سەرف و

نەحو فێر بوو. ماوەیەکیش لە خوێندنگەی «ئالیانس»ی سنە زبانی فەڕانسەی خوێنـد و پیـڕای ئەمانـە، لای هونەرمەندانی خەتاتەوە، شێوە نووسینی نەسخ و نەستەعلیقی مەشق کرد. کە پێگەییـشت، ماوەیـەک لـە دەزگای یەکێ لە خانەکانی سـنەدا سەرقەڵـەم بـوو. ساڵـی ١٣٣٣ ک. م. چـوو بـۆ تـاران و سـەرەتا لـە نووسینگەی سەرەک وەزیردا، وەک ئینشابەندی تایبەت و دەستەبەر دامەزرا و ١٨ ساڵ لەو دەفتەرە کـاری کرد. چەند ساڵیش لە وەزارەتی داد ئەو ئیشەی هەبوو. ساڵی ١٣١٤ ک.هـ. چووە وەزارەتی ناوخۆ و لەوێش سەردەمێک لە شارانی یەزد، مەراغە، خۆی، سمنان و دامغان فەرمانداری کرد و پاشان گەڕاوە تاران و دوای هێندێک وەنیشتە بوو. سەرەنجامیش ساڵی ١٣٥٨ ک. هـ. )١٩٧٩ ز.) ڕووی لە دیاری ئاخر نا.

هوشیار پیاوێکی هێژا بوو؛ و یەکجار زمان و وێژەی فارسی حەزپێدەکرد. بۆخۆشی شیعری دەگـوت و شیعرەکانی جوانن؛ لە شیعرێکدا ئاوا خۆی ناساندووە:

این دفتـری اسـت رشـحەی طبـع روان مـن — وین خـط بـود تـراوش کلـك و بنـان مـن
«هــشیار» شــهرت مــن و نــامم «علینقــی» — «کُرد» است اصلم و «سـنەدژ» شارسـان مـن
پیدایــشم ز عــالم هــستی ز عــشق بــود — زان یافت روشنی دل و افروخت جـان مـن
خود عمر جاودانم اگر نیست، باك نیـست — هــست ایــن سـرودەهــا اثـر جـاودان مـن

* * *

هەر سەر کە شەیدای دڵبەی و سەرگەرمی عیشقی یار نەبێ
سەرباری ئازیز! ئەوسـەرە، خواکـا سـەرێ سـەربار نـەبێ

لامپێ کە سوتیاوێ لە بەرق چۆن پووچ و پووک و بـێفـەڕە
هەروا بزانە هەر سەرێک، سەرگەرمی سەودای یار نەبێ

بێعشق بـوونم موشکـڵە، هـەم زنـدەگیم بـێحاسـڵە
عەمری نەمێنێ ئەو دڵە بەستە بـە مـووی دڵـدار نـەبێ

وەک مەنقەڵـی ئاتەشـکەدەم هەڵگرسـیابوو دڵ مـودام
تاوێ لـە تـاو عیـشقا نـەبوو ئـەم کـوورە ئاگربـار نـەبێ

ئیسەیچ کە چەرمگ بووگە مووم مەستم بە عیشقی مەرز و بووم
بێفەهمییە لەم نەشئە گەر هەرکەس سەری سەرشار نـەبێ

ئیستەم گرفتاری وەتـەن، عاشـق بـە دیـداری وەتـەن
کۆشام کە گوڵزاری وەتەن، جێدڕک و داڵ و خار نەبێ

مەفتوونی ئەو دەشت و دەرەم سەودازەدەی بـووم و بـەرەم
یانێ ئەکۆشم سـەرزەویم ژێـر قـودرەتی ئـەغیار نـەبێ

ئەفسووس کە تەنیام و هەژار، تەنیا گوڵێ، نایرێ بـەهار
بۆچ وا ئەشێ بۆ خاکی کورد کەس یاوەر و غـەمخوار نـەبێ؟
هۆش ئافەتی گیان و تەنە، تەک یاری خوەیدا دوژمەنـە
خەسمی منیش هۆشی منە، یا خوا کەسێ «هوشیار» نـەبێ

* * *

در انتظار بمانـدم کـه کـامم از تـو برآیـد / روا مـدار کـه عُمـرم در انتظـار سـرآید
بیا و باز کن از زلف خویش پیچ و شکن را / ز کار بستەی من تا کـه پـیچ و تـاب برآیـد
در انتظار تـو جـانم بـه لـب رسید، خـدا را / درای از در من پیش از آنکه جان به در آید
مـرا بـه تیـر نگـاهی ز پـا فکنـدی و رفتـی / فدای تیر نگاهـت کـه خـوب کـارگر آیـد
حلاوت دهنت را چگونه وصف کـنم مـن / سخن به وصف دهان تو خوشتر از شکر آیـد
تو را چه حاجت آرایش است و زیور و زینـت / عزیز من! که تو را سادگی قـشنگ‌تـر آیـد
چه رنجها که کشیدم به راه خدمت دولـت / بـدان امیـد کـه پـاداش نیـک در نظـر آیـد
دریغ و درد که بر باد داد زحمـت و رنجـم / همان که از ستم وی فغان بـه چـرخ برآیـد
امید هست به فرخنده سـال و عیـد همـایون / نهـال کوشـش «هـشیار» نیـز بـارور آیـد

له کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## گیوی موکوریانی

عەبدورڕەحمانی موکوریانی، ناسراو بە «گیو»، ساڵی ١٣٢١ ک. م. لە مەهاباد هاتە دنیا. تەمەنی دە ساڵ بوو، لەگەڵ کاکی (حوسەین حوزنی)دا بۆ شاری حەلەب چووە و لەوێ تا ساڵی ١٣٤٥ خوێندوویـە و بـە شوێن ئەوەدا بۆ فێر بوونی زبانی فەڕانسە، چۆتە بەیرووت و پاش ساڵێک گەڕاوەتـەوە حەلـەب و لەگـەڵ کاکیدا ڕوویان لە کوردستانی باشوور ناوە.

ئەو دوو برایە لە سـاڵانی ١٣٤٥ تـا ١٣٥٢ ک. م. لـە شـاری «ڕوانـدز»دا، گۆڤـاری «*زاری کرمـانجی*» و «*ڕووناکی*»یان دەرهێنا و پاش ئەوەش کە حوسەین حوزنی چاپخانەیەکی کوردی دانا، تا ئەو زیندوو بـووە (ساڵی ١٣٦٧)، بۆ کاری چاپ و بەرهەمهێنانی بلاڤۆکان، هاوقۆڵی کردووە و کە ئەویش لـە دنیـا چـووە، بەتەنیا چاپخانەکەی بەڕێوە بردووە.

دیسان لە کارەکانی مامۆستا گیو، دەرهێنانی گۆڤاری «*هەولێر*» لە شاری هەولێر و هەروەها نووسـینی پێشەکی بۆ دیوانی چەند شاعیری بەناوبانگی کورد، وەک: مەلای جزیـری، نـالی، سـالم، حـاجی قـادر، ئەدەب، ئەدیب و تاهیر بەگ و لەچاپدانەوەی دیوانەکانیانە.



بەڵام ئــەوی بــۆ مامۆســتا وەکــوو تایبەتمەندییــەک دێتــە ئــەژمار، تێکۆشــانی بــێوچــانی لــە بــواری فەرهەنگنووسیدایە. ئەو لە مێژووی وێژەی کورددا، یەکەم کەسێکە ئەو کارەی وەکوو کــارێکی گرینــگ ڕەچاو کردووە و بەشێکی بەرچاو لە ژیانی بۆ داناوە و بە بێ هاوکار و یاریدەرێک و بێبەش لە کەرســتە و ئامێری پێویست، توانیویە چەند فەرهەنگی کوردی و جووتزمانی بۆ ئەو کاتە یەکجار بایەخدار، ئاراستەی کتێبخانەی کورد بکا.

**ناسنامەی فەرهەنگەکانی مامۆستا گیو**:

١. «*ڕابەر*» (*المُرشد*)، عەرەبی ـ کوردی، دەوری ١٥٠٠٠ وشە، ساڵی ١٩٥٠ ز. لە هەولێر چاپ کراوە.

٢. «*کۆلکەزێرینە*»، کوردی-فارسی-عەرەبی-فەڕانسی-ئینگلیسی. چاپی یەکەم، ١٩٥٥ ز. چاپی دووەم بە پێداچوونەوەیەکی بنەڕەتی، چاپی هەولێر، ١٩٦٦ ز.

٣. «*مەهاباد*»، کوردی ـ فارسی، دەوری ٣٠٠٠٠ وشە، کــە بــە شــێوەیەکی زانــستیتــر کــار کــراوە. ئــەم فەرهەنگە ساڵی ١٩٦١ ز. لە هەولێر چاپ بووە.

٤. «*کوردستان*»، یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ کوردی، دەوری ٣٠٠٠٠ وشە، کە بیست و چەند ساڵ دوای خۆی، کچی مامۆستا، دوکتور کوردستان موکوریانی، ساڵی ١٩٩٩ ز. لە هەولێر چاپی کرد.

لە کتێبەکانیتری مامۆستا گیو، «*گیونامە*» و «*ڕێنووسی کوردی*»، چاپ کراون.

ئەم مامۆستایە سەرەنجام ساڵی ١٣٧٩ ک. م. پاش زیاتر لە ٦٠ ساڵ خزمەتی بــێ وچــان بــە زبــان و وێژە و وشەی کورد، لە تەمەنی ٧٤ ساڵاندا، لە هەولێر کۆچی یەکجاری کرد.

گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان.

## کامران بەدرخان

دوکتور کامران بەدرخان، کوڕی ئەمین عالی بەدرخان، لە پیاوانی هەڵکەوتووی وێــژە و وشــەی کــورد و بنیاتنەرانی ڕۆژنامەوانی کوردە.

کامران لەگەڵ جەلادەتی برایدا، بەشێکی بەرچاویان لە دەرهێنانی گۆڤــاری «*هــاوار*» و «*ڕوونــاهی*»، لــە نێوان ساڵانی ١٩٤١ تا ١٩٤٤ ز. لە دمشقدا هەبوو. لە بەیرووتیش گۆڤاری «*ڕۆژا نۆ*» و «ستێر»ی بە کوردی و فەڕانسی بڵاو کردەوە. ساڵانێکی زۆریش لە مەدرەســەی ڕۆژهــەڵاتی، ســەر بــە «ســووربون»دا، زبــان و وشەی کوردی دەرسگوتەوە و هەروەها دامــەزرانی دەورەیــەک دەرســی زبــان و وێــژەی کــوردی لــەو زانستگایەش، بەرهەمی تێکۆشانی بێوچانی ئەو بوو.

کامران بەدرخان تا پێش هەڵگرسانی ئاوری یەکەم شەڕی جیهــانی، لــە ئاڵــمان دەژیــا و دوکتــوری حوقوقیشی هەر لەوێ وەرگرت. پاشان ماوەیەکی لە سووریا و لوبنان، لەگەڵ جەلادەت بەدرخانی تێپەڕ

کرد و دوای ئەوە چوو بۆ فەڕانسە و ساڵی ١٣٩٩ ک. م. دوای ٨٣ ساڵ ژیان، لە شاری پـاریس، مـاڵاوایی یەکجاری دنیای کرد.

**بەشێک لە بەرهەمەکانی**:

١. *ڕێزمانی کوردی*، دمشق، ١٩٥٦ ز.

٢. *ئەلف و بێ بە وێنەوە بۆ منداڵان*، دمشق، ١٩٣٨ ز.

٣. *ڕێزمانی کوردی بە فەڕانسی*، پاریس، ١٩٥٣ ز.

٤. *فێرکاری زمانی دایکی بۆ منداڵان*، پاریس، ١٩٥٣.

٥. *فێرکاری زبانی کوردی بە ترکی*، ١٩٧٦ ز.

٦. *وەرگێڕانی چوارینەکانی عومەر خەیام بە کوردی*، دمشق، ١٩٣٢ ز.

٧. *فەرهەنگی کوردی ـ فەڕانسی و فەڕانسی*، ٩٥٠٠٠ وشە، کە بەداخەوە تا ئێستا چاپ نەکراوە

٨. *قسەی نەستەقی کوردی و وەرگێڕاوەیان بە فەڕانسی*، بە هاوکاری لوسی پول مارگریت، پاریس ١٩٣٨

٩. *وەرگێڕاوەی دەسچنێکی شیعری کوردی بە ئاڵمانی*، بە هاوکاری فـون کـورت و نـدرلینج، بـرلین، ١٩٣٥ ز.

١٠. *کۆمەڵە وتار لەمەڕ دینی ئیسلام و حەدیسەوە*، بە کوردی، دمشق، ١٩٣٨ ز.

١١. *تەفسیری قورئان بە کوردی*

١٢. شیعری *ئەویندارانەی کوردی و وەرگێڕاوەیان بە فەڕانسی*، پاریس، ١٩٧٣ ز.

گۆڤاری *ڕۆژی کوردستان*، ژمارەی ٥٥، ساڵی ١٩٧٩ ز. ل١٩-٢١.

## سەید مەزهەری عەلەوی

سەید موحەممەد مەزهەر، کوڕی سەید عەبدولکەریم، لە سەیدە حوسـەینییەکان و لـە پـشتی پیرخـدری شاهۆیی، ساڵی١٣٢١ ک. م. لە گوندی«چاولکان حاجی»، سەربە مەریوان هاتـە دنیـا و فیقهـ و ئوسـوول و وێژەی فارسی و عەرەبی، لای مامۆستایانی زانای ئەو زانستانە خوێند و پاش ماوەیەک چـووە ئیرشـادگەی بیارێ و پاش وەرگرتنی تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عەلادین، هەر لەوێ دانیشت و سات و کاتی خـۆی بۆ سەیر و سولووک و خوێندنەوەی کتێبانی ئایینی و ئەدەبی تەرخان کرد و دوای چەنـدێک، بـەرنوێژی و خوتبەی ڕۆژانی جومعەی ئەوێی پێ سپێرا. بە شوێن ئەوەدا، بە هۆی فێـر بـوونی زبـان و وێـژەی فارسـی، دەرسیگوتەوە و هەروەها شێوەی جوان نووسین و ئینشابەندی مورشیدەکەشی گرتە ئەستۆ.

سەید مەزهەر لەبەر برێ ڕووداو، ساڵی ١٣٢٥ ک. م. چوو بۆ سنە و لە مزگەوتێکی ئەوشارە، بـە نـاوی «میرزا فەرەجوڵا»دا بوو بە ئیمام. دواجار کە مەدرەسەی عولوومی دینی لە سـنە دامـەزرا، لەویـشیان داوا

کرد لەویٚ دەرس بێژێتەوە و تا کۆتایی ژیان ئەم دوو خزمەتەی درێژە پێ دا.

سەید مەزھەری عەلەوی پیاوێکی پاک، دیندار، زانا و ھێژا بوو. کاتی خۆی زۆرتر بە خوێندنەوە تێپەڕ دەکرد و جیٚ ڕێزی ھەموو چینێکی خەڵک بوو.

**لە کتێبەکانی، ئەوی من دیتوومن**:

١. *رد مسلک بهایی*

٢. *احتجاج بر اهل بدعت*

٣. *رد کسانی که زایرین قبور صلحاء را تکفیر می‌کنند*

٤. *اثبات مسائل ضروری دین اسلام با ادلّه و بُرهان عقلی و نقلی*

شادرەوان عەلەوی سەرەنجام لە شەوی ھەینی، ٢٠ی سەفەرە مانگی ساڵی ١٣٩٩ ک. م. بەرامبەر بە ٢٩ی بەفرانباری ١٣٥٧ ک. ھ. (١٩٦٩ ز.)، دنیای بەحیٚھێشت و لە گۆشەیەکی حەوشەی مزگەوتەکەیەوە، تەرمەکەیان ناشت.

شیعرێک بە بۆنەی دەرھاتنی گۆڤاری «*دەنگی گیتی تازە*»وە:

دەنگی گیتی تازە دێت، گویٚ بگرە کوردە! نەوبەتە

دەنگی تازەت وەرگرە ئەمڕۆ کە ڕۆژی فرسەتە

ئەرزەکەت ئەرزێکی حاسڵخێز و پڕخەیرە وەلیٚ

بۆ تۆ قازانجی چییە ئەمڕۆ کە مایەت غەفڵەتە؟

کردەوە و زانینە ئەمڕۆ گیانەکەم، مایەی ژیان

قەومی بیٚعلم و عەمەڵ دایم بەشی ھەر زیللەتە

خولقی پاک، ئایینی چاک، بۆت تەخت ئەکەن ڕێگەی مەرام

میللەتی بیٚدین سەرئەنجامی زیان و نەگبەتە

خدمەتی ھاوتیرەتە سەرمایە بۆ سەرکەوتنت

گەر لە بۆ خۆت ھەر خەریک بی ئاخرت ھەر وەحشەتە

وا ئەزانم تێدەگەی، مەستی و قومار و سەرسەری

خوەرنشینانی گەیاندە ئەو بوڵەندی عیززەتە

ھەوڵ و تێکۆشین و عەزم و یەکیەتی و عیلم و ھونەر

دیت چلۆن ڕووناکیێکی خستە نێو ئەو میللەتە

ڕۆژ دەرێژی ئارەق و ئەیدەی بە ئارەق بۆ شەوت

پارەکەت چیت بۆ دەمێنیٚ بۆ قومارت حاجەتە

دۆست لە دۆست بێگانە و بێزار ئەکا گیانە قومار
بەسیە بۆ شوومی و خەراپی ئەو کە مایەی نیفرەتە
هەر دوو میکرۆبن لەبۆ ئەندامی کۆمەڵ بێ‌گومان
جا نەخوازەڵڵا عەرەق میکرۆبی عەقڵ و سەروەتە
ڕەهزەنی ئایین و حورمەت، دوژمنی ماڵ و کەماڵ
بۆ حەیا و بۆ حەیاتی ئیقتیسادیت ئافەتە
مایەیی فیتنە و فەسادە، هەڵکەنی ڕیشەی شەرەف
کاری شەیتانی لەعینە، ڕاستە نەسسی ئایەتە
نووستنت بێ‌سوودە، مایەت پووچە گەر بیدار نەبی
ڕۆژی هەوڵ و یەکیەتی و زانین و بیر و غیرەتە

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## مەلا نیزامەدینی جەلالی

زانای ئاگا و پارسا، مەلا نیزامەدینی جەلالی نۆدشی، کوڕی مەلا عیسامەدین، کوڕی مەلا جەلالەدین، کوڕی مەلا عەبدورڕەحمان، کوڕی مەلا ئەحمەدی یەکەم، لە بنەماڵەی زانست و هێژایی، ساڵی ١٣١٣ ک. م. لە «نۆدشە»ی هەورامان هاتە دنیا و کە پێگەیشت، چووە خوێندن و بە تێکۆشانێکی زۆر، خزمەتی هێندێک لە مامۆستایانی ئەو سەردەمە گەیشت و پاش وەرگرتنی ئیجازە، گەڕاوە زێدی خۆی و ژنی خواست و باقی ژیانی بە خزمەت‌کردنی زانستی و ئایینی خەڵکەکە تێپەڕ کرد و سەرەنجام ساڵی ١٣٥٨ ک. هـ. )١٩٧٩ ز.)، بەرامبەر بە ١٣٩٩ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێنا و تەرمی پاکی هەر لە نۆدشەدا نێژرا.

ڕەوانشاد مەلا نیزام بۆخۆی لە نۆدشە هێندێکی کەم دار و باخی هەبوو. زۆرتر بە باخەوانی و بەرهەمی کاری خۆی دەژیا.

زاروزێچی مامۆستا ئێستاش شوێنی خۆیان ون نەکردووە و کەسانی زانا و هێژای زۆریان لێ هەڵکەوتووە.

ئەم شیعرەی کاتی هاتنەوەی بەهار، بۆ شینی کچە جوانەمەرگەکەی داناوە:

ئاح و داخ دیسان فەسڵ وەهارەن — وادەی تەماشای گوڵ و گوڵزارەن
دڵەی غەمبارم زویر و زارەن — نۆبەی حەسرەتان فەسڵ وەهارەن
پەخشەن بە ڕەزای بەرزی مەغاران — جاسووسەن پەری ئەووەڵ وەهاران
وەنەوشەی وەشبۆ بەرگش خومینەن — پەی یار پارین خاتر خەمینەن
چنوور نە کاوان قامەت چەم وەردەن — ئینتزار پەری ئازیزان کەردەن

غـەوغای بولـبولان نەسـەر چلانـەن فەسڵ شکوفتەی خونچەی گوڵانـەن
خێــڵی نــازاران، دیــدەســـیاوان جەموەردەن بە ناز نـە پـای بـەفراوان
هەرکەس پەری وێش نە سارای چەمـەن چـەنی یـار وێـش خـاترش جەمـەن
دڵــەی مــن تــەمام زویــر و زارەن فەســڵ وەهــارم چــون ژار مــارەن
چونکــە ئــازیزم نــە تـۆی مەغاکــەن گــوڵان وەهــار جــە لام خاشــاکەن
دیدەکــەم! عــومرم وە ئــاخر بــەردەن ها وادەی وەسڵت وە پێش ئـاوەردەن
چەنی تۆ نە خاک تـەن مـەبۆ بـە گـەرد خاکمان یەکسان مەبۆ چـەنی هـەرد
بەر مـەیۆ نـە خـاک سـەوزەی وەهـاران یـاران جـە لامـان مـەیان، مـەویاران
مــەواچان داخــۆ ئینــە قــەبر کــین؟ جە سەوزەی وەهار بیەن وە ڕەنگـین
دمـای چەنـد ساڵــێ کـەس نمـەزانۆ خاکمــان کامــەن، فــاتحێو وانــۆ
ئاخم پەی مەردەن، داخم پەی مـەردەن ئینە گشت خەتای چـەرخ چەپگـەردەن

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## مەلا عەلی سەببار

مرۆیەکی خێرخواز و زانایەکی بێ‌نیاز، بەدوور لە ئازوبازی نەوس و خاوەن هۆش و زیرەکـی و لێهـاتوویی زۆر، خەڵکی گوندی «بێساران»ی ناوچەی «ژاوەرۆ»یە، کە پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، ماوەیەک لـە سلێمانی و کەرکووک، پێڕای کار، عەرەبی خوێندووە و ئینگلیسی فێر بووە و هەر لەوێ ژنی خواستووە و سەرەنجام دەوری ساڵی ١٣٣٠ ک. م. گەڕاوەتەوە ڕۆژهەڵات و لە پەروەردەی سنە دامەزراوە و فـیقهـ و عەرەبی و ئینگلیسی دەرس‌داوە.

مەلا عەلی وازێکی یەکجاری لە کتێب بوو؛ کتێبی زۆری دەساند و لە ماوەی خزمەتیدا، کتێبخانەیەکی باشی پێک‌هێنابوو. کاتی تـەنیایی کتـێبی دەخوێنـدەوە. لـە تەفـسیر و سـیرە و ئـەدەبیات و فیقهـدا، شارەزاییەکی باشی دەسکەوتبوو. لە ماڵیش دەرس‌گوتنەوەی بەردەوام بوو. لە قوتابی و فەقێ تا چـینی ئیداری و بازاڕی، لە خزمەتیدا بەهرەیان دەبرد.

خوا لێ خۆشبوو سەببار بە لەش زۆر لاواز بوو؛ لەم دواییانەدا تووشی گژم (تەنگەنەفەسـی) ببـوو؛ زۆری ئازار دەدا و سەرەنجام لە بەهاری ١٣٥٨ ک. هـ. )١٩٧٩ ز.)، بەرامبەر بە ١٣٩٩ ک. م. دەستی لـە ژیـان بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا.

لەو مامۆستایە چەند نووسراوەیەک بەجێ‌ماوە کە هێندێکیان لەچاپ‌دراوە.

یاداشتەکانی نووسەر.



# چەرخی یازدەهەم

## مەلا خالیدی موفتی

حاجی مەلا خالید، کوڕی عەللامە مەلا عەبدوڵڵای موفتی دشی، ساڵی ١٣٢٣ ک. م. لە گونـدی «دشـە»ی هەورامان هاتە دنیا و سەردەمی منداڵی و خوێندنی سەرەتایی، لە شاری سنە تێپەڕ کرد. دوای ئەوە چوو بۆ کوردستانی باشوور و لە قوتابخانەی چەند شوێندا، سەرف و نەحو و مەنتیقی خوێند و سەرەنجام لە ڕوانـدز، زیاد لەو دەرسانە، «اصول‌الفقهـ»ی لە خزمەت عەللامە ئەسعەد ئەفەندیدا وەرگرت. پاشان گەیشتە هەولێر و هەیئەت و ڕیازی و سیرەی لە لا مەا ئەفەندی هەولێریوە خوێند و بەشێ لە تەفسیری بەیزاوی و سەحیحی بوخاریشی هەر لەو شارە، لە زانایانی‌تر وەرگرت و ئیجازەی ساند. پاش ئەوە گەڕاوە بۆ «تەوێڵێ»؛ کە ئەو کاتە نیشتنگەی قوتبی تەریقەت، شێخ عەلی حوسامەدین بـوو؛ شـێخیش بـۆ دەرس‌گوتنـەوە، ناردیـە گونـدی «زەڵم». دەوری ساڵی ١٣١٩ ک. هـ. (١٩٤٠ ز.)، لە لایەن ئەوقافی عیراقەوە بوو بە ماموستا لـە پێنجـوێن و ماوەی پێنج ساڵ بە شێوەیەکی ڕێک‌وپێک ئەم ئیشەی بەڕێوە برد. ساڵـی ١٣٢٤ ک. هـ. بوومەلەرزەیـەکی بەتەوژم، پێنجوێنی تێک‌ڕماند. مەلا خالید لەو کارەساتەدا زۆری زیان وەبەر کەوت؛ کوڕێکی تێداچوو. ناچار پێنجوێنی بەجێ‌هێشت و گەڕاوە بۆ سنە. ماوەیـەک لـە مزگـەوتی ئـەمین و سـەرەتێک لـە قوتابخانـەی نەسیردیوان، بەرنوێژی و ماموستایی کرد. دواجار بە شێوەیەکی فەرمی بوو بە ماموستا و ئیمـامی مزگـەوتی وەزیر.

ساڵی ١٣٨٠ ک. م. کە کاکی (مەولانا مەحموودی موفتی) لە دنیا دەرچوو، جێی ئەوی گرتەوە و بوو بـە موفتی و حاکمی شەرعی کوردستان. هەروەها تا ئەم دواییانەش ماموسـتای مەدرەسـەی عولـوومی دیـنی شاری سنە بوو.

حاجی مەلا خالید سەرەنجام لە ٢٦ی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٠٠ ک. م. بەرامبەر بە ١٧ی گـەلاوێژی ١٣٥٩ ک. هـ. (١٩٨٠ ز.)، لە تاراندا ئەمری خوای بەجێ‌هێنا و وەک ڕایسپاردبوو، تەرمەکـەیان بـردە سـەر کێـوی «بێشکۆ»ی لای ڕوانسەر و لە مەرقەدی وەیسدا ناشتیان.

خوا لێ خۆشبوو مەلا خالید مرۆیەکی خاکەسار، میهرەبان، مەردمدار و زانایەکی وریـا و گفـتڕەوان بـوو. شیعری جوان و دلگرە؛ بەڵام کەمتر شیعری دەگوت. بەڕاستی مەولەویناسێکی لەزەبر بوو. ئەو شـێوە ئـەو شیعری مەولەوی تاوەگۆزی شی دەکـردەوە و مانـای لـێدەداوە، دژوارە تـازە کـەس جێـی بگرێتـەوە. زۆر بەداخەوە، ئەو شرۆڤە یەکجار بەرزانە نەچوونە سەر کاغەزان و فەوتان.

بەرهەمێکی مامۆستا، وەرگێڕانی قەسیدەی بوردییەی ئیمام بووسیرییە، هەر لەسەر ئەو کێش و سەروایە؛ بەڵام بە هەورامییەکی پوخت و پاراو. ئەم کتێبە ساڵـی ١٣٧٨ ک. هـ. (١٩٩٩ ز.)، بـە تێکۆشـانی مامۆسـتا هادی مورادی، کە هێنایە سەر ڕێنووسی ئەوڕۆکە و پێشەکی و پەراوێزی بـۆ نووسـی، چـاپ کـرا و چـاوی وێژەوانان و کوردیدۆستانی پێ ڕوون بووەوە. ئەوا چەند بەیتی سەرەتاکەی:

جە کەردەیـە و یـادۆ هامـساکانوو «ذیسَلَم»ی — هەرسی ونینێ مەڕێزنی تۆ جە گۆشەو چەمێ؟
یا هۆرش کـەردەن شـنەو شەماڵـو لاو «کاظمـە»ی — یا شۆڵەش داوە بەرقی جە تـاریکیو «اضَـم»ی؟
چەمێت چی تا واچی وەس! بەتاو هەرسی مـەڕێژنا — چی دڵوەشی پەی دڵیت مەدەمنۆ دەمـەو غـەمی؟
چەنی خەیاڵش مەلۆ ئاشق دڵـش مەخفییـەن — گۆشێو دڵی جۆش مەدۆ قوڵش مەجنۆ جە چەمی؟
ئیشق ئەر نەبۆ نەمجێنی هەرسی هەوارگانـەرە — وەرموو شەوێت نەبڕڕی فکـرو «بـان» و «عَلَـم»ی
ئینکار چەنی مەکەری ئیـشقت کـە شاهیدشـەن؟ — وارانوو هەرس و چـەمی، زایفـی و زەردی و غـەمی
جۆی هەرسی سووریێ سەروو ڕوخساری زەردیتەرە — چمان گوڵو «بهـار»ین تێکـەڵ چـەنیو «عَنَم»ی
فکـرو حـەبیبم بەڵـێ ئـارام و وەرمـش بـڕی — حوببی لەزەت مەفەوتنۆ بە دەرد و دا و ئەلەمی
جە ئیشقی «عُذری» ڕەقیب! عوزرم قـەبووڵ بکـەرە — مەگێرە عەیبم وەروو ئینساف و ڕەحمی کەمی
حڵو من جە تۆ ویەرد، فاشەن جـە لاو گـر کەسـێ — دەردم گرانەن، سرم کەوتـەن دەمـو مـەردمی
نەسێحەتو تـۆ بـە گۆشـم ئاشـنا کـەی مـەبۆ؟ — ئاشقی گۆشش کەڕەن جە عەیب و لۆمـە و غـەمی
پیری کە نەسێحەتش جە توهمەتی خاڵـییەن — نەسـێحەتش لامـەوە پێـسەنە موتتەهـەمی

مامۆستا ئەم شیعرەی بۆ کاکی (مەلا موحەممەدی بورهان)، کە لە ئەستەمبووڵ بووە، هۆنیوەتەوە و بۆی ناردووە:

های شەماڵ! پـەیکی گـشت دەردەداران — مـەحرەم ئەسـرار جـە خزمـەت یـاران
پێـشڕەوی ئامـای سـپای وەهـاران — ئـارایشدەری هـەردوو کۆسـاران
شـادکەری دیـدە و دڵـی بوڵـبوڵان — وەلادەر پـەردەی ڕوخـساری گـوڵان
فـەڕڕاش فـەرش زمـڕووتی چەمـەن — مەششاتەی ڕوومـەت لـەعل و یاسـەمەن
نـەرگس بێدارکـەر جـە لانـساران — بەخـشندەی تـاجی شـکۆفەی داران
خولاسـە هـەرچی مـەوینۆ وە چـەم — جـەتۆ دڵـشادەن، ئاسوودەن جـە غـەم

بـەو بـەشـق شـنۆی سـوب سـەحەرانت وە لادان زوڵـــف مـــەهـ پەیکـــەرانت
وە عــەتر ئامێزیــت جــە یەخــەی یــاران پـــەی شـــەفای داغ گـــشت دەردەداران
ڕەحمــێ کــەر وە حــاڵ دڵــەی زەلــیلم بــۆ چەنــد ســەباحێ بــۆ وە دەلــیلم
هۆرگێرە گـەردێ جـە سـفتەکەم، بـووڵ پـــەی ڕانماییـــت هـــەتا ئەســـتەمووڵ
ئانـا سـەیل چـەم جاگـە جـەم وەردەن دوو دەریـــا وە هـــەم ئامێتـــە کـــەردەن
یەکێ وێنەی بـەخت سـیاهـ و شـوومەن ئـەو یـەک نیـشانەی سـفیدی موومـەن
پـــەی شـــاهدی حـــاڵ زار و غـــەمینم مەوج وەردەن جە دەور قیبلەکەی دیـنم
جا، وێت جیای مـن قوربـان بـاڵاش کـەر پـەی دیـدەم داوای گـەرد پـاڵاش کـەر
ئەر پرساش چەنەت حاڵـم ئـەو سـەروەر جە ڕووی لوتفـەوە پـێش ئـەو جـواو دەر
واچە ئەو حاڵـە و ئـەو دەردە و ئـەو غـەم مــن دیم یــاخوا تــۆ نــەوینیش وە چــەم
ئەســـرین مـــەڕێزنا جـــە دیـــدەی تـــاردا چـــون واران جـــە شـــەو تـــاری وەهـــاردا
وەختـــێ هۆشـــم دا وە دەرد کـــاریش ئینـــەم حاڵـــی بـــێ جـــە ســـۆز زاریـــش
های شەماڵ! ئامان جـە گـوڵ پەیکـەرێ نامان ڕیشەی غـەم جـە دڵ پـەی کـەرێ
ناکیاســـتەن ئومێـــد دونیـــا و دینەکـــەم نامـــە پـــەی مەرهـــەم ڕووی برینەکـــەم
دووی کـــوورەی دەروون ئـــایر بـــەردەوە ســـەیلاو ئەســـرین لافـــاو کـــەردەوە
باخچەکەی شادی تـوێ دڵـەی ئـەوگـار بـــەرباد دا یـــەکجار کـــەرد وە شـــۆرەزار
پـــەیک خەیاڵـــش پـــەی تەســـکین دەرد گاهـــێ بـــێزەحمـــەت وە دڵا مەویـــەرد
ئیـسە تـەنخوای گـوڵ خێزیـان پـەیکوڵ جـــە لاش ئەزیەتـــەن پـــا بنیـــو وە دڵ
گیـــانیچ وە تـــەنیا بـــێقـــەرار بییـــەن قەفـــەس بـــەدەن لـــێش بێـــزار بییـــەن
واچـــە ئـــەر گونـــاش نـــەدارۆ حـــەســـاو چینــــــە زیاتــــــەر مــــــەوازۆ عــــــەزاو
بـەڵام تـۆ پـەی وێـت کـەردەنـت یاسـا مـــەفهـــوومی «أحْـسنْ إلــی مَــنْ أسـا»
هۆرکەر جـۆی حـەیات وە نـووک قەڵـەم بـا ماڵـۆ جـە دڵ خـەس و خـار غـەم
بـــەڵ ڕیـــشەی شـــادی ئـــاوێ وەردەوە خونچـەی باخچەکـەش تـاوێ کـەردەوە
خەیاڵـــش جارـــجـــار پـــا بنیـــۆ پێـــشدا گیـانیش سـاکت بـۆ جـە یانـەی وێـشدا

وەرگێڕاوەی سێ بەیتی سەعدی، بە کوردی سۆرانی:

قـــسە کاتـــێ دەکـــا پیـــاوی ژیـــر یاکوو پەنجە دەکـا لـە پـاروو گـیر
گەر نـەڵـێ بـۆ گـەلی زیـانی بـێ وەر نــەخــوا ئافــەتی ژیــانی بــێ
بۆیـــە دایم وتـــەی لـــە ســـوودایە خواردنی لەشخوەشی لـە دوودایـە

ئەمەش قەتعە فارسییەکەی سەعدی:

سـخن آنگـه کنـد حکـیم آغـاز | یـا سرانگـشت سـوی لقمـه دراز
کـه ز نـاگفتنش خلـل زایـد | یـا ز نـاخوردنش بـه جـان آیـد
لاجـرم حکمـتش بـود گفتـار | خـوردنش تندرسـتی آرد بـار

یاداشتەکانی نووسەر. *قەسیدەی پیرۆزی بوردییە بە هەورامی*، وەرگێڕاوەی حاجی مەلا خالیدی موفتی، پێشەکی و پەراوێزی هادی مورادی، پەخشانگای ئیحسان، تاران، ١٣٧٨ ک. ھ.

## میرزا ئەحمەدی داواشی

میرزا ئەحمەدی موحەممەدیی، کوڕی داواشی موحەممەد، کوڕی مراد، ساڵی ١٣١٨ ک. م. لە ڕوانسەر هاتۆتە دنیا. کە پێگەیشتووە، لای مەلا موحەممەد حەسەنی جوانڕۆیی، لە گوندی «تەمتەم»ی سەر بە ڕوانسەر، خوێندنی دەسپێکردووە. دواجاریش تا تەمەنی ١٩ ساڵان لێرە و لەوێ و وردە ـ وردە خوێندوویە و لەو کاتەوە بەردەستیی بابی کردووە. کە باوکی لە دنیا چووە، تا ماوەیەک چۆتە ڕیزی پیاوانی عەباس‌خانی ئەردەڵان ( سەردار ڕەشید) و لە نزیکانی بووە.

میرزا ئەحمەد مرۆیەکی خۆش سەر و زمان، خاوەن زەوقی شیعر، بیر تیژ و گفتڕەوان و لە باری عیرفانیشەوە سەر بە تەریقەتی قادری بووە. شیعری کوردی، لە غەزەل و قەسیدە و داستان و شینگێڕی، زۆری گوتووە.

کۆچی دوایی میرزا، لە١٢ی زیقەعدەی ساڵی ١٤٠١ ک. م. بەرامبەر بە ١٣٥٩ ک. ھ. (١٩٨٠ ز.) ڕووی داوە و بەپێی وەسیەتی خۆی، لە مەرقەدی وەیسدا نێژراوە.

**دوو نموونە لە شیعرەکانی**:

ئـازیزم! مـەیلم، ئـازیزم! مـەیلم | جـە نـۆ تـازە بی جـە لای تـۆ مـەیلم
جۆش ئاوەرد دڵـەی جـە خـەمان کـەیلم | جارییەن هەر شـەو جـۆی ئەسـر سـەیلم
سا تۆیچ بەو چون لەیل سـەوزەی سەوسـەن خـاڵ | تاڵـێ زوڵـفەکەت بـدەر وە شـەماڵ
پـەی سـاکنی دەرد، شـەفای ئـێش زام | چـەنی نەسـیمش بـاوەرۆش وەلام
وەشـەن ئـەر شـەماڵ بـەیۆ ژ ڕاوە | چەن تایێ جە زوڵـف تـۆش هـان وەلاوە
وە مەرگت قەسەم شـەکەر ڕێـزەی ڕاز | جـەو دەم ئـەرواحم مەشـۆ وە پێـشواز
ڕازیمن جە ڕای تای گیـسووی دڵـبەر | نـە جـای مزگـانی بـدەم گیـان و سـەر
ئەحیانـەن ئـازیز! ئەگـەر مـن مـەردم | گیان جـە ڕای تـوغرای زوڵـفت سـپەردم
ئیمجـا جـەو دمـا شـۆخ نـازدارم! | تەشریف بـار وە پـای سـەنگ مـەزارم



وە حەســـــرەتەوە نەونـــــەمام نـــــۆم
پەنجـــەت بمالـــە وە خـــاک گـــڵکۆم

ئامانـــــت فـــــەرزەن، دۆس شـــــیرینم
میقراز گازەکەت شیکەر پـەی شـینم

زوڵفت چون ڕێحان پەخشکەر نـەدەورم
دەر ساعەت مەبۆ بە بەهەشـت قـەورم

نە یاگەی تەڵـقین، سـوورەی یاسـینم
بملاوێنــــــەرەو ئیمـــــان و دیـــــنم!

دەم بنیــە وە بــان گــڵکۆی تازەکــەم
واچــە هــەی شــەهید تــیر نازەکــەم

مەست بادەی عەشق لەبتەڕ نەکەردە
فــراوان حەســرەت وە گــڵکۆ بــەردە

سەر هۆردار لـەیلم خـاتر ئـەوگار تـۆم
زام بە سـۆ کەفتـەی پـای مـەزار تـۆم

بدیە من پەی تۆ جـەرگم پـڕ نێـشەن
وە تیــغ نــاخون ڕوخــسارم ڕێــشەن

ئەوســا نەپرســام چێــشەن ئــازارت
ئیـــستە مەناڵــم نــە پــای مــەزارت

ئەرچی بێسوودەن لـەو سـەروەختەدا
زاریکــەن وەبــان خــارای ســەختەدا

وەلــێ بــەو وە یــاد ویــەردەی وەریــن
لــە چــەمان مەســت بــڕێزە ئەســرین

بەڵ قەترەی ئەسرت بگنۆ وە ڕووی خـاک
وە حەســرەتەوە خــاککــەرۆ نمنــاک

جەو دەم پەی مەڵهەم زامان خەستەم
نــە گــڵکۆمەوە بگنـــۆ وە جەســـتەم

بە وێنەی ئەنفاس مەسـیحای مەریـەم
ئیحیام مەکـەرۆ قـەترەی ئەسـر چـەم

وەرنە خۆ «ئەحمەد» بە دڵ مەردەی تـۆن
تا ئەبەد، سەوزەم! ئیمان هەردەی تۆن

* * *

قیبلـەم! ئیعـدامم، قیبلـەم! ئیعـدامم
حەققــەن ســادرکەی حــوکم ئیعــدام

ئیعـدام وەشـتەرەن هـەی نەونـەمامم
نەک هەر ئان نمـەک بـدەی وە زامـم

با ڕەحمـەت نـەیۆ، ئـەرچی بێچـارەم
بەو بەی سزای سەخت بـدەر قـەنارەم

ئـــــەمر بفـــــەرموو فەڕڕاشـــــان چـــــاو
پــەتم لــە زوڵــفت هەڵــخەران وە تــاو

لە حەڵقەی زوڵفت حەڵقئاوێزم کـەن
دوچــار عــەزاب ڕەســتاخێزم کــەن

وە نــێش مــوژەت بزمــارڕێزم کــەن
لـــە دار بـــالات ســـەرئاوێزم کـــەن

ڕازییــەن «ئــەحمــەد» وا بـە فـدات بـۆ
وە شــەرتێ قــەبرش بــە ســەرەڕات بــۆ

پــا بنیــە پێــشدا وە نــاز بــۆ یــاری
نــەقش پــات وەســەن پــەی یادگــاری

*حدیقەی سُلطانی*، ل٢٦. یاداشتەکانی نووسەر.

## ئاغە بابا

سەید بابا ئەحمەدی شەهیدی، مەشهوور بە «ئاغە بابا»، کوڕی سەید ڕەحمەت، لە پشتی سەید موحەممـەد

زاهید، ناسراو بە «پیرخدری شاهۆ»، ساڵی ١٢٨٠ ک. م. لە ئاوایی «عەباساوا» (حەسار چەرمگ)، لە ناوچـەی گەڕووس هاتە دنیا و لە بنەماڵەیەکی ئایینیدا گەورە بوو.

ئاغە بابا پیاوێکی دیندار، خاکەسار، یەکجار بەخشندە و میـوانخۆشەویـست بـوو. دوای هێنـدێک ماڵـی گواستەوە گوندی «زاخەی خوارگ»، لە نزیک دیواندەرە، کە لەسەر ڕێگای سنە و سەقزە. ناوی ئەو گوندە بـە ئاغە باباوە دەناسرا و میوانخانەی ئاغە بابا لەوێ ـکە دەرگا و حەوشەی بۆ دانـەنابوو ــ هـەموو کـات پـڕ لـە میوانی لە هەموو چینێک بوو. تەنانەت ئەگەر کەسێکی نەناسیش ڕێی لە ماڵی بکەوتایە، وا بە گـەرم و گـوڕ پێشوازی لێ دەکرد، دەتگوت دۆستی چەنایچەنساڵەیە.

ئەگەرچی خاوەنی نیوەی دێیەکە بوو، بەڵام هێندەی بۆ نەدەماوە و بڕێ جار قەرزداریش دەبوو.

ئاغە بابا لەم دواییانەدا، بە هۆی پیری و نەخۆشی، ماڵی هاتە شار و لە سنە دانیشت و سەرەنجام لە سەرماوەزی ساڵی ١٣٥٩ ک. ه. (١٩٨٠ ز.)، ڕووی لە دنیا چەرخاند و بوو بە میوانی خوای بەخشندە و میهرەبان.

یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا ئەحمەدی تورجانیزادە

کوڕی مەلا حوسەین، کوڕی عەللامە مەلا عەلی قزڵجی تورجانی، ساڵی ١٣١٩ ک. م. لە شـاری مـەهاباد هاتە دنیا. هەر لە پێنج ساڵانەوە، بە زیرەکی و لێهاتوویی، ئەلف و بێتکـە و جزمـی عـەم فێـر بـوو. هەشـت ساڵان قورئانی خەتم کرد و فارسی دەخوێندەوە و مەشقی نووسینی دەکرد. لەوەو پاش لە ژێر چـاوەدێری بابی و لە خزمەت کاکی زانای (مەلا موحەممەدی قزڵجی)دا، خوێندنی سـەرەتایی عـەرەبی دەسـپێکرد و هەموو کتێبانی ئەو سەردەمەی فەقێیانی خوێند و دەورکردەوە و خزمەتی مامۆستایانیتریش گەیشت و بە کورتی لە ٢١ ساڵاندا دەرس و دەوری مەلایەتی تەواو کرد. دوای ئەوە سەردەمێکیش خـەریکی خوێنـدنی زانستە نوێیەکان، وەک حیساب و هیندسەی تازە و بەشێکی جەبر و موقابیلە و کیمیا و زمانی ئینگلیسی و فەڕانسە بوو. پاش ئـەوە دە ــدوازدە ساڵـی بـە دەرسگوتنـەوی فـەقێیان و خوێنـدنی کتێبـە ئـایینی و ئەدەبییـەکانی دوو زمـانی عـەرەبی و فارسـی تێپەڕانـد. ساڵـی ١٣١٥ ک. ه. (١٩٣٦ ز.)، لـە وەزارەتی مەعاریفدا دامەزرا و ماوەی شەش ساڵ لەوێ کاری کرد و پاشـان چـووە وەزارەتی پـەروەردە و لـە شـاری ورمێ و مەشهەد و تاران، لە پۆلی دواناوەندی بوو بە مامۆستا. دوای ئەوە لە زانستگای تەورێز پلەی ئوستادی درایە و تا دوا ساڵی ژیان (١٣٥٩، ١٩٨٠ ز)، مامۆستای زانکۆی زمان و وێژەی ئەوێ بوو.

**کتێبەکانی مامۆستا:**

١. *تاریخ ادبیات عرب، از دورەی جاهلّیت تا عصر حاضر*، بە فارسی، تەورێز، ١٣٤٨ ک. ه.

٢.*شرحی بر سبعەی معلّقه*، بە فارسی

٣. *الأُستاذ الاجل سعدی الشیرازی*، بە عەرەبی، کە ساڵی ١٣٢٩ (١٩٥٠ ز.) لـە «معهـد اللغـات الـشرقیه»ی زانستگای فوئادی قاهیرەدا بۆ قوتابیان و فەقێیانی میسری خوێندۆتەوە، چاپی زانکۆی ئەدەبیاتی تەورێز

٤. *داستان منظوم مکتبدار بصره*، بە فارسی

٥. *علوم معانی و بیان*، بە فارسی

٦.*مسائل و احکام فقهی*، بە فارسی

٧. *رد معتقدین اقانیم ثلاثه*، نامیلکەیەکە بە فارسی

٨. *آداب المناظره*، بە عەرەبی

٩. *دیوان اشعار*

١٠. *رسالةُ الحذف*، بە عەرەبی

تورجانیزادە زەوقی شیعریشی هەبووە و بە فارسی و عەرەبی شیعری گوتووە. ئەوا دوو نموونەی:

یەکەم، چەند بەیتی کۆتایی هۆنراوەی داستانی «*مکتبدار بصره*»:

نظـم کـردم داسـتانی بـس دقیـق — نقـــل از دیـــوان آثـــار عتیـــق

تـا بـود از مـن بـه دوران یادگـار — مـــن نمانـــدم، او بمانـــد پایـــدار

ایـن حکایـت را کـز ایـام قـدیم — در صدف مانده است چون درّ یتیم

مـن بـرون آوردم از قعـر بحـور — شـاهدان را تـا شـود عقـد نحـور

ور نباشـــد در بـــرونش زیـــوری — میدرخشد در درون چون گوهری

در دل دریـا شـدن بـا صبر و جـد — کـار غواصـان بـود ای مجتهـد

تـا بـرون آرنـد از بحـر عظـیم — درّ و گوهرهـای رخـشان و کـریم

لعـل کـان و گـوهر بحـر اجـاج — زینت این سینههـای همچـو عـاج

لیـک مرواریـد دریـای زمـان — زیـــور دل آمـــد و زیـــب روان

الحـق ایـن پیـشینیان نکتـهیـاب — بـا بیـان روشـن و فکـر صـواب

عبـرتآور داسـتانها گفتـهانـد — لُؤلـؤ لالای معنـی سـفتهانـد

آفـرین بـر طبـع گوهربارشـان — بـر صـریر خامـهی سرشارشـان

ای خوشا آن دل که غواصی بـود — نخـل معنـی را چـو خواصـی بـود

مرحبـا بـر آن زبـان خـوشبیـان — کـو بـود اسـرار جـان را ترجمـان

مرحبا بر کلک و بـر مـا یـسطرون — روشـــنیبخـــشان اســـرار درون

لَـــوْحش الله از اشـــارات لطیـــف — وز نکـات طرفـه و نغـز و ظریـف

حَبَّـــذا نقـــش نگـــارین نامـــههـــا — و آن گُهرافشان و مُشکینخامـههـا

خرّمـــا صـــورتگران پاکبـــاز / چهـره‌پـردازان بـت‌هـای طـراز
آفــرین بـــر نقـــشبندان گـــزین / و آن هُنرکـــاران معنـــی‌آفـــرین
شـــاد بـــادا روح آن روشـــندلان / کـــز بـــرای انتبـــاه مُقـــبلان
در دل کـوه و کتـاب و بـر حَجَـر / نقـش‌هـا بـستند از پنـد و عبـر
لَـوْحِ‌اَبْجَـد بهـر مـا بنگاشـتند / علـم و حکمـت را عَلَـم افراشـتند
آفـرین بـر روشـنان پـاک‌دیـن / رحمـــه‌الله عَلَـــیْهم اَجْمَعـــین

ساڵی ١٣١٦ ک. هـ. لە ماڵی شازادە ئەفسەرمیرزای قاجاردا کۆڕێکی ئەدەبی بووە. جارێک ئەم دوو بەیتە مەشهوورە بۆتە سەرباسی کۆڕ و هەرکەسێک بە زەوقی خۆی، پێشوازی لێ کردووە:

این خط جاده‌ها کـه بـه صـحرا نوشـته‌انـد / یـــاران رفتـــه بـــا قلـــم پـــا نوشـــته‌انـــد
سنگ مزارهـا همـه سربـسته نامـه‌ای اسـت / کـــز آخـــرت بـــه مـــردم دنیـــا نوشـــته‌انـــد

ئەمەش غەزەڵەکەی تورجانی‌زادە:

ایـن کارنامـه‌هـا کـه بـه دنیـا نوشـته‌انـد / از بهـــر عبـــرت دل دانـــا نوشـــته‌انـــد
اَسـرار حکمـت اسـت در اوراق کاینـات / در کوه و دشت و وادی و صحرا نوشته‌انـد
تقـــدیس کبریـــا و جـــلال و جمـــال او / در مـسجد و کُنـشت و کلیـسا نوشـته‌انـد
از خط سیر مـور کـه بینی بـه راه خـویش / درســی بــرای مــردم بینــا نوشــته‌انــد
بهـر صـلاح حـال، بـه ابنـای روزگـار / آبـــای دهـــر لـــوح اَلفبـــا نوشـــته‌انـــد
در چـشم عارفـان خـدابین حـق‌شـناس / توحیـد ذات در همـه اشـیا نوشـته‌انـد
هرچ آن نوشته‌اند ز نعـت صـفات دوسـت / یـک از هـزار و قطـره ز دریـا نوشـته‌انـد
یـک لمعـه از تجلـی عـشق جمـال اوسـت / هـر قـصه‌ای ز وامـق و عـذرا نوشـته‌انـد
آنـــان کـــه غافلنـــد ز انعـــام و فـــضل او / در نامـه‌هـای خـویش خطاهـا نوشـته‌انـد
منـــشور شـــوربختی و ادبـــار خویـــشتن / بـر صـورت و قیافـه و سـیما نوشـته‌انـد
در خـود چـو بنگرنـد نهـان‌هـا شـود پدیـد / کانجـا رمـوز حـل معمـا نوشـته‌انـد
بنگر چـه رمزهاسـت کـه از حـسن دلبـران / بر روی خـوب و نـرگس شـهلا نوشـته‌انـد
ایـن نقطـه‌هـای خـال چـه نیکـو نهـاده‌انـد / ویـن خـط‌هـای سـبز چـه زیبـا نوشـته‌انـد
پیوســـته ابـــروان دلارای مهرُخـــان / تفـسیر قـاب قـوس أو أدنـی نوشـته‌انـد
بـا خامـه‌هـای مـشک‌فـشان زلـف دلبـران / بـر روی مـاه سـوره‌ی أسـری نوشـته‌انـد
بـــر خـــاک آســـتان خداونـــد، عارفـــان / بـا کلـک فـرق حـرف تمنـا نوشـته‌انـد
«ترجـانی» ایـن صـحائف و اوراق در نـورد / کـاین بحـث را رجـال توانـا نوشـته‌انـد

یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا موحەممەدی عوبەیدی

کوڕی مەلا عەبدوڵڵا، کوڕی شێخ عەبدولقادر، خەڵکی گوندی «عەبابەیلێ» لای هەڵەبجە، ساڵی ١٣٢٥ ک. م. هاتە دنیا و هەر لە زێدی خۆی، لای باببیەوە تا پلەی ئاخر خوێندی و لە دەستی باوکی و باباڕەسوولی عەبابەیلێ ئیجازەی وەرگرت.

مەلا موحەممەد سەرەتا ماوەیەک لە گوندی «سۆڵە» دانیشت و دەرسی گوتەوە؛ دوای ئەوە چوو بۆ هەڵەبجە و بە یارمەتی خەڵکەکە، مزگەوت و مەدرەسەیەکی کردەوە و تا کۆتایی ژیانی (١٤٠١ ک. م.) لەوێ ماوە و خزمەتی ئایینی و زانستی کرد.

ئەم مامۆستایە پیاوێکی هێژا، لەسەرخۆ، بەئەدەب و ڕێزدار بووە؛ زۆری کتێب خوێندووە و هێندێک نووسراوەشی هەیە، یەکیان نامیلکەیەکە، سەبارەت بە «سێ‌تەڵاقە».

*عُلَماونا فی خدمةالعلم و الدّین*، ل ٥٤٠.

## زاری سەقزی

مەلا عەبدولکەریم، کوڕی عەبدوڵڵا، نازناو «زاری»، ساڵی ١٣٢٧ یان ١٣٢٨ ک. م. لە گوندی «ئاڵ‌کەلوو»ی سەر بە شاری سەقز هاتە دنیا و پاش خوێندنێکی سەرەتایی، چووە فەقێتی و کە دەرس‌ودەوری تەواو کرد، لە دێی«عەرەب ئوغلی سەروو»ی لای سەقز دانیشت و پیرای کشتوکاڵ، ئەرکی بەرنوێژی و ڕێنوێنی خەڵکەکەی گرتە ئەستۆی خۆی و سەرەنجام لە ٢٧ی گوڵانی ساڵی ١٣٦٠ ک. هـ. )١٩٨١ ز.)، بەرامبەر بە ١٤٠١ ک. م.ماڵاوایی لە دنیا کرد.

زاری وێژەوان و خاوەن زەوقی شیعری بووە و بە کوردی و فارسی شیعری گوتووە؛ ئەوا دوو نموونەی:

لە تاریکی شەوی هیجرام و موحتاجی چرای ڕووتم
لە گەنجی ئارەزوو دوور و لەگەڵ ماری خەمت جووتم

هەموو کەس با بزانێ چاکە وا من گیری داوی تۆم
غولامی خاڵی موشکین و قەدی باریکی وەک مووتم

لە سایەی ئاوری عشقی جەماڵی دڵڕفێنی تۆ
هەماری نەفت و گۆگرد و خەزینەی بەرق و بارووتم

ئەگەرچی ئاگری عەشقت بڵێسەی بەرزە، سووزانە
منم ئەمڕۆ سەمەندەر ئاورم هیلانە ناسووتم



لە ئەو ڕۆژەو موژەت تـەدبیری قەتـڵی عاشـقانی کـرد
مـنی بێـدڵ خـەریکی تەوسـیەی تاشـینی تـابووتم
ئەگـەر داوود تـەوفێقی خـودا بێـت و نـەکا یـاری
ئەمن کـەی پاڵـەوانی مەعرەکـەی مەیـدانی جـالووتم
گەدایی بێ‌پەناه و بـێ‌کـەس و گـەردەن‌کەچـە «زاری»
بە ڕەحمەت دەستی بگرە، ئـەز غـولامی دەسـت و بـازووتم

* * *

دلـی دارم بـه سـان بوتـه در تـاب — وزو خون می‌چکد، وز دیده خوناب
خلیـده خـار هجـران در رگ جـان — نشـسته زاغ نومیـدی بـه بُـستان
لگـدکوب سـتم باشـد وجـودم — نمـی‌دانـم از ایـن سـودا چـه سـودم
گـل عمـرم شـده پژمـرده از غـم — تـنم بـی‌حس بـه سـان مـرده از غـم
چنـان گـشتم زبـون و عاقبـت شـوم — در ایـن ویرانـه شـد هـم لانـه‌ام بـوم
چنـان آشـفته و زار و نـزارم — که بـر خـود نـام «زاری» مـی گـذارم

یاداشتەکانی نووسەر.

## موحەممەد ساڵەحی وەکیل

کوڕی موحەممەدخانی وەکیل «وکیلُ‌المُلک»، نازناو «ساڵح»، ساڵی ١٣٠٧ ک. ه. (١٩٢٨ ز.) لە سـنە هاتـە دنیا و لەو شارە دیپلومی وەرگرت. ئەوجار (ساڵی ١٣٢٨) چوو بۆ تاران و لە دوو زانکۆی ئەدەبیات و حوقۆقدا خوێندی و ساڵی ١٣٣١ لیسانسی ساند. ساڵی دوایی لە وەزارەتی پەروەردە دامەزرا. سـەرەتا لـە کرماشـان بوو بە مامۆستای دواناوەندی و پاشان (١٣٢٥) گەڕاوە سـنە و بـاقی ژیـانی لـە دەبیرسـتانەکانی ئەوشـارەدا خزمەتی کرد. ساڵی ١٣٤٣ بۆ حەج ڕۆی و سـەرەنجام سـەرەتای مـانگی ڕەزبـەری ساڵـی ١٣٦١ ک. ه. (١٩٨٢ ز)، بەرامبەر بە ڕەمەزانی ساڵی ١٤٠٢ ک. م. لە دنیا چوو.

وەکیل هەر لە سەرەتای لاویەوە، بە هۆی لێهاتوویی سرشتی و ڕاهاتوویی هزر و بیری، سەری‌کردە زمان و وێژەی فارسی و شیعرگوتنی دەسپێکرد. یەکەمین هۆنراوەکانی، وەرگێڕاوەیەک بوو لە زبانی فەڕانسەوە بـۆ فارسی، کە لە گۆڤاری «*گل‌های رنگارنگ*»دا چاپ کرا. ئەم مامۆستایە زبان و وێژەی فارسـی بـاش دەزانی و شیعری جوان بوون. دیوانی شیعرەکانی ـکە خۆی «شکوفه‌های جاودان»ی ناو ناوە ـ هێشتا چاپ نـەکراوە.

**باقی کتێبەکانی بریتین لە**:

١. «*از رودکی تا بهار*»، کتێبێکە لەمەڕ مێژووی وێژەی فارسییەوە

٢.«*تاریخ هندوستان از قرن هجدهم تا آغاز استقلال*»، چاپی ١٣٥٢ ک. هـ.
٣. «*سیری در تاریخ فلسفه و فرهنگ*»، چاپی ١٣٥٣ ک. هـ.
٤. نامیلکەیەک لەمەڕ ڕێزمانی فارسیوە

**دوو شیعری وەکیل**:

مهری که در وجودی و شوقی که در سری — مـــــاه بلندپایـــــه و بـــــدر منــــوّری
ظـاهر چـو آدمـی و بـه سـیرت فرشـته‌ای — در پـاکی و خلـوص درخـشنده گـوهری
فرزانـــه‌ای و گـــوهر تـــو فـــرّ و زیـــب تـــو — در عـالم کمـال خـرد، زیـب و زیـوری
روشـن ز توسـت روز مـن ای سـرو مـاهرو — در شـام تـار مـن چـو فروزنـده اختـری
پروانـه‌وار شـمع رخـت شـد مطـاف مـن — شـمع دلـی و لیـک روان را چـو آذری
رود نـشاط‌بخـش چـو شـهرود رودکـی — یـا بـاده‌ای و صـبحگهان مـستی‌آوری
تابنـده همچـو نـور بـه صـبح امیـد مـن — درگـاه هجـر بـر دل زارم چـو اخگـری
والاتـــر از مثـــالی و بـــالاتر از قیـــاس — در بارگـــاه عقـــل ز حجـــت فراتـــری
محبـــوبتر ز چنگـــی و زیبـــاتری ز شـــعر — مطبـــوع‌تـــر ز زاده‌ی کلـــک هنـــروری
الهـــامی از گلـــی و نـــشانی ز نـــسترین — در لالـــه‌زار حـــسن ز گـــل دلرُبـــاتری
هـــستی‌ده حیـــات و همـــای ســـعادتی — بـر بـام مـا ز لطـف و صـفا سـایه‌گـستری

* * *

کتـــابی ورق مـــی‌زدم صـــبحگاه — به جـوفش یکـی چامـه زان تـو بـود
بدیـــدم خـــط دلفریـــب تـــو را — کـه در رمـز هـستی نـشان تـو بـود
بـه دل پرتـو افکنـد نـوری چـو مـاه
ز دود از دلـــم خـــاطرات ســـیاه
بـــه یـــاد آمـــدم خـــاطراتی بـــدیع — از آن خـاطرات خـوش رفتـه هـا
ســـرودی ز پـــرواز مـــرغ و بـــشر — بـه تقلیـد سـعدی گهـر گفتـه‌هـا
چنـین شـعر نغـز از کـلام تـو بـود
لغتهـــا و معنـــی غـــلام تـــو بـــود
غـــلام تـــوام دوســـتدار عزیـــز — تـو ای مـاه مـن، مـشعل زنـدگی
فـــروغ مـــن و عـــشق و امیـــد مـــن — تـو را چـون معـانی کـنم بنـدگی
دو جسمیم و یـک روح، جـان منـی
حبیـــب عیـــان و نهـــان منـــی

تـوی آفتـاب کمـالات و حـسن — بـه دفتـر خـط تـو مـرا یادگـار
نیـازم بـه دیگـر اثرهـای توسـت — اثرهـــای زینـــده و شـــاهکار
دهـم دیـدەی تـار از آن روشـنی
کـه در زنـدگی خـود تـو نـور منـی

یاداشتەکانی نووسەر.

## کاردۆخی[١]

شێخ موحەممەد ئەمین، کوڕی کاکشێخ، کوڕی شێخ موحەممەد بەهائەدینی نەقشبەندی تەوێڵەیی، لـە ٢٥ی مانگی سێهەمی ساڵی ١٩١٦ ز. لە گوندی «تەوێڵێ» هاتە دنیا و خوێنـدنی سـەرەتایی، بـە منداڵـی و هەر لەوێ دەسپێکرد. پاشان چووە قوتابخانە (١٩٢٩) و بە شوێن ئەوەدا بۆ خوێندنی دواناوەنـدی گەیـشتە بەغدا و ساڵی ١٩٣٩ لە پەروەردەی زانستی مامۆستایانی لادێییدا دیپلومی وەرگرت و ئـەوجار لـە وەزارەتی پەروەردەی عیراقدا دامەزرا و ماوەی ٣١ ساڵ لە تەوێڵێ، بیارە، عەبابـەیلێ، هەڵـەبجە، سـلێمانی و بەغـدا خزمەتی کرد و ساڵی ١٩٧٠ ز. وەنیشتە بوو.

کاردۆخی هەر لە سەرەتای دامەزرانیـەوە، خوێندنـەوەی کتێبـە وێژەییـەکانی کـورد و فـارس و تـرک، بەتایبەت کرۆکاش لە مێژووی وێژەی کورد و کۆکردنەوە و هەڵەگـری هێنـدێک لـە دیوانـە کوردییـەکانی دەسپێکرد. هاوکات بۆخۆشی ـکە خاوەن زەوقییێکی تەواو بووـ شیعری دادەنا.

مامۆستا کاردۆخی کتێبخانەیەکی بایەخداری پێکهێنابوو کە بەداخەوە داگیرکەران لە هێرشیان بۆ سەر سلێمانی، ماڵ و کتێبخانەکەیان سووتاند و هەموو ئەو کتێبانە لە ناو چـوون؛ کتـێبی وەک: دیـوانی مـیرزا عەبدولقادری پاوەیی، دیوانی سەیدی هەورامی، چەند شانۆنامەی کوردی و ...

**بەشێک لە کارەکانی کاردۆخی**:

١. وەرگێڕانی *دیوانی میرزادەی عیشقی*، بە کوردی
٢. وەرگێڕانی *حەدیقەی خوسرەوی*، لە فارسییەوە بە کوردی
٣. کۆکردنەوە، پێداچوونەوە و چاپی *دیوانی سەیدی هەورامی*
٤. چاپی *دیوانی شاهۆ*
٥. چاپی *دیوانی شایق*
٦. *فەرهەنگی هەورامی بە سۆرانی*

---

١. **کاردۆخ**: ناوی یەکەم هۆزێکە لە مێژووی کەونارادا، کە لە کوردستان نیشتەجێ بوون.

مامۆستا کاردۆخی سەرەنجام ساڵی١٣٦١ ک. ھ. (١٩٨٢ ز.)، بەرامبەر بە ١٤٠٢ ک. م. پاش ماوەیەک نەخۆشی، ڕووی لە شاری خامۆشان نا و لە زیارەتانی «گردی سەیوان» نێژرا.

**چەند شیعری کاردۆخی**:

هەر تۆنی وەشیم، وەتەن! هەرووەش بی — جە دەرد و بەڵا و دیلی بێبەش بی
یاگێ و تەر دلگیر پێسە و تۆ نیا — بەهەشت وێنەی تۆ ئەر نەبۆ نیا
دل گەر سەعات بۆ بێڕیا و درۆ — پەی ئازادی تو دەنگێ بەرز چڕۆ
دەخیل هەی کوردا! گیانم فداتا — چەمێو گێلەندێ وەر وە دماتا
وەتەن! «کاردۆخی» فامش لاشییەن — پەی تۆ عاشقیش جەحەد بەرشییەن

* * *

بە ناو شێخم کەچی ڕقمە لە شێخی لاری کەچڕەفتار
بە خوێن کوردم کەچی دوژمن بە کوردی زاڵمی زۆردار
سەرم ڕووت کرد لە داخی مێزەر و چەتفەی مەلایانە
ئەوانەی ڕۆژ لە مزگەوتان، شەویش مەیخانە جێیانە
بە وردی کاتێ سەیری کردەوەی ئینسانی لارم کرد
بە دڵ پەست بووم و زوو هەستام، لە لایان کۆچ و بارم کرد
زبان و کردەوەی ئینسان ئەبێ دوور بێ هەتا مردن
لە ناپاکی و درۆ و دەعیەی ڕیایی و فتنەیی کردن

* * *

بۆ یادی خۆشی جەژنەکەی نەورۆز — بۆ یادی «کاوە»ی نەبەردی دڵسۆز
کۆ بینەوە با بە خۆشی و شادی — بۆ بیرەوەری ڕۆژی ئازادی

* * *

مەهێڵن دوژمن گڕەو باتەوە — شەیتان ئاگری شەڕ خۆش کاتەوە
ئاشتیپەروەر بن، نەک شەڕفرۆش بن — ئیش کەن بۆ گەل و دایم ڕووخۆش بن

*دەنگی گیتی تازە*، ژ٨، ل١٥٤. گۆڤاری *گەلاوێژ*.
یاداشتی کاک موحەممەدی سیراجەدینی.

## مەلا بەهائەدینی شادمان

مەلا بەهای شادمان، کوڕی مەلا عەلینەقی «سُلطانالعُلما» و نەوەی مەلا موحەممەد مەهدی دووەمی

شێخولیسلامی سنەیە کە دەوری ساڵی ١٣٢٦ ک. م. لە سنە هاتۆتە دنیا.

بنەماڵەی مەلا بەها لە شاری سنە بەناوبانگ بووگن و زیاتر لە چەرخێک لەو شارەدا پلەی شێخولیسلامییان هەبووە و زۆر کەسانی هەڵکەوتووی ئایینی و کۆمەڵگاییان لێ هەڵکەوتووە و خزمەتی باشیان کردووە؛ کە پێشتر، ناوی هێندێکیانمان هێناوە.

مەلا بەها ـ کە سەرەتا ناوی بنەماڵەیی «غەمی» بوو؛ دوایی کردیە «شادمان»ـ خوێندنی لە زێدی خۆی دەسپێکرد و پاشان چوو بۆ کوردستانی باشوور و لە چەند شاری ئەوێ، بۆ وێنە کەرکووک خوێندی و ساڵی ١٣٠٧ ک. هـ. (١٩٢٨ ز.) گەڕاوە سنە و لە مزگەوت و مەدرەسەی «عەبدوڵلابەگ»دا گەیشتە خزمەتی شێخ حەبیبوڵلای کاشتەری و سێ ساڵێک بەهرەی برد و ساڵی ١٣١٠ ئیجازەی لە دەستی ئەو مامۆستایە وەرگرت. بەشوێن ئەوەدا ژنی خواست و دوو ساڵ لە مزگەوتی «سارم نیزام» ـ کە ئێستا شوێنیشی نەماوە ـ دەرسی گوتەوە. ساڵی ١٣١٦، دەستی لەو کارە بەردا و لە وەزارەتی پەروەردە، دامەزرا و پاش سەرەتێک، بوو بە مامۆستای عەرەبی و فیقهو ویژەی فارسی لە پۆلی دواناوەندیدا.

ڕەوانشاد شادمان پیاوێکی هێژا بوو. لەو سێ ساڵەی بۆ خوێندن ئەهاتە لای بابم، دەرسیشی بە من دەگوت و چەند کتێبم لە سەرف و نەحو و مەعانی و بەیاندا، لە خزمەتی خوێند. بەڕاستی مامۆستایەکی تەواو بوو. ئەمن ئەگەر شتێک فێر بووبێتم، لە سێبەری سەری ئەو زاتەیە. ڕەببی خوای لێ خۆش بێ.

بەداخەوە لە ژیانیدا چەوت و چەڵەمەی زۆری هاتە ڕێ؛ بەڵام ئیمانێکی بەقەوەتی هەبوو؛ بەو هەموو سەخڵەت و ناخۆشییەوە، هەر شوکرانەبژێر بوو. لە کۆڕ و دانیشتنە فەرمییەکاندا بەشداری نەدەکرد و بایەخێکی بە ناو ناوبانگ و پلە و پایە نەدەدا. ژیانی بە سەربەرزی بردەسەر و لەم دواییانەدا حەجیشی کرد و سەرەنجام لە ٢٠ی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٦١ ک. هـ. (١٩٨٢ ز.)، بەرامبەر بە ٢٥ی ڕەبیعولئاخری ساڵی ١٤٠٣ ک. م. گیانی پاکی بەرەو لای خودای تاک گەڕاوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## عارفی یۆسفزەمانی

کوڕی میرزا عەلینەقی خەڕڕاز، ساڵی ١٢٩٩ ک. هـ. (١٩٢٠ ز.)، لە شاری سنە هاتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی تەواو کرد و پاشان دامەزرا.

یۆسفزەمانی مرۆیەکی خواناس، بەئیمان و خێرخواز بوو. کاتی بێکاری زۆرتر بە خوێندنەوە ڕایدەبوارد. جاروبارە شیعری دەگوت و نازناوی «عارف»ی بۆ خۆی دانابوو. لە مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٢ ک. هـ. (١٩٨٣ ز.)، بەرامبەر بە ١٤٠٤ ک. م. دەستی لە دنیا بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا.

**شیعرێکی ئەو خوا لێ خۆشبووە:**



به مادر گفتم آخر این خدا کیست؟ که هم در خانه‌ی ما هست و هم نیست

تو گفتی مهربانتر از خدا نیست دمی از بندگان خود جدا نیست

چرا هرگز نمی‌آید به خوابم؟ چرا آخر نمی‌گوید جوابم؟

نماز صبحگاهت را شنیدم تو را دیدم، خدایت را ندیدم

به من آهسته مادر گفت: فرزند! خدا را در دل خود جوی یک‌چند

خدا در رنگ و بوی گل نهان است بهار و باغ و راغ از وی نشان است

خدا در نیکی و پاکی است، فرزند بود در روشناییها خداوند

خدا بنهفته اندر جسم و جان است نه جسم است و نه جان، نور جهان

خدا در عالم امکان نگنجد خدا در وهم ما انسان، نگنجد

خدا هرجا که می‌بینی در آنجاست ولی هر جای دیگر نیز پیداست

به دریا و به کوه و دشت و هامون به ناز لیلی و سودای مجنون

به سوز سینه‌ی خلوت‌گزینان به حسن خط و خال نازنینان

به هر جا هست و فرمانش روان است که او فرمانروای این جهان است

به هر کاری دل خود با خدا دار دل کس را ز بی‌مهری میازار

یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا حەیدەری فەهیم

کوڕی مەلا نیزام، ساڵی ١٢٨٥ ک. هـ. (١٩٠٦ ز.) لە گوندی «ئەوێهەنگ»ی ناوچەی ژاوەرۆ هاتە دنیا و پاش ساڵانێکی زۆر خوێندن، ساڵی ١٣٥٢ ک. م. لە کۆڕی دەرسی شێخ حەبیبوڵلای کاشتەری ئیجازەی وەرگرت و پاشان گەڕاوە زێدی خۆی و تا دوا کاتی ژین، خەریکی دەرس‌گوتنەوە و بەرنوێژی و خزمەت بە خەڵکەکە بوو.

ڕەوانشاد فەهیم مرۆیەکی هێژا، دیندار، پاک، بەشەرەف، سەر لە ناو کتێبان و خەریکی لێکۆڵینەوەی زانستی بوو. بە ڕەنجی شانی خۆی و لە ڕێی کشت‌وکاڵ و باخەوانییەوە دەژیا و چاوی لە دەستی کەس نەبوو. ئەم مامۆستایە لە نیوەکانی ساڵی ١٣٦٢ ک. م.دا، کەوتە بەر ڕق و قینی هێندێک شەڕاشۆی بێ‌ئاوەزەوە و شەهید کرا و لە سنە نێژرا.

یاداشتەکانی نووسەر.

## شامی

شامرادی موشتاق، نازناو و ناسراو بە «شامی»، دەوری ساڵی ١٣٠٠ ک. هـ. (١٩٢١ ز.)، لە شاری کرماشان

هاتۆتە دنیا. سێ سالان نەخۆشی ئاولەی گرتووە و هەردوو چاوی کوێر بووە. پاش ماوەیەکی کەم، دایکی سەری یەکجاری ناوەتەوە و سێزدەسالان بابیشی بەجێیهێشتووە. بۆخۆی دەڵێ:

روژی کە مەن بیم وە مادەر پەیدا — قەومان وەشادی وەخت بوو بین شەیدا
شوکر خوداوەند وەجا ئاوردن — جەشنی وەشادی مەن بەرپا کردن
شەو یازدەهوم ساعەت کردن خوەش — ناو بەندە نان «شامی» ستەمکەش
تا مەن وارد بیم وەی میهنەتسەرا — وەی دونیای پوڕ جەور پوڕ وە ماجەرا
هەنووز نەشناسووم چەپ و ڕاس دەست — دەست جەهاندار جەهانبینم بەست
سێ ساڵونیمە تفل خاروزار — مادەرم وە دەرد سەختی بی دوچار
شەش ماهـ تەمام وەبان جا بی — ئاقبەت دەوای دەردش فەنا بی
لە بەعدەز دەساڵ فەوت مادەرم — خاک یەتیمیش ڕشیادە سەرم
مەن مەنم ئەڕای جەفای زەمانە — پەی تیر تەعنەی خیش و بیگانە

لەو کاتەدا ماموژنی فریای دەکەوێ و دەیباتە ماڵی یەک لە پیاوچاکانی خێرومەندی شاری کرماشان، بە ناوی حاجی ئامانوڵاخانی موعتەزیدی و لەوە بەولاوە شامی، تازەلاوێکی کوێر و بێکەس، لە ژێر چاوەدێری ئەوپیاوەدا ژیا.

ماڵی ئامانوڵا خان گەورەماڵێک بووە و هەموو چینێک هاتوچۆی کردووە. خان حەزی لە شیعر و شاعیری بووە و لە حەوتوودا شەوێک لە دیوەخانیدا شاعیران کۆڕیان گرتووە و شیعری خۆیان و شاعیرانی گەورەیان خوێندۆتەوە. شامی لەو شەوانەدا لە سووچێک دانیشتووە و گوێیگرتووە و ئەوی پێ خۆش بووە، لەبەریکردووە. وردە ـ وردە هەستی شاعیرانەی ڕاهاتووە و وەک خۆی دەیگێڕاوە، وای لێ هاتووە زۆر جاران ئەگەر باڵی هەوەڵی شیعرێکی بیستووە، باڵەکەیتری پێ زانیوە. لە قۆناغێکی تردا دەبینێ بۆخۆی دەتوانێ شیعر دانێ و ئەوی هەستی پێ دەکا بە زبانی شیعر بیڕازێنێتەوە.

دوایی کە پێدەگا، لە ماڵی ڕەوانشاد موعتەزیدی دەڕوا و دەبێتە چەرچی و جاروبار چای و سابوون و وردەواڵەی تر لە قەسرەوە بە قاچاخ دەباتە کرماشان و دەیفرۆشێ.

شامی ساڵانێکی زۆر هەروا بە دەستەنگی و هەژاری دەژیا. لەم دوایانەدا ـکە پیریش ببووـ لە گەڕەکی چەنانی، چاوە خانوویەکی سەندبوو، دوو ژووری بە کرێ دابوو؛ بەوە دەژیا.

خۆی دەیگوت: شیعری زۆرم گوتووە؛ بەڵام کەس نەبووە بۆمی بنووسێتەوە و لەبیرم چوونەتەوە. چەند جاریش کەسانێک ئەهاتن، شیعرمیان دەبرد گوایە چاپی بکەن؛ دەچوون و چیتر نەدەهاتنەوە!

پاییزی ساڵی ١٣٦٢ ک. هـ. (١٩٨٣ ز.)، دەفتەرێک لە شیعرەکانی بە ناوی «*چەپکەگوڵ*»، لە تاران چاپ کرا؛ بەڵام زۆر بەداخەوە، چەند ڕۆژ پێشتری بۆخۆی دنیای بەجێهێشت و ژیانی سەرانسەر مەینەتی، نەکرا بەو خۆشییە کۆتایی بێ!

شیعری شامی هەموو جوان و ڕەوان و دڵبزوێنن. ئەگەرچی کتێبێکی نەخوێندۆتەوە و بۆ شیعر گوتن، لای هێچ مامۆستایەک نەچووە، بەڵام لێهاتوویە سروشتییەکەی لە ڕادەیەکدایە کە لە شیعریدا هەموو جۆرە جوانکارییەکی توێکڵی و کاکڵی بەدی دەکرێ. بەتایبەت کاتێ بە تانەوە قسەی کردووە یان تیز و تەشەری گرتۆتە بارودۆخی نالەباری کۆمەڵگاکەی، شیعری تا ئەو ڕادە بەرز و ڕازاوە و سەرکەوتووە، کەسێک شامی نەناسێ، بڕوا ناکا ئەو شاکارە بێوێنە، کاری مرۆیەکی کوێری نەخوێندەوارە.

**چەند شیعری ئەو بلیمەتە**:

**کرانشینی**

(١)

کام دەرد عەلاجکەم؟ کام پارە پینە؟
سەنگ کام ستەم بدەم وەسینە؟
نیمی لە میللەت کرانشینە
بەس کە کرا داس بیچارە بینە
بەعزی دە پلاک کرایە سینی

چەبکەم وە دەس کرانشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢)

بەندە یەی‌نەفەر کرانشینم
چو عەزیز مردی دایم غەمینم
نە خارجمەزەب نە جوداس دینم
ئەر دوعات گیراس بکەر نفرینم
شایەد لەی دونیا دیتر نەمینم
ڕاحەت بووم لە دەس کرانشینی

چەبکەم وە دەس کرانشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٣)

توای بزانی، سەگ وە حاڵم نەو

ئاسایش نـەیرم، نـە ڕۆژ و نـە شـەو
سوب تا ئیوارە هـام لـە تـەق و دەو
تا سەر مانگ بای دو تیکە ئەسـپەو
یـا بـەم فرۆشـم، یـا نەمـە گـرەو
ئوشـم کراکـەم بەڵـکە نـەمینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٤)
ژنەم جاڕووکەش خـوەم قـاپچی دەرم
وە فەسڵ زمسان وەفـر پاکەوکـەرم
لە عەیش و عـەزا چـو سـەمـاوەرم
خوەیان چو ئاغـا و بەنـدە نەوکـەرم
ئەر مەنیان نەکەی، دەنە ناو سـەرم
ئووشن: گووشت گەن ئەڕامان سـینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٥)
یەی هەفتە مینیت مانگ بچوودەسـەر
ژن ساحیوماڵ دەس نیەتە کەمـەر
وە ژست تـەمام تیـەتـە پـشت دەر
لە وەرپای هەڵسم چو ئاغا و نەوکەر
وە ژنەم ئووشـم دەمکـەر سـەماوەر
خوەم دەوم ئەڕای میوە و شـیرینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٦)

یەی کوڕی دیرن چو وەچکـەی شـەیتان
سوب لە خاو هەڵسی تیەتە ناو ئـەیوان
وە جیب پـڕ ڕیـخ دەس وە تیرکـەوان
خەیت ئەڕای قووری، خـەیت ئـەڕای ئیـسکان
ســـیوڵ جـــافر گریتـــە نیـــشان
کەس جورئەت نەیری سەدای بایدەبان
بووشی جوانەمەرگ ســەرم نەشـکینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٧)

داراییم بیەسە چوار دوێت و یەی کـوڕ
دو پەتوی نیمدار، یەی جوفت لافەشـڕ
یەی جوفت متەکای وەدەم قەیچی پڕ
سەر نیەیدە بـانی چـو پـارەئـاجور
سەری گەن کەفی تیەدە خوڕەخوڕ
چوارجام ڕووحی، یەیدانـە سـینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٨)

زانی چەن‌نەفەر هایمـە یـەی‌حەسـار؟
من ئووشم پەنجا، تو بـووش: پـەنجاوچوار
دریـــژ و کووتـــا، کـــاردار و بی‌کـــار
سوب لە خەو هەڵسیت لە گووشەی‌حەسار
بیس‌نەفەر وساس، تەک‌داسە دیوار
بایەد پەی نەوبـەت بلیـت بـسینی

چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٩)

سەرشەو تا سوب هەر جیرەی دەر تیـەد
مەشەی غوڵام چوود، ئوسـا سـەفەر تیـەد
کەلای فەڕوخخان لە دینەوەر تیەد
ئوسا ئەمیرخان گەرد چوارخـەر تیـەد
مەرافــە دیــرن، ئــەردەر وازمـــینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٠)

بازووم وە غوسـە بیـەسـە بـاڵ سـەگ
ئیقباڵم پەستتر وە ئیقبـاڵ سـەگ
هاتم وەی دونیا من وە ساڵ سـەگ
هەر شەو نیەخەفم من وە قـاڵ سـەگ
نسم شەو ئووشم: خوەش وە حاڵ سـەگ
نە کراماڵ دەید، نـە پاڵـتاو سـینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١١)

جەرگم سووراخە چـو لانـەی زەنبـوور
بەسکە شنەفتم قسەی جووراوجوور
ڕووحم دی خەستەس وە فەرمان زوور
وە کوڕەم ئووشم: خـەر بیشـعوور
سوب لە خەو هەڵسی، سـوورتت نەشـوور

لــەی ئــاو لوولــە فــرە ڕشــینی

چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟

داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٢)

ئووشن هـەر ڕووژی دیـزە نیەیتـە دار

خوا ئەڕای شام بوو، خوا ئـەڕای نـەهار

خوا گووشت گاپیر، خوا شک پەروار

گووشت کوتانەکەی بوەیتە دەر حەسار

یـــواش بکـــوتی، نـــەڕمنی دیـــوار

لە ناو حەساریش ئـاجور نەشـکینی

چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟

داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٣)

وە هـــەوڵ گیـــانم نەونـــە دوشمـــنم

شایەد نەشیویت لانـە و مەسـکەنم

عەزیزم مردویت، وە دەمیان خـەنم

ئیمریکی ڕەقسم، ئینگلیـسی ژەنم

چو ئاغای ویگن، پەنجا جـوور خـوەنم

ئـەر بکـەن نفـرین ژن و فـەرزەنم

خوەمیش کومەک کەم ئوشم: ئامینی

چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟

داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٤)

بەس کە کرادام لەی تەویڵە چـو خـەر

عومر وە بەدبەختی هـاورم وە سـەر

بیمەسە موونس چەن گروو بەشــەر
لوڕ لە لوڕستان، کورد لــە دینــەوەر
جاف و هەورامی، لەک و کەمانگــەر
فــارس تــارانی، تــورک قــەزوینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٥)

نە پەســت و ناکــەس، نــە نادەرویــشم
شەرمەندە لە ڕووی بیگانە و خیشم
نە کەس تێەنەلام، نە لای کەس نیشم
خوەیان هەر شەو چن، من کیشک کیشم
ئەر دیــر دەر واکــەم، نەمنــە ڕیــشم
منیش ڕەگ نەیرم چو سیفـزمینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٦)

یــەی شــەو دو نەفــەر بینــە میمــانم
نیم‌ساعەت بیشتر لە بەرق ســوزانم
ســوب بینــە ئــاگر ڕشــیانە گیــانم
ئاغــای ســاحێومال وە گــەرد خــانم
ئــاو پاشـــینە بــان تــەپڵ ئامــانم
هـــەم لا فەشـــرە دریـــا وەشـــانم
وتــن: تــا غــروب لــەیردا نــەمینی
چەبکـــــەم وە دەس کرانــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٧)

ئەڕای بەدبەختی و نیامـەی و نـەهات
یەی قەومی دیریم، هاتوو لە دهـات
گاهەس بناسـی کـەیخودا بەسـات
یەی کەڵەشیری هاوردووە سەوقات
شەفەق سـاحیوماڵ، هـەم دەنگـی دەرات
پووپەکـەو بگـری بەسـکە قـولینی

چەبکــــەم وە دەس کرانــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٨)

دوێکە چیم بگرم، ئوتاقیـک لـە جـای
وتم بکیــشم، بــیڵا دەنگــم نــای
کەم‌ـکەم چیم لە دەرماڵ مەشـەی‌مـورای
یەی عفریتی دیم، وەڕیـوارت نـای
دەمامەی جادوو نیەڕەسید وە پـای
مــەر فــوولادزرە بووتــە قــەرینی

چەبکــــەم وە دەس کرانــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٩)

چو کاوڕ وە گـورگ، لـەلی ڕەم کـردم
یەیی پا هاتە وەر، سێ پا دوور گردم
وە هــەوڵ گیــانم ســڵامی کــردم
وت: کاری داشتی؟ ناو ئوتاق بـردم
وت: تویسرکانیت؟ وتم: نە کـوردم
وت: کورد کووڕەیت؟ وتم: هەرسـینی

چەبکــــەم وە دەس کرانــــشینی؟

داد وه هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٠)

وت: چـەن نەفـەرین؟ وتم: دە نەفـەر
غەیر لـە ڕوبابـە و عەمـە ماپـەروەر
زوبەیدە و ملووک، نوسرەت و کیـشوەر
نیمتاج و تاجی، عیـشرت و خـاوەر
کـوڕە بیچکەلـە و خـوەمم و ژنی
چەبکـــــەم وه دەس کرانـــــشینی؟
داد وه هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢١)

چـو پـشی لـە شـوون بـووی پیـازداخ
یەیهەفتە کردم ماڵ وه ماڵ سووراخ
له «سەنگ مەعدەن»، تا «چوارڕای ئوجـاخ»
«تیمچـە» و «چـەنانی»، تـا «بـەرزەدەماخ»
کەس وه پیم نەیات، یەی دانـە ئوتـاخ
وه دینت یەسـە، ڕەسـم هـاودینی
چەبکـــــەم وه دەس کرانـــــشینی؟
داد وه هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٢)

یەی فەرشی داشتم، مینستە جل‌شاڵ
بـاب پـاڵان بی ئـەڕای یـابوو ئـاڵ
چوار قیمەت خوەی هەرداومە حومـاڵ
هەفتەی یەی کووچە، چوار ڕووژ وه یەیماڵ
شانزدە ماڵ گەردیم وه عەرز یەیسـاڵ
دویکە دامەشان عەلیئاغـای دەلاڵ

وتم: بفــــرووش، نیـــەتوام بمـــینی
چەبکــــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٣)

سیٚ‌مانگم پەس‌کەفت کرایـەی خـانی
یەسە مانگی‌تـر هـات نیـشتە بـانی
باوڕو پیم نیـەوت، خـودا خـوەی زانی
چشتی کە شک‌بەم مەجمـە و قـازانی
ئـــەوەیش دی نیـــەیلم ژنم بـــزانی
سوب هەڕاجی کەم نیەتوام بمـینی
چەبکــــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٤)

کــەس خــەوەر نییــە وە حــاڵ دەردم
گوش کەس نییـە وە ئـاه سـەردم
چل‌ساڵ وە ئـیران زنـدگی کـەردم
کرای زەمین دەم وە بـانی گـەردم
ڕۆزگــار موحتــاج کــرد وە نامــەردم
نە ڕومی ڕومیم، نــە چـینی چـینی
چەبکــــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٥)

قەلبم چو کوورەی حەداد مەدەی جووش
لە دەس دونیا و خەڵک خاک‌فـرووش
دونیا زندانە پەی شەخس بـاهووش

ئایەم نەبایەد کەمتر بوود لە مــووش
ئەوەیش جیێدیری لە ناو پڕوپووش
موش نە کرا دەید، نــە کــرا ســینی
چەبکــــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٦)

ئوتــاقی گـــردم بیبـــەرق و بیئـــەو
دەر و پەیکر خویرد، چواردیــوار خــرەو
داغــی پــیرم کــرد کردمــە قولــەو
ڕووژ نیمــەڕوو وەلــیم کــردە شــەو
دی چە توای وەلیم؟ ئاسمان کــەو!
حەق من تا حەشر لە لات بمــینی
چەبکــــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٧)

لە ڕووژی ترسم ئەجەڵ بــدەی زەنــگ
عومرم تەواو بووت لە دونیای دوڕەنــگ
پنهان بووم لە ژێر خشت و خاک و سەنگ
ژن ســاحیوماڵ وە بــیڵ و قوڵــەنگ
قوڕەقوڕکونان، وە قسە و جەفــەنگ
بای کرایەی قەور لــە لــیم بــسینی
چەبکــــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٨)

ســـەرمانگ وە مانــگ بایتـــە دیـــارم

وە بیڵ هەڵـکەنی سـەنگ مـەزارم
بکـەی شـکەنجە و زەجـر و ئـازارم
بووشی کرا دەیت یا پاسـبان بـارم؟
منـیش لـە ئەلحـەد سـەرم دەرارم
داد بکەم هاوار، کەفەن کی سینی؟

چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٩)

چو سەگ وڵگەرد، دەروەدەر وە خوەم
شەو تا سوب نەخـەف، ڕەنـج بیـوەر وە خـوەم
دڵگیر وە دونیـای دوونپـەروەر وە خـوەم
لە دەس ساحیوماڵ خونجگەر وە خـوەم
لە زیندەی ئایەم بێخـەوەر وە خـوەم
نیەزانم «شامی» دی تاکەی مـینی؟

چەبکـــــەم وە دەس کرانـــــشینی؟
داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی

* * *

پەریـــشانم، پەریـــشانم، وڵـــمکـــە!
دوچـــار دەرد پنـــهانم، وڵـــمکـــە!

وە دەردم ئاشـــنا کـــردی، نـــەکردی
ســتەمگەر فکــر دەرمــانم، وڵـمکـە!

وڵمکە تانەوەیت کەس پـەی وە دەردم
دوســێ ڕوژی کــە مهمــانم، وڵـمکـە!

نەکرد کەس دەعوەتم خوەم بیمە مهمان
وە کــار خــوەم پەشــیمانم، وڵـمکـە!

تـــەنم زانم نەســـیب مـــوور و مـــارە
نــە مــوورم، نــە ســولەیمانم وڵـمکـە!

وە کـام کـەس نیەگـەردد چـەخ تاسـەر
نــە دەرویــشم نــە سولــتانم، وڵـمکـە!

وە واوەیــلای دڵ هــەر شــەو ڕەوانــە
سرشــک غــەم وە دامــانم، وڵـمکـە!

خـــەرابم کـــرد خـــەرابات خەیاڵـــت
وە دەست چوود عەقڵ و ئیمانم، وڵمکە!

وە بـــادەی تەڵـــخ جـــام زنـــدەگانی
دەمی مەست و غەزەڵخـوانم، وڵـمکـە!

و سەحرای خەیاڵ چـون قـەیس سـانی
تــو کــردی ویــل و وەیـلانم، وڵـمکـە!

لــەوە ترســم بکیــشد کــار وە هــاوار
نەکەی کەس گوش وە ئەفغانم، وڵم کـە!
وڵم کەید یا نەکەید ڕەحمـی وە حاڵـم؟
تــەنم کــردی وە زنــدانم وڵــم کــە!
وە ئەرواح شـەرەف سـەوگەند کـە دائـم
مــەلوول مــەرگ وجــدانم، وڵــم کــە!
شەرەف کوشیاد و وجدان جوانەمەرگ بی
وە بیوجــدانی حــەیرانم، وڵــم کــە!
وە کام دوشمەن بوەم ئەی دوس! شکایەت؟
کــە دوس بی قــاتڵ گیــانم، وڵــم کــە!
وڵم کە! وڵـکەرت نـیم سـوب لـە مەحـشەر
تــو کــردی خــار دەورانم، وڵــم کــە!
تـو کـردی بیسـەر و سـامان «شـامی»
وە مەولا خوەم قەشەنگ زانم، وڵـم کـە!

* * *

دڵ وە زەنجــیر فــەراقت راهـ ئــازادیش بەنــە
کار دڵ هەر دەم وە دووریت، داد و ئاهـ و شیوەنە
داد وە بەدعەهدی خووبـان هەرکەسـی دیـرد وەلی
گوش گەردوون ستەمگەر کەڕ وە فـەریاد مەنـە
دڵ وە فەریاد و فوغان کرد خیش و بیگانـە مـەلوول
بیوەفا! ئایا دڵ تۆ سـەنگسـەخت، یـا ئاهەنـە
سەنگ ئومید وساڵت شیشەیی سـەبرم شـکاند
بـەرق شەمـشیر فـەراقت قـاتڵ گیـان و تەنـە
خوەم عەجەب دیرم وە تاڵەی شوم کەچبنیاد خوەم
میهرەبانی گەرد هەرکەس کەم، وە گەردم دوشمەنە
بیسەبەب سەرگەشتە مەجنوون چی وە سەحرای جنـوون
مەر نەزانست ڕەسـم خووبـان بیوەفـایی کەردنـە؟
تا دەم مردن دەمادەم، دەم وە دیـدار تـۆ دەم
تا بـزانی دڵ ئەسـیر چـاهـ غـەم، چـون بیژەنـە
گیان وە چەنگاڵ فەراقی دەر نیەکەی «شامی» نەکـە!
داد وە بەعەهدی خووبان، مایەیی خوون خوەردەنـە

* * *

یــەی شــەو دڵـگیر بـیم لـە دونیـای دوڕەنـگ
وە گــەرد تاڵــەی ویم مەکــەردم جــەنگ
واتم: ئــەی تاڵــەی شــووم کــەچبونیــاد!
بــەربادبای! عــومرم تــو دای وە بــەرباد
نیــەزام ئــەی تاڵــەی تــیرەی واژگــوون!
تاکەی سەرگەشـتەم کەیـد وە دونیـای دوون!
تاکــەی تــەقالا تاکــەی بەردەڵــبەرد؟
تاکــەی بکــشیم وە دڵ ئــاهـ ســەرد؟
دڵ تاکــەی بیــزار لــە زنــدەگــی بــوو؟
ڕووح تاکـەی خەسـتەی دەوەنـدەگی بـوو؟
تاکــەی وە ئەفــسووس بــسام دەسوەدەس؟
تاکــەی بــشنەوم ناخــاس وە ناکــەس؟
بەدیم چـەس گـەردوون بـەد کـرد وەگـەردم؟
تاکــەی خــوین دڵ مــەدەی وە خــوەردم؟
داد بکەم تا چەنـد، خـوین بخـوەم، تـا کـەی؟
تاکــەی بکــشیم ئــاهـ پــەی دەرپــەی؟
تاکــەی بــار جــەور مەنــەی وەشــانم؟
ئــەیووب نــیم وەی تــەور کــرد ئیمتحــانم
ڕەنجــم بیســەمەر، ســەودام بیســوودە
کــەردەم نەکــەردە و بــوودم نــابوودە
لەســەر دوراهــەی زنــدەگی گــیرم
بــەربادە و بیســوود نەقــشە و تــەدبیرم

نــە مـــەرگم پەیِــداس، نـــە زنـــدەگانی
بلاتـــەکلیفم لـــەی دونیـــای فـــانی

وە دەرد چـــەم خـــوەی؟ زنـــدەگی وە زەجـــر
نــە دیــن، نــە دونیــا، نــە عوقبــا، نــە ئــەجر

چـە بووشـم چـە کـرد گـەردوون وە گـەردم
یـــەی تـــەن موبتـــەلای هـــزاران دەردم

مــەرمن وە جوملــەی نــەوع بەشــەر نــیم؟
یـــەی دەم بێغوســـە و بێدەردســـەر نـــیم

بیەیـــدە بـــانســـەر وە هـــەر دوودەســـی
داد بکـــەی وە دەس جـــەور بێکەســـی

قــەوم قبلــەس، وەلی قبلــەی مــن چەفتــەن
هــەرچی قــەوم دیــرم دوور وەلــیم کەفتــەن

قورئـــان لەعنـــەتکـــەی وە قـــەوم زاڵـــم
کـــەس وە دڵـــسۆزی نیەپرســـی حاڵـــم

یـــارەب! وە حورمـــەت شاهەنـــشای شـــاهان
نگـــــەداری کـــــەر وە بێپـــــەناهان

پـەنام هـەر خـوەدی هـەر وە خـوەد قەسـەم
وە زات بێعـــەیب موحەممـــەد قەســـەم

وئـــال ئـــەبا و پـــەنج تـــەن قەســـەم
وە دەر وە قەلعـــەی خەیبەرکـــەن قەســـەم

وە شـــاه مەزڵـــووم، تـــشنەلەب قەســـەم
و ســـەقای شـــوجای بائـــەدەب قەســـەم

وە ســـووز ســـینە و ئـــاه ســـەرد قەســـەم
وە شـــام تـــیرە و ڕەنـــج و دەرد قەســـەم

وە دەرد پنـــــهان دەردەدار قەســـــەم
وە شـــەرمەندەگی کوڵـــفەتبـــار قەســـەم

وە قـــەلب شـــیرین دڵناشـــاد قەســـەم
وە زوور فـــەرهاد ڕەنـــجوەبـــاد قەســـەم

وە ئەشـــک دیـــدەی نائومیـــد قەســـەم
وە ئـــاه پـــیران مووســـفید قەســـەم

وە نەسـیم سـوب پـیش ئـەز خـوەر قەسـەم
و ســـەوت قورئـــان ڕوحپـــەروەر قەســـەم

وە چەنـــدین هـــەزار پەیغەمبـــەر قەســـەم
هـــەر خـــوەت داوەری وە داوەر قەســـەم

وەر نــە، کــی دڵــسۆز کــی غەمخوارمــەن؟
کـــی وە بیمـــاری پەرەســـدارمەن؟

مــەریز بــووم کــام قــەوم تیــەدە دیــارم؟
کـــام دڵ مەســـووزد وە حـــاڵ زارم؟

دڵ وە زەمزەمـــەی زنـــدگی ســـیرە
ئەجـــەڵ ئیمـــشەو بـــاو، فەرداشـــەو دیـــرە

وای لـــە بەدبـــەختی داد وە ناکـــامی
دەرد دڵ فـــرەس، کووتاکـــە «شـــامی»!

* * *

خـیش و بیگانـە بـزانن قـاتڵ گیـانم تـونی
بـاعس ئـاه و فغـان شـام هجـرانم تـونی

بێسەبەب باران دیدە دامەن کەس تـەڕ نـەکرد
مایەیی ئەشـک عـەیان و ئـاهـ پنـهانم تـونی

* * *

مـن اگـر اهـل وفـا یـا بـیوفـا بـودم، گذشـت
مـدتی مهمـان ایـن محنـتسـرا بـودم، گذشـت

زاغ بـودم در چمـن، یـا بلبـل افـسردەحـال
در گلـستان جهـان، گـل یـا گیـا بـودم، گذشـت

گـر بـر سـر مـن سـنگ بکـوبی ای سـنگ! از طـــالع خویـــشتن نگـــردم دلتنـــگ
سـنگم، بـه سـرم سـنگ جفـا مـی کـوبی ای سـنگدل سـستوفـای همـهرنـگ

لەم شیعرەدا، شامی پێڕای چوونە پێشوازی غەزەلێکی «سەعدی»، گلە و گازندەی لە بارودۆخی نالـەباری ئێران، لە سەردەمی پاش کوودەتای ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٣٢ ک. ه. ) ١٩٥٣ ز.) کردووە:

جمعـی از ملت مـا شیره کـش و اهـل حـشیش عـدهای اهـل قمارنـد بـه دور از تـشویش
برخـی آسـوده از ایـن حادثـه، برخـی دلـریش خائنان گـرگ‌صفت، ملـت ایـران چـون میش

«هرکسی را هوسـی در سـر و کـاری در پـیش
مـن بیچـاره گرفتـار هـوای دل خـویش»

گفـتم ای پیـر وطـن! حـامی مـیهن باشـی در شـب تـار چـو نـورافکن روشـن باشـی
مـا نگفتـیم کـه کـت‌بـستەی دشـمن باشـی تـو زر نـاب چـرا در دل آهـن باشـی!؟

»هرگـز اندیـشه نکـردم کـه تـو بـا مـن باشـی
چون به دست آمدی ای لقمەی از حوصله بیش؟»

جایـت اول بـه دل ملـت و اکنـون محـبس جانـشین تـو و یـاران تـو جمعـی نـاکس
برخـی از دشـمن بیـرون شـده بـاز آمـده پـس ای همای شـرف آخـر ز چه هـستی بـه قفـس؟

«زخـم شمـشیر غمـت را نـنهم مـرهم کـس
تـشت زریـنم و پیونـد نگیـرم بـه سـریش»

تـو کـه هـم‌کـیش مـن و هـم‌وطـن از آن منـی مایـەی فخـر مـن و ملـت ایـران منـی
صـد اسـف بـی‌خبـر از حـال پریـشان منـی بیـنم ار خـواب کـه در کلبـەی ویـران منـی

«بـاور از بخـت نـدارم کـه تـو مهمـان منـی
خیمـەی سـلطنت آنگـاه فـضای درویـش!»

تا که خون در رگ و پـی دارم و در سینه نفـس دم ز عـشق تـو زنـم، بـاک نـدارم از کـس
بـی‌هـوای تـو چـه سـان برکـشیم از نـای نفـس دل غـم‌دیـدەی مـن مهـر تـو را دارد و بـس

«ایـن تـویی بـا مـن و غوغـای رقیبـان از پـس؟
ویـن منم بـی‌تـو گرفتـه ره صـحرا در پـیش؟»

مهربـانی تـو از ایـن خلـق چـه دیـدی سـعدی؟ این همه رنـج و محـن از چـه کـشیدی سـعدی؟
چـون مـصدق تـو مگـر پـرده دریـدی سـعدی؟ یـا چـو «شـامی» سـخن زور شـنیدی سـعدی؟

«تـو بـه آرام دل خـویش رسـیدی «سـعدی»!
می خور و غم مخور از شنعت بیگانه و خویش»

چەپکەگوڵ (دەفتەرێک لە دیوانی شامی)، سروش، ١٣٦٢.

## شێخ جەمیلی زیائەدینی

شێخ موحەممەد جەمیل، کوڕی شێخ موحەممەد شەریف، کوڕی شێخ موحەممەد سەلیم «سالم»، کوڕی شێخ ئەحمەدی مەردۆخی، ساڵی ١٣٠٤ ک. ھ. )١٩٢٥ ز.)، بەرامبەر بە ١٣٤٤ ک. م. لە سنە هاتە دنیا و دوو ساڵان بوو بابی ئەمری خوای بەجێهێنا و جەمیل لە ژێر چاوەدێری مامی پایەبەرزی، شێخ ئەحمەدی زیائەدینیدا پێگەیشت و لە قوتابخانە ئایینییەکاندا، تا ڕادەیەک خوێندی و پاشان لە وەزارەتی پەروەردە دامەزرا و لەوپەڕی پاکی و ڕاستی و دروستیدا، تا ئەو ڕۆژە وەنیشتە بوو، کاری خۆی بە باشترین شێوە بەڕێوە برد.

شادڕەوان زیائەدینی، مرۆیەکی دیندار، ئاکاربەرز و دوور لە چەوتی و خراپی بوو. کەمتر قسەی دەکرد و زۆرتر گوێی دەگرت. یەکجار ئەدەبیاتی حەز لێ دەکرد و بۆخۆشی خاوەن زەوقی شیعر و نازناوی «جەمیل» بوو.

کۆچی دوایی ئەو خوا لێ خۆشبووە، ڕۆژی ١٣ ڕەشەمەی ساڵی ١٣٦٢ ک. ھ. )١٩٨٤ ز.)، بەرامبەر بە ١٤٠٤ ک. م. پاش سەرەتێک نەخۆشی، لە شاری سنەدا ڕووی دا.

**چەن شیعری ئەو شاعیرە:**

### بۆ نیشتمان

وەتەن! قوربانی شیرین‌جیلوەکەی وەختی بەهارت بم — وەتەن! حەیرانی سونعی دڵڕفێنی کردگارت بم
فدای ڕوخساری ئارایش‌کراوی خۆش‌نگارت بم — بەلاگەردانی مەرز و بوومەکەی پڕئیفتخارت بم
سەراسەر ڕەحمەت و لوتفی خودایە، خاکی زەڕخێزت — فەرەحئەنگیزە هاوێن و بەهار و فەسڵی پاییزت
ئەڵێی موشکی تەتاری وا لە دەمدا بادی گولبێزت — بە قوربانی نەسیمی سافی بێ‌گەرد و غوبارت بم
مەسەڕڕەت‌بەخشی قەلبی خەستەیە سەیرانی کۆسارت — وەکوو تووبا و کەوسەر دڵبەرە ئەشجار و ئەنهارت
چ دلگیر و قەشەنگە دەشت و کوێ و باغ و گوڵزارت — گرفتار و ئەسیری حوسنەکانی بێ‌شومارت بم
لە تەئسیری خەیانەت‌کردنی حوککامی ناپاکت — لە فیتنە و نابەکاری پڕ بووە خاکی فەرەحناکت
هەموو بێ‌دەس کراوە لاوەکانی چوست و چالاکت — بلا با هەر خەریکی شیوەنی لەیل و نەهارت بم
وەتەن وا چاکە بۆ حیفزت لە دوشمن سینە ئەسپەر کەم — بە جارێ خەوف و جوبن و ترس و نامەردی لە دڵ دەرکەم
بە خوێنی دوشمنت پەنجەم وەکوو یاقووتی ئەحمەر کەم — ئیتر غەفڵەت بەسە، حەیفە هەتاکەی شەرمەسارت بم
ئیلاهی دایما ئاو و هەواکەت ڕۆحپەروەر بێ — دەم و لێوی «جەمیل»ت پڕ گوڵاو و شەهد و شەککەر بێ
چراغی ئیفتخار و شەوکەت و فەڕڕت مونەووەر بێ — ئەتۆ دایم گوڵاڵەی نەوبەهار و من عوزارت بم

**قەسیدەیەکی فارسی بۆ شینی شێخ نیزامی غیاسی:**

ز جورت فغان ای سپهر ستمگر — که با هم بسوزانی از خشك و از تر

گهـی لالـه رویـانی از خـون دلهـا | گهـی کاسـه‌پـردازی از کاسـه‌ی سـر
کنـی بـوم را منبـر از طـاق کـسری | دهـی گـرگ را جـای در کـاخ قیـصر
نه از فضل پرسی نـه از جاه و منصب | نـه از روز ترسـی نـه از جـیش و لـشکر
تو آنـی کـه رحمـی نکـردی بـه زهـرا | تـو آنـی کـه شـرمی نکـردی ز حیـدر
چـه جـای شـکایت کـه از مـا گرفتـی | «نظـام» سـعید آن چـراغ منـوّر
عزیـزی کـه مـی‌گـشت در محـضر او | مـشام از شـمیم حقیقـت معطـر
ز بـس کـرد آیـات قـرآن تـلاوت | ز بـس کـرد اقـوال پیغمبـر از بـر،
کلامـش کـلام خـدا بـود اغلـب | حـدیثش احادیـث پیغمبـر اکثـر
از آن گـل کنـون گـشته گلـزار خـالی | نمانده است در گلـشن آن رونـق و فـر
دریغـا کـه بگذشـت ایـام فرصـت | دریغـا کـه بـستند آن حجـره را در
دریغـا کـه دیگـر بـرای محبـان | فیـوض حـضورش نگـردد میـسر
اَیـا گـشته در جنـگ بـر نفـس غالـب | ولـی گـشته تـسلیم حکـم مقـدّر
تـو را ارجعـی گفـت امـروز بـاری | به خلوتگـه قـدس خوانـده است داور
بـزن بـر بـساط جهـان پـشت‌پـا را | بـه سـوی سـماوات بگـشای شـهپر
در آن حجره‌ی تنگ تا کی ریاضت؟ | تفرجگهـت بـاغ فـردوس بهتـر
غـذایی تـو را بایـد از شـاخ طوبـا | شـرابی تـو را بایـد از حـوض کـوثر
تعجـب مکـن گـر «جمیـل» از فراقـت | کند مویه بـر خـاک یـا خـاک بـر سـر

**غه‌زه‌لێک**:

به یک نگاه ربـودی ز دل شـکیب و قـرارم | بـه جلـوه‌ای بنمـودی بـه چنـد درد دچـارم
اگر به جانب گورم گـذر کنـی بـه وفایـت | پس از وفات صد آه از شکاف سـینه بـرارم
قسم به مصحف رویت، قسم به کعبه‌ی کویـت | که روزهای جـدایی ز عمـر خـود نـشمارم
قسم به ماه جمالت، قسم بـه دانـه‌ی خالـت | که بیش از این ز فراق رُخت شکیب نـدارم
در آرزوی وصـال تـو ای صـفای دل مـن | چو سیل گشته روان اشک از دو دیـده‌ی تـارم
هر آن عذاب که خواهی بده ولی به وفایت | «جمیـل»وار بـه دسـت جـدائیت مـسپارم

یاداشته‌کانی نووسه‌ر.

## یولماز گونه‌ی

کوردێکی خه‌ڵکی گوندی «یه‌نیجه»ی لای شاری «ئه‌دنه» له باکووری کوردستانه کـه ساڵـی ١٩٣٧ ز. هاتـه

دنیا. بابی لەبەر دەستەنگی، بە ماڵەوە لە دێ باری‌کرد و چووە ئەدنە و دووکانی پەمووفرۆشی دانا. یولماز تا ١٤ ساڵان ئەگەرچی پاکاری باوکی بوو؛ هەر بە فەرمانی ئەو، لەگەڵ کاردا، دەچووە قوتابخانە تا لە داهاتوودا بتوانێ حیسابی دووکان بگرێتە دەست. خوێندن لەگەڵ کار، بۆ یولماز زۆر دژوار بوو؛ ئەگەرچی بە هۆی زیرەکی و لێهاتووییەوە، تێیدا باش سەرکەوت و بۆی دەرکەوت زەوقی نووسینی هەیە و دەتوانێ داستان بنووسێ.

ساڵی ١٩٥٢ ز. یەکەم چیرۆکی لە گۆڤاری «*بیرگوین*»ی ترکیەدا چاپ بوو. ساڵی ١٩٥٥ داستانێکی نووسی کە تێدا ژنە وەرزێرێک بە ئاغای دەڵێ: «زۆرتان پێوە نەماوە و ئاخرتانە!». بە بڵاو بوونەوەی ئەم داستانە، دەنگی حوکمەت دەرهات؛ گرتیان و حەوت ساڵ و نیو زیندان و دوو ساڵ و نیو تاراندنیان بۆ بڕی؛ بەڵام پاش ساڵ و نیوێک زیندان و شەش مانگ تەرەبوون، بەریان‌دا.

ساڵی ١٩٥٨ ز. لە سەردەمێکدا کە لە زانستگای ئەستەمبووڵ، دەرسی ئابووری دەخوێند، شانۆنامەی فیلمی «ئالاگەیک»، واتا «ئاسک»ی نووسی و بۆخۆی نیارڤانی یەکەمی بوو. ئەمجارەش حوکمی زیندانیان بۆ دەرکرد؛ بەڵام پێش ئەوەی بیگرن، هەڵات و بە پەنامەکی دەژیا تا لە ساڵی ١٩٦١ ز. پولیس حەشارگەکەی دۆزییەوە و گرتیان و ئەم جارە ١٨ مانگ لە زیندان بوو. لەو ماوەدا، داستانی «هەژاران مردن»ی نووسی.

ساڵی ١٩٦٣ ز. لە شەریکەیەکی سینەماییدا دامەزرا، لەسەر ئەو بڕیارە کە بە وڵاتی تورکیادا بگەڕێ و ئەوی دەیبینێ، بیکاتە شانۆنامە. یولماز لە ماوەی پێنج ساڵدا، زیاتر لە شێست فیلمی بەرهەم هێنا کە لە هەموویدا نیارڤانی یەکەمی خۆی بوو. هێندێک لەو فیلمانە، وەک: «ئاکاد» و «بە ناوی قانوون»، بوو بە هۆی ناودەرکردنی و وای لێ هات خەڵک نازناوی «سوڵتانی چەوساوەی سینەما»یان پێ دا.

سەرەنجام خاوەنی ئەو شەریکە یولماز کاری بۆ دەکرد، لە ترسی خۆیدا، جواوی کرد و ئەمیش ناچار، بە خەرجی خۆی فیلمی «بووکی خان»ی دەرهێنا. ئەم فیلمە سەرانسەر باسی کوردستان دەکا و جل و بەرگ و داب و دەستووری کوردان نیشان دەدا.

ساڵی ١٩٧٢ ز. بەو تۆمەتەوە کە نەیارانی دەوڵەتی پەنا داوە، گرتیان و خستیانە زیندانی«سەلیمییە»، کە هی ئەرتەش بوو. لەوێ چەند چیرۆکی وەکوو: «سەلیمییە ئوچلە مەسی» و «سەلیمییە مەکتووبلاری» نووسی و ناردیە دەرەوە.

ساڵی ١٩٧٤، کە تازە بەردرابوو، تۆمەتی کوشتنی دادستانێکی تورکیان لێ دا و ١٨ ساڵ زیندانیان بۆ بڕی. لەو زیندانەش دیسان چەند فیلمنامەی نووسی، وەک: «یول» و «سورو». بە تاوانی نووسینی یەک لەوانە، ١٨ ساڵی تر زیندان و ٥ ساڵ تاراندنیان بۆ خستە سەر. لە زیندان نامەیەکی سەرکراوەی بۆ سینیۆر فرناندیز هریرا، سەرپەرشتی فستیواڵی سینەمایی «فالادید»، لە سپانیا نارد و ئابڕووی بە حوکمەتی تورکیاوە نەهێشت. بەم بۆنەشەوە، ٥ ساڵی تر چووە سەر حوکمەکەی. هێندێک لەودوا، دادگا حەوت تاوانی‌تری بۆ

دۆزییەوە و سەرجەمی ساڵەکانی زیندانی، دای لە ١٠٠ ساڵ! یولماز دیسانیش هەدای نەدا و لە زیندان، داستان و شانۆنامەی دەنووسی و بۆ دۆستانی لە دەرەوە دەنارد و دەبووە فیلم. یەک لەوانە، فیلمی «سورو» (ڕان)ە کە لە ئورووپا دەنگی‌داوە.

ساڵی ١٩٨٠ ـ پاش شەش ساڵان زیندانی لەسەریەک ـ داوای چەند ڕۆژ بەردایی کرد و چۆن بوو، پێیان دا. ئەویش ئەو هەلەی بە دەرفەت زانی؛ هەڵات و تا پاریس نەوەستا. دەوڵەتی ترک بە هەڵاتنی یولماز، شڵەژا و فیلم و داستان و تەنانەت ناویشیان قەدەغە کرد.

ساڵی ١٩٨٢ فیلمی «یول» لە فستیواڵی «کەن»دا، خەڵاتی یەکەمی بەرکەوت و بەم جۆرە، هەموو دنیا یولمازی ناسی و ڕێزی‌لێ‌نا. ساڵی دواتر (١٩٨٣)، لە فەڕانسە فیلمی «دیوار»ی دروست کرد و ئەمیش دیسان دەنگی‌داوە.

لەو ماوەدا کە یولماز لە فەڕانسە بوو، «ئەنستیتۆی کورد لە پاریس»ی دانا و بۆ ئەوکارە، لە ناو و ناوبانگ و پارە و هەرچیک هەیبوو، بەهرەی گرت؛ بەو نیازە کە لە ناودڵی ئورووپادا شوێنێک هەبێ، هی کوردان و بۆ گەیاندنی هاواری ئەو گەلە بە گوێی جیهان.

یولماز لەگەڵ هونەرە بەرزەکەیدا، مرۆیەکی یەکجار بەشەرەف، نەترس، ڕاست و پاک و دڵسۆزی ڕاستەقینەی خەڵکی چەوساوە و هەژار بوو. جا کە دەیدیت گەلەکەی خۆی چۆن کەوتۆتە بەر لێشاوی ناحەقیکاری و مافی ئەو میللەتە تا چ ڕادەیەک پێشێل کراوە و کەس نییە هاوارێکیان بۆ بکا، تەواو پێوە سووتابوو. کە گەیشتە ئورووپا و دنیای سینەما ـ وەک شیاوەـ ناسی و دەستەڵاتێکی یەکجار باشی هونەری و کۆمەڵایەتی دەسکەوت، زۆر خەیاڵی بۆ خزمەت بە کورد و کوردستان لە سەردا بوو؛ بەڵام داخ و مخابن، زیندان و ئازاری ترکان، جەستەی زۆر خەستە کردبوو. نەخۆشی مەودای نەدا و سەرەنجام لە ڕۆژی ٩ی سیپتامبری ساڵی ١٩٨٤ ز. (١٣ی زیحەجەی ١٤٠٤ ک. م.)، لە نەخۆشخانەیەکی شاری پاریسدا، گیانی پاکی، لەشی شکەستەی بەجێ‌هێشت. لەسەر ڕاسپێری خۆی، تەرمەکەیان بردە ئەنستیتۆی کورد و تا ڕۆژی ١٤ی مانگ، لەوێ ڕایانگرت. لەو ڕۆژەدا هەزاران کەس لە کوردان و هونەرمەندان و هونەردۆستان، لەو شوێنەدا دوایین دیداریان لەگەڵ خۆی و سەرخۆشییان لە خاتوو فاتووشی هاوسەری و تاکە کچەکەی کرد.

فڕانسوا میتران، سەرۆک کۆماری ئەو سەردەمەی فەڕانسە ـ کە ئەو دەم لە پاریس نەبوو ـ بە مادام میتراندا، تاجەگوڵێکی ناردبوو. موسیو ژاک لانگ، وەزیری پەروەردەی فەڕانسە و هەروەها چەند کەسایەتی ڕامیاری‌تری ئەو وڵاتە، لە ڕیزی ئامادەبواندا بوون. سەربالۆیزی یۆنان لە فەڕانسە، لە لایەن سەرۆک‌کۆمارەوە هاتبوو. هەروەها زۆرێک لە ناودارانی سینەمای جەهان، وەک پاتریک ژاسپین، سەرۆکی حیزبی سوسیالیست و سەرۆکی یەکیەتی کرێکارانی حیزبی کومونیستی فەڕانسە، نوێنەری حیزبە کوردەکان لە ئورووپا و دەوری ٢٠ کەس لە نوێنەرانی ڕێخراوە تورکییەکان لە ئورووپا، لەو پرسەدا بەشدارییان کرد و بە

هەزاران، نامە و برووسکە گەیشتە دەفتەری ئەنستیتۆ.

تەرمی یولمازیان سەرەتا بردە مەیدانی «ڕیپۆبلیکۆ»، لەوێوە بەرەو قەورسانی «پییر لاشیز» ـ زیارەتانی ناودارانی پاریس ـ بەڕییان کرد و هەر لەوێ ناشتیان. لەو کاتەدا هەزاران کەس لە خەڵکی کورد و ترک، سروودی ماڵاواییان خوێند.

گۆڤاری هیوا، س ١٩٨٥، ژ ٣، پاریس، ل٧-١٣ و ١٩٨-٢٠١. گۆڤاری پێشەنگ، ژ١٥، دسامبری ١٩٨٣.

## سدیق موفتی‌زادە

کوڕی عەللامە مەلا عەبدوڵڵای موفتی دشەیی، ساڵی ١٣٣٤ ک. م. لە گوندی «دشە»ی هەورامان هاتە دنیا. هەشت‌ساڵی پڕنەکردبۆوە، بابی کۆچی یەکجاری کرد و لەو کاتەوە دایکی، کە ژنێکی پارسا و تێگەیشتوو بوو، سەرپەرشتی کرد و نەیهێشت ڕەنگی هەتیوی لێ بنیشێ؛ سەرەتا زمانی فارسی و سەرف و نەحوی پێ خویند و پاش ماوەیەک بەو بۆنەوە کە کاکی (مەلا خالید) لە باشووری کوردستان بوو، ئەمیشی نارد بۆ لای و لەوێ خوێندی و لە زانستە ئایینییەکان و وێژەی عەرەبدا شارەزایی پەیدا کرد؛ ئەوجار چوو بۆ شاری سنە و ماوەیەکیش لە خزمەتی زانای پایەبەرز، مەلا مەحموودی موفتی (کاکی گەورەی) بەهرەی برد و ئیجازەی وەرگرت.

یەکەم جار چاوم پێ کەوت، کۆتایی ساڵی ١٣٢٢ ک. ه. )١٩٤٣ ز.) بوو. هەر لەو کاتەوە، بە شێوەیەک یەکمان خۆش‌ویست، تۆ دەڵێی زۆر ساڵە یەکتر دەناسین و پێکەوە دۆستین. ڕۆژ لە دووی ڕۆژ، ئاموشۆ و پێکەوەبوونمان زۆرتر دەبۆوە و زیاتر دڵمان بە یەک دەکراوە. زۆر ڕۆژان تا درنگانی شەو، خەریکی قسە و باس و کتێب خوێندنەوە دەبووین.

سەرەتای زستانی ١٣٢٣ ک. ه. لێ‌بڕاین بچین چاوێکمان بە تاران بکەوێ و کارێک بدۆزینەوە. لەو سەفەرەدا برای پچووکتری (عەبدوڕڕەحمان)یشمان لەگەڵ بوو. سەفەرەکەمان دوو مانگێکی خایاند و لەو ماوەدا دۆستانێکی تازەمان پەیدا کرد و چەند کەسێک لە زانایان و مامۆستایانی بەناوبانگمان چاوپێکەوت. سەرەنجام هەرسێکمان لە وەزارەتی پەروەردە دامەزراین؛ من بوومە مامۆستای دواناوەندی لە شاری سنە، کاک ڕەحمان لە تاران مایەوە و کاک موحەممەد سدیقیشیان ناردە مەهاباد.

دواجار کاک سدیق بۆ دوو ـ سێ شوێنی‌تر ڕۆی و سەرەنجام ساڵی ١٣٣١ ک. ه. گەڕاوە تاران و تا وەنیشتە بوو، لە قوتابخانە دواناوەندییەکانی ئەو شارەدا دەرسی‌گوتەوە و پیرای ئەوەش لیسانس و دوکتوری دین‌ناسی وەرگرت.

دوکتور موفتی‌زادە زۆر ساڵان بۆ بەشی کوردی ڕادیۆ تاران بەرنامەی دەنووسی و چەند ساڵێکیش لەم

دواییانەدا، لە زانستگای تاران، مامۆستای زمانی کوردی بوو.

کاک موحەممەد سدیق دوو زاراوەی سۆرانی و هەورامی باش دەزانی و بەتایبەت بەو بۆنەوە کە هەورامی زمانی دایکی بوو، لە ویژە و ڕێزمانیدا، هەڵکەوتە و بەڵکوو کەموێنە بوو. ماوەیەکیش شانی لە ئینگلیسی فێربوون شل کرد و تا ڕادەیەکی زۆر تێیدا سەرکەوت. پەخشانی فارسی باش دەنووسی؛ بە تایبەت کە عەرەبییەکی چاکی دەزانی، نووسراوەکانی شیوەیەکی تایبەتیان دەگرتە خۆ. وازێکی زۆری لە زبان و ویژەی کوردی بوو؛ لەم دواییانەدا، زیاتر هەر لەو بارەوە دەیخوێندەوە و دەینووسی. زەوقی شیعریشی هەبوو؛ ماوەیەک نازناوی «مەحزوونی» بۆ خۆی دەنووسی. بە هەورامی و سۆرانی شیعری دەگوت و کەمتر بە لای فارسیدا دەڕۆی.

لە کارە گرینگەکانی، ڕاستکردنەوە و شەرحی دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی، شاعیری ناوداری کوردە. بۆ ئەو کارە، بەڕاستی زۆری زەحمەت کێشا و کارێکی گەورەی کرد. بە داخەوە تا مابوو چاپ نەکرا و وەک دەڵێن، یەکێک لێی دزی و بە پرژ و بڵاوی و شێواوی، بە ناوی خۆیەوە لەچاپیدا!

کاری تری دوکتور سدیق، نووسینی ڕێزمانێکی کوردییە؛ کە ئەویش چاپ نەکراوە. بەڕاستی ئەو پیاوە لە ویژەوانە گەورەکانی کورد بوو کە بەداخەوە ئەجەلی ناوەخت نەیهێشت خزمەتە بایەخدارەکانی تەواو بکا و ڕۆژی سێشەممە، ٦ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٣ ک. هـ. (١٩٨٤ ز.)، بەرامبەر بە ١٤٠٥ ک. م. پاش چەند مانگێک نەخۆشی، دەستی لە دنیا بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا.

**چەند شیعری ئەو خوا لێ خۆشبووە:**

ژیان هاتنە پای کێوێکی سەختە | بڕینی ڕێگای پرپێچی بەختە
لە هەر پێچێکا چەن‌هەزار پلە | لە ڕێگاتدایە هەتا سەر ملە
کاتێ لە پلەی دوایی کەوتیە سەر | ئەبێ لە دەرگای ژیان بچیە دەر

**یاد دۆس**

کەفتە بیم نە گێج دەریای مەهجووری | مەنالام جە دەرد وەیشوومەی دووری
دیم نامەی شیرین وەش مەزموونەکەت | یاوا پەی تەسکین دڵ پڕهوونەکەت
دل وە ڕووی زامان کۆنە و نۆش ساوا | ئەحیام کەردەوە، یانەت بۆ ئاوا
ئازیز! یاد تۆ چون ڕایحەی گوڵ | یا چون شۆر عیشق نە ئەعزای بولبوڵ
پەخشەن نە زەڕڕات گۆشت و پێشە و هوون | چوون مەبۆ ساتێ دڵ بێ‌یادت، چوون؟
هەرساتێ تاوام ژیو وە بێ ویم | ئانە، نەمەندەن یەقین یادت پێم

**شەماڵ**

شەماڵ شەوگەرد! سەردیار ماوا | دڵەی غەریبان وە شنۆت ئاوا
نە هەر سەربەرزێ سەرتەرزێ وەردە | ڕاز دەردەدار وە دڵدار بەردە

وە بۆی هەر گوڵێ دەماخ چاخ کەردە
وە شنۆی کاوان دڵ پەرداخ کەردە
سێراو جە سافی تافەی شەتاوان
سەرووەش جە نەشئەی شاخەی وەفراوان
نە تۆی چین زوڵف یاران ویەردە
پەردەی شەو نە ڕووی سەحەر لابەردە
ئاشنا وە سیڕ مابەین یاران
حەریف هامڕاز جەرگەی دڵداران
وە سەرگەردت بم های شەماڵ دەخیل!
چینە زیاتەر مازەم وە زەلیل
خەیلێوەن قیبلەم نەچەم پێوارەن
دڵ جە زیندەگی تەمام بێزارن
چۆن نەدیەنەش چەم باڵای نەمامش
نەشنەفتەنش گۆش شەکەرکەلامش
چەم ئارەزوومەند سورمەی پاڵاشەن
دڵم حەسرەتمەند خاڵ ئاڵاشەن
پەی ئەو ئەراگیل سەر دیارانم
پەی ئەو سەرگەردان شار تارانم
پەی ئەو خەوراکم زوخاو و دەردەن
پەی ئەو هەمڕازم هەناسەی سەردەن
فەلەک وە بەختم مەگرەوۆ زارزار
مەڕێزنۆ ئەسرین چون هەور وەهار
فدات بام شەماڵ! فەریادڕەسیم کەر
ئی عەرزە هۆرگێر وە لای ئازیزبەر
واچە: ئەر سەد جار مەینەتش کێشان
خاترش وە نێش موژگانت ئێشان
هانە «تاران»دا وێڵ و سەرگەردان
مەحرووم جە مەجلس جەرگەی هامفەردان
ویردش هەر ئێدەن جە سوب تا ئێوار
ئەرێ هەی نازار مەحبووب دڵدار!
پەی چێش وە جارێ جە ویرم بەردی
وە تۆز پاڵات یادم ناوەردی
ئەر پەرساش ئازیز نازەنین دڵبەر
بەو گشت دەردەوە چێشم کەردەن سەر
واچە تا «مەحزوون» گیانیش باقییەن
خاکساری تۆ جە لاش تاقییەن

**قیبلەم با وەس بۆ**

زووخاو دەروون ئیمشەو جۆش وەردەن
بنچینەی شادیم جە بێخ هۆر کەندەن
تاقم جە یاران، جفتم چەنی دەرد
چون وەلگ نەمام ڕەنگم بیەن زەرد
ئومێد حەیات جە لام نەمەندەن
سەبر و قەرارم نە دڵ هۆر کەندەن
جە ئمێد وەسڵ یاران دڵسەردم
ها وەختەن شاد بۆ شەماڵ وە گەردم
خەیلێوەن پاڵات نە چەم پێوارەن
سۆمای بینناییم تاریک و تارەن
پەردەی دڵ وە خار دووریت بیەن ڕێش
مەیاونۆ وە گیان هەر ساتێ سەد ئێش
سەروەلگ نەمام حەیاتم زەردەن
چونکە زووخاوی دەردی تۆی وەردەن
یە چێش بی ئازیز بێوەفایی تۆ
تاکەی بێڕەحمی و بێپەروایی تۆ
نەکیانای پەرێم نامەی شیرینت
وە یاد ناوەردی تۆ دڵخەمینت

من بەی گشت مەینەت، بەی گشت دەردەوە
بەی جۆش دەروون، ئاه سەردەوە
تۆ بەو ئیستیغنای ڕەویەی مەحبووبی
مەن بەی ئیرادەت خوسووس قەلبی
ئەر جاریٚ چون من وە یاد باوەری
شیوەی بزورگی ویٚت ئیزهار کەری،
پەیڕەوی عادەت یارانت کەردەن
بەندەنەوازیت وەجا ئاوەردەن
هەرچەن ئیستیغنا پەی تۆ عادەتەن
ڕەویەی چون منیچ هەر ئیرادەتەن
ئەگەر تەوازوع تۆ ئیزهار کەری
شێوەی گەورەیی ویٚت جا باوەری
قیبلەم! با وەس بۆ بیٚپەروایی تۆ
با وەس بنالم پەی جیایی تۆ
جاریٚ ڕەحمیٚ خەیر وە دڵ باوەرە
پەردەی بیٚمەیلی جە بەین لابەرە
بنویسە پەرێم نامەی شیرین فەرد
بەڵ «مەحزوون» ساتیٚ خەلاس بۆ جە دەرد

لە کتێبی خاطرات و یادداشتهای من.

## جگەرخوێن

شاعیری دڵسۆز و سووتاو «جگەرخۆێن»، ناوی شێخ مووسا، کوڕی حەسەن، لە کوردانی ناوچەی «دکشووریان»ی باکووری کوردستانە کە ساڵی ١٩٠٣ ز. لە گوندی «هەسار» و لە بنەماڵەیەکی هەژار هاتە دنیا. مووسا منداڵ بوو باوکی کۆچی یەکجاری کرد و خوشکی گەورەی (ئاسیە)، سەرپەرشتی گرتە ئەستۆ. کەچی ئەویش نەیدەتوانی بیباتە ڕێوە و بە شوانی و کرێکاری گەورە بوو؛ بەڵام دوایی خوێندنی دەسپێکرد و چەند ساڵان لە مزگەوت و قوتابخانەکانی کوردستاندا فەقێتی کرد و سەرەنجام لای یەکێ لە مامۆستا ناودارەکانەوە، بە ناوی مەلا عوبەیدیللا، ئیجازەی وەرگرت.

مووسا لە سەردەمی خوێندندا، ماوەیەک لە کوردستانی ڕۆژهەلات و هێندێک لە باشوور بوو. بەو بۆنەوە بێجگە زاراوەی خۆی، تا ڕادەیەک سۆرانیشی دەزانی.

دوای شکانی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران و دیتنی خەیانەتی بڕێک لە کوردان و هاوکارییان لەگەڵ دەوڵەتی ترکان، بۆ هێور کردنەوەی هاوزمانانی خۆی و نیشاندانی زڵم و زۆری کارگێڕانی ترک و پۆخڵی دام و دەزگای داوەری دەوڵەتی ترک، بە زمانی شیعر کەوتە ئاخافتن و هێرشی بردە سەر دژمنانی گەلەکەی و نموونەی زۆری لەو بابەتانە کردە شیعر و بڵاوی کردەوە. دیارە بەرهەمی شیعری وا بۆ شاعیرەکەی، دەبیٚ چ بیٚ! زیندان و ئەشکەنجە و ماڵوێرانی و دەربەدەری؛ سەردەمێک لە دمشق، سەرەتێک لە بەغدا و هەمیشە ڕووت و برسی.

جگەرخوێن ساڵی ١٩٧٨ ز. ڕووی لە ڕۆژاوا نا و گەیشتە ولاتی سوێد. لەویٚ ڕێزێکی زۆریان لیٚ گرت و هەموو جۆرە پێداویستییەکی ژیان و کاریان بۆ دابین کرد؛ بەڵام زۆری نەخایاند و ڕۆژی ٢٢ی ئوکتوبری

ساڵی ١٩٨٤ ز. بەرامبەر بە ١٤٠٥ ک. م. گیانی پاکی، لەشی ماندووی بـەجێهێـشت. دۆسـتان و یـارانی، تەرمەکەیان بردەوە قامیشلی لە ڕۆژاوای کوردستان و لەگەڵ ڕێزێکی شیاودا ناشتیان.

**شیعر و پەخشانی جگەرخوێن**:

١. *پریسکی و پێتی*، دیوانی شیعر، دمشق، ١٩٤٥ ز.

٢. *جیم و گولپەری*، داستان (پەخشان)، دمشق، ١٩٤٨ ز.

٣. *سەورا ئازادی*، دیوانی شیعر، دمشق، ١٩٥٤ ز.

٤. *ڕشوێ داری*، داستان (پەخشان)، دمشق، ١٩٥٦ ز.

٥. *گوتنا پێشینیان*، قسەی نەستەقی کوردی، دمشق، ١٩٥٧ ز.

٦. *دەستوورا زمانی کوردی*، بەغدا، ١٩٦١ ز.

٧. *فەرهەنگی کوردی ـکوردی*، ٢ بەرگ،بەغدا، ١٩٦٢ ز.

٨. *کیم ئەز؟* دیوانی شیعر، ١٩٧٣ ز.

٩. *میدیا و سالار*، داستان (پەخشان)، ١٩٦٣ ز.

١٠. *ڕووناک*، دیوانی شیعر، سوێد، ١٩٨٠.

١١. *زەند ئاوێستا*، دیوانی شیعر، سوێد ١٩٨١.

١٢ *شەفەق*، دیوانی شیعر، سوێد، ١٩٨٢.

١٣. *هێڤی*، دیوانی شیعر، سوێد، ١٩٨٣ ز.

وەرگـیراو لـە یاداشـتی مامۆسـتا هـەژار. گۆڤـاری پێـشەنگی *کوردی*، ژ ١١، سووریا. ڕۆژنامەی *گەل*، ژ ١٣، سووریا ١٩٨٥ ز.

## عەلائەدین سەجادی

سەید عەلائەدین، کوڕی سەید نەجمەدین، لە سەیدەکانی کەلجی، سەر بـە شـاری سـنەیە. ساڵـی ١٣٢٥ ک. م. لە سنە هاتە دنیا و پاش خوێندنێکی سەرەتایی، ڕووی لە غوربەت نا و لە بەرگی فەقێتیـدا، زۆرێـک لە قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان گەڕا و سەرەنجام گەیـشتە بەغـدا و لـەوێش خزمـەتی تاقمێک لە مامۆستایان گەییشت.

مامۆستا عەلائەدین پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، هەر لە بەغدا مایەوە و تا دواکاتی ژیـانی (١٤٠٥ ک. م.)، بە تۆژینەوە و کۆکردنەوە و نووسینی کوردییەوە تەمەنی تێپەر کرد و چەنـد بەرهـەمی بایەخـداری بـۆ کتێبخانەی کورد بەجێهێشت؛ هێندێک لەوانە بریتین لە:

١. *ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی*

٢. *ڕشتەی مرواری*، ٨ بەرگ

٣. *مێژووی ئەدەبی کوردی*

٤. *گەشتێک لە کوردسانا*

٥. *گۆڤاری گەلاوێژ*

٦. *گۆڤاری نزار*

٧. *دەقەکانی ئەدەبی کوردی*

خوا لێ خۆشبوو عەلائەدینی سەجادی لە مامۆستایانی وێژەی کورد و ئەنـدامی کـارای «کـۆڕی زانیـاری کورد» لە بەغدا بوو.

*یادی سەجادی*، دلێر سەجادی، بەغدا، ١٩٨٧ ز. پێشەکی *شـــەرەفنامەی کـــوردی هـــەژار*، یاداشـــتەکانی نووســـەر.

## مەلا عەبدوڵای مودەڕڕیس گورجی

کوڕی مەلا عەبدولکەریم، کوڕی مەلا عـارف، کـوڕی مـەلا شـەریف، لـەدایـکبـووی ساڵـی ١٣١٣ ک. م. زانایەکی هێژا و مامۆستایەکی پارسا بوو کە پاک هات و پـاک ڕۆیـشت و لـە سـەرەتای لاوی و سـەردەمی هەرزەکارییەوە تا تەمەنی پیری و زورهانی، لەوپەڕی دوورەپەرێزی و نەوسکوژیـدا ژیـا و بـۆ بـەڕێوەبردنی فەرمانی شەرع، یەکجار پێداگر بوو. بە بێ چاوەڕوانی، ژیانی لە ڕێی ڕێنوێنی خەڵک و پەرەدان بە ئـایین و بارهێنانی فەقێیان و نووسینی کتێباندا تێپەڕ کرد.

مامۆستا هەم دەرسیدەگوتەوە هەمیش ئیمام و بەرنوێژی مزگەوتی «مەڵاوەیسی» شـاری سـنە بـوو. تـا ئاخریش ئەم دوو ئەرکەی بە باشترین شێوە بەڕێوە برد و سـەرنجام لـە ڕۆژی پێنجـەمی ڕێبەنـدانی ساڵـی ١٣٦٣ ک. هـ. )١٩٨٤ ز.)، بەرامبەر بە سێهەمی مانگی جیمادیئەوەڵی ساڵی ١٤٠٥ ک. م. لە شاری سـنە، گیانی پاکی بە خودای تاک ئەسپارد.

**بەرهەمەکانی مامۆستا**:

١. نامیلکەیەک لە مەنتیقدا، بە فارسی

٢. «پیام به برادران دینی»

٣. «كشف‌الغوايه»، بۆ لابردنی دوودڵی

٤. نامیلکەیەکی فارسی لە حیساب و جەبردا

٥. نامیلکەیەک بە فارسی لە بارەی حیجابەوە

٦. «مناسك حج»

٧. «*مەلوود نامە*» بە کوردی
٨. «تحقيق النُسخ»، ڕەد کردنەوەی خاچپەرستی و چەند کتێبی تر

یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا فەیزوڵای مورادی

کوڕی ئەبوومحەممەد، ساڵی ١٢٩٠ ک. هـ. )١٩١١ ز.)، لە گوندی «بێساران»ی ناوچەی ژاوەرۆ هاتە دنیا و هەر لە تەمەنی تازەلاوییەوە، بە ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستاندا گەڕا و لە خزمەتی مامۆستایانی گەورەی ئەو سەردەمە بەهرەی برد. هێندێک لەو زانایانە بریتین لە: مەلا شەریفی بێسارانی، سەید عینایەتی هۆیەیی، مەلا موحەممەد سادقی ئیمامەت (ئەویهەنگی)، مەلا موحەممەد باقری بالک، مەلا موحەممەد سەعیدی ڕەشەدیٚ، مەلا سلێمانی کانی میرانی، مەلا عارفی چنگینانی، مەلا عەبدوڵلای عەرەب (سووورداش) و مەلا عەبدوڵلای مودەڕڕیسی سلێمانی.

مەلا فەیزوڵا ئەوجار گەڕاوە بۆ سنە و سەردەمێکیش لە مزگەوتی مەلا جەلال، لە خزمەتی مامۆستای پایەبەرز، مەولانا موحەممەدی مودەڕڕیس گورجیدا خوێندی و ئیجازەی وەرگرت. ئەوجار گەڕاوە زێدی خۆی و پاش ساڵێک دەرس گوتنەوە و بەرنوێژی، لەوێوە چووە ئاوایی «کێلانە»ی لای سنە و ٩ ساڵیش لەویٚ خزمەتی کرد. بە شوێن ئەوەدا، چوو بۆ گوندی «سارەوقامیش» لە باکووری شاری سنە و ماوەی ٢٠ ساڵان لەو شوێنە، مامۆستا و ڕێنما و گەورەی خۆشەویستی خەڵکەکە بوو.

مامۆستا ١٤ ساڵی دوایی ژیانی گەڕاوە بۆ سنە و لە زانایان و ئیمامانی ناوداری شارەکە ئەهاتە ئەژمار و سەرەنجام شەوی هەینی ٢٨ی  پووشپەڕی ساڵی ١٣٦٤ ک. هـ. )١٩٨٥ ز.)، بەرامبەر بە دوا ڕۆژی شەوالی ١٤٠٥ ک. م. دەستی لە دنیا بەردا و ڕووی کردە بارەگای خودا. خەڵکێکی زۆر تەرمەکەیان  تا سارەوقامیش بەڕیٚ کرد و لەویٚ ناشتیان.

مەلا فەیزوڵای مورادی زانایەکی هێژا و مامۆستایەکی ئاکار بەرز بوو کە هەموو ژیانی بە خوێندن و فێر بوون و دەرس گوتنەوە و فێرکردن تێپەڕ کرد. ژیانێکی ئاسایی و بیٚ زەرق و بەرقی هەڵبژاردبوو. زیاتر لەگەڵ هەژاران و چێنی ڕەنجبەردا دادەنیشت و بەوپەڕی خاکەساری و بیٚنیازییەوە دەجووڵایەوە و لە ناو ناوبانگ و پلە و پایەی دنیا بێزار بوو.

یاداشتەکانی نووسەر.

## قەناتی کوردۆ

ساڵی ١٩٠٩ ز. لە گوندی «سوزریٚ» ناوچەی «فارس»، لە باشووری کوردستان هاتە دنیا. هێشتا منداڵ بوو،

هەموو خەڵکی دێیەکـە، لـە نـاعیلاجی و ترسـی دەسـدرێژی و زۆبێـژی جەندرمـەی تـرک، نیـشتمانیان بەجێ‌هێشت و دوای چەندێک وەیلانی و سەرگەردانی، گەیشتنە ئەرمەنستان. بابی قەنات ماوەیەک لەودوا بە ماڵەوە چووە گورجستان و لە شاری تفلیس دامەزرا و قەناتی لەوێ ناردە مەدرەسە.

ساڵی ١٩٢٨ ز. قەنات هاوڕێ لەگەڵ ٢٨ کوردی قوتابی‌تردا، بۆ خوێندنی باڵا گەیشتنە شـاری لینینگـراد (سەن‌پترزبورگ) و لە زانستگای ئەو شارەدا ناویان نووسی. هەر لەو سەردەمەدا بوو کە بە هاوقۆڵی تاقمێـک لە لاوانی کورد، گۆڤارێکی کوردی دەرهێنا.

قەنات پاش وەرگرتنی لیسانس، دوکتوری خوێنـد و ساڵـی ١٩٤١ ز. بـە باشـترین دەرەجـە، نامیلکـەی دوکتوراکەی پێشکەش کرد.

پروفیسۆر قەنات کوردۆ (کوردیۆڤ) ساڵی ١٩٥٥ ز. لە زانکۆی زمانە ڕۆژاواییەکانی زانستگای لینینگـرادا، وەکوو مامۆستا وەرگیرا و کرا بە سەرپەرشتی بەشی زمان و وێژەی کوردی و ماوەی ٣٠ سـاڵ دەرفـەتێکی باش بۆ ئەم مامۆستایە ڕەخسا کە بە لێکۆڵینەوە و نووسین و دەرس گوتنەوە، خزمەت بکا.

ئەو مامۆستایە سەرەنجام لە ١٨ی نوامبری ساڵی ١٩٨٥ ز. بەرامبەر بە ١٤٠٦ ک. م. سـەری یـەکجاری نایەوە و بە شێوەیەکی شایان، لە زیارەتانی شاری لینینگراد تەرمەکەیان ناشت.

**کتێبەکانی**:

١. «*ڕێزمانی کوردی*»، ئیروان، ١٩٥٦ ز.

٢. «فەرهەنگی زمانی کوردی بۆ قوتابیانی پۆلی سەرەتایی»، موسکۆ، ١٩٥٧.

٣. «*فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی*»، موسکۆ، ١٩٧٨ ز.

٤. «*ڕێزمانی زاراوەی باشوور و باکوور*»، موسکۆ، ١٩٧٨.

٥. وەرگێڕانی داستانی «*سیقاحاجی*» بە ڕووسی، موسکۆ، ١٩٦٢ز.

٦. «*ڕۆسەمی زاڵ لە ناو کوردان*»، بە ڕووسی، موسکۆ، ١٩٧٨ ز.

٧. «*زمانی کوردی*»، فرانکفورت، ١٩٨١ ز.

٨. «*مێژووی وێژەی کورد*»، دوو بەرگ، ستوکهۆڵم، ١٩٨٣ ز.

٩. وەرگێڕانی داستانی «*دمدم قەلا*» بە ڕووسی.

١٠. «*فەرهەنگی کوردی سۆرانی ـ ڕووسی*»، موسکۆ، ١٩٨٣.

١١. «*زنجیرە چیرۆکی فولکلۆری کوردی*»، بەغدا، ١٩٧٨ ز.

زیاد لەم کتێبانە، زۆرێک نامیلکە و وتووێژی لەمەڕ وێژە و مێژووی کوردەوە، لە هێندێک بلاڤۆکی ڕووس و باقی وڵاتە ئورووپییەکاندا، چاپ و بڵاو بوونەتەوە.

گۆڤـاری پێـشەنگ، سـوێد، س٤، ژ١١.

چێشتی مجێور، چ٢، ل ٢٨٢، ٤٨٨، ٤٩٠.

## هێمن

شاعیری هەستناسک و زمانپاراوی کورد، سەید موحەممەد ئەمینی شێخولیسلامی، کوڕی سەید حەسەنی شێخولیسلامی موکری، نازناو «هێمن»، لە پشتی عارف و زانای بەناوبانگ، مەلا جامی چۆڕی و لە سەری دایکیشەوە، نەوەی شێخی بورهان، بەهاری ساڵی ١٣٠٠ک. ھ. )١٩٢١ ز.)، بەرامبەر بە ١٣٤٠ ک. م. لە گوندێکی لای مەهاباد بە ناوی «لاچین» هاتۆتە دنیا. هەر بە منداڵی خوێندنەوەی قورئان و وانە سەرەتاییەکانی فارسی و عەرەبی دەسپێکردووە و پاشان بۆ خانەقای شێخی بورهان چووە و ماوەی چوارساڵ لەوێ ڕایبواردووە و هەر لەو سەردەمە، لەگەڵ هەژاردا یەکیان ناسیوە و بوونەتە دۆست. دوای ئەوە، بە فەرمانی بابی چووە بۆ گوندی «کولیجە» و چەند ساڵێک لە خزمەتی مەلا ئەحمەدی فەوزیدا خوێندوویە.

وەک خۆی لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ، ئەگەر شتێک فێر بووە و سەوادێکی دەسکەوتووە، لە خزمەتی مامۆستا فەوزیدا بووە و ئەگەر هەستی نەتەوایەتی ونیشتماندۆستی لە دڵ و مێشکیدا ڕیشەی داکوتاوە، ئەو تۆمەکەی داناوە و ئەگەر شیعری بەرزبۆتەوە و لە شاعیریدا سەرکەوتووە، لەو بوارەشدا، مامۆستا ڕایهێناوە.

ساڵی ١٣١٧ گەڕاوەتەوە ماڵی خۆیان، کە ئەودەم لە «شیلاناوێ» بووە. ڕۆژان سەرقاڵی کشتوکاڵ و شەوان تا دیرێک سەر لە ناوی کتێبە ئەدەبییەکان، لە کوردی و فارسی، خەریکی خوێندن بووە و ساڵێک چەند جار هاتوچۆی شاری مەهابادی کردووە و لە کۆڕە ئەدەبی و ئێوارەشیعرەکانی ئەو شارەدا بەشداری کردووە و شیعری خۆی خۆێندووتەوە و وردە ـوردە پیاوە ناسراوەکانی شار ناسیویانە و بەتایبەت پێشەوای شەهید، قازی موحەممەد لەو سەردەمە بۆتە ئاشنای.

هێمن لەم کاتەدا لاوێکی شیاوی پێگەیشتوو، ژێهاتی، خوێندەوار و ئاگا بووە کە شیعرەکانی لە لای خەڵک و نەخوازە لاوان دەستاودەستی کردووە. بابی ـکە بۆخۆشی لە شیعر و شاعیری سەریدەرچووە ـــ نەیویستووە کوڕەکەی خەریکی شیعرهۆنینەوە و ژیان خەسار کردن بێ! بەڵام لێهاتوویی سرشتی و زەوقی خودادادی هێمن و بارودۆخی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگا، ئەوی بە پێچەوانەی ویستی بابی، بەرەو سەرچاوکەی ڕوونی داهێنان لە هونەری شاعیریدا بردووە و زۆری پێ نەچووە کە پێشەوا، سەرناوی «شاعیری میللی» پێ بەخشیوە.

ساڵی ١٣٢١ (١٩٤٢)، بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی ژـک (ژیانەوەی کورد) و ئەو ئەندامەتییە، ئاڵوگۆڕێکی یەکجاری لە ژیان و بیر و بۆچوون و تەنانەت چارەنووسیدا بەدیهێناوە. ساڵی ١٣٢٣ (١٩٤٤) وەک نووسەری گۆڤاری «*نیشتمان*» وەرگیراوە؛ کە ئەودەم بە شێوەی پەنامەکی، تاقمێک لە وێژەوانان و شاعیرانی

کورد، دژی ڕژیمی شا دەریان‌دەکرد.

ساڵی ١٣٤٧ (١٩٦٨)، چیدی لەبەر زەبر و زۆری دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێران خۆی پێ نەگیراوە، داویەتە کەژ و بۆتە پێشمەرگە و دەوری دە ساڵان تفەنگ بە شان و قەڵەم لە دەست، بۆ ڕزگاری میللەتەکەی خەباتی کردووە.

هێمن پاش ڕاپەڕینی ١٣٥٧ (١٩٧٩)ی ئێران، گەڕاوە ڕۆژهەڵات و دەستی دایە خزمەتی فەرهەنگی و بۆ وێنە سەرپەرشتی گۆڤاری مانگانەی سروەی گرتە ئەستۆ؛ کە لە ورمێ دەردەچوو.

مامۆستا هێمن سەرەنجام شەوی هەینی ٢٩ی نەورۆزی ساڵی ١٣٦٥ ک. هـ. )١٩٨٦ ز.)، بەرامبەر بە ١٤٠٦ ک. م. پاش ٦٥ ساڵ ژیانی پڕ ئاڵوگۆڕ، بە یەکجاری سەری نایەوە و لە مەینەتی دنیا حەسایەوە.

**بەرهەمە چاپ کراوەکانی هێمن**:

١. «*تاریک و ڕوون*»، دیوانی شیعر

٢. «*ناڵەی جودایی*»، شیعر

٣. «*پاشەرۆک*»، زنجیرەیەک لە وتار و شیعرەکانی

٤. پێداچوونەوە، نووسینەوە بە ڕێنووسی کوردی و دانانی پێشەکی بۆ کتێبی «*تحفەی مُظفریّە*»

٥.پێشەکی بۆ ڕۆمانی «*قەڵای دمدم*»، عەرەب شەمۆ

٦. «*شازادە و گەدا*»، وەرگێڕاوە

٧. «*هەواری خاڵی*»، دوو بەرگ

**شینی هەژار بۆ هێمن**

«خەبەری مەرگی مام هێمن، وەها گێژ و سڕی کردم؛ کە هۆش و بیری شێواندم؛ دەماری هەستی تەزاندم؛ جەرگ و هەناوی سووتاندم؛ گیانی سیسی هەڵکزاندم؛ ژانێکی ئەوەندە گران تزاوەتە ناخی گیانم، کە زمانم لە دەربڕینی گۆ ناکا و لەنگ و کۆڵە. هیچ وشەیەک و ڕستەیەک لەم مەیدانەدا شک نابەم کە ئەم هەستە دڵتەزێنە ئاشکرا کات.

هێمن بەر لەوە شاعیر بێ و ناوبانگ و ناوێک پەیدا کا، ئاواڵی گیانی ـ گیانیم بوو. لای مامۆستایەکمان دەخوێند؛ سوێندمان بە سەری یەکتر بوو؛ لە ناو حوجرەیەکدا دەژیاین. بە درێژی شەو هەتا خەو گێژ و کەلالەی دەکردین، ڕاز و نیازی ساویلکە و منداڵانەمان لە لای یەکتری دەدرکاند. لە درێژایی ڕۆژگاردا دەرس و دەور و گەمە و گاڵتەمان وێکڕا بوو. بە تیتوش لێک هەڵنەدەبڕاین. هەرچەند هێمن کچەزای شێخی بورهان و بابیشی شێخولیسلام و لە بنەماڵەی سەیدی چۆڕ و مەلا جامی و بە تایفە بەناوبانگ و جێ‌بەرز بوو، منیش کوڕی مەلایەکی خۆماڵی و حەسەنخاڵی بووم و لە بابەت ماڵ و حاڵەوەش چەندین پلە لەو کەمتر و نەوی‌تر بووم، بە داب و نەریتی ئەوسا، دەبوایە دەعیەی نەهێنی من بدوێنێ و هەر



هاودەمی نەجیم و نەجیمزادان بێ؛ بەڵام گـڕی مەحەببـەتی دوو تـازە لاو بـۆ یـەکتری، هـەموو لەمپـەر و بەرگری پەڕاندبوو؛ سوتاندبوو.

هێمن منی لە گش ئامۆزا و خاڵۆزا و کەس‌وکاری خۆشتر دەویست؛ کە دیارە منی هەژاریش بە یاری ئەو خۆم بە بەختەوەر دەزانی و هەموو دڵخۆشیم هەر بەو بوو.

لەو دەمەش‌ڕا کە لە بستووی تازەلاوی بەو دیودا چوین، منداڵی نەما و گەورە بوین، بوینە هاوبیر لە بیری ئازادیخوازی و ڕێبـازی بەربـەرەکانێ داگیرکـەرانی زاڵـم و کـورد چەوسـێنەرمان دایـە پـێش؛ ئـەو نـاوی حەمەدەمینی کردە هێمن، منیش لە ئاوڕەحمانییەوە، ناوی هەژاریم لە خۆ نا، هەر شان‌بەشان و پـێ‌بـەپـێ ڕێوە دەچوین؛ پێکەوە بوین. شەوگار لەبەر چرای نەوت، لە ژوورێکـدا دەمـان‌نویـسی؛ کوردیمـان دەکـردە شیعر؛ شیعرمان بە کوردی دەگوت؛ هەر دووکمان بـەرەو ڕووگەیـەک نوێژمـان دەکـرد: بـەرەو پەیکـەری ئازادی گەلی دیل و چارەڕەشمان ـ کە هەمیشە لە پێش چاوی خەیاڵمان بوو ـ بە جووتە کڕنوشمان دەبرد. شیعری خۆمان نیشانی یەکتری دەدا؛ بۆ یەکتریمان چاک دەکرد. شیعری من بوایە یان ئـەو، دەبـوو هـەر دووک بە دڵ پەسەندی بکەین و ئەوسا ڕووناکی ببینێ و نیشانی هەوالانی دەین. ئێرەیی کەونـە شـاعیران لێرەدا باوی نەمابوو؛ لای من و هێمن فەوتابوو. یەکدڵیمان، تێکەڵیمان گەیشتە پلـە و پایەیـەک، وەک دوو جمک خۆمان و ناوەکانیشمان لە زۆربەی خەڵک دەگۆڕا. تووشی هەرکامێکمان دەبوون، بانگیان دەکرد:

هەژار هێمن! هێمن هەژار!

سەردەمایەک لە ڕۆژگاری ئازادیدا، مامۆستا حەسەن قزڵجی و هێمن و من، هاومەنزڵی سـێ‌برالـە بـوین، شەوێکیان قزڵجی گوتی: کوڕینە! ئێستا زەمانە لەم یەکتر گرتنەوەی ئێمە، کە هێندە بە یـەکتر شـادین، وا لە عەزرەتان شەق دەبا؛ زۆر دەترسم لێکمان بکا و ئاگامان لە یەکتر ببڕێ. بە ناشوکری خودا نـەبێ، قـسەی قزڵجی وەدیهات. دوو کەوتینە دەربەدەری و هێمن کەوتە کوێرەوەری. وەک تۆوی هەرزن بڵاو بـوین. لـە مەودای دەربەدەریمدا، تەنیا بە یادی مام هێمن فرمێسکم هەڵوەراندووە. بەڵێ خەمی کەس و کار و دۆست و یارانم زۆر بوە، بەڵام گریانم هەر تەنیا بۆ دووری هێمن هاتووە.

پاش چەند ساڵێک لە کوردستانی بەردەستی عەرەبیشدا گەینەوە یەک. برینی دەردی دووریمان سـاڕێژ کرا و سەبووریمان بە دیتنی یەکدی دەهات.

لەم ماوەی گەڕانەوەشدا، مانی هێمن هێزی گیان و هەناوم بوو.

هێندێک پتر لە نیو قەڕن، بە ژینی هێمن دڵخوش بووم؛ دۆستایەتیمان قایم بوو. قـەد جـارێکی بـە قـەد مسقاڵە زەڕڕەیەک دڵمان لە یەکتر نەئێشا. لە زەمانی منداڵی و لاویدا چۆن بووین، بە سەری پیریش هەروا بووین. بەڵام ئێستا بۆ یەکەمجار، بەغیلی بە هێمن دەبەم: چۆن بەرلە من خۆی لە دەرد و داخ ڕزگار کـرد و منی هەژاری بەجێ‌هێشت! داخی گەورە و گرانی من هـەر ئەوەیـە کـە تـازە هومێـدم نـەما لەسـەر دنیـا

ببینمەوە. بە فەرمایشی مەولەوی: «دیدەنی دیدار کەفتە قیامەت».

لە خودا ئاوتەخوازم بە زووێکی زوو ئەم دنیایە بێ هێمنە بەجێ‌بێڵم. لەو دنیا ـ کە ڕۆح ئازادە ـ بە مام هێمن بگەمەوە و دوور لە چاوی چاونەزێر و ستەمکاران، گیانمان بە دیتنی یەکتر شاد و شوکر ببێتەوە. دنیا بۆ من لە پاش هێمن چڵەکایەکیش ناهێنێ.

کاک هێمن گیان! هێندە بزانە هەژار بێ‌تۆ، باڵشکاوە؛ مایەی دڵخۆشی نەماوە. چاوەنۆڕ بە، بە هومێدم هەر بەو زوانە ژوانی پێک‌گەیشتنەوەمان لە بارەگای خوداوەندی دادگەر بێ».

کاک هێمن، برای شیرینم! — چاوان دەگێڕم، ناتبینم
زل‌کوێران دەڵێن مردووە — کۆچی یەکجاری کردووە
دڵەی پڕکوڵی هەژارم — گیانی بێ‌ئۆقرە و قەرارم
بە مەرگی تۆ باوەڕ ناکا — چۆن بێ‌منی لە تۆیی خاکا؟
تۆیەک هۆگری منداڵیم — هاوشلکی و هاو کرچوکاڵیم
هەمدەمی دەمانی لاویم — تەواوکاری ناتەواویم
هاوهەنگاو لە ڕێی خەباتا — هاوبەش لە هات و نەهاتا
هەواڵ دڵداری کوردستان — هاوپێشمەرگەی زێدپەرستان
هاو سروودخوێن بۆ ئازادی — بۆ ڕزگار بوون لە بێدادی
هاوسەنگەر دژی داگیرکەر — نامۆی خوێنمژی سەرەخەر
هاوقەتار لە دەربەدەری — بە هەژاری و خاکەسەری
هاوقەڵەم، هاوبیر و هاوهەست — هاوزمان، هاودڵ و هامدەست
هەر یەکێ بوو هەژار هێمن — منیش هەر تۆ بووم، تۆش هەر من
ڕۆحێک بووین دابەش لە دوو لەش — دوو لەشی ماندووی بەختڕەش
پەیمان بوو، بەجێم نەهێڵی — وێڵم نەکەی لە شوێن خێڵی
باری خەم وێکڕا هەڵبگرین — دواجاریش پێکەوە بمرین
تۆی کوردی وا خاوەن‌بەڵێن — چی تۆی کردە پەیمان‌شکێن؟
گەوی بەین و بە قات هەڵبوارد — خۆت بە ئاسوودەیی ئەسپارد
لاباری خەمخواریت لادا — ئەویشت بە مل مندا دا
جاڕز بووی لە دنیای بێ‌فەڕ — دنیای پڕ لە دەزبڕی و گەڕ
دنیای وڕ و گێژ و کاسان — گەوهەر و ئەمەگ‌نەناسان
دنیای بازاڕی نامەردان — دنیای خەم و کوڵ و دەردان

خەلەستی لە دەم هار و مار — تەکیەوە لەو ژینی گەمار
ژیانی پڕ ژانی بێدەرمان — گەییشتیە هەواری هەرمان
بۆ ئەو کۆچەی بێمن کردت — ئەو بەشە خۆشییەی تۆ بردت
زامی گیان و دڵ پڕسۆیە — شین بۆ خۆمە، نەک بۆ تۆیە
خۆزگە بەر لە تۆ دەمردم — تۆ شیوەنت بۆ دەکردم
دوور لە تۆ دڵ گۆمی خوێنم — بە گازندەوە دەتدوێنم
منیش وەک تۆ قەڵسم لە ژیان — «بۆچت جێهێشتم؟هێمن گیان!»[1]

**چەند شیعری هێمن:**

**کوردم ئەمن**

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن — قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم مەردم ئەمن
ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕخاڵ نیم — ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن
گەر لە برسان و لەبەر بێبەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم — نۆکەری بێگانە ناکەم، تا لەسەر هەردم ئەمن
من لە زەنجیر و تەناف و دار و بەند باکم نییە — لەتلەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن

**فرمێسکی گەش**

قەت لە دنیادا نەبوو بێجگە لە ناخۆشی بەشم — مات و داماو و پەشێو و بێکەس و چارەڕەشم
سەردەمێک ئاوارە بووم و ماوەییەکیش دەسبەسەر — نەمدی ڕووی ئاسوودەیی، هەر تووشی گێرە و قەرقەشم
دابی کوردی وایە کەس لاگیری لێقەوماو نییە — بۆچی سەرکۆنەی بکەم، لێم زیزە یاری مەهوەشم
تیغی بێمەیلی و جەفای ئەو نازەنینە دڵڕەقە — جەرگی لەتکردم بە جارێک ئەنجنیویە سینەشم
کوشتمی و شەشخانی ئومێدی لە من گرتن حەریف — مۆرە هەڵداوێم و بێهووده بە هیوای دووشەشم
نابینی زەردە لەسەر لێوی کەسێ لەم شارەدا — گەر خەم و دەردی دڵی خۆمیان بەسەردا دابەشم
خۆشەویستی گۆشەکەی تەنیایی هەر ئەژنۆکەمە — بۆیە ڕۆژ و شەو وەها گرتوومەتە نێو باوەشم
نایەڵێ دوژمن بە ڕەنگە زەردەکەی من پێکەنێ — تا دەمی مردن ئەمن مەمنوونی فرمێسکی گەشم
شاعیرێکی ڕاست و یەکڕووم و فیداکار و نەبەز — کوردە موحتاجی محەک نیم زێڕی بێغەل و غەشم

**ترۆپکی ڕزگاری**

ڕێبوارێکم ئازا و بەزیبک و زاکوون — دەبڕم چۆڵ و چیا و پێدەشت و بێروون

---

[1] ١. سەرجەمی پیتەکانی ئەم باڵە، بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ١٣٦٥، ساڵی کۆچی دوایی هێمن.

بەرهەڵستم دەکەم هەپروون بە هەپروون — دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم، دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگار بوون

کەند و کۆسپ هەنگاوم پێ ناکا شل — بێتە سەر ڕێم هەزاران گابەردی زل
بەهێزی شان و باهۆ پێ دەدەم تل — دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم، دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگار بوون

پێم گرتووە دەرچووم لە دارەدارە — ڕێم گرتووە، ڕێگای «قازی» و «ئاوارە»
نامترسێنێ گوللە، پەتک، سێدارە — دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم، دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگار بوون

بەو خوێناوەی لەو ڕێبازە ڕژاوە — گوڵی ئاڵی سەربەستی کورد ڕواوە
منیش بە دڵی پڕ لە هیوا و بڕواوە — دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم، دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگار بوون

نارەومەوە لە داوەڵ و تارمایی — زۆرم دیوە بووڵێڵ و تاریکایی
دێنم بەو شەوگارە ڕەشە، دوایی — دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم، دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگار بوون

من پەروەردەی بنسێبەری ئەشکەوتم — گەلێک جاران لە چاڵاوی ڕەش کەوتم
هاتمە دەرێ، هەدام نەدا، نەسرەوتم — دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم، دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگار بوون

## پەیامی ڕانەگەیێندراو

پەیامی من بە گوێی ئەم دڵبەرە نازدارە ڕاناگا — نەسیم بێسیم دەبینێ، شلدەبێ، بەم کارە ڕاناگا
گوتی سەبرت هەبێ دووبارە دێمە دیتنت ئەمما — لە کورتیدا تەمەن، وا دیارە بەو دیدارە ڕاناگا
وەکوو پەروانە دەوری لێ دەدەن لاوانی خۆولاتی — گوڵی ئێرە بە ژوانی بولبولی ئاوارە ڕاناگا
نەخۆش و دەردەدار و دڵبریندارم، پەرستارێک — بە حاڵی ئەم دڵە پڕ ژان و پڕ ئازارە ڕاناگا
دەکەی ماچی دەم و لێوان ئەگەر هێز و گوڕێکت بێ — دەنا جوانێک بە دەردی ئاشقی بێچارە ڕاناگا
هەتا کۆمتر دەبێ پشتم، پتر هەڵدەکشێ مینیژۆپ — ئیتر دەستم بە داوێنی کچی ئەم شارە ڕاناگا
دەبێ بولبول لە من فێر بێ غەزەڵخوێنی، بەڵام چبکەم — گرفتارم، چریکەم بەو گوڵ و گوڵزارە ڕاناگا

## ئارەق و تین

پێش ئەوەی گزنگی هەتاو — ترۆپکی چیا بنگێوێ
پێش ئەوەی شنەی بەیانی — بسکی بەڕەزا ببزێوێ

پێش ئەوەی قاسپەی خاسەکەو — لە زەرد و ما دەنگ‌داتەوە
پێش ئەوەی بلبل بخوێنێ — خونچە دەمی بکاتەوە

* *

پێش ئەوەی سیرەی هەڵۆیان — پەردەی بێدەنگی دادڕێ
پێش ئەوەی چوڕەپۆپنەکی — بەرەو ڕووناکی هەڵفڕێ

* *

پێش ئەوەی شەمی سەرچاکی — ئاخر فرمێسکی هەڵوەرێ
پێش ئەوەی گژەبای تووره — ژیلەمۆی پەپوولە بەرێ

* *

پێش ئەوەی لاوی بەختەوەر — دەم ڕاگوێزێ لەسەر خاڵان
پێش ئەوەی شەوگەڕی دڵتەڕ — وەڕەز بێ لە ماڵەوماڵان

* *

پێش ئەوەی بێری شلومل — چاوی خەواڵووی هەڵبێنێ
پێش ئەوەی شوان مەڕی شەوێن — وەگێڕێ، بەردا، دەس بێنێ

* *

پێش ئەوەی پۆلی نەشمیلان — شل‌شل داگەڕێن بۆ کانی
پێش ئەوەی سەرکانی و دەراو — ژاوەی بێ لە پەری جوانی

* *

پێش ئەوەی حاجی سەلەمخۆر — هەژارێک هەڵنێ بە تەماڵ
پێش ئەوەی ڕێچکە ببەستن — بۆ مزگەوتێ شان بە بەرماڵ

* *

پێش ئەوەی دەروێشی چڵکن — پەنجەی خەلیفەی کوشیبێ
پێش ئەوەی شێخ وەک تارمایی — بەرەو خانەقا خوشیبێ

* *

پێش ئەوەی گزیری بەدفەڕ — لە دیوەخان پاروو بادا
پێش ئەوەی خاتوونێک بەناز — پەردەی کۆشکی ئاغا لادا

* *

من کاری خۆم لە کار دیوە — من جەرگی زەویم دڕیوە

مــــن شیــــڵەگەم هەڵــــبڕیوە مــن یــەکســەریم ئــاخنیوە
مــــن ڕیزەسواڵــــەم دانــــاوە شەغرەو و وێنجەم پێــوەداوە
مـــن گـــاگێرەم تێـــر کـــراوە یـــا خۆیـــانم وەرگێــــڕاوە
هـــاوین و پــــاییز و بــــەهار هــەتاو لێــی نــەداوم بێکــار

* *

من جووتیـارم، مـن جووتیـارم من لەگـەڵ هـەتاو هاوکـارم
من بـە ئـارەق و ئـەو بـە تـین دامانڕشـــتووە بناخــەی ژیــن
باسـکی مـن و تیـشکی ئـەوی بژیــو دەســتێنین لــە زەوی
گـەر جوتیـار ئـارەق نـەڕێژێ گـەر هـەتاو تیـشک نـاوێژێ
دانیشتووی ناو کۆشـک و قـەڵا دەخـــۆن نــانی گەڵاگــەڵا؟

* *

بـەڵام حــەیف ئێـستاش لێـرە من برسیم و کەسـێک تێـرە
نــە قــەت ئــارەقی ئەســڕیوە نە قـەت گـەوزی هەڵـبڕیوە
نــە مەچــەکی جــەمام بــوە نـە چۆڵـەمەی لـەجێ‌چـووە
نـــە ئەنگوســـــتی ڕاگـــیراوە نــە داســۆ لــە چــاوی داوە
نـــە دڵـــی پێـــی دڕدڕ بـــووە نـە بـن‌هەنگـڵی خـڕ بـووە
نـــە کـــەفی دەردا بـــەکـــڵۆ نە پەنجـەی دەری‌کـرد دڵـۆ
نـە دەسـتی پاشـبارەی ناسـی نــە ســاوێکی دا لــە داســی
نـــە بـــە گـــەرما داهێـــزاوە نــە خــەوی لــە چــاوی زاوە
نـــە بـــە ســـەرمایە تـــەزیوە نـە لـە کـای پـاییز خزیـوە
نـە نووسـەکەی پێـوە نووسـا نــە لەبــەر بارانــێ خووســا
نـــە زوقمـــی بەســـەردا بـــاری نـە لـە قـوڕدا کـەوت بـاری
نـە دی شـەو و شـەونخوونی نە چێشتی دەردی نـەبوونی

* *

تاکـــەی وابم؟ تاکـــەی وابم؟ دەس‌بـەتاڵ و ڕەنـجبـەبـا بم
تاکـەی ڕەنجـی شـان و پـیلم بۆ دوژمن بێ، بۆ مـن دیلـم؟
نـــا نـــا، تـــازە ڕاپـــەڕیوم نــــاتوانن بــــدەن فریــــوم
ڕێبـــازی شـــۆڕش بـــەرنادەم مـەودا بـە داگیرکـەر نـادەم

لــە شــان و بــاهۆی خــۆم ڕادی هەڵـــگرم ئـــاڵای ئـــازادی

پێشەکی *تاریک و ڕوون*. دیوانەکانی هێمن. یاداشتی نووسەر.

## حاجی مامۆستا

مامۆستای پارسا و مەلای خۆشەویست، حاجی مەلا ڕەحمانی تـاهیری، مەشـهوور بـە «حـاجی مامۆسـتا»، کوڕی مەلا غەفوور، ساڵی ١٣٠٤ ک. ھ. )١٩٢٥ ز.)، لە گوندی «باغڵووجە»ی سەر بە شاری سەقز هاتە دنیـا و لە ژێر چاوەدێری بابیدا ڕاهات و وانە سەرەتایەکانی سەرف و نەحوی خوێند. ئەوجار (ساڵی ١٣٢٠)، چووە دارولعیلمی «تورجان» و لە خزمەتی مەلا حەمیدی قودسیدا ماوەی سێ ساڵ و شتێک بەهرەی بـرد. دوای ئەوە (١٣٢٤)، ڕۆیشتە گوندی «گردیگلان» و لە کۆڕی دەرسی مەلا عەولای سوتوورییدا دانیشت.

لەوێ بوو کە مەلا کەریمی شاریکەندی چاوپێکەوت و بوونە ئاشنا و دۆسـتی یـەکتر و پێکـەوە خزمـەتی مامۆستایانی وەک: مەلا موحەممەد ئەمینی قاجری، لە «قاراوای خواروو» و حاجی مەلا عەلی ڕەببـانی، لـە «بوغدەکەندی» گەیشتن. پاش ئەوە فەقێ ڕەحمان، لای مەلا عەلی ولژی لە «حەمامیان» و مەلا حەسـەنی شێخی لە «شێخلەر»، تەفسیر و حەدیس و فیقهی خوێند و ئەوجار ـ وەک دابی فەقێیانی ئەو ناوچە بـوو ـــ گەڕاوە تورجان و لەوێ ئیجازەی وەرگرت (١٣٢٨).

مەلا ڕەحمان سەرەتا چۆوە زێدی خۆی (باغلووجە) و چەند ساڵ لەوێ بەرنوێژی کرد و دەرسی گوتـەوە و دوایی ساڵی ١٣٢٣ کۆچی کردە شارەدێی «مەرخوز» و سـاڵانی سـاڵ لـەو شـوێنە، وەک سـەرچاوەیەکی خێروبێر بـۆ خەڵـکەکە، ڕێنـوێن و داوەری جـێ بـڕوای هـەموان بـوو. هـەروەها بـە دانـانی بەرنامەیـەکی ڕێکوپێک، کاری خوێندن و بەڕێوەچوونی فەقێیانی سامان پێدا.

حاجی مامۆستا تاهیری لەم داواییانەدا ـکە یەکجار جێ ڕێزی هەموو چینێکی خەڵک بـوو ـــ بـە ماڵـەوە چووە شاری بۆکان و لەوێ و لە مەیدانێکی هەراوتردا خزمەتی دەسپێکرد.

هۆی جیاواز بوونی حاجی مامۆستا لە چاو زۆرێک لە هاوقەتارانی، زیاد لە باری زانستی، بواری کەسـایەتی و ئاکاری بەرزی ئەو بوو. قەت پێچەوانەی بڕوای خۆی نەدەجووڵاوە؛ ئەگەر ڕاستی و دروستی بابـەتێکی بـۆ دەرکەوتایە، بۆ سەلماندنی، مانای مەترسی و مەرایی نەدەزانی. لـە دۆسـتیدا بەئەمـەگ بـوو. بـۆ دۆسـتی ڕاسـتی، گیانیـشی دادەنـا. سەروسـیمایەکی یـەکجار گـەش و نـوورانی هـەبوو؛ تـژی لـە میهرەبـانی و خۆشەویستی. زۆر قسەی نەدەکرد و لە کاتی ئاخافتندا، دەنگی نەرم و دڵبزوێن و زۆر لەسـەرخۆ بـوو. ئـەو هەمووە ڕێزیان دەگرت، لووتبەرزی و فەخرفرۆشتنی بەلایدا نەچووبوو. لەگەڵ گەورەو پچووک و تەنانـەت منداڵیشدا، وەکوو ڕەفیقێک وابوو.

حاجی مامۆستا سەرەنجام لە دوارۆژی مانگی نـەورۆزی ساڵـی ١٣٦٦ ک. ھ. )١٩٨٧ ز.)، لـە کارەسـاتی

پێکدادانی ماشێندا، گیانی پاکی، لەشی ئازراوی بەجێ‌هێشت. تەرمەکەیان خەڵکێکی زۆر ــکـە لـە شـار و لادێیەکانی کوردستانەوە هاتبوون ـ پێڕای خەم و کەسەر و داخ و مخابن، بەڕێ کرد و لە زیارەتانی بۆکانیان ناشت.

یاداشتەکانی نووسەر.

## حەمدی

عارفی ئاشنا و زانای پارسا، ئوستاد بورهانەدینی حەمدی، کوڕی ناوازەی عەللامە عەبدولحەمیدی عیرفـانی سنەیی[1]، ساڵی ١٢٨٢ ک. هـ. (١٩٠٣ ز.)، بەرامبەر بە ١٣٢٢ ک. م. لە شاری سنە هاتە دنیـا و تـازەلاوێکی ١٢ ساڵان بوو، بابی کۆچی دوایی کرد و لە ڕۆژگـارێکی نالـەباردا، بـەجێی‌هێـشت. بـەڵام بورهـان کـە لـە خزمەتیدا وانە سەرەتایەکانی خوێندبوو، تازە چێژی زانینی چێشتبوو؛ لێبڕا ئەو ڕێگایـە پێـی لێـی نـاوە، تـا ئاخری بڕوا. بەم جۆرە و بە هۆی بیری یەکجار تیژ و زیرەکی لە ڕادەبـەدەر و پێـداگری خـۆی و هـەبوونی مامۆستایانی هەڵکەوتوو لەو سەردەمە، کەسانی وەک: مەلا موحەممەد سادقی نیـەری، شـێخ حـەبیبوڵای کاشتەری و مەلا عەبدولعەزیمی موجتەهید، توانی لە ماوەیەکی کەمدا، زۆر کتێبان بخوێنێ و لەبەریان بکا. بە شێوەیەک کە کاتێ تەمەنی گەیشتە سی ساڵ، لە زۆربەی زانستەکاندا شارەزاییەکی تەواوی دەسکەوێ.

مامۆستا حەمـدی ساڵـی ١٣١٢ ک. هـ. (١٩٣٣ ز.)، لای ڕەوانـشاد، مـەلا سـادقی نیەرییـەوە ئیجـازەی وەرگرت و مامۆستاکانی تر، ئیجازەنامەکەیان مۆر کـرد. ئـەم چەنـد بەیتـە، شـادڕەوان شـێخ حـەبیبوڵای کاشـتەری، لەسـەر بڕوانامەکـەی نووسـیویە و دەردەخـا تـا چ ڕادەیـەک بـڕوای پـێ بـووە و لـە ڕاسـتیدا مامۆستاکانی وەک ئوستادێکی پایەبەرز ناویان لێ بدووە و چاویان لێ کردووە:

إجـــــــازةٌ لا بباطــــــــل    بـــورکَ فیهـــا لقابـــــل
کَحَبَّـــــــة فـــــی قـــــرار    أصـــابَها صـــوبُ وابـــل
فَأصْـــــبَحَتْ ذاتَ شــــطإ    تُنْبـــــتُ سَـــــبْعَ سَــــنابل
لبــــارع فــــی المعــــانی    و جــــــامع للفـــــضائل
فتــــیً، أدیــــب اریــــب    أزْکـــی ســـلیل الأفاضـــل
شــــارح کُنــــه الخَفایــــا    بُرهـــان دَعـــوی الفواضـــل
وَ نحــــنُ أیــــضاً أجَزنــــا    لــــهُ بمــــا هــــو آهــــل
مــــن نــــشر طیــــب العلــــوم    مقاصـــــــد أو وســـــــائل

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٥٨٥.

| | |
|---|---|
| یجـــری لـــسانُ الحبیـــب | و هـــو مـــن الله ســـائل |
| بـــأن یُفـــیضَ علیـــه | مـن سُـحب جـود هواطـل |
| مَناهـــــل البرکـــــات | و الفــضل أو فـــی مناهـــل |
| وَ أنْ یَمُـــــنَّ علیـــــه | بحفظـــه مـــنْ غَوائـــل |
| یـــاربِّ فـــاغفرْ ذنوبـــاً | أتیـــــــتُهنَّ ثَواقـــــل |

مامۆستا بورهانی حەمدی پاش وەرگرتنی ئیجازە، ماوەیەک لە مزگەوتێکی سنەدا بـەرنوێژی دەکـرد، تـا ساڵی ١٣١٥ لـە وەزارەتی پـەروەردە دامـەزرا و مـاوەی سـی و چەنـد سـاڵ لـە دەبیرسـتانەکانی سـنەدا دەرسی‌گوتەوە. چەند ساڵێکیش سەپەرشتی ئەوقافی گرتە ئەستۆی خۆی و لە ماوەدا زۆر خزمەتی کـرد و بۆ نویێ کردنەوەی مزگەوتان و دانانی مەدرەسەی تـازە، حـەولێکی زۆری دا. هـەروەها لـەسـەر داخـوازی بەرپرسانی زانستگای ڕازی، سەرەتێک لە زانکۆی سنەدا، مامۆستای زمان و وێژەی فارسی بوو.

باس لە پلە و پایەی زانستی مامۆستا حەمدی، باسێکی دوور و درێژە و وەک ئاماژەی پـێ کـرا، زانـای وا شارەزا لە هەموو زانستە ئایینییەکان و مەلەوانی دەریای بێ بـنی زمـان و وێـژەی عـەرەب و فـارس، کـەم هەڵکەوتووە. بەڵام کە دێینە سەر باسی کەسایەتی ئەو بلیمەتـە، زۆرتـر قـسەمان لەمـەڕ ئـەم دە ـــدوازدە ساڵەی کۆتایی ژیانی مامۆستاوە خۆش دەبێ. وردە ـ وردە دەستی لە هەرچی بۆنی دنیـا و نـاو و ناوبانـگ و دەسەڵاتی دەدا، بەردا و چاوی هیوای بڕیبە خودای بێ هاوتا. جا کە وای کـرد، وەک چـۆن ئـاوێکی زەڵاڵ مەزرایەکی تینوو دەگەشێنێتەوە ، مامۆستا بە یەکجاری بوو بە کۆگای میهرەبانی و خاکەساری و بوێری.

کۆڕی دەرس و کەلاسی مامۆستا لەم ئـاخرەوەوە، هـەمووی خۆشەویـستی و ئیمـان و یەکـڕەنگی بـوو. ئەگەرچی منداڵێکی نەبوو، بەڵام هەموو شاگردەکانی وەکوو منداڵی خۆی خۆش‌دەویست. بـە نەخۆشـی و لاقێشەوە، هەستان لەبەر پای میوانی قەت نەفەوتاند. لە حـەوتوودا جارێـک مەسـنەوی مـەولانای ڕۆمـی دەرس دەگوتەوە و وەک مامۆستایانی مەولەوی نـاس کـە لـەو کەلاسـەدا دادەنیـشتن، دەڵـێن، مامۆسـتا حەمدی یەکێ لە گەورەترین مەولەوی‌ناسان و مەسنەوی‌زانان بوو. زۆربەی بەیتەکانی لەبەر دەخوێنـدەوە و زۆرێک لە گرێ‌کوێرەکانی ـ کە باقی کەمتر خۆیان لێ داوە ـ بەوردی شی دەکردەوە. ئیمـامی غـەززالی زۆر خۆش دەویست و کتێبەکانی هەمیشە لە ژوور سەری بوون و قسەی خۆی بە وتە بەنرخەکانی دەڕازاندەوە. زۆرتر چاوی لە ئیمامی شافیعی دەبڕی؛ بەڵام تۆژینەوە لە ڕێبازەکانی تریـشی لا پەسـند بـوو. بۆخـۆی لـە باسی زەکاتدا، بەرامبەر بە مەزهەبی شافیعی فتوای نەدەدا. هەروەها لەمەڕ بابـەتی پەیوەندیـدار بـە دنیـای ئەوڕۆکەوە، تێبینی تایبەت و شایانی ئەم ڕۆژگارەی هەبوو.

ئەم زاتە پیرۆزە سەرەنجام ڕۆژی دووشـەمبە ٩ی سـەرماوەزی ساڵـی ١٣٦٦ ک. هـ. (١٩٨٧ ز.)، گیـانی پاکی بە خودای تاک ئەسپارد.

**بەرهەمەکانی مامۆستا حەمدی**:

١. وەرگێڕانی «*مشکوة الانوار*»ی ئیمام غەززالی

٢. وەرگێڕانی «*الاربعین فی اصول الدّین*»ی ئیمام موحەممەدی غەزالی

٣. وەرگێڕانی نامیلکەکانی «*حیّ بن یقظان*»ی ئیبنوسینا و شێخ شەهابی سوورەبەردی و ئیبنوتوفەیل لە یەک بەرگدا

٤. «*فلاسفه و خداشناسی*»، بریتی لە وەرگێڕاوەی «*رسالةُ الطّیر*» و «*رسالەی فلسفەی نماز*»ی ئیبنوسینا و کتێبی «*مراةُ الفلسفه*»ی تەنتاوی، لە بەرگێکدا

٥. وەرگێڕانی «*عقاید نسفی*»، سەعدی تەفتازانی

٦. وەرگێڕانی سێ قەسیدەی «*لامیةُ العرب*»ی شەنفەرا و «*لامیةُ العجم*»ی توغرایی و «*لامیةُ الکُرد*»ی عیرفانی سنەیی

٧. وەرگێڕانی قەسیدەی «*بانت سُعاد*»ی کەعب بنی زوهەیر

مامۆستا زەوقی شیعریشی هەبوو. نازناوی «حەمدی» دەنووسی. ئەم دوو غەزەلەی لە سەردەمی لاویدا گوتووە:

بُتا خون شد دلم در آرزوی دیدن رویت
بەسر شد عُمر من یکبارە در سودای گیسویت

گدای درگە تو گشتەام ای خسرو خوبان
بە لطف خویش بنواز و مرانم از سر کویت

اگرچە در مصاف شیر مردان شیردل باشم
ولی گشتم بە یک لحظە شکار چشم آهویت

سرآمد عُمر من در کسب دین و دانش و فرهنگ
ولیکن جملە را تاراج بُردە چشم جادویت

سنندج بی‌نصیب از برق اگر باشد غمی نبود
چو تابد در خیابانها فروغ روی نیکویت

بدینسان گر سوی بُستان خرامان بگذری یک‌دم
سهی سرو چمن گردد غلام قد دلجویت

از آن روزی کە «حمدی» شد گرفتار غم عشقت
سیە شد روزگارش همچوزلف غالیە بویت

* * *

ندارد کس چنین یار جفاکاری کە من دارم
زند هر لحظە تیری بر دل غمدیدەی زارم

نخواندە در دبیرستان بجز درس ستمکاری
نیاموزد دبیرش غیر کسر قلب افگارم

نباشد در فلک ماهی بدین خوبی و زیبایی
نروید در چمن سروی چو رعنا قامت یارم

نگاە چشم مستش آفت جان و دل و دین است
بە دام چین زلفش دل پریشان و گرفتارم

بهای بوسەای از آن لب لعل شکرریزش
اگر جانی ستاند، من بە صد جانش خریدارم

نماند در دل شیدایم آثار پریشانی
شبی گر با سر زلفش بە دمسازی بە روز آرم

فقیە شهر نبود از اصول عاشقی آگاە
ملامتها اگر گوید، ورا معذور میدارم

چو بینم روی آن مه، فارغ از خورشید گـردونم وَ گـر زلفـش ببـویم، بـی‌نیـاز از مُـشک تاتـارم
غزلخوانی کنم «حمدی» چـو بلبـل بـر گـل رویـش ولی از گلشن حسنش نصیبی نیست جُـز خـارم

لە شینی ئەومامۆستایەدا ـ کە دۆست و هاوکاری لەمێژینم بوو ـ قەسیدەیەکم دانا؛ ئەوا چەند بەیتی:

شـد از دار فنـا افـسوس راحـل سـوی دار بقـا آن مـرد مقبـل
گُـزین حبـر ادب «برهـان حمـدی» مهـین دانـای دانـشمند فاضـل
فـروزان اختـر شـهر سـنندج چـراغ انجمـن، شـمع محافـل
کلیـد رمـز ابیـات نظـامی کـلام مولـوی را حـل مـشکل
سـخن‌سـنجی چـو استادان پیـشین سـخندانی چـو سـحبان ابـن وائـل
پـی درس مقامـات حریـری کجـا دیگـر شـود راهـی مُحـصل
منـت بـودم یکـی همکـار چنـدی ندیـدم در تـو جـز حُـسن خـصایل
تنـی وارسـته مـشحون از محاسـن بـه دور از وصـمت ننـگ رذایـل
از آن گلـزار رنگـین معـانی فـراوان بهـره‌ام گردیـد حاصـل
دریغـا رفتـی و دیگـر نباشـد نظیـرت بـین اقـران و اماثـل
یقین دارم کـه اکنـون کـرده باشـی بـه گلـزار بهـشت خُلـد منـزل
روانـت شـاد از دیـدار پاکـان قـرین رحمـت خـلاق عـادل

*یادنامەی اُستاد* حمدی، بەفرانباری ١٣٦٦. یاداشتەکانی نووسەر.

## عەبدوڵای موفتی

کوڕی گەورەی مەولانا مەحموودی موفتی، مەشهوور بە «ئاغە» و نازناو «رستە»، ساڵـی ١٣١٣ ک. ه. )١٩٣٤ ز.) لە شاری سنە هاتە دنیا و هەر لە منداڵییەوە زۆر خۆشەویستی بنەماڵەی بوو. بـەو بۆنـەوە بـۆ خوێنـدن نەیانهێشت لە سنە دەرکەوێ و لای بابی و فەقێیەکانی خوێنـدی و کـە پێگەیـشت، چـوو بـۆ تـاران و لـە زانستگای تاران بوو بە قوتابی و لیسانسی ئـایینی وەرگـرت. ئـەوجار گـەڕاوە زێـدی خـۆی و لـە وەزارەتی پەروەردە دامەزرا و ماوەی ٣٠ ساڵ، لە پۆلی دواناوەندیدا دەرسی گوتـەوە و مامۆسـتایەکی زۆر سـەرکەوتوو بوو.

ئاغە لەم دواییانەدا بە ماڵەوە چوو بۆ کـەرەج و پـاییزی ساڵـی ١٣٦٧ ک. ه. (١٩٨٨ ز.)، لـە تەمـەنی ٥٤ ساڵاندا، شەپڵەی مێشک لێی‌دا و چەند ڕۆژ لەودوا، لەگەڵ داخ و دەردی دۆستان و کـەس‌وکاریـدا، سـەری یەکجاری نایەوە.

شادڕەوان عەبدوڵڵای موفتی پیاوێکی دینـدار، بـەغیرەت، بـوێر، میواندۆسـت، ڕووگـەش، قـسەخۆش و

خۆشەویست و هەروەها ویژەوانێکی خاوەن زەوق و وردبین بوو. کەلاسی دەرسی لەگەڵ خۆشی و دڵکێشیدا، یەکجار پڕپیت و بایەخدار کۆتایی دەهات. سەر و سیمایەکی زۆر پێکەوتوو، قەد و باڵایەکی بەرز و کەڵەگەت و لەگەڵ ئەوەدا بۆ داوێنپاکی ناوازە بوو. جاروبار شیعری دەگوت و شیعرەکانی جوان و دڵبزوێنن. ئەوا دوو نموونەی:

آن کە راە جنون گزیدە منم — روی لیلی دَمی ندیدە منم
وان کە از باغ زندگی هرگز — گُلی از آرزو نچیدە منم
از نگاە گلی بە گلزاری — خارها بر جگر خلیدە منم
مرغ بشکستە بالی از لانە — پیش صیاد اگر پریدە منم
آن کە با یاد غنچەی دهنی — تن ز حسرت چو گل دریدە منم
باختە شادمانی و لذت — بار محنت بە جان خریدە منم
کام کس از شکر نگردد تلخ — تلخی از کام او چشیدە منم
در شب تار، والە، سرگردان — ماندە، از کاروان بُریدە منم
سخن عاقلان ز «رستە» شنو — پند مجنون بە جان شنیدە منم

* * *

باشد بنای منزلت و افتخار کار — شاخ درخت زندگیت راست بار کار
تاریخ یادگار جهان و جهانیان — باشد نتیجەی عمل و یادگار کار
هر صفحەاش عیان کند از بهر عالمی — کاقبال نیست جز بە بر و در کنار کار
کاهل بود غریب بە ملك و دیار خویش — مهجور نیست شخص در اقصی دیار کار
بدنامی و کسالت و خواری ز تنبلی است — بخشندەی بزرگی و روح وقار، کار
بیکار سُست و خستە و خمیازەکش بود — بیمار نیست آن کە مَر اوراست یار کار
اُمید محض کی بە کسی دادە اعتلا — باشد امید و ناجی امیدوار، کار
پیشانی گشادە و عزم متین ببین — پیش رجال فتح و ظفر در حصار کار

**بەشێ لە قەسیدەیەک لە شینیدا گوتوومە:**

در خزان برگریزان گلستان ناگهان — تندباد مرگ کند از بیخ سرو راستان
پور پاکان یادگار مفتی والامقام — دیدەی بینای فامیل و چراغ خاندان
«ئاغە» عبداللە مفتی، بندەی طاعتگزار — خاطرش مملو ز ایمان، نام حق ورد زبان
در نجابت، در سخا، در رادمری، بیقرین — در صفا و خلق و خو همپایەی بگذشتگان
نکتەسنج و نکتەدان و نکتەبین و نکتەگوی — خوشبیان، نیکومنش، شیرینزبان، شیوا بیان

دشــمن بــی‌دینــی و دنیاپرســتان و نفــاق | لیـک بـا اربـاب معنـی همـره و همداسـتان
مجلس آرا بـود و شـمع جمـع اربـاب ادب | رهنمـای نوجوانـان بـود تـا بـودش تـوان
حیف از آن رُخسار زیبـا و آن قـد عرعـر مثـال | کاینچنین پژمرده گـشت و شـد اسـیر خاکـدان
ای دریـغ آن چهـرەی بـشاش و گفتـار نکـو | ای دریـغ آن شـیوەی مرضـیّه و خـوی شـیان
بهـر تـاریخ وفـاتش خامـەی «شـیوا» نوشـت | «کـرد عبـدالله مفتـی جـای در صـحن جنـان»[1]

یاداشتەکانی نووسەر.

## بابەشێخ «شیوا»[2]

زانای بێنیاز، بابەشێخی مەردۆخ ڕۆحانی، نازناو «شیوا»، نووسـەری ئـەم کتێبـە، کـوڕی شـێخ حـەبیبولای مودەڕڕیسی ڕۆحانی کاشتەری، ساڵی ١٢٩٩ ک. هـ. (١٩٢٠ ز.)، لە گوندی کاشتەر، لە ناوچـەی «بێـڵەوار»، هاتە دنیا و بە ناوی باپیریەوە، ناویان نا «ئیسماعیل» و بانگیان لێ کرد «بابەشێخ».

بابەشێخ منداڵ بوو، ماڵیان گواستەوە شاری سنە و ئەو لەو شارە و لە ژێر چاوەدێری بابیـدا، بارهـات و بـە لایەوە ئەلف‌وبێتکەی خوێند و لە ودمی هەناسەیەوە، زۆر زوو، قورئانی خەتم کرد.

هەر لەو سەردەمانەدا، یەک لە شاگردانی تازە ئیجازە وەرگرتـووی بـاوکی (عەبدولحەمیـدی میهـی)[3] لـە حوجرەی مزگەوتێکدا قوتابخانەیەکی دانابوو، چەند منداڵی تازەباوی وەکوو قوتابی وەرگرتبوو. بابەشێخیش چووە ڕیزی ئەو منداڵانەوە و دەوری ساڵێک زمانی فارسـی خوێنـد و قەسـیدەی «بُردیّـە» و «بانَـت سُعاد» و یەکێ ـ دوو قەسیدەی‌تـری لەبـەر کـرد. بـە دووی ئـەوەدا، لای یـەکێکی‌تـر لـە فـەقێیانی هێـژای بـابی (بەهائەدینی شادمان)[4]، «شمسُ‌التّصاریف» لە سەرف و «اظهار» و «کافیە»ی لـە نـەحو و چەنـد کتـێبی‌تـری خوێند. چەند مانگیش بە لای مەلا موحەممەد سەعیدی دەربەندیوە «بوستان سعدی» خوێند. ماوەیـەکیش بە خوێندنی حیساب و هیندیسەوە خـەریک بـوو. ئـەوجار کەلاسـی پێـنج و شەشـی سـەرەتایی، چـووە مەدرەسەوە و بڕوانامەی شەشی وەرگرت و ئەگەرچی بۆخۆی دڵی پێوە بـوو دەرسـی مەدرەسـە بخوێنـێ، بەڵام ڕای بابی لەسەر خوێندنی ئایینی بوو.

بەم جۆرە ماوەیەک «*شرح الفیّه*»ی سیوتی لە نەحو و «*فتح‌المعین*» لە فیقهـ و «*رسالَةُالکُبرا*» و «*شرح شمسیّه*»

---

١. ئەم باڵی ئاخرە، بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە ١٣٦٧، ساڵی کۆچی دوایی ئاغە؛ بە ساڵی کۆچی ـ هەتاوی.

٢. وەک لە پێشەکیدا ئاماژەی پێ کراوە، ژینامەی نووسەری ئەم کتێبە (ڕەوانشاد بابەشێخ) و چەنـد کەسـی‌تـر، پـاش کۆچی دوایی خۆی نووسراوە و وەرگێڕی ئەم کتێبە ـ بە کوردی و فارسی ـ نووسیویە.

٣. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٨٦١.

٤. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٨٩٥.

لە مەنتیقی لای بابیەوە خوێند و ئیمجا چووە ڕیزی فەقێیانی مامۆستای پایەبەرز، مەلا موحەممەدی مودەڕڕیس گورجی و «*فناری*» و «*گَلَنبَوی بُرهان*» و «*گلنبوی آداب*» و بەشێک لە «*تهذیبُ الکلام*»، لە خزمەتیدا فێر بوو. پێڕای ئەوەش چەند بابەت لە «*تشریح‌الافلاک*»ی لای مەلا مەجیدی ئوسوولیوە خوێند. لەو ماوەدا شەوان بابی «*شروح تلخیص*»ی عەللامەی تەفتازانی و هۆنراوەی «*نخبةُالادب*»ی لە بەدیعدا ـ کە خۆی داینابوو ـ پێی دەگوت. درەنگانی شەویش، کە باقی دەنووستن، «*تُحفةُ المُحتاج*» و «*جمع الجوامع*»ی دەخوێندەوە.

زستانی ساڵی ١٣٢٠ ک. هـ. باوکی کۆچی دوایی کرد و ناچار دەرسە ناتەواوەکانی بردە لای مامۆستایانی‌تر و چەند جاریش وەکوو گوێگر، لە کۆڕی دەرسی مەلا عەبدولعەزیمی موجتەهیددا دانیشت؛ کە «*تفسیر بیضاوی*» و «*جمع‌الجوامع*»ی دەرس دەگوتەوە. ساڵی دواتر (زستانی ١٣٢١) لە لایەن مامۆستاکانیەوە ئیجازەی وەرگرت.

شیاوی باسە ئیجازەنامەکەی، زانایانی وەک: مەولانا موحەممەد سادقی مینبەری نیەری، مەولانا مەحموودی موفتی، مەلا موحەممەدی مودەڕڕیسی گورجی، مەلا عەبدولعەزیمی موجتەهید و ئایەتوڵا مەردۆخ، شادەیان لەسەر نووسیوە و بۆیان مۆر کردووە.

هەر لەم سەروبەندانەدا ژنی خواست و بۆ دۆزینەوەی کارێکی شیاو، چوو بۆ تاران و دوای ئاشنا بوون لەگەڵ دوکتور مەحموودی ئەفشار، جێگری وەزیری فەرهەنگ (پەروەردە) و خۆشەویستی نواندنێکی زۆر لە لایەن ئەو زانا بەناوبانگەوە، ڕەشەمەی ساڵی ١٣٢٣ (١٩٤٥ز.) بە ناوی مامۆستای دواناوەندی شاری سنە، لەو مەزرینگەیەدا دامەزرا.

لە کتێبی «*خاطرات و یادداشت‌های من*»دا، باسی مووچەی لە سەرەتای دامەزرانییەوە دەکا و لەو بارەوە بیرەوەرییەک دەگێڕێتەوە؛ دەڵێ:

«بە بۆنەی دەسکورتی وەزارەتی پەروەردە لەو سەردەمانەدا، مانگێ ٥٥ تمەنیان بۆ بڕیار دام! کە بۆ ئەو کاتەش پارەیەکی زۆر کەم بوو و بەشی هیچی نەدەکرد. شیعرێکم گوت و بۆ دوکتور ئەفشارم نارد، کە دوو بەیتی سەرەتاکەی ئەمەیە:

کسی کو چو من بار محنت کشد — بە ناحق ز فرهنگ منت کشد؟

پی مبلغ نحس پنجاه و پنج — شب و روز رنج و مشقت کشد؟

**واتا**: کوا کەسێکی وەک من مەینەتکێش، بە ناڕەوا منەتی پەروەردە بکێشی؟ بۆ پارەی قۆشەی ٥٥ تمەن، شەو و ڕۆژ سەخڵەت و ئازار ببینێ؟

دوکتور ئەفشاریش بە شیعرێکی حافیزی شیرازی جوابی دامەوە:

صبا جوابی از من ببر ز روی کرم — بدان چکامه که آوردی از خجسته دبیر

نمودنم آنچه توانستمی و لی افسوس — اگــر موافــق تــدبیر مــن نــشد تقــدیر

نـصیحتی کُنمـت از زبـان حـافظ مـن — «هر آنچه ناصح مشفق بگو یدت بپذیر»

«چو قسمت از لی بی حضور ما کرد ند — گر اندکی نه به وفق رضاست خُرده مگیـر»

**واتا**: ئەی بای شەماڵ! وەرە و کەرەمکە و جوابێک لە لایەن منەوە ببە بۆ ئەو مامۆستا ڕێزدارە و پێ بێـژە: ئەوی توانیم، کردم؛ بەڵام چ دەکـرێ ئەگـەر چـارەنووس وەکـوو ڕاوێـژ نایەتـەوە؟ بـا لـە زبـانی حـافیزەوە مۆچیارییەکت بکەم؛ بەڵام ئەوی مۆچیاریکاری دڵسۆز دەیڵێ، بیبیسە! سا کە لە بەشبەشـێنی ئەزەلـدا، ڕا و ڕەزای ئێمەیان نەپرسی و بۆخۆیان کردیان هەرچی کردیان، ئێستا ئەگەر هێندێک بەدڵمان نەبوو، نەبوو!

هەرچۆنێک بێ، ماوەی ٨ ساڵ بەم جـۆرە کـاری کـرد؛ تـا سـەرەنجام ساڵـی ١٣٣١، پـاش وەرگـرتنی لیسانس، بە شێوەی فەرمی دایانمەزراند و تا ساڵی ١٣٥٧، واتا ٣٤ ساڵ، بە دڵ و گیان بۆ پەرەدان بە زانست و زانیاری، بەتایبەت لە نێو لاواندا، حەولیدا. زۆر جاران کـاری هاسـانتـر و نـانوئاودارتریـان پـێ پێـشنیار دەکرد، بەڵام ئەو هەرگیز دەرس و کەلاسەکەی بە هیچێک نەگۆڕاوە.

لەو هەموو ساڵانەدا، نموونەی نیشاندەری ئەوپەڕی خـۆ بـەخت کـردن، بـە بـێ چـاوەڕوانی و هـەروەها خاکەساری و نەوسکوژی کەموێنە، زۆرە. بۆ وێنە ئەو کاتە کە ئامێری کۆپیکردن نەبوو، شەوانی ئـەزموون، تا کازێوەی بەیان نەدەنووست؛ دوو پەڕە کاربونی دادەنا و بۆ یەکـەیەکـەی قوتابییـان، لاپـەڕەی ئـەزموونی دەنووسینەوە؛ تا هەموو قوتابییەک بەرگێکی پرسیارەکانی لەبەردەسـتدا هـەبی و پێویـست نـەکا مامۆسـتا چاودێرەکان بە نۆرە بیخوێننەوە و ئەگەر یەکیان بە هەڵـە خوێندیـەوە، بـەخۆدا بـشکێتەوە و قوتابییـانیش تووشی هەڵە ببن.

ئەڵبەت مامۆستایی بەشێک لە کار و ئـەرکی سەرشـانی ئـەو بـوو. نووسـینی پـەراوێز لەسـەر بەرهەمـە بایەخدارەکانی زانایانی پێشوو، وەرگێڕانی کتێـب و نووسـراوەی جـێنیـازی فـەقێیان، نووسـینی کتـێبی شەرعییات بۆ قوتابییان، لە پۆلی سەرەتاییەوە تا دواناوەندی و لـە هـەموو گرنگتـر، کۆکردنـەوە و نووسـینی ژینامـە و بەسـەرهاتی عارفـان، زانایـان، وێژەوانـان و شـاعیرانی کـورد و هـەروەها مێـژووی حاکمـان و ماڵەمیرانیان، لە سەرەتای مێژووی ئیسلامییەوە تا ئەم دواییانە بوو.

دیارە لە سەردەمی دوای جوانەمەرگ بوونی کۆماری مەهاباد و کارەساتی لە سێدارەدانی پێـشەوا قـازی، دەست بۆ کاری وا بردن، جگە لە ئەرگ و زەحمەتی لەڕادە بەدەر، لە ئێراندا ــ کە نـاوی کـورد و کوردسـتان بردن تاوانێکی گەورە بوو ــ چەند بوێری و لەخۆ بردوویی دەوێ.

مێژووی ناودارانی کورد، لە ڕاستیدا بەڵگەیەکی جێ متمانە و سەلماو بۆ ناسنامەی کوردە و دەردەخا کـە زۆربەیەک لەو عارف و زانا و وێژەوان و شاعیر و میرانە وا هەموو وڵات و میللەتـە ئیـسلامییەکان شـانازییان پێوە دەکەن، لە ڕاستیدا کورد بوون.



با باسی میژووی ناودارانی کورد و کەسایەتی نووسەرەکەی، بێلین بۆ کەسێکیتر؛ کە نووسەری ئەم وتارە، خۆی کوڕی ئەو ڕەوانشادەیە و بۆی نابێ زۆری لێ بکۆڵێتەوە.

بەکورتی، مامۆستا بابەشێخ دوای کارکەناری، بەماڵەوە چوو بۆ تاران و لێبڕا میژووەکەی چاپ بکا و بە پشتیوانی سەروماڵی مامۆستا هەژاری هێژا، دوو بەرگیشی لێ چاپ کرد؛ بەڵام ئەگەرچی تەمەنێکی زۆریشی نەبوو، نەخۆش‌کەوت، دوای ماوەیەک لە بەرەبەیانی پێنج‌شەمبە ٢٩ی بەفرانباری ساڵی ١٣٦٧ ک. هـ. (١٩٨٩ ز.) کتێبی ژیانی بەسرا و ڕووی کردە بارەگای خودا.

**بەرهەمەکانی مامۆستا بابەشێخ:**

١. *چهارصد مسألەی حساب و هندسه*

٢. *کتاب‌الصُّغری*، لە مەنتیقدا

٣. *فرهنگ نوزاد*، سێ بەرگ

٤. *قارورةالصّحو*، شەرحێکی عەرەبییە لەسەر هۆنراوەی «باکورةُالنحو»ی بابی

٥. *فرهنگ روحانی*، وەرگێڕاوەی «المُنجد»، (ناتەواو)

٦. *دانش سرایش*، لەمەڕ عەرووز و قافیەوە

٧. *مرآةُالاسامی*، شەرحێکی عەرەبییە لە کتێبی «وضع»ی مەلا ئەبووبەکری پیرڕوستەمی

٨. *الیمّ الغیث لحدایِق التوریث*، دەق و شەرحی بە شیعر و پەخشان لەمەڕ «فرایض فقهی» بە عەرەبی

٩. *ارمغان گرامی*، شەریعەتی ئیسلام (ناتەواو)

١٠. *مَآدبُ القوم بِمَآربِ الصّوم*، دەق و شەرحی بە شیعر و پەخشانی عەرەبی

١١. *اَحْسَنُ الاتحاف لِکتابِ الاعتِکاف*، دەق و شەرحی بە شیعر و پەخشانی عەرەبی

١٢. *فَتاوی الاکراد*

١٣. *ابهی المِصباح لِبَیت النّکاح*، (ناتەواو)

١٤. *بدیع روحانی*، لە بەدیعدا

١٥. *اَسْهَلُ الوصول الی نظمِ لُبّ الاصول*، دەق و شەرحی بە شیعر و پەخشان لە «اصول‌الفقه»دا بە عەرەبی

١٦. *دریای گوهر*، ٣ بەرگ

١٧. *شرح سبعەی معلّقه*

١٨. *شرح لامیة العرب و لامیة العجم و لامیة الکرد و قصاید بَانَتْ سُعاد و بُرده و قصیدەی جیمیەی بدیع‌الزمانی و قصیدەی طنطرانیّه*، لە بەرگێکدا

١٩. *شاهراه رهایی*، بە فارسی

٢٠. *شیوەی مسلمانی*، بە فارسی

٢١. *دورەی تعلیمات دینی*، بۆ قوتابییانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی

٢٢. *آ ینەی درستکاری، در برابر آ یین زشتکاری*

٢٣. *مناظره با آثار و تألیفات آ یت‌الله مردوخ*

٢٤. *صفوت روحانی در مناقب شیخ عبدالقادر گیلانی*، وەرگێڕاو لە عەرەبییەوە بۆ فارسی

٢٥. *بدیع و قافیەی شیوا*، بۆ قوتابییانی دواناوەندی

٢٦. *تاریخ مشاهیر کرد*، ٣ بەرگ (ناتەواو)

٢٧. *مناسک حج*، بە فارسی

٢٨. *خاطرات و یادداشتهای من*

٢٩. *دیوان اشعار*

خوا لێ خۆشبوو شیوا لە نووسینی پەخشانی فارسیدا، شێوازێکی تایبەتی هەبوو. ڕەوان و بێ گرێوگۆڵ دەینووسی و بە وشەیەکی کەم، مەبەستەکەی پوخت و پاراو، ڕادەگەیاند. لە شیعریشدا دەستێکی باڵای هەبوو؛ بەتایبەت غەزەلی جوان و ڕازاوەی زۆری هەن. ئەوا چەند نموونە لە شیعر و پەخشانی شیوا:

«... زمستان سال ٢٣ شمسی فرا رسید؛ هوا به شدت سرد و برفی بود و من مُدام به فکر کار و مشغلتی بودم. روزی دو نفر از دوستانم ـ که اتفاقاً آنها هم جویای کار بودند ـ به دیدنم آمدند. از هر دری سخنی گفتیم و در آخر تصمیم گرفتیم که به تهران برویم. البته قبل از هر چیز لازم بود هرکدام لباس مناسبی برای این سفر تهیه کنیم و گذشته از آن خرج سفر لازم داشتیم. آنها رفتند که برای خود پول و لباس دست‌وپا کنند و من هم به یکی ـ دو جا مراجعت کردم. متأسفانه این هیأت سه‌نفره بعد از یک‌هفته، روی هم سیصد تومان پول داشتیم... نزدیک غروب در حوالی طاق بستان پیاده‌مان کردند. آن شب در یک بیغوله‌ای که به نام مسافرخانه بود بیتوته کردیم و فردا صبح به کرماشان رفتیم. پس از یک ـ دو روزی توقف و دیدار دوستان و خویشانی که آنجا داشتیم و تهیه‌ی مبلغی دیگر وجه، شبانه به طرف تهران راه افتادیم؛ طلوع صبح به مقصد رسیدیم. نه جایی بلد بودیم و نه کسی را می‌شناختیم. هوا بسیار سرد بود و ما سرپناهی می‌خواستیم که از رنج سرما و خستگی سفر بیاساییم. یکی از همسفران، ما را به مسافرخانه‌ای راهنمایی کرد. آنجا منزل گرفتیم و یکی ـ دو ساعت استراحت کردیم تا خود را برای گشت و گذار در شهری که به هوای آن تحمل مشقت کرده بودیم، آماده سازیم...».

**لە وەڵامی داوەتی دۆستێکیدا بۆ حەج:**

| | |
|---|---|
| دو ست دارم چو تو من نیز به آنجا آ یم | قدم از سر کنم و جانب بطحا آیم |
| بعد یک عُمر گُنهکاری و نافرمانی | به امید کرم ایزد یکتا آیم |
| اندر آن بادیەی عشق به شوق در دو ست | قدم سعی ز سر ساخته، پویا آیم |

همچـو مجنـون پـی لـیلای مُـراد ار آیـم
مــن ســودازده، دیوانــه و شــیدا آیــم

دعــوت عــام «و لله علــیالنــاس الحــج»
انــدر آن ســاحت فرخنــده پــذیرا آیــم

مَهْــبَط وحــی بــه مژگــان ارادت روبــم
بــر در خانــهی حــق رفتگرآســا آیــم

سُــرمهی دیــده کــنم گــرد ره یثــرت را
تــا بــدان صــومعه بــا دیــدهی بینــا آیــم

بــا رُخ زرد و کتــاب سـیه و مــوی سـپید
جانــب صــاحب آن قُبــهی خــضرا آیــم

لیـک مـن یـک عمـل خیـر نـدارم کانجـا
بــه امیــد کَــرَم و نُــزل مُهنّــا آیــم

مــن تبهکــارم و وامانــدهی درگــاه خــدا
شــرم دارم کــه بــدانجا بــه تمنــا آیــم

یار من! صاحب آن خا نه تو را یاور باد
تــو بــرو، مــن نتــوانم کــه بــدانجا آیــم

شـاید ار عمـر وفـا کـرد و خـدا یـارم بـود
اگــر امــروز نــشد نوبــت فــردا آیــم

آیم آنجا که کنم شعر روان هد یهی دو ست
تا در ا ین شیوه به حق شاعر «شیوا» آ یم

شـاید از جانـب ایـزد بـه جـوابی زیـنسـان:
«بنــدهام توبــه قبــول اســت» منــادای آیــم

* * *

دیــشب بــه یــاد عهــد جــوانی گریــستم
پیــری بــه خــواب کــرده نهــانی گریــستم

با ا شک خون ز حسرت ا ین باغ ز ند گی
بــــر برگهــــای زرد خزانــــی گریــــستم

بـر مـوی نـو سـپید شـده اشـک ریختـم
بــــر قامــــت نژنــــد کمــــانی گریــــستم

نادیــده نقــش خنــده بــه لبهــای زنــدگی
جانــا چنــان کــه افتــد و دانــی گریــستم

خواندم یکدو برگ ز طومار سرگذ شت
بـر عُمـر خـویش و هـستی فـانی گریـستم

دیـدم کـه نیـست توشـه و نبـود ذخیـرهای
بــــر حــــال زار مــــوطن ثــــانی گریــــستم

بر ا ین حیات فانی بیبهره کان گذ شت
ناگــــاه همچــــو بــــرق یمــــانی گریــــستم

عکــــسی ز روزگــــار جــــوانیم یــــافتم
بــا خــون بــر آن یگانــه نــشانی گریــستم

کـردم نظـاره عهـد شـباب و زمـان شَـیب
بــر ایــن حیــات تلــخ جهــانی گریــستم

دی همچو خود خزان زده «شیوا» کبوتری
دیــدم شکــسته خــاطر و آنــی گریــستم

له پرسەی مامۆستا بابەشێخیدا، کە ڕۆژی ٥ی ڕێبەندانی ١٣٦٧ ک. ھ . (١٩٨٩ ز.) لە تاراندا بەڕێوە چوو، مامۆستا هەژار ئەم وتارەی خوێندەوە:

«وەک دەبینم ئێمە ئەمڕۆ لەم شوێنەدا کۆ بووینەوە، داخلەدڵین؛ ئازیەتبارین؛ کە عەزیزێکی زۆر بەڕێز، لـە دنیایە، بەڕواڵەت، کۆچی کردووە. خۆ ئەگـەر تۆزێـک بـەوردی سـەرنج بـدەین، کـەمێ ژیرانـە و پیرانـەی تێگەییشتوو بیر لە حاڵی خۆمان وەکەین، تێدەگەین کە بەشی زۆرمان، بە ناشکوری خودا نەبێ، هەرچەندە بە ڕواڵەت زیندووین، بەڵام سەدهەزار خۆزگەمان بە مردوان کا!

بەڵێ ئێمە لەم کۆڕ و کۆبوونەوەدا، شین و گریانێکمان دەوێ؛ بەڵام بۆ کێ؟ هەر بۆ خۆمان؛ بۆ کولۆڵی و نەگبەتیمان. نەک شیوەنمان بۆ کەسێک بێ وەک «بابەشێخ»، کە هەرگیز مردن و نەمان سەری نادا و تا هەتایە ناوی لە سەر پەڕی مێژوو، وێڕای هەموو ناودارانی بەرزی تەئریخ، بە شانازی خۆ دەنوێنێ.

ئێمەی کورد بەر لە ئیسلامەتی، هەرچێکمان بووبێ دیار نییە. بەڵام ئەگەر ئاوڕێکی، تەنانەت نیوە ئاوڕیش وەسەر خۆمان بدەینەوە، شتی یەکجار سەیر دەبینین. لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامەوە، بە هەزاران زانای لەزەبر و بلیمەت، لە شەریعەت، لە تەریقەت، لە شیعر و ئەدەبیات و مێژوو، لە هەرجۆرە هونەرێکی بابەتی زانیاری زەمان، لەم گەلی کوردە هەڵکەوتوون، کە زوربەیان مایەی شانازی گەلانی هاوسامان بوون؛ کە ئێمەی نەگبەت تا ئێستا، وەک لە گوێی گادا نووستبین، هەر ئاگا و خەبەرمان نەبووە!

گوناهی ئەم بێ خەبەرییە لە سەر کێیە؟ دیارە هەر لەسەر خۆمانە. ئێمە بەپێی توانای خۆمان، بۆ فەرهەنگی نەتەوەمان ماندوو نەبووین. بەڵام لە بیریشمان نەچێ، ماڵم حەقە، ئۆباڵی ئەم بێ ئاگاییە، تا ئەندازەیەکی بەرچاو، لە ئەستۆی ئەم گش زانایانەی بەچکە کوردە.

مەسەل دەڵێ: «تا ماڵ پێویستی پێ هەبێ، نابێ بدرێ بە مزگەوت»؛ کەچی هونەرمەندانی کورد، زانا و مێژوونووسانی کورد، لە درێژی و پانی مێژوودا و بگرە ئێستاش، ئەم پەندەیان بەراوەژوو کردۆتەوە و چی لەم مەسەلەدا هەیە، لە بیر خۆیان بردۆتەوە.

لە درێژایی تاریخی ئیسلامەتیدا، لە ڕابوردوودا تا ئێستاش، هەر کوردێکی هێژا و بەرکەتی هەڵکەوت، بە بێ ئەوە خۆی لەبیر بێ، هەرچی بوویە، داویە بە مزگەوت و تەکیە و ئەگەر پاشەکەوتێکی دیکەشی بووبێ لە سامانی هونەرییەوە و لە سەرمایەی بەختەوەری فەرهەنگیمان، گشتی دراوە بە گەلەکانی هاوسامان. خۆمان دەملەپووش و قەتیس ماوینەوە، لە دەرگای دەر و دەراوسێ، سواڵی ماڵی خۆمان دەکەین!

تۆ بڕوانە ئەم هەموو مێژوو نووسانەی تۆرەمەی کورد، لە ڕۆژگاری کەونارادا و لە دەورانی نیوەکەون و ئاماڵ تازە و نیمداشتیدا، شوێنەواری پڕ لە پیتیان، کتێبخانەی هەندەرانیان پێ نەخشاوە و بوونەتە مایەی شانازی گەلانیتر، لەو هەموانە ـ جگە لە تاک و تەرایان ـ دەربارەی وڵاتی خۆیان، گەلی خۆیان، لە فەنای بێدەنگا ژیاون؛ هەر متەقیشیان نەکردووە.

لەم هەزار و ئەوەندە سەتساڵانەدا، چەند جار قەتڵوعام کراوین، لە زێدی کەونارای خۆمان ڕاونراوین، دەرکراوین، چەند سەتجار تالان کراوین؛ نووسەر و هونەرمەندانمان، کەسیان نووکی قەڵەمەکەی بەرەو نووسینی دەردی گەل نەچەرخاوە. ڕەنگە هەر بە دەم گوتبێتیان «ماڵ سووتاو و ماڵ بریاو بە کۆی زوخاڵ بن»! تەنانەت بەڵای عاسمانیش وەکوو لافاو، بەفر و تەرزە، کولله و پەتا و بوومەلەرزەش لە کوردستاندا ڕوویدابێ و ماڵی کوردی پێ خرا بێ، بە هیچ ئاوا نەنووسراوە!

بە ڕەحمەت بێ شەریعەتی، لە نامیلکەی عیرفان و بەرانبەریدا، دەربارەی مەولانای ڕۆمی فەرموویەتی:

«پەسنی مەولەوی چەند بێژی، هێشتا کەمە. بەڵام ئافەرین لە چـی بکـەم؟ مەولانایـەک لـە بـەلخ ، لـە قوونییە، یان لە وڵاتێکی‌تر ژیاوە؛ خۆی وا لە ناو لێفەی ئەستووری عیرفان پێچـاوە، بـە کوشـت و کوشـتاری مەغول، بە شاڵاوی خاچپەرستان نەحەسیاوە. دەی‌سا من ناڵێم، تۆ بـڵێ! بـوون و نـەبوونی ئـەو پیـاوە، بـە بێچارە و هەژاران چی؟ بە بریندار و دەردەداری ئیمانداری موسوڵمان چی؟»

جا کە ئوستاد شەریعەتی تەوس و توانج دە مەولانای ڕۆمی بگرێ، ئێمـە دەگـەڵ ئـەو هـەموو زانایانـەی کورد، کە هیچ هەستیان بە تاوتوێی تیراویی، بە ئێش و ژانی خزمان و هاوماڵانی خۆیان نەکرد و خۆیان لـێ بوارد، دەبێ چۆن بین؟ دەبێ چ بڵەین؟

جا ئەمانە وا هاتن و وا ڕۆیشتن؛ خوایان لەگەڵ. بەڵام ئێستاش زۆری وامان لە ناودایە کە دەستی قەڵەمێ دەگرێ و نووسراوی دەخوێندرێتەوە. هەزارانە ڕوو دەکەمە ئەو دەستەیە و لەبەریان دەپاڕێمـەوە: خوشـکی کوردم! برای کوردم! تۆی کورد لە زێدی کورد ژیاوی. نان و ئاوی ئەم گەلە بۆتە بژیوت. لە فێرگەدا هەر بـە یارمەتی ئەو ماوی. تۆ لە سایەی کوردەواریدا بوویتە کەس. دەیـسا تـۆش لـە نووسـینتدا ئـاوڕێکی وەسـەر بدەوە. لە خۆشیان هیچ؛ کە هەرگیز خۆشی نەدیوە. هیچ نەبێ بە نووکی قەڵەم، لە دەردەکانی بەشدار بـە! هەرچی بەڵا و دەردیسەری بە سەری دێ، تۆ بیخە سەرڕووی کاغەزێک؛ با وەچـە و بـەرەی دواڕۆژی ئـەم میللەتە نەگبەتبارە، ڕابردووی باب و کاڵی خۆی لەبیر نەکا و جار-جار پەندی لێ وەرگرێ.

خوشک و برای هونەرمەندم! هەر وەک گەرەکتە فەرهەنگی دراوسێکان دەوڵـەمەند کـەی، لـە هەشـت مشتێکی لێ لادە و بیدە بە هاوماڵانی خۆت؛ با بە بێ‌ئەمەگ دەرنەچی.

خوزگە بە خوزگەی خودا با، زانا و هونەرمەندانی کورد، لە ڕابردووش و ئێستاشا، بزگوڕێکیان لە مامۆستای بەرز و نەمر، بابەشێخی ڕۆحانی خۆمان داورێبا. ئەم کارەی بابەشێخ کـردی، دەربـارەی مێـژووی نـاوداران، دەکرێ بڵێم بەو نەبا بە کەس نەدەکرا. هەر ئەو توانی پەڵەی هەڵەی سەر شانی زانایانی کوردی لـە کـورد خۆ بوێر، بسڕێتەوە و ئابڕووی ئێمەی دەڵەمە و نەبەگەی ئەمڕۆش بکڕێتەوە.

بەداخەوە منی هەژار بەختم نەیهێنا زۆر ساڵان لە فەیزی مامۆستای نەمر بەهرەوەر بم. تەنیا لـەم دوایـی دواییانە، بەهەڵکەوت ڕێگەم کەوتە لای ئینتیشاراتی سرووش. لـە سرووشـەوە دەگـەڵ ماجیـدی ڕۆحـانی بوومە ئاشنا. لە سایەی کاک ماجیدەوە توانیم مامۆستا زیارەت‌کەم و بە دیتنی بەهرەوەر بم.

هەر لە هەوەڵ دیدارم بۆ ماڵی ئوستاد، فیکرم سەرمەقولاتێکی دا! ئاخر منێکی هـەژاری لـە هـەموو دنیـا دەربەدەر، لە ناو هەموو چین و بەرەیەک لە کورد و عەرەب و تورک و فارسدا ژیاوم. بیرم وابوو کـە ئاکـاری خواپەسند و ڕەوشی جوان و پاک و ڕند، لە ناو مەردمدا نەماوە و لە حەو کێوان ئاوا بووە؛ دەمگوت پێـشووش هەر وا بووە. بەڵام نەخێر، حیسابی من گشتی بەراوەژوو دەرچوو. ئەم خانەوادە نەجیبە، ژن و پیاوی، پـیر و لاوی، گشت لە گشتی، خاوەنی ئەخلاقی بەرزی بێ نموونەن. لەو کەسانەی کە من هـەتا ئێـستا دیـومن،

ئەمانە زۆر جیاوازن. هەیاران! ئەم ئاكارانە لەم خێزانە دیارە سەرچاوەی لەو باوە و لـەو دایكـەوە هەڵـگیراوە. زانیم كە كەوتوومە شوێنێک فیز و خۆ بە زل زانین و گاڵتە و گەپ بە هەژار كردن، شوێنی نییە. هـەر بۆیـە بە ڕاشكاوی پرسیارم كرد: مامۆستا تۆ مەشغوولی چیت؟ لە مێـژووی نـاودارانی كـورد، چەنـد ڕووپـەڕێكی نیشاندام. سەیرم كرد؛ ئەم كابرایە لە فارسیدا نەهەنگە؛ لـە زمـانی عارەبیـدا دەریایەكـە؛ لـە زوانی كـوردی خۆماندا بێ هاوتایە ... هەر ئەوەندەم بۆ كرا بڵێم: كارەكەت یەكجار بەنرخە؛ خۆزگا بڵاو كراباوە. بە بێ ئـەوە هەست بكەم كە پێی خۆش بووە، یان غورووریێكی تووش بووە، بەوپەڕی خۆبـەكـەمزانی فـەرمووی: نـەخێر شتێ نییە؛ بەڵام چ بكەین هەر ئەونەم لە دەس هاتگە، كردوومە. قسەی ئەو شاعیرە ڕووسەم بـیر كەوتـەوە كە وتوویە: «بۆشكەی پڕ دەنگی لێ نایە. بۆشكەی والا دەنگی لە دنیا بڵاوە».

خوا شوكور بڕیار درا كە ئەم ئەسەرە چاپ بكرێ.[1] بۆ یەكەم جار لە ژیانی پـڕ كـڵۆڵیمدا بـەختی كـەچم ڕاستی هێنا كە ئیدارەی پەژووهیشی ئیرانزەمین، بە خێری خۆی، منی هـەژاری نێونـووس كـرد بـەر لـە چاپ بیخوێنمەوە. مەسەل دەڵێ: «ئەگەر خوا دای، پاڵەوەدە!» ئای لەو مزگێنییە!

كتێبم هاتە بەردەستان. تازەبەتازە تێگەییم كە مامۆستای نووسەری ئەو ڕووپەڕانە چەی كـردووە و پایـەی زانستی چەند بەرزە! تازەبەتازە تێگەییم كە ئەم پیاوە چەند حەول و تەقالای داوە و چەند لـە ڕێیـدا مانـدوو بووە! پیاوێكی بێبونیە و لاواز، چل و چەند ساڵ خزابێتەماڵێكەوە، سەر لە سەر كتێب هەڵنەگرێ، هەر لێـرە متالا بكا و هەر لەوێوە قەڵەم بەرێتە سەر كاغەز و تۆمار بكا. بۆ نموونە ئەمڕۆ كێ هەیـە بتوانـێ هـەزاران پـەڕ وەک: لوغەتنامەی دیهخودا، الكاملی ئیبنوئەسـیر، ئەعلامەكـەی زركلـی، مێـژووی مەسـعوودی و بولفیـدا، موعجەمولبولدانی یاقووت و سەتان كتێب وناملیكەی گەورەو پچـووک، لـە عـەرەبی و فارسـی و كوردیـدا وەخوێنێ و هەركامێكیان بپشكنێ، لە سووچی هەر ڕووپەڕێكـدا تووشـی نـاوی كوردێـک ببـێ، دەسـبەجێ بیقۆزێتەوە و بێ هەڵە بیگوێزێتەوە و ئەم چەند جڵدەی لێ پێکبێنـێ؟ سـەرەڕای ئەمـەش كلیلـی بەڵـگە و سەرچاوە دینەوە، بداتە دەستی لاوانی دوارۆژی كورد، كە هەركەس ویـستی دەربـارەی كـوردێكی نـاوداری مێژوو، بتۆژێتەوە و بنووسێ، ناچار نەبێ كون و كاژێڕی كتێبان لە كتێبخانان پەیدا بكا و بە خۆڕایی ماندوو ببێ.

من لەم پێداچوونەوەمـدا بـیرم لـەوە دەكـردەوە كـە خوایـە ئـەم پـیرەمێـردە ممبارەكـە، لـە ڕێگـەی زیندووكردنەوەی ڕابردووەكانی گەلەكەی، دەبێ چەند ڕەنجی كێشابێ؟ خوایە دەبێ چەند دڵۆپی خـوێنی گەشی دڵی تەنگی، تێكەڵ بە مەرەكەف بووبێ و ڕژابێتە سەر ئەم كتێبـە بەنرخـە؟ چـۆن توانیویـە و چـۆن

---

[1]. ئەوی ڕاست بێ، پێشتر، لە سەرەتای دامەزرانی جمهووری ئیسلامیدا، كە باسی بەرامبـەری گـەلان گـەرم بـوو، بـۆ وەرگرتنی ئیجازەی چاپی ئەم كتێبە زۆرم حەول دا؛ هەر وەرامیشیان نەدەدامەوە. بەڵام كە مامۆستا هەژار پێـی زانی و زانی چ باسە، بە هەموو هێز و توانییەوە پشتی گرت و بڕیاری لەچاپدانی ساند و بۆخۆشی نیشتە سـەری، تـا لـە چـاپ دەرنەهات، دەستی لێ بەرنەدا. ماجد

دەتوانێ ئەم هەموو ئەرکە دەربەرێ؟! دیسان لە دڵی خۆما دەمگوت: ئـەم پیـاوە ئەویندارێکـە، گراویەکـەی ژینەوەی فەرهەنگی کوردە. ئەویندارانی بەڕاستیش، لە ڕای گەیشتن بە ئاوات، لە هیچ خەتەرێ کۆ ناکەن.

من بە بیری هەژارانەم لە مردوو زیندوو کردنەوە، مامۆستای نەمر (بابەشێخ)، لـە مەسیحیـشی تێپەڕانـد. ئەگەر مەسیح لازارێکی خستەوە ژین، ئەو میللەتێکی لە مردنی بێ فەرهەنگی ڕزگار کرد.

دروودی خوا لە گیانی پاک و پیرۆززی.

* * *

پاش لە دنیا چوونی مامۆستا، زۆرێک لە شاعیران و نووسەرانی دۆست و ناسیاوی، شیعر و پەخشانی بەرز و ڕازاوەیان لە شینیدا نووسی و بە ناردنی ڕوونووسێکی بۆ من، منەتباریان کردم. دیارە هەموو ئەوانە تەنیا لـە یادنامەیەکدا جێیان دەبێتەوە و لێرەدا ـ بە داوای لێبووردنـەوە ـ دوو شـیعری کـوردی و فارسـی خـوا لـێ خۆشبوان، مامۆستا حەسەنی سەلاح «سۆران» و مامۆستا ئیبراهیمی ستوودە دێنین:

مگـر ز جـام غـم و رنـج و جامـەی آلام / سـپهر سـفلەنـوازم نـداد جامـە و جـام
بهار عمر به سر شد، ولیک بی‌حاصل / خـزان عُمـر درآمـد، ولیـک بـا آلام
گذشت شور شباب و رسید رخوت شَیب / نه زین گرفتم عبرت، نه زان بد یدم کام
دمـی فـراز شـباب و گهـی نـشیب مـشیب / از ایـن فـراز و نـشیبم چـه بهـره جـز اوهـام
دریـغ و درد لگـدمال شـد نهـال شـباب / بـه سُـمّ اشـهب بـام از قفـای ادهـم شـام
رسـید بـر لـب بـام آفتـاب عمـر عزیـز / هـلا وفـا نکنـد آفتـاب بـر لـب بـام
گـرفتم آنکـه دهنـدم چـو خـضر آب بقـا / جـز آتـش غـم هجـران چـه یـابم از ایـام
ز خضر پرس که جز مرگ دوستان عزیز / چه حاصل آمدت از طول عمر بی‌فرجام
به زهر مرگ عزیزان در این سپنج سرای / هـزار بـار مـرا کـشت دهـر خـون‌آشـام
بسا غما که ز اعصاب دل گُسست توان / بسا غما که ز اعصاب جان شکست قوام
ولیک این غم آخر، که آخرین غم باد / چنـان ز پـای فکنـدم کـه طفـل را سرسـام
ز مـا گرفـت فلـک اوسـتاد «شـیوا» را / کـه شیوەای دگـر افکنـد در مَقـال و مقـام
مهینـه شـاعر آزادە کـز بلنـدی طبـع / در آسـتان کمـالش عطـارد اسـت غـلام
اگـر چـه دور زمـان گوشـمال مـی‌دادش / بــه سـان سـنبله زیـر خـراس ازرق‌فـام
ولـی ز همـت والا بـه نـیم جـو نگرفـت / حـصید کاهکـشان را بـه مـزرع بهـرام
مدام خون جگر خورد و رخ گشاد چو گل / دمـی چـو خـار نـزد چنـگ بـر ردای لئـام
نـه دام نـام ببـردش ز ره، نـه دانـەی نـان / کـه نیـست طـایر قدسـی اسـیر دانـه و دام
ز چاه جاه مصون داشت پای یوسف نفس / چنـین کننـد عزیـزان مـصر عـزت و نـام

آیـا فرشـته سـیر، قبلـه‌گـاه روحـانی! | که آسمان سر پر خاش داشت با تو مدام
شـدی کـه گـنج کمـال تـو را بیابـد بـاب؟ | شـدی کـه بـدر جمـال تـو را ببینـد مـام؟
تو بدر بودی و بود ند دیگران چو هلال | خـسوف روی نیـارد مگـر بـه بـدر تمـام
دمـی رکـاب مـرادت نـداد ابلـق دهـر | بدان گُنه که زدی بر کمیت نفس لگام
هر آن که تیر صفت راست‌قامتی آموخت | هماره خون جگر می‌خورد به سان حُسام
بـه جـرم جـوهر ذاتـی ز کجـرویّ فلـك | کتـاره زجـر کـشد در سـیاهچال نیـام
رثـای پختـه‌گـری چـون تـو بـالالی چـشم | چه سان به رشته‌ی نظم آورد «ستوده‌ی» خام
مگـر فـرزدق و حـسّان و بوبـصیر و زُهیـر | مگـر سـنائی و خاقـانی و ظهیـر و هُمـام
سـر از ثـری بـه درآرنـد و خامـه برگیرنـد | سـزای تـو بـه رثـایی رسـا کننـد اقـدام
بـدین بـضاعت مُجـات بـا امیـد قبـول | صـلا دهـیم دعـایی بـه قـصد حُسن ختـام
اگرچـه دهـر سـیه‌کاسـه‌ی تُهـی کیـسه | سـرای سرسـریت تیـره کـرد از اسـقام
تـو را سـرای ابـد دلپـذیر و روشـن بـاد | بـه نـور پـاك پیمبـر علیـه الـفُ سـلام
هـزار چارصـد و نُـه زهجـرت نبـوی | هـزار نغمـه‌ی شـیوا بـه خلـد کـرد مقـام

* * *

که مەردۆخی زەمانم چوو، دڵم غەرقی غەمـە ئەمـشەو
که خۆری خاوەر ئاوابوو، سەما یەکـسەر تەمـە ئەمـشەو
کەل و ئاسۆ بە کوڵ دەگـرین، دەڕێـژن شـەونمی ئەسـرین
شەپۆلی ئەشکی «ئاویدەر» وەکـوو جۆگـە و چەمـە ئەمـشەو
سەرم وەک کێوی شاهۆیە لە دەوری هەوری غەم کۆیـە
تەواوی مەینەتی دنیا لە سـینەی مـن جەمـە ئەمـشەو
تەمی شەو چەشنی دیجوورە، سـنە بـێ‌نـوورە، خـاپوورە
شەوستانی هونەر چۆڵـە، پەپوولـە بـێ‌شـەمە ئەمـشەو
نەسیبی خەڵکی ئەم هەردە، هەموو داخ و خـەم و دەردە
غەمین و مات و ڕەشپۆشن، پەژارەی ئەعزەمە ئەمـشەو
بە مەرگی ئەو دڵم خوێنـە، دەڵـێم ئەشـعاری بـێ‌وێنـە
لە شـینی شـیوەنی شـیوا، شـەپۆڕ و ماتەمـە ئەمـشەو
مەشـاهیری گـەلی کـوردی، بەنێوبانگـە بـە جێـوردی
ئەوەی خەڵکە زل و وردی، چەمەرگێڕی ئەمە ئەمـشەو

کتــێبی کــەنزی دەورانــە، وەکــوو لاڕوو ســی سـۆرانە
جیەی شانازی هەموانە، هــەچی بێــژم کەمــە ئەمــشەو

## شێخ ئەحمەدی نەقشبەندی

شێخ ئەحمەد،کەسناو «نوورەدین»، کوڕی شێخ موحەممەد بەهائەدین و نەوەی قوتبی تەریقەت، شێخ عــەلی حوسامەدین، ساڵی ١٣٠٠ ک. هـ. (١٩٢١ ز.) لە گوندی «گوڵپ»، لە سەر سنووری ئێران و عیراق، هاتە دنیا و لە ژێر چاوەدێری باپیریدا ڕاهات و کاتێ کە پێگەییشت، لاوێکی پارێزکار، میهرەبان و تێگەیشتوو بوو.

شێخ ئەحمەد دوای کۆچی دوایی شێخ حوسامەدین و لە جێ دانیشتنی شێخ موحەممەد بەهائــەدین، بــە فەرمانی ئەو، چووە گوندی «باغەکۆن» و بەڕێوەبردنی خانەقا و پێڕاگەییشتن بە کاروباری مریدانی گرتە ئەستۆ.

لە بارودۆخی نالەباری ئەم دواییانەی عیراقدا، شێخ ئەحمەد دوو جار، بــە ژن و منداڵــەوە، بــاری کــرد بــۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان. یەکەم جار، ساڵی ١٣٥٣ ک. هـ. (١٩٧٥ ز.) کە شەڕفرۆشتنی بەعس لە کوردستاندا دەستیپێکرد و جاری دووهەم، دوای کیمیابارانی هەڵــەبجە بــوو. لــەم دوایــین کــۆچ و بارەیــدا، نەخۆشــی شێرپەنجەی تووش هات و سەرەنجام ساڵی ١٣٦٨ ک. هـ. (١٩٨٩ ز.) لە دنیا دەرچوو.

وەک دەگێڕنەوە، شێخ ئەحمەد لە نێو هاومالانیدا ئەو جیاوازییەی هەبووە کە جیاوازییەکی نێــوان گــەدا و دارا دانەناوە و لە خانەقایدا ـ پێچەوانەی ئەوەی باو بووە ـ چێشتێکیان لێناوە و مریدان و پیاوماقووڵان، یەک شتیان خواردووە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## ئاوات

سەید موحەممەد کامیلی ئیمامی، نازناو «ئاوات»،کوڕی سەید حەکیم، کوڕی ســەید کــەریم، کــوڕی ســەید ڕەحمان، لە بنەماڵەی بەناوبانگی زەمبیلە کە ساڵی ١٢٨٢ ک. هـ. (١٩٠٣ ز.)، لــە زەمبیــل هاتــە دنیــا. نــۆ ساڵان لە خزمەت مەلا مەحموودی مەشهوور بە «مەلا ڕەشە»دا خوێندنی عــەرەبی و فارســی دەســپێکرد. پاش دوو ساڵ لەگەڵ کاکیدا (سەید موحەممەدی نوورانی) چوونە خزمەتی مامیان (حــاجی بابەشــێخ) لــە گوندی «جیمان» و دوو ساڵیش لەوێ و ساڵو نیوێکیش لە «تورجان» لای مەلا ســادقی «واثــق بــالله» بــوون. کاتێ کە مەلا عەولای فەهیمی چوو بۆ زەمبیل، ئەمانیش گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان و تا ئەو مامۆستایە لەوێ بوو، لە خزمەتیدا بوون و خوێندیان. پاش ئەوە، ساڵێک خوێندنیان پەکیکەوت. ســەرەنجام ســەید کامیــل لەگەڵ عەباسی حەقێقی، شاعیری ناوداردا، گەیشتنە خزمەتی مەلا سەید کەریمی مودەڕڕیسی لە گونــدی «باخچە»ی لای مەهاباد.

سەید کامیل لە بیرەوەرییەکانیدا، بە خۆشی یادی ئەو سەردەمە دەکا و هەڵدانی هەستی شاعیرانەی خۆی، زۆرتر لە ودمی هاونشینی و هاودەنگیی مامۆستا حەقێقی دەزانی.

ساڵی ١٣٠٩ بابی نەخۆش کەوت؛ سەید کامیل ناچار دەستی لە خوێندن بەردا و گەڕاوە زەمبیل و سەری کردە کاری کشتوکاڵ. دوای هێدێک ژنیشی خواست و لەسەر ژیانی جووتیاری دامەزرا.

سەید کامیل لە سەردەمی فەقێتی و پاش ئەوەش، لەگەڵ خەڵکی لادێیی ، بەتایبەت لە ناوچەی موکوریاندا، تێکەڵ بووە و بەو بۆنەوە داب و دەستووری ژیان و زمان و فەرهەنگ (کولتوور)ی خەڵکەکەی باش زانیوە و ئەم تایبەتمەندییە لە شیعرەکانیدا جوان بەرچاوە و هۆی دەوڵەمەندی شیعری ئاوات لە باری وشەی ڕەسەن و قسەی نەستەق و زاراوەی ڕازاوەی ناوچەکەوە، هەر ئەمەیە.

زۆربەی شیعری ئاوات، باسی سروشت و جوانی و ژیانی کوردەواری و ئەوین و دڵدارییە؛ بەڵام جار جاریش بە زمانی شیعر، لە گەندەڵی دەسەڵاتداران و زۆربێژی کارگێڕانیان ناڵاندوویە و هۆی هەموو چارەڕەشییەکیشی، لە بێخەبەری و سڕی و سستی خەڵکەکەدا زانیوە. هەر ئەمەش جاروبار تووشی زەحمەتی کردووە و تەنانەت جارێکیش لە ساڵی ١٣٢٥دا، گرتوویانە و دەوری دوو ساڵ بە زیندانی بۆکان و سەقز و مەهاباد و ورمێدا گەڕاندوویانە.

سەید کامیل سەرەنجام لە ڕۆژی ٥ی خەرمانانی ١٣٦٨ ک. ه. (١٩٨٩ ز.)، لە زێدەکەی خۆیدا، کۆچ و باری بەرەو بارەگای هەتایی پێچاوە و بە ڕەحمەتی خودا چوو.

ئاوات پیاوێکی دیندار، خاکەسار، میهرەبان، میواندۆست و بەئاکار بوو. ئەگەرچی بە هۆی ناو و ناوبانگی بنەماڵەییەوە بۆی دەلوا بەهەشت بە خەڵکی بفرۆشێ و بەخۆشی ڕایبوێری، بەڵام سەید کامیل پیاوی ئەو فڕوفێڵانە نەبوو؛ وەکوو جووتیارێکی ئاسایی، بە جووت‌وگا و شەلەگە هەڵبڕین و دروێنەوانی و کەماکێشانەوە ژیاوە و سەری بەرز ڕاگرتووە.

بە کوردی و فارسی شیعری داناوە و بۆ نازناوی، «ئاوات» و «ئیمامی» هێناوە.

**چەند نموونە لە شیعرەکانی**:

| | |
|---|---|
| دەخولێمەوە لەم ژیانەدا بێ‌ئامانج | دیتم کە نەمان خاوەنی سەد تەخت و تانج |
| ئێستا بە ژیانی خۆم گەشەم دێ پاشان | دەگریم کە ئەوەندە بۆ ژیام بێ قازانج |

**خەزانی گوڵ**

(لە شینی حاجی بابای مامیدا گوتوویە)

| | |
|---|---|
| دەڵێن ڕۆیی لە نێو مە گیانە ئەو زیبی گوڵستانە | بەڵام پێش چاوی دڵ هەر باقییە، ئەو سەروی بوستانە |
| هەموو سەروی سەهی سەریان نەوی کرد باغەوان ڕۆیین | گوڵیش وا خۆی ڕنی، لایێ خەزان لایێ لە خۆدانە |
| خەزانی گوڵ بوو، ئەی دڵ بۆچی کەوتە هەڵبەزە و لەرزە | بە تەشریف چوونی ئەو بۆ جەننەتولمەئوایی جانانە |

شەوی جومعە لە نیوەی ئاخری شەو ئەو دەمەی خالیق
دەکا ئاواڵە دەرکی ڕەحمەتی بۆ هەرچی ئینسانە

نزوولە ڕەحمەتی بۆ توربەتی ئەو ساحێبئیحسانە
وەکوو ڕۆژ ئاشکرا بوو بەو شەوە، ئەو ڕێژنە بارانە

سەبا قوربانی سرووت بم، بڕۆ خێرا بە تەڕدەستی
سەلامی ئاگرینی من بەرە بۆ ئەو سولەیمانە

بڵێ سەر بێنە دەر لەو مەنزڵە پڕ فەیز و ئەنوارە
بزانە چۆن برازای بێوجوودت ماڵی وێرانە

هەچی تۆی دیبوو قوربان خاوەنی عەقڵ و فەراسەت بوو
ئەوا بێهۆش و گۆش و بەخت و بەدبەخت و پەرێشانە

عەجایب مەحشەرت هێناوە بۆ ئەم باقی ماوانەت
هەرایە، شین و قوڕپێوانە، واوەیلایە، گریانە

هەموو ڕەشپۆشە عەرز و ئاسمان، کێو و کەژ و سەحرا
سەدای ناڵین و هاوارە لە ماڵی خوێش و بێگانە

«ئیمامی» ماڵی کاول بوو نەما هێزی شکا باڵی
لە تاو مامی وەکوو بابی لە ژینی خۆی هەراسانە

**بەهاری تازە**

وا هات بەهاری تازە شنەی بای شەماڵە دێ
ناقووسی ژینی پڕ لە هیوای کیژ و کاڵە دێ

قاسپەی کەوی بنار و کەژ و کێو و یاڵە دێ
کۆتر لە سەر ڕەوەز بەگمە و ناڵەناڵە دێ

جیکەی مەلە، هەرایە، وشەی باڵی داڵە دێ

* *

شین بوو زەوین و مێگەلە مەڕ ڕۆیی بۆ لەوەڕ
پڕ بوو لە کارەکاری مەڕی شیو و دەشت و دەر

شوانان کە پەنکی تازەیی خۆیان دەکەن لەبەر
هەڵدێنە نێو هەوارەوە کیژان بە جلکی تەڕ

بارانە، بایە، گوڕڕەگوڕی هەوری تاڵە دێ

* *

ڕێک چیغ و چادرن دەدرەوشن لەسەر چیا
وەک خاڵی ڕەش دەچن کە لەسەر ڕوومەتی درا

ڕندوو لە هەر کوێ ما کوڵی فرمێسکی هەڵڕژا
بەو بۆنی چابوو خۆ کوڵی دڵ تۆزێ دامرا

کاتی هەوارە، قیژەیی کابانی ماڵە دێ

* *

دونیا وەکوو بەهەشتە سەراسەر بووە گڵووک
خونچە کە دەست نەخوردەیە وا بۆتە تازە بووک

هەرکەس گوڵێک بە ڕۆح نەکڕێ پێی دەڵێن چرووک
کاتی نەماوە کاکە خەم و ئاه و نووکە نووک

کیژان لە گوڵچنین و بزەی چاوی کاڵە دێ

* *

تیپی گولان گەیشت و وڵات بوو بە زێو و زەڕ
بولبول بە جوش و کوڵ لە نێوان شەو دەباتە سەر

شەونم لە سەر چڵۆیی گوڵان کەوتبوو بە بەر
نەرگس بە بەرگی زەردەوە هێناویە خەبەر

یانی گوڵاڵەسوورە لە خوێندا شەلاڵە دێ

ئـەمنیش هــەژار و دڵبــەخــەم و چـاوەڕێ پــەیام کێهــە پــەیام؟ پــەیامی ڕەفێقــانی وەک بــرام
پاڕامــەوە لــە خــالیقی بــوون و نــەبوون، بــەڵام هــەروا بــەداخــەوە گلەمــە، هــەر نــەبوو وەڵام
وێرانە ماڵ و حــاڵ و ســەدای کونـدەلالــە دێ

* *

خوێندی لە کوێ سـووانەیی تـالاری سـەوز و سـوور وێـرانی کـرد و تێکچـوو نـەما کۆشـکی پـڕ سـروور
دەگــرێ دڵــی هــەژاری «ئیمــامی» وەکــوو تــەنوور دەگری دەرِێژێ خوێنی گەشـی دڵ لـە خـوار و ژوور
هەرکوێ دەچێ لە دووی ئەوان زالــەزالــە دێ

غەزەلێکی فارسی:

چە شود اگر بـە رحمـت، مـن بینـوا نـوازی مـن اگـر نیازمنـدم، تـو کـریم و بـی‌نیـازی
بە چە رو روم بە درگە کە بـسی گناهکـارم من مبتلا و نـادم، تـو و عفـو و چـارەسـازی
بجــز از در تــو یــارب! در ســرفراز نبــود بـە هـزار تـرس آیـم بـە امیـد سـرفرازی
بە درت برم «امامی» سر خود بـە شرمـساری مگر آرد و گـذارد سـر و رو بـە خاکبـازی

*دیوانی ئاوات*. یاداشتی مامۆستا نافیع مەزهەر.

## شێخ موحەممەدی خاڵ

کوڕی شێخ عەلی، لە بنەماڵەی ناسراوی «خاڵ»، ساڵی ١٢٨٣ ک. ه. (١٩٠٤ ز.) هاتـە دنیـا. بـاب و کاڵــی، زۆربەیان لە زانایانی گەورە و بەناوبانگی کوردستان بوون کە سالانی ساڵ زانیـاری و زانـستە ئایینییــەکانیان پەرە پێ داوە. ئەم بنەماڵە سەرەتا لە چەرخی دەیـەمی کـۆچی ـــمانگیـدا، چەنـد کتێبخانـەی گـەورەیان گەڕاندووە. یەکەم قوتابخانەشیان لە گوندی «چۆڕ»، لـە باشـووری شـاری مەریوانـە کـە مـەلا ئەبووبـەکری موسەننیف بنیاتی ناوە. یەکی‌تر لە «قەلاچوالان»، ناوەندی حوکمەتی بابانەکان بووە کە لەگـەڵ گوزرانــەوەی ئەو ناوەندە بۆ سلێمانی، ئەویش گوزراوەتەوە.

موحەممەد نۆ سالان بووە بابی لە دنیا چووە و باپیری (حاجی شێخ ئەمینی خاڵ) سەپەرشتیی کردووە و لە مزگەوتێکدا کە خۆی مامۆستای بووە، پێی خوێندووە و ڕەشخوێنی قورئـانی پـیرۆز و هێنـدێک کتـێبی سەرەتایی عەرەبی و فارسیی فێر کردووە. پاشـان بۆخـۆی خوێنـدنی کتێبـانی وەک: «*عوامل جُرجانی*»، «*تصریف زنجانی*» و «*اظهار*»ی دەسپێکردووە. ئەوجار چۆتە خزمەتی زانای پارێزکار، شێخ جەلالی قەرەداغی و «*شرح کافیه*» لە نەحو و «*شرح شافیه*» لە سەرف و هـۆنراوەی «*کفایه*»ی مـەلا عەبدولـڵای بەیتووشـی، لـە مـەعانی حـورووفی بـەلاوە خوێنـدووە. هـەروەها نامیلکـەی «*ادب*»ی ئیـسماعیل گەلەنبـەوی، «*فناری*» عەبدوڵڵای یەزدی و «*گَلَنبَوی بُرهان*»ی بـە پـەراوێزەکانی ئیبنوقـەرەداغی و مـەلا ڕەحمـانی پێنجـوێنی

بەسەریاندا، «*شرح عَقاید نَسَفی*» و«*حاشیەی خیالی*» و «*جمع الجوامع*»ی لە کۆڕی دەرسی مامۆستای گەورە، شێخ عومەری قەرەداغی و بەشێکی گرنگ لە کتێبی «*مُغنی المُحتاج فی شرح المنهاج*» و «*تقریب المرام فی شرح تهذیب الکلام*»ی شێخ عەبدولقادری موهاجیری لە خزمەت مەلا حوسەینی بسکەندیدا خوێندووە.

ساڵی ١٣٠٠ ک. هـ. (١٩٢١ ز.)، حاجی شێخ ئەمینی خاڵ لە دنیا چووە و شێخ موحەممەد ـ کە ئەو دەم ١٨ ساڵی بووە ـ لە لایەن ئەحمەد تەفیق بەگ، فەرمانداری سلێمانیوە، لە جێی دانیشتووە. هەر لەو ساڵەشدا، ساختمانی قوتابخانەکەی بە شێوەیەکی شیاو، نوێ کردۆتەوە؛ وا کە ئێستاش ئەو شوێنە، ناوەندێکی ئاوەدانی دینی لە شاری سلێمانی دێتە ئەژمار.

شێخ موحەممەد لەو سەردەمانەدا، تەفسیری «*المَنار*»ی سەید ڕەشید ڕەزا و کتێب و نووسراوەکانی شێخ موحەممەد عەبدوهـ و بلاڤۆکی «*عُروة الوثقی*» و هێندێکی تری ـ کە توێکڵی پتر لە هەزار ساڵەیان لەسەر ئایین فڕێداوە و بە شێوەیەکی نوێخوازانە باسی دینیان کردووە ـ خوێندەوە و وەک خۆی دەڵێ: ون کراوەی لەمێژینەی دۆزیەوە و دڵی پێ ئەسپارد و لەدووی کەوت. بە شوێن ئەوەدا، بە وتاردان و نووسین، لەگەڵ خەڵکی هاوزمانیدا پێوەندی گرت و بەرهەمی بایەخداری ـ لە کتێب و نامیلکە ـ بڵاو کردنەوە.

مامۆستا خاڵ ساڵی ١٣٠٨ ک. هـ. (١٩٢٩ ز.) بوو بە قازی و پێڕای تۆژینەوە و نووسین، ماوەی ٣٨ ساڵ، لە نێوانی خەڵکدا، دادوەری کرد.

ساڵی ١٣٣٣ (١٩٥٤)، بە هۆی نووسینی کتێبێک لەمەڕ ژیان و خزمەتەکانی شێخ موحەممەد فەیزی موفتی زەهاوییەوە، وەکوو ئەندامی جێنشین، لە «مجمع العلمی العراقی»دا وەرگیرا و ساڵی ١٣٤٩ (١٩٧٠)، بوو بە جێگرسەرۆکی «کۆڕی زانیاری کورد» لە بەغدا و کە ئەو کۆڕە هەڵشێواوە، کرایە ئەندامی سەرەکی لە «مجمع»دا.

شێخ موحەممەدی خاڵ سەرەنجام پاش ٨٥ ساڵ ژیانی پڕپیت، لە ساڵی ١٣٦٨ ک. هـ. (١٩٨٩ ز.)، ژیانی سەر دنیای بەجێهێشت. ئەو مامۆستا زانایە، لەگەڵ باری ئایینی و ئیسلامەتیدا، خزمەتی زۆر بایەخداری بە زمان و وێژەی میللەتەکەی کرد.

**بەرهەمەکانی مامۆستا خاڵ**:

١. «*تەفسیری خاڵ*»، بە کوردی، چوار بەرگ.

بەرگی یەکەم، ٢١٨ لاپەڕە، بەغدا، ١٩٦٩ز.

بەرگی دووهەم، ١٩٨ لاپەڕە، سللمانی، ١٩٧٢ز.

بەرگی سێهەم، ٢٢٤ لاپەڕە، سلێمانی ١٩٧٩ز.

بەرگی چوارەم، ١٣٦ لاپەڕە، سلێمانی ، ١٩٨١ز.

٢. «*فەرهەنگی خاڵ*»، کوردی ـ کوردی، سێ بەرگ،

بەرگی یەکەم ٣٣٨ لاپەڕە، سلێمانی، ١٩٦٠ز.

بەرگی دووهەم، ٣٣٨ لاپەڕە، سلێمانی ١٩٦٤ز.

بەرگی سێهەم، ٥١١ لاپەڕە، ١٩٧٦ز.

٣. «*پەندی پێشینان*»، بەغدا، ١٩٧٥ز.

٤. «*موفتی زەهاوی*»، کوردی، بەغدا، ١٩٥٣ز.

٥. «*البیتووشی*»، عەرەبی، بەغدا، ١٩٥٧ز.

٦. «*الشّیخ معروف النودهی*»، عەرەبی، بەغدا، ١٩٦١ ز.

٧. «بابا *تاهیری هەمەدانی*»، کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٧ز.

٨. «*ناڵەی دەروون*»، بەغدا، ١٩٨٤ز.

٩. «*مەولوودنامەی نَواثر*» یان «*مێژووی پێغەمبەر*»، سلێمانی، ١٩٣٧ز.

١٠. «*فەلسەفەی ئایینی ئیسلام*»، کوردی، سلێمانی، ١٩٣٨ز.

١١. «*شەرحی دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی*»، کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٩ز.

١٢. «*پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا*»، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٤ز.

١٣. «*سەید جەمالەدین ئەفغانی*»، کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٦ز.

١٤. «*مەلا موحەممەدی خاکی*»، کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٨ز.

لەم مامۆستایە چەند نووسراوەی تریش بەجیماون کە تا ئێستا چاپ نەکراون.

خوا لێ خۆشبوو شێخ موحەممەدی خاڵ، پەخشانی کوردی، جوان و ڕەوان دەنووسی؛ نموونەیەک کە لە گۆڤاری «گەلاوێژ»دا چاپ بووە:

## من و چەمچەماڵ

ئەگێڕنەوە ئەڵێن: ساحیبی کوردی عەببادی وەزیر، ڕۆژێ لە دیوانی خۆی بە تەنیا دائەنیشێ؛ لەبەر بێهاودەمی نازانێ چی بکا و چۆن ڕابوێرێ. ئەمجار دەست ئەداتە قەڵەم بۆ ئەوەی کە هەروا هەرزەنووسی بکا و خۆی بخلافێنێ؛ ئیتر بە بێ ئەمە کە بیەوێ شتێکی تایبەتی بنووسێ، یا مەبەستێک بخاتە سەر کاغەز. وەزیر هەر لە خۆیەوە بە ڕێکەوت ئەم عیبارەتە بە نووکی قەڵەمەکەیا دێ و ئەنووسێ: «اَیُّها القاضی بِقُمْ! قَدْ عَزَلْناکَ فَقُمْ». یانێ ئەی قازی شاری «قُم» وا دەرمان کردی؛ ئیتر هەستە بڕۆ. وەزیر کە تەماشای عیبارەتەکەی خۆی ئەکا، وا دوو قافیەی زۆر جوانی بۆ هاتووە، مرخی لێ خۆش ئەکا و ئەڵێ: بە خوا حەیفە ئەم عیبارەتە جوانە فڕێ بدەم، وا چاکە بینێرم بۆ قازی شاری قُم و ئەوی پێ عەزڵ بکەم. کوتووپڕ وەزیر فەرمان ئەدا بە نووسین و مۆر کردن و ناردنی بۆ قازی قُم. بەڵام قازی پیاوێکی زۆر زیت و زرنگ و زیرەک و دانا ئەبێ. لەگەڵ کاغەزەکەی پێ ئەگا و ئەیخوێنێتەوە، کوتووپڕ تێئەگا و ئەڵێ: «واللە ما عَزَلْتَنی اِلّا هذهِ **السجعَةُ**» یانێ بە خوا هیچ شتێک منی بەدەر کردن نەدا، ئەم قافیەیە نەبێ.

منیش که به قازیەتی له هەڵەبجەوە نێردراوم بۆ چەمچەماڵ و قافیەی «شێخ موحەممەدی خاڵ» و «چەمچەماڵ»م خوێندەوە، وتم یا حافیز! قافیەی پێشوو بوو به بەهانە بۆ دەرکردنی قازییەک؛ ئەم قافیەیەش نەبێ به بەهانەی دیلی من له چەمچەماڵ! بەڵێ ئەم قافیەیەش منی ٥٢ مانگ و ٨ ڕۆژ دیل و پابەندی چەمچەماڵ کرد. هەروەک پیرەمێرد له «ژین»ی ژمارە ٧٤٨دا نووسیویەتی. ئەڵێ:

دوو قافیـــەمان، لــێ بـــوو بـــه دوو بـــاڵ          خـــاڵ و چەمچـــەماڵ، بـــه درێـــژی ســـاڵ

بەڵێ لەو ماوەدا چەن جارێ ویستم که خۆم ڕزگار کەم و گشتەکی هیوام دوولانه با بدەم وکرژی بکەمەوە؛ بەڵام هەرچەند خۆم به دەست و بازوویەکی بەهێز خەریکی بادانی ئەبووم بەلای ڕاستا، قافییەکەی پێشوو، به دەست و بازووێکی بەهێزتر و شان و ملێکی ئەستوورتر، به لای چەپا خاوی ئەکردەوە و هەموو جارێ چاوی ڕەشی کاڵ ئەکردەوە و ڕیسەکەمی ئەکردەوە به خوری. تا ئاخرەکەی خوا ڕزگاری کردم له چەمچەماڵ و له قافیەکەی؛ بەڵام له پاش چی؟ له پاش ئەوەی که کەتنی خۆی هەر کرد و دەستی خۆی وەشاند. یاخوا هیچ کەسێ نه تووشی قافیەی پێشوو بێ و نه دوچاری قافیەی پاشوو. بەڵام له هەمووی خۆشتر ئەمە بوو و که له ڕۆژی نەورۆز و له یەکەم ڕۆژی بەهارا، گەیشتمە شاری سلێمانی و چاوم ڕوون بوەوە به چاو پێکەوتنی دۆستان و بینینی گوڵ و گوڵزار و لالەزار و چەم و چیمەن و چڵ و چنوور و چیا و چنار و کانی و کارێز و تاڤگە و ڕەز و سەوزەر و باخ و دەشت و شاخ و گردی مامەیارەیەوە.

وەلێ به ڕاستی ژینی چەمچەماڵم هەرچەند درێژ و ناخۆش بوو؛ بەڵام پانیش بوو؛ گەلێ شتی جوانم تیا نووسی و گەلێ شتی ناتەواوم تیا تەواو کرد. هەروەک گەلێ شتی نووسراویشم تیا پوختە کرد. کەوابوو من له قافیەی خۆم بێبەهرە نەبووم؛ بەڵام قوڕ بەسەر قازی «قُم» بۆ خۆی و قافییەکەی.

*ژیانی من*، شێخ موحەممەدی خاڵ. *فەرهەنگی ئەدیب و نووسەرانی کورد*، مستەفا نەریمان، ١٩٨٤ز. گۆڤاری *گەلاوێژ*.

## موحەممەد ڕەسوولی شیرازی

کوڕی عەبدوڵڵا، له مامۆستایانی پەروەردەی شاری سەقز بوو که ساڵی ١٣١٤ ک. ه. (١٩٣٥ ز.) لەو شارەدا هاتە دنیا و لەوێ و تا دواناوەندی خوێند. ئەوجار بۆ خوێندنی باڵا چوو بۆ غوربەت و لیسانسی زمان و وێژەی ئینگلیسی وەرگرت. پاشان گەڕاوە زێدی خۆی و تا وەنیشتە بوو، دەرسی زمانی ئینگلیسی گوتەوە و سەرەنجام له مانگی خەرمانانی ساڵی ١٣٦٨ ک. ه. (١٩٨٩ ز.)، سەری یەکجاری نایەوە.

شادڕەوان شیرازی پیاوێکی ئاکاربەرز و خێرخوازی خەڵک بوو؛ ئەوی دەیناسی خۆشی‌دەویست و به چاکە ناوی لێ دەبرد. خاوەن هۆش و بیرێکی تیژ و زەوقی شیعر بوو. جاروبارە به کوردی و فارسی شیعری دەگوت. بێجگە ئینگلیسی، کوردی و فارسیی باش دەزانی و له عەرەبیشدا خراپ نەبوو. یەک له



بەرهەمەکانی، وەرگێڕاوەیەک بەناوی «*بنياد جهان*»، بە زمانی فارسییە، نووسراوەی مەک میلان.

مامۆستا نافیع مەزهەر لە شینیدا شیعرێکی داناوە؛ کە ئەوا بەشێکی:

سڵاو لە ڕۆحت سەدجار شیرازی | خوا بە لوتفی خۆی لێت ببێ ڕازی
ئەتۆ پسپۆڕ و خاوەن قەڵەم بووی | بۆ هەموو کەسێ شەریکی غەم بووی
وێنە و مانەندی ئەتۆ زۆر کەم بوو | تەواوی باشی لە تۆدا جەم بوو
ئەدیب و زانا و شاعێر و پیاوچاک | موسوڵمانێکی ڕۆشنبیر و پاک
عەلاقەی زۆرت بە شارەکەت بوو | دڵخۆشیت تەواو بە کارەکەت بوو

داخی گرانم بۆ وا زوو مردی؟
بۆ بە جێتهێشتین بۆ دنیا و دەردی؟

با کۆڕێ بگرین، بگرین زۆر بە کوڵ | وەک شینی بولبوڵ لەسەر پەڕەی گوڵ
بڵێین مامۆسای مێهرەبانم ڕۆ | پیاوی بێهەوا و خوەشبەیانم ڕۆ
خۆشەویستەکەی شاری سەقز ڕۆ | غەمخۆری گەلی ڕووت و عاجز ڕۆ
زانای زۆربەرزی نیشتمانم ڕۆ | ڕۆڵەی دڵسۆزی کوردستانم ڕۆ

ڕەفیقی ڕاز و دڵنەوازیم ڕۆ
وەی شیرازیم ڕۆ، وەی شیرازیم ڕۆ

ئێمە بۆ خواین و بۆ لای ئەو ئەچین | ئەگەر ڕاسرەو بین یا ئەگەر کەچین
گڵکۆت جێی کەیف و شادمانی بیت | جێگات بەهەشتی جاویدانی بێت
وەک هەژار ئەڵێ بۆ مەرگی هێمن: | ڕۆیشتی و غەمت بەجێهێشت بۆ من
پیرم، «شپرزە»م بەسمە گفتوگۆ | منیش بە تەمام زوو بێم بۆلای تۆ

وەرگیراو لە یاداشتی مامۆستا نافیع مەزهەر.

## مەلا غەفوور

شاعیری وردبین و خۆش‌کەلام، مەلا غەفووری دەباغی، مەشهوور بە حافیزی مەهابادی، کوڕی دەروێش عەبدوڵلا، ساڵی ١٣٠٦ ک. هـ. لە شاری سەقز هاتە دنیا. بابی دەواخچی بوو؛ بە بۆنەی کارەوە، ناچار چوو بۆ بانە و غەفوور ـکە ئەودەم منداڵێکی کرچ و کاڵ بوو ـ لەو شارەدا هاوڵەی تووش هات و ئەو نەخۆشییە پاش ماوەیەک کوێری کرد.

حەوت ساڵان بوو بابی بردیە لای میرزا موحەممەد کەریم ناوێک، قورئانی پێ فێر بکا. بەم جۆرە تا ساڵی ١٣٢٠ (١٩٤١)، دەوری نیوەی قورئانی لەبەر کرد. لەو ساڵەدا ئاوری دووهەم شەڕی جیهانی، گەیشتە

کوردستان و هاوکات، دەوڵەت، هێز و دەسەلاتێکی وای نەما. لە بانەدا حەمە ڕەشیدخان سەری هەڵدا و ناوچەکە تووشی بشێوە و ئاژاوە بوو. دەرویش عەبدوڵلا باری کرد بۆ مەهاباد و لەوێش کوڕەکەی ئەسپاردە مەلا ئەحمەدی حاجی بایەزید، بەشکوو ئەو کارەی دەستی‌پێکردووە، تەواوی بکا. بە کورتی، هەشت ساڵی خایاند تا غەفوور، هەموو سی جزمی قورئانی لەبەر کرد. پاشان بە فەرمانی باوکی چووە خزمەتی مامۆستایان: مەلا حوسەینی مەجدی، بۆ خوێندنی عەرووز و قافیە، حاجی مەلا خالیدی وەحیدی، بۆ شەرع و هەروەها قازی موحەممەدی خدری لە شنۆ، بۆ شەرحی عەقاید.

مەلا غەفوور ساڵی ١٣٣٠ ک. ه. (١٩٥١ ز.)، پێڕای دەرسی مەلایەتی، وازی چووە سەر شیعر و شاعیری و لە هەموو شتێک زیاتر، کەوتە لەبەرکردنی شیعری شاعیرانی کورد و فارس. لەو سەردەمەدا، زۆربەی کاتی لەگەڵ فەقێیان ڕادەبرد و بە یارمەتی ئەوان، شیعرێکی زۆری لەبەرکرد. شیعری زۆر بیستن و لەبەرکردنیان، هەستی شاعیری خۆشی بزواند و وردە وردە توانی شیعری جوان و ڕەوانیش بێژێ و بەتایبەت لە تێهەڵکێشی شیعری شاعیرانی‌تردا، دەستێکی باڵای پەیدا کرد.

شیعری مەلا غەفوور ـ کە یەکجار بێ‌گرێ و ڕەوان و جوانە و بە دڵەوە دەنیشێ ـ ناوی خاوەنەکەی خستە سەرزاران؛ بەلام ئەو ناو و ناوبانگە، بۆ مەلا غەفوور، نانی لێ شین نەدەبوو. یەکجار بە هەژاری دەژیا و ئەگەرچی دەرۆزەیی لە هەموو شتێک پێ ناخۆش‌تر بوو، لە ناعیلاجی ڕەگەڵ چەند حافیزی تر دەکەوت و زەکاتی کۆ دەکردەوە؛ یان شیعری بۆ ئاغایەک دەگوت و شتێکی لێ دەساند.

کودەتای قاسم لە عیراق و گۆڕانی بارودۆخی ئەو ولاتە لە هاوینی ١٣٣٧ ک. ه. (١٩٥٨ ز.)، زۆری کار کردە سەر هەستی مەلا و لەو سەردەمەوە، شیعری زیاتر باری کۆمەلایەتی گرتە خۆی و بە هەموو زمانێک، لە گەپ و گاڵتەوە تا تیز وتانە، تا بە شێوەی ڕاستەقینە، شیعری بەقەوەتی بۆ تڕۆکردنی ناحەقیکاران و گەلخۆران و دەسەلاتدارانی بێ‌ئاکار دانا و بوو بە زمانی مەردمی بەش‌خوراو و داماو.

مەلا غەفوور ساڵی ١٣٥٠ (١٩٧١)، لێ‌بڕا خەتی کوێران (بریل) فێر ببێ و تا تەواو پێی ڕانەهات، لێی نەبۆوە. پێڕای ئەوەش لێ‌کەوت، قسەی نەستەق و مەتەڵۆک و دەستەواژەی کوردی کۆ کردەوە و کردنیە شیعر و کتێبێکی یەکجار بایەخداری لێ بەرهەم هێنا؛ کە لەبەر هێندێک مەتەڵۆکی بۆندار، ساواکی شا بردی و تازە نەیداوە. مەلا بە بیرکردنەوە ، هێندێکیانی وەبیرهێنانەوە؛ کە لێرەدا چەند نموونەی دەخوێنینەوە:

وایان فەرمووە پیاوانی زانا      کۆسە چوو بۆ ڕیش، سمێڵی دانا

*

بەو کەسە دەڵێن عاقڵ و وشیار      دووجار لە جێیەک پێوەی نەدا مار

*

لە نێو خاس و عام ئەم قسە زۆرە      ماڵی خۆ نەخۆر، بۆ چەکمە بۆرە

چــرای مەزڵــوومان دایم بــێ‌نــووره ئــاوی زاڵــمان ســـەربەرەو ژووره

*

کـــێ بەرزەفـــڕە و خۆبـــەزڵزانـــە ڕۆژێ ئـــەیهاڕێ ئاشـــی زەمانـــە

*

لـە شـار و لادێ ئـەم نەقـڵە بـاوە گیای شین بە جێگای سەختەوە ماوە

*

قەل ئەڵێن لاسای کـەوی کـردەوە ڕۆینەکەی خۆشی لـە بـیر بـردەوە

*

جارێکت خواردم بـە سـندانت بـێ دوو جارت خواردم، نۆشی گیانـت بـێ

*

بە کـەم قایـل بـە تـا زۆرت دەبـێ هەشت بێ لە مشت بێ، نەک نۆ بێ و نەبێ

*

کەسێ نەگبەتی بێتـە سـەر شـانی پەلۆلـــە بخـــوا دەشـــکێ ددانی

*

تەماع سوێراوە، وەک ئـاو دەنوێنـێ تـا بیخۆیتـــەوە توونیـــەتی دێنـــێ

مەلا، لەم دواییانەدا لە نێو خەڵـکی شـاری مـەهاباد، وەج و ڕێزێکـی پەیـدا کردبـوو. زۆرێـک خۆشـیان دەویست و لایان چۆڵ نەدەکرد و بەم بۆنەوە تا ڕادەیەکی باش بەڕێوە دەچوو. بۆخۆی، بە پێزانییەوە، دەڵێ:

کانگـەی شـەرەف و غـیرەت و ویژدانـە مـەهاباد
چاوگـەی کـەرەم و هیممـەتی مەردانـە مـەهاباد
جێـی حورمـەت و ڕێـز گـرتنی میوانـە مـەهاباد
بووژێنـــەرەوەی ڕووت و هەژارانـــە مـــەهاباد
ئامـادەیی خزمـەت بـە غەریبانـە مـەهاباد

سابڵاغی سەتی دەی لە خـەمی بـوون و نەبوونـە
بـاقی دی شـەریکی خـەمی دامـاو و زەبوونـە
خەڵـکێکی نیـەت‌پـاکن و بیریـان هـەموو ڕوونـە
ئـەم شـارە لـە بـۆ کـاری بـەجێ بۆتـە نموونـە
تـاریفی لـە نـاو خەڵـکی ولاتانـە مـەهاباد

لـێ بـووردن و ڕەحـم و بـەزەیی لێـرە کـە بـاوە
میراتــە لــە پێــشینەوە بــەو خەڵــکە بــڕاوە
ئازایــەتی و غــیرەت و هیممــەت لــە خــوداوە
هەســتێکە لــە پــاڵ میللــەتی ئــەم شــارە نـراوە
دڵپاکی و بێبـاکی لـە خـۆی جوانـە مـەهاباد

دڵــیان پـڕە سـابلاغی لـە ئـیخلاس و ئـیرادەت
ڕووخوش و گەشن بێغەرەزن دوور لە حەسادەت
لایــەنگری مزگــەوت و ئەوینــداری عیبــادەت
دینــداری و تاعـەت چووەتـە ئەوپـەڕی عـادەت
ســەرچاوەیی خواناســی و ئیمانــە مــەهاباد

لەم شارە بـڕێک کاربـەدەس و خێـوی مەعاشـن
بیـستی لـە سـەتا خـاوەنی سـامان و قوماشــن
داخم کە بەشی زۆرتری دەسـکورت و لـە پاشــن
بۆ دەستودڵ و خزمەتی خەڵـکی هـەموو باشــن
ئەرکێکی گەلێ قورسی لە سەر شانە مـەهاباد

دڵــسۆزی بــەرەی لارەمــل و بــێدەســەلاتن
یاریــدەدەری خەڵــکی ڕەشوڕووتی ولاتــن
ئەهلێکی بەشەردۆست و بە بەخـشین و خـەلاتن
لای گشتی لە مەیدانی کـەرەم، شـەرمە هـەلاتن
چون مەرکەزی دەس گـرتن و ئیحـسانە مـەهاباد

کەمیان لە خەمی سـەروەت و زۆر کـردنی ماڵــن
زۆربەی تەشەنی مەعریفـەت و کەسـبی کەماڵـن
لاگــیری حــەقن، دژ بــە خورافــات و بەتاڵــن
لێــزان و بــەبیرن لــە قەڵــەمدا هــەموو قاڵــن
لانــەی گــەلی بـیر ڕوون و بزۆزانـە مـەهاباد

شارێکی چ خۆشدیمەن و جوان و بەحەشـیمەت
لاوانی چ خــوێنشــیرن و پیتــۆڵ و بلیمــەت
گەنجی هـەموو گەنجینـەیی هێـژا و بـەقیمـەت

پـــیرانی پتـــەوبـــیرن و بـــۆ ئێمـــە غەنیمـــەت
زانـــستگەیی پـــسپۆڕ و ئەدیبانـــە مـــەهاباد

مـــن لێـــرە کەســـێکم کـــە دەزانـــن هـــەموو نـــاوم
ســـیساڵـــە لـــە نـــاو میللـــەتی ئـــەم شـــارە ژیـــاوم
پـــیرم لـــە ڕواڵـــەت چـــل و نـــۆ ساڵـــی تـــەواوم
پـــێموایـــە لـــە ســـایەی ســـەری دۆســـتانەوە لاوم
خۆشی بە گـــەلی هـــاوڵ و دۆســـتانە مـــەهاباد

مەلا غەفووری دەباغی سەرەنجام لە بەیانی یەکشەممبە ٢٩ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٦٩ ک. م. (١٩٩٠ ز.) لە مەهاباد، دنیای تاریکی بەرهەڵدا کرد و ڕووی کردە بارەگای نوورانی خودا. خەڵکێکی زۆر تەرمەکەیان تـا سەرقەبرانی «بوداق سوڵتان» لەسەر شان بەڕێ کرد و لەوێ، لە پـەنای شـاعیری نـاوداری کـورد (مامۆسـتا هێمن) ناشتیان.

**چەند شیعری مەلا غەفوور:**

**پەری گیان**

ئەی تەختی هەنیت، تەختی سزادانە پەری گیـان! وەی چاڵی چەنەت قوژبنی زیندانـە پـەری گیـان!
شمـشیری بـرۆت پـارە دەکـا جـەرگی ئەویندار خنجێـری مـوژەت قاتـڵی لاوانـە پـەری گیـان!
بـسکت شـەوەیە، ئاڵـی دڵـە ڕوومـەتی ئاڵـت ئەم خاڵ و خەتەت قابیزی سەد گیانە پەری گیان!
بەرگێکـە بـڕاوە بـە قـەد و قامـەتی شـۆخت ئەم جەور و جەفا و خەڵکی بەکوشتدانە پـەری گیـان!
چاومەسـتی و تەڕدەسـتی و عاشـق کـوژی و نـاز تەننازی و عـەییاری لـە تـۆ جوانـە پـەری گیـان!
چـاوم نییـە زۆر موسـتەحەقی خێـر و زەکـاتم ماچێ بدە بـەم کـوێرە بـەسـەزمانە پـەری گیـان!

**گازندە لە هەژاری**

لالووتـە لـە ئێمـە چـەرخی گـەردوون پـێحەیفـە بـژین بـە بـەختیاری
بەرگێکـە بـە بـەژنی مـن بـڕاوە قـەرزای و سـەرکزی و هـەژاری
دەسـتم بـە دوعایـە خەڵـکی بمـرێ تـا نانـێ بخـۆین لـە تازیـەداری
تـف لـەم بەشـە، لـەم ژیانـە حـافز ئـەو نانـە بکـەی بـە ژەهـری مـاری
بـێچاوییـە هـۆی کـزی و کەساسـیت سـەرباری خەڵـک بی، نالـەباری
هـەروا بـووە ژیـنی ئێمـەمانـان تایبـەت لـە وڵاتی کـوردەواری
شـاعیر کـە ژیـانی پـڕ لـە ژانـە فـەرقی چییـە پـاییز و بـەهاری
کـێ ژیـر و بـە بـیر و هەسـتیارە بـەختی ڕەشـە، تاڵـە ڕۆژگـاری

ئــەو خەڵــکە تکایــە لــێم ببــوورن حــەق نابــێ لــە هــیچ کەســێ وەشــاری

**شێوەیەک تێهەڵکێشی شیعری شاعیرانی گەورە، بە تیزەوە:**

دل مــی‌رود ز دســتم، صــاحبدلان خــدا را گازمان نەماوە چی‌بکەم؟ دەس ناکــەوێ لــە شــارا

دردا کــه راز پنهــان خواهــد شــد آشــکارا پارووی چــەوْر مەحاڵــە، دەسـتت نــەبێ لــە کــارا

ای صــاحب کرامــت شــکرانه‌ی ســلامت سەرمامە وەختە قڕ بم، گەرمی‌کە ئەو حەمامــەت

روزی تفقــدی کــن درویــش بینــوا را تــا دەمــدەنێ قــڕمدێ، چوانــانی نــانوا را

ده روز مهــر گــردون افسانه اسـت و افسون زەمانە وای کوتاوم خۆم نــاگرم لەســەر قــوون

نیکــی بــه جــای یــاران فرصـت شــمار یــارا پێم خۆشە یارمەتیم دەن دۆستان لــە کــار و بــارا

در حلقه‌ی گل و مُل، خــوش خوانــد دوش بلبـل گوێ کپ کەن و مەبیسن وەعدەی بەتاڵ و زلزل

هــاتالــصبوحُ هبــوا یــا ایهالــسُکارا چی‌دی مەکەن کوڕوکاش لــە نێــو پــەریز و جــاڕا

آئینــه‌ی ســکندر جــام مــی اســت بنگــر تا ئەسپی شێ لەوێ بێ، پیاو چۆن دەچێتــە ســەرکەر

تــا بــر تــو عرضــه دارد احــوال ملــک دارا تەپڵی کەساسی دەکــوتن دارا لەگــەڵ نــەدارا

هنگام تنگدستی در عــیش کــوش و مــستی چەک بێ‌مەحەل بکێشە تا پووڵت دێتــە دەســتی

کــاین کیمیــای هــستی قــارون کنــد گــدا را شیرینەماڵی مفتــێ، خۆشــتر ئــەچێ بــە زارا

حافظ به خود نپوشید این خرقــه‌ی مــی‌آلــود بینێرە بەڵکوو بیشۆن لە ماڵی سۆفی مەولوود

ای شــیخ پاکــدامن معــذور دار مــا را نەیبەیتــە چــەم قــڕی دێ ماســی لــە ڕوودبــارا

* * *

پادشــاهی پــسر بــه مکتــب داد وتی تۆش کەر نــەبی وەکــوو فــەرهاد

لــوح ســیمینش در کنــار نهــاد نــەکوو قــۆڕی بکــا بــە شــەق ئوســتاد

بــر ســر لــوح او نوشــته بــه زر ژنی چــی نێرەکــەر نەکــەی زەڕە زەڕ

جــور اســتاد بــه ز مهــر پــدر خوێندنت ناوێ چش بە توونی تەتــەر

*دیاری مەهاباد*، چاپی یەکەم، نەورۆزی ١٣٦٣ ک. ھ. یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ عیمادی مەردۆخی

کوڕی شێخ ئەحمەد، لە بنەماڵەی مەردۆخی، ساڵی ١٢٩٧ ک. ھ. (١٩١٨) لــە گونــدی «دەژن»، لــە نێــوان بێلوار و هەورامان، هاتە دنیا.

تا ئەم دواییانە، دەژن یەک لە ناوەندە زانستییەکان بووە و کەڵەپیاوانی وەک شێخ موحەممەد «فخرالعُلما» (حەیران)، شێخ نیزامەدین «نظام‌العُلما» و شێخ ئیمامەدینی مەردۆخی، لەوێوە سەریان‌هەڵداوە.

عیمادەدین ھەر بە منداڵی و لە زێدی خۆیدا، لە خزمەتی بابی ڕەشخوێنی قورئـان و لای مـامی (شـێخ مەسعوودی خەتات)، زبانی فارسی و «گلستان» و «بوستان»ی خوێند و ھەروەھا خۆشنووسـی مەشـق کـرد. پاشان ـوەک زۆربەی فەقێیان ـ لەگەڵ غەریبی و نەداری و بێکەس‌وکاری، ماوەی چەنـد سـاڵان، کەوتـە گەڕان بە قوتابخانەکانی کوردستاندا و خزمەتی زۆر مامۆستای زانا گەییشت و دوایـی گەییـشتە سـنە و لـە کۆڕی دەرسی زانایانی وەک: مەلا موحەممەدی مودەڕڕیس گـورجی، مـەلا مـەحموودی مـوفتی و مـەلا عەبدولعەزیمی موجتەھید، خوێندنی تەواو کرد و ئیجازەی لێیان وەرگرت. ئەوجار چووە گوندی «کاشـتەر» و پاشان «سیویە» و ھەر لەوێ ژنی خواست و بۆ بەڕێوەچوونی ژیان، کاریشی دەسپێکرد.

شێخ عیماد بە نازناوی «سەبری»، شیعریشی دەگـوت. زۆربـەی شـیعرەکانی، باسـی جـوانی سروشـت و دیمەنی بەھارە. ئەگەرچی دڵی لە لای سروشت و یەکڕەنگی لادێ بوو؛ بەڵام ناعیلاجی ژیـان و پێویـستی منداڵان بە خوێندن، ساڵی ١٣٣٩ بردیە شار و لە سنە بوو بە دەفتـەردار. ساڵـی ١٣٤٩، سـەفەری حـەجی کرد و بۆ بیرەوەری ئەو سەفەرەی، شیعرێکی گوت کە دو بەیتی سەرەتای ئەمەیە:

دولـت واقبـال مـن جانـا ز سـال پـار بـود — مقـصدم بیـت‌الحـرام و کعبـەی دلـدار بـود
ظاھراً منظـور مـا حـج و طـواف کعبـە بـود — لیک در باطن ھدف، جلب رضای یار بـود

مـانگی سـەرماوەزی ساڵـی ١٣٦٩ ک. ھ. (١٩٩٠ ز.)، شـێخ عیمـاد لـە شـاری سـنە، بـە شـەقامێکدا تێدەپەڕی، ماشێنێک بە توندی لێی‌دا و برینداری کرد و چەند مانگ لەودوا گیانی پاکی، لەشی شکەستەی بەجێ‌ھێشت.

خوا لێ خۆشبوو شێخ عیمادی مەردۆخی پیاوێکی میھرەبان، ئاکارباش، دڵپاک و یەکڕەنگ بـوو. مانـای خۆ بە زل زانینی نەدەزانی و ھەموو، لە گەورە و پچووک، خۆشیان دەویست. دڵـێکی گـەورە و دامـەزراوی ھەبوو. کاتێ کە لە نەخۆشخانە کەوتبوو، ھـەموو گیـانی دێـشا، نـەک نەیدەناڵانـد، ئـەو ژن و منداڵـەکەی دڵدەداوە و قسەی خۆشی بۆ دەکردن.

**نموونەیەک لە شیعری سەبری:**

ئـازیز جـە وەشـی شـکیای سـپای دەی — دەی بۆ وەشـی‌کـەین فرسـەتن سـادەی
جاســووس وەھــار جــە ھــەر دیــاردا — پــەرێ مــوژدەی فــەتح ئامـا و دیـار دا
پــەیک وەش‌قــودووم ئــەوەڵ وەھــاران — ھۆرکەنـد جـە ڕیـشە وە ڕووی کۆسـاران
کــەرد گــەردەلوول زمــستان ســەرد — سروەی وای شەماڵ تـار و مـارش کـەرد
ھــەور نــەو وەھــار مــەگرەوو بــە زار — خەنــدە مەکــەران باغــات و گوڵــزار
بــە دەســت قــودرەت «ربّ‌العــالمین» — فــەرش زومــوڕڕود وزیـا ڕووی زەمــین
نــەرگس بــە وێنــەی نــیم‌نگـار دڵـبەر — جـە گۆشـەی سـەحرا سـەراوەرد وە بـەر

وەنەوشــە و سۆســەن شــەوبۆ و شــەقایق
شەرح مەدان یەکـ یەک ڕەمـز حـەقایق

شەماڵ بـە عـەتری وەردی ڕووی دڵـبەر
گوڵاوپاشــی کــەرد تــەمام دەشــت و دەر

چارشـێو سـفیدان چـون قـورس قەمـەر
پەخشان بین جە سەر سەوزەی دەشت و دەر

جــــە دەور کناچــــان چــــواردە ساڵـــــە
کــوڕان چــون ئــەنجوم بەستــشان هاڵــە

شــەوق گــوڵان و دیبــای زەرد و ســوور
سەرزەمین کەردەن یەکسەر شۆڵـەی نـوور

وادەی شــادی و شــۆر جــوان و پــیرەن
چــون گۆشــەی ســەحرا وەش و دڵــگیرەن

بۆڵبوڵان جە وەسڵ گـوڵان مەسـروورەن
جوانــان ســەرمەس دڵان مــەخموورەن

«عیمــاد» پــەرێ تــۆ حاڵــش پەرێــشەن
بێ‌تۆ تـەماشـای وەهـار پـەی چێـشەن؟

وەرگیراو لە یاداشتی کاک سەعدی مەردۆخی و یاداشتەکانی نووسەر.

## هەژار[1]

شاعیری وشیار، نووسەری هەستیار، وەرگێڕی نوێ‌واز و پێشمەرگەی ئازادیخواز، مامۆستا عەبدوڕڕەحمان شەرەفکەندی، نازناو و ناسراو بە «هـەژار»، ساڵـی ١٣٣٩ ک. م. بەرامبـەر بـە ١٣٠٠ ک. ه. (١٩٢١ ز.)، لـە شاری مەهاباد هاتە دنیا. بابی ( مەلا موحەممەدی بۆر) پیاوێکی دیندار بوو؛ سەودای دەکرد و لـە کاسـبیدا باش سەری دەردەچوو؛ بەڵام دوو جار بوو بە ماڵ و دیسان چۆوە سەر سیفر ؛ جارێک لە سەردەمی شـەڕی یەکەمی دنیاگر، لە هێرشی ڕووساندا، کە تەنیا توانی گیانی دەرکا و هەرچێکی هـەبوو، کەوتـە بـەر تـاڵانی سوپای داگیرکەرەوە. جاری‌تر کە شکاک ڕژانە ناو شاری مەهاباد و ئەمجارە ڕەحمانی کوڕی، منداڵی سـەر بێشکە بوو، تەنانەت دەسرازە و پەڕۆپاڵی ئەویشان برد و تەواو کەوتەوە سەر ساجی عەلی.

دایکی (فاتم)، کچی حاجی سەید حەمەدەمینی سارەوانان بوو؛ شازدە ساڵان بابی خواسـتی و ڕەحمـان دوو ساڵی تەواو نەکردبوو، تووشی سیل هات و بە تازەلاوی، دنیا و کوڕە ساواکەی بەجێ‌هێشت.

ڕەحمان کە گەیشتە تەمەنی پێنج ساڵان، لای بابیەوە ئەلف و بـێ و ڕەشـخوێنی قورئـانی دەسـپێکرد. بەشوێنیدا چوو بۆ قوتابخانە و لەوێوە گەیشتە خانەقای شێخی بورهان و لە خانەقا «هێمن»ی ناسی و پێکەوە وانە سەرەتاییەکانیان خوێند و وردە ـ وردە شیعریان ناسـی و ئـۆگری بـوون. دوای ئـەوەش ــوەک بـاقی

---

١. داستانی ژیان و بەسەرهاتی مامۆستا هەژار، بە قەڵەمی خۆی، کتێبێکی گەورەیە، پتر لـە ٥٠٠ لاپـەڕە؛ بـە نـاوی «چێشتی مجێور». ئەو کتێبە بێ‌شک یەک لە پڕخوێنەرترین کتێبانی زمـانی کوردییـە؛ کـە زیـاد لـە بـاری زمـانی و وێژەیی، زۆرێک ڕووداوی، جێی تێڕامان و هەستبزوێنی لە خۆدا جێ کردۆتەوە. دیارە کتـێبی وا، لـە چەنـد لاپـەڕەدا ناگونجێ و خوێنەری هێژا، بۆ باش ناسینی ئەو کەڵەپیاوە و زانینی بارودۆخی دەورانێکی یـەکجار گرنـگ لـە مێـژووی کورد و کوردستان، پێویستە چێشتی مجێور بخوێنێتەوە.

خوێندکارانی ئایینی ـ بووە فەقێ و لـە قوتابخانـەی هێنـدێک دێهـاتی ئـەو ناوچـەدا، لای چەنـد مامۆسـتا خوێندی و تازە پێ‌نابووە ١٧ ساڵانەوە و خەریک بوو لـە زانـین و تێگەییـشتن چێـژەی وەردەگـرت، بـابی کۆچی یەکجاری کـرد؛ نـەختێک زەوی و زار و زۆرێ قـەرز و قۆڵـەی بـۆ مایـەوە و بـە جارێـک دەورانی بێ‌خەمی و هەرزەکاری لێ بەسەر هات و ئەرکی بەڕێوەبردن و بەخێوکردنی خوشـک و برایـانی وردساڵـی کەوتە سەر شان. ناعیلاج دەستی لە خوێندن بەردا و بوو بـە جووتیـارێکی لادێیـی. ژنی خواسـت و وەک خۆی دەڵێ، فریشتەیەکی بردەوە ماڵ و لە سێبەریدا حەسایەوە. بـەڵام ئـەو ئەسـتێرە گەشـەی ئاسمـانی بەختی، یەکجار زوو ئاوا بوو؛ پاش دوو ساڵ، لە تۆفی لاویدا، سەری یەکجاری ناوە و بەجێی‌هێشت.

ئەگەرچی لە هەموو بارێکەوە بۆی دژوار بوو، لەبەر نیازی دەرس و مەدرەسەی منداڵان، ماڵـی گواسـتەوە مەهاباد. لەوێ هەموو جۆرە کەسب و کاری دەکرد. لە لادێییان گەنم و تووتن و مـەڕ و مـاڵاتی دەسـاند و دەیبرد بۆ تەورێز و دەیفرۆشت. لەوێش شتومەک و وردەواڵەی دێناوە و بەم جۆرە تەواو بووژاوە. ماڵی کڕی و دیسان ژنی خواست و ئەمجاریش ژنێکی فیداکار و میهرەبانی بە نسیب بوو.

ڕەحمان پێڕای کەسب و کار، وازێکی زۆری لە ئـەدەبیات، بەتایبـەت شـیعر و وێـژەی کـوردی هـەبوو. هەرچی شیعری شاعیرانی کوردی دەس‌دەکەوت، دەیخوێند و ئەوی پـێ خـۆش بوایـە، لەبـەری دەکـرد. هەروەها لەمێژ ساڵ بوو هەستی بە زەوقی شیعر لە خۆدا کردبـوو؛ بـەڵام لـە ترسـی بـابی، زۆر ئـاوڕی لـێ نەدابۆوە. ساڵی ١٣٢٠ (١٩٤١)، هاوکات لەگەڵ ٢٠ ساڵانیدا، بارودۆخی ئێران، نەخوازە کوردستان تەواو گۆڕا و بە بۆنەی کز بوون و پاشان نەمانی دەسەڵاتی دەوڵەت لە وڵاتـەکـەدا، هـەلێکی بـاش بـۆ ئـازادیخوازان و نیـشتمانپەروەران دەسـکەوت کـە سەرهەڵـدەن و بـە دانـانی حیـزب و کـۆڕ و یەکیـەتی، داوای مـافی پێشێل‌کراوی گەلەکەیان بکەن. لەو نێوانەدا، سەرەتا لـە هـەموو ناسـراوتر، کۆمەڵـەی ژ. کـاف. (ژیانـەوەی کوردستان) بوو؛ کە عەبدوڕڕەحمانی شەرەفکەندی لە ڕیزی یەکەمین ئەندامانی ئەو کۆمەڵە ئەهاتە ئـەژمار. ڕەحمان لەو سەردەمەوە شیعری بۆ دەربڕینی هەستی نەتەوایەتی خۆی و ڕاگەیانـدنی هـاواری دادخـوازی خەڵکەکەی گوت. نازناوی «هەژار»ی هەڵبژارد و بڕیاری دا قەت بۆ نان و ئاسایشی خۆی شیعر نـەیژێ و بـە هەموو قەوەتی قەڵەمییەوە، بەرهەڵستیی دەسەڵاتدارانی ناحەقیکار بێ.

شیعرە جوانەکانی هەژار ـکە بە زمانی خەڵکی لادێیی و قسەی دڵی پڕایی گەلەکەی بووـــ لـە ماوەیـەکی کەمدا، کەوتە سەر زمانی گەورە و پچـووک و دەستاودەسـت دەگـەڕا. پێـشەوا قـازی موحەممـەد، نازنـاوی «شاعیری میللی» پێ بەخشی و یەکەم دیوانی شیعرەکانی بە ناوی «*ئاڵەکۆک*»، لە چاپدرا و وەرگێڕایـە سـەر زمانی ترکی و بە ئازربایجانیشدا بڵاو کرایەوە. قازی زۆری خۆش‌دەویست و یەک لە نزیکان و ڕاوێژکارانی بوو.

پاییزی ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥)، لە سەفەرێکیدا بۆ شاری سـەقز ـکـە وەکـوو ڕاسـپێراوی پێـشەوا، لەگـەڵ ئەفسەرانی ئەرتەشدا وت‌وویژی دەکردـــ بـە جـارێ بـار گـۆڕا و فـەرمانی گـرتنی دەرچـوو. لـە زینـدان،

سەرهەنگ غەففاری پێی ڕاگەیاند کە ڕووس فرۆشتوونی و بڕیاری دەسەڵات گرتنەوەی دەوڵەت لە وڵاتـدا دراوە و قازانجی لەوەدایە پاشگەز بێتەوە و داوای لێبووردن بکا. ئەمیش وەرامی داوە بە هەموو گیانیـەوە، لـە سەر بڕوای خۆی سوورە و مردنی لە خۆ فرۆتن پێ خۆشترە.

پاش دوو مانگ مانەوە لە زیندانی سەقز، ویستیان بیبەنەوە بـۆ مـەهاباد. بـە ڕێگـادا دەرفـەتێکی هێنـا و هەڵات. لەو سۆڵەی زستان و بە ناو بەفر و بۆرانی بێئامانی ئەوساڵەدا، بەرەو عیراق تێیتەقاند و پاش چەنـد ڕۆژان، خۆی کرد بەودیوی سنووردا.

داستانی ژیانی هەژار لە عـیراق ـ کوردسـتان و عەرەبـسانی ـ سەرانـسەر باسـی بەسـەرهاتی پیـاوێکی ئەویندارە کە لە پێناوی دڵدارییەکەیدا، دەستی لە هەموو شتێ شتووە و هەڵوەدای وڵاتی غەریب بـووە؛ بـە کرێکاری، حەمباڵی، نۆکەری ماڵان، دەسفرۆشی و تەنانەت شاگردی مەیخانە، ڕازییە و تۆران و دڵئێـشان و ساردبوونەوەی بە دڵدا نایە. سەردەمێ لە بەغدا، عەزیز قادری وێنەگرە؛ سەرەتێک لـە کوردسـتانی سـووریا، عەبدوڕڕەحمان حەسەنە؛ لە شوێنێک مەلا ڕەحمانی پێ ئێژن؛ جارێ مەلا موحەممەدە و چاخێک بە ناوی حاجی دەیناسن. بەڵام لە هەموو شوێنێک و بە گش ناوێکەوە، بۆ کورد و کوردستان حـەولیداوە، شـیعری داناوە، نووسیویە و هاوکاریی یەکگرتنە کوردییەکانی کردووە.

کاری دژوار و بێ حەسانەوە، خواردنی کەم و بێ بایەخ و جێخەوی شێدار و خەوی ناخۆش، سـەرەنجام تووشی نەخۆشینی سیللی کرد و زۆری لێ گرت و کەوتە حاڵێک خوێن دەڕشاوە. بە یارمەتی و ئاسـانکاری چەند دۆستێکی کوردی، گەیشتە نەخۆشخانەی «بەحنەس» لە جەبەلی لوبنان و ماوەی دوو سـاڵ لـەوێیان ڕاگرت، تا هێندێک چا بۆوە؛ ئەگەرچی پاش ئەو نەخۆشییە، یەک لە سییەکانی پووچاوە و شانێکی خوار بوو و چیتر ڕەنگی ساغییەکی تەواوی بە خۆوە نەدی.

وەک خۆی دەگێڕێتەوە، بەحنەس کتێبخانەیەکی گەورەی خاوەن هەموو جـۆرە کتـێبی کـۆن و نـوێیی عەرەبی بووە. هەژار لەو دوو ساڵەدا، زۆربەی کات و ساتی، هەر لە سەرەتای بەیانییـەوە تـا درنگـانی شـەو، خەریکی خوێندنەوەی کتێبان دەبوو.

بەحنەس لەم بارەوە، زانستگایەک بوو بۆ هەژار؛ بە هۆی خوێندنەوەی زۆرێـک کتـێبی عـەرەبی؛ کـۆن و نوێ، لە نووسراوە و وەرگێڕاو و کردنەوەی چاوی بەڕووی دنیادا و دەسکەوتنی زانیارییەکی بـاش، بەتایبـەت لە زمان و وێژەی عەرەب، قوتابخانە وێژەیی و هۆنەرییەکانی ڕۆژاوا و هەروەها ناسینی نووسەرانی گـەورەی دنیا. کە گەڕاشەوە بۆ بەغدا، بە نەخۆشی و دەستەنگی و سەرقاڵیش، تازە خوێندنـەوەی کتێـب و بلاڤـۆکان ببووە خۆی و تا ژیا، لەگەڵیدا بوو.

مامۆستا هەژار کە گەیشتەوە بەغدا، دیسان ژیـانی هەژارانـەی خـۆی دەسـپێکردەوە و وەک جـاران، بـە نهێنی لەگەڵ کۆمەڵە کوردەکان، بەتایبەت حیزبی پارتی دێموکراتدا هاوکاری دەکرد و ئەوانیش ـ بە پێـی



توانا و دەسەڵات ـ جاروبار بە دەنگییەوە دەھاتن و لە کاتی بگرە و بەردەدا، دەیانشاردەوە.

ببووە نۆ ساڵ لە ئێران ھەڵاتبوو. پاش ئەو ماوە درێژخایەنە، ئێستا تازە بە ھاودڵی ھەوالانی، دەروێکی لێ کرابۆوە بتوانێ ژن و منداڵەکەی بانگ‌کاتە لای خۆی. ئەودەم کە ھەڵات و بەجێیانیھێشت، شێرکۆ (موحەممەد)ی کوڕی شەش‌مانگان بوو؛ ئەوا ئێستا نۆساڵانە و بابی خۆی ناناسێ[١]؛ نە خوێندنێک و نە ھیچێک. جا وەرە بە نەداری و لەش‌بەباری، ژن و منداڵیش بەڕێوە بەرە! بەو حاڵەش دیسان باشە یەکیان گرتۆتەوە و بوونەتەوە ماڵێک.

لەو ساڵانە، نووری سەعید ـ سەرەک‌وەزیری مەلیک فاروق لە عیراقدا ـ ملھوڕی و زۆربێژی گەیاندبووە ئەوپەڕی خۆی و ڕەخنەگران و نەیارانی دەگرت و لە زیندان توندی دەکردن. مامۆستا ھەژاریش یەک لەوانە بوو لەدووی دەگەڕان. ناچار دوای ماوەیەک ژیانی بە نهێنی و ماڵەوماڵ کردن، پێش ئەوە تووش بێ، ژن و منداڵی سپاردە دۆستێکی و بەرەو کوردستانی بەردەستی سووریا ھەڵات. لەوێ دوای ساڵێک خێزانەکەشی بانگ کردە لای خۆی و بەم جۆرە دیسانەکە و لە غوربەتێکی‌تر، یەکیان گرتەوە.

مامۆستا سێ ساڵ لە قامیشلی لای جزیر و بۆتان، میوانی ماڵەکوردێکی عەشایەری خێرومەند بە ناوی حاجۆئاغا بوو؛ تا لە ھاوێنی ١٩٥٨ ز. عەبدولکەریم قاسم لە عیراق کوودەتای کرد و دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست. ھێندەی نەخایاند نەمر، مەلا مستەفا بارزانی لە شۆرەوی (سۆڤیەت)ەوە گەڕاوە عیراق و داوای بەرامبەری مافی کورد و عەرەبی کرد. مامۆستا ھەژاریش، وەک زۆرێکی‌تر، خۆی گەیاندێ و چووە ڕیزی یارانی و لەو کاتەوە، ماوەی ١٧ ساڵ، لە نزیکترین دۆستان و ڕاوێژکارانی ئەھاتە ئەژمار.

مامۆستا لەم سەردەمەوە، ژیانی بارێکی‌تری گرتە خۆی و لە غەریبی و بیکەسی دەرھات. بەڵام ئەمجاریش بە شێوەیەکی‌تر تووشی ناخۆشی و دڵدامان دەبوو. لە لایەکەوە ھەرتاوێک بیانوویەک تاشین و شەڕ فرۆشتنی حوکمەتەکانی بەغدا و لەسەریەک شەڕ ھەڵگرسان، ئاسایشێکی نەھێشتبوو؛ لە لایەکی ترەوە، پشت لە دژمن کردن و خۆفرۆشتن و خەیانەتی ھێندێک لە ھاوڕێیان، دەردی سەرباری ھەموو دەردان بوو. ھەرچۆنێک ھات و بە ھەر شێوەیەک چوو، لە ھەموو ئەو ساڵانەدا، وەکوو پێشمەرگەیەکی بەئەمەگ، قەت دەستی لە خەباتی ئازادیخوازی بەر نەدا و لە ھەر بارودۆخێکدا بە شێوەیەک شوێنی ئارمانی خۆی گرت. کاتی ئاشتی، بە شیعر و نووسراوەکانی، وەکوو زمانی گەلەکەی لە ناحەقیکاران ئەھاتە دەنگ و ھەروەھا ڕوون‌کەرەوەی بیر و بەرچاوی خەڵک بوو؛ کە ئاوری شەریش ھەڵدەبوو، بە ڕۆژان وەکوو پێشمەرگە تفەنگ لە شان و شەوان لە ڕادیۆ و بلاڤۆکانی بزوتنەوەدا، بە نووسین و خوێندنەوەی شیعر و وتار، خزمەتی دەکرد و دەنگ و داخوازی خەباتکارانی ڕێگای ئازادی، بە دنیا ڕادەگەیاند. جاروباریش بۆ

١. لە ڕاستیدا ئێستاش نەیناسی!

شۆڕش، باربووی کۆ دەکردەوە.

لە سەردەمی حەفتاکاندا، کە بارزانی لەگەڵ دەوڵەتدا پەیمانی ئاشتی بەست، مامۆستا بوو بە ئەندامی کارای «کۆڕی زانیاری کورد» لە بەغدا و لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی چالاکی کۆڕدا، بەچەند کتێب و وەرگێڕاوە و گوتاری بایەخدار، خزمەتێکی گەلێک باشی بە زمان و وێژەی کوردی کرد.

پاش پەیمانشکێنی دەوڵەتی بەعسی و قەومانی دوایین شەڕ، کە ساڵی١٩٧٤ز. دەستیپێکرد و ١٩٧٥ بە خەیانەتی شای ئێران و لە ئامێز گرتن و ڕامووسانی سەدام لە جەزایردا کۆتایی هات، ئەگەرچی دەوڵەتی بەعسی فەرمانی عەفووی گشتی دابوو، بەڵام سەرەتا هەر پێشمەرگەیەک خۆی تەسلیم دەکرد، دەسبەجێ دەیانکوشت. ناچار زۆرێک پێشمەرگە، بە ژن و منداڵەوە، ڕوویان کردە ڕۆژهەڵات و پەنایان بردە بەر ئێران. لەو هەڵات ـ هەڵاتەدا، مامۆستا هەژار ویستی سەری خۆی هەڵگرێ و ئەگەر ڕێگای دەرکرد، بچێتەوە جزیرێ؛ بەڵام بارزانی نەیهێشت لێی جیا ببێتەوە و لەگەڵ خۆی بردیە ئێران و لە «ساواک» بڕیاری چاوپۆشی بۆ وەرگرت و لە عەزیمییەی کەرەجی لای تاران، لە پەنای خۆی، نیشتەجێی کرد. بەم شێوە بۆ جاری چەندەم و ئەمجار لە سەری پیریدا، دیسان چۆوە سەر خانی یەکەم و بۆ دەستخستنی کار و نان و پێخۆرێک، کەوتە گەڕان بە خیابان و ئیدارەکانی تاراندا.

لە زانستگای تاران، وەرگێڕانی «*القانون فی الطّب*»ی ئیبنوسینایان بە فارسی، پێ پێشنیار کرد و بڕیاریان دا ئەگەر تێیدا سەرکەوت، کاریان بۆی هەبێ. پاش تەرجەمەی کتێبی یەکەم، کۆڕە زانستی و وێژەییەکان ناسیان و بوو بە ئەندامی «فَرهنگستانِ زَبانِ فارسی» لە تاران.

بە لاچوونی ڕژیمی شا لە ئێران لە ساڵی ١٣٥٧ ک. هـ. (١٩٧٩ ز.)، مامۆستا دەرفەتێکی باشی دەسکەوت کە بە ئاواتی دڵی خۆی، بنووسێ و وەرگێڕێ و دڵنیا بێ کە کارەکانی ڕووناکی دەبینن و لە چاپ دەدرێن. بەم شێوە لە دە ـ دوازدە ساڵی کۆتایی ژیانیدا، توانی سەرجەمێک لە بایەخدارترین کتێبان بەرهەم بێنێ و ئاراستەی کتێبخانەی کوردی بکا.

بە داخەوە لەشی نەخۆشی زۆری لەگەڵ نەهات و لە کاتێکدا کە هزر و هەستی گەیشتبووە ئەوپەڕی توانایی و قەڵەمی ـ وشە بە وشە و دێڕ بە دێڕ ـ گەوهەری دادەباراند، لە دووهەمی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٦٩ ک. هـ. (١٩٩١ ز.)دا، دڵی لە جووڵە کەوت و دنیایەک زانست و زەوق و توان، بەجارێک لە دەس چوو.

تەرمی مامۆستایان بردەوە مەهاباد و خەڵکێکی زۆر ـ کە لە هەموو لایەکەوە هاتبوون ـ بەوپەڕی ڕێزەوە بردیانە زیارەتانی بوداغسوڵتان و لە پەنا مامۆستا هێمن و مەلا غەفور ناشتیان.

* * *

بێشک مامۆستا هەژار، لە گەورەترین ئوستادانی وێژە و مێژووی کوردە کە چ لە باری ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و چ لە بواری زمان و فەرهەنگمانەوە، بۆ کورد و کوردستان، ڕەمزی هەرمان و نەفەوتانە.

وەک گوتمان هەژاری ٢٤ سالان، لە لایەن پێشەوا قازی موحەممەدەوە، نازناوی «شاعیری میللی» پێ درا و ئەمە دەردەخا مامۆستا هەر بە جحێڵی چەند شاعیری چاک بووە. دیارە شیعری هەژار، جیا لە باری واتا و پەیامێکەوە کە بۆ میللەتەکەی دایناوە، لە چاو هونەر و دەسەڵاتی شیعرییشەوە، لە ڕیزی باشترین و بەرزترین شیعرەکانی ئەم دواییانەیە. بەڵام پەخشانی مامۆستا باسێکی جیاوازە. قەڵەمی ئەو نووسەرە بلیمەتە، توان و بڕشتی زمانی کوردی، بۆ بەرهەمهێنان و وەرگێڕان، یەکجار بردە سەر و بە تێکەڵکردنی ئاهەنگ و هەوایەکی تایبەت لەگەڵ پەخشاندا، شێوازێکی تازەی بەدیهێنا و لێهاتووییەکی بێ وێنەی بۆ زمانی کوردی وەدەرخست.

ناوی هەژار لە دوو زمانی فارسی و عەرەبیشدا، نامۆ نییە. مامۆستا پاش هەزار ساڵ قانوونی بووعەلی سینای لە عەرەبییەکی ڕەق و یەکجار دژواری لیچارئاساوە، کردە فارسییەکی ڕەوان و بێ گرێ و بەو بۆنەوە، زۆرێک لە وێژەوانانی فارس ستایشیان کرد.

بارێکی‌تر لە کەسایەتی ئەو کەڵەپیاوە، لە ڕوانگەی ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەوەیە. لەو ڕۆژەوە چووە ناو کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان (ژـک) و سوێندی خوارد کە بۆ بەرژەوەندی کورد و کوردستان تەنانەت لە گیانیشی درێغ نەکا، تا ئاخر، لەسەر پەیمانەکەی ڕاوەستا و لە پێناویدا، زیاتر بە دەستەنگی و ئاوارەیی و مەترسی گیران و هەڵاتن لە شار و وڵاتێکەوە بۆ شار و وڵاتێکی‌تر، ژیانی تێپەڕ کرد و جگە لە خۆی، بنەماڵەکەشی تاڵ و سوێری زۆریان چێشت و گەرم و ساردی فرەیان بینی و بە تایبەت کوڕە گەورەکەی ئێستاش هۆی ئەم ژیانە سەرانسەر کارەساتەی بۆ قووت نەچوو.

سەردەمێک بە هۆی شیعر و نووسراوەکانییەوە، لە چوار وڵاتان قاچاخ بوو. بەو حاڵەش قەت لە هیچ دەسەڵاتێک کۆی نەکردەوە و سەری بۆ کەس دانەنواند. هەر ئەم تایبەتمەندییەش هۆی ئەو هەموو ناوبانگ و خۆشەویستییەی لە ناو خەڵکدا بوو.

بە کورتی، داستانی ژیانی مامۆستا هەژار، بە ڕاستی یەک لە باشترین وێنەکانی مێژووی چەرخی ڕابوردووی میللەتێکە، بە هەموو بەرز و نزم و تاریک و ڕوونییەوە.

لە باری ئاکاریشەوە، خۆ و خدەی مامۆستا جێی سەرنجە. بەو هەموو دەسەڵاتی ئەدەبی و پلەی بەرزی زانستی و ناسراوییەوە، لووتبەرزی و فیس و خۆبەزلزانی، هەر بەلادا نەچووبوو. ئەگەر کارێکی گەورەتری دەست بۆ دەبرد، خاکی‌تر ئەبۆوە و تا ڕێز و حورمەتی لە ناو کۆمەڵگادا زێدە دەبوو، لەگەڵ خەڵک بە خاکەسارییەکی زیاترەوە ئەجووڵایەوە.

هەموو جارێ دەیگوت کوردییەکەی من جێ متمانە نییە؛ کوردیی ڕەسەنتان دەوێ، وا بە لای ئەو مامە شوانە و دایە پیرە لادێییەوە. ئەمن دەبێ لە پێشیاندا چۆک دادەم و کوردییان لێ فێر بم. جارێک شاعیرێکی لاو هاتە لای و شیعرێک و دوانی خۆی بۆ خوێندەوە. باش‌ـباش گوێی لێ گرت و داوای لێ

کرد چەند شیعری تریشی بۆ بخوێنێتەوە. لە ئاخردا پێی گوت: کاک ... بەڕاستی شاعیری چاکی؛ لە منیش چاتر. بەڵام خوا بتگرێ ئەگەر بیفرۆشی!

یەکجار لە درۆ بێزار بوو. زمانبازی و خوڵتەشی بە منداڵانی حەق‌ودای درۆ دەزانی. لە ئەمەگ و وەفاداریدا، سنوورێکی دانەدەنا و بۆ دۆست هەموو شتێکی دەدا؛ بەڵام ئەگەر بیری سەبارەت بە کەسێک دەگۆڕا، تازە هەیهات بوو لێی خۆش ببێ.

**بەرهەمەکانی مامۆستا**:

١. «*ئاڵەکۆک*»، دیوانی شیعر، چاپی تەورێز، ١٣٢٥ ک. ه.

٢. هۆنراوەی «*بەیتی سەرەمەڕ و لاسایی سەگ و مانگەشەو*»، چاپی سووریا، ١٩٥٧ ز.

٣. «*مەم و زین*»، هۆنراوەی ئەحمەدی خانی، بە زاری باکوور، وەرگێڕان بە موکوریانی، چاپی بەغدا، ١٩٦٠ ز. لەچاپدانەوەی بە زیاد کردنی شیعرەکەی خانی و واتای وشەکانی، چاپی ئیتالیا، ١٩٨٩ ز.

٤. «*بۆ کوردستان*»، دیوانی شیعر، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٦٦ ز. چاپی چوارەم، ستۆکهۆڵم، ١٩٨٨ ز. چاپی شەشەم، سنە، ١٣٨٥ ک. ه.

٥. «*چوارینەکانی خەییام بە کوردی*»، وەرگێڕاوەی ٢٥٠ ڕوباعی خەییام، هەر لەسەر کێشی خۆی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٦٨، چاپی سێهەم، تاران، ١٣٧٠ ک. ه.

٦. «*شەرەفنامەی بدلیسی*» مێژووی ماڵەمیرانی کورد، نووسینی میرشەرەفخانی بدلیسی بە فارسی، وەرگێڕان بە کوردی، بە زیاد کردنی پێشەکی و پەراوێز و ... چاپی یەکەم، نەجەف، ١٩٧٣ ز. چاپی دووهەم، تاران ١٣٦٠ ک. ه. چاپی سێهەم، هەولێر، ٢٠٠٥ ز.

٧. «*هۆزی لەبیرکراوی گاوان*»، وەرگێڕاو لە عەرەبییەوە، نووسراوەی دوکتور مستەفا جەواد، چاپی بەغدا، ١٩٧٣ ز.

٨. «*قانون در طب*»، نووسراوەی بووعەلی سینا، وەرگێڕان بە فارسی لە ٧ بەرگدا، چاپی یەکەم، تاران، لە ١٣٦٢ تا ١٣٦٧ ک. ه. (تا چاپی هەشتەم چووە).

٩. «*چوار نامیلکەی دوکتور عەلی شەریعەتی*»، وەرگێڕان بە کوردی، چاپی یەکەم، تاران، ١٣٥٨ و ١٣٥٩ ک. ه. چاپی دووهەم، هەولێر، ٢٠٠٦ ز.

١٠. «*شەرحی دیوانی مەلای جزیری*» بە کوردی سۆرانی، چاپی تاران، ١٣٦١ ک. ه.

١١. وەرگێڕانی «*آثارُالبِلاد اخبارُالعباد*» بە فارسی، نووسراوی زەکەریا، کوڕی موحەممەد، کوڕی مەحمودی قەزوینی، چاپی تاران، ١٣٦٦ ک. ه.

١٢. «*هەنبانە بۆرینە*»، فەرهەنگی کوردی ـ کوردی و فارسی، چاپی یەکەم ، تاران، ١٣٦٩ ک. ه. (تا چاپی شەشەم چووە. چەند کوردێکی نیشتمانپەروەر«!» بە دزییەوە چاپی کردۆتەوە).

